ئیسماعیل بێشکچی و
سینەمخان جەلادەت بەدرخان
پێشەکییان بۆ وەرگێڕانە
کوردییەکە نووسیوە

لە تورکییەوە:

محەمەد عزەدین

# بیرەوەرییەکانم

## مووسا عەنتەر

له توركییەوە: محەمەد عزەدەین

ئیسماعیل بێشكچی و سینەمخان جەلادەت بەدرخان

پێشەكییان بۆ ئەم وەرگێرانە كوردییە نووسیوە

"هیچ کوردێکم نەدیت، هێندەی مووسا عەنتەر هێمن و لەسەرخۆ بێ، بۆیە ناتوانم لە دەوڵەتە بکوژەکەی خۆشبم".

**یاشار کەمال**

**دەزگای فام**

**بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە**

FAMpublication

**بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری**

**HATIRALARIM**

Musa ANTER

Publisher AramYayınları

ISBN: 978-9944-222-50-1



**چاپی یەكەم - ٢٠٢١**

# بیرەوەرییەكانم

نووسینی

## مووسا عەنتەر

وەرگێڕانی لە توركییەوە

## محەمەد عزەدین

بابەت: بیرەوەریی

پێداچوونەوە: لوقمان باپیر

پۆرتریتی سەر بەرگ: ئەحمەد تۆغوت

پێوانە

١٣.٥*٢١سم (٦٢٨) لاپەڕە

ئەم پەرتووكە لە چاپی چوارەمەوە وەرگێڕدراوە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان/ هەرێمی كوردستان ژمارە سپاردنی (٨)ی ساڵی ٢٠٢١ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆك

**مووسا عەنتەر**
**شاهیدی ڕووداوەکانی مێژووی نوێ**

مووسا عەنتەر لە سەردەمێك ژیا، نكۆڵی لە بوونی كورد و زمانەكەی دەكرا. ئەو، لە نێوان ساڵانی (١٩٢٠–١٩٩٢) ژیا، لە سەردەمێكی تژی لە هەوڵ و كاری تواندنەوەی كوردان لە قاڵبی توركبوون و شوونبزركردنی زمانی كوردی لە چوارچێوەی زمانی توركیدا. بۆ جێبەجێكردنی هەر بیرۆكەیەكی لەو شێوەیەش، كە خزمەتی ئەو بەرنامە و زیهنیەتەی كردبا، پلانی زۆر ورد دادەنرا و پرۆگرامی بۆ دادەڕێژرا و ئینجا دواتر دەچووە بواری جێبەجێكردنەوە. لەگەڵ دامەزراندنی كۆمار و لە سەردەمی سیاسەتی تاك پارتایەتی لە توركیا، لە نێوان ساڵانی (١٩٢٣ – ١٩٤٥)، بە شێوەیەكی چڕوپڕ بڕیاری لەبارەوە دراو ئەو بیرۆكانە ئامادە دەكران و كاریان لەسەر دەكرا و دەچوونە بواری جێبەجێكردنەوە. پاش ساڵی، ١٩٤٥ دوای هاتنەپێشی قۆناغێكی تازە لە ڕێڕەوی سیاسیی توركیا و دروستبوونی پارتی تازە و كۆتاییهاتنی تاك پارتایەتی، لە سەردەمی پارتی دیموكراتیش لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠ – ١٩٦٠)، ئەو پیلانی دژ بە كوردە بەردەوامیی پێ درا.

كودەتای سەربازیی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق،

بۆ کورد بووە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی کوردستان. گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ پێشمەرگەکانی بۆ بەغدا و بەیاساییکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەشداریی کورد لە کابینەی تازەی حکوومەتی عێراق، ئومێدێکی زیاتری دابووە گەلی کورد. لەو سەروبەندەش، لە دیاربەکر، ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد) دەستی بە چاپ و بڵاوکردنەوە کرد. مووسا عەنتەر یەکێك بوو لە نووسەرەکانی ئەو ڕۆژنامەیە، خاوەنەکەشی عەبدولڕەحمان ئەفەم دۆلاك بوو. پارێزەر جانیب یڵدرم، هەر لەو ڕۆژنامەیە، بەڕێوەبەری نووسین بوو. جگە لەوانە، لە هەمان قۆناغ، مووسا عەنتەر دوو پەرتووکی بە ناوەکانی (برینی ڕەش) و (کمل) بڵاو کردبووەوە و دەنگدانەوەیەکی زۆری لە میدیاکان پەیداکردبوو. سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستویەک، مووسا عەنتەر و دکتۆر سەعید قرمزی تۆپراك تووشی دەمەقاڵێیەك دەبن و ناخۆشیان دەکەوێتە نێوان. ئەو ساڵە مووسا عەنتەر لە گۆڤاری (بارش دونیاسی) دەینووسی و دکتۆر سەعید قرمزی تۆپراکیش لە هەفتەنامەی (یۆن) نووسینەکانی بڵاو دەکردنەوە. یۆن، ساڵی ١٩٦١ بە فیکری چەپڕەوی دەستی بە کار کردبوو، خاوەنەکەی دۆغان ئاڤجی ئۆغلوو بوو. هەرچی گۆڤاری (بارش دونیاسی) بوو، گۆڤارێکی لیبراڵ بوو، ئەویش لەلایەن ئەحمەد حەمدی بەشار بڵاو دەکرایەوە و ساڵی ١٩٦٢ دەستی بە بڵاوکردنەوە کردبوو، بەڵام ئەو گۆڤارە لە نزیکەوە کاری لەسەر کێشەی ناوچە کوردییەکانی ناو سنووری تورکیا دەکرد. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە لە ١٩٥٩ دۆسیەی ٤٩

کەسەکەی پەیوەست بە ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد) کرابۆوە و مووسا عەنتەر و جانیب یلدرم و عەبدولڕەحمان ئەفەم، سێ کەس بوون لەناو ئەو ٤٩ کەسەی لە زیندان بوون.

دادگاییکردنی ساڵی ١٩٦٣ی مووسا عەنتەر لە دۆسیەی ٢٣ کەسەکە، بە تەواوی وردەکارییەکانی ناویەوە، لەو پەرتووکەی بەردەستتان بە ناوی (بیرەوەرییەکانم) دەخوێننەوە. خۆشم لە ساڵی ١٩٧١ نزیکەی دوو ساڵ لە دیاربەکر و سیرت، لە بەڕێوەبەرایەتیی فەرماندەیی دۆخی نائاسایی سەربازی لەگەڵ کاک مووسا لە زیندان بەیەکەوە بووین. برا گەورەیەکی هاوکار و دڵ فراوان بوو. بەردەوام هەوڵی ئەوەی دەدا هاوکاریی برادەرە گەنجەکانمان بکات. جگە لەوەی لەگەڵ کاک مووسا لە ساڵی ١٩٩٠ لە دامەزراندنی ناوەندی فەرهەنگی میزۆپۆتامیا لە ئیستانبووڵیش ماوەیەکی باش پێکەوە کارمان کرد. بە بۆچوونی منیش، گەورەترین دەستکەوت و ڕووداوی ئەو قۆناغەی ئەوسا، دروستکردنی ئینیستیتوتی کوردی بوو لە ئیستانبووڵ، کە لە ١٨ نیسانی ١٩٩٢ کرایەوە. لە قۆناغی دروستکردن و دامەزراندن و کردنەوەی ئینیستیتوتی کوردییش لە ئیستانبووڵ لەگەڵ مووسا عەنتەر بەردەوام کارمان دەکرد، بیرمە تا ڕۆژی کردنەوەشی مووسا عەنتەر زۆر بە چڕی کاری دەکرد و زۆر خۆی پێوە ماندوو دەکرد.

پەرتووکی (بیرەوەرییەکانم) کارێکی زۆر گرنگ و پڕ بایەخی مووسا عەنتەرە، چونکە لە ڕێگەی ئەو پەرتووکەوە، نووسەر بەشێکی زۆر لە ڕووداوەکانی مێژووی نوێی کوردستان

ڕووناك دەکاتەوە. ئاخر ئەو شاهێدی زۆر ڕووداوی کوردستان و تورکیایە کە لەو پەرتووکە دەیخوێننەوە. بۆیە، ماندووبوونی کردنەکوردیی ئەو پەرتووکەش بۆ شێوەزاری سۆرانی لەلایەن محەمەد عزەدینی دۆستمانەوە، شایەنی ڕێزگرتنە و منیش لە ناخی دڵمەوە، بۆ ئەو کارەیان، سوپاسگوزاریانم.

**ئیسماعیل بێشکچی**
**١٦-٨-٢٠٢٠**
**ئەنقەرە**

## زمانمان، ناسنامەمانە

مووسا عەنتەر، مرۆڤێکی ڕووناکبیر و تێگەیشتوو و زانا بوو. بۆیە، دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ کردنی تام و چێژێکی زۆر خۆشی هەبوو. تێکەڵیی ئەو لەگەڵ ماڵباتی بەدرخانییەکان وەکو تێکەڵیی دوو ڕووناکبیر یان سیاسەتمەداری کورد نەبووە، بەڵکو ئەو لەیەك نزیك بوونەوەیە لە خزمایەتیش تێپەڕی بوو. ئاپێ مووسا لەگەڵ کامەران بەدرخانی مامم دۆستی زۆر نزیکی یەکدی بوونە، وەکچۆن لەگەڵ ڕەوشەنی دایکم و خێزانی جەلادەت عالی بەردخانیش خۆشەویستی و ڕێزێکی زۆریان لەنێواندا هەبووە. سەرباریش، ئەو دۆستێکی نزیکی مەزیەتی پوریشم بوو، کە ئەوسا لە ئیستانبووڵ دادەنیشت.

یەکەم جار ساڵی ١٩٦٨ بوو کە ئاپێ مووسام بینی، ئێمە، پێشتر ئەومان لە ڕێگای نووسینەکانییەوە دەناسی، بەڵام ئەوکات لە ڕێگای پوورمەوە بە خێزانی یەکدیمان ڕوو بە ڕوو بینی. بیرمە ئەوساڵە چووبووینە ئیستانبووڵ، خوالێخۆشبوو ڕەوشەنخانی دایکیشم لەوێ بوو. هەر لەو سەردانە ڕۆژێکمان دیاری کرد و چووینە دەرەوە، زۆری قسە بۆ کردین و نوکتەی خۆشی بۆ گێڕاینەوە، چونکە وەك دەزانین ئەو زۆر حەزی بە حەنەك و

گاڵتەوگەپ دەکرد. جگە لەمانە، ئاپێ مووسا باسی بەشێك لە بەسەرهاتەکانی خۆیشی بۆ کردین. ئەو جڤینە بە ساتەوەختێکی مێژوویی دادەنێم، جا بۆیە، لە یادکردنی ئەو ساتانە لای من مەحاڵە. ئەو ڕۆژە وێنەیەکی زۆر جوان و تایبەتی خێزانیمان گرت، کە تا ئێستا لای خۆم پاراستوومە. ئەو ڕۆژە باسی زۆر شتمان کرد، بەڵام بیرمە جەختی لێ کردمەوە کە زمانی کوردی ببێتە زمانی دایکیی منداڵەکانم، ئینجا پێی گوتم: "زمانمان ناسنامەمانە، بێ زمان ناسنامەمان ون دەبێ".

دوای ئەو دیدارەی ئاپێ مووسا، پەیوەندییەکانمان لە ڕێگای نامەگۆڕینەوە و هەندێکجاریش بە تەلەفۆن هەر بەردەوام بوو، چونکە ئێمە گەڕاینەوە کەرکوك و ئەویش لە ئیستانبووڵ مایەوە. پەیوەندییەکانمان لە ئاستی خێزانی لەگەڵ ئاپێ مووسا پتەوتر بوو، بە تایبەتیش مێردی خوالێخۆشبووم سەلاح سەعدوڵلا پەیوەندییەکی توند و تۆڵ و نەبڕاوەی لەگەڵیان دروست کرد. دواتریش هاوسەرەکەم پەرتووکی (برینی ڕەش)ی ئاپێ مووسای وەرگێڕا سەر زمانی عەرەبی، ئەگەرچی ڕژێمی بەعسی عێراق، تەنیا لەبەر ئەوەی نووسەرەکەی مووسا عەنتەر بوو، زۆری ڕێگری لە چاپ و بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکە کرد، بەڵام دواجار پەرتووکەکە بە زمانی عەرەبیش چووە ناو ڕەفی پەرتووکخانەکان. مرۆڤ، کاتێك ئەو پەرتووکەی بەر دەستتان یان پەرتووکی (برینی ڕەش) دەخوێنێتەوە، بەرامبەر ئەو هەموو کارەساتە ناخۆشەی بەسەر ئاپێ مووسا و گەلی کورددا هاتووە، بەڕاستی دڵی ڕەش دەبێت، وەلێ بەداخەوە هەندێك لە کوردی ئێمە دونیا بینیان کورتە و ڕێز لەو بەرهەمە ناوازانە ناگرن.

نازانم باسی چی بکەم، چونکە چەندی باسی ئاپێ مووسا بکەم کەمە، بەوپێیەی ئەو نەك تەنیا ڕۆژنامەڤان و ڕووناکبیر و

سیاسەتمەدار بووە، بەڵکو ژیان و کەسایەتیی ئەو وەرچەرخانێکی مێژوویی گرنگی قۆناغێکە لە قۆناغەکانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کورد، بۆیە، دەبێ بەردەوام ئەوە لە بیر نەکەین، کە ئاپێ مووسا چۆن ژیا، دواتریش چۆن بە دەستی نەیاران کوژرا. جا بۆ زانینی زیاتری لایەنە نهێنییەکانی ئەو ڕووداوانە، دەستخۆشی لە وەرگێڕی ئەو پەرتووکە دەکەم بۆ سەر زمانی کوردی، تا گەلی کورد بزانێ ژیان و خەباتی ئەو کەڵە پیاوە چۆن بووە، چونکە هەڵوێست و بەسەرهاتەکانی ئەو لە خوێندنەوەیدا بۆ ئێمە دەردەکەوێت چەند گرنگە، بەو پێیەی بەسەرهات و بیرەوەریی کەسێکی ئاوا گەورەی وەك ئاپێ مووسا، دڵنیام زۆر وانە و پەندی گرنگی بۆ ئێمە تێدایە.

**سینەمخان جەلادەت بەدرخان**

**٢-٠٩-٢٠٢٠ / هەولێر**

# بەشی یەکەم

## زیڤینگێ

وەک پێشتریش گوتوومە، نازانم شوێنی لەدایکبوونم کوێیە؟ بەڵام داخۆ ژیانی منداڵێکی ئەشکەوتی چی بێ و بەلای کێوە ئەوەندە گرنگە؟ جا لە هەر کوێیەکیش لەدایک بووبم. ئەو جۆرە بیرکردنەوانەم وایدەکرد هەرگیز بیر لە نووسینەوەی سەربردەی ژیانم نەکەمەوە، ئەگەرچی زۆریشم داوا لێ دەکرا. بەڵام پێدەچێ مرۆڤ کە تەمەنی هەڵدەکشێ و بیرەوەرییەکانی کەڵەکە دەبن، حەز بکا شان بداتە بەر کارێکی ئاوا. ئەحمەدی خانیی گەورە شاعیری کورد، لە پێشەکیی فەرهەنگی کوردی – عەرەبی (نوبەهارا بچووکان) دەڵێ:

"نە ژ بۆ ساحێب ڕەواجان
بەلکی ژ بۆ بچووکێن کورمانجان".

منیش بە ئیلهام وەرگرتن لەو پیاوە گەورەیە، یادەوەرییەکانم بۆ منداڵەکانم دەنووسمەوە. بەو ئاواتەی ڕێگای چەندان منداڵی دیکەی ئەشکەوتێ ڕووناك بکاتەوە.

گوندەکەمان ناوی (زیڤینگێ)یە، لە کوردی بە مانای کوێستان دێت، بەڵام نەك ئەو کوێستانەی لە هەندێك وڵاتە دەوڵەمەندەکان زستانان بۆ خلیسکانێی سەر بەفر و کەیف و خۆشی ڕووی تێدەکەن، بەلکو ئەوەی ئێمە، بۆ ئەوە بوو تا زستانان حەیوانی تێدا ڕاگرین.

لە ناوچەکەماندا زۆر شوێنی دیکەش ناوی "زیڤینگێ"یە، بەڵام هەر زیڤینگێیەك بە ناوی عەشیرەتەکەی ناویەوە دەناسرێ. بۆ نموونە زیڤینگێی ئێمە بە زیڤینگێی تامیکا دەناسرێتەوە، ئەوانی دیکەش، بە زیڤینگێی هابیزبینیا، زیڤینگێی بۆتان، دەناسرێتەوە. جا سەیر ئەوەیە، کەسی وا لەو گوندانە پەیدادەبن خولیایان زانست و زانینە. شیکردنەوە عەرەبییەکەی دیوانی مەلا ئەحمەدی جیزیریش، لەلایەن مەلا ئەحمەدی زیڤینگێی نووسراوە، کە دواتر، لە سووریا بووەتە موفتیی قامیشلۆ. بەڵام وەرن ببینن لە سەردەمی ئەشکەوتەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، کە نزیکەی ٧ هەزار ساڵە، چۆن حکوومەتە زاڵمەکان، وەك ئەوەی ناویان لە سەگ و پشیلەکانیان نابێ، بەبێ ئەوەی پرسیش بەئێمە بکەن، ناوێکیان لەو شوێنانەی ئێمە ناوە. بۆیە، ناوی ناوچەکەی ئێمەیان کردە (ئەشکەوتی کۆن). واتا لە تەمەنی ٦٥ساڵی بوومە خەڵکی ئەشکەوتی کۆن. وەك چۆن لە ماوەی ڕابردوو لە بولگاریا، ناوە تورکییەکانی ئەو وڵاتەیان کردۆتەوە بولگاری، ئەم کارانەش کەلتووری مرۆڤایەتی بەرەو دۆخێکی خراپتر دەبەن و دژی مافەکانی مرۆڤیشە. جا گەر بولگارەکان تاوانی ناو گۆڕین لە تورکەکانیش فێر بووبن ؟ چونکە تەنیا لادێکەی ئێمە تووشی ئەو بەڵای ناو گۆڕینە نەبوو، بەڵکو لە نیشتمانی من هەرچی ناوی لادێ هەبوو، بێ ئەوەی پرسێك بە خاوەنەکانیان بکەن، حکوومەت کردوونی بە تورکی. تەنیا ناوی لادێکانمان نا، بەڵکو ناوی چەندان شار و شارۆچکەشیان گۆڕی، بۆ نموونە (دیاربەکر- دیارباکر، ئەلئازیز- ئەلازغ، دەرسیم – تونجەلی، شامراخ – مازی داغ). جگە لەوەی بەشێك لەو ناوانەی نەشیان گۆڕی، بەڵام پێشگر یان پاشگرێکی بێ سوودیان لێ زیاد کردن، بۆ نموونە (عەنتاب) کرا بە (غازی عەنتاب) (ئورفا)ی

بەستەزمانیشیان کردە (شانلی ئورفا)، بەڵام نازانم بۆچی مێردینیان لەبیرکرد، دەی دەتوانن بەویش بڵێن مێردینی هەژار.

لادێکەمان لە نێو دەشتاییەکانی سنووری عێراق و سووریا و چیاکانی توور ئابیدینە، کە نزیکەی بیست ئەشکەوتی لێیە. بەپێی لێکۆڵینەوە جیۆلۆجییەکانیش بێت، ناوچەکە بە لانکەی شارستانیەت دادەنرێت، چونکە بەشێك لە ئەشکەوتەکانی سروشتین و هەندێکیشیان دەستکردی مرۆڤن. ناوچەکەمان ئاوی خواردنەوەی نەبووە، بەڵکو سوودیان لە باران وەرگرتووە بۆ ئاو هەڵگرتن و دواتر بۆ خواردنەوە و پێویستیی ڕۆژانە بەکاریان هێناوە، هەرچەندە بەم دواییانە لە ستێلیلێدا، یانی بە ناوە تازەکەی لە ئاکار سوودا، بە بۆڕی ئاویشیان دابین کرد بۆ ئەوێ، بەڵام پرۆژەکە سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە، لە سەردەمی منداڵیم کاتێك ئاوی هەڵگیراو تەواو دەبوو، بە وڵاخان ئاویان لە لادێکانی دەوروبەرمان یان لە کانیە بچووکەکانی ناو پاوانی ئاژەڵەکان دەهێنا.

داهاتی لادێکە، کەم تا زۆر، لەسەر کشتوکاڵی دێمی وەستاوە، ئەو بەرهەمانە تۆدەکرێن کە پێویستیان بە ئاودان نییە، وەکو گەنم، جۆ، نیسك، نۆك و قامیش، کە تایبەتە بە ناوچەکە. کزن و نۆکە ڕەشیش دەچیندرێت. لە زەوییە وەرد کراوەکانیش شووتی و گندۆرە و تەرۆزی وگەنمە شامیی سپی و هاشیك، دەچیندرێت، لەگەڵ (گەنەك) کە زۆر لە ڕوونی فاسوڵیای سۆیە باشترە و چەندان سەدەش ڕوونەکەی بۆ چرا و قوتیلکەی شەوان بەکارهێندراوە. ڕاستییەکەی، لادێکەمان بۆ ئاژەڵداری زۆر باشە، ئەشکەوتی گەورە گەورەی لێیە و لە ناوچەکەش هیچ دانیشتوویەکی بێگانەی لێ نییە، بۆیە، تەواوی لادێکە وەك یەك خێزان وان.

عوسمانییەکان، کاتێك، بۆ تاپۆکردنی زەویوزارەکەی، دێنە ناوچە کوردییەکان، لادێکەمان لە دەستی باپیرە گەورەم عەنتەرێ میهۆتەزە بووە، بۆیەش زەوییەکانی بەناوی ئەو کران. بەشێوەیەکی ئاساییش، دوای گەورە بوونی خێزانەکەمان و کۆچی دوایی باپیرەم، ئەو زەویوزارانە وەکو میرات بەسەر خزمەکانماندا دابەشکرا. لادێکەم هەر ٢٥ کیلۆمەترێك لە باکووری رۆژئاوای نوسەیبین دوورە. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوە ئارکیۆلۆژییانەی بەو دوواییەش کراون، دەرکەوتووە لادێکەمان لە دێر زەمانەوە تەنێ بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دێمییەوە سەرقاڵ نەبووە، بەڵکو چەندان ڕەزی ترێشی لێبووە، بەڵام ئەمڕۆ لەناو زەوییەکانمان تاقە مێوێکیش نادۆزرێتەوە. کەچی هێشتا هەشت دانە ئامێری بچووکی سەرەتایی کوشینی ترێ لە زەوی کۆنەڕەزەکان ماون. دۆزینەوەی چەندان سواڵەت لە دەوروبەری گوندەکەمان دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە بەر لە هاتنی ئیسلام، ناوچەکە بەشێوەیەکی فراوان بە دروستکردنی شەڕابەوە سەرقاڵ بووینە. بەڵام دوای قبوولکردنی ئەو ئایینە، دانیشتووانی ناوچەکە لە بەرهەمهێنانی شەڕابەوە ڕوویان لە دروستکردنی دۆشاوی ترێ کردووە.

لە لادێکەمان، ئەوانەی لە دەرەوەی ئەندامانی خێزانن پێیان دەڵێن جیران، ئێمە زەوییەکانمان بە قەد پێویستیی خۆمان دەچاند و ئەوەی دەماوە دەماندا دراوسێکانمان. وەك چۆن ئەوانیش بۆ هەموو کار و فەرمانێکی ئێمە ئامادە بوون. جگە لەوەی بەرامبەر ئەو زەوییانەی دەشماندانێ بۆ جووت کردن، لەکاتی هەڵگرتنەوەی خەلەوخەرمان، بەرامبەر بەکارهێنانی زەوییەکەمان، یەك لە دەی بەرهەکانیان دەدایێ، ئەو قۆناغانەی وەرگرتن و دانەوەش بە خۆشی و ڕەزامەندیی هەردوو لا دەبوو.

دوای هاتنی تراکتۆر و گۆڕانی سەردەمەکە چاوچنۆکی و هەڵپەکاری سەری قووت کردەوە. بۆیە، جیران گیان هەر یەکە و بەلایەکدا کەوتن و لە شار و شارۆچکەکان کەوتنە ناوچە هەژار نشینە سەربەهەشەکان و دۆخ و گوزەرانیان زۆر خراپ کەوتەوە. لەگەڵ ئەوەش، ئێستاشی لەگەڵدابێ کاتێ لەگەڵ ئەو دراوسێیانەمان یەکدی دەبینینەوە، وەك دۆستە نزیکەکانمان یەکدی لەباوەش دەکەین و ماچی ئەولا و ئەولای یەکدی دەکەین.

هەموو سەرکەوتنێك ئیلهام و سەرچاوەیەکی هەیە، بۆیە، لەو بڕوایەدام بەشێك لەسەرکەوتنەکانی قوتابخانە و هەندێکیش لە کایەی نووسەریم، لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە خێزانەکەمان ئاغایەکی بچووکی هەندێك زەویی ناوچەکە بووە. ئەودەمای زەویی ئاغاکان داهاتێکی بۆ خێزانەکانیان دابین دەکرد، باپیرانم و بابم و دوای ئەویش دایکم، هەمان نەریت و ڕێوشوێنیان گرتووەتەبەر و زەوییەکانیان وەبەرهێناوە. شوێنێکمان هەبوو پێمان دەگوت (ئۆدە)، چەشنی شوێنێکی هاوبەشی وەك کاروانسەرا و شوێنی نان خواردنی میوانان بوو، هەر ڕێبوارێکیش کە دەبووە میوانی ئێمە لەو ئۆدەیە، بەبێی هیچ بەرامبەرێك پێشوازیی لێ دەکرا و ڕێزی لێدەگیرا، جگە لەوەی ئەو دەنگبێژ و سترانبێژ و دەروێشانەی زوو زوو دەهاتنە لامان پارە و کەلوپەلیشیان وەردەگرت. بۆیە، ئەو کەلتوورە وەك چیرۆك و داستان و گۆرانی لەناو فۆلکلۆری کوردی ڕەنگی داوەتەوە. سۆفییەکانیش بە تەنیا و لەگەڵ دەفەکانیان دەهاتن و سروودی ئایینییان دەگوتەوە و قەسیدەی شاعیرانی کلاسیکی کوردیان دەخوێندەوە، کەچی پاش ئەو هەموو تەمەنە، ئێستا دەزانم بەشێکی زۆری شیعرەکان لە دیوانەکانی مەلای جزیری

و فەقێ تەیران دەردەهێندران. ئەوسا بەوانەیان دەگوت دەنگبێژ، دەنگبێژەکـــان لەزۆربەی کارەکانیـــان باســـی ئەو زوڵـــم و لەسێدارەدانە نـاڕەواو و کۆمەڵکـوژی و پەناهەنـدەیی و زامە بە ئازارانەی سەر کوردانیان دەکرد، کە لە سەردەمی عوسمانییەکان و سـەرەتای دروسـتبوونی کۆمـاری تورکیـا، بەرامبەر بە گەلـی کورد کرابوون.

دوای شکستی شۆرشـەکەی شـێخ سـەعیدی پیـران لە سـاڵی ١٩٢٥، کۆمەڵێك خێزانی کـوردی دەوروبەری لـیجە و دیجـلە و کولـــپ و دیـــاربەکر، دوای لە دەســـتدانی مێـــرد و مـــاڵ و منـــداڵەکانیان، کۆچیـــان کردبـــوو بـــۆ نـــاوچەکەی ئـــێمە و لە ئەشـکەوتە سروشـتییەکانی لادێکەمـان گیرسـابوونەوە. دایکـم و ژنـانی گونـد ئەوانیـان بەخێـو دەکـرد. لەنـاو ئەو خێزانـانەدا ئافرەتێکی بەتەمەن هەبوو ناوی خەجۆ بوو، ئەو لە شۆڕشی شێخ سـەعیدی پیرانـدا دوو کـوڕ و هاوسـەرەکەی و دوو زاوای لە دەســـتدابوو. ئەو ئـــافرەتە وەك دایکێکـــی جەرگ ســـووتاو و شـایەدحاڵێکی ڕووداوەکە، فرمێسـکەکانی دەهـاتەخوارێ و بە دەنگێکی زۆر خەمبار، بەسەرهاتەکەی ئاوا بۆ باسـدەکردین، کە دوای ٦٥ سـاڵ، هێشـتاش نـاتوانم ئەو دەنـگ و سـەدایە لە بیـر بـکەم، بـۆیە هەر کاتێـك باسـی دەکەم هەسـتدەکەم ڕووداوەکە تازە ڕووی داوە.

سەرەڕای دڵتەنگیمان بـۆ ئەو ڕووداوانە، بەڵام ئـێمەش وەکـو هەر منـداڵێك خۆشـترین کـاتی منـداڵیمان لە یـاریکردن بەسـەر دەبرد، کە چەندان یاری وەکو چاو شلکانێ و خەزالێ و هـۆلی و قیژم کاڵ و لاك و چەندان وازیی دیکەی لەو شێوە، کە ئێستا بیـرم نەمـاوە. کەلوپەلەکـانی یاریکردنیشـمان هەر کەلا و جـام و

پــارچە شیشــۆقی شــکاوبوو. جــگە لە ئاهەنگەکــانی بــووك گواســتنەوە. ئەوســا منــداڵە کچەکــان لەگەڵ منــداڵە کوڕەکــان و هەرزەکارەکانی لادێ یارییــان نەدەکــرد، چــونکە هەر دەرفەتــی بەیەکەوە یاری کردنیشیان نەبوو، بەوپێیەی یــاری کــوڕان زیــاتر توندوتیژی تێدابوو، یاخود زۆر جــار تەنیــا نیشانشــکانێ و یــاریی ســەرنجڕاکێش بــوون، وەك بڵێــی جۆرێــك لە پەروەردەیەکــی بچــووککراوەی ســەربازی بــێ. لەگەڵ هەنــدێك یــاریی وەك بۆکسێن و کاراتی. بۆ نموونە هەندێکیان شەرە بۆکسیان تێدابوو، هەندێکیان لەسەر خۆگری وەســتابوو، هەنــدێکجاریش هەنــدێك یاری مۆدێرنی وەك قاشوانێمان دەکرد، بەڵام نەك وەك منــداڵانی وڵاتانی پێشــکەوتوو بە کەلــوپەلی تــایبەتیی وازیــیەکە، بەڵکــو بە پارچە داری بڕاوە یارییەکەمــان دەکــرد. جــگە لەمــانە یــارییەکی دیکەش هەبوو دەمانکرد، بەڵام زیاتر هەرزەکارەکان حەزیان پێ دەکرد، ئەویش دارلاستیکانێ بوو، کە جەژنان دوو هەرزەکــاری کــوڕ لە لادێــکە، بەرامــبەر یەك لە دوورییەکــی دیــاری کــراو دەوەستن و بە دارلاستیك هێرشیان دەکردە ســەر یەکــدی، بۆیە شــوێنەکەش دەبــووە مەیــدانی جەنــگ، چــونکە هەم ئەوانەی یارییەکەیــان دەکــرد و هەمــیش ئەوانەی ســەیریان دەکــردن زۆربەی کــات برینــدار دەبــوون، بەڵام کەس پێــی دڵتەنــگ نەدەبوو، چونکە کەس ئەوەی وەکو دوژمنــداری لێــك نەدەداوە، بەڵکو پێیانوابوو ئەوە بەشێکە لە پەروەردەیەکی قارەمانــانە. بۆیە، گەر سەرنج بدەن زۆربەی لاوە کوردەکان بەو پەروەردە ئــازا و قارەمانانە تێدەپەڕین تا گەورە دەبــوون. ئینجــا کە گەورە دەبــوو

بۆ پرسینی تەمەنی کوڕەکان دەیانگوت گەیشتۆتە ئاستی چەك هەڵگرتن یان نا، کاتێك ئەو دەستەواژەیان بۆ من بەکارهێنا تەمەنم نزیکەی چواردە، پازدەساڵێك دەبوو.

وشکوبرینگیی ناوچەکەمان، وای کردبوو هەردەم خۆزگە بە ئاو بخوازین، زستانان کە کەندەکانی تنیشت گوندەکەمان هەڵدەستان و لافاویان دەکرد، ئێمەش لەگەڵ منداڵانی دراوسێمان لە کەنار لافاوی ئەو کەندانە هەستمان دەکرد لە قەراغ ڕووباری دیجلەیـن. وەك چۆن یەحیا کەمال دەڵێ: "سەڵتەنەتی پیاوی هەژار هەندەی نابا ". بۆیە کاتێك لافاوی زستان کەم دەبۆوە، ئێمەش خەمگین و دڵتەنگ بە دیار کەندێکی وشکەوە، چاوەڕوانی هاتنی زستانێکی دیکەمان دەکرد.

محەمەد پاشای گەورە وەزیری سەردەمی سوڵتان سلێمان، بەسەرهاتێکی لەگەڵ تەمەرهیندی (خەرنووپ) هەیە. ڕۆژێك گەورە وەزیر کاتێك لە باخچەی گوڵهانە لە ئیستانبوول پیاسە دەکات، یەکێك لە وەزیرەکانی خەرنووپێکی هەرە باش لێدەکاتەوە و پێشکەشی محەمەد پاشای دەکات، گەورە وەزیریش خەرنووپەکە وەردەگرێ و دەپرسێ ئەوە چییە؟ وەزیریش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: "پاشام بیخۆن، ئەوە حەلوای هێز و ئازایەتییە و چەندین دڵۆپە هەنگوینی تێدایە"پاشاش دیارییەکە دەداتەوە وەزیر و پێی دەڵێ: "هەتیوو من بۆ چەند دڵۆپە هەنگوینێك ئەو پەلکە ڕەقەیم پێ قوت نادرێ". بۆیە، یادەوەرییەکانی منیش وەك ئەو دڵۆپە هەنگوینانەی ناو خەرنووپەکەیە.

ئێمەی کورد سەری ساڵی خۆمان، کە نەورۆزە، لە بیر کردووە و سەری ساڵی ڕۆمیمان لە شوێنی ئەو وەرگرتووە، سەری ساڵی کوردی سێزدە ڕۆژ دوای یەکەم ڕۆژی مانگی یەکی میلادییە، ئەوسا و تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، بەم جۆرە لەسەرجەم لادێکان یادی دەکراوە. بنەچەی نەورۆزی سەری ساڵی کوردیش بە واتای ڕۆژێکی نوێ دێت، لەهەمان کات بە جەژنی ڕزگار بوونیش دادەندرێت. کاوەی ئاسنگەری پاڵەوانی کورد، ئەوسا دژی زوڵم و زۆرداریيەکانی زوحاك ڕادەپەڕێ و ئەو خوێن مژە دەکوژێ، بۆیە ئەو ڕۆژە وەك هێمایەکی ڕزگاریخوازی گەلی کورد یادی دەکرێتەوە. لە مێژووی کۆندا کورد سەری ساڵ و نەورۆزیان، وەك جەژنی ڕزگاری کاوەی ئاسنگەر لە ۳۱ تەباخ دەکردەوە، بەڵام دواتر بەرواره‌کەیان گۆڕی. ئێستا بەپێی لێکدانەوەی بەرواری کۆن ئەو یادە لە شەوی ۲۱ی نەورۆز دەکرێ. لە سەرچاوە عەرەبی و فارسی و ئەرمەنی و بیزانسیەکاندا بە(عیدی کوردی) واتا جەژنی کوردی ناوی هاتووە، بۆیە، ئەمرۆش لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین تورك و عەرەب و فارس ڕق و قینیان بەرامبەر نەورۆز لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

لە سەری ساڵی ڕۆمی هەموو خێزانێکی کوردستان، بەپێی داهات و تواناکانی، ئامادەکاری بۆ ئەو ڕۆژە دەکات، منداڵ و لاوانی گوندیش یەکێك لەنێوخۆیان هەڵدەبژێرن و جلی سەیر سەیری وەك پالیاچۆی لەبەر دەکەن و بە چەندان ڕەنگ بۆیەی دەکەن، لە کوردیدا پێی دەڵێن (قردك)، بۆیە منداڵ و لاوانی گوندی یەك بە دوای یەك لەگەڵ ئەو کەسەی قردکی لەبەرە

ماڵ ماڵ بەناو لادێدا دەگەڕان و بێژەی کوردیان دەگوتەوە و داوای دیارییان لە ماڵان دەکرد. بۆ نموونە لە منداڵیمەوە تا ئێستا ئەو بێژەیەی ئەوسام هەر لە بیر ماوە:

"سەری ساڵ و بنی ساڵێ

خوا بیهێڵێ

گەنجی ماڵێ

بینن کوانێ دیاری ماڵێ".

بەم جۆرە خاوەن ماڵ بە شادییەوە دەستیان بەسەری منداڵەکان دادەهێنا و پارە، یاخود ئەو خواردنە وشکانەی پێشتر بۆ ئەو ڕۆژە ئامادەیان کردبوو، وەك دیاری دەیانبەخشی. جگە لەمانە ڕەوەندە موتریبەکانیش سەری ساڵان کەڵەشێرێکی جوانیان دەبەستەوە و دەیانهێنا دیوەخانی گوند و کەڵەشێرەکەیان لە کۆشی ئاغا دادەنا، ئاغاش دوای وەرگرتنی دیارییەکە بە سەربەرزییەوە کەڵەشێرەکەی دەداوە خاوەنەکەی و بای پێویست بەخشیشی دەبەخشییە ئەو کەسەی دیارییەکەی هێنابوو. ئەم دابونەریتەش لە ئایینی زەردەشتی کورددا، لە مەلەکی تاوس سەرچاوەی گرتبوو، لەبەر ئەوەی ئەو ڕەوەندە بەستەزمانانە نەیاندەتوانی تاوسێك بگرن و گوند گوند بیگێڕن، بۆیە بە وەکالەتی تاوس، کەڵەشێریان لەگەڵ خۆیان دەهێنا، چونکە کەڵەشێریش لە کوردەواریدا وەك باڵندەیەکی بە ناموس دەبیندرێ.

یەکێك لە یادەوەرییەکانی دیکەم لەگەڵ بێریانە، کە بەلامەوە لە هەنگوین شیرینترە. ئەها لەناو کورددا ناوی بێریڤان زۆرە. لە ئاژەڵداریدا خاوەن مێگەل بە ژماردنی پێنج مانگ، بەران و تەگە

بەر دەدەنە ناو مەڕ و بزنەکانیان، چونکە ماوەی ئاوسبوونیان ئەو ئاژەڵانە پێنج مانگە، هەرچەندە بەپێی کەشوهەوای هەر ناوچەیەك زانی ئاژەڵەکان بە گوێرەی تێپەڕینی چلەی زستان دیاری دەکرێ. بۆ نموونە لای ئێمەکەلدان لە مانگی ڕەزبەرێیە، بەم جۆرەش لە مانگی ڕەشەمێش دەزێن. بۆیە، مانگی دوو و مانگی سێ ئاژەڵە زاوەکان نادۆشرێن و شیرەکانیان بۆ بێچووەکانیان جێدەهێڵدرێ، بەڵام لە مانگی چوار دوای ئەوەی هەموو لایەك دەبێتە گژوگیا و ناوچەکە سەوز دەبێ، ئینجا بێری دێنە بێرێ و ماڵات دەدۆشرێن، وەك نەریتێکیش ئەم کارە کچ و ئافرەتە گەنجەکان دەیکەن. ئەوان بەر لەوەی بچن بۆ دۆشین ئامادەکاریی خۆیان دەکەن و پێویستییەکانی خۆیان کۆدەکەنەوە و مەنجەڵ و هەمبانەکانیشیان لەناو جانتایەکی گەورەی ڕەنگاو ڕەنگ لەگەڵ خۆیان دەبەن. بێری بە گۆرانی و کەیف خۆشییەوە دەچنە بەربێرێ، ئێمەی منداڵیش ئەوسا بەگەڵیان دەکەوتین و لەناو دەشت و سەوزایی بەهار بە ڕاکردن و هەڵپەڕ و داپەڕەوە بەشداریی ئەو خۆشییەمان دەکرد، ئامانجیشمان لەو چوونەی ئەوەبوو کەفی سەر شیری ناو مەنجەڵی بێرییەکان بە دەستی بخۆین. هەرکە بێریش دەگەیشتنە بەربێرێ، واتە ئەو جێیەی شوان مێگەلەکەی لێ ڕاگرتبوو، شوان جوانترین بەرانی ناو مێگەلەکەی هەڵدەبژارد و زەنگوڵەیەکی لە قۆچی دەبەستا و دەیهێنا پێش سەربێرێ، ئەوجا کچی ئاغا یاخود کچی خاوەن مێگەل لە ناو بێرییەکان بەرانەکەی وەردەگرت و قۆچی ئاژەڵەکەی دەگرت و بەخشیش یان دیارییەکی دەدا شوانەکەی، دوایەش بەرانەکەی ڕەوانی ناو مێگەلەکەی دەکردەوە.

منداڵان چۆن بەشداری بەزمی بێرییان دەبوون، ئاواش لە جەژنە ئایینیەکان یان لە ئاهەنگەکانی بووك گواستنەوەش

جلوبەرگی تایبەتیان لەبەر دەکرد و لەپی دەست و قژمان بە خەنە دەکرا و بەزم و ڕەزمێکی خۆشمان دەکرد، چونکە منداڵی کورد لە زۆر شتی دیکە بێبەشە و دەبێ ناچار چێژ لەو بۆنانە وەربگرێ.

دەتوانین بڵێین لە زۆربەی ئاهەنگەکانی بووکگواستنەوە منداڵان بەشە دیاریی خۆیان هەبوو، کاتێك بووك دەگاتە بەر دەرگای ماڵی زاوا، منداڵان تا دیارییان وەرنەگرتبا، نەیاندەهێشت بووك لە پشتی ئەسپەکەی بێتە خوارەوە. زاواش، ئەو سینییەی شیرینی و پارەی لەناو داندرابوو لەگەڵ خۆی دەهێنا، گەورەی خێزانیش دوای دیاریی دەدا بووکێ، ئینجا منداڵەکان، ئیدی بووك لە پشتی ئەسپەکە دەهاتە خوارەوە بەرەو ماڵ هەنگاوی دەنا، بەر لە چوونە ژوورەوە زاوا سینییەکەی لە دەست دەخرا خوارەوە و پارە و شەکرۆکە بەو ناوەدا پەروش و بڵاو دەبووەوە، ئێمەی منداڵیش لەبەر دەست و پێی بووك و زاوا بە هەڵبەز و دابەز دەمانویست چەندی پێمان بکرێ پارە و شەکرۆکەی سەرزەوییەکە هەڵگرینەوە. سەیر ئەوەبوو لەکاتی کۆکردنەوەی شیرینی و پارەکان، جگە لە بەها مادییەکەی بۆ ئێمەی منداڵ، خێزانەکانیشمان دەیانبینین و بۆیان دەردەکەوت کامەمان چاو برسی و کامەشمان بزێو و وریا و چاپووکە لە کۆکردنەوە.

منداڵانی کورد بۆنەیەکی دیکەی ترش و تاڵیشیان هەیە، ئەویش کاتی سوونەتکردنیانە. گەرچی سونەت واتا جێبەجێکردنی ئاکارەکانی حەزرەتی محەممەد، بەڵام کورد و یەهوودی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین هەزاران ساڵ بەر لەهاتنی ئیسلامیش سونەتکراون، ئاخر پێش ئەوەی پزیشکیش بێنە

ناوچەکەمان، شێخەکانی تیلۆی سیرتی بۆ سونەتکردنی منداڵان تا ئیستانبوول و میسر ڕۆیشتوونە. لەگەڵ هاتنی بەهار سەرجەم شێخەکان هەر یەکە و بەلایەکدا دەچوون، تا وەك ئەرکێکی ئایینی مەراسیمی سونەتکردنی منداڵان جێبەجێ بکەن، بۆیە، هەموو کەس چاوەڕوانی هاتنی بەهار و شێخیان دەکرد، هەرچەندە شەرمیشە بەڵام دەمەوێ باسی کاتی سونەتکردنی خۆم بکەم. بیرمە ئەوسا لە نوسەیبین بۆ ڕۆژی سونەتەکەم جلوبەرگی جوانیان کڕی و سەریان لەخەنە گرتم و بە شەمێی هەنگوینیش چەناغەیەکی زێڕیان بەسەر نیوچاوانیدا شۆڕکردمەوە و ئاهەنگێکی گەورەم بۆ سازکرا و چەندان جۆر خواردن لێنراو هەرکەسە و بە دڵی خۆی پڕ بە سکیان نانیان خوارد. ئەوسا لە قوماشی شامی و مووسڵی جێگایان بۆ دروستکردم و بۆ سەرقاڵکردنیشم چەندان جۆر شەکرۆکەی ڕەنگا و ڕەنگ و پرتەقالیان بۆ کڕیم، هەرچەندە لە سەردەمی ئێمە منداڵان پرتەقاڵیان بۆ خواردن نا بەڵکو بۆ بەشێك لە یاری کردن بەکار دەهێنا. دەمزانی سونەت چییە، بەڵام نەمدەزانی چۆن بە چەقۆی تیژ و پلایس کارێکی خوێناوی و ئازار بەخش دەکرێ، ئیدی کاتی سونەتکردنەکەم هات و کیرڤەم منی لە باوەشی خۆی دانا و ئەو شێخەی هاتبوو بۆ سونەتکردنم، کۆمەڵێك دووعای عەرەبی خوێند، بەڵام من هێشتا هەستم بە ترسەکە نەکردبوو، لە پڕێکدا یاشێخ لاقەکانمی لێك کردەوە و لەچاوقوچانێکدا کارەکەی تەواو کرد و منیش زیرەم گەیشتە حەفت تەبەقەی ئاسمان، شەکرۆکەیان خستە زارە کراوەکەم و خۆشترین شیرینییان پیشاندام، تا ئەو ئێشەم لە بیر ببەنەوە.

ئەو شێخانەی سونەتیان دەکرد، دوای کارەکەیان، چەند چارەسەرێکیان لە برینی منداڵەکە دەدا و هەندێکیشیان بۆ

بەکارهێنانی چەند ڕۆژێکی دواتر جێدەهێشت. ئەو دەرمانانە لە چیاکانی کوردستان کۆدەکرانەوە، شێخەکانی تیلۆش ناو و شوێنی چاندنی ئەو گژوگیایەیان بە کەس نەدەگوت، بۆیە دوای چەند ڕۆژێك لە وەرگرتنی دەرمانەکانیان، برینی سونەتەکەم چاك بوونەوە و وردە وردە گەڕامەوە ناو منداڵان بۆ یاری کردن. دوای ۳۰ ساڵ چوومە تیللۆ و پرسیاری ئەو گژوگیایانەم کرد، کیرڤەم نەوەی شێخ تاهیر مستێکی لەو گژوگیا سروشتییانە دامێ، بەڵام بە داخەوە لە ساڵی ۱۹۵۹ کاتێك دەستگیرکرام هەموویم لێ ون بوو، بۆیە دەمەوێت گەنجانی کورد بچنە تیللۆ و لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ ئەو گژوگیایە بکەن و لە چیاکانی ناوچەکەش بەدوای ئەو گژوگیایانەدا بگەڕێن، تا وەك چارەسەرێك سوودی لێببینن، کە هیچ زیانێکی لاوەکیی بۆ جەستە نییە، لە بری ئەنتیبایۆتیك و دەرمانەکانی ئازار شکاندن بەکاریان بهێنن.

لە گوندی، لە دوازدە مانگی ساڵ حەفتیان لەسەر بانی دەخەوتین. دایکم خوێندەوار نەبوو، بەڵام زانیارییەکی زۆری لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی هەبوو. خەڵك لەسەر بان زۆربەیان لەسەر قەروێلە، یان تەختەیەك دەخەوتن، لەبەر ئەوەی بابم لەوێ نەبوو، بۆیە من و خوشکی گەورەم و سێ برا بچووکەکەشم بەیەکەوە دەخەوتین، چونکە تەختەکەمان ئەوەندە گەورە بوو، جێگای هەموومانی لێدەبۆوە، بە شێوەیەك لە کاتی دروستکردنیدا شوێنی بێشکەی منداڵانیشی تێدا جیاکرابۆوە. لە کاتی نووستن هەموومان وەك جووجەڵە دەمانویست خۆمان بخەینە پاڵ دایکم. دایکیشم هەم بە میهرەبانییەوە دەستی بەسەر ئێمە دادەهێنا و هەمیش چیرۆکی بۆ دەگێڕاینەوە و هەمیش ناوە ناوە ئەستێرەکانی ئاسمانی پێ دەناساندین. لەناو ئەستێرەکان

دانەیەکیان هەبوو بە ناوی ئەستێرەی عەشق، یەکێکیان ناوی ئەفسوونی دژە دوو پشك پێوەدان بوو، هەشیانبوو ناوی ڕۆحی پێگەیاندنی میوە بوو. لە سەیرکردنی ئەستێرەکاندا زۆر سەرسام بووم بەوەی شەوان کاتێك هەندێك لە ئەستێرەکان ڕێگای خۆیان ون دەکرد و بە سەیرکردنی ئەستێری قوتبی ڕێگای خۆیان دەدۆزیەوە. هەر ئەستێرە و ناوی خۆی هەبوو، بۆ نموونە مانگی گەورە ناوی جەنازەی ئەستێرەی مەریخ بوو، مانگی بچووکیش ناوێکی دیکەی هەبوو. ئەو ئەستێرەی دەکەوتە لای ڕاستی ئەستێرە گەورەکە، گەر بمانتوانیبا بچوکەکەیان ببینین، ئەوە ئەو نزایەمان دەخوێند بۆ هاتنەدی مرازەکانمان: "ئەی جەنازەی مزراقی ئادەم، من ئومێدی خۆم لە تۆ دەوێت".

جگە لەمانە ئەستێرەی لەیلا و مەجنوون هەبوو، لە بەهاران مەجنوون لە باکوور بە دیار دەکەوت و لەیلاش لە ڕۆژئاڤا، لە یەکێك لە ڕۆژەکانی مانگی تەباخ لەیەك نزیك دەبنەوە و لە شەوێکدا بەیەك شاد دەبن و دواتر لەیەك تێپەڕ دەبن. بۆیە، ئەو گەنجەی لە کاتی بەیەکگەیشتنی ئەو دوو ئەستێرەیە هەر چی مرازێك لە دڵ بگرێت بۆی دێتە دی. هەرچی ئەستێرەی پیر و مەزنە لەگەڵ هاتنی هاوین لە باکوورەوە بەرەو باشوور شۆڕدەبنەوە، کاتێکیش ڕێك دێتە بەرامبەر ئاڕاستەی قیبلە، بەرهەمی ترێ و گندۆرە و شفتی ڕوویان لە زیادبوون دەکرد.

## کێشەی زمان

ساڵ لە دوای ساڵ، سەردەم دەگۆڕا و خەڵك وەك پێشوو نەدەمان،**"هەموو دونیا بوونە حکوومەت و کوردیش ڕابوون"**[1]. ئیدی کۆماری تورکیا وردە وردە خۆی ڕێکدەخست و ناحیە و قەزا و پارێزگای تازە دروست دەبوون. ئیدی ژەندرمە و فەرمانبەرانی میری و باجەستێن دەچوونە لادێکان، ژەندرمە دەچوونە ئەو شوێنانەی پێشتر نەیانتوانی بوو بیگەنێ، لەگەڵ چوونیشیان دەستیان لە زوڵمکردن نەدەپاراست. خێزانەکەمان خاوەنی گوندەکە بوو، لەبەر ئەوەی باوکم لەسەر جێگا کەوتبوو و پیاوێکی وەهاش نەبوو جێی بگرێتەوە و کارەکانی لادێکەمان ڕاپەڕێنێ، بۆیە، دایکم کاری موختاریی گوندەکەمانی لە ئەستۆ گرت. بۆ ئەو سەردەمە موختارێکی ئافرەت شتێکی سەیر بوو، لە کاتێکدا گەر تەواوی ناوچەکە، بە فانۆسیش گەڕابای کەسێکت نەدەدۆزییەوە تورکی بزانێت. ڕاستە ئەوانەی دەهاتن بۆ سەرانە وەرگرتن خەڵکی ناوچەکە بوون، هەر بۆیەش بە ئاسانی لەیەك دەگەیشتین، بەڵام لەگەڵ هاتنی ژەندرمە، هەموو شتێك ئاوەژوو بووەوە، چونکە لە داواکارییەکانیان تێنەدەگەیشتین، ئاخر نەماندەزانی هێلکەیان دەوێ، مریشکیان پێویستە، یان بەرخ و دار و پارەیان دەوێ بۆ بنکەکانیان، بۆیە، لەگەڵ ئەوەی ڕازیش بووین بەوەی چییان دەوێ بیاندەینێ یان هەر شتێك بۆخۆیان پێویستیانە بیبەن، ئەو لەیەك نەگەیشتنەمان دەبووە هۆکاری ئەوەی تێروپڕمان لێبدەن و بە جوێن و قسەی

---

[1] ئەحمەدی خانی.

ناخۆش بمانشۆنەوە، چونکە ئەوسا واماندەزانی حکومداری ئاوایە و دەوڵەت چی بوێت دەبێ بیدەیتێ. بۆیە، نەزانینی زمان ئێمەی پەرێشان کردبوو، بەتایبەتی دایکم زۆر پێیەوە سەغڵەت دەبوو، بە شێوەیەك تەنیا بۆ ئەوەی لە زمانی ژەندرمە تێبگەم و بزانم چییان دەوێ، منی ناردە بەرخوێندن.

ئەوسا تەلەفۆن و ئۆتۆمبێل و ئامرازەکانی گەیاندن لە لادێکەمان نەبوو، بۆیە ژەندرمە نووسراوە فەرمییەکانی دەوڵەتیان لە نوسەیبینەوە بە دوو ژەندرمە دەنارده ناحیەکەی ئێمە لە ئاکار سوو، لەوێشەوە دوو ژەندرمەی دیکە دەچوون و نووسراوەکانیان لە شوێنێکی دیاریکراو لەوان وەردەگرت، زۆربەی کات شوێنی وەرگرتنی ئەو نووسراوەشیان لە زەوییەکانی ئێمە لەناو شینایی گندۆرە و شفتی دەکرد. ئێمەی منداڵ کاتێ ئەوانمان دەبینی، خۆمان لە کونجێك دەشاردەوە و سەیری ژەندرمەکانمان دەکرد. ئەوان دوای ڕادەستکردنی نووسراوەکان، ئەو چوار ژەندرمەیە پازدە بیست بڕکە شفتی و گندۆرەیان لە ڕەگەوە هەڵدەکێشا تا چەند دانەیەك بۆ خواردن بدۆزنەوە، چونکە نەیاندەزانی کامەیان کارکە و کامەشیان گەییوە. ئەوان پێیانوابوو هەرچی قەبارەی گەورە بووە، واتا پێگەیشتووە و بۆ خواردن دەشێ. لە کاتی ڕۆیشتنیشیان تێروپڕ جنێویان بە خاوەنی شینایییەکە دەدا و گندۆرە و شفتیەکانیشیان دەدا بەر شەق. ژەندرمەکان نەیاندەزانی دەبێ کامەیان بڕنن، کەچی ئێمە بەو تەمەنە بچووکەمانەوە دەمانزانی کامە بۆ خواردن دەشێ، بەڵام لەبەر ئەوەی زمانی ئەوانمان نەدەزانی، بۆیە نەماندەتوانی تێیان بگەیەنین، جا گەر بشمانزانیبا لێیان دەترساین و نەماندەوێرا نزیکیان بکەوینەوە، چونکە ئێمەیان بە پیاو نەدەزانی. دوای ئەوان، گەورەکانی گوند کاتێك دەهاتنە سەر شینایی، کاڵەك و شووتییە کارك و

فڕێدراوەکانیان کۆدەکردەوە و دەیانکردە خواردن بۆ ئاژەڵان، کاتێکیش دەمانگوت ژەندرمە وای لەو بەرهەمانە کردووە، گەورەکان بە کارێکی ئاساییان وەردەگرت، بەڵام ئێمە سەیرمان پێدەهات، پێم وابێ گوندییەکان باوەڕیان بەوە هێنابوو ژەندرمە چی بکات ئەوە ڕاستە، چونکە ئەوان بە فەرمانی حکوومەت تێمان هەڵدەدەن و جنێوبارانمان دەکەن و تەڕ و وشك بەیەکەوە دەسووتێنن.

ئەوسا بە ژەندرمە دەگوترا (ڕۆمی)، ئێستاش هەر ئاوایان پێدەڵێن. سەردەمانێك دوای ئەو ڕووداوانە، لە وشەی ڕۆمیم کۆڵییەوە و گەیشتمە ئەو ئەنجامەی ئەو ناوە لەوەوە هاتووە کە شاعیری گەورەمان ئەحمەدی خانی لە پێشەکی دیوانی ناوداری مەم و زیندا دەڵێ: "ڕۆم و عەرەب و عەجەم"واتا تورك و عەرەب و فارس. چونکە سەرەتا ڕۆم و بیزانسییەکان کوردستانیان داگیرکردووە، چونکە ئەو سەربازانەی بە تەنیا و بەبێ خێزانەکانیان هاتوونە ناوچەکە، جگە لە زوڵم و زۆرداری و بێناموسی هیچی دیکەیان لە دوای خۆیان جێ نەهێشتووە. تورکیش، دوای موسوڵمان بوونیان، بە فەرمانی خەلیفەی عەباسی و بە هاوکاری دەوڵەت و فەرمانڕەوای کوردان ڕاستەوخۆ لە کوردستانەوە تێپەڕ بوونە، بەڵام لە ناوچەی ئەنادۆڵ ماونەتەوە و جێگیر بوونە، ئینجا لەگەڵ ڕۆم و بیزانسەکان بەشەڕ هاتوونە و ئەوێیان کردۆتە نیشتمانی خۆیان. تورکیش وەك ڕۆم و بیزانسەکان کاتێ سەربازەکانیان هاتوونە، هەمان مامەڵەیان لەگەڵ کورد کردووە، بۆیە، کوردیش هەمان ناوی بۆ سەربازە تورکەکانیش بەکار هێناوە و پێیان گوتوونە ڕۆمی، بەشێوەیەك ئێستاش بەرامبەر بە مامەڵەی خراپی سەربازانی تورك، کورد دەڵێ (ڕۆمی ویژدانی نییە).

هەمـوو ئەو ڕووداوانە زیـاتر هـانی دەدام بچـمە قوتابخـانە و فێـری تـورکی بـبم. ئەوسـا خەڵکـی ناوچەکەمـان کە زانییـان دەمەوێ بچمە بەر خوێندن، زۆریان پـێ سـەیر بـوو، لەبەرئەوەی دەیـان سـاڵ بـوو هەنـدێك کـاری وەك مـزگەری و ناڵبەنـدی و ڕسـتن و چنـین و کـاری پەمـۆ و ئەفەنـدیاتی، واتـا زانینـی خوێندنەوە و نووسین وەك کارێکی شـەرمە سـەیر دەکـرا، بـۆیە زۆر کەس لە ژیانم بە ڕاسـت و ڕەوانـی پێیـان دەگـوتم: "شـێخ مووسا شەرم نییە دەچییە قوتابخانە، یانی دەبییە ئەفەنـدی و ئـێمە سەرشۆڕ دەکەی؟"بەسەرێك هەقیـان بـوو، چـونکە بەشـێکی زۆر لەو خوێندەوارانەی تووشیان دەبوون کلاوچی و ترسنۆك و خـۆ فرۆش بوون.

دایکم لە مانگی ڕەشەمێی ساڵی ۱۹۲۷ منی بۆ خوێندن ناردە (کەرجۆوس)، مامۆستا ئیبراهیمی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە وەکـو گـوێگر وەریگـرتم. دوای تەواو بـوونی قوتابخـانە گەڕامەوە لادێکەمان، لەو ماوەیە چەند وشەیەکی تورکی وەکو (نان، ئـاو، دار، وەرە - بڕۆ، ناوت چییە) فێر ببووم، بەر لە چوونیشـم چەنـد وشەیەکی وەکو (کەڵەشێر و مریشك و قەل و هێلەکەم) دەزانی، چـونکە لەنـاو ئەلفـوبێی زمانەکەمانـدا هەبـوو، بـۆیە، دایکـم لە خۆشییان هەستی دەکرد هەموو دونیا بـووەتە هـی ئەو. ئەمە وای کرد کاتێك لە هاوین ژەندرەمە هـاتنە لادێکەمـان تووشـی هـیچ کێشـەیەك نەبـین و لێدانیشـمان بەرنەکەوێـت، چـونکە کێشـەمان ئەوە نەبوو چییان دەوێ بیاندەینێ، بەڵکو کێشەکە تێکنەگەیشـتن بوو، منیش ئەوەندە فێـر بـبوم لە داواکـاریی ژەنـدرمەکان بـگەم. سـاڵی دواتـر لە نوسـەیبین بـوومە قوتـابیی پـۆلی یەك، قوتابخانەکەمـان لە پێـنج پـۆل پێکهـاتبوو، بـۆیە، دوو مامۆسـتا

وانەیان دەگوتەوە، یەکێکیان ناوی تاهیر هەڵەبی بوو، ئەوی دیکەشیان مامۆستا حەمدی گوێ گرانی ناودار بوو. حەمدی گوێ گران وانەی بە پۆلی یەك و دوو و سێ دەگوتەوە، قوتابییەکان لە وانەی ئەو دەنگە دەنگیان دەکرد و جنێویان پێدەدا، بەڵام ئەو گوێی لێنەدەبوو، بۆیە، منیش لە دوو مانگ زیاتر نەمتوانی خۆم بگرم و لە داخان قوتابخانەم جێ هێشت و گەڕامەوە ماڵەوە و جارێکی دیکەش نەگەڕامەوە ئەوێ. ئەوسا نوسەیبین شوێنێکی وێران و پیس و بێزەوەر بوو، ڕۆژانە ڕووبەڕووی یەك دوو جەنازە دەبووینەوە. ئەوسا بەپێی قانوون دەبوو تەنیا لە دووریی پێنج کیلۆمەتر لە شوێنی نیشتەجێبوونەوە مەرەزە بکرێ، بەڵام کاك نەدیم و مەحموود ئادڤانی دیاربەکری لە خێزانی (پرینچ چی ئۆغلوولاری) لە دیار بەکرەوە تا نزیك نوسەیبین مەرەزەیان دەکرد و بە بەرتیل ڕاپۆرتی چاندنیان دەکردە پەنجا کیلۆمەتر، بۆیە، لەگەڵ ئەو بینە و بەردەی کێشەی تۆکردن و پیسی و وێرانیی نوسەیبین و بینینی جەنازەی زۆر، دایکیشم مافی بە مندا و جارێکی دیکە نەیناردمەوە ئەوێ. لەو ماوەیەدا بەمەبستی نەژاد گۆڕین چەند قوتابخانەیەکی تازە، کە قوتابی دەیتوانی هەرلەوێش بژی لە چەند لادێیەك کرانەوە، بەڵام لەوێ منـــــــــــــدالی هەژار و نەداری ڕەش و ڕووت وەرنەدەگیران، بەڵکو منداڵی ئاغا و دەوڵەمەندەکانی دەوربەری مێردین دەخرانە بەر خوێندن. بۆ نموونە لەو قوتابخانانە لە ئاغاکانی عەشیرەتی ئۆمەری، کوڕی ئەحمەد سولەیمان و دوو برازای و منداڵی مامەکانی و لە عەشیرەتی سورگوچیان، سێ کوڕی عیسا ئاغا و دوو منداڵی بنەماڵەی ئاڤێنیان و دوو منداڵی ئەکمەلەدینی کەرجەوس و دوو کوڕی مەحموود ئاغای لە

عەشیرەتی کیکان و دوو کوڕی مەحموود ئاغا و دوو منداڵیش لە عەشیرەتی شەمیراخ و چوار منداڵیش لە عەشیرەتی ئۆمەریان و چەند قوتابییەکی دیکە لە دێرك و خۆسەر و ماهشەرتە وەرگیران و بە من ڕابووینە ٩٠ قوتابی.

حکوومەت ئەو پلانەی وا دانابوو، گەر هات و سەرۆکی عەشیرەتەکان ئاسمیلە بوون، دواتر تەواوی ئەو عەشیرەتە ئاسیمیلە دەبن، بەڵام دەتوانم بە دڵخۆشییەوە بڵێم وەك ئەوەی ئەوان بۆی چووبوون پلانەکەیان وا دەرنەچوو، چونکە جگە لە چەند کەسێکی کەم نەبێت کە دەستمان بە خوێندن کرد، نە من و نە منداڵەکانی دیکە دواتر جاش دەرنەچووین، سەرەتا ئێمەی منداڵانی لادێ، وەك چۆن تورکیمان نەدەزانی، ئاواش لەو پیلانەی حکوومەت ئاگادار نەبووین. نەك تەنیا ئێمە بەڵکو گەورەکانیشمان هەستیان بەو پیلانە نەکردبوو، بۆیە، لە ئەنجامدا دوای ئەوەی حکوومەت لە ساڵی ١٩٣٥ بۆی ڕوون بۆوە ئەو پیلانەی دایان نابوو سەرنەکەوت، سەرجەم ئەو قوتابخانانەی لە لادێکان کردبوویانەوە بە فەرمانێك دایانخست، چونکە سەرەتا ئەو قوتابخانانەیان وەکو بەردەوامیی قوتابخانەی حەمدیە کردبۆوە. دواتر بەشێك لە قوتابییەکانی قوتابخانەکەم لەگەڵ کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان کوژران و بەشێکیشیان بەرەو حەلەب کۆچیان کرد.

## مێردین

لە مێردین، پێنج قوتابخانە هەبوو، وانەی مۆسیقای ئەو قوتابخانانەش کەمانژەنی موشلی، کاك تۆفیق دەیگوتەوە، لەبەر ئەوەی یەکەمجار لە مێردین لەگەڵ نۆتەی مۆسیقا کەمانی ژەندبوو، بۆیە پێیان دەگوت دۆمیرۆ. تۆفیقە فەندی ڕۆژێك لە وانەیەکمان، بە کەمانەکەی پارچە مۆسیقایەکی گۆرانییەکی زۆر خۆشی بۆ ژەنین، دوای تەواو بوونی ڕووی لە ئێمە کرد و پرسی: "ئەرێ کەستان دەزانن گۆرانی ئەو پارچە مۆسیقایە چییە؟". من دەمزانی، بەڵام وەڵامم نەداوە، چونکە گۆرانییەکە کوردی بوو، ئەوساش لەناو شارەکان قسەکردن بە کوردی قەدەغە بوو، دەوڵەت هەر کەسێکیشی گرتبا کە بە کوردی قسە دەکا بەرامبەر بەکارهێنانی هەر وشەیەك لیرەیەك سزای بەسەر دەسەپاند، بۆیە مێردین ببووە کامپی کەڕ و لاڵان، لەبەر ئەوەی بە ئاشکرا لە دەرەوە نەیاندەتوانی قسە بکەن، بۆیە ناچار بۆ لەیەکگەیشتن بە هێمای دەست لە نێوان خۆیاندا پەیوەندییان دروست دەکرد. من بەو ترس و تۆقینەوە سەرەتا دەستم هەڵبڕی و ویستم وەڵامی مامۆستا بدەمەوە، بەڵام دواتر پاشگەز بوومەوە، بەڵام مامۆستاکەمان منی بینی، بۆیە گوتی: "هەستە کوڕم مەترسێ و بیڵێ"، منیش بەو قسانەی مامۆستا غیرەتم پەیدا کرد و گوتم ئەو گۆرانییە"بەردە بەردە بەردا بەردە لاوك دەستێ من بەردە"یە، بەرامبەر وەڵامەکەم تۆفیقە فەندی گوتی: "هەر بژی ئافەرین".

لەسەر ئەو بابەتە دەمەوێ نموونەیەکی دیکەش باس بکەم. لە

گوندەکانەوە خەڵك بارە داریان بە سواری کەران بۆ فرۆشتن دەهێنا مێردینێ، ئەو دارانە پەنجا – شێست قروشی دەکرد، بەڵام گەر باش با ئەوە پێنج – شەش لیرەی دەکرد. ئەو گوندییە کوردانە کاتێ لە کەر دەخوڕنەوە دەڵێن: (چۆ – حەچە). ئەو گوندییە بەستەزمانانە تورکیشیان نەدەزانی و بەبێ ئەوەی ئاگاداری هیچ بن، لە مێردین کاتێك بە کەرەکە دەڵێن حەچە، ژەندرمە کە پێشتر تەڵەی بۆیان دانابۆوە، بەسەریان دادەدەن و تێر قسەی ترش وتاڵیان پێدەڵێن و بە زەبروزەنگ دەستگیریان دەکەن. گوندی قوربەسەریش کاتێك دەیەوێ بەرگری لە خۆی بکات بە کوردی دەدوێ، بەڵام بێ ئاگا لەوەی خۆی ڕووبەڕووی تاوانێکی گەورەتر کردۆتەوە. یەکێك لەو کەسانە ناسیاوێکی دایکم بوو، ئەو دوای ئەوەی بارەکەی، بە ٥ لیرە فرۆشتبوو، لەلایەن ژەندرمەوە دەستگیردەکرێ و بە تۆمەتی قسەکردن بە زمانی کوردی دوازدە لیرە سزای بەسەردا دەسەپێنن و دوو ڕۆژیش دەستگیری دەکەن و دوای ئەوەی تێروپڕی لێدەدەن ئینجا بەری دەدەن. دوای سێ مانگ و نیو، باج وەرگرەکان دێنە گوند و داوای ئەو حەفت لیرەی لێدەکەن کە لەسەری مابوو، ئەگەر نەیشیدا دەست بەسەر تەواوی ماڵ و موڵکیدا دەگیرێت. لەبەر ئەوەی باج وەرگرەکان بەتەنیا نەدەهاتن و ژەندرمەشیان لەگەڵ بوو، بۆیە خاڵم چوار پێنج بزنی فرۆشت و پارەکەی دانێ. گەر لە مێردین ئەرشیفی نووسراوەکانی دەوڵەت مابێت، بە دڵنیایەوە ئەو نووسراوە پڕ شەرمەزارییانەش دەبێ تا ئێستا مابن.

لە ماوەی ئەو پێنج ساڵە، زۆر ڕووداوی دیکە ڕووی دا و

بیرەوەریــی زۆریشــم هەن، منــیش زۆر بەو ڕووداوانە دڵتەنــگ دەبــووم. لە قوتابخانەکەمــان، ئەحــمەد و ســەنانیك، دوو کــوڕی عەلی ئەحمەد ئاغا بوون و لەگەڵ ئێمە دەیانخوێند. ساڵی ١٩٣٢ لەنــاو عەشــیرەتی ئۆمەریــان ڕووداوێــك ڕوودەدات، ئەوســا لیــوایەکی ســەربازی تــورك بــۆ دەســتپێکردنی ئۆپەراسیۆنێکی ســەربازی بەنــاوی (خــاوێنکردنەوە) لە دیــاربەکرەوە هــاتبوونە مێردین، چونکە لە ناو ئۆمەرییان ڕووداوێك ڕووی دابوو. دوای هــاتنی ئەو لیــوایە، لە ترســان کــوڕی گونــد هەموویــان بەرەو چیاکان ڕایان کردبوو. لە چیای تیخوپ، عەلی ئاغا و دوو برای و ١٥ پیاویان ڕوو بەرووی سەربازی تورك دەبنەوە، لە ئەنجامــدا چەنــدان کەس دەکــوژرێن و چەنــدانی دیــکەش بە برینــداری دەســتگیردەکرێن، ســەربازەکان ســەری زینــدووەکان دەبــڕن و لاشەکانیشــیان لەو نــاوە فــڕێ دەدەن. بەپێــی گێڕانەوەکــان بــێ، یەکێــك لە لاوەکــان بەنــاوی ئەحــمەدی درەی، دوای ئەوەی سەری لە جەستەی جیا دەکرێتەوە، وەلێ جەستەکەی بە فــیچقە کردنی خوێنی ملی چەند چرکەیەك بە پێ ڕۆیشتووە. دواتــر ئەو ســەربازانە ســەرە بڕاوەکانیــان وەکــو شــفتی لە چەنــد گــونیەیەك کردووە و ئەو گوند و ئەو گونــد پیشــانی خەڵکیــان داوە. ئەوان تــا لادێــکەی ئــێمەش هــاتبوون و لەوێ گــونیەی کەللەســەرە بڕاوەکانیــان ڕادەســتی مەلای گونــد کردبــوو، مەلاش دوای شوشتنی کەللەسەرەکان، کەلــیەی ئاغــا و براکــانی لە شــوێنێك و ئەوانەی دیکەشــی لە شــوێنێکی دیــکەی کۆتــایی قەبرســتانەکەی ئێمە شاردبۆوە.

جــگە لەو ڕووداوە، بەســەرهاتی دیــکەی لەو چەشــنە لە

کوردستان زۆر بوو، بۆیە ئەو هاوڕێیانەمان کە ڕووداوەکەیان بەسەر هاتبوو، بۆ ماوەیەکی زۆر لە ترس و شەرم و خەمان نەهاتنە قوتابخانە.

بەسەرهاتی خوێندنم زۆر بە سەیری دەچووە پێش، لە سەرەتاوە گەر ساڵی لە دایك بوونم لە دادگا نەکردبا ساڵی ١٩٢٠ لە قوتابخانەیان وەرنەدەگرتم، چونکە دەیانگوت ئەوە خۆی لە دایك بووی ١٩٢٤ و تەمەنی بچووکە بۆ قوتابخانە، بەڵام ئەوەش ڕاست نەبوو، چونکە دایکم دەیگوت: "دوای فەرمانی فلان لە دایك بووی"بەو پێیە بێ کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لە ساڵی ١٩١٥ دەستی پێ کرد و لە ساڵی ١٩١٧ کۆتایی هات، بۆیە دەبێ ساڵی لە دایك بوونی من یان ١٩١٧ بێت، یاخود ١٩١٨.

### دایکم و کۆچی دوایی باوکم

یەکێك لە یادگارییە ناخۆشەکانی ساڵانی سەرەتای خوێندنم، گیان سپاردنی باوکە شەپرەکەم بوو. لەیەکەم پشووی قوتابخانە، کاتێك گەڕامەوە لادێ باوکم نەبینی، کاتێکیش پرسیم لەکوێیە، بە منگە منگ و لە ژێر لێوان پێیان دەگوتم بردوویانەتە دکتۆر. دواتر پوورێکی باوکم هات، دەستی بە گریان کرد، ئینجا زانیم باوکم کۆچی دوایی کردووە. بەرەو گۆڕستان ڕامکرد و کێڵەکەیم لە باوەش گرت، تا ئێستاش ئەو ژانە لە دڵمە و هەرچەندی دەکەم لێی ڕزگار نابم. چەند بە سوێیە، کاتێك ساڵی ١٩٦٣ دەستگیر کرابووم، دایکیشم کۆچی دوایی دەکا. وەك ئەوەی بۆیان باسکردم، تا دوا هەناسەکانی ویستویەتی من ببینێت و لەبەرخۆیەوە بەردەوام گوتوویەتی: "کوا

نەهات، کوا نەهات؟"هەر بەدەم گوتنەوەی ئەو وشانەش گیانی سپاردبوو.

دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی، کاتێك گەڕامەوە گوند، ئاواتەکەی دایکم هاتە دی، چونکە ئیدی تەنیا لەگەڵ ژەندرمە نا، بەڵکو دەمتوانی لەگەڵ ئەفسەر و بەڕێوەبەر و قایمقامیش قسە بکەم، تا ئەو ئاستەی بەشێك لەو فەرمانبەرانەی دەهاتنە گوند، سڵیان لێ دەکردمەوە، چونکە تورکییەکی زۆر باش فێر ببووم. یەك دوو جار بە دایکم گوتبوو دەمەوێ بچمە قوتابخانەی ناوەندی، بەڵام ئەو دونیای خرا کرد و گوتی: "ئیدی گەورە بوویت و فێری تورکیش بوویت، کەچی دەتەوێ بەو ژناتیەی خۆمەوە هەر من گوند بەڕێوە ببەم؟". بە گوتنەوەی ئەو قسانە نەیدەهێشت بچمە قۆناغی ناوەندی.

چەندان مانگ بە حەزرەتی قوتابخانەوە نەمدەزانی چی بکەم، لە کۆتاییەکانی مانگی تەباخ، دایکم من و خزمەتکارێکمانی بۆ کڕینی چەند پێویستییەکی شینایی ناردە مێردین. من لەسەر پشتی ئەسپ و خزمەتکارەکەشمان سواری هێستر ببوو، جلوبەرگەکانم وەك جلوبەرگی مندالە ئاغایەك بوو، کراسێکی حەریری بە نەخش و یەلەگێکی ڕەنگ جوانی بە نەقشم لەبەر بوو، لەگەڵ شەڕواڵێکی خاوێن و کراو و جەمەدانییەکی دەستووری خۆمان و پێلاوێکی دەستکردی میدیاتی. چۆنتان بۆ باس بکەم، لە فۆلکلۆریستەکانی ئەمڕۆ زۆر کەشخەتر بووم.

دەمەو ئێوارە گەیشتینە مێردین، کاتێك لەسەر شەقامەکە بەبەردەم قاوەخانەی (بڵند) تێپەڕین، کەسێك بە مووسا... مووسا بانگی کردم، منیش وەستام و ئاوڕم لێی داوە، بینیم سەبری فەندیی موفەتیشی قۆناغی سەرەتاییمان، بوو. ئەو منی زۆر خۆش دەویست، چونکە قوتابییەکی زیرەك بووم، بەڵام هۆکارێکی

دیکەش هەبوو بۆ ئەو خۆشەویستییە. جەنابی موفەتیش خەڵکی (گەملکی) بوو، لەوێ عەلی ناوێکی هێنابوو و کردبوویە دەرگەوانی قوتابخانەکەمان، عەلی و خێزانەکەی و منداڵەکەیان لە یەکێك لە ژوورەکانی قوتابخانەکەمان دەمانەوە، کوڕەکەیم زۆر خۆش دەویست، هەر کاتێك دەرفەتم هەبا ئەوم لەگەڵ خۆم دەبردە گەڕان. ڕۆژێك وانەمان نەبوو، چووم تا کوڕەکە لەگەڵ خۆم ببەمە دەرەوە، بەڵام کە چوومە ژوورەکەیان بینیم دایك و کوڕ نیوە مردوو نیوە زیندوو لەسەر زەوی کەوتوونە، زانیم شتێك ڕووی داوە، بۆیە هاوارم کرد فریامان بکەون، فریامان کەون. لەگەڵ هاواری من مامۆستا و خزمەتگوزاری قوتابخانەمان گەیشتنە لامان و ژن و منداڵەکەیان دەرهێنان و لە دەرەوەیان دانان، تومەزە بەهۆی دووکەڵی ڕەژووەوە لەهۆش خۆیان چووبوون. بەو شێوەیە گەر من نەچووبام، ڕەنگە بەهۆی نەمانی ئۆکسجینی پێویستەوە گیانیان سپاردبا، بۆیە بەو بۆنەیەوە لە قوتابخانە ڕێوڕەسمێکیان بۆ کردم و دیارییان دامێ و بە پاڵەوانیان هەژمارکردم. بۆیە، سەبریە فەندی بەردەوام خۆی بە قەرزداری من دەزانی و پێی دەگوتم کوڕە ڕزگارکەرە فریشتە ئاساکەم.

ئەسپەکەم ڕاگرت و هاتمە خوارەوە، بەرەو پیری چووم و دەستیم ماچ کرد، ئەویش بە میهرەبانییەوە سەیرێکی کردم و گوتی: "کوڕی خۆم چییە ئەو جلە جوانانە؟"، دواتریش پرسیی بۆ نەچوومەتە قوتابخانە، منیش گوتم: "توانای ئەوەمان نییە بێمە قوتابخانە"، ئەویش گوتی: "من هاوکاریت دەکەم". ئینجا ئاگاداری کردمەوە کە بەیانی بچمە قوتابخانەی (غازی پاشا). ڕۆژی دواتر بەیانییەکی زووبوو چوومە قوتابخانە، کە مامۆستاکەم منی لەبەر دەرگا بینی ڕووی لە ماریفی بەڕێوەبەری

قوتابخانەکەمان کرد و گوتی: "جەنابی بەڕێوەبەر ئەو منداڵە، لە قۆناغی سەرەتایی، یەکەمی سەر قوتابخانەکەی خۆی و تەواوی ماردین بووە، گەر دەرفەت بدەن دەمەوێ تاقیکردنەوەی پێ بکەین، دەتوانین دواتریش نووسراوە فەرمییەکانی بۆ جێبەجێ بکەین، هەرچۆنێك بێ بڕوانامە و ناسنامەکەشی لامانە".
بەڕێوەبەریش بە داواکارییەکە ڕازی بوو. دواتر مامۆستا سەبری منی بردە هۆبەی تاقیکردنەوە، نازانم بەخت یاوەر بوو یان تەنیا ڕێکەوت بوو، چونکە ئەو ڕۆژە تاقیکردنەوەی خوێندنی مانەوەی بێ پارەش هەبوو. ڕاستەوخۆ کاغەز و پێنووس و لاستیکی ڕەشکردنەوەیان پێ دام. دوای ئەزموونەکە مامۆستا سەبری گوتی: "بەیانیش وەرەوە قوتابخانە". ڕۆژی دواتر دیسان چوومەوە و تاقیکردنەوەیەکی دیکەشم کرد، لە هەردووکیشیان سەرکەوتوو بووم، چونکە کاتێك لە پۆل وەڵامی پرسیارەکانم دەداوە، مامۆستا سەبری لەسەرم وەستابوو و سەیری وەڵامەکانی دەکردم و دەستی بەسەرمدا دەهێنا، هەر ئەوکات زانیم نمرەی باش وەردەگرم.

بەر لەوەی بزانم لە قوتابخانە وەردەگیرێم یان نا؛ لەگەڵ خزمەتکارەکەمان گەڕاینەوە لادێ، ئەوسا هەرزەکارێکی تەمەن چواردە ساڵان بووم. دایکم هەمیشە هەوڵی دەدا هاوسەرگیری بکەم، بەڵام من لەبەر خۆشەویستیم بۆ خوێندن و قوتابخانە بەرپەرچی ئەو داوایەم دەداوە. کاتێك وادەی کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکان نزیك بۆوە، زیاتر کێچم کەوتە لەش، نەمدەزانی چی بکەم و وردە وردەش کات تێپەڕ دەبوو. ڕۆژێکیان دایکم لە نوسەیبینەوە چەند کیلۆیەك حەلوای گوێزی کڕیبوو، حەلواکە لەناو کاغەزی ڕۆژنامە پێچرابۆوە، دوای خواردنی، ڕۆژنامەکەی سەر حەلواکەم تۆزێك داوەشاند تا

بیخوێنمەوە، زۆر باشم لەبیر ماوە، ڕۆژنامەکە ناوی (حاکمیەت میللیە) بوو، دواتر ناوەکەی کرا (ئولوس). لە ناوەڕاستی لاپەرەکانی ناوەوە، لە ژێر ناونیشانی دەرچووانی تاقیکردنەوەی قوتابخانەی بێ بەرامبەر بۆ قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی، لیستێکی ناوی درێژ ڕیز کرابوو، ناوەکان بەپێی ناوی پارێزگاکان دابەش کرابوون، سەیری ناوەکانی مێردینم کرد، بینیم ناوی خۆم شێخ مووسی کوڕی عەنتەر لە سەرەوەی ناوەکانە، لە ڕۆژنامەکە ناوی ئەو قوتابخانەیەش نووسرا بوو کە لێی وەرگیرابووم، ئەویش ئامادەیی (ئەدەنەی کوڕان) بوو، بەڵام سەیری بەرواری دەرچوونی ڕۆژنامەکەم کرد دوو مانگی بەسەردا تێپەری بوو، لە کاتێکدا سەیرم پێهات چۆن لە دەرچوونی تاقیکردنەوەکان ئاگادار نەکرابوومەوە. کە زانیم کاتێکی زۆر بەسەر ئەو بەروارە تێپەڕیوە، زۆر بێتاقەت بووم، چونکە لەوە بوو ئەو دەرفەتەم لە کیس بچێت. بۆیە، بێ یەك و دوو چوومە لای بەڕێوەبەری ناحیەکەمان، چونکە ئەو زوو زوو سەرزنشتی دەکردم بەوەی بۆ بەردەوام نابم لەسەر خوێندن، بە گریانەوە چوومە ژوورەکەی و ڕۆژنامەکەم پیشاندا، ئەویش گوتی: "کوڕی خۆم دڵتەنگ بەمە، هەوڵ دەدەم شتێکت بۆ بکەم". بەمە تۆزێك هێور بوومەوە، بەڵام پێم گوت: "خاڵە مودیر تۆ بۆشم بکەی دایکم ڕێگام پێ نادا بخوێنم". لە وەڵامدا گوتی: "کوڕم تۆ خۆت تێکەڵ مەکە و من ئەو ئیشەت بۆ جێبەجێ دەکەم". جەنابی بەڕێوەبەر دوو ژاندرمە و دوو پاسەوانی بانگ کرد و فەرمانی پێ کردن بچن فەسڵە خانی بۆ بێنن. ڕۆژی دواتر بە حوزنەوە سەیری ڕێگام دەکرد، لە دوورەوە بینیم دایکم بە مات و مەلوولی بە سواری ئەسپەکەیەوە بەرەو ڕووی ئێمە دێت. ترس و دڵەڕاوکێی دایکم لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە لە ساڵی ١٩٢٦ لەسەر کێشەی

زەوی خاوەنیی گوندی (خەراپکۆرت) لە سووریا، کە دەکەنە بنعامی باوکم، لەگەڵ ئیبراهیمی کوڕی لە گەڵ پیرە حسۆی خاوەنی گوندی (چوڤا) لە تورکیا بەشەڕ دێن، لە ئەنجامدا پیرە حسۆی و دوو کوڕە مامی بەڕێوەبەری ناحیەی (ستیلیلیێ) ئەحمەدە فەندی و دوو ژەندرمە دەکوژن، ئەمەش دایکمی زۆر ترساندبوو، بۆیە، هەرکاتێك کەسێکی نەناسراو، یان بێگانەیەك یان ژەندرمەیەك بهاتبا گوند، دایکم من و یوسفی برا بچووکمی لە ئەشکەوت دەشاردەوە.

لەگەڵ دایکم چووینە ژووری بەڕێوەبەر، جەنابیان لەبەر ئەوەی خەڵکی دیاربەکر بوو، بۆیە بە کوردی بە دایکمی گوت: "خوشکی خۆم دەزانی من بەردەوام ئێوە بەرامبەر بە حکوومەت دەپارێزم، بەڵام ئەمجارە فەرمان لە ئەنقەرەوە هاتووە". بە دەست ئاماژەی بە نووسراو و کاغەزەکانی سەر مێزەکەی کرد و گوتی: "ئەنقەرە دەڵێ یان فەسلا خانم شێخۆی کوڕی دەنێرتە قوتابخانە، یانیش هەموویان بۆ ئەنقەرە ڕادەگوێزرێن". وەك کارەکتەرێك کە ڕۆڵ بگێڕێت بەڕێوەبەر باوەڕی بە دایکم هێنا، دایکیشم یەکسەر دەستی بە گریان کرد و گوتی: "ئێمە چ پەیوەندییەکمان بەو کەتنەوە هەیە کە ئیبراهیم مەحموودی سووری کردوویەتی، من بێوەژنم و منداڵی هێتیمم هەیە، ئەی ئێمەش گوناح نینە، ئەنقەرە چی لێمان دەوێت"، ئینجا دەستی بە دەردە دڵان کرد، بەڵام گریان و فرمێسکی دایکم پارەی نەدەکرد و بەڕێوەبەر سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەمجارە هیچی پێ ناکرێ، بۆیە، بێ چارە دایکم چوونە قوتابخانەی منی بە نابەدڵی قبوولکرد، ئەمەش بەڕێوەبەری دڵخۆشکرد، بۆیە ڕاستەڕاست بە تەلەفۆن پەیوەندیی بە مێردینەوە کرد، بەڵام کەس وەڵامی نەداوە، بۆیە دواتر پەیوەندی لەگەڵ خالی

وەستانی شەمەندەفەری نوسەیبین کرد، لەوێ زانیاریی ئەوەی وەرگرت کە دوو ڕۆژی دیکە شەمەندەفەر هەیە بۆ ئەدەنە.

گەڕاینەوە لادێ و دایکم ڕووداوەکانی بۆ گوندییەکانمان گێڕاوە، ئەمە وای کرد کەشێکی خەمناک باڵ بەسەر لادێکەماندا بکێشێ، چونکە ئەوانیش ناحەق نەبوون، لەبەر ئەوەی تا ئەو ڕۆژە کێ لە گوند دەرچووبا، جارێکی دیکە نەگەڕابۆوە، بۆیە، بە خەمگینیی و تازیەبارییەوە دایکم ئامادەکارییەکانی منی تەواو کرد و ڕۆژی دواتر بە پرچ دەرهێنان و دەموچاوڕنینەوە منیان بەرەو ئەدەنە بەڕێ کرد.

دایکم لە عەشیرەتی (بینیاتکی) ئێزیدی، کچی سەرۆکە موسوڵمانەکەیان حوسێنی سەرێ بوو، کە بەو دواییانە هاتبوونە سەر ئایینی ئیسلام. دایکم لە گوندی کانی شێخ هاتبووە دونیا. بەسەرهاتی دامەزراندنی ئەو گوندەی باپیرم چیرۆکێکی سەیری هەیە. کاتی خۆی باپیرەم کچی سەرۆکی عەشیرەتێکی دژی خۆیان، واتا داپیرمی، هەڵگرتبوو، باپیری داپیرم، ئەوەندە کەسێکی زاڵم و ئۆتۆریتە بووە، کوردی ناوچەکە پێیان گوتووە خوای چۆلی. چۆلی ناوی ئەو شوێنەیە کە لێی نیشتەجێ بوونە. داپیر و باپیرم دوای ئەوەی لەلایەن خێزانەکانیانەوە لەعنەت و حاشایان لێ دەکرێ، باپیرم لە ناوچەی کانی شێخ لە پانتایی سەر تەپۆلکەیەکی بەرز، قەڵایەکی بچووك دروست دەکات، دواتر بەرەوڕووی هەردوو خێزان دەبێتەوە و دەستەیەک لە ئێزیدییە چەکدارە بە ڕەچەڵەك کوردەکانی ناوچەکە لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە، ئینجا بە هەڕەشە و گوڕەشە باخ و باخچەکانی گوندەکانی دەور و بەری خۆی دەکڕێت و ئەو گوندە دروست دەکات.

دایکم لە شوێنێکی ئاوا گەورە ببوو، گەر سەرنجیش بدەین

ناوی باوکی دایکم حوسێنی سەرێیە، واتە باوکی دایکم بە ناوی بابی کە مەحموود نا، بەڵکو بە ناوی دایکی (سەرێ) بەناوبانگ بووە. لەناو کورددا ژنی قارەمان زۆرن، بۆیە زۆر عەشیرەتی بەهێز و ناودار لەگەڵ ئەوەی کوڕ و پیاوی زۆر چەلەنگیان هەبووە، بەڵام بەشێکی زۆریان بەناوی دایکیانەوە ناودار بوونە، کە زۆر جار لە مێژووی کورددا ئاماژە بەو ژنە ئازایانە کراوە، بۆ نموونە باوکی دایکم حوسێنی سەرێ، وەك سەرۆکی عەشیرەتی (ڕامان)، ئەمینی پەریخانی، سەرۆکی عەشیرەتی (ئۆمەریان)، محەمەدی شەمسێش، پاشناوەکانیان لە دایکیانەوە وەرگرتووە نەك باوکیان.

ڕۆژێك دایکم پێی گوتم: "کوڕم سەرەڕای ئەوەی عەنتەری باوکت بە گەنجی کۆچی دوایی کرد، بەڵام لەناو خەڵك هەر خۆشەویستە. بۆیە، تۆ بە مووسا عەنتەر بانگدەکەن و بە مووسا فەسڵێ بانگت ناکەن[1]، بەڵام من بەوە بێتاقەت نابم، چونکە بەراستی خۆشەویستیم بۆ یادەوەرییەکانی باوکت هەیە و تا ئێستا هێندەی ئەو بەرێز نەبوومە لەناو خەڵك". باوکم لە تەمەنێکی گەنجیدا بە جەڵتەی مێشك تووشی ئیفلیج بوون بوو، دایکم

---

[1] خەڵک بە منیان نەدەگوت مووسا، بەڵکو پێیان دەگووتم شێخۆ. بۆیە لێرەوە دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە چیرۆکی شێخۆ و شێخ مووس چۆن بووە. کاتی خۆی کەسێکی موبارەك هەبووە ناوی سوڵتان شێخ مووسا بووە، ئەو زاتە سوڵتانێکی خوێن ڕێژ و شەڕ فرۆش نەبووە، بەڵکو کەسێکی زانا و زانست پەروەر بووە، بۆیە لەناو خەڵك ئەو شێخ مووسایە بووەتە شێخ مووس. بە پێی ڕێچکەی زمانی کوردیش هەندێك ناو وەك زمانی ئیتالی لەبەر ئەوەی کاتێك بە پیتی (ۆ) کۆتایی دێت بۆ زمان ئاسانتر دێ، بۆیە شێخ مووس بووەتە شێخۆ و بە فاتمەیان گووتوە فاتۆ، بە حەسەنیان گووتوە حەسۆ، بە براهیمیان گووتوە برۆ.

حەفت ساڵ وەك كۆرپەیەك خزمەتی كرد، برا بچووكەكەم، یوسف عەنتەر، منداڵی دوای فەلەج كەوتنی باوكمە.

لەو سەین و بەینەدا، كۆماری توركیا دامەزرا و ئەو ڕووداوانەشم بۆ باسكردن كە لە ناوچەكە بەسەرمان هاتن، جگە لە لادێكەی ئێمە، عەشیرەتی تەمیكان كە لە ٢٥ گوند پێكهاتبوون، كەوتبوونە ناو سنووری سووریا، بەشێك لە گەنجەكانی لادێكەشمان بەرەو ئەوێ كۆچیان كردبوو، بۆیە پیاوێك نەمابۆوە تا ببێتە موختاری گوند. دایكم، بە ناچاری پیرەمێردێكی بەناوی سلێمان تەمۆ، بە پارە بە كرێ گرتبوو تا ببێتە موختاری گوند، جا ئەو كابرایە لەبەر ئەوەی لە سەردەمی یەكەمین جەنگی جیهانی سەربازیی كردبوو، بۆیە تەنیا لەبەر ئەوەی قیچ قیچ دەیزانی بە توركی بڵێ وەرە - بڕۆ، دایكم كردییە موختار، بەڵام دوای ساڵێك كابرا دەمرێ، بۆیە دایكم بێ چارە خۆی ئەركەكە جێبەجێ دەكات. لەو باوەڕەدام گەر لێكۆڵینەوەیەك بكرێ، ڕەنگە دایكم بە یەكەمین موختاری ئافرەتی فەرمی لە توركیا دابندرێت.

من باوكمم لەسەر پێی خۆی نەبینی، چونكە لە یادەوەرییەكانی منداڵیم ئاماژەم پێداوە كە بەردەوام دایكم بینیوە، چونكە زۆرجار لێم دەپرسن،"ئەو خەباتە سیاسی و ئەدەبیەت لە كوێوە سەرچاوەی گرتووە؟". منیش بێ سڵەمینەوە، دەڵێم لەو دایكەم كە نووسین و خوێندنەوەی نەدەزانی، بەڵام ئەو زوو زوو ئامۆژگاریی دەكردم و دەیگوت: "كوڕم هیچ كات باوەڕ بە قسەی عەرەب و توركان مەكە". بەردەوامیش بە گوێیدا دەیچرپاندم كە هەرگیز پیاوەتی و ئازایەتی خۆت لەبیر مەكە و بەردەوام بەزەییت بە كەسوكاری خۆتدا بێتەوە. ئەو قسانەی

دایکم بە ئامۆژگارییەکانی ساڵح بەگی فەرمانڕەوای شێروانەی کوردستان دەچوێتم بۆ کوڕەکەی، چونکە مێژووی دیوەخانی ساڵح بەگی شێروانە لە کوردستان ڕوونە، کە بە ناوێکی خوازراو بۆ کوڕەکەی لە شیعرێکدا دەڵێ:

"ساڵح بە کوڕی خۆی دەگوت،
لای تۆ ئەمانەتە هەژار
سەرەتا دەست بە زانین بکە،
دوایە دەستکە ڕاو و شکار
هەردەم کار و خەبات بکە
بەڵام نەك وەك باب و باپیرانت".

لێرە ساڵح بەگ دەیەوێ بڵێ، ئێمە هەڵە بووین، بۆیە تۆ وەك ئێمە مەبە و زیاتر سوودت بۆ خەڵکەکەت هەبێ.

ئەو پیاهەڵدانەی بۆ دایکیشم دەینووسم، لەبەر ئەوە نییە کوڕی ئەوم، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ژنێکی کوردی نەخوێندەوار بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، دەمەوێ بشڵێم تەنیا دایکم نا زۆر ژنی دیکەش قارەمانیەتی زۆر گەورەیان کردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەسیانم لە نزیکەوە وەك دایکم نەناسیوە، بۆیە نامەوێت هیچ ناوێك بنووسم، گەر هەر دەشتانەوێت چەند ناوێك بڵێم، پێمباشە ناوی لەیلا قاسم و زەکیە ئالکانتان بەبیر بهێنمەوە.

#### ئەدەنە

کاتێك لە وێستگەی شەمەندەفەری ئەدەنە دابەزیم، بە سەرسامییەوە بۆ ماوەیەکی درێژ لە شوێنی خۆم وشك بووم، تا ئەو کات تەنیا شار کە بینیبێتم مێردین بوو، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ ئەدەنە لە لادێیەك زیاتر هیچی دیکە نەبوو. ئەو شارە زۆر

لـە مێـردین جیـاواز بـوو. لەیەکەم بینینـدا سـەرم سـوورما لەگەڵ باڵەخانەی بەرز و داری خورمـا و کـاکتۆس و کـالیپتۆس، بەڵام لەهەموویـان زیـاتر زۆر سـەیرم بە گڵـۆپە کارەبایەکـان هـات، چەندی هەوڵم دا تێ نەدەگەیشتم چۆن کـار دەکەن، چـونکە لە مێردین کاتێك دونیا تاریك دەبوو، شەقام و بەشێك لە ماڵەکانیان بە لۆکس ڕووناك دەکردەوە، ئەویش بە مـازۆت ئیشـی دەکـرد. بۆیە، بەر لە ڕۆژئاوابوون کارمەندەکانی شـارەوانی لوکسـەکانیان ئامەدە دەکرد و لە هەر شەقامێك بەسـەر چەنـد دارێکـی دیـاری کراوەوە هەڵیاندەواسی. بەڵام ئەو گڵۆپانەی لە ئەدەنە بینـیم هـیچ بە لوکسـەکانی مێـردین نەدەچـوو. هەسـتمکرد لە نـاو دنیـای خەونـانم. مـن خەیـاڵ بردبـوومیەوە، لە پـڕ کەسـێکم بینـی، بە کڵاوەکەی سەری هەستم کرد قوتابییە و بە شەرمەوە لێم پرسی: "چـۆن دەتـوانم بچـمە ئامـادەیی ئەدەنەی کـوڕان؟"ئەویش بە بنزمانەکەمڕا زانی خەڵکی مێردینم، بۆیە گوتی: "وەرە بـرا گیـان منیش مێـردینیمە و لە قوتابخـانەی مـوعەلیمیە دەخـوێنم، خەمـت نەبـێ مـن دەتگەیـنمە ئەو قوتابخـانەیە". بە ٢٥ قـرووش سـواری داشقەیەک بووین و چـووینە قوتابخـانەکەم. لە ڕێگـا نووسـراوە فەرمییەکانم دا ئەو هاوشاریەم کە پێـك هـاتبوو لە ڕۆژنـامەیەکی چەوری کۆن و نامەیەکی بەڕێوەبەری ناحیەکەمان. لە نامەکەیـدا جەنابی بەڕێوەبەر نووسیبووی: "ئەو قوتـابییە منـداڵێکی زیـرەك و هێتیمە، لە تاقیکردنەوەکـان دەرچـووە، بەڵام هـیچ ئاگـادارییەکی بۆ نەچووە، تا ئەوکاتەی بە ڕێکەوت دوای نزیکەی دوو مانـگ لە ڕۆژنـــامەیەکی کـــۆن نـــاوی خـــۆی دەبینێـــت و هەواڵـــی دەرچوونەکەی دەخوێنێتەوە".

ڕێبەرەکەم منـی بـردە ژووری بەڕێـوەبەر لە قوتابخـانە، لەوێ پیاوێکی باڵا بەرزی قژ زەردی چاوشین دانیشتبوو، ڕێبەرەکەشم

پەڕاوەکانمی بۆ ئەو درێژ کرد و دایە دەستی، ئەویش دوای خوێندنەوەی گوتی: "سەی کوڕی سەی، ماکەر، دوو مانگە ئێمە بەدوای تۆدا دەگەڕێین و تۆش تازە دێیت، لە کامە جەهەنەم بوویت و ئێستا بە دیار کەوتوویت؟". سەیر ئەوەبوو کابرا پێش ئەوەی قسە بکات، چاوە شینەکانی، منی لە دەست و پێ خستبوو، کە ئەو قسانەشی هاتە سەر، کەلەجانی خوێندنم لە پڕێکدا لا نەما. چەند خولەکێك دواتر منی هەستاند و لەگەڵ خۆی بردمیە ژووری یاریدەدەری یەکەمی قوتابخانە، لە ژوورەوە کەسێك دانیشتبوو سەر و کەللەی زۆر بە خەڵکی لای ئێمە دەچوو، کاك حوسێنی چاو شین ئەو کەسەی بە کاك تاهیر بانگ کرد و گوتی: "ئەو منداڵە مێردینیەی بەدوای دەگەڕاین ئێستا هاتووە، کات تەواو بووە و ناتوانین وەری بگرین ئەی وانییە؟". ئەو دەیویست لە سەرەتاوە بە دڵدانەوە هەواڵی وەرنەگرتنەکەم پێ بڵێت، بەڵام مامۆستا تاهیر هەستاوە سەر پێ و بە دەموچاوێکی گرژەوە سەیری مامۆستا حوسێنەکەی کرد و گوتی: "جارێ پەلە مەکەن، با بیرێکی لێبکەینەوە". هەر سێکمان بەیەکەوە چووینە لای بەڕێوەبەری قوتابخانە، کاغەزەکانم لای کاك تاهیر بوو، بۆیە لای بەڕێوەبەر کاك حوسێن قسەی نەکرد، بەڵام مامۆستا تاهیر نامەی بەڕێوەبەری ناحیەکەمان و ڕۆژنامەکەی بە بەڕێوەبەر پیشاندا و حاڵ و ئەحواڵی منی بۆ باسکرد، بەڕێوەبەریش گوتی: "باشە وەریبگرن". ئینجا فەرمانی بە حوسێنە فەندی کرد و گوتی: "حوسێن بەرگدوورێك بانگ بکەن، دەستە جلێکی بۆ بدوورێت و پێڵاو و کڵاو و دەفتەر و پەرتووکیشی بۆ ئامادە بکەن و ژووری نووستن و تەختە نووستنەکەی و دۆلابی کەلوپەلەکانیشی پیشان بدەن و دوای تەواو بوونی بانگم بکەن دەمەوێ خۆشم ببینم". کاك حوسێنیش

گوتی: "بەسەرچاو جەنابی بەڕێوەبەر"، ئەو لای بەڕێوەبەر گوتی بەسەرچاو، بەڵام بە دەموچاوێکی ترشەوە منی ڕەگەڵ خۆیدا و نا بەدڵانە فەرمانەکانی بە ڕێوەبەری جێبەجێکرد. لە سەر تەختەکەم کاتێك بە شۆرتەوە دانیشتبووم مامۆستا تاهیر و جەنابی بەڕێوەبەر هاتنە ژوورەوە و پێیان گوتم: "کوڕی خۆم هیچ بێزار مەبە و ئێمەش هاوشاری تۆین و خەڵکی مێردینین، تۆ قوتابییەکی زیرەکی و تەنیا داواکاریمان لە تۆ زۆر خوێندن و خۆ ماندوو کردنتە، چونکە هاوپۆلیەکانت دوو مانگە دەستیان بە خوێندن کردووە و زۆر لە پێش تۆن، بۆیە شەرمەزارمان مەکە". ئینجا دەستی بەسەرمدا هێنا و منیش دەستی هەردووکیانم ماچ کرد و بەڵێنم دانێ زۆر بخوێنم.

بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان خوالێخۆشبوو جەودەت بارلاسی خەڵکی عەنتاب بوو، لە قوتابخانە لەیەك کاتدا بەڕێوەبەر و مامۆستای زمانی فەڕەنسیش بوو. کاتێك تاهیرە فەندی، مامۆستای بیۆلۆژی و یاریدەری قوتابخانە، منی بەرەو پۆلەکەم دەبرد، لێی پرسیم: "لە قوتابخانە سێ زمان هەیە، ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی، دەتەوێ کامەیان بخوێنیت؟". ئەوسا لە تورکیا بە گشتی خەڵك ڕق لە دڵ بوون بەرامبەر ئینگلیز و فەڕەنسا، بەڵام کەیفیان بە ئەڵمانیا دەهات، سەرچاوەی ئەم دۆستایەتی و دوژمنداریەش هیی سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی بوو، بۆیە گوتم مامۆستا دەمەوێ بە زمانی ئەڵمانی بخوێنم. تاهیرە فەندی منی بردە پۆلی ئەلفی ئەڵمانی، ئەوسا قوتابییەکان لەناو وانەی بیرکاری بوون، مامۆستاکەمان ناوی ئەفە ڕاسیم ئۆکجوو بوو، نازناوی ئەفەشی لە شەڕی ڕزگاریی دژی یۆنانییەکان بە دەست هێنابوو، چونکە وەك گەریلا شەڕێکی گەورەیان لەگەڵ یۆنانییەکان کردبوو. تاهیرە فەندی چەند

قسەیەکی لەگەڵ مامۆستاکەم کرد و منی جێ هێشت، مامۆستای بیرکاری منی لە ڕیزی پێشەوە دانا، بەڵام جلە کۆنەکانی قۆناغی سەرەتاییم و پیس و پرتۆخیی خۆم و ڕەشبوونی کونی لووت و گوێم بە دووکەڵی شەمەندەفەر، گوندی بوونمی لەسەر و کاپێلکمدا دەردەخست، بۆیە هەر زوو هاوپۆلییە تازەکانم حەنەکی خۆیان پێ کردم. بەڵام هەر کە مامۆستا هەستی بەوە کرد چەند قسەیەکی ڕەقی پێ گوتن و بێ دەنگی کردن، منیشی هەڵستاندە سەر سەبوورە و گوتی: "کوڕی خۆم بنووسە، دوو سێو و پێنج هەرمێ و دە پرتەقاڵ کۆی بکەوە و بزانە دەکاتە چەند؟". منیش گوتم: "مامۆستا گیان ئەوانە کۆناکرێنەوە". مامۆستا گوتی: "بۆچی؟". لە وەڵامدا گوتم: "چونکە ئەوانە لە یەك جنس نین و میوەی جیاواز جیاوازن"، کە وام گوت مامۆستاکەم لە بری ئەوەی تووڕە ببێت خەندەیەکی کرد و گوتی: "ئافەرین کوڕی خۆم دانیشە". دواتر ڕووی لە هاوپۆلییەکانی دیکەم کرد و پێی گوتن: "بینیتان کەرینە، دوو مانگە لەگەڵ ئێوە دەڵێم، بەڵام کەستان نەتان توانی وەڵامێکی وەك ئەو منداڵەم بدەنەوە کە گاڵتە و حەنەکی پێدەکەن".

### ڕۆژانی ناوەندی و ئامادەیی قوتابخانەم

وەك منداڵی ناوچەیەکی دواکەوتوو، بە تاسەی هەموو شتێك بووم، خواردن، خواردنەوە، جلوبەرگ، فێربوون، گەڕان و زۆر شتی دیکە. بەڵام، خەریکبوو لە مەراقی خوێندن و فێربوونەوە، ئەوانی دیکەش وردە وردە نەیەنە دی، چونکە گەر ئەو وشەیە شەرم نەبێت، من زۆر چاوچنۆکی فێربوون و خوێندن بووم. بەو هەوەسەش ماوەیەکی کەم بەر لە ئەزموونەکان و کارتی کۆتایی وەرزی یەکەم، توانیم باش بچمە پێش و لە زۆربەی وانەکان

سەرکەوتوو بم، ئەمە وایکرد مامۆستاکانم زیاتر دەستم بەسەردا بێنن و میهرەبانیی خۆیانم بۆ دەربخەن. زۆربەی هاوپۆلییە ئەدەنەییەکانم منداڵە دەوڵەمەند بوون، بۆیە زۆربەیان تەمبەڵ بوون و هەر پۆلێکیان بە دوو ساڵ دەبڕی، دواتریش کارتی دەرنەچوونیان وەردەگرت و دەچوونە ئیستانبووڵ و لە ئامادەیی هایریەی تایبەت دەیانخوێند، ئینجا لەوێ، بە پارە، بڕوانامەیەکی دەرچوونیان وەردەگرت.

لە ماوەیەکی کەم لەگەڵ هاوپۆلیەکانم بووینە دۆستێکی نزیك، بە ئاستێك نەك برادەر بەڵکو بووینە برای یەکدی، بۆیە لە پۆل گەر یەکێك هاروهاجییەک یان دەنگە دەنگێکی کردبا، یاخود لە ئەزموونەکان گزیەکی کردبا، کەسمان زمانمان لێ نەدەدا.

سێ جۆرە قوتابی لە قوتابخانەکەمان هەبوون، بەشێکیان بە ڕۆژ دەهاتن و بەشێکیان وەکو قوتابی تایبەت پارەیان دەدا و شەوانەش لە بەشە ناوخۆیی قوتابخانە دەمانەوە و بەشێکیشیان بێ بەرامبەر شەوانە دەمانەوە. ئەوانەی بە ڕۆژ دەهاتن و شەوان نەدەمانەوە خەڵکی ئەدەنە بوون، ئەوانەی شەوان دەمانەوە و پارەیان دەدا، منداڵە دەوڵەمەندەکانی دەوروبەری ئەدەنە بوون، ئەوانەی شەوانەش دەمانەوە و پارەیان نەدەدا، ئەو قوتابییانە بوون کە لە چوار لای تورکیاوە لە ڕێگەی تاقیکردنەوە وەرگیرا بوون. لەگەڵ هەندێك لەو قوتابییە ئەفغانی و قوبرسییانەی لە هەتای دەمانەوە و هەندێك قوتابی سووریش. قوتابییە ئەفغانییەکان لە سەردانێکی پاشای ئەفغانستان (ئەمانوڵڵا) بۆ تورکیا، لەسەر بەڵێنێکی ئەتاتورك وەرگیرابوون، ژمارەیان بیست کەس دەبوو، دوای هاتنیان وەزارەتی پەروەردە ئەو قوتابییانەی

بەسەر چەند ئامادەییەك دابەش کردبوو و پێنجیشیان کەوتبوونە قوتابخانەکەی من.

من و ئەوانەی بەبێ پارە دەمانخوێند و شەوانە دەماینەوە، گەر ساڵێك لە پۆلێك دەرنەچووباینایە، مافی خوێندنی بێ بەرامبەرمان نەدەما. ئەمەش واتای ئەوەبوو جارێکی دیکە نەمدەتوانی بخوێنم، بۆیە بەردەوام لە کاتی سەعی کردندا ئەو ترسەمان لە دڵدا بوو. هەستنەکەن دەمەوێ بەخۆمدا هەڵبڵێم، چونکە من دەمەوێت ڕاستییەکانی ژیانمتان بۆ باس بکەم، لەو باوەڕەشدام ئەوانەی دەمناسن، دەزانن کەیفم بە خۆ هەڵکێشان و پێدا هەڵدان نایەت، چونکە ئێستا لە چ دۆخێك بم، هەر ئەو منداڵەی ئەشکەوتم، جا باشتر بم یان خراپتر، بۆیە چ پێویست ناکات، قسەی گەورە گەورە بکەم.

لە کاتی سەعیکردندا زۆر هاوکاری هاوپۆلەکانم دەکرد، ئەوەش بۆ من هەم وەك پێداچوونەوەیەك بوو بەر لە تاقیکردنەوە، هەمیش هاوکاری هاوڕێیەکانی خۆم دەکرد، بەوەش دڵخۆش دەبووم. لە ئەزموونەکان هاوپۆلەکانم شەڕیان بوو لەسەر ئەوەی کامەیان لە تەك منەوە دانیشێت، لەبەر ئەوەی چەند جارێك کاغەزی ئەزموونەکەم بۆ ڕاگرتن تا لەسەری بنووسن و چەند جارێکیش قۆپیەم پێدان، بەڵام بەرامبەر ئەو کارانەم مامۆستاکان سەرزەنشتێکی توندیان کردم. یەکێك لەو برادەرانەم بەناوی قادر هۆمەرئۆغلو، لە یەکێك لە تاقیکردنەوەکان لە دواوەم دانیشت و من چیم نووسی ئەویش بە سەیرکردنی وەڵامەکانم هەمان وەڵامەکانی منی دووبارە نووسییەوە، بۆیە کاتێك وەڵامی هەردووکمان وەك یەك دەبێت، مامۆستا عەزیزی وانەی مێژوو، کە کورد بوو، سفری دابووە هەردووکمان، دواتر عەزیزە فەندی منی بانگ کرد و کاتێك

زانی هیچ سووچێکم نییە، دڵنەوایی کردم و گوتی: "کوردی هەتیوو، وەڵامەکەی تۆ بای ١٠ نمرە بوو، من گوتم یەکی لێ ڕەشدەکەمەوە و نۆ دەمێنێتەوە، من چووزانم یەك بڕوا سفر دەمێنێتەوە، بەڵام خۆت بێتاقەت مەکە، لە تاقیکردنەوەی داهاتوو تۆڵەت بۆ دەکەمەوە و بیستت دەدەمێ".

هەر زوو هەموو شتێك بەرووم‌دا پێدەکەنی و ئەستێرەی بەختم گەشابۆوە، لە وانەکاندا جگە لە ئایینزانی، زۆر خولقم لەگەڵ وانەی میتافیزقیا و کۆمەڵناسی و دەروونناسی هەبوو، تا ئەو ئاستەی بە هاوکاریی فاتیمە شەربەتچی ئۆغلووی مامۆستای فەلسەفەمان توانیم دوو کۆڕ لە قوتابخانەکەمان ببەستم، ئەوکات بەڕێوەبەر و تەواوی مامۆستاکان دەستخۆشییان لێ کردم. کۆڕی یەکەمم دەربارەی بابەتی هەستەوەری بوو لە تیۆری زانینی، (هێنری بێرگسۆنی) فەرەنسیی بە ڕەچەڵەك جوو و دامەزرێنەری خوێندنی باڵا. کۆڕی دووەمم لەسەر تیۆری دیاردەی فەیلەسوفی ئەڵمانی (کانت) بوو، بۆیە لە قوتابخانە دوای ئەو دوو کۆڕەم پێیان دەگوتم فەیلەسوف، ئەو ئارەزووە زیادەشم بۆ فەلسەفە لەوەوە هات کە ئەوساڵە بۆ خوێندنی باڵا لە بەشی فەلسەفە چوومە ئەزموونی وەرگرتنی لە زانکۆی ئیستانبووڵ. ئەوسا لە تەواوی تورکیا تەنیا من و جەودەت ئۆرهان توتەنگیل و سەباحەتین باتوور لە تاقیکردنەوەکە دەرچووین.

ڕەنگە بپرسن ئەو ئارەزووە بۆ فەلسەفە و ئەو زانیارییانەت لە کوێ دەستدەکەوت؟ منیش سەرەتا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەمەوێ بڵێم لەوسەردەمەدا قوتابخانەکەمان و مامۆستاکانمان توانای زانست و مەعریفیان زۆر بەرز بوو، چونکە لە پاڵ پەرتووکخانەیەکی گەورە و دەوڵەمەند، ژووری تاقیگەی فیزیا و کیمیاشمان هەبوو، وەك چۆن مامۆستای فیزیا و کیمیامان لە

ئاستی تورکیا مامۆستا پلە یەکەکان بوون، بەهەمان شێوە فەرمانبەری پەرتووکخانەکەشمان، ئێمە هەرچیمان بویستبا هاوکاری و ڕێبەریی دەکردین، تا ئەو ئاستەی تەواوی پەرتووکەکەی بۆ کورتیش دەکردینەوە، منیش سوودم لەو پەرتووکە فەلەسەفییانە دەبینی کە بە تورکی نووسرابوون وەك: (حاتەمی سەمیح، موستەفا شەکیپ)، لە پەرتووکە لۆژیکییەکانیش زۆر سوودم لە (حەسەن عەلی یوجەلاندی) بینی، جگە لە پەرتووکەکانی (کانت و هێنری بیرگسۆن و باخ و نیچە و ڕۆسۆ و شۆپنهاوەر)، چەندان پەرتووکی دیکەی (ڤیکتۆر هۆگۆ و پوشکین و ماکسیم گۆرکی) شم لەسەر فەلسەفەی ئەدەبیات خوێندەوە، لەگەڵ ئەو پەرتووکە گیرفانییانەی ئەوسا لەلایەن ڕۆژنامەی (تان)ەوە بڵاو دەکرانەوە کە زۆربەیان لە ڕووسی و فەڕەنسی وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی تورکی. لەپاڵ ئەو فەیلەسوف و پەرتووکانەی سەرەوە، زۆریش کەیفم بە فەلسەفەی کۆنی یۆنانی دەهات، بە تایبەتی زۆر هەوڵم دەدا بتوانم لە (سوکرات) بگەم و لە خەیاڵدانی خۆم شوێنێکی تایبەتی بۆ بکەمەوە. بۆیە ئێستا لەو باوەڕەدامە سوکرات و (ئەفلاتوون)ی قوتابی و (ئەرستۆ)ی مامۆستای ئەسکەندەری گەورە و قوتابیی ئەفلاتوون، لە تەواوی پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل لە سەروو ترن. چونکە هەست دەکەم ئەو پێغەمبەرانە بیر و بۆچوونی ئەو سێ فەیلەسووفەیان جارێکی دیکە بە بیروباوەڕی خۆیان داڕشتێتەوە و بە بۆچوونی تایبەتی خۆیان بە خەڵکیان فرۆشتبێتەوە، چونکە دواکەوتوویی ڕۆژهەڵاتی ناڤینیش سەرچاوەکەی ئەو بیروباوەڕە نالۆژیکییە ئایینزایانەی ئەو سەردەمەیە و تا ئێستا ماوەتەوە.

بۆچوونە فەلسەفییەکانم تەنیا لە چوارچێوەی قوتابخانەکەم بوو

و نەمدەتوانی لە دەرەوە باسیان بکەم، هەر کاتێکیش لەسەر پرسێکی فەلسەفی پرسیارم هەبا و تێنەگەیشتبام دەچوومە لای مامۆستای بەڕێزم فاتمە شەربەتچی ئۆغلوو و هەولی تێگەیشتنم دەدا، ئەویش وەك مامۆستایەکی زیرەك و بە هەستی دایکێکی میهرەبان وەلامی پرسیارەکانی دەدامەوە، هەندێکجاریش گەر کاتی زیادم لەبەر دەست بووایە، دەچوومە لای موستەفا فەندی کارمەندی پەرتووکخانە و بەیەکەوە گفتوگۆی زۆر پرس و بابەتمان دەکرد.

## پرسی هەتایی و سەرهەڵدانی دێرسیم

ئەوکاتەی لە ئەدەنە قوتابی بووم، دوو ڕووداو کاریگەریی زۆریان لەسەر جێ هێشتم، یەکێکیان سەرهەڵدانی هەتایی و ئەوی دیکەشیان شۆڕشی دێرسم بوو. ئەوسا هەتای لەژێر دەسەلاتی کۆلۆنیالی فەڕەنسیدا بوو، بەلام شوێنەکانی دیکەی هەتای لە ژێر دەسەلاتی فەڕەنسا نەبوو، چونکە دوای کۆتاییهاتنی یەکەمین جەنگی جیهانی، سووریا لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی جیا دەبێتەوە، بە چاودێریی کۆمەڵەی گەلانی ئەوسا بۆ ماوەی بیست ساڵ هەتایی و دەوروبەری دەخرێتە ژێر ڕکێفی پاریس، لەگەڵ هەتای، ئەنتاکیا و ئەسکەندەروونیش هەمان چارەنووسیان بۆ دیاری کرا. ماوەی دیاری کراوی دەسەلاتی فەڕەنسییەکان بۆ ئەو ناوچانە لە ساڵی ١٩٣٨ کۆتایی دەهات، بۆیە بەپێی هەندێك گێڕانەوە و بەڵگەی مێژوویی بێت، بەهۆی هەندێك دۆستایەتی نێوانیان، پاریس چاوپۆشیی لەوەی کردبوو تورکیا ئەو ناوچانە بخاتە ژێر کۆنتڕۆڵی ئەنقەرە، بۆیە تورکیا لە پڕ گوتی: "هەتای خاکی ئێمەیە"، لە کاتێکدا تا ئەو کاتەش لە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی، یاخود سەر زاری خەڵك شوێنێك

نەبوو بە ناوی (هەتای). دیار بوو هەر بەو لۆژیکەی بە کوردیان دەگـوت ئێـوە تـورکن، بە هەمـان شـێوە بە عەرەبەکـانی ناوچەکەشیان گوت ئێوە تورکن، بۆ ئەوەی باوەڕیش بکەن، گوتیان لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە وڵاتـی مەنگۆلییەکان ناوچەیەك هەیە پێـی دەڵێن هەتـای و ئێـوەش لەوێـوە هـاتوون، جا لەبەر ئەوەی جووتیـــــارە عەرەبە بەســــــتەزمانەکانی ئەوێ لەو شـــیکردنەوانەی دەوڵەت تێنەدەگەیشـــتن، بـــۆیە ناچـــار تەنیـــا قبوولکردنیان بۆ دەماوە.

هەر بـــۆ ســـەلماندنی ئەوە، ڕۆژێـــك حكـــوومەتی تورکیـــا میتینگێکی ڕێك خست، لەوێ موستەفا فەندیی خاوەنی کارگەی جووتیـاریی ئەدەنـە، لە قسـەکانیدا، لەگەڵ ئەوەی بەسـتەزمانەی تورکیشـی نەدەزانـی، بەڵام بە دەسـت لە سـینگ دانەوە گـوتی: "وەڵاهی ئێمە تـورکین، بیلاهـی تـورکین، تیلاهـی تـورکین، بە قورئان تورکین". ئینجا لەسەر ستەیج هـاتە خـوارەوە، بەڵام دیـار بوو چەندیان لەگەڵ گوتبوو تا بڵێ ئێمە تورکین.

لەو کەین و بەینەدا، ئەتاتورك دوو جار هاتە ئەدەنە و تـوانیم لە نزیکەوە ببینم. دوای ئەو کێشەیە، ڕاپرسییەك لە هەتـای کـرا، بە دەست لەپشتدانی پـاریس، تـورك توانیـان دەنگێکـی زیـاتر لە عەرەبەکان دەسـتەبەر بـکەن، کە ئەنتاکیـا و ئەسکەندەروونیشـیان لەگەڵ چەندان ناوچەی دەوروبەر لەگەڵ قوبرس بـۆ تورکەکـان یەکلایـی کـردەوە، بەڵام ئەو چەنـد شـوێنە وەك نـاوچەیەکی بـێلایەن لە دەوڵەتـی تورکیـا لەلایەن سـەرۆك کۆمـار تـایفور سـۆکمەن و سـەرۆك وەزیـران عەبـدولڕەحمان مەلەك بەڕێـوە دەبردران و پەرلەمانی تایبەت بە خۆیشـی هەبـوو. بـۆ ئەو شـوێنە تـازە ئـازادانە دەسـتوور نووسـرایەوە، لەیەکەم مـاددەی ئەو دەسـتوورەش ئامـاژە بەوە کـرا کە بە کـۆی دەنگـی پەرلەمـانی

هەتای، ئەو ناوچانە دەتوانن بچنە پاڵ هەر وڵاتێکی بیانەوێت، بەڵام مەبەستەکە ئەوە بوو کە دەتوانن بچنە پاڵ تورکیا و لەگەڵ ئەنقەرە یەك بگرنەوە. دوای ماوەیەکی کورتیش هەر ئاوا دەرچوو، چونکە هەتای بڕیاریدا لەگەڵ تورکیا یەك بگرێت، دوای یەکگرتنیشی ئینجا ئاشکرا بوو کە تایفوور سۆکمەن سیخورێکی نهێنیی پۆلیسی تورکیا بووە.

لەو سەروبەندەدا، شۆرشی دێرسیمیش دەستی پێ کرد، کە دواتر لە دەرەوەی وڵات زۆر پەرتووکی لەسەر نووسرا، لە تورکیاش پرسەکە بە زانایی بە لاڕێدا بردرا. ئەوکاتەی ئەو ڕووداوانە ڕوویان دەدا من قوتابی قوتابخانەی ئامادەیی ئەدەنە بووم، کە چەند ڕووداوێکم لەو بارەیەوە بەسەر هات، یەکێك لەوانە بۆ یەکەمجار لە ژیانم دەستگیرکرام.

سەید ڕەزا سەرکردایەتیی شۆرشی دێرسیمی دەکرد، بەسێی هاوسەری بەرێزیشیان سەرکردایەتی گرووپێکی گەریلایی دەکرد، بۆیە ئەوکات هەموو ڕۆژێ لە ڕۆژنامەکانی ئیستانبووڵ هێرش دەکرایە سەر بەسێ خانم، ئەوەش زۆر بێتاقەتی کردبووم، بەرامبەر بەو ناڕاستییانە، لەناو قوتابیان، وەك لاوێکی خوێنگەرم بەردەوام بەرپەچی هەواڵ و نووسینی ئەو ڕۆژنامانەم دەداوە. هاورێکانی قوتابخانەشم ئاگاداری ئەوە بوون، بۆیە بە گاڵتە و تێکەڵەیەك لە ڕاستی پێیان دەگوتم: "ئەوەی بەسێ". ڕۆژێك لە کاتی وانە گوتنەوەی مامۆستا، لە کورسییەکانی دواوە پارچە کاغەزێکیان بۆ نادرم، کردمەوە و بینیم لەسەریان نووسیبوو (ئەوەی بەسێ)، دوای دەرچوونی مامۆستاش بە دەنگێکی بەرز پڕ بە گەروویان پێم پێکەنین.

شەوێك، کاتێك ببومە چاودێری پۆل، چوومە پۆلەکە و بینیم چەند هاورێیەکم لەوێن، بەڵام ئەوان بەیەکەوە و بەیەك دەنگ

هەر کەمنیان بینی گوتیان: "بەسێی بگ.......م، منیش چوومە سەر کورسـی مامۆسـتاکەم و ڕووم لەوان کـرد و گـوتم: "منـیش زوبەیـدەی[1] بـگ.......م". دوای ئەوە لە نێـوان خۆمـان ڕووداوەکەمان لە بیرکرد و وەك گاڵتەیەك وەرمان گـرت، بەڵام هاوپۆلێکمان کوڕی پۆلیسێکی ئەدەنە بوو بە نـاوی عەدنـان، ئەو چووبوو ڕاستەوخۆ چیمان کردبوو هەمووی بۆ باوکی گێڕابۆوە، بۆیە ڕۆژی دواتر چەند پۆلیسێك هـاتنە قوتابخانەکەمـان و منیـان بـردە بـنکەی پـۆلیس، لەوێ پێـنج ڕۆژ مـامەوە، ئەمەش یەکەم دەستگیرکردنم بوو لە ژیانمدا.

دوای بینـە و بەردەیەکـی زۆر، بەڕێـوەبەری قوتابخانەکەمـان چووبـووە لای پارێزگـار و گوتبـووی: "جەنـابی پارێزگـار، قوتابییەکان دەزانن مووسا کـوردە، بـۆیە بەسـێیان بە داپیـری ئەو داناوە و جنێویان پێداوە، مووساش هاوپۆلەکانی بە تـورك زانیـوە و زوبەیدەی بە داپیری ئەوان زانیوە بۆیە بە هەمان شـێوە ڕەدی داونەوە"والیش، جـگە لە بەڕێـوەبەر، هەمـان بـابەتی لەلایەن دوو کوڕی تەوفیق هادیش بۆ دەگێڕدرێتەوە، بـۆیە بەڕێوەبەرکەمـانی دڵ سارد نەکرد و بڕیاری ئازادکردنی منی دەرکردبـوو، چـونکە ئەوسا پۆلیس، بەر لەوەی بیباتە بەردەم دادوەر، دەیتـوانی شـەش مانگ کەسێك دەستگیر بکات.

دوای دەرچوونی لە لای پارێزگـار، بەڕێوەبەرەکەمـان خـۆی هات و منی لە بـنکەی پـۆلیس دەرهێنـا، لە ڕێگـای گەڕانەوەش دوو ئامۆژگـاریی کـردم، کە ئەو ڕووداوە لەگەڵ هـیچ کەسـێك باس نەکەم، دووەمیش ئەو دەرسانەی لە ماوەی ئەو چەنـد ڕۆژە

---

[1] دایکی مستەفا کەمال ئەتاتورکە (وەرگێڕ).

لە کیسم چووە دەبێ بە زووترین کات تۆڵەیان بکەمەوە.

دوای گەڕانەوەم بـۆ قوتابخـانە، بینـیم ئەو نـۆ قوتـابییەی جوێنەکەیـان پێـداوم، بەشـێوەیەکی ناچاری لە قوتابخـانە دوور خراونەتەوە. ئیدی کەوتمەوە سـەر خوێنـدن و وامزانـی بـابەتەکە کۆتـایی پێهـاتووە، بەڵام دوای دوو مانـگ شـەوێك بانگهێشـت کـرامە ژووری بەڕێـوەبەر، کە چـووم بینـیم پیـاوێکی نەناسـراو لەوێ دانیشـتبوو، تـومەز ئەوە سـەر داواکـاری گشـتی ئەدەنەیە. دوای گەیشتنم جەنابیان کـاغەزێکی لەنـاو جانتـاکەی دەرهێنـا و بۆی خوێندمەوە و دواتریش پێی واژوو کردم، دیار بـوو لەسـەر ئەو جنێودانەی مـن بە دایکـی، لە ئەتاتورکیـان پرسـی بـوو ئایـا سکاڵا لەسەر مووسا تۆمـار دەکەی یـان نـا؟ ئەویـش گوتبـووی نامەوێ سکاڵا تۆمار بکەم. داواکاری گشتی ڕووی لە مـن کـرد و گوتی: "گوێبگرە کوڕی خۆم، ئەتاتورك تۆی بەخشـی، تـۆش جـارێکی دیـکە هەڵەیەکـی ئـاوا منـداڵانە مەکەوە". منـیش بە سـاردی سوپاسـی ئامۆژگـارییەکەیم کـرد و دواتـر دەسـتی بەڕێوەبەرم ماچ کرد و لە ژوورەکە دەرچووم.

ڕووداوەکـانی دێرسـیم کـاری لە هەمـوو کـوردێکی دڵسـۆز کردبوو. ئەوەندە کۆمەڵکوژی و تاوان کرابوو، بەدەسـت خـۆت نەبـوو پێـیەوە بێتـاقەت دەبـووی. دەمەوێ لێـرە بـاس لە دوو دۆسـیەی ئەو تاوانەنـانە بـکەم، ئینجـا دەمەوێ بچـمە سـەر گێڕانەوەی بەسەرهاتێك لە کاتی خوێندنی قۆناغی زانکۆ بەسەرم هات.

سـەرۆکی ئەوسـای هێـزە ئاسـمانییەکانی تورکیـا (موحسـین بـاتوور)، لە سـاڵی ١٩٨٥ لە ژێـر ناونیشـانی (**بەسـەرهات و بۆچوونەکان، پشت پەردەی سێ خولی جیاواز**)، پەرتـووکێکی بڵاوکردبۆوە. نووسـەر لە پەرتـووکەکە چەنـد بەسـەرهاتێکی بەم

شـێوەیە نووسـیوەتەوە: "سـاڵی ١٩٣٨ بە یەکجـاری لە ئەڵازی دامەزرایـن، بەڵام دوای هـاتنی فەرمانێـك لە ئەنـقەرەوە لەگەڵ یەکەکەم بەشداریی پێشگرتنی جووڵانەوەکانی دێرسیممان کـرد، بەڵام داوای لێبـووردن لە خـوێنەرانم دەکەم و ئەو لاپەڕانەی ژیانم نانووسمەوە". جەنابی نووسەری فەرماندە زۆر لەسەر حەقە، چـونکە بە دەسـتە خوێناوییەکـانییەوە چ ڕوویەکـی هەیە ئەمـڕۆ لاپەرەکانی ژیانی ئەوڕۆژەیمان بۆ بنووسێتەوە.

ئەوەی دووەمیـان چـاوپێکەوتنێکی (سـەبیحە گـۆکچەن)ی کچـی مەعـنەوی ئەتـاتورکە. ئەو لە ١٥ ی مـانگی دووی سـاڵی ١٩٩٠ لە دیـــدارێکی تەلەفزیۆنیـــدا، کاتێـــك باســـی یەکەم تاقیکردنەوەی فڕۆکەوانی خـۆی دەکـرد، دەیویسـت بە خێرایـی بڵێ ئەو یەکەم ژنە فڕۆکەوان بووە کە بەشداریی ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی کردووە، وەلێ دەیویسـت خۆی لە ناوی ئۆپەراسـیۆنی سـەر دێرسـم بـدزێتەوە، کە تەڕ و وشـك و گەورە و منـداڵیان بەیەکەوە سووتاند. چونکە لە بیرمە ئەوسا سـەرجەم ڕۆژنامەکـان ڕۆژانە بە وێـنەی گەورە و مانشـێتی درشـت، دەیاننوسـی (بـژی پاڵەوان سـەبیحە گـۆکچەن) جـا لە پـاڵ ئەو مانشـێتانەش وێـنەی ئەویان لە کاتی بەشداریکردنی ئۆپەراسـیۆنەکە بـڵاو دەکـردەوە. ئەوکـــاتەی لە ســـاڵی ١٩٣٨ ئەتـــاتورك هـــاتە ئەدەنە، ســـەبیحە گۆکچەنیشم لە نزیکەوە بینی.

کاتی خۆی، لە زانکۆ و ئامادەیی، ساڵانە لە کۆتـایی وەرزی خوێندن بۆ ماوەی بیست ڕۆژ کامپێکی ئامادەکاریی سەربازی بۆ قوتابیـان دەکـرایەوە. کـامپی ١٩٤١ ی زانکۆمـان لـە نـاوچەی پەندیك لە ئیستانبوڵ بوو. ئەوسا پەنـدیك گونـدێکی بچـووکی ئاوارەکان بوو، دەوروبەرەکەی تژی دارستانی زەیتوون بـوو، کە لە ڕۆمەکانەوە جێمـابوو. ئەو ڕۆژەی چـووینە کـامپەکە، ڕائیـدی

کامپەکە ئێمەی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندین نابێ ئاودەستی گەورەمان لەناو مەقەڕەکەمان بکەین. لە نێوان برادەران دوای ئەو ئاگادارکردنەوە، ناوی ڕائیدەکەمان کردە ئاودەستی گەورە. چەند ڕۆژێك دواتر ڕائید ئەوەی بیستەوە، بەڵام هیچی لەگەڵمان پێ نەکرا، دواتر نەخۆش کەوت و ئێمەی جێ هێشت. لە شوێنی ئەو ئەفسەرێکی دیکە هات ناوی ئەسم ئەرەن بوو کە توندییەکەی بە توندیی ژەنەڕاڵ (ڕۆمەڵ)ی ئەڵمانی دەچوو، ئەو وەك سەربازەکانی جەنگ کاری پێدەکردین، بەردی دەخستە ناو جانتاکانی پشتمان و بارەکانی ٣٥ کیلۆ و پتریش دەکردین. ڕۆژێك بە پێ دەڕۆیشتین و لە ناوچەی یاکاجك چەند خولەکێك بۆ پشوودان وەستاین. ئەفسەرێکمان بە ناوی ڕەفیك تولگا، کە دواتر بووە ژەنەڕاڵ و دواتریش سەرپەرشتیاری دۆخی لەناکاوی سەربازیی ئیستانبوول کرد، لە تەك منەوە سواری ئەسپ ببوو. هاوڕێیەکم، سلێمان ئەلبانیی ناوبوو و دۆستێکی زانکۆم بوو، لە تەك منەوە زۆر بە جوانی وەك ماینێك حیلاندی، بۆیە ئەسپەکەی جەنابی ئەفسەر پێشووی بۆ ئاسمان بڵند کرد، زۆری نەمابوو کاکی ئەفسەر لەسەر پشتی ئەسپەکە بکەوێتە خوارەوە، بۆیە تووڕە بوو و ڕووی لە من کرد و گوتی: "هەتیو کا بێنە ناسنامەکەت"، منیش ناسنامەکەم دایە.

دوای ڕووداوەکە سلێمانی هاوڕێم لە ترسان هەڵتۆقی. کە بووە ئێوارە منیان بانگهێشتی بارەگای سەربازی کامپەکەمان کرد، هاوڕێکانم بۆ من زۆر بە پەرۆش بوون، چونکە دەیانزانی ئەسم ئەرەن لە سزادان چەند توندە. دوای ئەوەی منی بینی، ئەسم ئەرەن گوتی: "ئەوە تۆبووی ئەو کارەت کرد ها؟"، منیش گوتم: "نەخێر من نەبووم، چونکە گەر ئێستا لە سێدارەشم بدەن ناتوانم وەك ماین بحیلێنم". ئەویش لێی پرسیم: "باشە ئەی گەر

تۆ نەبووی کێبوو؟"منیش گوتم: "گەورەم گەر ڕێگام بدەن نامەوێ ناوی بهێنم، چونکە ئەی ئێوە لێرە وەك سەربازێك فێرمان ناکەن کە پیاوانە بین و مەرد بین؟، بۆیە زمان لێدان لە ئێمە ناوەشێتەوە؟ دووبارەی دەکەمەوە ئەو دەنگە لەمنڕا نەبووە، بەڵام من بۆ وەرگرتنی هەموو سزایەك ئامادەم، بەڵام وەك سەربازێك ناوی هاوڕێکەم ئاشکرا ناکەم". لە وەڵامدا ئەفسەرەکەمان گوتی: "ئافەرین کوڕی خۆم، بەڵام بەو کەرە بڵێ جارێکی دیکە کاری وا نەکات".

ڕۆژێك لە کامپەکەمان لە ژێر سێبەری دارێك پشوومان دابوو، سەجادەدین ناوێکی ئەفسەری پلە یەکەکەی ئێمە، بە هەوەسێکی زۆرەوە باسی یادگارییەکانی خۆی لە ئۆپەراسیۆنەکانی سەر دێرسیم دەکرد.

لەناو ئەو چەندان ڕووداوەی گێڕایەوە دەمەوێ یەك دوو دانەی بۆ ئێوەش باس بکەم."لە دێرسیم هەنگاوێکی گەورەی لەناوبردنمان دەستپێکردبوو، لە یەکێك لە ئەشکەوتەکان خێزانێکمان دۆزییەوە لە باپیرێك و دایك و باوکێك و منداڵێکی چوار پێنج ساڵان پێکهاتبوون، گەورەکانیانمان لەوێ دا بەر ڕم و نێزە و هەر لەوێ تەواومان کردن. منداڵەکەشمان هێشتەوە بەڵکو زانیارییەکی لێ دەربهێنین، چونکە نەماندەتوانی هیچ شتێك لە گەورەکانی دێرسیم وەرگرین، ئەمەش وای دەکرد دوای دۆزینەوەیان ڕاستەوخۆ سەریان بپەڕێنین، چونکە دەمانزانی هیچ شتێك ئاشکرا ناکەن. سەرەتا بۆ ئەوەی منداڵەکە نەترسێ، کاتێك دایك و باوك و باپیریمان سەر بڕی ئەومان بردە لایەکی دیکە، هەوڵیشمان دەدا ببینە برادەری منداڵەکە، نانمان دەدایێ، شەکرۆکەمان دەدایێ، بەڵام ئەو هیچی لێ وەرنەدەگرتین.

ماوەیەك بەسەر چوو، نازانم چ کاتێك بوو، بەڵام لەو سەر و بەندە فڕۆکەیەکی سەربازی خۆمان بەسەرماندا تێپەڕی، لە پڕ ئەو منداڵەی کە خۆی گرمۆڵە کردبۆوە و هیچی نەدەخوارد، هەر کە فڕۆکەکەی بینی دەستی دا پارچە دارێك و وەك چەك نیشانەی لە فڕۆکەکەمان گرت، کە ئەو دیمەنەم بینی زۆر تووڕە بووم و فەرمانم کرد ئەو بێژیەش لەناو ببەن، سەربازەکانیش بە پیل ڕاکێشان منداڵەکەیان بردە سەر شاخێك و لەوێوە فڕێیاندا خوارەوە".

"ڕۆژێکی دیکە لە ئۆپەراسیۆنێکی فراواندا بە هەزارەها کوردمان لە ئەشکەوتەکان دەستگیر کرد و هێنانمانە خوارەوە، لە دەشتاییەك خڕمان کردنەوە و فەرمانی کوشتنیان درا، بەڵام فەرماندەکەمان گوتی پێویست ناکات ئەوەندە گولە لە کوشتنی ئەوانەدا بە فیڕۆ بدەین، بەڵکو بیانبەن لە ئاوی ڕووباری (مونزر) بیانخنکێنن، ئێمە ئەوانمان بە پێش خۆماندا و بەش بەش دەمانبردنە سەر پردی مونزر و لەوێش فڕێمان دەدانە ناو قووڵایی ئاوی ڕووبارەکە، ئەوانەی نەشدەهاتن بە زەبری هێز و لێخوڕینەوە بە پێش خۆمان دەدان و دەمانخستنە ناو ڕووبارەکە. ئیدی کۆمەڵ کۆمەڵ دەمانهێنان و فڕێمان دەدانە خوارەوە، ئەوان خۆیان بەیەکەوە بەستبۆوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی ڕادەستی ئێمە نەبن، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە لە چەند لقەداری تەڕ هەندێك شووڕکم دروست کردبوو، بۆیە فەرمانم کرد ئەوانەی ناچنە سەر پردەکە بە شووڕکان لێیان بدرێت، لە خوار پردەکەش، لە کەنار ڕووبارەکە چەند سەربازێکم جێگیر کردبوو بۆ ئەوانەی ڕاستەوخۆ دوای فڕێدانیان ناخنکێن و دەیانەوێت بە مەلە کردن خۆیان ڕزگار بکەن."

ئەو دوو ڕووداوەی سەرەوە دەریدەخا چەندە دوژمنێکی گەورەی مرڤایەتین، ئەم نووسین و گێڕانەوەشم بۆ ئەوە نییە تۆڵە بکەینەوە، چونکە تۆڵەکردنەوە لە دینی محەمەد هاتووە، لەگەڵ ئەوەی ئێمەش لەسەر ئایینی ئەوین، بەڵام ئەو نووسینە تەنیا بۆ ئەوەیە نەوەکانی داهاتوو ئاگاداری ڕووداوی لەو شێوەیە بن و جارێکی دیکە ڕێگا بە دووبارە بوونەوەی نەدەن. هەمان ئەفسەر، بێ ئەوەی شەرم لە خۆی بکاتەوە، کە ئەویش لە ژن بووە، کەچی دەیگوت: "کچێکی کوردی دێرسیمی دوازدە سێزدە ساڵانمان، بە چەندان ئەفسەر لاقە کرد و هەر بەو شێوەیەش کوشتمان". جا کێ دەزانێ ئەو ئەفسەرانە ساڵانی دواتریش بۆ تەواو کردنی ماوەی سەربازییان لە کوردستان دانەمەزراون!؟.

## ساختەکاری

بەبێ باسکردنی چاپکردنی پارەی ساختە لە ئامادەیی ئەدەنە، کۆتایی بە بەسەرهاتەکانی ئەوێم ناهێنم. نێوانی ئامادەییەکەمان و ناو شاری ئەدەنە نزیکەی دوو کیلۆمەتر دوور بوو. نزیکەی هەزار قوتابی، ئەوانەی بە ڕۆژ دەیانخوێند، نیوەڕۆیان بۆ کاتی نان خواردن بە پایسکیل یان بە گالیسکەی ئەسپ، یاخود بە پێ دەچوونەوە ماڵ و دوای نانی نیوەڕۆش بۆ وانەکان دەگەڕانەوە قوتابخانە. ڕۆژێك بیرم لەوە کردەوە گەر نان و هەندێك خواردنی سادە لەوێ دانێم، هەم بەشێك لەو دۆستانە لەو شەقەتیەی چوونەوە ماڵ ڕزگار دەکەم، هەمیش لە ڕێگای خێرەکەیەوە هاوکاری دەگەیەنمە یەکێتیی هاوکاریی قوتابیانی قوتابخانەکەم. بەدەم ئەو ورتە ورتانەی خۆمەوە چوومە لای

بەڕێوەبەر و بیرۆکەکەم پێگوت، ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی: "جا کوڕم بۆ ئەو کارە، پارەت هەیە؟"منیش گوتم: "بەڵێ دوازدە لیرە و پەنجا قروشم هەیە، بۆیە گەر ئێوە ڕێگام پێبدەن من دەتوانم تەرتیبی بکەم". لە باخچەی قوتابخانەکەمان شوێنێکی باش هەبوو بۆ ئەو کارە، بۆیە بەڕێوەبەر گوتی: "بە مامۆستا سەبری چافوش بڵێ لە دامەزراندنی ئەو حانووتە هاوکاریت بکا".

شوێنێکی قشتم ئامادە کرد، دواتر چوومە ناو شار و مۆرێکم بەناوی یەکێتیی هاوکاریی قوتابیان دروست کرد و لە سێ ڕەنگی جیاوازیش سێ جۆر کارتۆنم کڕی. کارتۆنەکانم لە قەبارەی بلیتێکی شەمەندەفەر بڕی، لەسەر هەر ڕەنگێکیش نووسیم پێنج قروش، لەسەر یەکێکی دیکەیان دە قروش و لەسەر ئەوەی سێیەمیشیان سەت قرووش، ئینجا هەموویانم مۆر کرد، بەم شێوەیە ۱۵۰ لیرەم دروست کرد. ڕۆژی دواتر داوام لە فڕنیەك کرد ۱۰۰ سەموونم بۆ دروست بکات، ئینجا چووم کیلۆیەك پەنیر و کیلۆیەك سجوق و کیلۆیەك پاسترمە و سندوقێك تەماتە و ئارووم کڕی. سەموونەکانم کردە دوو بەش و بووە ۲۰۰ پارچە، بە تەعبیری ئیمڕۆ لەفەمان دروست کرد، نرخی هەر لەفەیەکیش پێنج قروش بوو، کاتێك دۆست و برادەری قوتابخانە زانیان شوێنێکی ئاوا کراوەتەوە، یەکەم ڕۆژ لە ماوەیەکی کەم هەر ۲۰۰ لەفەکە تەواو بوو. کە قوتابییەکان دە قرووش یان بیست قروش و پەنجا قروشیان دەدا، ئێمە زۆر جار خوردەمان نەبوو بیاندەینەوە، بۆیە ئەو کارتۆنانەمان دەدانەوە

کە خۆمان دروستمان کردبوو، چونکە ڕۆژانی دواتر دەیانتوانی بە هەمان کارتۆن قوتابییەکە لەفە بکڕێت، واتە کارتۆنەکان پارە نەبوون، بەڵام بەهای پارەیان هەبوو، بەمشێوەیە لە ماوەی چەند ڕۆژێك ئەو کارتۆنانەی دروستمان کردبوون، وەك پارە چووە گیرفانی قوتابییەکانەوە. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئیشمان باشتر و فراوانتر دەبوو، زۆر شتی دیکەشمان زیاد کردبوو، هەر لە خواردن بگرە تا کەلوپەلەکانی پەڕاوگە، بە تایبەتی یارییەکی چوکلێتمان هەبوو وەك ئاوی کانی پارەمان لێ قازانج دەکرد. لە پاکەتێکدا پەنجا دانە چوکلێت هەبوو، هەر دانەی بە سێ قروشمان دەکڕی، وێنەی هونەرمەندە ناودارەکانیان تێدا دەردەچوو، بۆیە قوتابییەکان بێ بەردەوام دەهاتن چوکلێتیان دەکڕی و یارییان بە وێنەکانیان دەکرد، هەندێك ڕۆژ دوو قوتوو چوکلێتمان دەفرۆشت، ئەوەی لە یارییەکەش زۆری قازانج دەکرد، نەیدەزانی چی لەو هەموو چوکلێتە بکات، ئیدی بە ناچاری بە نرخێکی کەمتر بە ئێمەی دەفرۆشتەوە، ئێمەش چوکلێتەکانمان ڕاست و جوان دەکردەوە و لە شوێنی خۆیانمان دادەنانەوە و هەمدیسان بە پێنج قرووش پێم دەفرۆشتنەوە. یانی تا چوکلێتەکە لەبار یەك هەڵدەوەشاوە هەشت نۆ جار دەمانکڕی و دەمانفرۆشتەوە.

لە کۆمەڵەی قوتابییەکانی قوتابخانەکەمان نزیکەی ٤٠ قوتابی هەبوون کە پێویستیان بە هاوکاری بوو، بۆیە ئەو پارەیەی قازانجمان دەکرد دەمانبردە لای یاریدەدەری بەڕێوەبەر و ئەویش هاوکاریی قوتابییەکانی پێدەکرد.

کە ئامادەیم تەواو کرد، داوام لە بەڕێوەبەر کرد حانووتەکەیان ڕادەست بکەمەوە، بەڵام یاریدەدەری بەڕێوەبەر گوتی: "کوڕم خۆ ئێمە هیچمان نەداوەتە تۆ تا تۆ شتێکمان بدەیەوە، بۆیە چەندی دەتەوێ بۆخۆت هەڵگرە و تەنیا کلیلەکەمان بدەوە". منیش بە ناچاری پەنجا لیرەم بۆخۆم هەڵگرت و بە قەد دووکانێکیش حانووتێکی گەورەم بۆ جێ هێشتن.

دەمەوێ ئیدی کۆتایی بە یادەوەرییەکانی ئەدەنەم بێنم، چونکە گەر باسی هەمووی بکەم، لاپەرەکانی ئەو کتێبە بەشیان ناکا، بەڵام بەر لەوەی کۆتایی پێبهێنم دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە بەسەرهاتێکی دڵداریشم لە ئەدەنە هەیە. ئەوسا هاوپۆلێکی خۆشەویستم هەبوو ناوی نیهاد جالبە بوو، ئەو خوشکێکی هەبوو ناوی عایشە بوو، خۆشمویست، پێم وابێ ئەویش منی خۆشویست، بەڵام نەبووە قسمەت.

## بەشی دووەم
## ئیستانبووڵ - ١٩٤١

دوای ماڵئـــاواییکردن لە ڕەفیقەکـــانم، لە ئەدەنەوە ســـواری شەمەندەفەر بووم بەرەو ئیستانبووڵ، دوای دوو ڕۆژ لە وێستگەی گشتیی حەیدەر پاشا دابەزیم. وەی بـابە ئەوە چییە دیسـان! وەك جـاری یەکەم کە لە گونـدەوە چوبـوومە ئەدەنە، هەمـان شـتم بەسەر هاتەوە، وێستگەیەکی گەورەی شەمەندەفەر و ئەسـکەلە و کەشتی و دەریا، هەموو ئەو شتانەی یەکەمجار بوو دەمدیتن. ئەو کەشتییەی سواری ببـووم، وردە وردە لە ئەسـکەلەی کەرەکـۆی نزیك بۆوە، بە زەحمەت کەرستەکانی خـۆم هەڵگـرت، چونکە دوو بـاولی داری تـژی پەرتـووك بـوون، لەگەڵ چەنـد پـارچە جلێك، کە بلوزێکیان عائیشە بە دەستی خۆی بۆی چنیبووم.

لەگەڵ کـردنەوەی دەرگـای کەشـتییەکە کۆمەڵێـك حەمبـاڵ تاویـان بـۆ هێنـام، دەرفەتـی ئەوەم نەمـا شـتێك بڵـێم، یەکێکیـان هەردوو باوڵەکەی بۆ هەڵگرتم، منیش وەك نەشـارەزایەك بەدوای کەوتم، لە بری ئەوەی من ئەو ئاڕاستە بکەم، ئەو بە منی گـوت: "دەچنە کوێ؟"منیش گوتم: "دەچمە سیرکەجی تـا میوانخـانەیەك بـدۆزمەوە". بە پـێ لە پـردی نێـوان کەرەکـۆیی و سـیرکەجی پەڕینەوە، ئەوسا مەیدانی ئیمنینۆی نەبـوو، تەنیـا ڕێگـایەکیش ئەو تولە ڕێیەی ترامڤای بوو. لە ڕێگا حەمباڵەکە لە پێشـەوە چوسـت و چـالاك، منـیش بەدەم سـەیرکردنی دەوروبەرم خـاو خـاو لە

دوای دەڕۆیشتم، بۆیە لەبری ئەوەی بە تورکی پێم بڵێ، بە کوردی گوتی: "دە وەرە کوڕۆ". حەمباڵەکە ئەوەی گوت، بەڵام لە دەوی دەرپەڕی، بۆیە بەو قسەیەی زانیم کوردە، بۆیە تۆزێك دوودڵییەکەم ڕەوییەوە و گوتم: "کاکۆ تۆ خەڵکی کوێی؟"ڕووی تێکردم: "تۆش کوردی؟"سەرێکم بۆ لەقاند، دواتر کاکەی حەمباڵ: "من خەڵکی پۆتورگێمە". بەدەم ئەو قسانەوە گەیشتینە سیرکەجی. لەوێ بە دوای میوانخانەیەکی هەرزانـدا دەگەڕام، لەسەر باڵەخانەیەك نووسرابوو هۆتێل حەلەب، گوتم ڕەنگە ئەوە شوێنێکی شەعبی بێ و نرخەکەی هەرزان بێت، بۆیە چووینە ژوورەوە و لە کارمەندی پێشوازییەکەم پرسی: "کاکە گیان لە دەرەوە نرخی شەوێك نووسراوە دوو لیرە و نیو، ئایا ڕاستە؟"ئەویش بە بەڵێ وەڵامی دامەوە. من ئەو نرخەم بە کێشە نەزانی چونکە حەڤدە لیرەم پێبوو، ڕۆژی دواتریش دەچوومە قوتابخانەکەم، بۆیە کارمەندەکە ژوورێکی یەك نەفەریی پیشاندام، دواتر گوتمە حەمباڵەکە"حەقی تۆ چەندە کاکۆ؟"ئەویش گوتی: "گەر کەسێکی دیکە با ١٠ لیرەم لێ وەردەگرت، بەڵام با ئەوەی تۆ پێنج لیرە بێ، سەیرمکرد پارەم کەم پێدەمێنێت، بۆیە گوتم: "برا دەمژمێرێکی جوانی گیرفانم هەیە، لە بری ئەو پێنج لیرەیە ڕازی دەبی ئەوت بدەمێ؟"ئەویش قبووڵی کرد و وەك کەسێکی شارەزا دەمژمێرەکەی بە گوێیەوە نا و هەندێك هەستی بۆ ڕادێرا و گوتی: "باشە وەری دەگرم"، ئیدیماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت.

بەیانی یەکەم کارم ئەوە بوو بچمە قوتابخانەی (ڤەفاکی باڵا). لە یەکەم ساتی چوونە قوتابخانە چیم بینی، هەر زوو هەستمکرد ژیان لێرە زۆر تایبەت و جیاوازە، وەك چۆن لە نێوان ئەدەنە و ماردین چەند جیاوازی هەبوو، لە نێوان ئەدەنە و ئیستانبووڵیش

دوو ئەوەندە. کچ و کوڕ بەیەکەوەن و تەنیا شوێنی خەوتنیان لەیەك جیاوازە، ئەو کوڕانەی تۆزێك لە ئێمە گەورەتر بوون، هەریەکە و دەستی کچێکی گرتووە و لە باخچە پیاسە دەکەن و کەس بە خراپە تەمەشایان ناکا و ئەوانیش لەو ناوە بۆخۆیان لەگەڵ ئەو کچانە تەراتێن دەکەن. چوومە بەشی کارگێڕی و نووسراوە فەرمی و ئەوراقەکانم پێشکەشکردن، کاك ڕاتیب، بەرکاری بەڕێوەبەری ڕێزدار، بە هەستێکی باوکانە پێشوازیی لێ کردم، فەرمانی بە کارمەندەکانی کارگێڕی کرد کاروبارەکانم جێبەجێ بکەن و ناوم تۆمار بکەن، ئینجا شوێنی مانەوەشم بۆ دابین بکەن. دواتر جەنابی بەڕێوەبەر پێی گوتم: "بەیانی لە ناوچەی ڤەزنەجلار دەچییە باڵەخانەی زەینەب کەمال، لەوێ لە کۆلێژی ئەدەبیات دەچییە بەشی فەلسەفە و ناوی خۆت تۆمار دەکەی، دوای تۆ هاوپۆلەکانی دیکەشت دێن، بەر لە تۆش دوو هاوپۆلی دیکەت هاتوون، ڕەنگە ئەوان بتوانن هاوکاریشت بن". ئەو دوو هاوپۆلەی جەنابی بەڕێوەبەر باسی کردن، جاڤیت ئۆرهان و سەباحەتین باتوور بوون.

بە زەوق و هەوەسێکی زۆر و تازەوە دەستمان بە خوێندنی وانەکانی بەشی فەلسەفە کرد. ئەو مامۆستایانەی ناوەکانیانم تەنیا لەسەر کتێبەکان بینی بوو، دەهاتنە دەرسەکانمان و وانەیان پێدەگوتین. ئەمەش وایکرد هەستبکەم هەموو دونیا هی منە، لەوانە پرۆفیسۆر ڤان ئاستۆر، جگە لەو ناوانە، لە زانکۆ کەسە گەورەکانی دونیای ئەدەبیات و مێژووشم، کاتێك لە دوورەوە دەبینی، کەلەجانێکی زۆریان پێدەبەخشیم، لەوانە خالیدە ئەدیب و مێژووناس موکریمین خەلیل و ئەحمەد جەعفەر ئۆغلوو و سەدری مەقسوودی و چەندانی دیکە.

کاتێك چووبووینە ناو بابەتە فەلسەفییەکان و هەموو هەوڵێکم

بۆ سەرکەوتنم بوو لەوبەشە، بە ڕێکەوت چەند قوتابییەکی کوردم ناسی، بەڵام فایەق بوجاك لە هەموویان زیاتر لێم نزیك کەوتەوە، ئەو لەبەشی یاسا دەیخوێند. لە ماوەیەکی کورت بووینە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی، بۆ ئەوەی زیاتر بەیەکەوە بین داوای لێ کردم بەشەکەم بگۆڕم و بچمە بەشی یاسا بۆ لای ئەو، چونکە ئەوسا قوتابی بە ئارەزووی خۆی دەیتوانی لەماوەیەکی دیاری کراو بەشەکەی بگۆڕێت، چونکە دوای تەواو کردنی ئامادەیی هەڵبژاردنی بەش ئازادانە بوو، هێشتا کات درەنگ نەببوو، ئاخر هەر مانگێك بوو خوێندن دەستی پێ کردبوو، بۆیە هەر زوو مامەڵەکانی کۆلێژی ئەدەبیاتم گواستەوە بۆ کۆلێژی یاسا.

## هاوسەرگیری

پێشتر ئاماژەم بەوەکرد ساڵی ١٩٤١ هاتمە ئیستانبووڵ، لە سەردەمی دووەمین جەنگی جیهانی زۆرم پارە قازانج دەکرد، لە ڕووی ماددیەوە گوزەرانم زۆر باش بوو. گەنج بووم، بەڵام تا ئەوکات وەک ڕەبەنێکی دێرێ ژیابووم، قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیم لە بەشە ناوخۆیی قوتابخانەکانم بەسەر بردبوو، وەك چۆن سێ چوار ساڵ لە ئیستانبووڵیش بە هەمان شێوە ژیام. زۆرم کچ لە دەوروبەریدا هەبوون، بەڵام بیرم لەوە کردەوە گەر هاوسەرگیری لەگەڵ کچێك نەکەم کە خاوەن خێزانێکی ڕێك و پێك بێ، ئەوە ڕەنگە پەرێشان ببم، چونکە هیچ زانیاری و تەجروبەیەکم لەسەر هاوسەرگیریی شارستانان نەبوو. دەمویست ئەو کەسەی ژیانی هاوسەریی لەگەڵ پێك دێنم لە خێزانێکی کورد بێت، ئەو ویستەشم لە ئەنجامی

بیرکردنەوەیەکی نەتەوەپەرستانە سەرچاوەی نەگرتبوو، بەڵکو تەنیا دەمویست لەگەڵ کەسێك هاوسەرگیری بکەم کە دابونەریتمان وەکو یەك بێت. لە کۆتاییدا لەگەڵ ماڵباتی عەبدولڕەحمان ڕەحمی زاپسوو یەکدیمان ناسی، ئەوان ڕێك ئەو خێزانە بوون کە من دەمویست، چەند کچێکیان هەبوو لە قوتابخانەی (ساینت جۆرج)ی نەمسایی دەیانخوێند و تەمەنیان دە ساڵێك لە من بچووکتر بوو، یەکیان دایکی ئەمڕۆی منداڵەکانمە، لەگەڵ عائیشە هالە عەنتەر ژیانێکی نوێمان دروستکرد.

لە یازدەمین ڕۆژی دوا مانگی ١٩٤٤ ژیانی هاوسەریم پێکهێنا، لە ١٨ ی تەباخی ١٩٤٥ کوڕی گەورەم عەنتەر لە دایك بوو، ئەوسا لە تورکیا قەدەغە نەبوو، کە ناوی باوك لە منداڵ بندرێت، بۆیە منیش ناوی باوکم لە کوڕە گەورەکەم نا، بەو شێوەیە منداڵەکەم ناوی بووە، (عەنتەر عەنتەر). دەمانویست کچێکیشمان ببێت، لە ١٨ ی مانگی دەی ١٩٤٨ کچێکیشمان بوو، منیش ناوی (ڕەشێ)ی پوورم لێنا، بەڵام گەر دەزانن ڕەشێی هەش بەسەری منداڵی ئەشکەوت، لە ئیستانبوول ناوەکەی چۆن بووە (ڕەخشان)، کێشە نەبوو، چونکە کوردایەتیمان لەسەرووی هەموو شتێکەوە بوو. دواتر ویستمان منداڵێکی دیکەشمان ببێت، لە ٣٠ ی مانگی سێی ١٩٥٠ کوڕی بچووکم (دیجلە) هاتە دونیاوە. بەرواری لە دایك بوونی دیجلە بۆمن ڕۆژێکی تایبەتە، چونکە ئەوکات لە ئیستانبوول، هەموو ساڵێك بۆ ئەوەی ڕۆژێك تەرخان بکەین و یادی نەورۆز لە نێوان خۆماندا بکەینەوە، شەوانەی دیجلەمان ڕێکدەخست.

شەوی ئەو ساڵە (جەلال بەیار)[1]ی سەرۆکی گشتیی پارتی دیموکراتیشمان DP [2] داوەت کردبوو، لەگەڵ ئەو، هەریەکە لە دکتۆر موکەرەم سەرۆڵ و جیهات بابانیش هاتبوون. لەبەر ئەوەی من سەرپەرشتیاری کۆبوونەوەکەم دەکرد، بۆیە میوانەکان لەسەر مێزی من دانیشتبوون، لەگەڵ ئەوەی ڕقم لە جەلال بەیار دەبۆوە، بەڵام سیاسییانە بەدەور و خولیانەوە بووم. چاوەڕوانی هاتنی خێزانەکەم بووم، بۆ بەشداری کردن لە بۆنەکەمان، بەڵام زۆری پێچوو و ئەو هەرنەهات، دڵم کەوتە قرت و فرت، بەدەم ئەو قرتوفرتەی کەوتبووە ناو دڵم، لە ڕێی تەلەفۆنەوە لەلایەن دکتۆرێکی نەخۆشخانەی زەینەب کامیل ئاگادار کرامەوە، بگەمە نەخۆشخانە خوا کوڕێکی پێ بەخشیوون. توومەز بەیانی زوو دوای ئەوەی لە ماڵ دەرچوومە، خانم دۆخی خراپ بووە و خزم و ناسیاویش گەیاندوویانەتە نەخۆشخانە، کاتێك دۆست و برادەران ئەو هەواڵەیان بیست، هەر لەوێ دەستیان دا بڵندگۆی بۆنەکە و گوتیان: "میوانە بەڕێزەکان پیرۆزبایی جەژنانەی ئەوشەومان دەکەینە دوو پیرۆزبایی، چونکە تۆزێك پێش ئێستا

---

[1] جەلال بەیار (١٨٨٣-١٩٨٦). لە نێوان سالانی (١٩٣٧ – ١٩٣٩) لە سەردەمی سەرۆك كۆمار مستەفا كەمال ئەتاتورك سەرۆك وەزیرانی توركیا بووە. لە نێوان سالانی (١٩٤٦ – ١٩٥٠) سەرۆكی پارتی دیموكرات بووە. لە نێوان سالانی (١٩٥٠ – ١٩٦٠) سێیەمین سەرۆك كۆماری توركیا بووە. (وەرگێڕ).

[2] لە دوای پارتی گەلی كۆماری CHP، بە دووەمین پارتی سیاسی دادەنرێت لە مێژووی كۆماری توركیا. پارتی دیموكرات دوای ماوەیەكی زۆر لە سەردەمی تاك پارتایەتی لە توركیا، لە ساڵی ١٩٤٦ دادەمەزرێت، لە سالانی (١٩٥٠-١٩٦٠) دەبێتە فەرمانڕەوای توركیا. لە ٢٧ مایسی ١٩٦٠ كودەتایەكی سەربازی بەسەردا دەكرێت و دوای لە دەستدانی دەسەلات، پارتەكەش لە توركیا دادەخرێت. (وەرگێڕ).

هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە برای گەورەمان مووسا عەنتەر کوڕێکیان بووە، بۆیە، بێ ئەوەی پرسی پێبکەین ڕاستەوخۆ ناومان لێنا دیجلە، بۆیە دەمانەوێت بۆچوونی ئێوەش لەسەر ئەو ناوە وەرگرین، تکایە کێ لەگەڵ ئەو ناوە نییە با دەستی بلند کا؟ ئەی کێ لەگەڵیەتی؟"لە پڕ هەموو میوانەکان بە جەلال بەیاریشەوە هەستانە سەر پێ و دەستیان بە چەپڵە لێدان و پیرۆزبایی کرد، منیش مایکرۆفۆنەکەم گرتە دەست و گوتم: "بە شانازییەوە ناوی کوڕەکەم قبوول دەکەم، ئینجا ئەو بەیتەی خوارەوەشم لە دیوانی مەلای جزیری خوێندەوە:

"سەرکەوتنمان هەر وەك نیلە، بەڵام ئێمە دیجلە و فوراتین"

جەلال بەیار لە بەیتەکە نەگەیشت، بەڵام ئامادەبووانی هۆڵەکە تێکڕا کردیانە چەپڵە ڕێزان. گەر نەبێتە بەخۆدا هەڵگوتن، ئێستاش هەندێکجار بیر لەوە دەکەمەوە، گەر بمزانیبا ژیانی منداڵەکانم و دایکیان ئاوا جوان دەبوو، زووتر هاوسەرگیریم دەکرد و منداڵی زیاترمان دەخستەوە، بەڵام شوکر بۆ ئەوەی کە هەشە، چونکە خۆم و منداڵەکانیشم ئەوەندەی لە دەستمان بێت هەوڵمانداوە شەرمەزاری گەلەکەمان نەبین. عەنتەری کوڕم، دوو منداڵی هەیە، کچ و کوڕێك، کوڕەکەی ناوی ڕۆنی مووسا عەنتەرە، کچەکەشم ناوی خوشکی دایکم،واتە"سارا"یان لێناوە، عەنتەر خێزانەکەی خەڵکی سویسڕایە و ئافرەتێکی ڕێك و پێکی دەرچووی کۆمەڵناسییە، بەڵام دەڵێی لە ئەشکەوتەکانی گوندەکەمان گەورە بووە، ئەوەندە شارەزای دابونەریتی کوردەواریمانە.

ڕەخشانی کچیشم دوو کوڕی هەیە، ناویان، باران و ئەرشانە،

ئێستا ئەو دوو نەوەیەم لە سوید یەکێکیان لە قۆناغی ئامادەییە و ئەوەی دیکەشیان لە زانکۆیە، زاواکەشم، واتا هاوسەری کچەکەم، نیگارکێش شەنۆڵ یۆرۆزلوە، یۆرۆز شارەدێیەکی شیرینە لەکەنار دەریای ڕەش، ئێ خۆ لە یۆرۆزیش عەرەب و تورك نینە، هەبێ و نەبێ، لەوێ، ئەحمەد یلدز گوتەنی"کوردی دەریا دیو، لاز هەیە". دیجلەی کوڕم لەگەڵ نەسرینی کچی کاك جەمیلی دراوسێی ماڵەکەی سوعادیەمان خێزانی پێکهێناوە، ئەوان دوو کوڕ و دوو کچیان هەیە و لە سوید وەك خێزانێکی بەختەوەر ژیان بەسەر دەبەن.

ڕەنگە بپرسن بۆچی تەواوی ماڵباتەکەی تۆ لە سوید دەژین؟ ئەی ئەوەش بەشێك نییە لە ئاوارەیی و ڕاگواستن؟ بەڵێ خۆیەتی و هەر لەبەر ئەوەیە. چونکە، عەنتەری کوڕم، هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە تا قۆناغی زانکۆشی دەستپێکرد، سەدان شەو پۆلیس بەسەر ماڵ و منداڵمیان داداوە و دار و بەردیان پشکنیوە، تا ئەو شوێنانەی کە لە جەستەی مرۆڤ و ماڵەکەی بە شوێنی مەحرەمیش دادەنرێن. لە نێوان ساڵانی ١٩٥٩ تا ١٩٦٣ نەمتوانیوە بە ڕێك و پێکی ئاگام لە خێزانەکەم بێت، چونکە بەردەوام لە زیندان و دەربەدەری ژیانم بەسەر بردووە، تا وامان لێهاتبوو، بگەینە ئەو هەستەی ئەو نیشتمانەی زۆر خۆشماندەویست، ڕقمان لێبێتەوە، چونکە بەڕێوەبردنی وڵات کەوتبووە دەست کەسانێك کە نەیاندەزانی حکوومەت بەڕێوەببەن. بۆیە، هاتینە سەر ئەو باوەڕەی لە بری تورکیایەکی نەرێنی بۆ ژیان، سویدێکی ئەرێنی هەڵبژێرین، کە لە زۆر لاوە وەك تورکیایە، بەڵام بە شێوەیەکی ئەرێنی و بێ کێشە، بۆیە سویدمان کردە نیشتمانی دووەمی خۆمان. لەگەڵ ئەوەی من ئامادەبووم سینگم بکەمە لەمپەری هەر ناخۆشییەکی لە کوردستان دەهاتە ڕێمان، پێم وابوو لە بری

ئەوەی لە غوربەت و هەندەران کاتێك مردم ئێسك و پڕوسکم بهێننەوە، ناوەڵا با لەناو خاکی خۆمدا بمرم.

گەر سەرنج بدەن، من لە یادەوەرییەکانمدا خۆم لە سەربوردە خێزانییەکان دزیوەتەوە، چونکە بە پێویستم نەزانیوە شتێکی بۆ کۆمەڵگاکەم پێویست نەبووبێ، لێرە بینووسمەوە. بەشێك لە نووسەران کاتێ یادەوەرییەکانیان دەنووسنەوە، دەڵێن: "دایکم ئەو خواردنانەی دروست دەکرد کە من حەزم لێ بوو، خێزانەکەم منی زۆر خۆش دەویست تاد..."من خۆم لەو جۆرە یادەوەرییانە دوور گرتووە، لەگەڵ ئەوەی ڕاستە ئەو پەرتووکە یادەوەرییە، بەڵام یادەوەریی منە لەگەڵ کورد و کوردستان.

دەزگای هەواڵگریی تورکیا (میت) لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێ: "ماڵی مووسا عەنتەر بووەتە باڵیۆزی کوردستان لە ئیستانبووڵ"، وەك ئەوەی میت دەڵێ نا، بەڵام هەر کوردێك کێشەیەکی هەبا من بەدەمییەوە دەچووم، یان ئەوان دەهاتنە لام، ئەها دەڵێن: "ئەنقەرە ئەنقەرە، هەموو بەدبەختێك دەیەوێ بتبینێ ئەنقەرە"ئەوەی منیش شتێکی لەو شێوەیە، ئینجا پێم وابێ بە زیادەوەش، چونکە هەموو کوردێك بەدبەخت و بەڵەنگازە.

### یەکەمین ڕێکخستن

بۆ ئەو قوتابییە کوردە پەرێشانانەی لە کوردستانەوە هاتبوون و لە ئیستانبوول دەیانخوێند، دروستکردنی بەشە ناوخۆیەك لە ڕۆژەڤدا بوو، کاتێك منیش پشتگیریی بیرۆکەکەم کرد، هەنگاوەکانی کارەکە خێراتر بوون. موفەتیشی گشتیی[1] ئەوسای دیاربەکر (عابدین ئۆزمەن)[2] بوو، ئەویش وەك ئەو پارێزگارە بێ عەقڵەی دۆخی نا ئاسایی ئێستا بوو. لێرە دەمەوێت یەك دوو بەسەرهاتی عابدین ئۆزمەنتان بۆ باس بکەم، چونکە ئەو باسانە دواتر پەیوەندیی بە دامەزراندنی بەشە ناوخۆییەکەمانەوە دەبێت.

سالانی ١٩٢٩-١٩٣٠ کاتێك وەزیری پەروەردەی تورکیا کۆچی دوایی دەکا، ئەتاتورك زۆر دڵتەنگ و خەفەتبار دەبێت، شەوێك لەسەر مێزی خواردنەوە، عابدین ئۆزمەنی خەڵکی نیدە لەوێ دەبێ، بەدەم خواردنەوەوە، ئەتاتورك دەڵێ: "عابدین تۆ دەبیتە وەزیری پەروەردە". عابدینیش دەڵێ: "بەڵام گەورەم من ناتوانم ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ". ئەتاتورکیش بەو دڵتەنگییەی خۆیەوە پێی گوتبوو: "پێت دەکرێ، پێت دەکرێ، کەرەزەلام بۆ

---

[1] سیستەمێکی بەڕێوەبردن بوو لە تورکیا لە نێوان سالانی (١٩٢٧ – ١٩٥٢). موفەتیشی گشتی دەسەلاتی بەسەر هێزی سەربازی و کارگێڕیی ناوچەکەی و دادگاکانی هەبوو. ئەو سیستەمە ڕاستەوخۆ بە سەرۆك کۆماری تورکیاوە گرێدرا بوو. (وەرگێڕ).

[2] عابدین ئۆزمەن (١٨٩٠ – ١٩٦٦). جگە لەوەی لە تراکیا و دیاربەکر، پۆستی موفەتیشیی بۆ ماوەی چەندان ساڵ بەڕێوە بردووە، ئەوکاتەی مستەفا کەمال ئەتاتورك سەرۆك کۆماری تورکیا بوو لە نێوان سالانی (١٩٣٤ – ١٩٣٥) وەزیری پەروەردە بووە. (وەرگێڕ).

پێت ناکرێ"، ئیدی ئەوسا عابدین ئۆزمەن بووە وەزیری پەروەردە. ئەو کەرەزەلامە، ئەوکاتەی من پۆلی سێ یان چواری قۆناغی سەرەتایی بووم، بڕیارێکی دەرکرد و چەند تاقیکردنەوەیەکی یەك لە دوای یەکی کرد و هەرچی قوتابیی قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی هەبوو، هەموویانی دەرچواند.

هەر ئەو کەرە زەلامە، دواتر بە فەرماندەی موتڵەقی حەفت پارێزگای ناوچە کوردییەکان دامەزرێندرا. لە بەختی کوردان کەسێکی تا بڵێی خوێن پیس بوو. ڕۆژێك، خوسرەو ئەفەندیی ئەندام پەرلەمانی پێشووی دیاربەکر، لەگەڵی تووشی بەسەرهاتێکی سەیر دەبێت. ئەوکات، کاك خوسرەو لە شارەوانی دیاربەکر وەك چاودێر فەرمانبەر دەبێت. بەیانییەك، عابدین ئۆزمەن لە ماڵ دەردەچێت، بەر لەوەی بچێتە شوێنی فەرمیی خۆی وەك چاودێرییەك بەناو شاردا خولێك دەدا، لە ڕێگا دەبینێ شەقام و کۆڵانەکان هەموو کراونەتە ئاڵای تورکیا، کەچی خۆی ئاگاداری هیچ شتێك نییە، دواتر لە ڕێگا تووشی خوسرەو ئەفەندی دەبێت. عابدین کاتێك ئەو چاودێرەی شارەوانی دەبینێت، ئۆتۆمبێلەکەی دەوەستێنێت و بانگی دەکات و لێی دەپرسێ: "کوڕم ئەو ئاڵایانە چییە هەڵواسراون؟ ئیمڕۆ چ بۆنەیەك، یان جەژنێکە؟"خوسرەو ئەفەندیش وەڵامی پرسیارەکە نازانێ، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووە کە کورد لە نیساندا جەژنی هێلکەی سۆریان هەبووە، لەبەر ئەوەی مانگی نیسانیش بووە، بۆیە خوسرەویش بە عابدین دەڵێ: "جەناب جەژنی هێلکەی سۆرە". عابدینیش دوای ئەو وەڵامە کاتێك دەچێتە شوێنی فەرمیی خۆی و دەپرسێ بۆچی ئەمڕۆ ئەو هەموو ئاڵایە هەڵواسراوە؟ فەرمانبەرەکان پێی دەڵێن بەڕێزم ئەمڕۆ جەژنی یەکەم سەردانی ئەتاتورکە بۆ دیاربەکر. عابدین کە گوێی لەو

وەڵامە دەبێت توورە دەبێت و سواری سەری خۆی دەبێت و دەڵێ: "ئەو چاودێرە بێ ناموسەی شارەوانیم بۆ بانگ بکەن"، دیارە ئەوە قەشمەری بە هاتنی ئەتاتورك دەکا بۆ دیاربەکر.

هەمان ڕۆژ، خوسرەو ئەفەندیی چاودێری شارەوانی دەهێننە بەردەم عابدین ئۆزمەن، ئەویش چەندی دەڵێ نازانم و لە خۆمەوە وام گوتووە، بەڵام هیچ شتێك دادی نادا و ڕادەستی پۆلیس دەکرێ، دوای ئەشکەنجەیێکی زۆر، جلەکانی لەبەر دادەکەندرێ و لە فەرمانبەری دەردەکرێت. ڕەنگە ئەو بەسەرهاتە بۆ هەندێك کەس وەك نووسینەکانی ئەولیا چەلەبی و کارڵ مای نووسەری ئەڵمانی بە شتی خەیاڵی بزانن، یان ڕەنگە هەست بکەن ئەو ڕووداوەم بە ڕق و قینەوە نووسیوەتەوە، بەڵام دڵنیابن هەمووی ڕاستییە.

ئەو بەشە ناوخۆییەی کردمانەوە، بەناو، عابدین ئۆزمەنمان کردە سەرۆکی، چونکە گەر وا نەبا ڕێگای کردنەوەیان نەدەداین، بەڵام سەرۆکە کردارییەکەی مستەفا ڕەمزی بوجاك بوو. کاك ڕەمزی کاتێك لە بەلجیکا، لە زانکۆ، دەستی بە خوێندنی بەشی ماف کردبوو، دووەمین جەنگی جیهانی دەست پێ دەکات، بۆیە ئەویش خوێندنی بە نیوەچڵی جێ هێشتبوو و گەڕابۆوە و لە بەشی مافی زانکۆی ئیستانبووڵ دەستی بە خوێندن کردبۆوە. کاتێك ئێمە لە قۆناغی یەکەم بووین، ئەو قۆناغی کۆتایی دەخوێند، مامی، کچی عوسمان پاشای هێنابوو. لە ماوەیەکی کورت بووینە ٢٥ کەس، ئەو بیست و پێنج کەسەش لە ٧ ناوچەی جیاوازی کوردستانەوە هاتبووین، هەر

حەفت ناوچەکەش لە ژێر چاودێریی کارگێڕی گشتی دا بوون. ئەوسا شتێك نەبوو بە ناوی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، وەك ئەوەی ئێستا دەگوترێ. بەڵکو بە مێردین و ڕوها و مالاتیا و موش و بیتلیس و وانیان دەگوت ڕۆژهەڵات.

بەرامبەر بەو شەڕەفەی پێمان بەخشی بوو، عابدین ئۆزمەن ڕێگای دابوو ساڵانە لە بوودجەی ئەو حەفت شارەوانییە سێ هەزار لیرە وەك بوودجەیەك بە ئێمە ببەخشرێ. وەك یادگارییەك دەمەوێ ئەوە بگێڕمەوە، لە ساڵی ١٩٤٣ شارەوانی شەمراخ[1]، کە ئێستا ناوی گۆڕاوە بۆ (مازی داغ)، لە بەشە بوودجەی خۆیان، حەفت لیرە و نیویان بۆ ئێمە دابین کردبوو و گەیاندبیانە دەستمان. کە پارەکەمان وەرگرت زۆر پێی دڵخۆش بووین، بۆیە چووین پارەکەمان بە بیبەر و خوێ دا، بەو ئامانجەی خواردنەکانمان بە پارەی شەمراخ بە تام و لەزەتتر بێ.

ئەو برادەرانەی لە کوردستانەوە دەهاتن، لە چین و توێژی جیاواز بوون، هەندێکیان لەو خێزانانە بوون کە ترسێندرابوون، هەندێکیشیان لە ماڵباتی منداڵە دەوڵەمەندەکان بوون، ئەو جیاوازییەش لە نێوان قوتابییەکان لە وەرگرتنی پارەی مانگانەی بەشە ناوخۆییەکەماندا ڕەنگی دابۆوە، چونکە هیچ پارەیەکمان لە هەندێکیان وەرنەدەگرت و لە بەشێکیشیان نیوەی پارەکەمان وەردەگرت و لە بەشێکیشیان تەواوی پارەکەمان وەردەگرت. مانگانەی قوتابییەك کە تەواوی پارەکەی دابا ١٥ لیرە بوو، ئەوەی نیوەشی دابا حەفت لیرە و نیوو، ئەوانەی زۆر نەبوونیش بوون، بەشێوەیەکی نهێنی لەلایەن کارگێڕی بەشە ناوخۆییەکەوە

[1] قەزایەکی پارێزگای مێردینی باکووری کوردستانە (وەرگێڕ).

هاوکاری دەکران، بۆ ئەوەی ئەوانیش بەسەر خۆیاندا نەشکێنەوە، کاك ڕەمزی و زەهرا خانی خێزانی، ئەو کارەیان زۆر بە جوانی بەڕێوە دەبرد. باشم لە بیرە ڕۆژێك زەهراخان پێڵاوێکی بۆ هێنام، لە ژووری دانیشتن لەنێوان برادەرەکانمان پێڵاوەکەی دامێ و گوتی: "مووسا بۆ خاتری خوا ئەو پێڵاوەم لێ وەرگرە و لە پێی بکە، چونکە تەنیا لەبەر ئەوەی من کڕیوومە، ڕەمزی کردیتییە کەللە ڕەقی و لە پێی ناکا، تۆش لە ڕقی ئەو لە پێی بکە". سەیری پێڵاوەکەم کرد شتێکی جوان و گرانبەها بوو. ماوەیەك دواتر زانیم ژمارەی قاچی کاك ڕەمزی ٤٤ بووە، لە کاتێکدا ژمارەی پێی من ٤٢ بوو، بۆیە، تێگەیشتم کە هەر لە سەرەتاوە زەهرا خان پێڵاوەکەی بۆ من کڕیوە. جا ئەوە تەنیا نموونەیەك بوو تا پێتان بڵێم سەرجەم هاوکارییەکانی دیکە، بە چۆن شێوەیەکی دۆستانە و لێهاتووانە بەسەر ئەو قوتابییانە دابەش دەکران.

دەستوورێکی کارکردنمان هەبوو، هەموو لایەك زۆر پێی سەرسام بوون، وەبگرە، پرۆفیسۆر (هیرسچی) ئەڵمانی، لە بەشی ئابووریی کۆلێژ لە وانەکانیدا شێوازی کارکردنی ئێمەی وەکو یەکەمین بەڵگەی دیموکراسیی تورکیا هەژمارکردبوو. بۆ نموونە لەگەڵ ئەوەی کاك ڕەمزی بەردەوام بە بەڕێوەبەر هەڵدەبژێردرا، بەڵام هەموو جارێکیش هەڵبژاردنمان دەکرد بۆ ئەو کەسەی پۆستەکە وەردەگرێت. لەگەڵ کاك ڕەمزی سێ کەسی دیکەش کارەکانی بەشە ناوخۆییەکەیان بەڕێوە دەبرد و دوو کەسیش چاودێر و کەسێکیشمان ژمێریار بوو. مانگانەی بەشە ناوخۆیی لە قوتابییەکان بە پسوولە وەردەگیرا، هەر شتێکیش کڕابا پسوولەکەی هەڵدەگیرا، چونکە ئەو پارەیەی کە لە شارەوانیی ناوچە کوردییەکانەوە بۆمان دەهات، ڕاستەوخۆ نەدەدرایە ئێمە،

بەڵکو پارەکە دەدرایە مامۆستا زوهتووی سکرتێری گشتیی زانکۆکەمان، ئەویش پارەکەی هەڵدەگرت، بەڵام کاتێك ئێمە شتێکمان دەکڕی و پسوولەکەمان پیشان دەدا، ئەویش بڕی پارەی ئەو پسوولەی دەداینەوە. بە شێوەیەکی گشتیش، ئەو پارەیە، کە نزیکەی ۳۰۰۰ لیرە بوو، بۆ کرێی باڵەخانەکە و ئاو و کارەبا و ڕەژوو خەرجدەکرا. ناونیشانی جوگرافیی شوێنەکەمان لە بەشی ئەورووپای ئیستانبووڵ نزیك دیواری دێرینی بۆزدۆغان کەمەر بوو، لە سەرووی مزگەوتی کیرازجی. کۆشکەکە، لەسەردەمی سوڵتان عەزیز، فەرمانگەی خەزێنەی دەوڵەت بوو. شوێنێکی تا بڵێی ناوازە و تایبەتی لە دار دروست کراو بوو، لەگەڵ باخچەیەکی جوان و فراوان و گۆڕەپانێکی چاکیش بۆ یاریی باله، کرێی مانگانەشی ۹۰ لیرە بوو.

لە چین و ئاستی جیاواز دۆست و هەڤاڵ دەهاتنە لامان، کەسی وایان تێدابوو، مێشکیان وا شۆردرابۆوە، کە بەڕاستی وایدەزانی بنەچەی ئەو، وەك کوردێك، تورکە. بۆیە، ئەمە کەشێکی ناخۆشی جوداخوازیی دروست کردبوو، بۆیە بەو هەوەسەوە بۆ بەرگری کردن لە مافی گەلێك ڕێکخراوێکمان دامەزراند، گەر بە چاوی ئەمڕۆ سەیری بکەین ئەوەی ئێمە دامانمەزراند، نە پارتێکی سیاسی بوو، نە سەندیکا، بەڵکو زیاتر وەك کۆمیتەیەکی نهێنیی سیڤیل بوو، تەواوی ئەرکەکانیشمان بریتی بوون لە هاوکاریکردنی ئەو کوردانەی لە نیشتمانی خۆیانەوە دەهاتنە ئیستانبووڵ، لەگەڵ وەبیرهێنانەوەی بنەچەی کەسایەتی و نەتەوەی خۆیان. ماوەیەك بەسەر کارەکەمان تێپەڕی، بۆیە بەپێی شوێنی هاتنی قوتابییەکان کارەکانمان لە نێوان خۆماندا دابەشکرد، ئەوانەی لە مێردین و سێرت و هەکاری دەهاتن، من لێیان بەرپرسیار بووم، هەرچەند تا ئەوکات

لە هەکارییەوە هیچ قوتابییەك نەهاتبووە لامان. ئەندامانی کۆمیتەکەمان سێیان لە من گەورەتر و یەکێکیشیان تەمەنی لەمن بچووکتر بوو، مستەفا ڕەمزی بوجاك و یوسف عەزیز ئۆغڵوو و زیا شەڕەفخان ئۆغڵوو، وەك برا گەورەم بوون، فایەق بووجاکیش وەك برا بچووکم، بەداخەوە، ئێستا، لەو پێنج کەسە تەنیا من لەناویان زیندووم.

من و فایەق لە بەشە ناوخۆیی دەماینەوە، چونکە ئەوانی دیکە خێزاندار بوون. فایەق برازای کاك ڕەمزی بوو، بۆیە سەرەڕای بچووکی تەمەنم لەگەڵ هەموویان زوو تێکەڵ بووم. من بە پاشخانێکی ئامادەکراوی نەتەوەیی بۆ ئەو بیرۆکەیە لە ئەدەنە و نوسەیبینەوە، هاتبوومە ئیستانبوول، ئەوانیش پێویستی بیرۆکەیەکی ئاوایان دەمێك بوو بۆ دەرکەوتبوو و لەسەر ئەوەش ئامادەکارییەکیان سازدابوو. کۆبوونەوەکانمان لە ماڵی یوسف عەزیز ئۆغڵوو لە نزیك مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد کرد. عەزیزئۆغڵو لە قۆناغی پێنجەمی بەشی پزیشکی بوو، خێزانەکەی ژنی پێشووی مامە کۆچکردووەکەی بوو، لە هەموومان بە تەمەنتر بوو، بەڵام تا بڵێی ئافرەتێکی بێوێنە بوو، بەپێی نەریتی خێزانی، دوای کۆچی دوایی مامی، مارەییان لە یوسف بڕیبوو.

ڕێکخراوەکەمان نایاسایی بوو، بەڵام ئامانجمان چاکەکار بوو، هیچ نیەتێکی دوژمندارانەمان بەرامبەر تورك و دەوڵەتی تورکیا نەبوو، بەڵکو تەنیا دەمانویست هاوکاریی ئەو کوردانە بکەین، کە لە دۆخێکی نا هەموارداں، بۆیە جگە لەو چەند کەسە، هیچ کەسێکی دیکەمان نەکردە ئەندامی ڕێکخراوەکەمان. بۆ ڕاستگۆبوون بەرامبەر بە ڕێبازەکەمان، پێویست بوو لە نێوان خۆمان سوێند بخۆین. بۆ ئەمە هیچ نیەتێکمان نەبوو کەسوێند بە قورئان بخۆین، بەڵکو وای پێویست

دەکرد ئەو سوێند خواردنەش بەرگێکی نەتەوەیی بەبەردا بکرێ، بۆیە بڕیارماندا سوێند بە ئـاڵای کوردستان و چەکێك بخورێ. کــاك یوســف دەمـانچەیەکی هەبـوو، ئەرکــی دروسـتکردنی ئاڵایەکی کوردستانیش بەمـن سـپێردرا. چـوومە بـازاڕی (قەپـاڵی چارشی) قەیسەرییەکەی نزیك مەیدانی سوڵتان ئەحمەد، لە چوار ڕەنگ هەریەکە و نیو مەتر و قردێلەیەکی چەند مەتریشم کڕی. دەستم کرد بە دروستکردنی ئەو ئاڵایەی ئەمڕۆ دەیزانین، سپی و سـوور و کەسـك و لە ناوەڕاسـتی ڕەنگـی سـپیش خۆرێـك بە ڕەنگــی زەرد. ڕەنگەکـانی نـاو ئـاڵاکە و سـیمبوڵی ڕۆژەکەی ناوەڕاستیشـی واتـاکەی بەم شـێوەیەیە: سـپی واتـا ئاشـتی، سـوور خــوێن و شـۆڕش، کەسـك بەرەکەتــی خـاکی کوردســتان و میزۆپۆتامیا، سیمبوڵی هەتاوەکەش لە ئایینی زەردەشتیی نەتەوەیی کوردان سەرچاوەی گرتبوو. ئەوسا ئاڵای کوردستان ئـاوا بـوو، هەر ئــاواش قبوولکرابــوو، دواتــر لە کۆمــاری کوردســتان لە مەهاباد، بە شـێوەیەکی کـرداری ڕەنگـی سـپی لـێ دەرهێنـدراو، سـیمبوڵی هەتاوەکەیـان وەك ڕەنگێـك لەنـاو ئاڵاکـە دانـا، لەو باوەڕەدام ئێستا بەو شێوەیە قبوولکراوە، کەسك و سـوور و زەرد، پێم وابێ هۆکاری دەرهێنانی ڕەنگی سپیش بۆ ئەوەبێ کە کورد دوای ئەوەی بۆ ماوەی چەندان سەدە، ئاشتیان هەر نەبینی و هیچ سوودێکیشی پێنەگەیاندن، بۆیە ڕەنگی سـپی کە هێمـای ئاشـتیە لە ئاڵاکە دەرهێندرا.

تەواوی ئــاڵاکەم بەدەســتی خــۆم، بە دەرزی و داو چنــی، چونکە دەترسام بیبەمە بەرگ دوورێك، لە کاتی چنینیشی چەنـد برادەرێك لەدەستیان بینیم و لێیـان پرسـیم: "مووسـا ئەوە چییـە بە دەستەوە؟"منیش دەمگوت: "ئەوە دەیکەمە ڕووپۆشی پایسکلێکی جــوان بــۆ هــاوڕێیەکم کە بە دیـاری بـۆ بـرا بچـووکەکەی

دەکرێت"، ئەوانیش باوەڕیان دەکرد. ڕۆژی کۆبوونەوەکە ئاڵاکەم لەگەڵ خۆم برد، برادەران زۆریان پێ جوان بوو، لەسەر مێزێك دەمانچەکەمان دانا و ئاڵاکەشمان بەسەری دادا، دەستمان لەسەر ئاڵا و دەمانچەکە دانا و ئەوسوێندەی پێشتر ئامادەمان کردبوو، خوردمان. ئەوەندی بەبیرم بێت سوێندەکە بەو شێوەیە بوو: (تا مردن، بەرامبەر خۆشەویستیی نیشتمانەکەم ڕاستگۆ دەبم، لە هیچ دۆخێك دژی هاوخاکیانم گەلەکۆمەك ناکەم و پاشقولیان تێناگرم و نابمە جاش و خۆ فرۆش). ئەو چوار هەڤاڵەم بە پاکی و لەسەر ئەو سوێند خواردنە وەفاتیان کرد، منیش وەك ئەوان لە کۆتایی هەمان ڕێگام. ئەو چوار هەڤاڵەی دیکەم لە ژیاندا نەماون، بۆیە گەر ویستیان با منیش بکوژن، منەتیان نەبێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە، گەر کارێکی وا بکەن، بۆ من و هاوخاکییەکانیشم دەبێتە شەڕەفێك.

ڕێکخراوەکەمان ناوی (کۆمەڵەی ڕزگارکردنی کوردان) بوو، چونکە ئەوسا و ساڵانی پێشتریش، دۆخی کورد وەك دۆخی ئەو مێگەلە بوو کە بەبێ شوان گورگ بەناویان کەوتبێت. کورد، بە زۆری زۆردار دەکرانە پەناهەندە و گولەباران دەکران و کۆمەڵکوژ دەکران و هەموو ئەمانەشیان بەرامبەریان بە ڕەوا دەزانی، بۆیە دەمانویست کورد لەو مامەڵە نامرۆڤانەیەی لەگەڵی دەکرا ڕزگار بکەین و زوڵمی حکوومەتیش بەرامبەر بەو گەلە بە گوێی هەموو کەسێك بچرپێنین. بۆیە، لەسەر ڕێچکەی ئەو سوێندەی خواردبوومان لە ساڵی ١٩٤٨ لە ئیستانبووڵ، دەستم بە بڵاوکردنەوەی هەفتەنامەیەك کرد بەناوی (سەرچاوەی دیجلە).

کاك ڕەمزی خێزاندار بوو، لەهەمان کات سەرقاڵی هەندێك کاری دیکەش بوو، نەیدەتوانی بەردەوام بێتە بەشە ناوخۆیی.

مـن، بە بریکـاریی ئەو کارەکـانم بەڕێـوەدەبرد، بـۆیە لەگەڵ ئەو شوێنە کەم تا زۆر یادەوەریی تاڵ و شـیرینم هەیە. دەمەوێ لێـرە بە کورتی باسی چەند دانەیەکیان بکەم.

دەتـوانم بڵـێم یەکەم گرووپـی فۆلکلـۆری لە تورکیـا ئـێمە دامانمەزرانـد، ئەو گـرووپە لە چالاکییەکـانی شـەوانی دیجـلە لە ئیسـتانبووڵ خـۆی دەبینـیەوە، ئەوسـا بە جلـوبەرگ و مۆسـیقای فۆلکلۆری و نەتەوەیـی، بە زمـانی تـورکی، کە بەشـێکی زۆری ئیسـتانبووڵ پێـی سەرسـام بـوو چالاکیەکانمـان بەڕێـوە دەبـرد، لەماوەی ئەو چەند سـاڵە زۆر شـەوی ئاوامـان دروسـتکرد، بـۆیە داوەتنامەمــان بـۆ تەواوی کوردسـتانیانی ئیسـتانبووڵ دەنـارد و ئەوانیش بەخۆشحاڵییەوە ئامادە دەبوون، بە شێوەیەك، گەورەترین هۆڵی ئیستانبووڵ کە ئەوسـا هـۆڵی گـازینۆی شـارەوانی تەقسـیم بوو، تژی ئامادەبووان دەبوو و بەشێکی زۆریش بە پێـوە سـەیری بەشـێك لە چالاکییەکانیـان دەکـرد. زۆر گرنگیمـان بەو بـۆنەیە دەدا، لەسەردەمی سەرەتای ساڵانی دووەمین جەنگی جیهـانی بـۆ ئەو بۆنەیە باڵیۆزی ئەڵمانیا و ئینگیلتەرەشمان داوەت کـرد. بیـرمە بـاڵیۆزی ئینگیلـتەرە نەهـات، بەڵام (ڤـۆن پـاپەن)[1]ی بـاڵیۆزی ئەڵمانیا و ئەو کـچە قەشـەنگەی کە دواتـر لە جەنگـی لینینگـراد کـوژرا بەشـداریی یەکێـك لەو شـەوانەیان کـردین. بە ئەڵمـانی پێشوازیم لە میوانەکانمان کرد، ڤۆن پـاپەن دەسـتی گـرتم و بەم شـێوەیە خـۆی و کـچەکەی پێناسـاندم: "مامـت ڤـۆن پـاپەن و

---

[1] فرانز ڤۆن پاپەن (١٨٧٩ – ١٩٦٩) یەکێکە لـەو دیپلۆماتکارانـەی لەگـەڵ هاتنە سـەر دەسـەڵاتی هیتلـەر لـە پەیوەندیـیەکانی دەرەوەی ئـەڵمانیا ڕۆڵـی گێـڕاوە و لـە نێـوان سـاڵانی (١٩٣٩ – ١٩٤٤) بـاڵوێزی ئـەڵمانیا بـووە لـە تورکیا. (وەرگێڕ).

کچەکەی". چونکە ئەوسا بە باوەڕی ئەڵمانەکان، کورد یەك لە نەتەوە هەرە نزیکەکانی تیرەی ڕەسەنی نەژادی ئەڵمان بوو. بەو دواییانەش لە سەردانێکمدا بۆ موش، لەگەڵ عەشیرەتێك ئاشنایەتیم پەیدا کرد کە ناویان (ئەڵمان) بوو، سەیری سەر و کەللە و ڕەنگ و ڕووخساریانم کرد و لێیان ورد بوومەوە، بەڕاستی لە ئەڵمانان دەچوون، جا خۆی، ئەو عەشیرەتانەی خۆیان لە ژن و ژنخوازیی عەرەب و تورك و عەجەمان پاراستووە، ڕەنگ و ڕووخساریان زۆر بە ئەڵمانان دەچێ. بۆنموونە لە ناوچەکانی بۆتان و شیرڤان زۆربەی دانیشتووانەکەی باڵا بەرز و چاوشین و پرچ زەرد و ڕەنگ سپینە.

لە کاتی پیادەکردنی ئەو چالاکییانەمان لە ئیستانبووڵ، لەگەڵ پۆلیسیش زۆر ڕووداوی سەیرمان بەسەرهات، ڕۆژێك منیان بانگهێشتی بنکەیەکی پۆلیس کرد. ئەفسەری بنکەکە بە خۆ گێفکردنەوەیەکەوە گوتی: "هەتیوو ئێوە قەوانتان نییە؟"منیش بە بەڵێ وەڵامم داوە، کەچی گوتی: "مادەم قەوانتان هەیە، بۆ فیکەی کوردی لێدەدەن؟"کە وای گوت من دۆش دامام، وەڵامم داوە: "من نازانم فیکە لێبدەم، بەڵام چۆن دەتوانم ڕێگری لەو سەدان کەسە بکەم کە فیکە لێدەدەن؟"ئەویش لوتفی نواند و بە شەق و پێلەقە نەیگرتم، دواتر بەڕێی کردم و گوتی: "سکتر بە و لەبەر چاوم ونبە، با پێشت بڵێم من ئەو شتانە نازانم ئەوجارە گوێم لە فیکە بێتەوە من تۆ دەناسم".

سەردەمی ساڵانی جەنگی جیهانی بوو، زۆر بێ پارە بووین، جا خۆ پارەشمان هەبوایە، هیچ شتێك نەبوو بیکڕین، ناچار لە شارە کوردییەکانەوە ساوار و نیسك و قاورمە و خواردنمان بۆ دەهات، ئێمەش بە ناچاری بەردەوام ئەوانەمان دەخوارد، لەگەڵ سەلکە پیازی گەورە گەورە. ئێمە لە نەبوونیان ئەوانەمان

دەخـــوارد، کەچـــی هەنـــدێك لایەن ئەو ڕەزالەتەی ئێمەیـــان بەشێوەیەك بە پۆلیس گەیاندبوو کە مووسا عەنتەر پلاو ساوار و گۆشـت لەگەڵ پیـاز دەرخـواردی قوتـابییە کوردەکـان دەدا تـا لەگەڵ خـواردنی ئیسـتانبووڵ ڕانەیەن و خـواردنە نەتەوەییەکـانی کوردیش لە بیر نەکەن. لەسەر ئەوە جـارێکی دیـکە بانگهێشـتی بنکەیەکی دیکەی پۆلیس کرامەوە.

ئەوسـا، حـاجی عەبـدولڕەحمان ناوێـك هەبـوو زۆر ئـێمەی خـۆش دەویسـت و زوو زوو سـەردانی دەکـردین، ڕۆژێـك تەگەیەکی هێنایە بەشە نـاوخۆییەکە و لەوێ سـەری بـڕی و هەر لەوێش بە دەستی خۆی (چی کۆفتە)[1] یەکی نایابی بۆ دروست کـردین، ئـێمەش ئەومـان بە هاوشـاری خۆمـان دەزانـی بـۆیە خۆشـمان دەویسـت. کەچـی دواتـر بۆمـان دەرکەوت حـاجییە فەنـدی پۆلیســی نهێنـیە، دوای ئەوەی دڵنیـا بـووین لەوەی کە پۆلیسە، ڕۆژێك بە زەوق و شـەوقەوە هـاتە لامـان و هەموومـانی ماچ کرد، بەڵام ئێمە بڕیاری خۆمان دابوو، چـی لێبکەین، بـۆیە فایەق و چەنـد برادەرێـك بە چەنـد بیـانوویەکی جیـاواز ئەویـان بـردە جـل شـۆرەکەی نـاو بـاخچەی بەشـە نـاوخۆییەکە و لەوێ ئەوەنـدیان لێـدا تـا لە پەل و پۆیـان خسـت، دواتـر جلوبەرگیـان پشك پشك کرد و ناسنامەی پۆلیسی و دەمانچە و بڕە پـارەیەکی زۆریـان دۆزیـیەوە، ئەو کەلـوپەلانەش وەك حەنەکێـك لەلایەن

---

[1] بە یەکێك لە خواردنە گرنگەکانی شاری ڕوها دادەنرێـت لـە بـاکووری کوردستان، لە هەمان کات لە چەندان شاری دیکـەش دروسـت دەکرێـت. (چی کۆفتە) بە واتای کفتەی خاو دێت، کە لە پیرخەنی و بیبەری ئیسۆت و گۆشـتی نـەکوڵاو و نـاوی تەماتـە و پیـازی وردکـراو و مەعـدەنووس دروست دەکرێـت و تـەنیا بـە تێکـەڵکردن و شـێلان خواردنەکـە دروسـت دەکرێت، بێ ئەوەی بخرێتە سەر ئاگر. (وەرگێڕ).

دادگای خەڵکەوە دەستی بەسەردا گیرا، بەشێك لە برادەران گوتیان با بیتۆپێنین، من نەمهێشت، بەڵام بە شەق و پێلەقە دەرخوارددان و تف بارانکردن لە بەشە ناوخۆیی دەریانپەڕاند.

گەر تەنیا بەسەرهاتەکانی بەشەناوخۆیی دیجلە بنووسمەوە بەرگێکی باشی ئەو پەرتووکەی لێ دەردەچێ. بۆ نموونە، لە ڕادیۆ باسی هەواڵەکانی جەنگی نێوان ئینگلیز و ئەڵمان دەکرا، کە ئەڵمانیا ئینگلیزیان تا مسر پاشەکشێ پێ کردووە، ڕۆژی دواتر ئەوجارە ئینگلیز تا جەزائیر سوپای ئەڵمانیای پاشەکشێ پێدەکرد. بەشێك لەبرادەران پشتگیریی ئەڵمانیا و بەشێکی دیکەشی پشتگیریی ئینگلیزیان دەکرد، بە شێوەیەك ئەو ڕکابەرییە وەك یاری تۆپی پێی نێوان (فەنەربەخچە و گەڵەتەسەڕای)[1] لێهاتبوو، بۆیە کاتێك ئەڵمانەکان هێرشیان دەکردە سەر ئینگلیزەکان بەشێك لە برادەران دەیانگوت: "یەڵا باقیێ من ڕۆمەل[2] لێخە!" کاتێکیش هێرشەکە پێچەوانە دەبۆوە، ئەوجارە لایەنگرانی ئینگلیز دەیانگوت: "هایدی باقیێ من بیکوژە".

---

[1] دوو یانەی دێرین و ناوداری تۆپی پێی ئیستانبوڵن، کە ساڵانێکی زۆرە ڕکابەرییەکی توندیان لە نێواندا هەیە. (وەرگێڕ).

[2] ئەروین ڕۆمەڵ (١٨٩١ - ١٩٤٤) یەکێکە لە ژەنەڕاڵەکانی سوپای ئەڵمانی. ئەو لە دووەمین جەنگی جیهانیدا، فەرماندەی هێزەکانی ئەڵمانیای دەکرد لە ئەفریقا. ڕۆمەل لە باکووری ئەفریقا چەندین جار سەرکەوتنی بەسەر ئینگلیز بەدەستهێنا، هەربۆیە نازناوی (ڕێوی بیابان)ی پێبەخشرا. (وەرگێڕ).

## هەندێ لە کەسایەتییەکانی کورد

لە سەردەمی عوسمانییەکان، لە نێوان سالانی ١٩٠٨ تا ١٩٢٠ لە ئیستانبوول، چەندان کۆمەڵە و گۆڤاری کوردی دەردەچوون، ئەوەی ڕاستیبێ، هیچ زانیارییەکی ئەوتۆمان لە بارەیانەوە نەبوو. لەوانە (کۆمەڵی تەعالی کوردی[١]، کۆمەڵەی هێڤی کوردی[٢]، کۆمەڵەی ئافرەتانی کورد[٣])، لەو ماوە مێژووییەدا جگە لەو کۆمەڵانەش چەند گۆڤارێکی کوردیی وەك (کوردستان، ڕۆژا کورد، هەتاوا کورد، گۆڤاری ئافرەتان دەردەچوون)، ئاگاداری ئەوەش بووین لەو گۆڤارانە چەندان شاعیر و نووسەری قەدرگرانی کورد نووسینیان بلاودەکردەوە. جگە لەمانە، لەو ماوەیەدا چەند بەرهەمێکی دانسقەی دەستنووسی وەك دیوانی جزیری، مەم و زینی شاعیری گەورە ئەحمەدی خانی و نوبەهارا

---

[١] ئەم کۆمەڵەیە لە سالی (١٩١٨) لە ئیستانبوڵ دادەمەزرێت و لە شارە کوردییەکانیش بارەگای تایبەت بە خۆی دەکاتەوە. ئامانجی کۆمەڵەکە بریتییە لە دامەزراندنی ولاتێکی سەربەخۆی بێ لایەن بۆ کوردستان. مستەفا کەمال ئەتاتورك دەیزانی کۆمەڵەکە بە ئاگاداریی ولاتانی ڕۆژئاوا ئامانجیان دروستکردنی دەوڵەتی کوردستانە، بۆیە بە بڕیارێکی پەرلەمانی تورکیا، لە سالی ١٩٢١ کۆتایی بە چالاکییەکانی هێنرا. (وەرگێڕ).

[٢] ئەو کۆمەڵەیە لە سالی ١٩١٢ لەلایەن (عومەر بەگی جەمیل بەکر و قەدری جەمیل پاشا و فوئاد بەگ و ئەکرەم جەمیل بەگ و مەمدوح سەلیم) دامەزرا و لە سالی ١٩٢٢ کۆتایی بە چالاکییەکانی هێنا. لە ماوەی کارکردنی کۆمەڵەکە چەندان بلاوکراوەی وەك (ڕۆژی کورد، هەتاوی کورد و گۆڤاری ژینی) بلاوکردەوە. (وەرگێڕ).

[٣] ئەو کۆمەڵەیە لە سالی ١٩١٩ لە ئیستانبوڵ دامەزرا، کۆمەڵەکە بە یەکەمین بزووتنەوەی ئافرەتان دادەنرێت. (وەرگێڕ).

بچووکـان چـاپ کرابـوون، لەگەڵ پەرتـووکێکی پاشـا یوسـف زیـادەدین ئەلخالیـدی، بە نـاوی (هـدیاتول حامدیـة فـی لغـات کردیة) کە شەرحی ڕێزمانی کوردی دەکرد بە زمـانی عەرەبـی، لەگەڵ فەرهەنگێکـی (کـوردی – عەرەبـی)، بـۆیە دەمانویسـت سـەرجەم ئەو کـارە نـاوازانە کـۆبکەینەوە و نووسەرەکانیشـیان بناسێنین. لە کاتێکدا زۆربەی ئەو نووسەر و کەسایەتیانە، یـان لە سـێدارە درابـوون، یـانیش هەڵاتبـوونە دەرەوەی تورکیـا. بەڵام، بیسـتبوومان لەنـاو ئەوانە سـێ - چـوار کەس لەولا و ئەمـلای ئیستانبووڵ ماینەوە، لەناویاندا شێخ شـەفیق ئارڤاسـی[١] پێشـنوێژی مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد و پرۆفیسۆر شـوکروو بابـان و خەلیـل خەیـاڵی مـۆدان و مـورادە فەنـدیی تـاقە کـوڕی لە ژیـان مـاوی بەدرخـان پاشـا و پرۆفیسـۆر مـحەمەد میهـری هـیلاف[٢] و

---

[١] شێخ شـەفیق ئارڤاسـی (١٨٨٤ – ١٩٧٠) لـە گونـدی ئارڤاسـی سـەر بـە شـاری بیـدلیس لـە دایـك بـووە و لـە قوتابخانـەی (هـۆر هـۆر)ی وان لـە باکووری کوردستان قوتابیی شێخ سەعیدی کوردیی بووە. (وەرگێڕ).

[٢] محەمـەد میهـری هـیلاف (١٨٨٥ – ١٩٥٧). خەڵکـی نـاوچەی پـاوەی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتانە. دیـارە دوای پەیڕەوکردنـی یاسـای پاشـناو (نـاوی گەورە) لە تورکیـا، هـیلاف بـووە بە پاشـناوی بنەمـاڵەی مێهـری لەو وڵاتە. هـیلاف سـاڵی ١٨٨٥ لە گونـدی (دشـە)ی سـەر بە پـاوە لە ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان لە دایـک بـووە. بـاوکی مـحەمەد میهـری کە لە لایەن مـوزەفەرەدین شـای قاجـارەوە کـراوە بە مـوفتی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان، حەفت کوڕی بووە لە سێ ژن، محەمەد میهری گەورەی هەموویـان، نـاوی دایکـی خـاتوو شاپەسـەن بـووە کە لە دەرەبەگەکـانی جـوانڕۆ بـووە. لە ناسنامەی تورکیایی هیلاف دا شوێنی لە دایکبوونی ئەو بە نـاوچەی سـنەی سـەر بە موسـڵ دانـراوە. پـێ دەچێـت هـیلاف بەمەبەسـتی بەدەسـتهێنانی ڕەگەزنـامەی عوسـمانی شـوێنی لە دایکبـوونی خـۆی بەو شـێوەیە بە تۆمارکردن دابێت. (وەرگێڕ).

عەبدولڕەحیم ڕەحمی زاپسوو[1]، کە دواتر بووە خەزوورم. ئەوەی جێگای ئاماژە پێ کردنە، ئەو کەسایەتییانە زۆربەیان خاڵی هاوبەشی گێڕانەوەی ڕووداوەکانیان بەوشێوەیە بوو:

ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی، ئیمپڕاتۆریەتێکی تورکی نەبوو، بە شێوەیەك گەر گوتنی ڕاستبێ، تورك، بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە، بێ ڕێژترین نەتەوەی ناو ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بوون. لە ڕووی ئایینیشەوە لەگەڵ هەندێ یەهوودی گەر هەبووبێ، ئەوەی دیکە زۆربەی مەزهەبە جیاوازەکانی کریستیانەکان وردە وردە لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی جیا بوونەوە، وەکو یۆنانییەکان و بولگارەکان. وەك چۆن ئەرمەنیستان لەناوەڕاستی وڵاتانی موسوڵمان لە دووری ئەوروپا دەکولێ و دادەمەزرێ، ئەوانیش لەناو ئەو ئیمپڕاتۆریەتە لە دووری وڵاتە کریستیانەکان، وەك کریستیان، لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی هەمان چارەنووسی ئەرمەنستانیان هەبوو. لە سەدەی بیستەم بیرۆکەی جیابوونەوەی نەتەوەیی لەناو موسوڵمانانیش بڵاوبۆوە، وەك ئەلبانەکان و عەرەب و تورکەکان. ڕەنگە سەیرتان پێبێت گەر بڵێم لە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی گەنجە تورکەکان و پارتە تورکییەکان، ئامانجیان دروستکردنی دەوڵەتێکی تورکی بوو لە دەرەوەی ئەو ئیمپڕاتۆریەتە. لەو ناوە تەنیا کورد مابۆوە، بۆیە کوردیش بیریان لە چارەیەك دەکردەوە بۆ نیشتمانەکەیان،

---

[1] عەبدولڕەحیم ڕەحمی زاپسوو (١٨٩٠ – ١٩٥٨) نووسەر و شاعیری کورد، لە ناوچەی باشاك کەلەی شاری وانی باکووری کوردستان لە دایك بووە و لە ئیستانبوڵ کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی تەعالی کوردە، هەروەها نووسەری پەرتووکێکی سێ بەرگییە بە ناوی (مێژووی گەورەی ئیسلام). جگە لەمانە قوتابی شێخ سەعیدی کوردی بووە، دواتریش بووەتە هەڤاڵی خەباتی چەکداری. (وەرگێڕ).

بەڵام ئەوان زیاتر پەلە و هەڵبەزیان بوو، چونکە ئەو عەرەبانەی لە سووریا و عێراق دەژیان و تورکەکانی تورکیاش، ئەو خاکەی لەسەری دەژیان، نیشتمانی خۆیان نەبوو، بەڵام کورد ئەو خاکەی لەسەری دەژیا نیشتمانی دەیان هەزار ساڵەی خۆیان بوو، کوردستان بوو. ئەنجام، لە جەنگی جیهانیی یەکەم، کورد بەرامبەر بە هێرشی ڕووس و فەڕەنسا و ئینگلیز بە توانا سەرەتاییەکانی عەشیرەتەکانی، بەبێ داوای هاوکاری کردن لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و تورك، بەرامبەر بەو وڵاتانە جەنگان. بۆیە، لە ساڵانی ١٩١٤-١٩١٥-١٩١٦ لە شکانی بەرگری وان و بەدلیس و موش و هەکاری، زۆربەی شەرڤانانی یان شەهید بوون، یانیش ئەو ماڵ و منداڵانەی مانەوە بەرەو باشووری کوردستان کۆچیان کرد، لەناویان بەشێکی زۆر لە برسان یاخود بەهۆی نەخۆشییەوە گیانیان لە سپارد. هێزی بەرگری باشووریش، ئەمڕۆ، لەلایەن تورکیای فاشیست بەناچاری ددانی پێدانـدراوە. قەهرەمان ماراش، غازی عەناتپ، شانلی ئورفا، سیمبوڵی مەدالیای سەلماندنی ئەو ڕووداوەن. بەرگری کورد بەرامبەر فەڕەنسییەکان ببووە داستانی سەرزمانان، گۆرانی (لاوی کورد بیانکوژن، ڕۆژی ناموسە) لەو داستانەوە سەرچاوەی گرتووە.

بە پێی گێڕانەوەی گەورەکانمان بێ، ئێمەش وەك کورد بیرمان لە چارەسەرێك کردەوە بۆخۆمان، بە تایبەتی ئەوسا زانا و دانایانی کورد لە ناوەندی زانستی ئەوسا، کە ئیستانبووڵ بوو، کۆ ببوونەوە، ئەو جیابوونەوە و هەوای ئازادییەش دوای دووەمین

(مەشروتیەت)[1] زیاتر چەکەرەی کردبوو، چونکە بەر لە سالّی ١٩٠٨ سولّتان عەبدولحەمید[2] لە ژێر کاریگەریی سیاسەتی بیزانسییەکان فەرمانڕەوایی دەکرد، هەندێك کوردیشی لە کۆشکی خۆی گلدابۆوە، هەندێکیشی کردبوونە پاشا و سەرۆك و ڕاوێژکار، لەوانە بەدرخانییەکان و سەید عەبدولقادر و بابانییەکان.

بۆیە، لەو سەردەمە گەورەترین کۆمەڵەی کوردی بەناوی کۆمەڵەی تەعالی کورد دادەمەزرێت. لە ژیان ماوەکانی دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵەیەش شێخ شەفیق ئارڤاسی و شوکروو بابان[3] و عەبدولڕەحیم زاپسوو بوون، جگە لەوەی کار و چالاکیی گۆڤاری ئەو کۆمەڵەیە بۆخۆی پرسێکی تایبەت و درێژە.

## عەبدولڕەحیم زاپسوو

عەبدولڕەحیم زاپسووی شاعیر و نووسەر، لە بەشێکی زۆری گۆڤار و بڵاوکراوەکانی ئەوسا، شیعر و نووسینی ئایینی و نەتەوەیی بڵاودەکراوە، بە سوود وەرگرتن لە وێژەی کوردی لە

---

[1] بەیەکێك لە قۆناغە ڕاگوێزەکانی دەسەلاتی عوسمانی دەگوترێت، لە سەردەمی سالانی یەکەمین جەنگی جیهانی، بەر لەوەی ئیمپراتۆریەتەکە بە تەواوی لەناو بچێت. (وەرگێڕ).

[2] سولّتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٤٢ – ١٩١٨) بە ٣٤ مین سولّتانی عوسمانیەکان دادەندرێت. لە نێوان سالانی (١٨٧٦ – ١٩٠٨) سولّتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە. (وەرگێڕ).

[3] ناوی تەواوی حوسێن شوکرو بابانە (١٨٩٠ – ١٩٨٠) ڕۆژنامەڤان و ئابووری ناسی کورد شوکری بابان لە بەغدا لە دایك بووە و لە ئیستانبوڵ کۆچی دوایی کردووە. کوڕی مستەفا زیهنی پاشای بابانییە. (وەرگێڕ).

ژێر کاریگەریی داستانی (مەمی ئالان) لە گۆڤاری ژین دوو دەقی شانۆیی نووسی بوو. لە ئیستانبوول عەبدولڕەحمان زاپسوو و دکتۆر عەبدوڵا جەودەت و عەزیز بابان و زیا گۆك ئالپ[1] لە وەقفی گۆڕی سوڵتان مەحموود، قوتابخانەیەکی کوردییان بۆ منداڵانی کورد کردبۆوە. شێخ شەفیق ئەفەندیش ئەو چەند دەستنووسەی کە تا ئەوسا لە مزگەوتان مابۆوە، لەوانە دیوانی ناوداری جزیری و مەم و زینی ئەحمەدی خانی، ١٠ دانەی لە هەر یەکێکیان چاپکرد.

مادەم هەر باسی ئەو کەسایەتییانەم کردەوە لێرە، تا باسی خەلیل خەیاڵیش نەکەم وازناهێنم. ئەوسا کە بەڕێزیانم ناسی، لە بەشی ژمێریاریی کۆلێژی دارستان خانەنشین کرابوو، پیرەمێردێکی بە شەوق و ڕەونەق بوو، کەسێکی تێگەیشتوو و ڕۆشنبیر بوو، کاك خەلیل خەیاڵی خاوەن دوو چاوی پڕ عەشقیش بوو بۆ نیشتمان، بۆیە بەردەوام دەیگوت: "من هەموو ئاواتم ئەوەیە، بە لەشێکی تەندروست تا لە ژیان ماوم، ببینم کە کورد لە دەست ئەو نەتەوە زاڵم و ئەو ژێر دەستەییە ڕزگاری بێت". ئەو لەگەڵ ناجیە خانمی کچی دەژیا، ئەو کچەی خەلیل خەیاڵی، دەرچووی کۆلێژی ساینت بینۆیت بوو، دوای کۆچی دوایی باوکیشی پەیوەندییە خێزانییەکەمان لەگەڵی نەپچڕاند، دواتر ناجیە خانم لەسەر وەزارەتی دەرەوەی تورکیا خانەنشین

---

[1] زیا گۆك ئالپ (١٨٧٦ – ١٩٢٤). کوردە و خەڵکی دیاربەکرە، نووسەر و شاعیر و سیاسەتمەدار بووە، جگە لەمانە ئەندامی پەرلەمانی تورکیاش بووە، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە زیا گۆك ئالپ لەگەڵ ئەوەی کورد بووە، بەڵام دواتر دەبێتە دامەزرێنەر و داڕێژەری بنەماکانی فیکری نەژادی (تورکایەتی)، سەبارەت بەو پرسەش چەندان نووسین و پەرتووکی بڵاو کردۆتەوە. (وەرگێڕ).

کرا. دوای کۆچی باوکی پرسیاری خۆڕاگریی ئەوم لێ کرد بەرامبەر بەو خزمەتە زۆرەی پێشکەشی باوکی کرد؟ وەڵامی ئەویش ڕێك ئاوابوو: "مووسا چۆن خزمەتی کەسێکی ئاوا گرنگ نەکەم؟ لە یەك کاتدا هەم باوکمە و هەمیش کوردێکی بە شەرەفی کورد پەروەرە". ماوەیەکی کەم بەر لە کۆچی دواییکردنی، خەلیل خەیاڵی دەفتەری یاداشتەکانی خۆی دامێ، لەناویاندا چەندان بەڵگە و دۆکۆمێنتی ئێجگار تایبەت و گرنگی وەك دیوانی حاجی قادری کۆیی بە دەست و خەتی خۆی، لەگەڵ نووسینێکی گرنگ لەسەر ڕێزمانی کوردی کە زیا گۆك ئالپ بە دەست و خەتی خۆی نووسی بووی، ئەو نووسینانەیشی تێدابوو کە خەلیل خەیاڵی لەسەر زمانی کوردی لێکۆڵینەوەی لەسەر کردبوو، بەڵام بەداخەوە ساڵی ١٩٧٢ کاتێ تەوقیف کرام، لەگەڵ پەرتووکخانەکەم ئەو نووسینە گرنگانەشیان هێنایە بەردەم بەڕێوەبەرایەتیی دادگای سەربازی و لەوێ دەستی بەسەردا گیرا. دوای دەرچوونی لێبووردنی گشتی و دەرچوونم لە زیندان، بۆ وەرگرتنەوەی پەرتووکەکانم داواکاریم پێشکەشی دادگا کرد، بەڵام پێیان ڕاگەیاندم کە سەرجەم پەرتووك و نووسراوەکانیان سووتاندووە.

لەسەرەوە، ئاماژەم بەوە کرد کە عەبدولڕەحیم زاپسوو خەزوورمە، بۆیە منیش وەك ناجیە ئەبلە، کاك عەبدولرەحیمم وەکو دوو چاوی خۆم ئاگا لێبوو و لە کۆتایی تەمەنیشی ئەوەندەی پێم کرا خزمەتم کرد، چونکە لەلایەك باپیری منداڵەکانم بوو و لەلایەکیش کەسایەتییەکی گرنگ و نووسەر و شاعیرێکی کورد بوو. وەکو ڕێزێك لێرە شیعرێکی ئەو دەنووسمەوە کە یادەوەرییەکیەتی لەگەڵ شێخ سەعیدی کوردی (بەدیعولزەمان). زاپسوو، دوای ئەوەی لە جەنگی بدلیس بریندار

دەبێ، دەستگیر دەکرێ و دواتر لە پەناهەندەییدا وەکو بەندکراوێك لە ڕووسیا شیعرەکەی بەناوی (عەشقا وەڵات) دەنووسێ:

**عەشقا وەڵات**

بەهار هات و شین بوون گیا
لبەر کرن خەملین چیا
گەشتان بکەن سەر کانیا
ژ خەیری دی، چیت شەبهێ زیا
بەراق پاك و سافییە،
عەشقا وەڵات، عەشقا وەڵات!
تە جەرگ و مەیلاقێ مە پات
جارەکا دن، من دبە خوەزی
کۆنێ د ڕەش، کیربیت بی زی
تو ماست لسەر ئاڤێ تازی
زەریەت وەکی سیرمێ کەزی
لە بێریی لە پەی بزنان دبەزی
عەشقا وەڵات! عەشقا وەڵات!
تە جەرگ و مەیلەقێ مە پات
بۆچی ژ تە ئەم بوون جودا
مە تەرك کرن، لەزەت سەفا
شاهان گۆچە دانا گەدا
هاتن لە بن خانێ مەدا
عەشقا وەڵات! عەشقا وەڵات!
تە جەرگ و مەیلەقێ مە پات
کانێ وەڵاتێ سەرهەڵدان

سۆتیم ئەوان ئاتەش گەدان
لەوڕا گۆ گەر بوونە شڤان
دەنگێ بلوران، نالیان
دەنگێ هەواران، گازیان
عەشقا وەڵات! عەشقا وەڵات
تە جەرگ و مەیلەقێ مە پات
دەنگەك توونە، شوخولەك عەجێب
ئەم مانا گیرا غەریب
دوور بوون وەڵاتێ ژ دڵ فەریب
جارەکا دی، ئێ بیتە نەسیح؟
چوونە لی وی ڕەببێ موحیب
عەشقا وەڵات! عەشقا وەڵات!
تە جەرگ و مەیلەقێ مە پات
دبێژن وەڵات بۆ دوژمنە
ئەز ساخ ببم قە مومکونە
خەیرەت، هامییەت تا منە
عەشقا وی مێهڤانێ منە
قوربان ژ وی ڕا مێرگی منە
عەشقا وەڵات! عەشقا وەڵات!
تە جەرگ و مەیلەقێ مە پات.

## شوکروو بابان

شوکروو بابان کوڕی زیهنی پاشای ناوداری بابانییەکانە، ئەو دووەم سەرۆکی کۆمەڵەی تەعالی کوردی بوو، زیهنی پاشاش دۆستێکی نزیکی سەروەزیر تەڵعەت پاشا[1] بوو. شوکروو بابان لە پرسی کوردایەتی زۆر وریا بوو، تا ئەو کاتەی کۆچی دوایيشی کرد لە ساڵی ١٩٧٩ من وەکیلی دارایی ئەو بووم، چونکە خۆی فەلج ببوو و سەرجەم کارەکانی من بەڕێوەم دەبرد. مادەم هەر باسیشم کرد، لێرە چەند بەسەرهاتێکی سەردەمی وەکالەتەکەیتان بۆ دەگێڕمەوە:

محەمەد ئاکیف ئەرسۆی[2] شاعیر، بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات لە وەسیەتەکەیدا نووسی بووی: "گۆڕەکەم لە نێوان سلێمان نازیف[3] و پرۆفیسۆر شوکروو بابان بێت"، دواى مردنی

---

[1] محەمەد تەڵعەت پاشا (١٨٧٤ – ١٩٢١) دامەزرێنەری کۆمەڵەی عوسمانی ئازادە و یەکێکیشە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی. ساڵی ١٩١٧ دەبێتە سەر وەزیر لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەڵام دوای ئەوەی لە یەکەمین جەنگی جیهانی شکست دێنن، ئیستانبوڵ جێدەهێڵێت و بەرەو دەرەوەی تورکیا هەڵدێت. نزیکەی سێ ساڵ دوای جێهێشتنی ئیستانبول، ساڵی ١٩٢١ لە بەرلین لەلایەن ئەرمەنیەکەوە دەکوژرێت. (وەرگێڕ).

[2] محەمەد ئاکیف ئەرسۆی (١٨٧٣ – ١٩٣٦) خاوەنی شیعری سروودی ئیستیقلالە کە بە سروودی نیشتیمانی تورکیا دادەنرێت. بۆیە لەناو تورك بە شاعیری گەل و نیشتیمان دەناسرێ. (وەرگێڕ).

[3] سلێمان نازیف (١٨٧٠ – ١٩٢٧). شاعیر و نووسەر و سیاسەتمەداری تورك. دوای ئەوەی پۆستی پارێزگاری چەند شار و ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بەڕێوە دەبات، لە ساڵی ١٩٠٩ دەبێتە پارێزگاری بەسرە و ساڵی ١٩١٣ دەبێتە پارێزگاری موسڵ و ساڵی ١٩١٤ دەبێتە پارێزگاری بەغدا. سلێمان نازیف دوای ئەوەی عیراق لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان ڕزگار دەکرێت، دیوانێکی شیعری بە ناوی (فیراقی عیراق)چاپ دەکا.

←

وەسیەتەکەیان هێنا جێ، بەڵام دواتر شەقامێکی تازە دروستکراوی قیرتاوکراو، لە پرۆژەیەکی تازەی ڕێگاو بان، ڕێك بە شوێنی قەبری ئەواندا تێدەپەڕێ، بۆیە شارەوانی بڕیاری گواستنەوەی گۆڕەکانی دەرکرد، بۆ ئەمەش شارەوانی گۆڕەکەی محەمەد ئاکیفی هەر وا جێ نەهێشت و بڕیاری گواستنەوەی دا.

واریسی کچی شوکروو بابان، وەکو واریسی باوکی لە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا بوو، بۆیە فەرمانێکی دەرکرد بۆ خاوەنداریەتی کردنی گۆڕەکانیان. بە ناوی شوکروو بابان من چووم، بۆ کاك شوکروو و خێزانەکەی دوو کفنم کڕی و تابووتیشم بە دروستکردن دا و بردمە گۆڕستان. دوای ئێمە کرێکارەکانی شارەوانی هاتن، گۆڕەکانمان هەڵداوە و هێسك و پروسکەکانیمان خستە ناو کفن و لەناو تابووتەکانمان دانان. لەتەك قەبری شوکروو بابان، گۆڕی سلێمان نازیفیش هەڵدرابۆوە و کەلە سەری لە پاڵ گۆڕەکەی لەو گۆڕە کەوتبوو، لەبەر ئەوەی زۆر ڕقم لێی دەبۆوە، بۆیە کاتێك بەلایەوە تێپەڕیم، کەلەجان سەرتاپای لەشی داگرتم، گەر بە قەستیش نەبووبێ، بەڵام قاچێکم لە کەلەسەرەکەی دا و دیسان گلۆربۆوە ناو گۆڕەکە، ددانە ئاڵتوونەکەشی کەوتبووە ئەو ناوە، بۆیە کرێکارەکان خستیانە گیرفانیانەوە، منیش خۆم لێ بێ ئاگا کردن، دواتر تابووتەکان هەڵگیردران و لە ڕێورەسمێکدا کە

---

شاعیر لەو دیوانەیدا خەم و کەدەری دابڕانی عیراق لە دەوڵەتی عوسمانی بە شیعر بەیان دەکات. جگە لەمانە ئەوکاتەی پارێزگاری موسڵ بوو، بە بڕیاری سلێمان نازیف (شێخ عەبدولسەلام بارزانی) لە سێدارە دەدرێت. (وەرگێڕ).

منیش لە ڕیزی پێشەوە ئامادە بووم، لە شوێنی ئامادەکراوی گۆڕستانی شەهیدان محەمەد ئاکیف لە ناوەڕاست و ئەوانی دیکەش لەولا و ئەملای نێژران.

شاعیری بەناوبانگی کورد، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، چوارینەیەکی دەربارەی سولێمان نازیف نووسیوە، منیش دەمەوێ لێرە ئاماژەی پێبکەم. سولێمان نازیف لەگەڵ ئەوەی کوڕی سەعید پاشای بە ڕەگەز کوردی دیاربەکری بوو، وەلێ کاتێك پارێزگاری مووسڵ بوو، زۆر زوڵمی لە کوردان کردووە و چەندان گەنجی کوردیشی لە سێدارە داوە، لەناویاندا مامێکی بارزانیش هەمان چارەنووسی بەسەر هاتووە. ئەوسا کەرکووك قەزایەك بووە لە ویلایەتی مووسڵ، کاتیکیش کەرکووك دەبێتە پارێزگا، بۆ سوود وەرگرتن لە تەجروبە و خیبرەکانی، سلێمان نازیف دەکەنە والیی ئەو شارە. شێخ ڕەزا بەو هەواڵە زۆر قەهر دەخوا و چوارینەیەکی لەسەر دەنووسێ:

**"کەرکووك بووە پارێزگا، سلێمانیش بە والی**
**ئای لە بەختتان ئەی ئەهالی".**

شوکروو بابان، یادەوەرییەکی دیکەشی بۆ باس کردم، بە بۆچوونی من ئەو یادەوەرییە هەم لە ڕووی مێژووییەوە، هەمیش بۆ ئەمڕۆمان گرنگییەکی تایبەتیی هەیە، ئەویش بەم شێوەیە:

زیهنی پاشای باوکم، لە والییەتی لوبنان خانەنشین ببوو، خۆشی دۆستێکی نزیکی سەر وەزیر تەڵعەت پاشا بوو، بۆیە، تەقریبەن هەموو ڕۆژانی پشووی هەینی لە کۆشکەکەی سولەیمانیەمان تەڵعەت پاشا سەردانی دەکردین و لەگەڵ باوکم عارەقیان دەخواردەوە و یاریی شەتڕەنجیان دەکرد.ساڵی ١٩١٥

بوو، تازە کولێژی زانستە سیاسییەکانم تەواو کردبوو و تازە لە فەڕەنسا گەڕابوومەوە، دەمویست هەندێکی دیکەش لە پاریس بمێنمەوە، بەڵام کاتێك جەنگی یەکەمی جیهان دەستی پێ کرد، ناچار بووم واز لەو بیرۆکەیەم بێنم.

ڕۆژێکی هەینی لە کۆشك بووم، منداڵەکانمان هاتنە لام و گوتیان باوکت بانگت دەکات، چوومە شوێنی پێشوازیی میوانان و دەستی باوکم و تەڵعەت پاشام ماچ کرد، پاشا سەیرێکی کردم و گوتی: "ئێوو شوکروو ماشەڵا بوویتە گەنجێکی خوێنگەرم، خوێندنیشت تەواو کردووە، وانییە؟"منیش گوتم: "بەڵێ پاشام"، ئەویش گوتی: "مادام وایە کوڕم لەمڕۆ بە دواوە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی نیشتەجێبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی داتدەمەزرێنم"، منیش بە شاگەشکەییەوە گوتم: "جەنابی پاشا جا من کێ نیشتەجێ دەکەم؟"ئەوانیش بە پرسیارەکەم پێکەنین و پاشا گوتی: "کوڕم ئەرمەنییەکان لەوێ نیشتەجێ بکە"، وەڵامی پاشام داوە: "ئەی ئەرمەنییەکان نیشتەجێ نین، بۆ کۆچ دەکەن؟ ئەی باشە چۆن دەتوانم ئەو کارە بکەم؟"دوای وەڵامەکەم پاشا بە قاقایەکی بەرزتر پێکەنی و گوتی: "شوکروو تۆ چوویتە پاریس، بەڵام هێشتا هەر منداڵی. کوڕی خۆم ئاسانە. تۆ فەرمان دەردەکەی و دواتر ئەرمەنییەکانی ئەرزەڕووم کاتێك دێنە موش، لە ڕێگا نیشتەجێ دەکرێن، ئەوانەی وانیش کە دەچنە بەدلیس و ئەوانەی بەدلیسیش لە ڕێگای چوونە سیرت و ئەوانەی دیاربەکر لە کاتی چوونیان بۆ ڕوها و ئەوانەی ڕووها بۆ مێردین و ئەوانەی مێردینیش کە دەچنە مووسڵ، لە ڕێگا نیشتەجێ دەکرێن"، کاتێك تێگەیشتم ئەو ڕێگا بڕینانە تژی خوێنڕشتن و

قوڕبەسەرییە، ڕەنگم زەردە هەڵگەڕا و زمانم تەتەڵەی کرد. دوای ئەو تێکچوونە دەروونییەم، ڕاستەوخۆ فەرمانیان پێ کردم بچمە دەرەوە. کە ئەوانم جێ هێشت، ڕاستەوخۆ بەرەو حەرەمی کۆشك ڕۆیشتم، لە ڕێگا دایکم منی بینی و پرسیاری شپرزەیی حاڵی کردم، بەڵام هیچم بۆ باسنەکرد. بەو کەسەرەوە تا هەینی داهاتوو نە ڕێك و ڕەوان شتێکم خوارد، نە شتێکم خواردەوە و نە وەك شەوانی ڕابردووش خەو چووە چاوم. هەینی داهاتوو کاتێك دیسان بانگیان کردمەوە، دەست و پێم دەلەرزین، بیریشم لەوە کردەوە گەر دیسان بۆ ئەو پۆستە زۆرم لێ بکەن، یان دەگەڕێمەوە پاریس، یانیش خۆم دەکوژم، بەڵام وەك ئەوەی بیرم لێدەکردەوە وا دەرنەچوو، چونکە کە چوومە ژوورەوە و سەر و سیمایان بینیم، تەڵعەت پاشا بانگی کردم و گوتی: "وەرە وەرە مەترسە، وا دەزانی جگە لە تۆ هیچ شوکرووەکی دیکە نییە، وەرە شوکرووەکی باشترمان بۆ ئەو پۆستە دۆزییەوە".

ئەو شوکرووە باشەی پاشا باسی کرد، وەستایەکی لێهاتوو بوو لە کارەکەی، لەسەردەمی کۆماری تورکیا ببووە وەزیری ناوخۆ، لەبەر ئەو هۆکارانە ئەتاتورك نازناوی (تاشە بەرد)ی پێ بەخشی بوو، بەو پێیەی لەسەردەمی سەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیا کێشەیەکی زۆری نیشتەجێکردن هەبوو، بەڵام ئەمجارە نیشتەجێکردنی ئەرمەنیان نا، بەڵکو نیشتەجێکردنی کورد کێشەی سەرەکیی دەوڵەت بوو.

زۆرم یادەوەری لەگەڵ شوکروو بابان هەیە، چونکە بەشێکیان بۆ سەردەمی مامۆستایەتی و بەشێکیشیان بۆ ئەو ماوەیە دەگەڕێتەوە کە بەیەکەوە دەماینەوە. ئەو زۆر خۆشی لەگەڵ

نووسین نەدەهات، منیش گەر بمرم سەرجەم یادەوەرییەکانی دەچنە ژێر خاك، کاتێکیش ماوە ماوە دەمویست باسی کێشەی کوردی لەگەڵ بکەم، ئەو ڕستەیەی زوو زوو بەکاردەهێنا: "کورڕم بۆ ئەوەی کەسێکی بە ناموس و بە شەرەف بم، پێویستیم بە ئامۆژگاری نییە".

## شێخ شەفیق ئارڤاسی

شێخ شەفیق، لە خێزانێکی زانای ماڵباتی بەناو و دەنگی ئارڤاسییە. برازای سەید عەبدولحەکیمی مامۆستای سوڵتان حەمیدە. شێخ شەفیق، سەبارەت بە مامی، دەیگوت: "عەبدولحەکیمی مامم، دوای نوێژی عەسر لە مزگەوتی بەیازیت، بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ شەرح و تەفسیری مەسنەوی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمیی کردووە". خۆشی سەر ئیمامی مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد بوو لە ئیستانبووڵ.

شێخ شەفیق، سەبارەت بە لایەنی مێژوویی شیعری فەتح لە دیوانی جزیری، بۆی گێڕامەوە کە: "کاتێك فاتیح سوڵتان محەمەد ئیستانبووڵ دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، ئاك شەمسەدینی مامۆستای دەچێتە حەج، فاتیح سوڵتان ئەوسا بەو مامۆستایەی دەگوت (بابە)، بۆیە پێی دەڵێ: "بابە لەوێ چ دیارییەکم بۆ دێنی؟"مامۆستاکەی لە وەلامدا دەڵێ: "کوڕم شتێك کە شایەنی تۆ بێت". لە گەڕانەوە، ئاك شەمسەدین سەردانی مزگەوتی ئەزهەر دەکات لە میسر، لەوێ گەنجێکی زۆر زیرەك بە ناوی محەمەد گۆرانی دەناسێ. گۆران ناوی عەشیرەتێکی کوردە، دواتر ئاك شەمسەدین ئەو گەنجە ڕازی دەکات لەگەڵ خۆی بیباتە ئیستانبووڵ. دوای هاتنیان کاتێك ئاك شەمسەدین لەگەڵ

سـولّتان یەکـدی دەبیـنن، فـاتیح پێـی دەڵـی: "بـابە ئەی کـوا دیارییەکەم؟"ئەویش دەڵێ: "کورم دیارییەکی ئاوام بۆ هێناوی تـا هەتایە سەربەرزت دەکا". ئینجا گۆران پێشکەشی سولّتان دەکـا. کە دواتر ئەو گەنجە دەبێتە مامۆستایەکی ناوداری فاتیح سولّتان و وەك مەلایەکیش دەبێتە دامەزرێنەری قوتابخـانەی فـاتیح. مەلا گۆرانی کـاتی خـۆی هـاوفەقێی مەلا ئەحـمەدی جزیـری بـووە، بۆیە هاورێیەتییان تا ئەوساش بەردەوام بووە، بۆیە مەلای جزیری لە قەسـیدەیەکی دیوانەکەیـدا کە بەو چـوارینەیە دەسـت پـێ دەکات، ئاوا باسی سولّتان فاتیح دەکات:

**"ئەی شاهێنشاهێ مووعەزەم**
**حەق بێ نیگاهداریێ تە**
**سورەتنا، فەتەحنا**
**ببێتە حافیز و یاریێ تە".**

بە نامەیەك مەلا ئەحمەد تەواوی قەسـیدەکە بـۆ مەلا گـۆرانی دەنێرێـت، مەلا گـۆرانیش تەواوی قەسـیدەکە بـۆ فـاتیح سـولّتان وەردەگێرێت، سولّتانیش زۆری پێخۆش دەبێ و مەلای جزیـری داوەتی ئیستانبووڵ دەکا، بەڵام جزیری سوپاسی دەکات و دەڵێ: "نـامەوێ لە نیشـتمانی خـۆم دوور بـکەومەوە"، دوای ئەو وەڵامە فاتیح سولّتان حەڤدە هەزار ئاکچەی زیـو دەنێـرتە جزیـرێ، مەلا ئەحمەدیش لە ژێر ئەو شـوێنەی ئەمڕۆ مەنزڵیەتـی، مـزگەوت و قوتابخانەی جزیرێ بنیاد دەنێ. بۆیە، ئەو دێوانانەی ئەمڕۆ زمـانی کوردییان قەدەغە کردووە، با ببینن و شەرم دایانگرێت کە چۆن بە زمانی کوردی پیاهەڵدان بـۆ سـولّتانێکی عوسـمانی کـراوە. لە ڕاستیدا منیش دەمەوێ لەبەر ئەوەی بە کـوردیم نووسـیووە سـزا بدرێم، بەڵکو وەحشیەتیان بە ڕۆنی بۆ خەڵك ئاشکرا بێت!

تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد، دۆستایەتیمان لەگەڵ شێخ شەفیق بەردەوام بوو. بەراستی ئەو، منی زۆر خۆش دەویست، بۆیە بەردەوام پێی دەگوتم: "مووسای بێ عەسا"، چونکە بەلای هەموومانەوە ئاشکرایە کە عەساکەی حەزرەتی مووسا چەند بەناوبانگ بوو. ڕەحمەتی، ژیانێکی شەرفمەندانەی بەرێکرد. کاتی خۆی ئەو مارەیی خەسوومی بڕی بوو، ڕێکەوت وا هاتە پێش هەر خۆشی مارەیی ڕەخشانی کچیشمی بڕی. بیرمە، دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمی مارەکردنی ڕەخشان، ڕووی لە من کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: "کوڕی خۆم خوا بیکردبا مارەیی کچی ڕەخشانیشم بڕیبا، ئیدی بەس بوو تەمەن"، زۆری نەمابوو ئەو ئاواتەشی بێتەدی، بەڵام ڕەخشان کچی نەبوو، شێخیش تەمەن ڕێگای نەدا ئەو مارەییەش ببڕێ.

**محەمەد میهری هیلاڤ**

محەمەد میهری، هەم لە کۆلێژی کۆنی زانستە ئایینیەکان پرۆفیسۆر بوو، هەمیش پارێزەر بوو. کەسێکی چوست و چالاك و زانا و ڕاوچی و کوردێکی بە شەرەف بوو. ئەو خەڵکی ناوچەی سلێمانی بوو، بەڵام کورمانجییەکی زۆر جوانیشی دەزانی، ئەوەندەی زمان دەزانی وەك ئەوە بوو زمان نەبێت نەیزانێ. عەرەبی و فارسی و تورکی و فەڕەنسی و سەرجەم شێوەزار و زۆر شارەزای زاراوە کوردییەکانیش بوو. کاتێك بڵاوکراوەی (دیجلە کایناغ)م دەردەچواند، حەفت نووسینی خۆی دامێ، تا ئەوکاتەی وەفاتیشی کرد بەشێوەیەکی بەردەوام نووسینی بۆ گۆڤاری ژین دەنارد کە لە عێراق دەردەچوو.

کاك محەمەد میهری جارێکیان لە دۆسیەی بەشە ناوخۆیی

فورات، کە سکالایان لەسەر تۆمار کردبووین تا ئەوێ چۆڵ بکەین، پاریزەریی بۆ کردم. بە بەرگریکردنە دڵ گەرم و مرۆڤانەکەی کاریگەریی لەسەر دادوەر دروست کردبوو و داواکەشی لەبەرژەوەندیی ئێمە بردبۆوە، محەمەد میهری لە دادگا بەم شێوەیە بەرگری لە دۆزەکەی ئێمە کردبوو:

"جەنابی دادوەر نازانن ئەو گەنجە چەند مرۆڤدۆستە، چونکە بە سەدان هەژار و نەدار لەو بەشە ناوخۆییە پێگەیشتوون و تا ئێستاش بەردەوامە. ئێستا ئێوەش ئەو گەنج و لاوانە لەوێ دەردەکەن و بڵاوەیان پێ دەکەن و شوێنەکەش دەدەنە ئەو پارە ویستانە؟ جا بۆیە بڕیاری کۆتایی بۆ ویژدانی تۆ جێدەهێڵم".

دادوەر دوای بیرکردنەوە، هەمان بۆچوونی مرۆڤدۆستانەی کاك میهریی لا دروست ببوو، بۆیە، بڕیارەکەی لەبەرژەوەندیی بەشە ناوخۆییەکەمان دەرکرد. دوای بڕیارەکەی دادگا، ئیبراهیم یۆرووکی پارەداری بورسایی، لەگەڵ پاریزەرە بە بنەچە یەهوودییەکەی، ڕەشاد ئاتابەکی ناودار، بە سەروچاو ترشاویەوە لە دادگا دەرچووبوون.

### دکتۆر محەمەد شوکروو سەکبان

دکتۆر، خەڵکی شارۆچکەی مادەنی سەر بە پارێزگای ئەلعەزیزە. پرۆفیسۆری یاریدەدەر و لە نەخۆشخانەی جەراح پاشا، تایبەتمەندی نەخۆشی پێست بوو. ئەو لە زۆربەی چالاکییەکانی کورد لە ئیستانبوڵ ئامادە بوو، زۆر پارەی قازانج دەکرد و هاوکاریی سەرجەم کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکانی دەکرد.

ناوی ئەو لەسەرووی ئەو لیستە ١٥٠ کەسییە بوو کە

ئەتاتورك داوای دەكردن، بۆیە ئەویش وەكو ١٥٠ كەسەكەی دیكە توركیای جێ هێشتبوو. شاعیر و فەیلەسووفی بەناوبانگ ڕزا تۆفیقیش لەناو ئەو لیستەدا بوو، لەگەڵ نووسەر ڕەفیق هالیت و ڕەفیق جەودەت. مـن، دوای دەرچوونی لێبووردنی گشتی، لەگەڵ دكتۆر سەكبان یەكدیمان ناسی، تا مردنیشی پەیوەندیمان بەردەوام بوو. سەبارەت بەو پەرتووكەی كە ببووە جێی شەرم بۆی، (كوردەكان توركن) هۆكاری نووسینەكەی بەوجۆرە بۆمن گێڕاوە: "ساڵی ١٩٢٥ كوردستان بێ خاوەن مابۆوە و كرابووە ئامانجی هەموو زوڵم و بێ دادییەكان، هیچ یەكێك لە ئەورووپا و وڵاتانی جیهانی ئیسلامی بەرگرییان لێنەدەكرد، حكوومەتی فاشیستی ئەنقەرە دەستی بۆ هەموو كارێك كرابووەوە، ئێمەش لە دەرەوە هیچمان پێنەدەكرا، لە ڕاستیشدا ئەو سەرهەڵدانانەی تورك بە دژایەتی و سەرهەڵبڕینیان دەزانی، كاردانەوەی بەڵێنە جێبەجێنەكراوەكانی توركیا بوو بەرامبەر گەلی كورد، چونكە كورد دوای ڕزگار بوون لە پادشا و ئیتیحاد و تەرەقیی غەدار، چاوەڕوانی مامەڵەیەكی مرۆڤانەیان لە كۆماری توركیا دەكرد؛ بەڵام بینییان حكوومەتی كۆمار زاڵمی زۆر غەدارتری لەگەڵ خۆی هێنا. من لەبەر ئەوەی نووری سەعید پاشام لە ئیستانبووڵ ناسی بوو، بۆیە لە كابینەی حكوومەتی مەلیك فەیسەڵی یەكەم بوومە وەزیری تەندروستیی عێراق. لەبەر دەرد و كەسەر لە سەرەتاوە تووشی سیل و وەرەم بووم، ئەوەش لاواز و بێهێزی كردم، بۆیە بۆ چارەسەری پزیشكی چوومە ئەڵمانیا، لەناو ئەو خەمبارییەدا بیرمكردەوە: ئەو كەسایەتییە جاهیلانەی ئەنقەرە دەڵێن هەموو جیهان توركە، با منیش بڵێم كوردیش توركە، بەشكووم ئەو زوڵم و زۆرداریەی سەر كورد كەم بكەنەوە. لە نەخۆشخانە ئەوەم لەسەر كلینكیسی كاغەز نووسی، دوای

چاکبوونەوەی باری تەندروستیم، پەرتووکەکەم لە چاپخانەی زانکۆی سۆربۆن لە پاریس چاپکرد، بەڵام ئەوە برادەرەکانی زۆر سەغڵەت کردبووم. کاتێك لە ئەوروپا گەڕامەوە لە سووریا لامدا، لە شام لەگەڵ جەلادەت بەدرخان[1] چووین تا نانێك بخۆین. لەوێ خواردنێکی عەرەبیان هێنا پێشم کە پێشتر ئاشنای نەبیووم، منیش لە کاك جەلادەتم پرسی ئەو خواردنە ناوی چییە؟ ئەویش گوتی: "دکتۆر باینجانە، بەڵام تۆ دەتوانی بڵێی کوودووە". زانیم بە ڕەخنەگرتن لە پەرتووکەکەم، دەیەوێ بڵێ کە لە ژێر کاریگەریی هاوسەرە چەرکەزەکەم و حەسرەتم بۆ ئیستانبووڵ ئەو پەرتووکەم نووسیووە، بۆ ئەوەی ئەتاتورکیش لێبووردنم بۆ دەربکات، بەڵام دەتوانم سوێند بخۆم کە شتێکی لەو جۆرە لە ئارادا نەبووە".

نووری سەعید پاشا، هەم دۆستی دکتۆر محەمەد شوکروو سەکبان بوو، هەمیش دۆستی عەدنان مەندەرەس[2]. ڕۆژێك لە کاتی پێشوازی لێ کردنی لە فرۆکەخانەی یەشیلکۆی لە

---

[1] میر جەلادەت عالی بەدرخان (١٨٩٣ – ١٩٥١). نووسەر و شاعیر و ڕۆژنامەڤانی کورد لە ئیستانبوڵ لە دایك بووە و تا کۆتایی تەواو کردنی قۆناغی زانکۆ هەر لەوێ ژیاوە، دواتر دەچێتە ئەڵمانیا و ئینجا دەچێتە قاهیرە و دواتریش دەچێتە سووریا و لە شام کۆچی دوایی دەکات. میر جەلادەت کوڕی ئەمیر عالی بەدرخانە و یەکەم سەرۆکی کۆمەڵەی خۆیی بوونی کوردە، بە دامەزرێنەری پیتی لاتینی ئەلفوبێی کوردیش دادەندرێ. نووسەر خاوەنی ١٢ پەرتووکە بە زمانی کوردی و تورکی و فەڕەنسی، بە شێکی زۆریشیان پەیوەندیی بە زمان و ئەدەبی کوردییەوە هەیە. لەگەڵ پەرتووکی (نامەیەك بۆ ئەتاتورك). (وەرگێڕ).

[2] عەدنان مەندەرەس (١٨٩٩ – ١٩٦١) سیاسەتمەداری تورك، وەکو نۆیەمین سەرۆکوەزیرانی تورکیا لە نێوان سالانی (١٩٥٠ – ١٩٦٠) سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی وەزیرانی کردووە. (وەرگێڕ).

ئیستانبووڵ، نووری سەعید بە مەندەریس دەڵێت: "برای خۆشەویستم مەندەریس، کەسێك هەیە ناوی دکتۆر محەمەد سەکبانە و هێندەی تۆ خۆشمدەوێ، دەمەوێ ئیدی کاتێك دێمە ئێرە لە فرۆکەخانە ئەویش لە تەك تۆ ببینم، چونکە ئەوسا ئەو دڵە نەخۆشەم زیاتر ئاسوودە دەبێت". نووری سەعید پاشا نەخۆشی دڵی هەبوو، بۆیە گوێی لە دکتۆر محەمەد سەکبان دەگرت. دوای ئەو داواکارییەی پاشا، عەدنان مەندەریس دکتۆر محەمەد بانگهێشت دەکا و بە مووچەیەکی بەرز لە ئیستانبووڵ دەیکاتە دکتۆری بەڕێوەبەرایەتیی کارەبا و تونێلی ترامڤای، لە هەمان کات، هەر کاتێکیش سەعید پاشا دێتە تورکیا، لە تەك خۆی دەیباتە فرۆکەخانە.

سالی ١٩٥٨ نووری سەعید پاشا لە گەشتێکی بۆ لەندەن لە ئیستانبووڵ وچانێك دەدات، ئەمەش دوایین گەشتی بووە. لە فرۆکەخانە کارتۆنێکی تژی دیاری دەداتە دکتۆر. دکتۆر تەلەفۆنی بۆکردم، منیش چوومە نووسینگەکەی، دوای گەیشتنم گوتی: "کوڕی خۆم مووسا سەیرکە، ئەوە دیاری سەعید پاشایە، کە خورما و چا و قاوەیە، من و خێزانەکەم خورما و چای ناخۆین، من هەندێك لە قاوەکە دەگێڕمەوە و ئەوەی دیکە تۆ ببەوە ماڵ"، منیش دیارییەکەم وەرگرت و گوتم: "مامە مادەم لەگەڵ نووری سەعید پاشا ئەوەندە نێوانتان خۆشە، بۆچی داوای لێناکەی لە عێراق هاوکاریی کوردەکانی ئەوێ بکات؟"پێکەنی و سوێندە بەناوبانگەکەی خۆی خوارد و گوتی: "کوێر بم گەر لە گەڕانەوە پێی نەڵێم".

نووری سەعید لە لەندەن گەڕابۆوە، ڕۆژی یەکشەممە بوو، جێبێکی ئاسایش هاتنە بەر دەرگای ماڵەکەمان لە سوادیە، پێکەنیم و گوتم خێرە دیسان بۆ کوێ دەڕۆین؟ ئەوانیش

گوتیان نا نا ئێمە دەڕۆین، بەڵام تا دەمژمێر ۱۲ نیوەڕۆ بڕۆ ئەو ماڵە، سەیری ناونیشانەکەم کرد، ماڵی دکتۆر بوو. وامزانی نەخۆشە، بۆیە بەپەلە بەرێکەوتم بۆ ماڵەکەیان، لەسەری کۆڵانەکەیان هێزێکی زۆری پۆلیسی لێبوو، پێم گوتن دەچمە ماڵی دکتۆر محەمەد، ئەوانیش ڕێیان دامێ. کە چوومە ژوورەوە دکتۆر خۆی پێشوازیی لێ کردم و گوتی: "وەرە برازای خۆشەویست بزانە بە کێت دەناسێنم". منی بردە ژوورەوە، لە هەندێك وێنەیەوە نووری سەعید پاشام دەناسی، بۆیە، منی یەکسەر بردە لای و پێی گوت: "سەیرکە پاشام ئەوە ئەو گەنجە کوردەیە کە سکاڵای لێت کردووە، لەبەر ئەوەی پاشاش دەرچووی ئامادەیی گەلەتەسەڕایی بوو، بۆیە تورکی دەزانی، چوومە پێش و ئەویش هەستاوە و بە دۆقەکردن دەستیم کوشی و ئەویش ماچی کردم و لەتەکی دانیشتم، دەستمان بە قسەکردن کرد و پاشا گوتی: "سەیرکە برازا، باوەڕ بکە لەبەر ئەوەی ئاگاداری ڕووداوەکان نیت، بۆیە مافت پێدەدەم سکڵا بکەیت، بەڵام دڵنیابە، لەوە گەڕێ زۆر کوردی دەستگیرکراوی ئاساییم ئازاد کردوونە، بەڵکو چەندان جار کوردهەبووە فەرمانی لە سێدارەدانیان بۆدەرچووە، بەڵام ئەوانم لە مەرگ ڕزگار کردووە، چونکە گەر لێم بروانی منیش عەرەب نیمە و باوباپیرانمان خەڵکی سیرتن و منیش بە ڕەچەڵەك کوردم. ئەو داواکارییەی تۆش هیچ کات لە بیر ناکەم. لە تەك دکتۆری مامیشت بەڵێنی جێبەجێکردنی داواکارییەکەت دەدەمێ". نازانم بڵێم زۆر شوکر یان زۆر بە داخەوە، بەڵام پێم وابێ بڵێم زۆر شوکر کە بەر لەوەی خورما و چایەکەی ئەو لە ماڵەکەمان تەواو بێت، جەنابیان دوای ئەو دیدارە کە گەڕانەوە بەغداد، کودەتا ڕووی دا و کوژرا.

## سەعیدی نوورِسی (کوردی)

شێخ سەعید، نازناوەکەی لە گوندی نوورِسی شاری بەدلیس وەرگرتووە. سەعیدی نوورِسی چەندان نازناو و ناوی هەیە، کە بەپێی لاپەڕەکانی ژیانی لە بەرخۆدان و بەرگریکردن گۆڕانی بەسەردا هاتووە. بۆ نموونە، لە تەمەنی گەنجی، ئەوکاتەی لە کوردستان وەك شەرڤانێکی کورد خەباتی دەکرد، پێیان دەگوت مەلای ناودار، یان مەلا سەعیدی کوردی. دواتر بەهۆی باڵا دەستیی ئایینیی لە گۆرەپانی ئیسلامیدا لە ئیستانبووڵ و شام پێیان دەگوت بەدیعولزەمان. کاتێك بە تەمەندا دەچێت، ئەو موریدانەی لە دەوروبەری بوونە بۆ پەیداکردنی پارە بە زانست و زانیارییەکانی ئەو، پاشناوە بە شەرەف و نازناوە ئایین زانییەکەیان لێ دابڕی و گوندێکی لاچەپیان کردە نازناوی ئەو و پێیان گوت سەعیدی نوورِسی.

ئەو ژیانە شەرەفمەندانەکەی زۆر ڕەنگدار بوو، بە شێوەیەك کاتی نەبوو هاوسەرگیری بکا و ماڵێك بۆخۆی دروست بکات، بە تایبەتی لەو سەدەیەی ئێمە. تا ساڵی ١٩٦٩ هەموو ژیانی لە خەباتی دژایەتی کردنی دەسەڵاتداریەتی عوسمانی و کۆماری تورکیا بەسەر بردووە. من ناتوانم لە ناو یادەوەرییەکانی خۆم باسی ئەو ژیانە شەرەفمەندانە دوور و درێژەی بکەم، چونکە ژیانی ئەو بە چەندان پەرتووکی تژی لە دیمەنی جوان و خەبات و عیبرەت تەواو نابێت، بەڵام دەمەوێ لێرە یادگارییەکی خۆمتان لەگەڵ جەنابیان بۆ باس بکەم.

شێخ سەعید زوو زوو دەدرایە دادگا. ساڵی ١٩٤٥ لە ئیستانبووڵ دانیشتنێکی دادگای هەبوو، عەبدولڕەحیم زاپسووی

خەزوورم، هەم هاوشـــاری ئەو بـــوو، هەمـــیش لە ســـەردەمی یەکەمـین جەنگـی جیهـان، لە بەدلـیس دوای ئەوەی وەك دیـل دەکەونە دەسـت ڕووسـەکان، بەیەکەوە بـوونە. دوای شۆڕشـی ڕووسیاش لە ڕێگای ئەورووپاوە دوای شەکەت و ماندووبوونێکی زۆر گەڕاونەتەوە ئیستانبوول. بۆیە، هۆکاری هاتنی شێخ سـەعید بۆ ماڵی کاك عەبـدولڕەحیم لە ئیسـتانبوول، بـۆ ئەو هـاوڕێیەتی و دۆســـتایەتییە کـــۆنەی نێوانیـــان دەگەڕێـــتەوە. لەو ڕۆژانەی لە ئیسـتانبوول دەمـاوە، جەنابیـانم ئێـوارەیەك داوەتـی شـیڤی کـرد، لەگەڵ سەرجەم کوردە دیارە ئایینیەکانی ئیستانبوول، بـۆ نمـوونە شێخ شەفیق ئارڤاسی و شێخ ئەمینزادە و شێخ مستەفا بەدلیسـی و مـوفتی کـادیکۆی مەککـی ئارڤاسـی و جەمـالەدین ئارڤاسـی ... دوای نان خـواردن، بەدەم خـواردنەوەی چـای سـەر سـەماوەری تایبەت بە نـاوچەی، خۆمـان گفتوگـۆ و قسـەکردن دەسـتی پـێ کـرد. گفتوگـۆیەکی زۆر خۆشـی ئـایینی و زانسـتی کرابـۆوە، سـەعیدی نوورســی ئەوســا لە ڕۆژئـاوای تورکیـا دادەنیشــت، زۆربەی موریدەکانیشـــی تـــورك بـــوون، ئەوەنـــدەی ئەوســـا لە ئاخافتنەکانی تێگەیشتم، جەنابیان هەوڵیان دەدا مرۆڤ بچێتە سەر ڕێگای ڕاست، تا بەهەشتیان بەقسمەت بێ.

ئەوسـا گەنجێکـی خـوێنگەرمی دەمشـڕ بـووم، درۆی چـی بـکەم، چـونکە ئێسـتاش هەنـدێکم لەو خـووەم هەر مـاوە، هەرچەندە زۆر نەتەوە پەروەر بووم، بەڵام ئەو نەتەوەپەروەرییەی من وەك نازیەت و فاشیزم و تورانی نەبـوو، کە نەتەوەکـانی دی بە کەم ببیـنم و بـمەوێ حـوکمی نەتەوەکـانی دیـکەش بـکەم و خۆشم پێ لەوان بەرزتر بـێ، بەڵکـو نەتەوەپەروەرێکـی وا بـووم کە دەمویست گەلەکەم لەو زوڵم و ستەمەی بەرامـبەری دەکـرا ڕزگـــار بـــکەم. بـــۆیە، بەوە زۆر هەڵـــدەچووم کە زوڵـــم لە

هاوزمانییەکم کرابا. کاتێ ئەوان سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، سەرەڕای ئەوەی خاوەن ماڵیش بووم، بەڵام ئەو ئەرکەم بە کاك عەبدولڕەحیم سپاردبوو، بۆیە خۆم لە قسە و باسەکانیان هەڵنەدەقورتاند، بەڵکو سەرقاڵی خزمەتکردنیان بووم. لە کاتی دەمەتەقێیەکەیاندا لە پڕ ئارامم لێ بڕا و بەشێوەیەکی هەڵەشانە، بە بەدیعولزەمانم گوت: "مامۆستای بەڕێزم، لە منداڵییەوە ناوی جەنابتم بە مەلا سەعیدی کوردی بیستووە، کە بەلای کوردەوە ناوێکی خۆش بووە، ئێستاش بە دەستی تورك هەر ڕۆژە و بۆ شوێنێك ڕادەگوێزرێن و هەر ڕۆژە و لە شوێنێك دادگایی دەکرێن، بەڵام تا ئێستاش جەنابتان لە هەوڵی ئەوەن تا تورك ببەنە بەهەشت، ئەوە چۆن کارێکە؟ بەراستی هیچی لێ تێناگەم".
ئەو قسە و گفتوگۆیەشمان بە کوردی کرد. لە پڕ ئەو چاوانەی کە نوور و زانستی لێ دەتکا، وەك تیشکێکی ڕووناکی بۆ من وەرگێڕا و بە زەردەخەنەیەکەوە لە خەزوورمی پرسی: "عەبدولڕەحیم ئەوە کێیە؟"باوکی خێزانەکەشم گوتی: "سەیدا ئەو خورتە زاوایێ منە"، ئینجا سەعیدی نوورسی پێی گوتم: "کوڕی خۆم وەرە لای من دانیشە"، چوومە تەکی و دانیشتم و دەستی لە ملم کرد و ماچی کردم، ئینجا گوتی: "کوڕی خۆم تۆ هێشتا منداڵی و نازانی من چ دەکەم، تۆ بخوێنە و فێرە زانست ببە"، کەسانی ناو مەجلیسەکە بە بینینی ئەو دیمەنانە ئاشتەواییەکەی نێوانمانیان بۆ دەرکەوت و ئۆخەیەکیان بەبەردا هاتەوە، چونکە کاتێك مامۆستا یەکێك ماچ کا و دەستی لە مل بکات، واتە بە جۆرێك لە جۆرەکان پیرۆزی کردووە.

زۆر لە بەرهەمە ناوازەکانیم خوێندەوە، بەڵام بەداخەوە جارێکی دیکە بە دیداری شاد نەبوومەوە و لەگەڵ جەنابیان هەر ئەوەندە یادگارییە بە نرخەم بۆ ماوە. ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ گرووپە

ناودارەکەی چل و نۆیەکان، لە زیندانی حەربییە بووین، ئەوسا بەرپێزیان ناساغ دەبن و دوای ماوەیەکی کەم کۆچی دوایی دەکات، لەسەر وەسیەتی خۆشی لە کوردستان دەیشارنەوە، بەسەرهاتی کۆچەکەشی بەم شێوەیەیە:

موریدەکانی شێخ سەعید لە ناو پارتی دیموکرات تاکسیەك بۆ ئەو دابین دەکەن، ئەویش بەرێدەکەوێت بۆ کوردستان. لە ڕووها لە میوانخانەیەك دادەبەزێ، بەڵام کەس ئاگاداری هاتنی نییە. ئەو شەوە دۆخی تەندروستیی تێکدەچێت، کاتێك پارێزەر فایەق بوجاك دەزانێ شێخ سەعید هاتۆتە ڕووها و لەوێ دۆخی تەندروستی تێکچووە، لەگەڵ چەندان ڕووناکبیری دیکەی کورد دەچنە لای و دەیگەیەننە نەخۆشخانە. بەڵام سەرەڕای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر، دکتۆرەکان ناتوانن هیچی بۆ بکەن و گیان دەسپێرێ. بەپێی ئەو گێڕانەوانەش بێ، کە دواتر فایەق بوجاك بۆی باسکردم، دوای وەفاتی شێخ سەعید، ئەو ماڵ و موڵکەی جەنابیان دوای خۆی جێی هێشتووە، بە تایبەتی ئەو کەلوپەلە ماددییانەی لەو دونیایە جێی هێشتبوو، تەنیا سەبەتەیەکی بە قامیش دروستکراو کە دوو دەستەسڕی تێدابووە، لەگەڵ دوو جووت گۆرەوی و دوو دەرپێ قووت و دوو ژێر کراس، لەگەڵ سەڵتەیەکی درێژی تایبەت بە خۆی، کە لەناو یەکێك لە گیرفانەکانیدا حەفت لیرە و نیوو لەناو پەڕۆکێك پێچرابووەوە، لەگەڵ بەرماڵێك و گۆزەیەکی ئاو خواردنەوە.

پێویستە پیاوە ئایینیە تەماحکارەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، وانەیەك لەو فەیلەسووفە خاوێنە کوردە وەرگرن و تێبگەن نابێ وەك قاروون بن.

لەو سەردانەی کۆتایی، سەعیدی کوردی، دەیویست بە دیاربەکر و سیرت و بەدلیس و موش و هەکاریدا بگەڕێ، بەڵام

ئەو ویستەی نەهاتە دی، بەڵام سەرەڕای ئەمە وەسیەتەکەی هاتە جێ، چونکە، بەو پێیەی بۆ ئەو هیچ جیاوازییەك لە نێوان ناوچەکانی کوردستان نەبوو، لە کوردستان وەفاتی کرد و لە کوردستانیش نێژرا.

ئەوسا، فایەق بوجاك، سەروکاری مەراسیمی شاردنەوەی تەرمەکەی کرد. بەشێویەکی زۆر شکۆمەندانە ئەو ئەرکەی بە جێ هینا و لە مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیلولرەحمانی شاری ڕووها لە شوێنێکی پیرۆز بە خاك سپێردرا. لە ماوەیەکی زۆر کەم بە سەدان هەزار لە نوورجی و موریدەکانی، بە پاس و ئۆتۆمبێل، لە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵەوە هاتنە ڕووها و بەشێکی زۆریشیان هەر لەوێ مانەوە. بۆ کوردیش سەردانیکردنی ئەو کەسایەتییە پیرۆزە گرنگە، پێویستی نەبوو کە نوورجی بیت، چونکە ئەو یەکێکە لە گەورەترین زاناکانی کورد لەسەدەی نۆزدە و بیستدا. بە فەرمانی دەسەڵاتی فاشیستی ئەوسای تورکیا شەوێك گرووپێك دێن و گۆڕەکەی هەڵدەدەنەوە و تابووتەکەی دەردەهێنن و تەرمەکەی لەناو سندوقێکی دیکە دادەنێن و دەیبەنە دیاربەکر، لەوێشەوە بە فرۆکە لە نێوان مێرسین و قوبرس، لەناوەراستی دەریای سپی فرێی دەدەن، بەڵام هێشتاش کورد و نوورجییەکان هەر دەچنە سەر گۆڕەکەی ئەو، بەو هەستەی ئەوێ شوێنی ناشتنی ئەوە.

شێخ سەعیدی کوردی، نزیکەی ٩٠ساڵی تەمەنی، لە خزمەتکردنی گەلەکەی و مرۆڤایەتی تەرخان کرد و هیچ کاتێکی بە بەتاڵی بە فیڕۆ نەدا. ژیانی شێخ سەعید بەو شێوەیە کۆتایی هات. منیش وەك مرۆڤێك یان وەك نەوەیەکی ئەو، لێرە بە ڕێز و خۆشەویستییەوە دەمەوێ یادی بکەمەوە و ئەمەش بە ئەرکێکی سەرشانی خۆم دەزانم.

**بەدرخان پاشیم موراد**

کاك موراد، تاکە کوڕی بەدرخان پاشا بوو کە ئەوسا لە ژیان مابوو، چونکە بەدرخان پاشا بیست و حەفت کوڕی هەبووە. ساڵی ١٩٤٢ لەگەڵ کاك موراد یەکدیمان ناسی، ئەو لە کۆشکی فەنەریۆڵ دادەنیشت. دوو کوڕ و کچێکی هەبوو، کاك ئەحمەدی کوڕە گەورەی لە ئیزمیر پارێزەر بوو، کاك عەزیزی کوڕی بچووکیشی فەرمانبەری حکوومەت بوو، کاك موراد خۆشی دادوەری خانەنشین بوو.

ئیختیارێکی تا بڵێی میوان دۆست بوو، کە چوومە لای لەسەر ئاگردانی گۆشەیەکی ناو باخچەی کۆشکەکەی قاوەیەکی بۆمن و خۆی دروست کرد. دەستەکانیم ماچکرد. هەرچەندە داوام کرد ئەزیەت نەکێشێ، بەڵام بە بنزارێکی جوانی بۆتانی گوتی: "تا کوڕێ مـن چ زوڕ هەیە، ئەز ژی ژ خوەڕا قەهوەکی ڤەخۆم"، قاوەکەمان خواردەوە. زۆر هەوڵم دا تا ماندووی نەکەم، وردە وردە ئاخافتنەکەی نێوانمانم هێنا سەر باسی چیرۆکی ژیانی خێزانەکەیان.

چاوە گەشەکانی بریسکاوە و گوتی: "کوڕم بە داخەوە ماڵباتی بەدرخانی دابەشی سێ بەش بوون، بەشێکمان بووینە فەرمانبەری دەوڵەت و بووینە کەسانی دوور لە سیاسەت، زۆر لە برا گەورەکانم بوونە خانەدان و پاشا و دادوەر و پارێزگار و خۆیان دایە پەنا حکوومەتەکانی ئەوسا، بۆ نموونە، عوسمان پاشای برا گەورەم و حوسێن عەلی پاشا و عەلی شامیل پاشا و ساهیپە فەندیی پارێزگاری شام، لەو بەشەیاندا بوون. بەشێکیشیان وەکو پێشوو بەرگرییان لە کورد و پرسی کوردایەتی کرد، بۆیە

ناچار بوون توركیا جێبهێڵن، كامەران و جەلادەتی برازام لەناو ئەو بەشەیاندا بوون. بەڵام چەند برازایەكیشم خۆیان دایە پاڵ ئەتاتورك. ئاسف چنار زۆریش لە ئەتاتورك نزیك بوو، بۆیە، بووە وەزیری پەروەردە، نازناوی چناریش ئەتاتورك بۆی دۆزییەوە، تا لە بەدرخانییەكانی دابپڕێنێت، لەسەر ئەو پرسەش جارێك پێی گوتبوو: "خێزانەكەی ئێوە وەك داری چنار لق و پۆپی زۆرە، بۆیە، نازناوی تەواوی خێزانەكەتان دەكەمە چنار"، بەڵام منداڵەكانی تاهیری برام، بە شێوەیەك لە شێوەكان، ئەو نازناوەیان وەرنەگرت، كەچی ئەوانیش نازناوی (كوتای) یان خستە پاڵ ناوەكانیان، بۆیە جەمال و كەنعان كوتای نازناوەكانیان لەوێوە وەرگرتووە.

بۆ ئەوەی زیاتر لەوە ماندووی نەكەم، دەستەكانیم ماچكرد و جێمهێشت، بە داخەوە دوای ماوەیەكی كورت، كۆچی دوایی كرد. كاتێكیش، لە نێوان سالانی ١٩٤٧- ١٩٤٩، ژیانی هاوسەریم پێكهێنا، لە كۆشكەكەی ئەوان بوومە كرێچی و ڕەخشانی كچیشم لەوێ لە دایك بوو.

## شێخ سەلاحەدین ئینان

شێخ سەلاحەدین خەڵكی بەدلیسە، لەبەر نازناوە ناودارەكەی خێزانەكەیان (غەوس)ە، كورد پێی دەڵێن مەلا غەوس، ئەو نازناوەش لە عەرەبییەوە هاتووە كە بە مانای تەنگی زەوی، بە واتایەكی دیكەش بە مانای دەریای زانست دێت.

لە دێر زەمانەوە وا زانراوە كە یەكەم سەرهەڵدانی گەلی كورد لە كاوەی ئاسنگەرەوە دەستی پێ كردووە، دواتر سەدان شۆڕش و سەرهەڵدانی دیكەی كوردی ڕوودەدات. لە سەرەتای

سەدەی بیستەم سالی ١٩١٣ بەرخۆدانی حوزەیران، یاخود ڕووداوەکانی بەدلیس ڕوو دەدات. ئەوسا لەلایەك بە پالەپەستۆی قەیسەری ڕووس هێرش دەکرێتە سەر کورد و لەلایەکی دیکەش دەسەلاتی زالمی ئیتیحاد و تەرەقیی ئەوسا، کورد ناچاری دەربەدەری دەکەن. ئەو ڕووداوەی خوارەوە یەکێکە لەو سەدان ڕووداوەی ئەوسا بەسەر گەلی کورددا هات:

لە کاتی بەرخۆدانەکەدا، خوسرەو گەرەدە والی بەدلیس بووە، کە دواتر بووە سەرۆکی پەرلەمانیش، سەرۆکی بەرخودانکارانیش مەلا سەلیم بوو. والی بەدلیس بۆ سەندنەوەی تۆلە، هێزێکی زۆر دەنێرێتە سەر کورد، بەلام ئەو هێزە دەشکێندرێت و هێزە کوردییەکانیش دوو ناوچەی بەدلیس کۆنترۆل دەکەن، بەلام زۆری پێناچێت هێزێکی زۆر زیاتر دەنێردرێتە سەر کورد، لە ئەنجامدا هێزی بەرگریی کورد دەشکێنن و چەندان کوردیش دەستگیر دەکەن، دواتر ئەو دەستگیرکراوانە دادگایی دەکرێن و بەشێکیان سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەردەکرێ و بەشێکیشیان ڕادەگوێزرێن. لەو کەین و بەینەدا مەلا سەلیمیش دەچێتە ناو قونسولخانەی ڕووسیا، کاتێك یەکەمین جەنگی جیهانی دەست پێ دەکات، هێزە تورکییەکان هێرشیان کردە سەر قونسلخانەکە و مەلا سەلیم و هەژدە هاوەلی دەستگیر دەکرێن و دواتریش لە سێدارە دەدرێن. ئەو ڕووداوە لەناو خەلك ئەوەندە کاریگەریی هەبووە، کاتێك لە سالی ١٩١٣ ڕۆژ دەگیرێت، کورد ڕۆژ گیرانەکە بە لە سێدارەدانی مەلا سەلیم و هاوەلەکانی دەبەستریتەوە. جگە لەمە لە ژێر کاریگەریی ئەو لە سێدارەدانە شاعیرێکی میللی کوردی شیعرێکی قافیەدار دەنووسێت، بەشێوەیەك تا ئێستاش خەلك ئەو شیعرەیان ئەزبەرە، کە بەو شێوەیە نووسراوە:

"چوومە بەدلیسێ، خۆپانێ د کۆرتێ دا
هاتم بەدلیسێ، خۆپانێ د کۆرتێ دا
داراخاچی ڕاست کیربوون تێدا
کندرێن، زەیت کری بەردابوون پێدا
شێخ شابەدین، سەید عەلی و محەمەد شیرین ئاڤەتبوون پێدا
کندر قەتیا بوو، ژ با خوەدێ دا
شێخ شابەدین کەتبوو عەردێ دا
دڵێ نەیاران، کەڤر و تێدا
دیسان شێخ ئاڤێتبوون کندرێ سێیێ دا".

لە کـۆمەڵگەی ئیسـلامیدا باوەڕێـك هەیە، پێـی وایە گەر مێرخاسێك لەکاتی لە سێدارەدان گوریسەکەی ملی بپسێت و کەسەکە گیان لەدەست نەدات، ئەوە سزادراوەکە جارێکی دیکە لە سێدارە نـادرێتەوە، بەڵکـو سـزاکەی دەکـرێتە زینـدانی هەتـا هەتایی. بەڵام دیارە گەر ئەو کەسەی لە سێدارە دەدرێت کـورد بێـت، ئەو ڕێکـارە ئیسـلامیە هـیچ حیسـابێکی بـۆ ناکرێـت. ئەو شـێخانەی ئاواشـیان بەسـەرهات، لەسـەردەمی کۆمـار، کاریـان لەگەڵ حکـوومەتی تـورکی نەدەکـرد بـۆیە ئەوە کۆتاییەکەیـان بـوو، تـا سـەردەمی کـامەران ئینـانی[1] وەزیـرە بەناوبـانگە نـا خۆشەویستەکەمان.

شێخ سەڵاحەدینی بـاوکی کـامەران، کـوڕی شـێرە مێرخـاس

---

[1] کامـەران ئینـان (١٩٢٩ – ٢٠١٥) لـە دایـك بـووی بەدلیسـی بـاکووری کوردستانە و لە نێوان سـاڵانی (١٩٧٧ – ١٩٧٨) وەزیـری وزە و سـەرچاوە سروشتییەکانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

سەید عەلی بوو. ئەوان دوای دروستکردنی کۆماری تورکیا لەگەڵماڵباتەکەی ڕاگوێزرانە بورسا، هەر کاتێکیش شێخ سەلاحەدین لە بورساوە دەهاتە ئیستانبووڵ، بێ قەید و شەرت دەبووە میوانی من، کە دەهاتیش ڕاکیی[1] دەخواردەوە، ئەو عارەقەی زۆر حەز لێبو، منیش بە بیرە خواردنەوە هاوبەشیم دەکرد، بەدەم خواردنەوەش بە زمانە شیرین و کەلتوورە دەوڵەمەندەکەی خواردنەوەکەمانی خۆشتر دەکرد.

ئەو بنەماڵەیە کاتێک ڕادەگوێزرێنە بورسا، وەك سەردەمی بەدەوییەکان بە سەبەتە کەلوپەلی خۆیان نەبردبوو، بەڵکو زۆر پارچەی بەهاداری وەك مافوور و زێڕ و زیو و قاپ و قاچاغ و خشڵی جوانیان لەگەڵ خۆیان بردبوو. لەگەڵ تێپەڕینی کات، ئەو کەلوپەلە بەهادارانەیان هەموو فرۆشت و پارەکەیان خوارد، نەک هەر قەدەغەبە نامە بۆ ئەو خێزانە بنێردرێ، بەڵکو نەتوانراوە پارەشیان بۆ بنێردرێ، تا ئەو ئاستەی سەردەمێکی وایان هاتۆتە پێش کە ئەو ماڵباتە موحتاجی پارچە نانێك بووینە. شێخ سەلاحەدین چەندان داواکاری بۆ ئەنقەرە دەنووسێت، بەڵام هیچ وەلامێکی ناگاتەوە دەستی، لە کۆتاییدا، ڕۆژێك وەزیری ناوخۆی ئەوسای تورکیا دەچێتە بورسا، لەوێ شێخ سەلاحەدین قوتابخانەیەکی فەرهەنگیی هەبوو، وتاربێژێکی باش و نووسەرێکی بە سەلیقەش بووە، بۆیە، هەموو بەسەرهاتەکەی لە پەڕاوێکدا دەنووسێ و پوولێکی ١٥ قرووشیشی لێدەدا و واژووی دەکا. دواتر نووسراوێکی دیکەش دەنووسێ و پوولی لێ دەدات، نووسراوی دووەم تەنیا لەسەری دەنووسێت: "جەنابی

[1] جۆرێکی باوی عارەقە.

نوێنەری ناوەخۆ، تکاتان لێدەکەم تا کۆتایی بیخوێننەوە"، ئینجا ئەو نووسراوە، لەوەی یەکەم دەدات. وەزیری ئەوسای ناوخۆی تورکیا، حیلمی ئوتان، داواکارییەکەی پێ سەیر دەبێ و یەکسەر فەرمان دەکات خاوەنی ئەو نووسراوە بیننەوە و بۆی بهێنن. کاتێك شێخ سەلاحەدین دەگات، وەزیر بەدەمییەوە دەچێت و داوای لێبووردنی لێدەکات، فەرمانیش بە پارێزگاری بورسا دەدا ئەرکێکی پێ بسپێرن کە مووچەیەکی چاکی هەبێت. دواتر ساڵ لە دوای ساڵ، لە ساڵی ١٩٤٧ گوایە تورکیا دەبێتە دیموکراسی، وەك ئەوەی شێخ سەلاحەدین، قەباحەتێکی کردبێت لێخۆشبوونی بۆ دەردەچێت. بەر لەوەی بورسا جێبهێڵێ هاتە ئیستانبوول و ماڵئاواییمان لەیەك کرد و ئینجا گەڕایەوە کوردستان. دوای گەڕانەوەی لە پارتی دیموکرات بووە پەرلەمانتار. لە کودەتایەکدا پارتی دیموکرات لە دەسەڵات دەهێنرێتە خوارەوە و سەرجەم پەرلەمانتار و بەرپرسانی دەستگیر دەکرێن و دەبردرێنە دوورگەی یاسسی بۆ ئەوەی دادگایی بکرێن. لە کاتی دادگایی کردنی شێخدا، سەرۆکە فاشیستەکەی دادگای دوورگەی یاسسی، سەلیم باشۆل، بە شێخ دەڵێ: "کاك سەلاحەدین ئێوە شێخن، هەر ئەوەندەش نا دەڵێن ئێوە غەوسیشن، ئایا ئەوە چییە؟" شێخ سەلاحەدینیش ئاوا وەڵام دەداتەوە: "جەنابی دادوەر ئێمە لە سەردەمی عوسمانییەکان شێخ و غەوس بووین، وەك چۆن سەرۆکی وڵاتیش خەلیفە بوو، واتا نوێنەری پێغەمبەر بوو، بەڵام کاتێك سەرۆکی وڵات وازی لە خەلیفایەتی هێنا، ئێمەش بە ڕێگای سەرۆکە تازەکانمانەوە بە دوای پارە و ژن و عارەق و قومار کەوتین". شێخ سەلاحەدین مەبەستی ئەتاتورك و سەرۆکەکانی دواتری تورکیا بووە.

شێخ سەلاحەدین لەگەڵ دوو ژنی هێنابوو، دانەیەکیان کورد

بوو، کە لەو خێزانەیان کوڕە گەورەکەی عابدینی هەبوو، ئەو هەم لای باوکی و هەمیش لای خەڵکی کوردستان کەسێکی خۆشەویستە، بەڵام بەداخەوە ماوەیەکە ئیفلیج بووە، ئێستاش نازانم لە ژیان ماوە یان نا. خێزانەکەی دیکەشی کچی خێزانێکی ناوچەی دەرخاسەی ئەرمەنییانە، لەو خێزانەشی کامەران ئینانی هەیە، کە هەم تورك و هەمی خەڵکی کوردستانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە. خوا شاهێدە کامەران هێشتا بچووك بوو شێخ سەلاحەدینی باوکی پێی گوتم: "ئەو کوڕە دەبێتە پەڵەی شەرمەزاری بەنێوچاوانمەوە"، ئێستا کامەران لە ژیان ماوە و دەتوانێ وەڵامی ئەو نووسینانەم بداتەوە و داواشم لەسەر تۆمار بکات لە دادگا، بەڵام من دەتوانم بە هەزاران شاهێد ڕاستیی ئەو نووسینەم پشتڕاستبکەمەوە. من هیچ گەل و نەتەوەیەك بە کەم نابینم، بۆ فەرەنسەیەك و ئەرمەنییەکیش ڕێزێکی مرۆڤانەم هەیە، بەڵام کامەرانە فەندی دەڵێی بۆ بێ بەهاکردنی خێزانی غەوسییەکەیان فەرمانی پێکراوە. ئەو لەگەڵ مەدامێکی فەرەنسی هاوسەرگیریی کرد، شێخ سەلاحەدینیش ئومەتچی نەبوو، بۆیە بۆ کامەران تەنیا نەتەوە پەروەرییەکەی مابۆوە، بەڵام نازانین منداڵەکانی لەسەر کامە نەتەوە هەژمار دەکات، چونکە بە کامەران بێ منداڵەکانی نە کوردن و نە ئەرمەنی و فەرەنسی، چونکە وای بۆ دەچێ یان تاتارن، یانیش مەغۆل، بەشێوەیەك کامەرانە فەندی لە ئەدەبیاتی میللی کوردی پەخشانێکی ئاواشی لەسەر دەگێڕنەوە:

دەڵێن کاك بەردخان کاتێك لە کۆشکی (بیرجە بەلەکی) جزیرێ پیاسە دەکات، دوو قەفەسی کەو دەبینێ لە دەستی عەلی شامیلی کوڕی، کە دواتر ئەو کوڕەی دەبێتە پاشا، کاك بەدرخانیش دەپرسێ: "ئەوە چییە کورم؟"، عەلی کوڕیشی دەڵێ:

"بابە، ئەوە کەوێکی زۆر بەهادارە و لە شنگالەوە بۆم هاتووە".
بەڵام کاك بەدرخان دەڵێ: "جا ئەو کەوە باشییەکەی چییە؟"
کوڕەکەش وەڵام دەداتەوە: "بابە، ئەو کەوانە دەبەمە چیا و لەوێ
تەڵە بۆ کەوە چیاییەکان دادەنێمەوە، بەشێوەیەك کاتێك
کەوەکانی من لەناو قەفەس دەست بە خوێندن دەکەن، کەوی
ناوچەکە بەدەم ئەو دەنگەوە دێن، کاتێکیش نزیك دەبنەوە
دەکەونە ناو ئەو تەڵانەی من بۆم داناون". دوای ئەو وەڵامە،
کاك بەدرخان کەوەکانی ناو قەفەسەکە دەردەهێنێ و سەریان
هەڵدەکێشێ و فڕێیان دەداتە سەر زەوی. دوای ئەو کارە
منداڵەکە دەست بە گریان و فیغان دەکا و خۆی لە زەوی
دەگەوزێنێ، کاك بەدرخانیش کوڕەکە لە زەوی هەڵدەگرێتەوە
و دەستی بەسەردا دەهێنێت و دەڵێ: "کوڕی خۆم، مرۆڤ یان
ئاژەڵ جیاوازی نییە، گەر بەرامبەر بە کۆمەڵ و نەتەوەکەی
غایەنی بکات دەبێ سەری هەڵبکێشرێ". کامەران ئەو نموونە بە
هەڕەشە تێنەگات، بەڵام پێم وایە جەنابیان وەك نموونەی ئەو
کەوەیە.

بەو بۆنەیەوە ڕێز و حورمەتی بێ پایەنم هەیە بۆ شێخ
سەلاحەدین، بەڵام کامەران ئینان لەو ڕێز و حورمەتەم بەدەرە،
بەشێوەیەکی دڵپاکانەش باوەڕم وایە و دەڵێم گەر ئەمڕۆ شێخ
سەلاحەدین لە ژیاندا مابا و کامەرانی بەو شێوەی ئێستا بینیبا، لە
من زیاتر بەر شاڵاوی ڕق و قینی دەکەوت و لەوەبوو حاشاشی
لەوە کردبا کە کوڕیەتی.

## شێخ عەلی ڕزا

شێخ عەلی ڕزا کوڕی شەهیدی کورد شێخ سەعیدی پیرانە، ئەو، لەبەر ئەوەی کوڕی گەورە بووە، بۆیە زۆر لە باوکی نزیك بووە. شێخ عەلی ڕزا شارەزای زانستە ئایینییەکان و پرسی کورد بوو، بەڵام لەلایەك ئەو ڕووداوانەی بەسەر خێزانەکەیان دێ و لەلایەکی دیکەش لە سێدارەدانی خەزووری، وا دەکات بۆ ماوەیەك بەرەو بەغدا بڕوا و بیێتە پەناهەندە. دوای دەرچوونی لێخۆشبوونیش کاتێك دەگەڕێتەوە، خەڵك بە چاوێکی دیکە لە خۆی و خێزانەکەی دەڕوانن، بۆیە، بە بەهانەی کێشەی ئاو دەسەڵاتی تورکیا جارێکی دیکە ڕایاندەگوێزنە تاراکیا و ئەنقەرەش دەست بەسەر ماڵ و موڵکیاندا دەگرێت.

من، بەبێ بینینی خۆی، ئەو و خێزانەکەیم لە بچووکییەوە ناسیووە، بۆیە بەردەوام ڕێز و خۆشەویستیم بۆ شێخ سەعید و ماڵباتەکەیان هەبووە، بەڵام نازانم یەکدی ناسینەکەمان ڕووداوێکی خۆش بوو یان نا، چونکە بەو شێوەیەی خوارەوە بووە:

فاتمە خانی خوشکی بچووکی جبرانلی خالید، دوایین خێزانی شێخ سەعید ئەفەندییە، فاتمە خان لە شێخ سەعید کوڕێکی هەیە و ناوی ئەحمەدە، ئەوانیش، وەکو هەموو ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەی شێخ سەعید بەرەو چۆرلوو ڕاگوێزرابوون. ئەوسا بەپێی یاسای ڕاگوێزران، هەرکەسێکی ڕاگوێزراو، بەبێ بوونی مۆڵەتی وەزارەتی ناوخۆ، نەیدەتوانی ئەو شوێنەی بۆی ڕاگوێزراوە بەجێبهێڵێت و بچێتە شوێنێکی دیکە .

پێچەوانەی ئەو یاسایە، ڕۆژێك فاتمە خانم، دڵی دەکوشرێ

و بێ وەرگرتنی مۆڵەت سواری ئۆتۆمبێلێك دەبێ و دێتە ماڵی ڕائید ڕەشیدی خانەنشینکراوی ناسیاویان لە ئیستانبوول. من لەگەڵ کاك ڕەشید دۆستایەتیم هەبوو، کەسێکی زۆر خۆش مەشرەب و نوکتەچی بوو، بەردەوام نزای بۆ کورد دەکرد، بەڵام نەیتوانیبوو لە ژێر کاریگەریی ڕووداوەکانی ڕابردوو ڕزگاری ببێ، بۆیە بەردەوام ئامۆژگاریی دەکردم خۆم لە زوڵمی حکوومەت دوور بگرم، لەسەر کەللە ڕەقییەکەشم دەیگوت: "وەڵا ئەز یەقین ناکەم تۆ بەو سەرەوە بچییە ناو گۆڕ".

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی ١٩٤٦ کاك ڕەشید بە پەلە و هەناسەسوارییەوە هاتە لام، لەبەر ئەوەی نەخۆشی دڵی هەبوو، بۆیە دامنیشاند و چووم پەرداخێك ئاوم بۆ هێنا تا پشوویەك بدا. دواتر لێم پرسی: "مامە خێرە ئینشاڵڵا؟" وەڵامی دامەوە: "خێری چی کوڕم، خێزانی شێخ سەعید ئەفەندی لە پڕ هاتۆتە لای ئێمە، نازانم چی بکەم، ناکرێ دەری بکەم، بەڵام لای ئێمەش ببینن نازانم چیم لێ بەسەردێ!" منیش دڵمداوە: "مامە هەرچۆنێك بێ ئێوە پێم دەڵێن گیان فیدا، بۆیە من چارەی ئەو کێشەیەش دەکەم، بەڵام تکایە خۆتان بێ خولق مەکەن". ئەویش گوتی: "کوڕم چۆن چارەی دەکەی؟"، منیش گوتم: "فاتمە خانی دەبەمە ماڵی خۆمان، بەو شێوەیە وای پیشان دەدەین کە لە سەرەتاوە هاتۆتە لای من، وەك ئەوەی تۆی نەناسیبێ، گەر دەستگیریش کرام، با بۆ خاتری ئێوە بێت، چونکە منیش هەستدەکەم وەك ئەو ڕاگوێزراوانەم لە ئیستانبووڵ، گەر ویستیان با منیش ڕاگوێزنە ئەدرنە، سزاکەشیان لەوەی زیاتر نییە".

ئەوکات کاك ڕەشید هاتبووە بەشە ناوخۆیی قوتابیانمان، بۆیە گوتی: "کوڕم وەڵلا شەرم دەکەم، من لێرە دادەنیشم و وەك ئەوەی من ئاگام لە هیچ نەبێ تۆ بڕۆ چی دەکەی بیکە". خۆم

کۆکردەوە و چوومە ماڵیان. پەیکەر خانی خێزانی کاك ڕەشید، منی وەك کوڕی خۆی خۆش دەویست، بۆ هۆڵی دانیشتنی ماڵەکەیان فەرمووی لێ کردم، سەرەتا فاتمە خانی لە منیش شاردەوە، کاتێك دۆخەکەم بۆ باسکرد، ئەویش هەناسەیەکی هاتەوە بەر، پەیکەر خانیش خەڵکی جیبرانلیدی بوو، نەوەی عەلائەدین پاشای ناسیاوی کاك خالیدە، کە ئێستا لە مووش مزگەوتێکی گەورە و وەقفیان هەیە. بەیەکەوە چووینە لای فاتمە خان، دەستەکانیم ماچکرد و ڕێز و حورمەتی خۆم پێ گوتن، پێم گوت بۆ چەند ڕۆژێك یان تا چەندی خۆی حەز دەکات دەتوانێ ببێتە میوانی من، چ وەك ناسیاوی کاك خالید یان وەك خێزانی شێخ سەعید، بۆیە، ئەو شەرەفەم پێببەخشن و لام بمێننەوە، ئەویش بەچاو سەیرێکی پەیکەر خانمی کرد، وەك ئەوەی بە چاوەکانی بپرسێت گەر بڕۆم ئاساییە؟ پەیکەر خانمیش بە کورمانجی گوتی: "خوشکا من تو زانی، مووسا ژی کوڕێ مەیە". ئیدی فاتمە خان داواکەی ڕەتنەکردمەوە و خۆی ئامادە کرد و پەچەکەی لەبەر کرد و چووینە ماڵی ئێمە. ڕێز و حورمەتێکی زۆرمان لێنا، کاتێك کاك عەبدولڕەحیمی خەزوورم و خەسووم بیستیان زۆر دڵخۆش بوون، ئەوان بۆ ساتێکیش فاتمە خانیان بە تەنیا جێ نەهێشت. جا بۆ دڵخۆشکردنیان چەندان دیاری و پۆشاکی پێویستیان بۆ فاتمە خان و ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەیان کڕی. بەو شێوەیە دە ڕۆژ لە ماڵەکەی من مانەوە، دواتر خێزانەکەی پێیانزانی هاتۆتە ئیستانبووڵ، بۆیە هاتن و لەگەڵ خۆیان بردیانەوە.

فاتمە خانم دوای گەڕانەوەی تەواوی ڕووداوەکە بۆ خێزانەکەی دەگێڕێتەوە. نزیکەی ساڵێك دوای ئەو سەردانە، کاتێك لێخۆشبوون بۆ ماڵباتی شێخ سەعیدە فەندی دەردەچێت،

خـــۆی و تەواوی خێزانەکەیـــان هـــاتنە ئیســـتانبووڵ، لە یەکەم دەرفەتیانـدا کـاك عەلـی ڕزا و چەنـد بـرا و ناسـیاوێکی هـاتنە ماڵمـان. ئـێمە بەو سـەردانە زۆر دڵخـۆش بـووین، بەڵام لەبەر ئەوەی خاوخێزانەکەیـان ژمارەیـان زۆر قەڵەبـاڵخ بـوو، بـۆیە لە ناوچەی مەرجان لە میوانخانەی کوردێـك مـابوونەوە، بۆ مـانەوە نەهاتنە ماڵەکەی ئێمە.

بەو بـۆنەیەوە، لەگەڵ کـاك عەلـی ڕەزا یەکـدیمان ناسـی، بۆیەش نەمگوت شـێخ چـونکە بێـزار ببوو لەوەی پێـی بڵـێن یـا شـێخ، لەسـەر ئەو مەسـەلەیە دەیگـوت: "ئەی هـاوار پـێم مەڵـێن شێخ، چونکە ئەو ناوە زۆر بەڵای بەسـەر کـورددا هێنـاوە، ئـاخر بووە یەکێك باوکی شێخ بێ، بەڵام کلاوچیی وەك خۆی نەبێ؟، کەچی لەبەر ئەوەی باوکی شێخە ئەو کوردەی ئێمە پێیدەڵێن یـا شـێخ". دوای ئەو قسـە لەگەڵ ئەوەی مـن گـوتم ئەسـتەغفیرولڵا جەنابتان ئاوا نینە، بەڵام گوتی: "نا کـاکە نـا منـیش وەك ئەوانـم، بۆیە ئێوە بە منیش مەڵێن یا شـێخ". بیـرم دێ سـێ چـوار ڕۆژ لە ئیسـتانبووڵ مـانەوە، هۆکـاری مانەوەشـیان لەو کـاتەدا، سـەردانی کوردانی ئەو شارە بوو بۆ لایان، بۆیە ئەوانم تەنیا جێ نەهێشـت، تا بلیتی شـەمەندەفەریان کـڕی بـۆ گەڕانەوە. لە گـاری حەیـدەر پاشـا جـارێکی دیـکە دەسـتی فـاتمە خـانمم مـاچکرد و بەرەو ئەرزڕووم بەڕێمـــانکردنەوە. ئەوان چـــوونە قەزای هـــنس لە ئەرزرووم، دوای گەڕانەوەشـــیان لەگەڵ کـــاك عەلـــی ڕزا پەیوەنـدییەکانمان بەردەوام بـوو، تـا ئەو ڕۆژەی کـۆچی دوایـی کـرد. لە دوایـین نەخـۆش کەوتنـی، کاتێـك هـاتبووە ئەنـقەرە، چوومە سـەردانیان. چەنـد گەنجێکـی خێزانەکەشـی لەگەڵ بـوو، ئەوان لەمن زۆر لاوتر بوون و ئێستا لە ژیاندا ماون، بۆیە، عەلـی ڕزا ڕووی تێکردن و پێی گوتن: "سەیرکەن کوڕینە، هەرگیـز لە

ڕێگای مووسا عەنتەر دەرنەچن، گەر دەریشچن گەردەنتان ئازا ناکەم". ڕۆژێک لەو ڕۆژانەی لە ئەنقەرە بووم داوای بەڵگەنامەکانی بەسەرهاتی باوکیانم لێ کرد، ئەویش گوتی: "کوڕم وەڵڵا منیش دەمەوێت ئەو بەڵگەنامانەت بدەمێ، بەڵام زۆربەیان کاتی خۆی بە نهێنی درانە دۆستێکی عەرەبمان لە بەیروت، پێموابێ ئەویش یان لەناوی بردن، یاخود تا ئێستا شاردیتییەوە، چونکە ئەو کابرایە جارێکی دیکە نەیداوە ئێمە". لە چەند دیدارێکی دیکەی ڕۆژانی دواتر، باسی پرسی کوردمان کرد، سەبارەت بەو پرسە ئەو پێیوابوو: "پرسی کورد تا لە ئاستی ناوەندە دیموکراتییەکانی جیهان و ڕێکخراوە نا حکوومییەکان نەناسێندرێت، ئەوە پرسەکە ناگاتە کەنارێکی ئارام، چونکە ئێستا وڵاتانی جیهان کاتێك باسی کوردیان لا دەکەیتەوە، کێشەکە تەنیا وەك پرسێکی ناموس لێکدەدەنەوە، بۆیە بە دەستدانە چەك و چوونە شاخ ئەو پرسە چارەسەر ناکرێ. بۆ نموونە ڕووداوەکانی مێژووی نزیکمان شاهێدیی ئەوەمان بۆ دەدەن. بەسەرهاتەکانی باوکم و ئاگری و زیلان و ساسۆن و دێرسیم، وتەکانم پشتڕاست دەکەنەوە. بۆیەش، ڕێگا و میتۆدی کارکردنی تۆم بە دڵە، دەبێ سەرەتا جیهان ئاگاداری ئەوە بێت کە پرسی کورد پرسێکی ڕەوایە، ئینجا کێشەکە چارەسەرکردنی ئاسان دەبێ، بۆیە ئەمە ئامۆژگاریی منە بۆ تۆ و گەنجە کوردەکان".

منیش بەو بۆنەیەوە سەرگوزەشتەکانم لەگەڵ جەنابیان بە ڕێزەوە یاد دەکەمەوە و سەری ڕێز و نەوازش بۆ جەنابیان و باوکی بەڕێزیان شێخ سەعیدی پیران دادەنوێنم.

## شێخ عەبدولباری کووفرەڤی

شێخ عەبدولباری، کوڕی شێخ محەمەد کووفرەڤییە. شێخ محەمەد یەکێکە لەو پێنج شێخەی مەولانا خالید ناردبوونیە کوردستان بۆ بڵاوکردنەوەی تەریقەتی نەقشبەندی. قوببە ناودارەکەی بەدلیس مەزارگەی شێخ محەمەد کووفرەڤییە. ساڵی ١٩٥٨ لە سەردانێکم بۆ بەدلیس چوومە سەر مەزارگەکەی، بەڵام لەوێ شتێکی سەیرم بینی. لەبەردەم دەرگای چوونە ژوورەوە، کاتێك دەچیتە ناو مەزارگەکە، لە شوێنی پێدانان، هەستم کرد جێی گۆڕێکە، زۆریش پێدەچێ لەگەڵ هاتوچۆ قەبرەکە لەگەڵ زەوی تەخت بووبێ، سەرەتا ویستم پێی لێ نەنێم، بەڵام سەیرم کرد بەبێ ئەوەی پێ لەو گۆڕە نەنێی ناتوانم بچمە ناو قوبەتەکەوە، وەستام و نەچوومە ژوورەوە. ئەو ڕێبەرەی لەگەڵم بوو هەستی بە هەڵوەستەکەم کرد و گوتی: "بەڕێزم شێخ ئەمین ئەفەندی، ئەوەندە شێخ محەمەد کووفرەڤی خەلیفەی خۆشویستووە و جێگای ڕەزامەندیی بووە، وەسیەتی کردووە لەبەردەم مەزاری شێخ محەمەد بینێژن، تا هەر موسوڵمانێك بەر لەوەی بچێتە سەر مەزارەکەی، پێ لە گۆڕەکەی ئەو بنێ. بۆیە تۆش پێی لێ بنێ و بچۆ ژوورەوە". بە شەرم و نا بەدڵییەوە، پێم لە گۆڕی ئەو زانا گەورەیە نا و چوومە ژوورەوە. دواتر کە هاتمەوە ئیستانبووڵ بەسەرهاتەکەم بۆ موستەفای نەوەی شێخ ئەمین ئەفەندی گێڕاوە، شێخ مستەفاش بە پێکەنینەوە گوتی: "ئەو ڕێبەرە درۆی کردووە، لەبەر ئەوەی باپیرەم هیچ وەسیەتێکی ناوای نەبووە، کووفرەڤییەکان بۆخۆیان ئەو چیرۆکەیان هەڵبەستووە، تا خۆیانی پێ گەورە بکەن".

شێخ عەبدولباری ڕاگوێزرابووە ئێدرنە، پۆلیسی بەر دەرگای ماڵەکەیان ناوی هەموو ئەو کەسانەیان تۆمار دەکرد کە دەچوونە لای. ساڵی ١٩٤٣ قاسم کووفرەڤی کوڕی لە پارتی دیموکرات، لە شاری ئاگری ببووە پەرلەمانتار و ئێستاش مامۆستای بەشی ئەدەبیاتە. لەگەڵ کاک قاسم، کاتی خۆی هەم قوتابی بووین، هەمیش برادەر. بیرمدێت زوو زوو دەچووینە تورشی فرۆشەکەی لای ناوچەی شێخزادە و بەیەکەوە پێنج قروشمان دەدا و ئاوی تورشیمان دەخواردەوە. ڕۆژێك، لەسەر داوای من، بەیەکەوە چووینە زیارەتی باوکی، هەڵە نەبم تەمەنی نزیکەی ٨٠ – ٨٥ ساڵێك دەبوو، ڕیشێکی درێژی سپی و سیمایەکی کوردانەی هەبوو، دەستەکانیم ماچکرد و قاسمیش منی پێناساند. جەنابیان زانیی لەگەڵ کچی کاك عەبدولڕەحیم دەستگیراندارم، چونکە دیار بوو بەر لە یەکدی ناسینمان گوێی لە ناوم ببوو. بە کوردی دەستمان بە قسەکرد، سەرەتا ماچی کردم و بۆ ئەوەی کەلەجانەکەشم نەمێنێ بە حەنەکەوە گوتی: "کوڕی خۆم تۆ خەڵکی نوسەیبینی، بەڵام ئینشاڵا ئێزیدی نیت، قەینا گەر ئێزیدیش بی چ کێشە نییە، چونکە ئێزیدی زۆر لە موسوڵمانان باشترن، هەرنا ئێوە بۆ گەل و ئایینەکەتان زۆر ساڵحترن و وەك ئێمە نین؟". دوای ئەو دیدارە شێخم زۆر کەوتبووە بەر دڵ و زوو زوو دەچوومە سەردانی. هەرگیز بیرم ناچێتەوە لە یەکێك لە سەردانەکانمدا، کاتێك چوومە لای قاپێك بەرووی کولاوی لەپێش بوو، شێخ نەریتی وابوو، خواردنی لەگەڵ کەس نەدەخوارد، بەڵام ئەو ڕۆژە فەرمووی لە من کرد تا بەرووەکە بەیەکەوە بخۆین. ئەو شەوە تا درەنگانێك چووبووینە قووڵایی زۆر بابەت و بەم شێوەیە چەند یادەوەرییەکی خۆی بۆ گێڕامەوە:

"کورِم من بەرامبەر مرۆڤایەتی و نەتەوەکەم کەسێکی تاوانبارم، بۆیە دەمەوێ بە داوای لێبووردنەوە لە دوارِۆژەکانی ژیانم ئەو تاوانانەم بۆتۆ باسبکەم، بەڵکو لە داهاتوو ئەوە بۆ گەلەکەم بگێریتەوە. من یەکەم تاوانم ئەوە بوو کە لە ساڵی ۱۹۱٦ -۱۹۱۷ کاتێك سوپای عوسمانی لە وڵاتە عەرەبییەکان بە هۆیها دەردەکران، عەرەبەکان بیستبوویان کە ژەندرمەی عوسمانییان زێرەکانی خۆیان قوت دەدەن، ئینجا هەڵدێن، بۆ دەستخستنی ئەو لیرە زێرانە، عەرەبەکان هەر چ سەربازێکی عوسمانیان کەوتبا دەست دەیانکوشتن و ریخەڵۆکانیان دەردەهێنان و بەدوای زێردا دەگەران. ئەوسا من لەو ناوچەدا شێخێکی بە دەسەڵات بووم، بۆیە سولتان رەشاد[1] نامەیەکی بۆ ناردم، لە نامەکەیدا سولتان باسی ئەو پێشهاتەی کردبوو و داواشیان لێ کردم بچمە لای شێخی عەشیرەتی شامرار و تەیاح لە میزۆپۆتامیا، تا دەست لەو کردەوە ناشرینە هەڵگرن. دوای نامەکە بەرەو نوسەیبینی شارەکەی تۆ بەرێکەوتم، ئینجا لە رێگای چیای سنجار و عەبدولعەزیز، گەیشتمە ئەو شێخانەی لە ژێر چادر دەژیان. ئەوان رێز و حورمەتێکی زۆریان لێنام و گوتیان: "ئاگاداری ئەو تاوانەین، بەڵام دەستبەجێ پێشی لێ دەگرین". دوازدە شێخی هەڵبژێردراو و پیاوەکانیانم بردە لای فەرماندەیەکی سەربازی لە سەربازگەی نوسەیبین، تا بۆ رێ گرتن لەو کردەوانە رێگا چارەیەك بدۆزنەوە. بەیانیی رۆژی دواتر زوو لەخەو هەڵستام و بینیم هەر دوازدە شێخیان لە سێدارە

---

[1] سولتان محەمەد رەشاد (١٨٤٤ – ١٩١٨) ٣٥مین سولتانی عوسمانییەکانە و لە ماوەی ساڵانی (١٩٠٩ – ١٩١٨) سولتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەکان بووە. (وەرگێر).

دراون، پێموابوو ئۆباڵی ئەو تاوانە لە ئەستۆی مندایە، بۆیە بە ئازارێکی زۆری ویژدان و دەرد و کەسەرەوە گەڕامەوە بەدلیس، بەڵام دیار بوو هێشتا عاقڵ نەبووبووم. چونکە ساڵی ١٩١٩ کاتێك مستەفا کەمال پاشا (ئەتاتورك) هاتە کوردستان، عوسمانییەکان بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرکردبوو، وەك چۆن بە کوردەکانیان دەگوت ڕێگر و جەردە، بە هەمان شێوە دەوڵەتی عوسمانی هەمان ناویان بۆ ئەویش بەکارهێنا، بەڵام من و شێخە کوردەکانی دیکە لەگەڵ ئاغا و بەگەکان، مستەفا کەمالمان پاراست و ئامادەکاریمان بۆ کۆنگرەی ئەرزرووم کرد، دواتر حاجی بەدر ئاغای کاهتاڵی و پێنجسەت سوارچاك لەگەڵ هێزەکانی دیاپ ئاغای[1] دێرسیمی هاتینە سیواس و

---

[1] دیاب ئاغا (١٨٣١ – ١٩٣٥). هاوینی ساڵی ١٩١٩، کاتێک مستەفا کەمال ئەتاتورک دەیەوێت بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەی سیواس لە ئەرزەرووممەوە بەڕێکەوێ، عەلی غالیبی والیی خارپوت، بە فەرمانی ئیستانبوڵ، پیلانێک دادەڕێژێت بۆ کوشتنی ئەتاتورك. هێزێک بۆ ئەو مەبەستە ئامادە دەکات، بۆ ئەوەی لە ڕێگە ئەتاتورک و هاوڕێکانی بخەنە بۆسەوە. دیاب ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی فەرهاد ئوشاکی دەرسیمی بەو هەواڵە دەزانێت و، دەستوبرد پەیوەندی بە چەند سەرۆک هۆزێکی دیکەی کوردەوە دەکات و بە هێزێکی گەورەوە دەچنە سەر ڕێگەی نێوان ئەرزەرووم و سیواس بۆ پاراستنی ئەتاتورک. دیاب ئاغا و هێزەکەی، سێ ڕۆژ لە ناوچەکە دەمێننەوە تا ئەتاتورک دەگات. هێزەکەی ئەتاتورک سەرەتا سەریان لێ دەشێوێت و وا دەزانن کەوتوونەتە بۆسەی دوژمنەوە. بەڵام دیاب ئاغا لێیان دێتە پێشەوە و بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە ئەوان لە پێناوی پاراستنی ئەتاتورکدا لەوێن.
لەو ساتە بەدواوە، دیاب ئاغا و ئەتاتورک دەبن بە هاوڕێ و، ئەتاتورک لە ساڵی ١٩٢٢ لە یەکەم خولی پەرلەمانی تورکیا، دەیکاتە نوێنەری دەرسیم. دیاب ئاغا تا مردنی لە ساڵی ١٩٣٢، وەک کەسێکی ئەڵقە لە گوێی ئەتاتورک بوو و دژی شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران و هەموو هەوڵێک
←

کۆنگرەکەمان بەستا. دەمەوێ بە کورتی بڵێم کەمال پاشا چەندان جار ئەوەی دووپات کردەوە کە بەرامبەر مافی گەلی کورد ڕاستگۆ دەبێ. ئێمەش بڕوامان پێ کرد و پشتگیریمان کرد، بەڵام کابرا کۆماری دامەزراند و لە ڕێککەوتننامەی لۆزان، پشتی تێ کردین و هەر شێخ و ماڵباتێکی گەورەی کورد کە یارمەتیی دابوو، بە بەهانەی جیاواز لە سێدارەی دان و ئەوانەی ماشنەوە، هەمووانی ڕاگوێزا شوێن و ناوچەی دیکە. تۆ دۆخی من دەبینی و منداڵەکانی حاجی بەدر ئاغاش، کە باوکیان زۆر ڕێزی لە ئەتاتورك دەگرت، دەبینی چۆن ئەوانیش هەموویان ڕاگوێزرانە مێرسین، میرئالای کاك خالید و یوسف زیای پەرلەمانتاری بەدلیس و هەموو دێرسیمییەکانی دیکەش دۆخیان دیارە چۆنە".

ئەو شتانەی شێخ بۆی گێڕامەوە، جۆرێك بوو لە لێپێچانەوەی ویژدانی و پەشیمانیی یادەوەرییەکی تاڵ. دواتر، لە ساڵی ١٩٤٦ کۆچی دوایی کرد. دوای مردنی باوکی، قاسمی کوڕی دەیویست تەرمی باوکی بباتەوە بەدلیس، ئەوکات سەرۆککۆمار عیسمەت ئینینۆ[1] لە کۆشکی فلۆریا دەماوە، بۆ وەرگرتنی

---

بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد وەستایەوە. دیاب ئاغای دەرسیمی، ئەتاتورکی لە مەرگێکی مسۆگەر ڕزگار کرد، بەڵام ئەتاتورک ٥ ساڵ لە دوای ئەو، خەڵکی دێرسیمی جینۆساید کرد و تەنانەت دەستی لە ئەندامانی بنەماڵەی دیاب ئاغا و عەشیرەتەکەیشی نەپاراست. (وەرگێڕ).

[1] عیسمەت ئینینۆ (١٨٨٤ – ١٩٧٣) لە دایك بووی ئیزمیرە و بە ڕەگەز کوردە، بەڵام خۆی بە تورك دادەنا. یەکەم سەرۆکوەزیرانی تورکیایە و دووەم سەرۆککۆماری ئەو وڵاتەیە. عیسمەت ئینینۆ جگە لە بەڕێوەبردنی چەندان پۆستی سیاسی و سەربازیی هەستیار، وەکوو نوێنەری تورکیا واژووی لەسەر ڕێکەوتننامەی لۆزان کردووە. (وەرگێڕ).

مۆڵەتی گواستنەوەی جەنازەی باوکی، قاسممان ناردە لای، عیسمەت پاشاش بە بەکارهێنانی تەڵەکەبازییەکانی پێی گوتبوو: "کورم بەو هۆکارانەی گواستنەوەی ئەمڕۆ هەیە، بردنەوەی تەرمی شێخ بۆ بەدلیس تا بڵێی گران و شەقەتییە، بەڵام من فەرمان دەکەم لە قەبرستانی ئەیوب سوڵتان شوێنێکی گونجاوی بۆ دیاری بکەن". پێموابێ بۆ تێچووەکانی تازیە و جەنازەکەش ۲۵۰ لیرەی دابووە قاسم، بەڵام ئەو بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گەڕابۆوە. دواتر بە شێوەیەکی سادە و خاکیانە تەرمی شێخمان شاردەوە، تا ئەوڕۆش گۆڕەکەی لە شوێنی خۆیەتی، ئینشاڵلا خوا لە کەم و کوڕییەکانی دەبووڕێت و گۆڕی پڕ دەکات لە نوور.

قاسم کووفرەڤی ئێستا لە ژیان ماوە، شاهێدی بۆ ئەو وتانەم دەدا، چونکە بەشێکی زۆر لە کەسایەتیی ناو بیرەوەرییەکانم ئێستا لە ژیان نەماون و هیچ بەڵگەیەکیش لەبەر دەست نین کە بیرەوەرییەکانم پشتڕاستبکاتەوە، بۆیە، ڕەنگە بیربکەنەوە و بڵێین ئەو کابرایە چی بە مێشك داهاتبێت نووسیویەتی، بەڵام دەمەوێ دڵنیابن هیچ شتێکم نەنووسیتەوە گەر ڕووینەدابێ، ڕەنگە، گێڕانەوەکانم، کەم و کووڕیشی تێدابێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە زیادەڕۆیی تێدا نییە.

## شێخ مەعشووق ئەفەندی

شێخ مەعشووق، کوڕی شێخ مەحسووم ئەفەندییە، لە ماڵباتی شێخەکانی نۆرشینن، شێخ ئەحمەدی خیزان، باوکی شێخ مەحسوومە، کە خەلیفەی ئەو ماڵباتەیە. شێخ ئەحمەد و کوڕەکانی، شێخ مەحسووم و شێخ عەلائەدین و شێخ عزەدین، ناوبانگێکی زۆریان لە کوردستان هەیە، بە تایبەتی لە ناوچەی سنووری نێوان سووریا و تورکیا. لەو بارەیەوە، چیرۆکێکی

ناواش دەگێڕنەوە: "لە کاتی شۆڕشی مەلا مستەفا بارزانی، شێخ مەحسوومیان بردبووە شام و لەوێ ناچاری دەکەن لە ڕادیۆ دژی بارزانی قسەبکات، بەڵام شێخ دەڵێ: هەردوو لا موسوڵمانن، ناشزانم کامە لایەن لەسەر حەقە و کامەش ناحەقە، با لێکۆڵینەوەکانم بسەلمێنم، ئەوسا بەپێی یاسای ئیسلامی لایەنی ناحەق ڕادەگەیەنم. لەبەر ئەوەی سووریای عەرەب زانیویەتی عێراق ناحەقن، بۆیە بابەتەکەیان ئاوا داخستووە و وازیان لە شێخ هێناوە".

ساڵی ١٩٥٨ لە دیاربەکر، ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد)م بڵاودەکردەوە، ڕۆژنامەکەمان بیووە دەنگی هەموو ناوچە کوردییەکان. کاتێك شێخ مەحسووم کۆچی دوایی کرد، شێخ مەعشووق چووە سووریا تا لە شوێنی شێخ عەلائەدین خەلیفەیەك دانێت. ئەو پەڕینەوەی شێخ مەعشووق بە هاوکاری و پاڵپشتیی پارێزگاری موش و بەدلیس و سیرت و دیاربەکر و مێردین بووە، چونکە خۆی و پیاوەکانی لە نوسەیبینەوە پەڕینەوە ناو سووریا. شیاوی گوتنە، ئەو خێزانە لەلایەن ڕووناکبیرانی کوردەوە قبووڵنەکراو بوون، بەو پێیەی ئەو ماڵباتە، بەبەراورد لەگەڵ شێخەکانی دیکە، هیچیان نەکردبوو. چونکە دەزانین شێخ سەعید شۆڕشی بەرپا کرد و شۆڕەشەکانی دیکەی شێخەکانی کوردستانیش هەموومان ئاگاداری وردەکاریانین. بۆیە، ئەوەی بەسەر ئەو شێخانەدا هاتبوو، بەسەر ئەوانەدا نەهاتبوو و لەلایەن دەوڵەتیشەوە هیچیان لەگەڵ نەکرابوو، ئیدی ئەوانیش بە هەمان چاوی شێخ سەیدا و شێخ سەلیم لە جزیرێ لێیان دەڕواندرا. دوای پەڕینەوەی شێخ بۆ سووریا ئەوسا منیش ئەو هاوکاری و پاڵپشتە فەرمییەم لە وتارێکمدا خستە بەر ڕەخنەی قەڵەمەکەم، بۆیە موفتی و مەلایەکانی سەر بە شێخ مەعشووق دژی من

پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە من کۆمۆنیست و کافرم.

ماوەیەك دواتر، شێخ مەعشووق لە سووریاوە گەڕایەوە دیاربەکر، ئەو ڕۆژە میوانی فرنی چییەکی دەوڵەمەندی موریدی خۆی بوو، ماڵی موریدەکەی کۆشکێکی شاهانەی جوانی بە بەرد نەقشێندراوی ناوداری دیاربەکر بوو، تاهیر بوداکی کلاوچیش موریدی شێخ بوو، بۆیە ئێوارەیەك لەگەڵ یەکێك لە بەردەستەکانی هاتنە لامان. کە هاتن ئێمە سەرقاڵی دروستکردنی کۆگای دەرمانخانەی (شارك ئەجزا) بووین لەگەڵ یوسف ئەزیزی ئۆغلوو. تاهیر ئاغا بەئەدەبەوە هاتە لام و گوتی: "کاك مووسا حەزرەتی شێخ مەعشووق دەیەوێ بتبینێت و دەیەوێ بچنە لای جەنابی"، تێگەیشتم دوای گەڕانەوەی لە سووریا هەموو شتێکیان تێگەیاندووە، بۆیە گوتمە تاهیر ئاغای: "کافر و کۆمێنیستێکی وەك من چ کارێکی هەیە لای شێخ مەعشووق، چۆن دەبێ کەسێکی وەك من ئیسراحەتی ئەو کەسە پیرۆزە تێکبدا، بۆیە بڕۆ بڵێ مووسا نایەت". سەروبەندی هەڵبژاردن بوو، کاك یوسف بە نارەحەتییەوە چەندی گوتی بڕۆ، بەڵام نەڕۆیشتم. تاهیر ئاغا دوای یەك دوو دەمژمێر دیسان هاتەوە: "بەڕێزم جەنابی حەزرەتی شێخ دەڵێ گەر ڕێگا بدەن من سەردانی دەکەم". بەڵام دیسان ڕەتم کردەوە، بەڵام کاك یوسف زۆر پەست بوو، ئەوسا نەخۆشییەکی گرانی شەکریشی هەبوو، بۆیە نەمویست لەوە زیاتر بێتاقەتی بکەم، گوتم کێشە نییە، با بەیانی دەمژمێر ١٠ کەرەمکەن.

ڕۆژی دواتر، ڕێك لە کاتی دیاریکراو، جەنابی شێخ لەگەڵ حەفت هەشت موریدی هاتنە کۆگاکە. من و کاك یوسف پێشوازیمان لێ کردن. دانیشتین و چامان پێشکەش کردن. من دەمویست دەفتەری ڕووداوەکان نەکەمەوە، بەڵام ئەو بابەتەکەی

کردەوە و گوتی: "کاك عەنتەر، باوەڕ بکەن ئێمە بەردەوام نزا بۆ جەنابت و ڕێبازەکەشت دەکەین، کاتێك باوکم لە ئیستانبووڵ لای خەزوورت مابۆوە، ئێمە دەزانین ئێوە چەند بەدەمیەوە چووبوون، بۆیە، هەرگیز ئەوە لە بیر ناکەین، بە شێوەیەك ئەو کڵاوە چندراوەی جەنابتان کردبووتانە دیاریی بۆ باوکم، ئێمە تا ئێستا دەیپارێزین، زۆر کاتیش لە تەکیەکەمان کاتێك ڕۆژنامەکەتان لە دەستی فەقێکانمان دەبینین، بێ دەنگیی لێدەکەین و لێیان توورە نابم، بە پێچەوانەوە هانیشیان دەدەین، بەڵام ئێمەش زۆر دڵتەنگ بووین کاتێك جەنابت بە پێش گوندەکەی ئێمە تێپەڕی، بەڵام سەرێکت لێ نەداین"[1].

منیش ئەو چەند قسەیەم بە جەنابیان گوت: "یا شێخ من چۆن بێمە لای ئێوە؟ ئەی گەر ئەو کاتەی هاتبام، ئاتیلای بەڕێوەبەری ئاسایشی میللیی دیاربەکر لەوێبا؟". کە ناوی ئاتێلام هێنا، شێخ باسی یەکدی ناسینی خۆی لەگەڵ ئەتیلا بەم شێوەیە گێڕاوە: "بەڕێزم من دوو ساڵ پێش ئێستا، هاتبوومە دیاربەکر، خەلیل ئەفەندی موفتی بۆ نانی ئێوارە داوەتی کردبووم، کە چووم بینیم ئەتیلاش داوەت کراوە، لەوێ بەبێ ویستی خۆم لەگەڵ ئەو یەکدیمان ناسی، ئیدی لەو ڕۆژەوە یەخەمان لەیەکدی نابێتەوە، خەڵکیش وا دەزانن، ئێمە پیاوی ئەوین". بەو شێوەیە گفتوگۆکانمان بەردەوام بوو، لە کاتی ڕۆیشتن بە پێداگرییەوە داوای لێ کردم منیش سەردانی بکەم. منیش بە نابەدڵیەوە بەسەری زمان گوتم ئینشاڵا، بەڵام دکتۆر یوسف هاتە نێوانمان و گوتی: "زۆرباشە شێخم زۆرباشە دێ ئینشاڵا"، منیش ناچار

---

[1] گوندی نوورین لەسەر ڕێگای نێوان موش و بەدلیسە، لەکەنار ڕێگا.

بووم بڵێم باشە ئینشاڵا. دوای یەك دوو دەمژمێر هەستام و چوومە زیارەتی.

هەیوانەکەی ماڵی جەنابی فرنیچی تژی مرۆڤ بوو، هەمووی لەسەر چۆك وەك کێڵی قەبر لە پاڵ یەك ڕیز ببوون، مەلا و موفتییەکانی دژیشم لەوێ دانیشتبوون، ئەوانیش وەك خەڵکەکەی دیکە لە پاڵ قاچەکانی شێخ خۆیان گرمۆڵە کردبوو، کاتێك شێخ مەعشووق منی بینی، تا سەر پلیکانەکان بەرەوپیرم هات، دەستی گرتم و ماچی کردم، لە دیوەخانیش لەتەك خۆی دانیشاندم، دژ بەرەکانم سەریان سوورمابوو، کەمێك دوای دانیشتنم، بە تایبەت بۆ من و یا شێخ قاوە و چا هات. ئێمەش بە دەنگێکی بەرز و کەیفێکی خۆشەوە باسی مێژووی ئیسلام و ئەدەبیاتەکەیمان دەکرد. مەلا بانگی عەسری دا، شێخ داوای لێبووردنی لێ کردم و گوتی: "کاك مووسا گفتوگۆ لەگەڵتان زۆر شیرینە، بەڵام وەك دەڵێن کاتی نوێژە". منیش گوتم نا نا بەرێزم، منیش دەستونوێژم هەیە و نوێژەکەم دەکەم. یا شێخ بەو قسەیەم دڵخۆشبوو، بۆیە لە ڕیزی پێشەوە بۆ نوێژکردن شوێنی کردمەوە. دوای سەلام دانەوە، دیسان ڕووی لە من کردەوە و گوتی: "ماشەڵا ئیشێکی دیکەشمان هەیە"، منیش گوتم: "خوتبەیە؟" شێخیش بە بەڵێ وەڵامی دامەوە. لەبەر ئەوەی شارەزای ڕێبازی نەقشبەندی بووم، بۆیە گوتم: "منیش دەمەوێ بێمە خوتبەکەتانەوە"، بەمە جارێکی دیکەش یا شێخ زۆر دڵخۆش بۆوە. کە خوتبەشمان بە هەموو ئەحکامەکانەوە تەواو کرد، موفتی دەمارگیر و مەلاکان زیاتر کەوتنە دڵەراوکێ، دیسان سینییەك میوەی شاهانەی تایبەت بۆ من و شێخ هات، ئێمەش بەیەکەوە میوەکانمان دەخوارد و قسە و دەمەتەقێمان دەکرد. من لەوێ زۆر نەدەمامەوە، بەڵام لە ڕقی ئەو

دەمارگیرانەی ئەویێ دانیشتنەکەم درێژکردەوە. ئیدی کات ببووە ئێوارە، بۆیە لە کاتی ڕۆیشتن شێخ مەعشووق لەگەڵ چەندان موریدی تا بەر دەرگا لەگەڵم هات و منی بەرێکرد و نزای بۆ کردم. دوای ئەو دانیشتنە تا چەندان ساڵی دیکە گوێم لەوە نەبۆوە کە دمارگیرەکانی ئەو ڕۆژەی لەلای شێخ دانیشتبوون پاشملە قسەم لەسەر بکەنەوە. بە پێچەوانەوە هەندێکیان لێشم نزیکبوونەوە. دوای ماوەیەکی هەواڵم زانی، شێخ مەعشووق، نەخۆشی دڵی هەیە و لە نەخۆشخانەی فێرکاریی دیاربەکر خەوێندراوە. هەستام و چوومە سەردانی، زۆر دڵخۆش بوو، نەیدەهێشت بڕۆم، دیاربوو ماڵئاوایی دواجاری بوو، چونکە ماوەیەکی کورت دوای ئەو دیدارە کۆچی دوایی کرد، ئەویش بەقەد کردەوەکانی خوا لێی خۆشبێت.

## تەوفیق دەمیرئۆغڵوو

خەڵکی وانە. برازای شێخ عەبدولحەکیمی نەوەی سەید تەهایە. لەناو ماڵباتەکەیان بە مامە تەوفیق دەناسرێت. لە پاڵ ئەوەی شارەزایەکی قووڵی مەدرەسەی ئایینی بوو، هەمان کات ئابووری ناسێکی لێهاتووش بوو؛ چەندان ساڵ بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە پۆستی بەڕێوەبەرایەتیی باج و سەرانەی ئیستانبوولی بەڕێوەبردووە. کەسێکی مێرانە و چاو نەترس و نوکتەچی بوو. لە پاڵ هەموو ئەمانەش شارەزایەکی چاکی وێژەی کوردی بوو. کوڕی پووری عەبدولڕەحیم زاپسووی خەزوورم بوو. ئەوکات تازە خەریك بوو دەبوومە دەستگیراندار، بۆیە بەرامبەر کاك عەبدولڕەحیم کەسێکی شەرمن بووم، لەشەرمان هەستم دەکرد شتێکی خراپ لەگەڵ کچەکەی

دەکەم، چونکە ئەوەندەم شەرم لێدەکرد، ئیدی بەو جۆرە لە ماڵی کاك عەبدولڕەحیم لەگەڵ مامە تەوفیق یەکدیمان ناسی. پێشتر ناوی جەنابیانم بیستبوو، بەڵام نەمدەزانی کەسێکی باڵابەرز و سەرو کاپێلك گەورەیە. مامە تەوفیق کە منی بینی، لە خەزوورمی پرسی: "ئەو کورە نووسەیبینییەی دەبێتە زاواتان ئەوە خۆیەتی؟" کاك عەبدولڕەحیم گوتی: "بەڵێ"، ئەویش گوتی: "لەوە گەڕێ کە لە ماڵ و ناوچەی خۆمان دەربەدەر بووین وەك پەنابەر، بەڵام چاوەڕێم نەدەکرد، ڕۆژێك ئێزیدییەك ببێتە زاوامان". ساڵی ١٩١٦ کاك تەوفیق و خێزانەکەی سەرەتا ڕاگوێزرابوونە لای ئێمە لە نوسەیبین، دواتریش بۆ شنگال کە نزیك ناوچەی ئێمەیە. شنگال هەمووی ئێزیدییە و دەوروبەری نوسەیبینیش هەندێك ئێزیدیی لێ هەبوو، ئەویش لەوێوە دەیزانی. دوای ئەو قسەیەی مامە تەوفیق من سووربوومەوە و تێکچووم. کاك عەبدولڕەحیم هەستی پێ کرد و یەکسەر گوتی: "نا تەوفیق مووسا ئێزیدی نییە، لە عەشیرەتی تەمیکانە و موسوڵمانە". ئیدی ئەو ڕۆژە ناخۆش تێپەڕی، چونکە من نەمدەزانی کاك تەوفیق کەسێکی چۆنە، دوایی کە ناسیم، ئیدی شیعری فەقێی تەیران و دیوانی جزیری و چەندان شاعیری دیکەی بۆ دەخوێندمەوە.

مامە تەوفیق، لە سەردەمی عەدنان مەندەرەس، ئەستێرەی بەختی گەشابۆوە و ناودار ببوو، چونکە هەموو ساڵێك وەزیری دارایی تورکیا حەسەن پۆلاتکان بۆ دارشتنەوەی بوودجەی ساڵانە سوودی زۆری لە کاك تەوفیق وەردەگرت. ساڵێك بۆ هەمان مەبەست چوو بووە ئەنقەرە، لەبەر ئەوەی زوو زووش دەهاتە لامان، بۆیە کاتێك دیار نەدەما مەراقمان دەکرد، ڕۆژێك لە پڕ بە دیار کەوت و هاتەوە. ئەوجارە من سەرم خستە سەری و بە کوردی پێم گوت: "ئۆۆ مامە خوا نەیبڕێ ئیدی پۆستت

بەرز بوەتەوە و بـوودجەی دەوڵەت دادەڕێـژییەوە"، ئەویـش ئـاوا وەڵامـی دامەوە: "نـا کـوڕم، بەڵام بـا چیرۆکێکـی خۆمـت بـۆ بگێڕمەوە: کە بچووك بووم سەید تەها ئەفەندیی بـاپیرم، قورئـانی فێردەکردم، ئەو دەیگوت (تەببەت)؛ منیش دەمگوت (بەددەت)، چەند جارێك ئاوا دووبارەم کردەوە، بـۆیە بـاپیرم تـووڕە بـوو و پێی گوتم: تەوفیـق سـەیرکە لاوۆ، لەوەیە ڕۆژێـك بێـت پـایەت بەرز بێتەوە، بەڵام باوەڕ بە پۆستەکەت مەکە، کە پایەت ئاوا بڵند بووە، چونکە لەبیر نەکەی ئەوە پایە بەرزی هاتۆتە خـوارێ و لە ئاسـتی قاچەکانتـدایە. ئێسـتاش ئەو قسـەیەی بـاپیرم کە ٦٠ سـاڵ پێش ئێستا پێی گوتم هاتۆتە جێ؛ چونکە من بەرز نەبـوومەتەوە، بەڵکو دەوڵەتی تورکیا ئاستی نزم بـۆتەوە و ناچـاری مـن بـووە". لەگەڵ مـامە تەوفیـق و خێـزانەکەی زۆر یـادەوەریم هەیە، بەڵام بەوەندە کۆتایی پێدەهێنم، بە حورمەتیشەوە یادیان دەکەمەوە.

### ساڵح موفتی

پێشـتر گوتبـووم، کە سـاڵی ١٩٥٨ لە دیـاربەکر ڕۆژنـامەی (ئیلەری یـوردم) دەردەکـرد. ئەو ڕۆژنـامەیە نەك تەنیـا لە نـاوچە کوردییەکان، بەڵکو لە تەواوی تورکیـا ببـووە باسـی سـەر زاری خەڵـك. مـن بە زگـورتی چووبـوومە دیـاربەکر و لە ژوورێکـی میوانخانەیەك دەمامەوە. ڕۆژێك دوو زاتی ڕدێن درێژ هـاتنە لام، کە یەکدیمان ناسی، یەکێکیان ساڵح ئەفەندیی موفتی موش بوو، ئەوی دیکەش شێخێکی خەڵکی مـوتکی بـوو، بە داخەوە نـاوی شێخەکەم بیر نەماوە. دوای چاك و چۆنی، ساڵح ئەفەندی گوتی: "بـرا ئەو ئەرکە قورسـە بە تەنیـا و بە زگورتیـاتی لە ئەسـتۆ دەگری؟ ئەی ئێمە شتێك نییە بیکەین؟". ئەوسـا ماکـاریۆس بە

شێوەیەکی چالاك سەرکردایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللیی ڕۆمی لە قوبرس دەکرد، بۆیە، بە تەلمیحی ئەوە گوتم: "بەرێزینە نازانم چیتان پێبڵێم، ئێوە زوو زوو دەستونوێژ هەڵدەگرن، مەگەر هەرکاتێ، دەست بە ڕدێنتان دا دەهێنن، ماکاریۆسی بهێننەوە یادی خۆتان". پێکەنین و دەستمان بە چای خواردنەوە کرد، دواتر هەستان و ڕۆیشتن.

لەگەڵ پارێزگاری موش یەکدیمان دەناسی، بۆیە زوو زوو منی داوەتی شارەکەی دەکرد، منیش ڕۆژێك هەستام و چوومە لای، کە گەیشتم داوای لێ کردم لە ماڵی پارێزگار بمێنمەوە، بەڵام من ڕەتمکردەوە، بۆیە پارێزگار فەرمانی کرد لە لە باشترین و جوانترین میوانخانەی موش شوێنێك بۆ من بدۆزنەوە. بۆ بەیانی چوومە باڵەخانەی پارێزگا و دانیشتین و دواتر گوتم: "دەمەوێ سەردانی موفتییە زاناکەتان بکەم، ئاوام پێ گوت وەك ئەوەی کە نایناسم" پارێزگاریش گوتی: "قەیناکە زانایە، بەڵام زۆر بێ تەبیعاتە، هەر کەسێك بچێتە لای لەبەردەم دەرگا ناچاری دەکات پێڵاوەکانی لە پێ بکاتەوە". منیش گوتم: "جا چییە، وا دانێین دەچنە مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد، ئێمەش پێڵاوەکانمان لە پێ دەکەینەوە". پارێزگاریش گوتی: "مادام وایە منیش دێم". بەیەکەوە چووین و پێڵاوەکانمان لە پێ کردەوە و چووینە ژوورەوە، موفتی کە منی لە تەك پارێزگار بینی، واقی ورما و گوتی: "ئەوە چییە؟" پارێزگار بەیەکدی ناساندین، بە موفتیشی گوت کە ڕۆژنامەنووسێکی دیاربەکرە و زۆرم کەیف بە ئازایەتییەکەی دێ، ئەویش زۆر حەزی کردووە کە تۆ ببینێت. دانیشتین و هەندێك باسی ڕۆژەڤمان کرد، بەڵام خەڵك ئەوەندە دەهاتن تا کیتابی فەرمی لای پارێزگار واژوو بکەن، ئیدی بە تامی دەو تێر قسەمان نەکرد، لە پڕ پارێزگار گوتی:

"مووسا گیان لێرە پشوو نییە، هەستە با بڕۆین"، بەڵام گوتم دەتوانن جەنابیان بڕۆن، بەڵام من دەمەوێت تۆزێکی دیکە لای موفتی بمێنمەوە، پارێزگاریش ڕازی بوو، بۆیە ئەو ڕۆیشت، دوای ڕۆیشتنی پارێزگار موفتی دەرگەوانەکەی بانگ کرد و ئاگاداری کردەوە کە کەس نەیەتە ژوورەوە. دیسان دەستمان بە گفتوگۆ کردەوە و موفتی بە کوردی گوتی: "کورە مووسا تۆ یاریت بە ئیمانمان کرد، چونکە بەر لەوەی بێینە لات، هەر کاتێك دەستمان بە ڕیشمان دادەهێنا، حەزرەتی محەمەدمان بەبیردەهاتەوە، بەڵام دوای وریاکردنەوەکەی تۆ، ئیدی کە دەست بە ڕدێنمان دادەهێنین، ماکاریۆسی کافرمان بەبیر دێتەوە". دیاربوو شێخەکەی برادەریشی بە تێکەڵەیەکی لە ڕاستی و حەنەك هەمان شتی بە موفتی گوتبوو. زۆر پێکەنین، ئیدی ماڵاواییمان لە یەك کرد و من ڕۆیشتم.

دوای ماوەیەکی زۆر لە ساڵی ١٩٧٢، دوو داوام لەسەر کرابۆوە، یەکیان لە دیاربەکر، DDKO[1] و ئەوەی دیکەشیان لە جزیرێ IKDP (پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق). لەو دادگاییکردنەدا جگە لە من و شەرەفەتین ئەلچی هیچ کەسێکی دیکە تورکی نەدەزانی. ئەو کات ساڵح ئەفەندیی موفتی دیاربەکر وەك وەرگێڕ قبوولکرابوو. لە کاتی وەرگێڕاندا هەستم کرد ساڵح ئەفەندی موفتی، ئیفادەی ئەو کوردە هەژار و

---

[1] کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی کولتووری ڕۆژهەلات، لە ساڵی ١٩٦٩ لەناو قوتابیانی کورد لە باکووری کوردستان و تورکیا لە ئیستانبوڵ دامەزرێندرا، چونکە تا ئەوسا کورد لەناو پارتە کۆمۆنیستیە تورکیەکان کار و چالاکیی سیاسییان دەکرد، بەڵام دوای دامەزراندنی کۆمەڵەکە ئیدی کورد لە ناو کۆمەڵەیەکی تایبەت بە خۆی سیاسەتی دەکرد. کۆمەڵەکە دوای کودەتای سەربازیی ١٩٧١ چالاکیەکانی قەدەغەکرا. (وەرگێڕ).

نەدارانەی هەمـــووی ڕاســـت دەکـــردەوە و دواتـــر دەیکـــردە ئیفـادەیەکی بێکێشـە و ئینجـا بە تـورکی بە دادوەری دەگـوت. هەرگیز لە بیرمناچێ، برادەرێکمان هەبوو ناوی محەمەد بوو، ئەو نەخۆشـیی سـیلی هەبـوو. مـحەمەد سـەرجەم داواکارییەکـانی ڕەتـــدەکراوە بـــۆ داوای ئـــازادکردنی، بەڵام لە یەکێـــك لە دانیشتنەکاندا محەمەد هەستاوە و بە کوردی، قسەی ناشـرینی بە دەوڵەت و حکـوومەت و دادگـا گـوت، دادوەریـش بە مـوفتی گوت: "مامۆستا ئەوە چی دەڵێ؟" سـاڵح ئەفەنـدییش بەو شـێوەیە وەریگێــڕا: "گەورەم مــن بێتــاوانم، دەبیــنن کە نەخۆشــییەکی گرانیشـم هەیە، خـاوەنی مـاڵ و منـداڵم، داوا لە دادگـای پـایە بەرزتـان دەکەم، مـن ئـازاد بـکەن، هەر نەبـێ بـا لە نێـو مـاڵ و منداڵەکەم بمرم". ئەوجا دادگـا بڕیـاری ئـازادکردنی مـحەمەدی دەرکرد. پاشـان ئـێمەش ئـازاد کـراین، دوای چـوار پێنج سـاڵ، چـوومە سـەردانی سـاڵح ئەفەنـدی، بە حەنەکەوە پـێم گـوت: "مامۆســتا جەنابـت وەرگێڕێکــی ســوێندخواردوو بــووی، چـۆن شتێکی ئـاوات گـوت؟" ئەویـش بەو چیـرۆکەی شـێخ سـەعدی شیرازی وەڵامی دامەوە:

"لە نێوان شای ئیران و حکـوومەتی هیندسـتان جەنـگ بەرپـا دەبێــت، شــای ئێــران ســەردەکەوێ و حوکمــداری هیندســتان دەسـتگیر دەکـات. شـای ئیـران بە زمـانێکی سەرزنشـتکارانە بە حوکمداری هیندستان دەڵێ: "بۆ لە سەرەتاوە بیـرت لە ڕۆژێکـی وەك ئەوڕۆ نەکردەوە و خـۆت خسـتە نـاو جەنگێکـی ئـاواوە؟". کاتێـك قسـەکانی شـا بـۆ حوکمـداری هیندسـتان وەردەگێـڕن، حوکمداری هیندستان دەڵێ: "بێ ئەدەبی مەکە، ئێمە جەنگاین لە جەنگیش هەر یەکێکمان سەردەکەوتین، من لەو جەنگە شکام و ئێستا لای تۆ دیلم، بۆیە پێویست بەو زمانە زبـرە ناکـات، ئیـدی

چیت پێدەکرێت درێغی لێ مەکە". ئینجا حوکمدار بەو دوو وەرگێڕەی نێوان خۆیان دەڵێ کە قسەکانی ئەو بۆ شا وەربگێڕن. وەرگێڕی یەکەم بەو شێوەیە قسەکانی حوکمداری هیندستان بۆ شا وەردەگێڕێت: "بەڕێزم من دەمزانی لە ئاستی ئێوەدا نیم، بەڵام ئەو غایەن و خۆویستانەی دەوروبەرم، منیان بۆ کارێکی لەو شێوەیە هاندا، بۆیە منیش بە کارێکی لە ئاستی خۆم گەورەتر هەستام". شای ئێران زۆر خۆشیی لەو قسانە دێت و حوکمداری هیندستان دەبوورێت. لەو سەر و بەندە وەرگێڕەکەی دیکە بەرگە ناگرێ و دەست بە قسە دەکا و دەڵێ: "گەورەم حوکمداری هیندستان ئاوای نەگوت، بەڵکو قسەی ناشرین و جوێنی بە ئێوەدا". کە شا گوێی لە قسەی وەرگێڕی دووەم دەبێ، بە توندی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: "جا درۆی ئەو لە ڕاستی تۆ زۆر بە خێرترە، چونکە ئەو گیانێك ڕزگار دەکات، بەڵام تۆ ڕێگا بۆ کردنی تاوانێك خۆش دەکەی".

دوای گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە، ساڵح ئەفەندی بەم شێوەیە درێژەی بە قسەکانی دا: "بۆیە وەرگێڕانی ئەو ڕۆژەی دادگام وەك ئەو چیرۆکە بوو، دەمزانی بەرامبەر سوێندەکەم سەرڕاست نابم، بەڵام ئەو چاکەیەی کردم، بە زیادەوە بایی ئەو ناڕاستییەم دەکات کە بەرامبەر دادوەر کردم". ساڵێك دواتر کە چوومەوە دیار بەکر، پرسیاری جەنابی موفتیم کرد، بەڵام بە دڵتەنگییەکی زۆرەوە زانیم کە شەش مانگ بوو کۆچی دوایی کردبوو.

## سەلیم سەڤانی شێخی هەکاری

چەندان ساڵ، لە ناوچەکەی خۆیان، هەم سەرۆکایەتیی تەریقەتی نەقشبەندیی کرد، هەمیش لە ژێرەوە جاشایەتی نهێنیی پشتگوێ نەخست بۆ دەوڵەت. هەموو شتێکی دەکرد بۆ ئەوەی خەڵکی هەکاری هیچ کاریگەرییەکیان نەبێ، بۆیە، بەردەوام لای ئەتاتورك و عیسمەت پاشا خۆشەویست بوو. کەریم ئاغا زەیدانیش پیاوی ئەو بوو، بۆیە هەردووکیان، تا مردنیان بە گیان و ماڵ خزمەتی جەهەپەیان[1] کرد. شێخ سەلیم بەردەوام ئاوا ئامۆژگاریی مورییدەکانی دەکرد: "ماوەی سەربازیتان بە ڕێکوپێکی بکەن، قاچاغچیاتی مەکەن، بە پاك و دروستی مانەوەتان بۆ کۆماری تورکیا، واتای بەهێزی باوەڕتانە، گەر سەرۆکی وڵاتتان موسوڵمان بوو، جیاوازیی نییە ئەو موسوڵمانە تورك بێ یان عەرەب، یان عەجەم"، بەڵام قەت نەیدەگوت گەر کورد بێت. چونکە ئەوسا ڕەنگە کوردیش چاوی ببێتەوە و لەوەیە ئەوانیش بیانەوێت ببنە سەرۆککۆمار و ئەو بیرۆکەیان لا چەکەرە بکات. بۆیە، بەرامبەر ئینکاری کردن لە ئایین و نەتەوەکەی، ساڵی ١٩٤٦ مەدالیای پارتەکەی ئەتاتورکی لە سینگ درا و کرایە پەرلەمانتاری جەهەپە لەسەر بازێڕی هەکاری.

دوای سوێند خواردنە پڕ کەموکورتییەکەی لە پەرلەمانی تورکیا، هاتە ئیستانبوڵ، لەبەر ئەوەی دەیزانی خەزوورم

---

[1] CHP پارتی گەلی کۆماری، یەکەمین پارتی کۆماری تورکیایە، ساڵی ١٩٢٣ لەلایەن مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە دامەزرێندرا. (وەرگێڕ).

شارەزایەکی ئایینە و هەمان کات برازای ئارڤاسیانیشە، بۆیە دەیناسی و زۆری خۆش دەویست. بۆ هاتنەکەی، خەزوورم، سەرۆکی دیوانی ژمێریاری فارووق ئارڤاس ئیشق و تەوفیق دەمیری سەرۆکی ژمێریاری ئیستانبووڵ و شێخ شەفیق ئارڤاسیشی بۆ نان خواردنەکە داوەت کرد. بەڵام لەبەر ئەوەی ماڵی خەزوورم بچووك بوو بۆ داوەتێکی ئاوا قەرەباڵغ، داوای لێ کردم ئێمە ئامادەکارییەکان لە ماڵی بکرێن. منیش لە بەشە ناوخۆییەکەمان کابانێك و کارمەندێکی چێشتخانەکەم هێنا و داوەتێکی جوانم بۆیان ئامادەکرد. دوای نان خواردن دەستمان بە چا خواردنەوە و گفتوگۆ کرد، من هەم گوێم لەوان گرتبوو، هەمیش خزمەتم دەکردن. ئەوسا، تازە کۆماری کوردستان لە مەهاباد ڕووخابوو، بارزانی و ٦٠٠ سەربازی، کە دواتر پێیان گوتن پێشمەرگە، بە سنووری نێوان عێراق و ئێران و تورکیا تێپەڕین و چووبوونە یەکێتیی سۆڤیەت. لەبەر ئەوەی تازە لە هەکاری هاتبوو، کاك عەبدولڕەحیم ئەو ڕووداوەی لە شێخ پرسی، چونکە لەوە بوو لەسەر ڕووداوەکە شتی تازە بزانێت. شێخ سەلیم لەلایەك تەزبیحەکەی دەژمارد وەك ئەوەی زکر بکات، لە لایەکی دیکەشەوە ئاوا وەڵامی پرسیارەکەی خەزوورمی داوە: "ئەتوو لە مستۆ دەپرسی؟ کاکە ئەو کابرایە ڕێگرە و کوشتنی حەڵاڵە". کە وای گوت وەك ئەوەی تاسێك ئاوی کوڵاوم بەسەردا بکەن، خاتر و ڕێز و خاوەن ماڵیم بیرچۆوە و پێی هەڵشاخام و گوتم: "ئۆو ماشەڵا، دەبینم فتوای کوشتنیش دەردەکەی یا شێخ، بەڵام مەدالیاکەی سەر سینگت و جوبەکەی بەرت نابینیت، بۆیە بە بۆچوونی من ڕێك فتوای کوشتنی تۆ و سەرجەم بەرپرسەکانی جەهەپە حەڵاڵە، نەك بارزانی". ئەو قسانەم هەمووانی بەیەکەوە تووشی سەرسووڕمان

کرد، بۆیە، شێخ لە خەزوورمی پرسی ئەوە کێیە؟ ئەویش گوتی هەم زاوامە، هەمیش خاوەن ماڵ، بۆیە، هەوڵی دا وەك خۆی غایەنانە، بە عەقڵە سووکەکەی من نەرم بکاتەوە، گوتی: "ئا کوڕی خۆم من مەبەستم ئەوە نەبوو، بۆیە وەرە دانیشە و بۆت شیبکەمەوە." بەڵام من زۆر بە توندی داواکەیم ڕەت کردەوە، بەو وەڵامەشم هەموو خواردنەکەم لە قوڕگی کردە ژەهری مار. کە هەستان لە دەرگای چوونە دەرەوە چەندی پێی لەسەر ئەوە داگرت بچمە لای، بەڵام لێی نزیك نەبوومەوە و دۆقەم لەگەڵ نەکرد. ئەوکات، عوبەیدوڵای کوڕی لە ئەنقەرە لە کۆلێژی ماف دەیخوێند، دوای گەڕانەوەی باوکی ڕووداوەکەی نێوانمانی بەشێوەیەکی دیکە بۆ گێڕابۆوە، لەبەر ئەوەی پێشتر لەگەڵ کوڕەکەی یەکدیمان دەناسی، بۆیە دوای ئەوەی لە دەمی منیشەوە گوێی لە بەسەرهاتەکە بوو، مافی بە من دا نەك باوکی. ئێستاش لە ئوسکودار داواکاری گشتیی کۆمارییە، خۆشی شاهیدی ئەو ڕووداوەیە.

## شێخ سەیدا

هەرگیز باوەڕم پێی نەکردووە، بەڵام لە گەنجییەوە گوێم لە کەرامەتەکانی شێخ سەیدای جزیری دەبوو. لای من ڕێبازێکی پۆلینکردن هەیە کە ڕاستییەکەشی هەر ئەوەیە: (ئەو شێخانەی لە سەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە سێدارە نەدران یان ڕانەگوێزران، لە ڕووی ئایینەوە شێخی کلاوچین و لە ژێرەوەش کار بۆ دەوڵەت دەکەن). لە باکووری کوردستان، شێخ سەلیمی هەکاری و شێخەکانی نۆرشین و شێخ سەیدا و هەندێك لە شێخۆکەکانی دیکە، لەناو چوارچێوەی ئەو ڕێبازەدان.

هەر قائیمقام و داواکارێکی گشتی و فەرماندەیەکی ژەندرمە،

کاتێك لە جزیرێ دادەمەزرا، دەمودەست دەبوونە شاهێدی کەرامەتەکانی شێخ سەیدا. بۆ نموونە: داواکاری گشتی دەڵێ: "شێخ شکاتی لێ دەکرا و من دەمویست دەستگیری بکەم؛ بەڵام ئەو پێنووسەی ڕۆژانە فەرمانی دەستگیرکردنی چەندان کەسی دیکەم پێ دەنووسی، لە پڕ نەیدەنووسی، دەچوومە سەر ئامێری چاپەکە، بەڵام ئەویش نەیدەنووسی". لەلایەکی دیکە ئەفسەرێك دەیگوت: "جارێك بە تۆمەتی ئەوەی ئاسایشی ناوچەکە تێکدەدات چووم شێخ سەیدا دەستگیر بکەم، پێش ئەوەی بگەمە لای ماڵیان هەردوو چاوم توانای سۆماییان داهات و کوێرە بووم. وازم لێ هێنا و گەڕامەوە، ئینجا دوای ماوەیەك چاوەکانم چاك بوونەوە". لەولاتر قایمقام دەیگوت: "هەواڵی ئەوەم پێگەیشت کە شێخ سەیدا لە گەڵ گرووپێکی گەورەی موریدەکانی سەرقاڵی زیکرکردنن، لەسەر ئەوە بانگهێشتی قائیمقامیەتم کرد، کە هاتە ژوورەوە ویستم هەستمەوە سەر پێ، بەڵام نەمتوانی چونکە هەردوو چۆکم شل بوو، بە دانیشتنەوە دەستەکانیم کوشی، کەچی دەستم وەك ئەوەی لەناو ئاگر بێت سووتا و ئەستوور بوو، چەندین دەرمانم بەکارهێنا، بەڵام، تا شێخ سەیدا فووی بە دەستەکانمدا نەکرد، چاك نەبۆوە".

خوتبەکانی شێخ سەیداش وەك خوتبەکانی شێخ سەلیم سەمەرە بوون، کەم تا زۆریش خوتبەکانیان لەو چوارچێوەیە دەسووڕایەوە: "فەرمانگوزاری حکوومەتمان بن، گەر ماڵ و منداڵیشتان لە برسان مرد قاچاغچیاتی مەکەن، خوا قسمەتی ئەوان هەر دەنێرێت. ماوەی سەربازیی خۆتان بکەن، چونکە سەرۆکی وڵات دوای ئەوەی مووسڵمان بوو، ئیدی جیاوازی نییە لە چ نەتەوەیەکە، بۆیە لە فەرمانی دەرمەچن".

ساڵی ١٩٦٥،، لە سنووری پارێزگای مێردین، بوومە بەرپرسێری

بێلایەن بۆ پەرلەمان. لێرە نا، بەڵام لە شوێنی خۆی بە درێژی باسی ئەو بابەتەش دەکەم، بەڵام مادەم نۆرەی هاتووە دەمەوێ یادەوەرییەکی خۆمتان لەگەڵ شێخ سەیدا بۆ بگێڕمەوە، چونکە ئاشکرایە بۆ خۆ ناساندن و کۆکردنەوەی دەنگ سەردانی تەواوی قەزا و ناحیە و لادێکانی مێردینمان دەکرد، بەڵام دەچووینە هەر شوێنێك دەیانگوت چوویە لای شێخ سەیدا؟ کەچی من نەمدەویست بچمە لای ئەو کابرایە، دواجار ناچار بووم ئەو کارە بکەم. شێخ سەیدا لە شوێنێکی بەرزی دووری جزیرێ دەماوە، سەیری ئەو تەڵەکەبازییەی بکەن، هەموو ڕۆژێك بە هەزاران کەس دەچوونە زیارەتی، شێخیش بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە، ئۆتۆبووسێکی شەق و شڕی کڕیبوو، بەو ئۆتۆبووسەش خەڵکی لە نێوان جزیرێ و شوێنی مانەوەی بە پارە دەگواستەوە. هەستمکرد شێخ جگە لە کۆکردنەوەی زەکات، کاری بازرگانیش دەکات، چونکە لە میدیات لای زیوفرۆشێکی کریستان بە گرانی کیلۆیەك لە زیوی بێ عەیار چەندان بازنەی بچووکی دروستکردبوو، واشی لە خەڵك گەیاندبوو کە ئەوە بازنەکی پیرۆزە، بۆیە ڕۆژانە سەدان دانەی ئاوای لە ڕێگای موریدەکانییەوە بە پێنج لیرە و دە لیرە بە خەڵك دەفرۆشتەوە.

دەمژمێر، ١٠ ی بەیانی گەیشتینە ئەو شوێنەی شێخ لێی دەماوە، خۆی لە شوێنی پشوودانەکەی بوو، دوایین خێزانی، کە پێنجەمین ژنی بوو، تەمەنی چواردە ساڵان بوو، خۆشی تەمەنی نزیکەی ٨٥ ساڵێك دەبوو. بە یەکێك لە سۆفییەکانی هەواڵی گەیشتنمان بۆ نارد دیدەنییەکی کورتی لەگەڵ بکەین، دوای ماوەیەك سۆفی گەڕاوە و پێی ڕاگەیاندین کە شێخ نایەت، بەڵکو لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ دەتوانێ بیانبینێت. خۆم بە ناچاری چووبووم، بۆیە تووڕە بووم و بە برادەرانم گوت هەستن با

بـڕۆین پێویسـت ناکـا ببینـین. چـووینە لای جێیەکەمـان، بەڵام شـۆفێرەکە چەنـدی کـردی نەیتـوانی ئۆتـۆمبێلەکە بخـاتە گەڕ، کەچی ئەوەشیان کردە کەرامەتی یا شێخ. لەو سـەروبەندە، شـێخ فەخرەدین، کە لەکاتی چوونمـان وانەی بە فەقێکـان دەگـوتەوە، ئەوسا وانەکانی تەواو ببوو و هاتە لامان، پێشتر نـاوی یەکـدیمان بیستبوو، بۆیە، کە هات دەستی لە مل کردم و داوای لـێ کـردم ئەڕۆم و چەنـد دەمژمێرێك دانیشـین و گفتوگـۆ بکەیـن، منـیش دڵیم نەشـکاند و گەڕامەوە. شـێخ فەخـرەدین لە ژێـر کەپرێکـی جوان وانەی بە فەقێکان دەگوتەوە، پەرتووکەکانی منیشی لابوو، ئەویش پەرتووکێکی لەسەر لۆژیك بە دیاری پێـدام، کە لە شـام خـۆی کردبـوویە کـوردی و چـاپکرا بـوو، مـحەمەد نـوور، کـە ئەوسـا قوتـابی بـوو لەوێ و دواتـریش شـێخایەتی لە بـاوکی وەرگرت، هات و قاوەی بۆ هێناین، دواتـریش سـینیەك میوەمـان بۆ هات، ئیدی وردە وردە چەنـد دەمژمێرێـك تێپەڕی و بـانگی نیـوەڕۆ درا. هەسـتام و چـووم دەسـتونوێژێکی بەربژێرییـانەم هەڵگرت، ئینجا بەرەو ئەو شوێنە کراوەی نوێژی لێدەکرا، لە پـڕ بووە قیژە و هاوار، لە سەر شانی سۆفییەك مافوورێکی سـەردەمی ئیسـپارتە و لە دوای ئەویـش چەنـد سـۆفییەك بە خوێنـدنەوەی تەکبیر، لە دوای ئەوانیش دوو سـۆفیی چەکـدار هـاتن. لە پـێش جەماعەتی ئەوێنـدەرێ مافوورەکەیـان ڕاخسـت بـۆ ئەوەی شـێخ نوێژی لەسەر بکات، شێخ چـووە سـەر مـافوورەکە و ڕیزەکـانی نوێژکردن ڕاست بوون بۆ ئەوەی دەست بە نـوێژکردن بکرێـت، مـن و شـێخ فەخـرەدین لە ڕیـزی پێشـەوە بـووین، بەڵام دوو چەکـدارەکە لە پشـت شـێخ لای ڕاسـت و چەپـی وەسـتان و چەکەکانیـان ڕوو لە جەمـاعەتی نـوێژکەران کـرد، بەر لەوەی نیەتی نوێژکردن بێنـێ، شـێخ ڕووی لە ئـێمە کـرد و بە کـوردی

گـــوتی: "ئەو میـــوانە تـــوورەم لە کـــوێیە؟" منـــیش گـــوتم: "ئەستەغفیرووڵڵا یـا شـێخ کارەکەمـان بەپەلە بـوو بـۆیە". کە نـوێژ تەواو بوو دیسان شێخ بە کوردی گوتی: "کوڕم مـن تەمەنـم ٩٠ ســاڵە، ئیختیــار و مانــدوومە، لە کەم و کــوڕیم ببــوورە، ئەوە نوێژیشتان کرد، نانیش بخۆن چـونکە ئێـرە وەك مـاڵی باوکتـانە، چەندی دەتانەوێ لێرە بمێننەوە، ئینجا کەی حەزتان کـرد ئەوسـا بڕۆن، ئینشاڵڵا خواش مۆفەقت دەکا". دواتـر بە شـێخ فەخرەدینـی گــوت: "ئەو میوانــانە بــبە بــا نانەکەیــان بخــۆن". لەگەڵ ئەو ماڵئاواییمان لەیەك کرد، دوای نـان خـواردن، شـوێنەکەمان جـێ هێشــت، بەڵام دواتــر لە کــوڕەکەیەوە زانیمــان کە لە گونــدی سەرداهییە شێخ میوانی هەیە. شێخ لە گوندی سەرداهییە بـۆ هەر ژنێکی ماڵێکی جوانی دروستکردبوو، هەر مـاڵێکیش حەوزێکـی بە بەرد نەخشـێندراوی تێـدابوو، لە دیـوی دەرەوە گەر سـەیری ماڵەکانت کردبا هەر بە خانوویەکی ئاسایی لادێ دەچـوو، بەڵام لە ژوورەوە زۆر پێچەوانە بوو. شێخ هەر لەو گونـدە مزگەوتێـك و قوتابخانەیەکی ئـایینی ئەوەنـدە گەورەی هەبـوو، کە ئەمـڕۆ بە ملیاران لیرە دروست نـاکرێ، لە سـەر ڕێگـای هـاتن و چـوونی موریـــدەکانیش بە کەرپـــووچ ڕێگـــای دروســـت کردبـــوو، شوێنێکیش بۆ دانیشتن و کوخێکی بچووکیش بۆ مانەوە، خۆشـی جلوبەرگەکــانی هەمــووی لە قوماشـــی حەریـــری زۆر بـــاش دروستکرابوو، چونکە دەنگۆیەکی ئـاوا لە نـاوچەکە بـڵاو ببـۆوە کە "شێخ سەیدا ئەوەندە لە مـاڵی دونیـایێ دوورەپەرێـزە، نـازانێ جۆری دراوی وڵاتەکەی چییە".

کەچی لە جزیرێ چوار کۆگای گەورەی کەلوپەلی دەوڵەتی هەبوو، یەکێکیان ئالیك و یەکێکیـان ڕۆن و دووەکەی دیـکەش جـۆ و گەنمـی تێـدا بـوو. خـوری و ڕۆن، لە گەڤـاش و ئغـدر،

گەنمیش وەك دەزانین لە ناوچە کوردییەکان و ناوچەی نەنادۆڵەوە دێت، شێخ خەلیفەکەی ئغدری ناوی خەلیفە ئیبراهیم بوو، بە مانایەکی دیکە شێخەکان خەلیفەکانیان جۆرێك لە ئەرکی کۆکردنەوەشیان هەبوو، خەلیفە ئەو زەکاتەی بۆ شێخ کۆی دەکاتەوە، هەر بەناوی شێخیش دەیبەخشێتەوە. تا ئێستاش هەندێك کوردی جاهیل هەن سوێند بەسەری شێخ دەخۆن و دەڵێن بەسەری شێخ سەیدا، بەڵام نازانن ڕووی ڕاستەقینەی شێخ چۆنە. لێرە باسکردنی بەشێك لەو شێخانە لەناو یادەوەرییەکانم بە تێکەڵی لە نێوان شێخە باش و خراپەکان، بۆ ئەوەیە مادەم باسی شێخە باشەکانی کوردم کرد، با هەندێك باسی خراپەکانیشی بکەم، چونکە بۆ بەراوردکردن باشە، وەك دەزانین لە سەرجەم ئایینەکان باش و خراپ لە تەك یەك دادەندرێن، وەك شەیتان و محەمەد، ئەهریمەن و هوورمزیش لە ئایینی زەردەشتی.

### نووری دێرسیمی

دوای ساڵی ١٩٤٥ گەشتی دەرەوەی وڵاتم لێ قەدەغەکرا، لەو ڕۆژەوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، ئەو قەدەغەیەیان لەسەرهەڵنەگیرا، ئەو تورکیایەی گوایە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ جێبەجێ دەکات، تا ساڵی ١٩٥١ چوونەوە ناوچەکەی خۆشمی لێ قەدەغە کردبووم. سەرجەم خێزانەکەم لە سووریا دادەنیشن، منیش، چەند جارێك چوومە لای پارێزگار و گوتم دەمەوێ بچم خێزانەکەم ببینم، بەڵام بە بەهانەی بەرزی پلەی گەرما و پیسی سووریاوە، پێیانگوتم گەر بچمە ئەوێ نەخۆشدەکەوم، بۆیە، مۆڵەتی گەشتکردنیان نەدام.

نەجدەت ئەلدەمی هاوشاریم و وەزیری پێشووی دادی

تورکیا، ئەوکات قائیمقامی نوسەیبین بوو، ڕۆژێك لە قائیمقامیەت دانیشتبووین، قائیمقام و بەڕێوەبەری پۆلیسی قامیشلۆ هاتن، ئەوکات من پەیامنێری ڕۆژنامەی جمهوریەت بووم لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا، لەگەڵ میوانەکان خۆمان بەیەکدی ناساند، کاتێك زانییان ڕۆژنامەنووسم، زۆر مکوڕبوون لەسەر ئەوەی داوەتی سووریام بکەن. منیش پێم ڕاگەیاندن ناتوانم بێم، چونکە قەدەغەم لەسەرە. قائیمقام نەجدەت منجە منجێکی کرد، بەڵام بە ناچاری ١٠ ڕۆژ مۆڵەتی گەشتکردنی دامێ بۆ سووریا.

لەبەر ئەوەی پێشتریێ ڕۆژنامەی (دیجلە کاینایی)م بڵاودەکردەوە، بۆیە ڕووناکبیرە کوردەکانی سووریا دەیانناسیم. خێزانەکەشمان گەورە و کراوە بوون، بۆیە سەردانەکەم وەك ڕووداوێکی لێهات. لە شام و حەلەب و سەرجەم شارەکانی دیکەی سووریا ڕووناکبیرانی کورد هاتنە قامیشلۆ. بۆ نموونە جگەرخوێن و عوسمان سەبری و عەبدی ئیبراهیم و مەحمووت عەنتەر و حەسەن حاجۆ و سلێمانێ حاجۆ و قەدری جان و هەژار و دکتۆر نافیز و هبایتار نووری و دێرسێمی و چەندان گەنجی کورد. لەگەڵ ئەو کەسایەتییانە ١٠ ڕۆژی شیرین و خۆشمان تێپەڕاند. ئەو ڕۆژانە ڕۆژانێکی سادە نەبوون، چونکە بۆ داهاتووی کوردی هەژار لە سۆری سبەینێوە تا درەنگانی شەو تەواوی ڕۆژەکە بە بەڕێوەبردنی پانێل و ڕێنمایی دەچووەسەرێ.

نامەوێ بەسەرهاتەکانی ئەوێ لێرە بنووسم، چونکە هەموو کوردێك و هەر کەسێکی هەستی مرۆڤایەتیی هەبێ، دەزانێ لەوێ باسی چیمان کردووە، بەڵام منێك کە بەردەوام خۆم بە خزمەتکاری یادەوەرییەکانی، نووسەری پەرتووکی (مێژووی دێرسیم) دکتۆری ڤەتەرنەری، نووری دێرسیمیی گەورەمان زانیوە، دەمەوێ لێرەوە یادەوەرییەکی جوانیتان بۆ بگێڕمەوە.

گەرچی ڕووداوەکە شێوەیەکی فەنتازیی هەیە، بەڵام لە هەمان کات بەرگێکی سیاسیشی لەبەردایە. ئەوسا ئەو پیاوانەی بە گەورە دەژمێردران ئەخلاق و کارەکتەریان ئەو نازناوەی پێ دەبەخشین. ڕووداوەکە بەمشێوەیە: مامە نووریمان لەگەڵ ئەمیر عەبدوڵای شای ئوردن لە سەردەمی گەنجییەوە یەکدی دەناسن، ئەمیر عەبدوڵا یەك لە سێ کوڕەکەی شەریف حوسێنە، ئینگلیز بە مەرجی لاوازکردنی سوپا و هەیمەنەی عوسمانییەکان، لە سووریا و عێراق و ئوردن و حیجاز، بەڵێنی دابوو چوار پاشا لە بنەماڵەی هاشمییەکان بۆ ئەو شوێنانە دانێ، عەرەب بەڵێنەکانی خۆیان جێبەجێ کرد و ئەوەی لە دەستیان هات دژی عوسمانییەکان کردیان، بەڵام ئینگلیز سەیریانکرد، گەر هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بدەنە عەرەب لەبەرژەوەندیی ئەواندا نییە، بۆیە ڕێگایان دا تاماڵباتی ئیبن سعوودی وەهابی مەزهەبی دوژمنی ماڵباتی هاشمی، حیجاز داگیر بکەن. کەچی عیراقیان دایە فەیسەڵی کوڕە ناوەنجییەکەی شەریف حوسێن، بڕیاریش بوو سووریا بدەنە عەلیی کوڕە گەورەی، بەڵام لەو سەروبەندە عەلی کۆچی دوایی دەکا. بۆیە بە پێشینەی بیست ساڵ سووریا دەدەنە فەڕەنسییەکان، هۆکاری ئەو ڕادەستکردنەش لە سووریا بۆ نەبوونی کادرۆیەکی دەوڵەتمەداری بوو لە وڵاتەکە. شەرقول ئەدنا، یانی لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری ئوردن، وڵاتێکیان دامەزراند، بۆ ڕابەرایەتی ئەوێش وەکو پاشا جاهیلەکانی ئێمە، عەبدوڵای کوڕە بچووکەکەی حوسێنیان بە پاشای ئەوێ دامەزراند. لەو سەر و بەندەشدا کراڵ حوسێن لە لای ئینگلیزەکان لە قوبرس کۆچی دوایی کرد.

گەر سەرنج بدەین، ئەو چوار دەوڵەتە عەرەبییە، خۆیان سنوورەکانی خۆیان نەکێشاوە، بەڵکو ئینگلیز و دەوڵەتە

ئیمپریالیستەکان کارەکەیان کردووە. هەر ئەوساش کوردستان پارچە پارچە کرا، دوو پارچەی هەرە چالاکیشی، بەبێ ئاگاداریی خۆیان بەسەر تورکیا و سووریا و عیراق دابەشکران. ئەوە لە ولاتانی دیکەش ڕووی داوە. ئەوانەی تامەزرۆی ئەوەشن بزانن لە سەرەتای سەدەی بیستەم، مێژوو و دابەشکردنی جوگرافیی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست چۆن بووە، دەتوانن پەرتووکە زانستی و بێلایەنەکان بخوێننەوە و لەوە تێبگەن. گەر پەرتووکەکانی سەردەمی کۆماری تورکیاش بخوێنێتەوە و بگاتە ئەنجامێك، دەزانن کە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و مێژووی میزۆپۆتامیا هەندێك گەل هەن وەك ڕەوەندێك لە ڕۆژهەلاتی ئاسیاوە هاتوون و کاتی خۆی لێرە جێگیر بووینە.

بابێینە سەر باسکردنە نایابەکەی مامە نووری: "کوڕ من، ئەها من گوتم لە ئیستانبوول لەگەڵ عەبدولا شەریف حوسێن یەکدیمان دەناسی، فەلەك منی لە مەملەکەتی خۆم کرد، کەچی ئەوی لە بیابانی عەرەبان کردە ئەمیر. کاتی خۆی کە لە ناوچەکەی خۆمانەوە بەرەو ئوردن هەلاتم. دکتۆر شوکرو سەکبانی هاوڕێم، لە عیراق ببووە وەزیری تەندروستی. ئوردنیش ببووە دەولەت، بەلام پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیران و بەڕێوەبەرایەتیی ناسنامە و تاپۆ و ئابووری و بازرگانی و تەندروستی و کاروباری دەرەوە و ناوخۆی نەبوو. سالانە ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز تەنها بۆ کۆشکێك ١٢ ملیۆن ستەرلینیی بۆ ئوردن دابین دەکرد، چونکە ئەوان جگە لەو پارەیە هیچ داهاتێکی دیکەیان نەبوو. کاتێك گەیشتمە ئوردن، ئەمیر عەبدولا زۆر بە باشی پێشوازیی لێ کردم، لە کۆشکەکەی شوێنێکی دامێ و گوتی: "دکتۆر گیان لە ئوردن لە مرۆڤ زیاتر گرنگی بە ئاژەل دەدەین، خوا تۆی بۆ من ناردووە، بۆیە لەو باوەڕەدام

بۆ ئەسپ و حوشتر و مەڕ و ماڵاتی ئوردن زۆر سوودت هەبێت. هیچ نەبێ تۆ پەرتووکی پزیشکیشت خوێندووە، بۆیە لە کۆشکەکەم ئاگات لە کاروبارە تەندروستییەکانی ئێرەش بێت".

دوای ئەوە پێنج ساڵ لە ئوردن مامەوە و چارەسەری نەخۆشییەکانی مرۆڤم دەکرد، نەخۆشەکانی دیکەش بە شێوازی داغکردنی عەرەبان چاك دەبوونەوە، یانیش دەمردن. ساڵی ١٩٣١ ئەمیر عەبدوڵا لەسەر داوەتی ئەتاتورك چووە ئیستانبووڵ، ئەوسا ئەو زاتە ناوی کەمال پاشا بوو. ئەو بە باشی پێشوازیی لە عەبدوڵا کردبوو، بۆیە لە ڕاگەیاندنەکانی تورکیا بەبێ ویست بەو جۆرە ببووە حەنەك.

"کەمال پاشا، لە کۆشکی دۆڵمە باخچە لە هۆڵی جەژنانە و بۆنەکان میواندارییەکەی ڕێك خستبوو، عەبدوڵا بە مێشکی خۆی تا عەرەب لە تورك بە کەمتر دانەنێت، دەستی بە پێداهەڵگوتنی پاقلاوەی پاقلاوەچییەکی شام کردبوو، بەڕێزم پاقلاوەکەی بیست قاتە، لە هەر قاتێك گوێز و باوی و بندق و فستق هەیە. کە پارچەیەك لەو پاقلاوەیە دەخەیتە دەمت لەناو زارت خۆی دەتوێتەوە. ڕۆژنامەنووسەکان ئەو چیرۆکە نەگونجاوەی نێوان پاشا و سەرۆك کۆماریان بە حەسرەتەوە گوێ لێگرتبوو. لەوەشە ئەتاتورك باسی جۆرە باشەکانی عارەقی ڕاکی و لەبلەبیی کردبێت.

ڕۆژی دواتر پاشایان لە دەرگای کۆشك ڕاگرت و لێیان پرسی: "جەنابی پاشا دوێنێ باسی پاقلاوەیەکتان کرد، ئایا دەتانەوێت لوتف بکەن و هەندێکی دیکە باسی بکەن؟" بۆیە کاتێك مەلیك عەبدوڵا تێدەگات پێی ڕادەبوێرن، بەو ڕەقی و توندییەی خۆیەوە گوتبووی: "هەتیو جا چی بووە، پاقلاوەمان خوارد، خۆ گوومان نەخوارد".

عەبدوڵا، دوای گەڕانەوەی لە ئیستانبووڵ، بانگی منی کرد و گوتی: "دکتۆر تۆ هاوڕێمی و دۆخی سیاسی نێوان تورکیا و ئوردن دەزانی، ئاگاداریشی لە ئیستانبووڵ ماڵ و موڵك و دۆست و ناسیاوێکی زۆرم هەیە، کەمال پاشاش بەوانە هەڕەشەی لێ کردووم و ناچاری کردم تۆ لەلای خۆم دوور بخەمەوە، بۆیە بمبەخشە، بەڵام من دیسان هاوکاریی تۆ دەکەم، وەلێ ناتوانم لە ئوردن بتهێڵمەوە". منیش سەرەتا چوومە بەیرووت، دواتر هاتمە حەلەب و لەگەڵ کورد و ئەرمەنییەکانی هاوشاریم لێرە دەژیم.

لە سەرەتای ئەو پەرتووکەوە هەر باسی پیاوی کوردم کرد، بەڵام داخۆ هیچ ئافرەتیکی کوردی نەتەوە پەروەر و شۆڕشگێڕمان نەبووە؟ وەڵام ئەوەیە بەڵێ هەمان بووە، بەڵام ئەوکات بە پەنجەی دەست دەژمێردران، وەك شەهید لەیلا و مارگرێت، کە لە جەبهەی شۆڕشی بارزانی شەڕ و خەباتیان دەکرد. یانی بە گشتی ئافرەتی ئاوا چالاك لەو سەردەمە کەم بوو، بۆیە، ژمارەشیان وەك ئەو کچە لاوانەمان نەبوو کە ئەمڕۆ لە چیاکانی کوردستان بۆ کورد و کوردستان خەبات و تێکۆشان دەکەن.

لە نێو یادەوەرییەکانم دەمەوێ ئیدی باسی هەندێك لەو خانمە کورد پەروەرانە بکەم.

### دادە زەهرا بوجاك

کچی عوسمان پاشای سیڤەرەکییە، هاوسەری موستەفا ڕەمزی بوجاگە، دوو منداڵی هەیە ناویان مەمۆ و لەیلایە، دەرچووی کۆلێژی ساینت بیۆنیتە. لە بەشە ناوخۆیی دیجلە تۆزێك باسی زەهرا خانمم کردبوو، بۆیە، لێرەش دەمەوێ بە کورتی باسی هەندێك لە یادەوەرییەکانی خۆم لەگەڵ ئەو بکەم.

پەیوەندیی زەهرا خان لەگەڵ ئێمە پەیوەندییەکی سەیر بوو، هەموومان لە کوردستانەوە هاتبووین و خۆمان ڕادەستی ئادابی ئیستانبووڵ نەکردبوو. زەهرا خان لە قوتابخانەی فەرەنسی خوێندبووی و لە شیشلی دادەنیشت، جگە لەوە ئەو لە ئیستانبووڵیش گەورە ببوو، بۆیە لەو ڕووەوە کەسێکی چاو کراوە بوو. ئەو خۆی بۆ بەشە ناوخۆیی دیجلە تەرخان کردبوو، بە باشی ئاگاداری خواردن و هەستان و دانیشتن و پاك و خاوێنیشمان بوو، هیچ نەریتێکی بورژوازیشی لەگەڵ ئێمە جێبەجێ نەدەکرد، کەسێکی ڕاست و دروستبوو، داواشی لێدەکرین وەك پیاو هەڵسوکەوت بکەین. هەموو کارەکانیشی بە هەستێکی نیشتمانییانە دەکرد و دەیگوت: "ئامانجم پێگەیاندنی گەنجانی کوردە". لە هەر دەرفەتێکدا، بە هێنانەوەی نموونەی گەلانی دیکە، هەستی کوردایەتی لە ناخمان زیندوو دەکردەوە. هەردەم بە گەنجەکانیشی دەگوت: "کوردپەروەری، وەك نەتەوە پەرستەکانی دیکە، فاشیست بوون و ڕەگەز پەرستی نییە، بەڵکو کوردایەتی واتا پاراستنی ژیان و ئارەزووەکانتان لە کاری خراپە. من و برادەرانی دیکە یەکەمجار ئەو وتانە لە زەهرا خانەوە فێر بووین. ئاگادارییەکی تەواوی لەسەر زمان و ئەدەبی فەڕەنسی هەبوو، زوو زووش باسی داگیرکارییەکانی فەڕەنسای بۆ ئێمە دەکرد. کات تێپەڕی و کاك ڕەمزی و زەهرا خان ناچار بوون کۆچ بکەن بۆ ئەمریکا. ساڵی ١٩٧٠ کاك ڕەمزی لە وێ کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان هێناوە سیڤەرەك. لەبەر ئەوەی ئەوسا دەستبەسەر بووم، نەمتوانی بچمە مەراسیمی جەنازەکەی.

زەهرا خانم و منداڵەکانی ئێستا لە فەڕەنسا دەژین، ئەو کاتەی

لە ئەمریکاش بوون، دۆستێکی نزیکی ئەلانۆر ڕۆسفێلت[١] بوون، لەگەڵ کاك ڕەمزی بەیەکەوە هاوکاریی تەواوی ڕێکخراوە کوردییەکانیان دەکرد. ئێستاش بەردەوامن لەسەر ڕێبازی سوێند خواردنی هاوسەری بەڕێزیان، واتا تا مردن کارکردن بۆ ڕزگارکردنی گەلی کوردی هەژار و دیل!

### مەزیەت عالی بەدرخان، (چنار) خانم

مەزیەت خانم کچی ئەمین عالی بەدرخانە، خوشکی بچووکی کامەران و جەلادەت بەدرخانە. کاتی خۆی لە ئیستانبوول لەگەڵ کەسێکی نیوە کورد و نیوە عەرەبی شامی هاوسەرگیریی کردووە، بەڵام، پێش ئەوەی منداڵیان ببێ مێردەکەی کۆچی دوایی کردووە. چەندان ساڵ لە ئەپارتمانێکی پشت گۆڕستانی ڕۆمییەکان لە شیشلی دادەنیشت. ماڵەکەی ئەو، بۆ گەنجانی کوردی ئیستانبووڵ، وەك زیارەتخانە و ناوەندێکی کەلتووری بوو. لەبەر ئەوەی تەمەنی بچووك بوو، لەناو چینی دەوڵەمەندەکانی کۆن زۆر نەمابۆوە، بەڵام هەندێکجار هەندێك لە یادەوەرییەکانی برا گەورەکانی و چۆنیەتی کۆچ کردنیانی بۆ سووریا بۆ دەگێڕاینەوە. لەبەر ئەوەی لە بەرەی دایکی ناسیاوی ماڵی نازم حیکمەت[٢] بوون و خزمایەتییەکەشیان زۆر نزیك

---

[١] ئەلانۆر ڕۆسفێلت (١٨٨٤ – ١٩٦٢) هاوژینی فرانکلین ڕۆسفێلتی ٣٢مین سەرۆکی ئەمریکا. (وەرگێڕ).

[٢] شاعیری ناوداری تورک نازم حیکمەت (١٩٠٢-١٩٦٣) ساڵێک یان دوو ساڵ بەر لە مردنی، لە ڕێی کەسایەتی و ڕووناکبیری کورد کامەران بەدرخانەوە (١٨٩٥-١٩٧٨) نامەیەک ئاراستەی گەلی کورد دەکات و تیایدا بۆچوونی خۆی لەمەڕ دۆزی کورد لە تورکیا دەخاتە ڕوو. لە سەرەتای ←

دامەزرانـدنی کۆمـاری تورکیـادا و لەگەڵ دەرچـوونی یاسـای "تەقریـری سکون" و زیادبوونی گوشاردا بۆ سەر ڕۆشنبیران، ژمـارەیەکی زۆر کەسـی دیـار و ناسـراو دەسـتگیر کـران و هەنـدێکیان لە دار دران. ئەو ڕەوشـە کـامەران و جەلادەت بەدرخـانی بـرای کە دەکەنە نەوەی میـر بەدرخـانی میری جزیرە، ناچار کرد لە ئیستانبوڵ هەڵبێن و ڕوو لە ئەورووپا بکەن. پاش چەند ساڵێک جەلادەت بەدرخان گەڕایەوە بـۆ سـوریا و لەوێـوە لە کـاری ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانی بەردەوام بوو، بەڵام کامەران بەدرخان لە ئەورووپـا مایەوە و ژیانی هاوسەریتی پێکەوە نـا. بە ڕێکـکەوت هاوسـەری کـامەران بەدرخـان و هاوسـەری نـازم حـیکمەت یەکـدی دەناسـن و هەر ئەوەیـش دەبێت بە هۆی بە یەکگەیشـتن و یەکترناسـینی کـامەرانی کـورد و نـازمی تـورک. بە پێـی زانیارییەکـانی کوردۆلـۆگی ناسـراو مـحەمەد بـایراک (دانیشتووی ئەڵمانیا)، دیداری لوتکەی نێوان ئەو دوو کەسایەتیـە سـەرەتای ساڵانی ١٩٥٠ لە پاریس پێک هاتووە و کامەران بەدرخان لەو دیـدارەدا بە دوور و درێژی باسی مێژوو و کولتوور و زمانی کورد بۆ نـازم حـیکمەت کـردووە. هەر لەو سـەردەمەدا نـازم حـیکمەت لە ڕوانـگەی سۆسیالیزمەوە زیاتر ئاشنای گەلی کورد و دۆزەکەی بووە و و پاش چەند سـاڵێکیش لەو دیدارە نامەیەکی بۆ کامەران بەدرخان ناردووە. ئەو نامەیە کە سـاڵی ١٩٨٠ لە ئەرشـیفی تـایبەتیی کـامەران بەدرخانـدا دۆزرایەوە و ئۆرژینـاڵەکەی لە ئەنسـتیتووی کـورد لە پـاریس پـارێزراوە، مێـژووی بە سـەرەوە نیـیە، بەڵام بایراک ڕای وایە ساڵی ١٩٦١ یـان ١٩٦٢ نووسـرابێت. دەقـی ئەم نـامەیە بە زمانی تورکی و لە تورکیا بۆ یەکەمجار لە ژمارەی ڕۆژی ٣١ی تەمـووزی ساڵی ١٩٨٨ی گۆڤاری (ئیکیبینە دۆغرو)دا بڵاو کراوەتەوە .

دەقی نامەکەی نازم حیکمەت:

"نەتەوەی کـورد کە ڕەگ و ڕیشـەی سـەدان سـاڵ بە مێـژوودا ڕۆچـووە، زۆرینەیەکـی بەرچـاوی بە مێـژوو و کولتـووری خـۆیەوە لە پـارچەیەکی ئەنادۆڵ دەژی. نەتەوەی تورک کە لە پارچەکانی تـری ئەنـادۆڵ دەژی، بە برای نەتەوەی کورد دادەنرێت. هەردوو نەتەوە لە ئیمپراتۆریـای عوسـمانیدا کە هاوشێوەی هەمـوو ئیمپراتۆریاکـانی تـر زینـدانی گەلان بـوو، زنجیـری ئەستووری ئاغا و دەرەبەگەکانی تورک و کورد و ئیـدارەی ئیمپراتۆریـای عوسـمانی لە دەسـت و پێیـان خرابـوو. دوای ڕووخانـدنی ئیمپراتۆریـای عوسـمانیش، هەردوو نەتەوە بەرەیەکـی هاوبەشـیان لە دژی ئیمپریـالیزم دامەزراند و خەباتیان کرد.

←

بزووتنەوەی میللیی ڕزگارکردنی ئەنادۆڵ تەنیا بۆ تورکەکان نا، بۆ کوردەکانیش بە یەکێک لە لاپەڕە هەرە بەشکۆکانی مێژوویان دادەنرێت.
یەکێک لە گۆرانییە هەرە لە بیر نەکراوەکانی ئەو سەردەمە کە لە ساڵانی دوای شەڕدا لەلایەن دەسەڵاتی تورکەوە قەدەغە کرا، بەم دێڕە دەستی پێ دەکرد: "لێدەن کوڕانی کورد، ڕۆژی نامووسە!" لە دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا، دەسەڵاتداران و ناوەندە باڵادەستەکانی تورک نکۆڵیان لەو مافە نەتەوەیی و مرۆییانە کرد کە لە سەروبەندی پەسەندکردنی بزووتنەوەی کورددا بەڵێنی بەدیهێنانیان دابوو، تەنانەت کاریان گەیاندە سنووری نکۆڵیکردن لە هەبوونی نەتەوەی کورد. ئەو سەردەمە قۆناغی سازشی نێوان دەسەڵاتداران و چینە باڵادەستەکانی تورک و ئیمپریالیزم بوو.
دەرکەوتنی ئەو نکۆڵیکردن و سازشە لە هەمان قۆناغدا ڕێککەوت نەبوو. سیاسەتمەدارانی تورک کە ئەمڕۆ تورکیایان کردووە بە یەکێک لە قەڵاکانی ئیمپریالیزم لە ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستدا، بە پێداگرتنەوە بەردەوامن لە نکۆڵیکردن لە هەبوونی نەتەوەی کورد و تەنانەت ئەو مافانەی کە لە ناو سنوورەکانی کۆماری تورکیادا بۆ کەمینەکانی تر دابین کراوە، ئەمان لە نەتەوەی کوردیان زەوت کردووە.
ئەو ئومێد و خواستانەی کە گەلانی تورک و کوردی ناو سنوورەکانی تورکیا لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوە چاوەڕێی دەکەن، دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆی تورکیای تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کردووە. هەردوو نەتەوە خوازیارن کولتووری میللیی برایانە و ئابووریی میللی پێش بخەن و بگەن بە مافەکانی خاوەنداریتیی زەوی و کەرەستەکانی کشتوکاڵ و ئازادی و مافە دیموکراتییەکان. گەلانی تورک و کورد بە تاسەی ئەوەوەن کۆماری تورکیا لە دەرەوە سیاسەتێکی بێلایەن پەیڕەو بکات و خۆی لە دۆخی بوون بە بنکەی ئیمپریالیزم ڕزگار بکات.
هەر وەک چۆن نیشتمانپەروەرانی ڕاستەقینەی تورک بە گیان و دڵ پشتیوانی لە خوشک و برایانی کوردیان دەکەن لە تێکۆشانیاندا بۆ گەیشتن بە مافە نەتەوایەتییەکانی خۆیان لە چوارچێوەی سنووری تورکیادا، نیشتمانپەروەرانی ڕاستەقینەی کوردیش بە هەمان شێوە پشتیوانی لە گەلی تورک دەکەن لە تێکۆشانیاندا بۆ دیموکراسی و سەربەخۆیی نەتەوەیی.
ئەو هێزە کۆنەپەرست و کۆلۆنیال و تاریکانەی کە خوازیارن دووبەرەکی بخەنە نێوان تورک و کوردەکانی دانیشتووی ئەنادۆڵەوە دەستیان خستووەتە

←

بوو، بۆیە زوو زووش باسی حیکمەتی باوکی نازم و یادەوەرییەکانی نازمیشی دەکرد. چەندان فۆتۆی نازم حیکمەت و باوکی پێدام، کە لە هیچ شوێنێك چاپ و بڵاو نەکرابوونەوە، بەڵام ئەوانیش لەگەڵ پەرتووکخانەکەم کاتێك لە ساڵی ۱۹۷۲ دەستگیرکرام، خرایە مەزادەوە و فەوتان. کاك حیکمەت دوای نووسینەوەی دەستوور لەسەردەمی ئیتیحاد و تەرەقی، ببووە بەڕێوەبەری گشتیی چاپخانەکان، بۆیە زۆر لە بەدرخانییەکانی کردبووە ئەندامی پارتی ئیتیحاد و تەرەقی. دادە مەزیەت دەیگوت: "لەگەڵ ماڵی نازم حیکەمەت زۆر لەیەك نزیك بووین، چونکە کامەرانی برام و نازم حیکمەت لەیەك تەمەن بوون، دایکمان زوو زوو منداڵەکانیان دەگۆڕیەوە بۆ شیرپێدان. بۆیە لەگەڵ نازم، بە خوشك و برای یەك هەژمار دەکراین، ئەو نزیکییەی کاك حیکمەتیش لە خێزانەکەمان سوودی بە پرسی کوردیش گەیاندبوو، هەم لە گۆڕەپانی سیاسی لەبەر چاوی ئیتیحادییەکان، هەمیش لە مەیدانی ڕاگەیاندن، لە بەرژەوەندیی کورد زۆر دەرفەتی دەستەبەر کردبوو".

دادە مەزیەت بە پەروەردەیەکی جوانی عەشایەری کوردی و

---

دەستی ئیمپریالیزمەوە و دەیانەوێت گەلانی خۆیان زیاتر بچەوسێننەوە .
تێکۆشانی میللیی نوێی گەلانی کورد و تورک لە دژی دەرەبەگ، هێزە ڕەشەکان، ئاغاکانی شار و گوند، پاشڤەڕۆیان، ڕەگەزپەرستان، ئەوانەی نکۆڵی لە هەبوونی میللەتان و مافە نەتەوایەتییەکانیان دەکەن، ئەوانەی گەلان دەکەن بە گژی یەکدیدا و بە ساناهی سواری کۆڵیان دەبن و لە دژی نۆکەرانی ئیمپریالیزم بە دەست خستنە ناو دەستی هەردوو نەتەوەی کورد و تورک سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت و ئەم دوو نەتەوەیە دەگەیەنێتە بەختیاری و ئاستی ژیانێکی مرۆییانە. ئەم دوو نەتەوە برایە تەنیا بە هاوکارییەکی لەو جۆرە دەتوانن بگەن بە ئازادی و مافە نەتەوەیی و مرۆییەکانی خۆیان". **(ئامادەکردن و وەرگێڕانی: بەکر شوانی).**

پێشکەوتوویی ئیستانبووڵ گەورە بوو، چونکە لەگەڵ ئەوەی بەدرخانییەکان لە ١٨٤٠ ڕاگوێزرانە ئیستانبووڵ، کەچی لە ماڵەوە بەردەوام بە کوردی قسەیان دەکرد و بۆ پەروەردەی منداڵەکانیشیان لە جزیریێوە دایەنیان دەهێنا. کە هاتمە ئیستانبووڵ، هەموو بەدرخانییەکان وەکو من کوردییان دەزانی.

راپۆرتێکم لە دادگاوە بۆ هات، کە سوپاسالاری تورکیا سەبارەت بە من بۆ دادگای بەرز کردبۆوە، لە ڕاپۆرتەکە هاتبوو: "ئەو ماوەیە مووسا عەنتەر چالاکیی نییە، بەڵام کێ ئەو ببینێ کوردایەتی بە مێشکیدا دێ." دادە مەزیەتیش ڕێك ئاوابوو. وەك چۆن لای کەسێکی ئەولیا، کاتێك کەسێك دەمرێ، هەستێکی مەعنەوی بەخۆداچوونەوەی بۆ دروست دەبێ، من و سەرجەم ئەو گەنجە کوردانەش کاتێك دادە مەزیەتمان دەبینی، هەستێکی ئاوامان بۆ دروست دەبوو. جگە لەوەی ئەو دۆستێکی نزیکی خەسووشم بوو، بۆیە وای نیشان دەدا زیاتر لە من نزیکە پیشان و بەردەوام تەلقینی هەست و شەرەفی نەتەوەیی دادەداین. بەردەوام کامەران و جەلادەتی وەکو نموونەیەك بۆ ئێمە دەهێناوە، بەڵام بەردەوامیش دەیگوت: "دەبێ ئێوە لەوان باشتر و پێشکەوتوتر بن".

مەزیەت خانم هەموو یەکەم هەینیی مانگێکی تازە، دوای نیوەڕۆ بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کامەرانی برای دەکرد، کە لە پاریس دەژیا، چەند ساڵیش ڕەنگە هەموو هەینییەك سەردانم کردبێت، بەڵام لە ساڵەکانی دواییدا ئەو ڕۆژانەی لە هەینییەوە بۆ چوارشەممە گۆڕیبوو. لەگەڵ ئەوەی کاك کەمەرانم ڕوو بە ڕوو نەبینی، بەڵام بەو بۆنەیەوە زۆر قسەم لەگەڵ کرد، زۆر سوودم لە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی وەردەگرت. دوای بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی (دیجلە کاینای) بە بەردەوامی و ڕێك و پێکی

ڕۆژنامەکەم بۆ ئەو دەنارد، ئەویش منی زیاتر خۆش ویست و زۆرتریش بەدەممەوە هات، تا ڕۆژێك لە تەلەفۆن بە کوردی ئەو چیرۆکەی بۆ باسکردم:

"چۆلەکەیەك بێچووەکانی گەورەکرد، دوای پەڕ و باڵ هاتنی بێچووەکان، ئیدی کاتی ئەوەیان هاتبوو لە هێلانەکانیان دەرچن و بچنە دەرەوە. بەر لە چوونە دەرەوەیان دایکەکە، بە ئاماژەکردن بەو مرۆڤانەی لە خوارەوەیان هاتوچۆیان دەکرد، ئامۆژگاریی دەکردن و دەیگوت، سەیرکەن بێچووەکانم، ئەو مەخلوقانەی لە خوارەوە دەیانبینن مرۆڤن، ئەوان دوژمنی گیانی بە گیانی ئێمەن. گەر سەیرتان کرد چەمینەوە بۆ زەوی تا بەرد هەڵبگرنەوە، ئێوە ڕاستەوخۆ بفڕن و هەڵێن. دایکەکە کە ئاوای گوت یەکێك لە بێچووەکان گوتی: باشە دایکە ئەی گەر بەر لەوەی خۆی بچەمێنێتەوە، بەردی لەناو مستی بوو، یان لە ناو جلوبەرگی شاردبوویەوە؟ دایکەکەش دەڵێ ئافەریم ڕۆڵەکانم، دیارە ئیدی پێویستتان بە ئامۆژگاری نەماوە، بۆیە ئیدی کاتی چوونە دەرەوەتانە". کاك کامەران دوای گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە پرسەکەی هێناوە سەر من و گوتی: "کوڕم من ئامۆژگاری چیت بکەم، چونکە تۆ پێویستت بە ئامۆژگاری نییە".

لێرەوە، هەم کاك کامەران و هەمیش خوشکە ئەزیزەکەیان، بە ڕێزەوە یاد دەکەمەوە.

### نەسرین بەدرخان (چنار)خانم

خێزانی عوسمان پاشای کوڕی بەدرخان پاشایە. کچی مەهمەتە فەندی پسمامێ بەدرخان پاشایە، خەڵکی گوندی شاها بۆتانە، هەر لەوێوەش بە جلوبەرگی کوردی بێ ئەوەی تورکی بزانێ بووە بووکی عوسمان پاشا و هاتە ئیستانبوڵ، عوسمان پاشا وتەبێژی سوڵتان حەمید بوو.

ئەوکاتەی نەسرین خانم بینی، تەمەنی هەشتا ساڵ بوو. بەڵام، لە تورکی پەندێك هەیە دەڵێ: "مزگەوت ڕووخا، بەڵام مینبەر هەر لە شوێنی خۆیەتی". بۆیە، نەسرین خان بەڕاستی بێ وێنە بوو، ئێمە و سەرجەم خێزانەکانی دیکە ڕێز و حورمەتێکی زۆرمان بۆی هەبوو، بۆیەش بە (نینە) بانگمان دەکرد. لەگەڵ ئەوەی ٦٥ ساڵ لە ئیستانبوڵ ژیا، بەڵام تورکییەکی باشی نەدەزانی. سوڵتان حەمید و خەڵکی ناو کۆشکی سوڵتان گوێیان لە ناوبانگی جوانیەکەی ببوو، بۆیە بەشێك لە خەڵکەکە داوایان لە عوسمان پاشا کردبوو بیهێنێتە کۆشك. ڕۆژێك عوسمانیش داوای لێ کردبوو خۆی ئامادە بکات تا بچنە کۆشکی سوڵتان، بەڵام نەسرین خان گوتبووی: "کورۆ ئەز چەوا بێم، ئەز ترکی نزانم". عوسمان پاشا لە وەڵامدا: "کچێ ئەو هەمی وەکی تەنە، چەرکەز مەرکەز و گاورن".

لەگەڵ نەسرین خانم گوزەشتەی زۆرم هەیە و تا ساڵی ١٩٤٩ کە وەفاتی کرد، لێی دانەبڕام. ئەو سەرپۆشەی لەدەوری تابووتەکەشی گرێدرابوو تا ئەوڕۆ وەك یادگارییەك لای خۆم پاراستوومە. ئافرەتێکی چوست و چالاك و پڕ شەوق بوو بۆ ژیان. لە فەنەر یۆلوو دراوسێی یەکدی بووین، هەر کە عادز

دەبـوو، دەهـاتە لای ئـێمە و دەیگـوت: "دە ڕابە کـوڕۆ، ئەمـێ هەنـدەکی گۆڤەنـدێ بگـرین". بـۆیە منـی هەڵدەسـتاندەوە و بەیەکەوە چەنـدان شـایی کوردیمـان دەکـرد، ئەوەی نەشـمزانیبا فێـری دەکـردم، بە تـایبەتی شـایەکی شـێخانی هەبـوو، هەم گۆرانیمان لەگەڵ دەگوت هەمیش شاییەکەمان لەگەڵیدا دەکرد. هەرگیز لە بیر ناکەم، دوو منـداڵی هەبـوو بە ناویـان خەدیـجە و مەنسووڕ بوو. خەدیجە خێزانی سەبری پاشای خەڵکـی وان بـوو، سەبری پاشا بەڕێوەبەری گشتی لۆجیستی تورکیا بوو، هەر کاتێ هاتبا ئیستانبووڵ زوو زوو سەری لـێ دەدایـن، بەڵام مەنسـووڕی کوڕی سەرسـەری و سـەرخۆش بـوو. بە پلەی نەقیبـی وازی لە سوپا هێنابوو، هاوڕێیەکی نزیـك و هـاوپۆلی ڕەجەب پەکەری[1] سەرۆکوەزیرانی ئەوسا بـوو. هەر ئەوانـیش بـوون کە ئەویـان لە ڕێگا لادا و بەو ڕۆژەیان گەیاند.

عوسـمان پاشـا، لە ڕیـزی تـونێلی ئیسـتانبووڵ لە شـەقامی ئیسـتیقلالی نـاوچەی تەقسـیم، سـێ ئەپارتمـانی هەبـوو، بەڵام مەنسـوور هەمـووی فرۆشـت و پارەکەشـی لە قومـار و ژن و خـواردنەوە توانـدەوە. بەپێـی گێڕانەوەکـانی نەسـرین خـانم، مەنسوور، لەگەڵ ڕەجەب پەکەر لە ئیسپانیاوە ئافرەتیـان دەهێنـا و لە هەنگاریـاش بە فـرۆکە مەزە... ئەوکـاتەی مەنسـوورم بینـی، پەرێشان و سەرسەری، وەك دەرۆزەکەری لێهاتبوو.

نەسـرین خـانم بۆچـوونێکی دیـاری کـراوی سیاسـیی نەبـوو،

---

[1] مەحمـەت ڕەجـەب پەکـەر (١٨٨٩ – ١٩٥٠) بـۆ مـاوەی پێـنج سـاڵ سکرتێری گشتی پارتی گەلی کۆماری CHP بووە. لە سەردەمی سـەرۆك کۆمـاری عیسـمەت ئینۆنـۆ لـە نێـوان سـاڵانی (١٩٤٦ – ١٩٤٧) سـەرۆك وەزیرانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

بەڵام پەیوەست بوو بە کورد و کوردایەتییەکەی، بۆیە دەیگوت: "کورێ من ئەز قیزا پاشێ و ژنا پاشێ و خوشکێ پاشێ مە، لێ ئەز کوو حەماڵەکی کورد دبینم، وسا کێفا من تێ، کو ئەز وێ نادەم بی وی پاشایان". لەبەر ئەوەی لە کۆشك بەردەوام هەستان و دانیشتنی لەگەڵ کەنیزەک و خزمەتگوزاران زۆربوو، بۆیە فێری تورکی نەببوو، بۆیە بە کوردی درێژەی داپیراتی خۆی دابوو.

گەر بتوانم لەناو گۆڕیش دەمەوێ دەستی ماچ بکەم.

### هیدایەت عەزیز زاپسوو

کچی کاك بەدرخان عەزیزە، خیزانی عەبدولڕەحیم زاپسووە، یانی خەسووی منە. دەرچووی قوتابخانە بوو، ماوەیەکی زۆریش لە قوتابخانەی سەرەتایی مامۆستایەتی کردبوو، بەڵام بەر لەوەی خانەنشین بێت، دەستی لەکار کێشابۆوە، پێش ئەوەی بێمە سەر یادوەرییەکانی نێوانمان، دەمەوێ باسی یادەوەرییەکی خۆیتان بۆ بکەم.

ڕۆژێك لە ئەزموونی وانەی ئایین، مامۆستا پرسیارێکی ئاوا دەکا: "کچم ڕۆژی قیامەت چۆن بەرپا دەبێت؟". لە کاتی خۆ ئامادەکردنی بۆ تاقیکردنەوە گرنگی بەو بابەتە نەدابوو و نەیخوێندبوو، بەڵام لەسەر ئەو پرسە، وەك وەڵامی پرسیارەکە، گوزارشتێکی ناو خەڵکی نووسیبۆوە، کە ئەمەیە: "یەکێك دەکا و یەکێك دەخوا"، لە ڕاستیدا ئەو گوزارشتە هیچ پەیوەندییەکی بە وانەکەوە نەبووە، بەڵام مامۆستاکەی ئافەرینی لێدەکا و نمرەی تەواوی دەداتێ.

لەگەڵ ئەوەی هیدایەت خانم لە ئیستانبووڵ لە دایك ببوو و هەر لەوێش گەورە ببوو، بەڵام بە بنزارێکی بۆتانی زۆر جوان بە

کوردی قسەی دەکرد، نەسرین خانم خوشکی باوکی بوو، لە ماڵباتی ئەوان زمانی سەرەکی قسەکردن، زمانی کوردی بوو، لەسەر زمانی تورکیش دەیگوت: "کوڕم ئێمە تورکی وەك زمانێکی بێگانە فێر بووین". لە ساڵی ١٩٤١ وە، دوای ئەوەی کاك عەبدولڕەحیمم ناسی، دەستم بە سەردانی ماڵیان کرد.

هیدایەت خانمیش، وەك کاك عەبدولڕەحیم، لەگەڵ ئێمە گەرم و گوڕ بوو و بە کوردی دەیگوت: "کوڕم لە خوا بە زیاد بێ ئێوە پێگەیشتوونە و چاکدەکەن دێنە لای ئێمە، بە هاتنی ئێوە ماڵی باوکمم بیردەکەوێتەوە، چونکە بیست ساڵە دەرگای ماڵمان داخراوە، ئاگردانی ماڵمان خەریك بوو دەکوژاوە، چونکە هیچ ڕووناکبیرێکی کوردمان نەدەبینی". لە هەر سەردانێکماندا، بۆ ئەوەی ئێمە بێزار نەبین، وەك ئەوەی ئێمە بە سەرلێدانەیان چاکەیان لەگەڵ بکەین، کەشوهەوایەکی ئاوای دەخولقاند. ئەو پێشوازی و ڕووخۆشییەی لە ئێمەی دەکرد دەریدەخست چ هەستێکی کوردپەروەرانەی لە ناخیدا هەبوو، بۆیە، زوو زوو دەیگوت: "کوڕم وەڵاهی من دوژمنداریی مرۆڤایەتی ناکەم، بەڵام با بیوورن چونکە من تورکم خۆشناوێ و پێش هەموو شتێك گەلی کوردی خۆمم خۆش دەوێ، ئاخر تورکیش ئێمەیان خۆشناوێ، سەرەڕای ئەوەی ئێمە دوژمنداریان ناکەین، وەلێ ئەوان دوژمنداریمان دەکەن".

ئەو خانمە دواتر بووە خەسووم. ڕۆژێك گوتی: "سەیرکە مووسا، بەڵام لەخۆت بایی مەبە، لە یەکەم بینینتەوە حەزم کرد ببیە زاوام". ئێمە بووینە یەك خێزان، بۆیە، چەندان یادەوەریی خێزانیی تاڵ و شیرینمان پێکەوە هەیە، بەڵام ئەو یادەوەرییانە پەیوەندیی بە خەڵکەوە نییە، بۆیە لێرە باسیان ناکەم.

هیدایەت خانم تا ساڵی ١٩٧٥، کە کۆچی دوایی کرد، پێم

وایە هیچ بێڕێزیەکم بەرامبەری نەکردبێت، بۆیە ویژدانم زۆر ئاسوودەیە. بە ڕێز و حورمەتەوە یادی دەکەمەوە.

### بەشە ناوخۆیی فورات

هاوینی ساڵی ١٩٤٢ بوو، ڕۆژێك، من و نەجاتیی جەمیل ئۆغلوو،[1] بریارماندابوو بچینە کەنار دەریا. ئەوساماڵباتی جەمیل پاشا بۆ چەندین شوێنی جیاوازی تورکیا ڕاگوێزرابوون، خاوخێزانی نەجاتییش بۆ شاری ئۆردوو دەریای ڕەش (قەرە دەنیز) ڕاگوێزرابوون. بە هەر ترس و لەرزێك بێت، نەجاتیمان لە بەشە ناوخۆیی وەرگرتبوو؛ چونکە حکوومەت بەدوای هەنجەتێکدا دەگەڕا بۆ داخستنی بەشە ناوخۆییەکە. ئەو ڕۆژە لە ناوچەی لالەلی لە شەقامی گەنج تورك، باڵەخانەیەکمان بینی تازە دروست دەکرا، ئەو کەسەی سەرپەرشتیی کرێکارەکانی دەکرد، لە دوورەوە سیمای بە کوردان دەچوو، پەڵە برینەکانی سەر دەمووچاویشی دەریدەخست کوردە. چووینە لای و دوای چۆنی و چاکی و سڵاوکردن، دەستمان بە گفتوگۆ کرد، لە قسەکردن بۆمان دەرکەوت گومانەکەمان هەڵە نەبووە. ئەو ناوی حاجی محەمەد فاتیح بوو، لە عەشیرەتی گەرگەریی ڕوها بوو.

حاجی محەمەد پێی گوتین، لەسەر ئەو زەوییە ٢٥٠ مەترییە، بە نیازم باڵەخانەیەکی شەش نهۆمی دروست بکەم، کە هەر نهۆمێك پێنج ژوور و ساڵۆنێکی هەیە. منیش لێم پرسی: "حاجی

---

[1] نەجاتیی جەمیل ئۆغلوو لە ساڵی ١٩٢٣ لە دیار بەکر چاوی بە دونیا هەڵهێناوە. سیاسەتمەدارێکی کوردە، لە ماڵباتی جەمیل پاشا زادەن. لە ساڵی ١٩٦٣ وە بۆ ماوەی سێ خول سەرۆکایەتیی شارەوانیی دیاربەکری کردووە.

کە تەواو بوو، بە نیازی نهۆمی بە چەندی بیدەیە کرێ؟" ئەویش گوتی: "لێرە هەر نهۆمێك ٣٠ تا ٣٥ لیرە دەکات". منیش گوتم: "بۆ نایەی ئێرە بکەینە بەشەناوخۆیی بۆ قوتابیان؟ لە هەر نهۆمێکیش پێویست ناکات ئاودەست و گەرماو دروست بکەی. بێ ئەوەی پارەشت لێوەرگرین ئێمە دەیکەینە بەشە ناوخۆییەکی ئامادەکراو، سەرەتاش کرێی سەرجەم نهۆمەکانت دەدەینێ، لە قازانجی ئەوەی ماوەش نیوەی من نیوەی تۆ". حاجی گوتی: "با بیرێکی لێ بکەمەوە و بەیانی یەکدی ببینینەوە". کە ڕۆژی دواتر چوومەوە، بە داواکارییەکەم ڕازی ببوو. منیش گوتم: "سەیرکە مامە حاجی، تۆ پیاوێکی موسوڵمانی، دوای ئەو هەموو کەدە گەر شتێك بەسەر من یان بەسەر تۆ بێت، کارەکە تێك دەچێت، وەرە ئەو قسانە لای فەرمانگەی دادنووسی بکە و لێك تێگەیشتنەکەی نێوانمان بکەینە نووسراو". حاجی بەو شەرتە ڕازی بوو من کاری بیناسازییەکە بیکەم، چونکە گوتی من هیچی لێ نازانم، بەڵام پارەی دروستکردنیت دەدەمێ. ڕۆژی دواتر دەستم بە کار کرد، لە مانگی حوزەیرانەوە تا ئەیلول، جوانترین بەشەناوخۆیی ئەوسای ئیستانبوولم بە ناوی فورات دروست کرد. لەوێ، شوێنی نووستن و مانەوە و خواردن و گەرماو، بۆ هەر خوێندکارێك، مانگانە ٤٥ لیرە بوو. بەڵام، سەرەتا ١٥ لیرەمان بۆ ناو تۆمارکردن وەردەگرت، جگە لەمە ١٥ لیرەش وەك بارمتە وەردەگیرا، پارەی ناو تۆمارکردنیش نەدەگەڕێندراوە، بەڵام پارەی بارمتەکە، قوتابی، دوای دەرچوونی لە بەشە ناوخۆیی وەری دەگرتەوە. دەشتوانرا لە ڕێگای پۆستەوە ناو تۆمار بکرێت. بەشە ناوخۆییەکەم ١٥٠ قوتابی دەگرت، بۆیە، تا مانگی دە هیچ شوێنێکم بە بۆشی نەماوە. لەو ٣٠ لیرەی سەرەتا دەدرا، ٢٥ لیرەیم بە قەرزێڵە و

لێف و نوێن و سەرین دا. بەو پێنج لیرەیەی ماوەش، چێشتخانە و پەرتووکخانەم دروستکرد.

لەگەڵ کرانەوەی زانکۆ، قوتابییەکانم وردە وردە دەستیان بە هاتن کرد، لەگەڵ ئەوەی لە شارەوانی و پۆلیس من خاوەنەکەی بووم، بەڵام لەبەر ئەوەی دەچوومە کۆلێژ، کاتێك و بەڕێوەبەرێکم بۆ بەشە ناوخۆییەکە گرتبوو. زۆرم پارە دەستدەکەوت، بۆیە، قوتابییە هەژارەکانی ئامادەیی ئەدەنە و قوتابییە کوردە نەدارەکانم بێ بەرامبەر لە بەشە ناوخۆییەکەم جێ کردبۆوە. سەردەمانێك ٢٥ قوتابیم هەبوو کە کرێی مانەوەیان نەدەدا. پۆلیسی نهێنی ئەوەی دژم بەکارهێنا و لەسەر ئەو پرسە ڕاپۆرتێکی ئاوایان لەسەر ئامادە کردبووم:

"ئامانجی مووسا عەنتەر بازرگانیکردن نییە، بەڵکو دەیەوێت گەنجی کورد پێ بگەیەنێت". کارتی ئەو قوتابییانەی بێ بەرامبەر دەمانەوە، بە ڕەنگێکی جیاواز دروستم کردبوون. پۆلیس بەوەی زانیبوو، چونکە قوتابییەکی بە ناوی حیکمەت بە نهێنی خستبووە ناو بەشە ناوخۆییەکەم. کاتێك من لە کۆلێژ بووم، ئەو چووبووە نووسینگەکەم و سەیری کارتەکانی کردبوو، کاتێکیش زانیبووی زۆربەی ئەوانەی بێبەرامبەر دەخوێنن تورکن، ئیدی گوتبوویان مادەم وایە مووسا کۆمۆنیستە، ئەوجارە دەستیان بەو هەنجەتە کردبوو.

لێرەش، وەك بەشە ناوخۆیی دیجلە، یادگاریی زۆرم هەیە، ئێستا زۆر کەسی ناسراو هەیە کە ئەو سەردەمە لە بەشەناوخۆییەکەی من مانەوە و خوێندیان، بۆ نموونە، پرۆفیسۆر موزەفەر ئاك کلچ، تورهان، ئیلهان سەلچووك، سەیفی تۆك و عەبدولرەحیم دیکەری دکتۆری ناوداری چەنەکەلە و کوڕی دکتۆر فوات، کە لە شۆرشی شێخ سەعید لەدار درا.

ئەورۆ گەر بچمە هەر لایەکی تورکیا، یان قوتابییەکانی بەشە ناوخۆییەکەم، یانیش منداڵەکانیان بە دەمەمەوە دێن. منیش دڵخۆش دەبم بەو هاتنە پێشەوەیان. دوای ئەوەی بەشە ناوخۆیی فوراتم دانا، هیچ پەیوەندییەکم بە بەشی کارگێڕیی بەشە ناوخۆیی دیجلەوە نەما، لە شوێنی خۆشم، خەیری ساراچ ئۆغلووم، کە پێمان دەگوت (ئاپۆ)، وەك بەڕێوەبەر دامەزراند. ئەو خەڵکی سیرت بوو و لە هەموومان بەتەمەنتر بوو، هەم فەرمانبەر بوو لە فەرمانگەی تاپۆ، هەمیش لە زانکۆ بەشی مافی دەخوێند. بە ١٠ ساڵ خوێندنی تەواو کرد، دواتر لە ئاکچەکەلە و ڕوها و وان و قەزاکانی دادوەری کرد. لە ساڵی ١٩٧٩ کۆچی دوایی کرد.

راستە وازم لە بەشەناوخۆیی دیجلە هێنا، بەڵام لەبەر ئەوەی دەمزانی چ دەگوزەرێ و دۆخیان چۆنە، بۆیە زۆر کات، شتێکم لەدەست هاتبا هاوکاریی ئەوێشم هەر دەکرد. بوودجەی مانگانەیان لە ٢٥مین ڕۆژی مانگ دەبڕا، بۆیە، ئەو ڕۆژانەی دەماوە تا دەگەیشتنە سەری مانگی تازە، دەهاتن لە کۆگای بەشەناوخۆییەکەی من کەرستەی پێویستی خواردنیان دەبرد، بۆ ئەمەش هەرگیز پارە نەبووە پرسێکی نێوانمان، چونکە هیچ نەبێ منیش نزیکەی دوو ساڵ و نیو بێ بەرامبەر لەو بەشە ناوخۆییە نانم خواردووە.

### کامەران بەدرخان - عەبدولڕەحمان قاسملوو

مادام کاتی هاتووە، دەمەوێ لێرە باسی یادگارییەکم بکەم، کە بەبۆچوونی من بیرەوەرییەکی زۆر قەدر گرانە. دوو برای کوردی ئێران لە ئیستانبوڵ دەیانخوێند، حوسێن قاسملوو لە بەشە ناوخۆیی زانکۆی تەکنیك دەماوە و هەر لەوێش

دەیخوێند. ئەحمەد قاسملووش لە کۆلێژی پزیشکی دەیخوێند و لای من دەمایەوە. پێموابێ ساڵی ١٩٤٥ بوو، حوسێن لاوێکی ئێجگار قشت و زیرەکی هێنا لام و بەم شێوەیە پێی ناساندم: "کاك مووسا، ئەوەش عەبدولرەحمانی برا بچووکمانە".
عەبدولرەحمان قاسملوو، ئەو ساڵە لە ئێران ئامادەیی تەواو کردبوو و هاتبوو تا زانکۆ بخوێنێ، گەنجێکی خوێنگەرمی زۆر تایبەت بوو، یەك پارچە دۆستایەتی و کۆمەڵایەتی بوونی لێ دەتکا، بەڵام دوو برایە گەورەکەی ئاوا نەبوون. لەوەش زیاتر، زۆر حەزی لە هونەر و ئەدەبیات بوو، بەڵام حەزی دەکرد کۆمەڵناسی بخوێنێت. ناویم لە بەشی کۆمەڵناسی تۆمارکرد، لە بەشە ناوخۆییەکەی منیش دەماوە. نەك تەنیا لە بەشە ناوخۆیی، بەڵکو لە دوای وانەکانی زانکۆش لێم جیا نەدەبۆوە، ئەو بە ئاگری کورد و کوردستان دەسووتا و دەتلاوە. لە هەموو دەرفەتێکدا دەیگوت دەمەوێ بچمە ئەوروپا.

ئەوسا، لە ماڵی دادە مەزیەت بەدرخان لە شیشلی، هەموو یەکەم هەینیی مانگێکی تازە، دوای نیوەڕۆ لەگەڵ کامەران بەدرخان قسەمان دەکرد. ڕۆژێك حەز و تواناکانی ئەو گەنجەم بە کامەران بەدرخان گوت، ئەویش ئاوا وەڵامی دامەوە: "بۆ نا، کوڕم بینێرە، من بۆرسێکی خوێندنی لێرە بۆ دابین دەکەم". دواتر کە موژدەکەم بە عەبدولڕەحمان دا زۆر دڵخۆش بوو، بەڵام پێم گوت: "عەبدولڕەحمان بۆ ئەو کارە یەك مەرجم هەیە، ئەویش دەبێ براکانت ڕازی ببن". وەك ئاگر بوو، هەر ئەو ئێوارە هەردوو براکانی هێنایە لام، براکانی گوتیان ئێمە ڕازین، بەڵام پارەمان نییە و دەبێ نامەیەك بۆ ئێران بنووسین و داوای پارەیان لێبکەین، ئینجا دواتر دەینێرین، منیش پێم گوتن: "داوای پارەتان لێناکەم و من پێویستییەکانی بۆ دابین دەکەم، گەر برای

ئێوە بێت بـرای منیشـە". عەبـدولڕەحمان لە مـاوەیەکی کەم نـاو تۆمـارکردنەکەی زانکـۆی لە ئیسـتانبووڵ ڕەشـکردەوە و ئەوراقە فەرمییەکـانی ئامـادەکرد و لە گـاری سـیرکەجی سـواری شەمەندەفەرمان کرد و بەرەو پاریس بەڕێمان کـرد. ئەوسـا تـازە دووەمین جەنگی جیهان کۆتایی هاتبوو.

عەبدولرەحمان پاش ئەوەی چووە پاریس، پەیوەندییە زانسـتی و سیاسییەکانی لەگەڵ من نەپچڕاند، لەوێ بەردەوام سەبارەت بە زانکۆ و زانست و بابەتی ئاشتی و پەرتووکخانە و هەر بابەتێـك کە بەلای مـنەوە گرنـگ بـا، ئەو بە نـامە بـۆی دەنووسـیم و دەینارد. کاك کامەران زۆر پێی سەرسام بـوو، عەبـدولرەحمانیش ڕێـز و حـورمەتێکی زۆری بـۆ کـاك کـامەران و خێـزانە پۆلۆنییەکەی هەبوو. کـاك کـامەران ئەوی وەك منـداڵێکی خـۆی دادەنـا و شـانازیی پێـوە دەکـرد، لەبەر ئەوەی خـاڵی خێـزانەکەم بوو، بۆیە بەردەوام پێی دەگوتم خوارزا. ڕۆژێك، کە بە تەلەفۆن قسەمان دەکرد گوتی: "کوڕم خەمبار بـووم بەوەی کە منـداڵمان نابێ، بەڵام تۆ و عەبدولڕەحمان ئەو بۆشاییەتان بۆ پـڕ کـردمەوە، ئێستا زۆر بەختیارم، گەر بمرم بە ئـارامی چـاوان لێکـدەنێم". ئەو قسەیە خۆشترین ڕستە بوو کە لە ژیانم گـوێم لـێ بـووبێتن، ئەو شـەڕەفەی کە پـێم درا، نـاتوانم، بە پێنـووس و نووسـین، مانـا و قورسـاییەکەی پێناسـە بـکەم. دوای ئەو قسـانە، وام هەسـتدەکرد کوڕی کـامەران بەدرخـانم، بـۆ ئەوەی بەرگـری لەو شـەڕەفەش بـکەم، هەمـوو هێـز و توانـای خـۆم خسـتە گەڕ و هەر ئـاواش کارمکرد. ئێستاش، بە وزەی ئەو پێداهەڵدان و شـەڕەفەی ئەوەوە ڕێچـکەی ژیـانم گرتـووە، پێشـم وایە گەر تـا ئەمـڕۆ لە ڕووی ئەخلاق و سیاسەتەوە لەسەر پێ مابمەوە، ئەوە لەسەر ئەو تەلقیـنە نەتەوەییەی کاك کامەران بەدرخـانە. گەر سـەرنج بـدەن، لەگەڵ

عەبدولڕەحمان لەسەر هەمان ڕێچکەداین، بەڵام تاکە جیاوازیمان ئەوەیە، ئەو لە مـن بە بەختتـر بـوو، چـونکە ئەو مردنەکەشـی شـەڕەفمەندانە بـوو، بۆیە گەر منیش شانسـم هەبێـت و لە ڕێـی خەڵکەکەم شەهید ببم، بـۆ مـن زۆر گەورەیـیە. عەبـدولڕەحمان ئەورۆ لەناو خەڵك وەك ئـاڵایەکی سـەرکەش دەشـەکێتەوە، ئەی گەورەترین شەڕەفیش هەر ئەوە نییە؟.

## موناقەشەکانی کۆلیژ

ئەوسـا، کـۆلێژی یاسـا لە ڕووی زانسـتییەوە ئاسـتێکی باشـی هەبـوو، بەڵام لە ڕووی کـارگێڕییەوە وەك کـۆلێژێکی پـۆلیس وابوو. ڕاگری کۆلیژ کەسێکی عەرەبی شامیی ماستاوچی بـوو و بەنـاوی جەمیـل بیلسـەر بـوو. ئەو سـەرباری پۆسـتەکەی، وانەی یاسـای دەوڵەتیشـی پێـدەگوتین. جەمیـل بیلسـەر، لەسـەردەمی ئەتـاتورك وانەکـانی زانکـۆی کۆکردبـۆوە و کردبـوویە پەرتووکێك، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ناوی عیسمەت ئینینۆی تێدا نەهێنابوو. دوای مردنی ئەتاتورك پەرتووکێکی دیکەی نووسـی، بەڵام ئەوجـارە نـاوی ئەتـاتورکی نەهێنـابوو، واتـا لە شـوێنی ئەتاتورك لە زۆر شوێن تەنیا ناوی عیسمەت پاشای هێنابوو.

هەڵبژاردن، بۆ کـۆمەڵەی قوتابیـانی کـۆلێژی یاسـا دەکـرا، تـا سـەرۆکێك بـۆ کـۆمەڵەکە هەڵبژێـرن. بەشـی کـارگێڕیی کـۆلێژ کێیان بە دڵ بوایە بۆ هەڵبژاردن ناویان لەسـەر تەختـە دەنووسـی، دواجـار هەر ئەویـش هەڵـدەبژێردرا، بەڵام مـن هـیچ کـات بە پێویستم نەزانـی ئەو مـافە مەدەنییەم بەکـار بهێـنم. لە کـۆلێژیش چەندان یـادەوەریی تـاڵ و شـیرینم هەیە، بەڵام لەنـاو هەموویـان دەمەوێ باسی دوو دانەیان بکەم:

مامۆستای یاسـای کارگێڕیمـان، سـدق سـامی ئۆنـار، لە پـۆل

وەك وانەيەك باسـی ڕێکخستنەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی دەکرد. ئەو دەیگوت: "عوسمانییەکان بە دوو شێواز دەستیان بەسەر زەویدا دەگرت: بەشێکیان لە ڕێگای جەنگ، بەشێکیشیان لەگەڵ سوپای ئەو گەلانەی خەڵکی خاکی دەستبەسەرداگیراو بوون، بۆ ئەمەش کوردستان و جەزائیری بە نموونە هێناوە؛ دوای باسکردنی یاڤووز سوڵتان سەلیم[1] و ئیدریسی بەدلیسی[2]، وتەکانی هێنایەوە سەر کورد؛" کورد گەلێکی بەهێز و ڕەقن، زۆر پەیوەستی دابونەریتەکانیانن، بۆیە، لە دێر زەمانەوە بەو شێوەیە درێژەیان بە بوونی خۆیان داوە؛ دوای یەکەمین جەنگی جیهان، بەشێك لەو برایە تورکانەمان، کە لە ئەورووپا مابوونەوە، هێناوە تورکیا و لە دیاربەکر نیشتەجێمان کردن. بەڵام، دوای ماوەیەکی کەم بوونە کورد و لە دەستمان دەرچوون". من وشەی لە دەستمان دەرچوونەکەم لە بیر نەکرد.

---

[1] سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٤٧٠ – ١٥٢٠) بە نۆیەمین سوڵتانی عوسمانییەکان دادەنرێت. لە ساڵی ١٥١٢ کودەتایەکی سەربازی بەسەر سوڵتان بەیازیدی دووەمی باوکی دەکا و لەسەر تەختی پادشایەتی دەیهێنێتە خوارەوە و خۆی دەبێتە دەچێتە شوێنەکەی. دوای هەشت ساڵ لە فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان لە ساڵی ١٥٢٠ بە شێرپەنجە کۆچی دوایی دەکات و، قانوونی سوڵتان سلێمانی کوڕی شوێنی دەگرێتەوە. لە سەردەمی ئەو سوڵتانە جەنگی چاڵدێران ڕوو دەدات. لە ترسی ئەوەی وەك خۆی بەرامبەر باوکی کردی، تا سلێمانی کوڕی کودەتای بەسەردا نەکات، چەند جارێك هەوڵی کوشتنی کوڕەکەشی دەدات، بەڵام لە هەوڵەکانی سەرکەوتوو نابێت. (وەرگێڕ).

[2] ئیدریسی بەدلیسی (١٤٥٢ – ١٥٢٠) سیاسەتمەدار و نووسەرێکی کوردە. لە سەردەمی یاڤووز سوڵتان سەلیم ڕۆڵێکی دیاری سیاسیی هەبووە لە ناوچە کوردییەکانی ناو جوگرافیای دەسەڵاتداریەتیی عوسمانی. خاوەنی نزیکەی ١٧ پەرتووکی نووسراو و ٣ بەرهەمی وەرگێڕدراوە. لەناویاندا چەند پەرتووکێکی پێهەڵدانی سوڵتانە عوسمانییەکانە. (وەرگێڕ).

كاتێك مامۆستا له‌ ده‌رس ده‌رچوو، ڕێگام پێ بڕی و چوومه‌ لای، ئه‌ویش گوتی: "بلێ كوڕم"، چونكه‌ ئه‌و مامۆستایه‌مان خوێكی هه‌بوو، دوای هه‌موو وانه‌كان یه‌كه‌م قوتابی كه‌ ڕێی پێ بگرتبا تا به‌ر ده‌رگای ژووره‌كه‌ی گوێی لێ ده‌گرت، له‌وێش بێ ئه‌وه‌ی تووڕه‌ بێت وه‌ڵامی پرسیاره‌كه‌ی ده‌داوه‌؛ ئه‌و ڕۆژه‌ منیش زوو ده‌ستپێشخه‌ریم كرد و یه‌كه‌م كه‌س خۆم گه‌یانده‌ لای. دوای كورتكردنه‌وه‌ی وانه‌ی ئه‌و ڕۆژه‌مان پرسه‌كه‌م هێنایه‌ سه‌ر وشه‌ی له‌ ده‌ست ده‌رچوونه‌كه‌ و گوتم: "مامۆستا تۆ گوتت بوونه‌ كورد و له‌ ده‌ستمان ده‌رچوون، به‌ڵام ئه‌و دوو وشه‌یه‌ له‌وێ زیاده‌ بوو، چونكه‌ ئه‌وه‌ی تۆ ده‌یڵێیت، به‌ مانای بزر بوون و به‌هه‌ده‌ر چوون دێت، ئایا ئێوه‌ كوردیش ئاوا ده‌بینن؟".
مامۆستا وه‌ستا: "كوڕم، تۆ خه‌ڵكی كوێی؟".
من: "خه‌ڵكی دیاربه‌كرم".
مامۆستاكه‌م: "ئا كوڕم به‌ چ بۆنه‌یه‌كه‌وه‌، چونكه‌ من دیاربه‌كر و خه‌ڵكه‌كه‌شی زۆر لام ئه‌زیز و خۆشه‌ویستن، دیاربه‌كر ناوه‌ندی كه‌لتووریی شارێكی مێژووییه‌، زۆر دۆستی ئه‌زیزی دیاربه‌كریم هه‌یه‌ وه‌ك كاك زیا گۆكالپ، سلێمان نازیف، عه‌لی ئه‌مین... جگه‌ له‌وه‌ سه‌عید پاشای باوكی سلێمان نه‌زیف زۆر قه‌دری هه‌یه‌ لای من. كوڕی خۆم دڵته‌نگ مه‌به‌، من ئه‌و وشه‌یه‌م به‌و مانایه‌ به‌كار نه‌هێنا".
من: "به‌ڵام مامۆستا تۆ كه‌ باسی ئه‌و پرسه‌تان كرد، براده‌رانی پۆله‌كه‌م ئه‌وانه‌ی ده‌یانزانی كوردم، دوای قسه‌كانی تۆ به‌ پێكه‌نینه‌وه‌ سه‌یری منیان ده‌كرد".
مامۆستاكه‌م: "ئا كوڕی خۆم من ئێوه‌م خۆش ده‌وێ".
وانه‌ی دواتر مامۆستا هاته‌ پۆل و سه‌یری ئێمه‌ی كرد و منی بینی. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی ئه‌و بابه‌ته‌ی پێشوو له‌ وانه‌كانمان تێپه‌ڕ ببوو،

بەڵام دیسان پرسەکەی هێنایەوە سەر کورد و کوردستان و گوتی: "لە جەنگی چاڵدێران و مەلازگرت[1] سەرکەوتووی جەنگ کورد بووە، جگە لەوەی شاری ئێدرنە لە جەنگی باڵکان بە هاوکاری هێزەکانی حەمیدییەی کوردی[2] کۆنترۆڵکراوە و بەر لە جەنگی سەربەخۆبوونیش، کورد سیمبولی ئازایەتی و مەردایەتی و ڕاستگۆیی بوونە، کاتێك باسی هەموو ئەوانەشی دەکرد بەردەوام چاوی لەسەر من بوو، وەك ئەوەی بیەوێت بڵێت، کوڕم ئەوەندە بەسە".

ڕۆژێك، لە تاقیکردنەوەی پزیشکیی هێلکاری ڕووداوێکم بەسەر هات، دەمەوێ لێرە ئەویش باس دەکەم.

مامۆستاکەم پرسیارەکانی لێ پرسیم، منیش بۆ وەڵامدانەوە خۆم ئامادەدەکرد. قوتابییەکەی پێش منیشی هێنابووە لای خۆی و تاقیکردنەوەی پێدەکرد. سەیرم کرد پرسیارەکان زۆر ئاسان بوون، دوای ئەوە دەستم کرد بە گوێگرتن لە مامۆستا و ئەو قوتابییەی تاقیکردنەوەی لەگەڵ دەکرا. ئەو پرسیارەی مامۆستاکەمان لەو قوتابییەی کرد بەو شێوەیە بوو: "کاتێك کەسێك گوللەیەکی بەردەکەوێ و بریندار دەبێ، چۆن دەزانی کە گوللەکە بەر کوێی کەوتووە و لە کوێی دەرچووە؟".

---

[1] جەنگی مەلازگرت لە ٢٦ تەباخی ١٠٧١ لە نێوان سەلجوقییەکان و ئیمپراتۆریەتی بیزانس ڕووی دا. لە جەنگەکە سەلجوقییەکان بە هاوکاریی چەند هێزێکی دیکەی هاوپەیمانیان بەسەر بیزانسەکاندا سەرکەوتن. بە پێی بەشێك لە بەڵگە مێژووییەکان، کوردیش بەشێك بوونە لەو هاوپەیمانیەتییە. (وەرگێڕ).

[2] هێزەکانی حەمیدییەی کوردی، لە ساڵی ١٨٩٠، بە فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و بەسەر پەرشتی زەکی پاشا، لە چەند عەشیرەتێکی کوردی پێك هێنرا. (وەرگێڕ).

قوتابییەکە ئەوەندە بە وردی وەڵامی پرسیارەکەی داوە، مامۆستاکە سەری سوڕما و گوتی: "کوڕم، تۆ ئەوانە لە کوێ فێر بووی؟". قوتابییەکە: "مامۆستا من ئەفسەر بووم و بەشداریی ئۆپەراسیۆنەکانی سەر دێرسیمم کرد و زۆرم کورد کوشت، لەوێوە ئەو وردەکارییانە دەزانم". قوتابییەکە هێشتا قسەکەی تەواو نەکرد، بە شەق و پێلەقە کەوتمە سەری. مامۆستا واقی وڕمابوو، هەندێك برادەری کوردم لەبەر دەرگا بوون، ئەوانیش هاتنە ژوورەوە، دوای ئەو هەمـوو هەوڵەی مامۆستا بۆ ڕزگارکردنی قوتابییەکە، بەڵام وازم لێنەهێنا تا شەل و کوتم کرد. وەلێ سەیر ئەوە بوو، دواتر مامۆستاکە لەسەر ئەو شەڕە لە بەشی کارگێڕی زانکۆ لای منی گرتبوو، بۆیە بێ ئەوەی هیچم لێ بپرسێ، بە نمرەیەکی ئاسایی منی لە وانەکە دەرچواندبوو.

## ڕێستۆرانتی فەرمانبەر و کرێکارانی دیجلە

ساڵی ١٩٤٩، پرۆفیسۆر فەخرەدین کەریم گۆکای، سەرۆکی شارەوانی و پارێزگاری ئیستانبووڵ بوو. ڕۆژێك بەڕێوەبەری قەڵەمی نهێنیی پارێزگار، لە بەشە ناوخۆیی هاتە لام و پێی گوتم پارێزگار بۆ کۆبوونەوەیەك بانگهێشتی کردووی. پارێزگار جەهەپەیەکی زۆر تۆخ بوو، ملی لەبەر ملی پارتی دیموکرات نابوو، مەبەستی پارێزگار پروپاگەندە بوو. چوومە لای و زۆر بە گەرمی و مێرانە پێشوازیی لێ کردم، زۆری بەسەردا هەڵگوتم و داوایەکی ئاواشی لێ کردم: "کوڕم، ماوەیەکی زۆرە لە ئیستانبووڵ لەولا و ئەملا دەپرسین و لێکۆڵینەوە دەکەین، گەیشتووینە ئەو باوەڕەی ئەو ئیشەی ئێمە دەمانەوێت، تۆ دەتوانی بە باشی بیکەی. چونکە دەمانەوێت ڕۆژانە نان بدەینە ٣٠٠٠ کەس، بۆ ئەمەش شوێن و ئاو و کارەبا و ڕەژوو لەسەر

ئێمــە. جــگە لەوە، بــۆ فــراڤین، ٩٠ کرێکــاری پارێزگــاش لە خزمەتگوزارییەکان هاوکارتان دەبێت. بەرامبەر ئەو هاوکارییەیان بێ بەرامبەر خواردن بدە ئەو نـۆهەت کرێکـارە. شـوێنی دیـاری کراویش بـۆ کـارەکە ناوەنـدی وەرزشـی ئیسـتانبووڵ دەبێـت لە باخچەی ئامادەییەکە". دوای چۆنیەتی کارەکە و داواکارییەکـانی ئەوان، پارێزگار لێی پرسیم، سێ قاپ خواردن و پارچەیەك نـان نـرخەکەی بە چەنـد ڕادەوسـتێت؟، چـونکە داوای وەڵامێکـی بەپەلەیان لێ کردم، لە مـاوەیەکی کورتـدا. گەڕامەوە و حەق و حیسابێکم کرد، بینـیم ئەو داواکـارییەی پارێزگـار بـۆ خـواردنی هەر کەسـێك ٤٥ قـروش ڕادەوەسـتێت، بیرمکـردەوە گەر پێـنج قروشـیش سـوودی خـۆمی بـاوێمە سـەر نـرخەکەی دەبـووە ٥٠ قـروش. وەڵامــم دانەوە و نـرخەکەیم پێگـوتن، بەڵام پارێزگـار گوتی سـوودەکەی تـۆ کەمە، بـۆیە ٥ قروشـیش لەلایەن منەوە، بۆیە بە ٥٥ قروش پێك هاتین.

هەمــان ڕۆژ، تەواوی ســـتافەکەم ڕێکخســـت. ٥٠٠ ســینی سێرڤسی خواردن دانـانم کـڕی، ئینجـا وردەوارەکەی دیـکە ئێـو حیســـابی بـــکەن. مەنجەڵـــی گەورەم لە لای پاقرچییەکـــان دروستکرد، ئاگردان و مێز و کورسی ڕێکخران. سێ پۆلیسـم لە ژووری پۆلیسەکانی پارێزگـا لەبەردەم ڕێسـتۆرانتەکە دانـا. لەپـاڵ هەر یەکێکیشـیان کەسـێکم بـۆ بلیتبـڕین دانـا، ئەوەی بلیـتەکەی وەردەگرت دەچـوو سـینیی خـواردنەکەی وەردەگـرت، چـونکە هەرکەسەو خۆی خزمەتی خـۆی دەکـرد، واتـا سـێڵف سێرڤس بوو. خواردنەکـان بە دەسـتووری تابلـدۆت، واتـا بـێ هەڵبـژاردن بوو. ئەو نەوەد کرێکارەی دەهاتنە لامـان کاریـان هەڵگـرتنەوەی قاپ و قاچاغ و سڕینەوەی مێزەکان و ئاودانان بوو بۆ میوانەکان. کـارەکە بەشـێوەیەك کەوتبـووە سـەر سـکەی خـۆی، بەر لەوەی

ماوەی پشووی نیوەڕۆ تەواو بێت، سێ هەزار کەس فراڤینی دەخوارد، لە ڕاستیدا هەندێك ڕۆژ ژمارەکە لەوەندەش زیاتر دەبوو.

ئەو مۆرەی لەسەر فاتوورەکانمان دەدا تا ئێستاش وەك یادگارییەك لای خۆم هەڵمگرتووە. نووسراوی سەریشی بەو شێوەیە بوو: "ڕێستۆرانتی فەرمانبەر و کرێکارانی دیجلە". کارەکەمان تا هەڵبژاردنەکانی ١٩٥٠ درێژەی کێشا، دوای هەڵبژاردنیش چەند مانگێك خواردنمان دابەشکرد. ڕۆژێك فەخرەدین کەریم منی بانگ کرد و بە دڵتەنگییەوە گوتی: "ئیدی ناتوانن لە کارەکەتان بەردەوام بن". ئینجا بە ئاهێکەوە گوتی: "کوڕم چ بکەین، ئەو کرێکار و فەرمانبەرانەی خواردنمان دەدانێ، لە بری ئێمە، دەنگیان بە پارتی دیموکرات دا، با بە خۆشی دیموکراسی بەکاربهێنن، بەڵام تۆش ببە شاهید، چونکە پەشیمان دەبنەوە".

تا ئێستاش وتەکانیم لەبیرە، چونکە هەر ئەو فەرمانبەر و کرێکارانە بوونە بینەری ڕووخانی پارتی دیموکرات و لە سێدارەدانی سەرکردەکانی... دوای تەواوبوونی کارەکەش، کەلوپەلەکانم زۆر هەرزان فرۆشت.

بەمشێوەیە ئەو کارەش تەواو بوو...

## بەشە ناوخۆیی تۆرۆسی کچان

برادەرێکی بە ڕەگەز عەرەبی مێرسینیم هەبوو، ناوی نزار بوو. کەسێکی مێبازی دەوڵەمەند بوو، قوتابی کۆلێژی ئەدەبیات بوو، ئێستا نازناوەکەیم بیر نەماوە. نزار هەر بۆ زەوقی خۆی، لە پشت سینەما توران، کە ئەوڕۆ دەکەوێتە پشت بەشەناوخۆیی سیتە، خانوویەکی کۆنی لە دار دروستکراوی کردبووە بەشە ناوخۆیی

کچان، کە ٧٠ تەختەی خەوتنی لێ بوو، بەڵام لەبەر بێ خەمی نزار و بێ سەر و بەریی کچەکان، بەشە ناوخۆییەکە کەلکی پڕابوو. نزار هاتە لام و گوتی: "دەمەوێ بەشە ناوخۆییەکە بفرۆشم، پارەی پێشینیشم ناوێت، بە چ نرخێکی تۆش بتەوێت من ڕازیمە، منیش قبووڵمکرد و بەشە ناوخۆییەکەم لێ کڕی".

لەگەڵ کچەکان دەستم بە ڕێکارێکی توندی ژیان کرد لە بەشە ناوخۆییەکە. ئەوانەی پێشتر پارەی مانگانەیان نەدەدا، وامکرد مانگانە پارە بدەن، ئەوانەی ڕووبەرووم وەستانەوە دەرمکردن، لە ماوەی چوار پێنج مانگدا بەشە ناوخۆییەکە هاتەوە سەر سکە، بەڵام هەندێك لە کچەکان بە تەمەن لە من گەورەتر بوون و دەمێك بوو لەوێ بوون، ئەوان لەسەر ڕێگای خراپ دەڕۆیشتن، بۆیە زۆریان سەر ئێشە بۆ دروست کردم. ئەوسا برادەرێکم هەبوو ناوی عەبدولڕەزاق ئایسان بوو، ئێستا دکتۆری ددانە. ئەوم کردە بەڕێوەبەری ئەوێ، دیسان سەرکەوتوو نەبووم، چونکە بینیم دکتۆریشمان خەریکە خووی ئەوان دەگرێ. کەوتبوومە ناو قوڕێك بە ناموسێکی پاکەوە دەرچوون لێی زەحمەت بوو، بۆیە، بە ناچاری بەشە ناوخۆییەکەم داخست، بەڵام بڕیاری داخستنی بەشە ناوخۆییەکە زۆر بە کەیفی جەنابی دکتۆری بەڕێوەبەرمان نەبوو. بەڵام تێمگەیاند گەر ئاوا بڕوا هەردووکمان ڕەزیل و ڕیسوا دەبین.

### دیجلە کایناک

ساڵی ١٩٤٨، زوڵم و ئەشکەنجەی سەر گەلی کورد زیادی کردبوو. دوای دووەمین جەنگی جیهانی، وڵاتانی براوە، گەر بە ناویش بێت، داوای بە دیموکراسی بوونی تورکیایان لە ئەنقەرە دەکرد. هەندێکجاریش بۆ ئەمە فەرمانیان بەسەر دەسەڵاتدارانی

تورکیا دەکرد. ئەو داوا و فەرمانە بەلای تورکەوە بە مانای دۆڕاویی جەنگ لێکدەدراوە، کەچی ئێستاش باوەڕناکەم، چۆن دوای ٢٥ ساڵ لە زەعامەتی نەتەوەیی، عیسمەت ئینۆنۆ دەستە خوێناوییەکەی شوشت و گەر بە نابەدڵیش بێت، بووە دیموکرات.

لە وتارێکمدا ئەو بە دیموکراتی بوونەم بە کەسێکی نەدیتکە چواندبوو، کە لە ئاهەنگێکی بورژوازی چاکەت و پانتۆڵ لەبەر دەکات، وەك ئەوەی لەناو فیلمەکاندا هەیە. زۆری پێنەچوو لەسەر ئەو نووسینەم لە دادگای ڕۆژنامەوانی ئیستانبووڵ، بە تۆمەتی ناوزڕاندنی سەرۆککۆمار داوایەکیان لەسەر تۆمارکردم. هەمان کات لە وتارەکەم مەبەستم ئەو ئۆپۆزسیۆنەش بوو کە وەك یاریکەرێك لەو یارییە دیموکراتیۆکەدا هیچیان لەدەست نەدەهات. جا بەتۆمەتی ئەوەی لە ئۆپەراسیۆنەکانی دژی دێرسیم دژ بە خەڵکی شارەکە نەرم بووە، بە فەرمانی ئەتاتورك، جەلال بەیاریان هێنایە شوێنی عیسمەت ئینۆنۆ، کەچی ئێستا گوایە جەلال بەیار لە پارتی دیموکراتە و دەیەوێ ببێتە کەسێکی دیموکراتخواز.

بۆیە، دەمەوێ لێرە نموونەیەك لە هێمای دیموکراسییەکەیتان بۆ باس بکەم: لەسەردەمی سەرۆکوەزیرایەتیی خۆیدا، عسمەت ئینۆنۆ، تەلەگرافێکی ئاوا بۆ فەرماندەی پێشڕەویی سوپا لە دێرسیم دەنێرێت: "عەبدوڵڵا پاشا؛ فەرماندەی سوپای ٣ و فەرماندەی سەرپەرشتیاری جوولانەوەکان، کەس لە دێرسیم بە زیندوویی نەمێنێت". جا ئەو کەسە نا موبارەکە لە تورکیا دەبێتە پیاوی یەکەمی دیموکراسی.

دووەم ؛ فوئاد کۆپرووڵوو، بە درۆ و دەلەسەی تورك و تورکیا، ماوەیەکی زۆر بوو بە زانایان دادەنا. ئەو کابرایە

لەسەردەمی چەند سولتانێك سەرووەزیرانیی کردووە، بە بنەچە سربی بوو. ئەو لەو منداڵە کریستیانانە بوو کە کاتی خۆی عوسمانییەکان هەڵیاندەبژاردن و لای خۆیان پەروەردەیان دەکردن، کەچی دەیگوت من لە نەوەی مەهمەت پاشای کۆپروولوومە. جا ئەوە و منداڵە هاوشێوەکانی، خۆیان لە تورك و کوردی خەڵکی ئەنادۆڵ بە گەورەتر دەزانی.

وەك یاریزانێکی تازەی ئەو یارییە، عەدنان مەندەرێس تازە دەرکەوتبوو، بەڵام بێئاگا کە دوارۆژێکی پڕ کارەسات چاوەڕێی دەکات. کەسێکی نیەت باش بوو، بەڵام کەلەپچەکراوی دەست گورگەکانی دیکە بوو. چەند جارێك لەگەڵ ئەو یەکدیمان دیت. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ موکەرەم سارۆڵ و جیهات بابان، هاتنە بەشە ناوخۆیی فوراتی قوتابیان. داوای لێ کردم بچمە ناو پارتی دیموکراتی، منیش پێم گوتن: "بەڕێزم منیش وەکو هەموو ئەوانەی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی باشوورن[1] ڕقم لە جەهەپە دەبێتەوە، ئەو دژبەریەشمان لەگەڵیان، وەك دوژمنداریی خوێنییە لە ئیسلام، بۆیە، من و هەموو ئەو بە ناموسانەی خەڵکی ڕۆژهەڵاتن، ئەرکی سەرشانمان ڕووخاندنی جەهەپەیە، بۆ ئەوەش چیمان لەدەستبێت بۆ پارتەکەی ئێوە دەیکەین، بەڵام من ناتوانم پەیوەندیم لەگەڵ هیچ پارتێك هەبێ، چونکە بە باوەڕی من پارتەکانیش وەکو ئایینەکان یان مەزهەبەکانن، وەك چۆن مرۆڤێك لە پێناو بەرژەوەندیی تایبەتی

---

[1] مەبەستی باکووری کوردستانە، چونکە تا ئێستاش لە تورکیا بە ناوچە کوردییەکان دەگوترێ باشووری ڕۆژهەڵات، مەبەست لێی شوێنی جوگرافی کوردە لەسەر نەخشەی تورکیا، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە. (وەرگێڕ).

زوو زوو ئایین ناگۆڕێت، بە بۆچوونی منیش دەبێ ئەوە بۆ پارتی سیاسیش وابێت. من گەنجم و کێ نالێ لە نیشتمانەکەم چەندان پارتی مرۆیی دیکە دروست نابێت. پارتی دیموکراتی ئێوە دوا پارتی ئەو ڕێگایە نییە، بەڵام لەوەیە دەستپێکێك بێت. لە دیموکراسیشدا پێشبڕکێ و ڕکابەری بنەمایەکی سەرەکییە، پەنا بە خوا ئێوە بە زوویی پێشدەکەون و ڕابەرایەتییەکەش نادەنە کەسی دیکە، ئەوسا کەسانی وەکو منیش بە شێوەیەکی خۆڕسکی لەناو پارتەکەی ئێوە کۆ دەبنەوە". دواتر لەگەڵ قوتابییەکانی بەشە ناوخۆییەکەمان نانێکمان خوارد، ئینجا بە درۆ بێ یان بە ڕاستی، عەدنان مەندەرێس زۆر ڕێزی گرتم.

ڕۆژی عەرەفەی هەڵبژاردنی ١٩٤٦ بوو، بە ناوی پارتی دیموکرات، سەرجەم کارەکانی ئافیشە ماوەکانی شەقامی یەنی قاپی و بەیازیت و تۆپقاپەم لە ئەستۆ گرت. لە هەڵبژاردنەکە، مارشاڵ فەوزی چاکماکیش وەك بەربژێری سەربەخۆ بەشداریی هەڵبژاردنی دەکرد؛ پیاوەکانی هاتنە لام و داوایان کرد تا پیاوەکانم، لە ڕۆژی هەڵبژاردن لەسەر سندووق مارشاڵ بپارێزن و بەڵگەنامەیەکیشیان پێدام تا لەسەر سندووقەکان وەك نوێنەر ئەرکەکە لە ئەستۆ بگرم. دوای ئەوە بەپەلە چووم و ناوی قوتابییە دیموکراتەکانی بەشە ناوخۆییەکەشم، وەك چاودێری سەر سندووق دایە کۆمسیۆنی هەڵبژاردن.

بۆ فراڤین، بە قەد پێویستی ژمارەی چاودێرەکان، خواردنم نارده سەر سندووقەکان، لەگەڵ چاودێرەکانی ئێمە خواردنم بۆ جەهەپەیەکانیش نارد. ئۆتۆمبێلە تاکسییە جوان و تایبەتەکەی ئەندازیاری باڵای کشتوکاڵ، کاك زیای خاڵی خێزانم وەرگرت. ئۆتۆمبێلەکە ئەوسا لە ئیستانبوڵ زۆر جوان و تاك بوو. تا دەمژمێر پێنج بەسەر ناوەندەکانی دەنگداندا گەڕام و

ورەم بە چاودێرەکـان دەدا. دوای کـردنەوە و هەژمـارکردنی دەنگەکان، پـارتی دیمـوکرات و مارشـاڵ، دەنگێکـی چاوەڕوان نەکراوی زۆریان هێنا. تەنیـا لە نـاوچەی هەڵبژاردنـی ئێمەش نـا، بەڵکـو لە تەواوی ئیسـتانبوول. لە هەمـوو لایەك ئاهەنگەکـانی خۆشـحاڵی دەربـڕین دەسـتی پـێ کـرد، بەڵام بـاوکی ئەردال ئینۆنوی[١] سەرکردەی ئێستای (پارتی سۆشیاڵ دیمـوکراتی گەل - SHP)[٢]، گـوایە بـووە کەسـێکی دیمـوکرات، بەڵام بەپێـی یاسـای هەڵبژاردنـی عیسـمەت پاشـا، بڕیـاردرا، ئەو بلیتـی هەڵبژاردنـانەی سـندووقەکان، کە گـوایە بەقەڵەمـی ڕەسـاس هەڵبژاردنیان پێ کراوە، هەمووی بسووتێندرێت. هەر ئاواش کـرا و ئەو بلیتـانەی هەڵبـژاردن، لەکـاتی سـووتاندنیان لە ناوچەکـانی ئێت یەماز و کۆجامستەفا پاشا و چەند ناوچەیەکی دیکە، بـوونە هۆی ئاگر تێبەربوونی چەند خانووێکی داریـش. دوای دوو ڕۆژ ئەنجامەکـانی هەڵبـژاردن ڕاگەیەنـدرا و لە هەمـان ئەو ناوچـانە و تەواوی ئیسـتانبووڵ و بە جیـاوازیەکی زۆر بەرچـاویش، جەهەپە هەڵبژاردنەکەی بردەوە.

ساڵی ١٩٤١، لەگەڵ چەند بـرادەرێکم، بەرامـبەر ئەو زوڵـم و

---

[١] ئەردال ئینۆنۆ (١٩٢٦ – ٢٠٠٧) سیاسـەتمەدارێکی بـە ڕەگـەز کـوردە و کـوڕی عیسـمەت ئینـۆنـۆی یەکـەم سـەرۆکوەزیرانی تورکیایە. ئـەردال بـۆ ماوەی ٣٩ ڕۆژسەرۆکوەزیرانی تورکیا بووە بە وەکالەت، بۆ ماوە دوو ساڵ جێگری سەرۆکوەزیران و کەمتر لـە سـاڵێکیش وەزیـری دەرەوەی تورکیـا بووە. لە نێوان ساڵانی (١٩٨٦ – ١٩٩٣) سـەرۆکی گشـتیی پـارتی سۆشـیاڵ دیموکراتی گەل بووە. (وەرگێڕ).

[٢] پارتی سۆشیاڵ دیموکراتی گـەل، سـاڵی ١٩٨٥، دوای داخسـتنی پـارتی گەلی کۆماری، دامەزرا. ساڵی ١٩٩٥، دوای ئەوەی جەهەپە جارێکی دیکە وەکو پارتێکی سیاسی دەسـتی بـە چـالاکیی سیاسـی کـردەوە، سـەهەپەش لەگەڵ ئەو پارتە یەکیان گرتەوە. (وەرگێڕ).

کــردەوە نامرۆڤــانەیەی دەرحەق بە کــورد دەکــرا و لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەو هەڵسوکەوتە بەرانبەر ئاژەڵانیش نـاکرێ، لە ژێـر کـاریگەریی تونـدوتیژیی حکـوومەت و ئەو وێرانکـارییەی ناوچە کوردییەکـانی گرتبـۆوە، کۆمیتەیەکمـان دامەزرانـد، بەڵام ئەو کـۆمیتەیە ئامـانجی دوژمنـداریی تـورك و عەرەب و عەجەم نەبوو، بەڵکو بەر لە هەموو شتێك ئامانجمـان ئەوەبـوو دەسـەڵاتی تورکی فێـرە هەڵسـوکەوتی مرۆڤـانە بکەیـن. ڕۆژنـامەی (دیجـلە کاینای)ش بەهەمان ئامانجەوە دەرچوو. لە بەشەناوخۆیی دیجـلە، حوسێن دیکیجی دیاربەکری و تەلعەت سایگن و ڤەلی دۆڵووی بەدلیسـی دانیشـتین و بڕیـاری دەرکردنـی ڕۆژنامەکەمـان دا. ئەو برادەرانە کەسانی نیەت پاک و دیموکرات و کورد بوون، بۆیە، بەرامبەر بەو تـاوانەی دژی کـورد دەکـرا، دڵیـان پـڕ بـوو، بەڵام هەرسـێکیان کەم دەرامەت و قوتـابی بـوون. مـن پـارەم هەبـوو، بۆیـە، هەمـوو تواناکـانی خـۆم و ڕاسـتگۆیی ئەوانمـان لە پێنـاو دەرکردنـــی ڕۆژنـــامەکە خســـتەگەڕ. ئەو هەنگاوەمـــان بە یەکەم پێنگاڤی هێنانە زمـانی کێشـەکانی کـورد دادەنـدرێ لەسـەردەمی کۆمار.

بەرواری یـازدەی تەمـووز، لە سـاڵوەگەڕی بڵاوکــردنەوەی وتــارەکەی عیســـمەت ئینۆنـــو ڕۆژنامەکەمـــان بڵاوکـــردەوە. بەناونیشانی (بۆ ئەو ڕێگـایە دەگرینـە بەر) وتـارێکم نووسـی کە سەرجەم کێشەکانی ڕۆژهەڵات و باشـووری ڕۆژهەڵاتـم تێـدا بە کورتی باس کردبوو. ئەوسا بە ڕۆژهەڵاتیـان دەگـوت (شـارق)، لەگەڵ ئەوەی وشەی ڕۆژهەڵاتیش داهێنانی بیـری داگیرکـارییە، بەڵام ئەمڕۆ دەسەڵاتدارەکان لەو وشەیەش بێزار بـووینە، چـونکە تیۆری پەرتکە و زاڵبەی ئیمپریالیزمیان زۆر بەرەو پێشـەوە بـرد و دەسـتیان لە زیـاتر خـاپوور کردنـی ڕۆژهەڵات و باشــووری

ڕۆژهەڵات نەپاراست، ئێمەش منداڵی ئەو ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات و ئەنادۆڵە بووین.

لە ئاستی خۆمان هەموو شتێك تێدەگەیشتین، بۆیە، بە نامووس و دەرامەتی خۆمان بە شێوەیەکی ئاشکرا دەمانویست ڕۆژنامەکەمان بڵاوبکەینەوە. گەر بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بۆ کۆلێکشنی ڕۆژنامەکەمان بکرێت، لەو باوەڕەدام نموونەیەکی زیندوویان لەو بارەیەوە دەستبکەوێت.

ڕۆژنامەی (دیجلە کاینای)، بۆ یەکەمجار زۆر نهێنی کۆمەڵکوژی زیلان[1] و شۆڕشی شێخ سەعید و جووڵانەوەی ئاگری و ساسۆن و دێرسیم و کەرەکۆپروو و ڕووداوەکانی سی و سێی بڵاوکردەوە. جگە لەوەی بەردەوام باسی ژمارە لە بن نەهاتووەکانی ڕاگوێزانی کورد و ڕووداوە بچووکەکانی دیکەشمان کرد. دەمەوێ بڵێم کە ئەحمەد عاریفی برادەرم، دوای بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەی ئێمە، شیعرەکەی بەناوی سی و سێ فیشەك نووسی، بۆیە، ئەحمەد عاریف بەو شیعرەی، کە وەستایانە کاری لەسەر ئەخلاقی مرۆڤەکان کرد، ئێمەی زۆر گەورە کرد.

## نەیزەن تەوفیق

بە بنەچە چەرکەزە، وەك جەمال ئەفەندی کوڕە مامی، کە لە بەشەناوخۆیی فورات چێشتلێنەرم بوو، ئەویش زۆر حەزی لە

---

[1] کۆمەڵکوژی زیلان لە تەمووزی ۱۹۳۰ لەلایەن فەیلەقی نۆی سوپا کرا. کۆمەڵکوژییەکە لەناوچەی زیلانی سەر بە قەزای ئەرجیشی شاری وان ڕوویدا، کە نزیکەی ۱۵۰۰۰ کورد لەو کۆمەڵکوژییەدا شەهید کران. (وەرگێڕ).

خـواردنەوە بـوو، بـۆیە دەڵـێم چەرکەز بـوو، چـونکە لە زاری نەیزەنەوە نەك نەتەوەپەروەریـیەکەی بەڵکـو گـوێگرتن لە هەستە مرۆڤایەتییەکەشی ئاسان نەبوو. برادەرایەتیم لەگەڵ ئیحسـان ئەدا، لە ئامــادەیی ئەدەنەوە بەردەوام بــوو، ئەو لە دوورگەی ڕۆدۆس دەژیا، بەڵام زۆر نزیك بوو لە نەیزەن، جگە لەوەی مـاوەیەك لە ڕۆژنـامەی ڤەتەن بەڕێـوەبەری نووسـین بـوو، دواتـریش بـووە پەرلەمانتار لەسەر شاری هاتای. بڕوانامەی کۆلێژی یاسای هەبوو، بەڵام هـیچ کـات بەکـاری نەهێنـا. ئیحسـان زوو زوو دەهـاتە بەشەناوخۆیی فـورات، منیش بەپێـی دەرامەتـی خـۆم هاوکـاریم دەکرد. ڕۆژێك منی بە نەیزەن تەوفیق ناساند، کە لە میوانخـانەی مەحموودیە دەماوە.

نەیزەن بەسەرخۆشی و چاوە مەخمـوورەکەی بە سـەیرکردنی من، "هەتیو تۆ کوردی؟" منیش بە "بەڵـێ" وەڵامـداوە... "مـادەم وایە وەرە دانیشە". یانی گەر کورد نەبووبام نەیدەگوت دانیشە.

میوانخــانەکە دەتگــوت گــووە، قەرەوێڵەیەکـــی بە شـــین بۆیەکراوی کـۆن، یاتـاغێکی تـا بلێـی خراپـی لەسـەر بـوو، دوو کورسی خراپی شکاو، لەسەر مێزێکی بچووکیش دۆلـکەیەك و بەرداخێکی کەسکی کاڵ دانـدرابوون. دانیشـتم، بەڵام ئەو داڵـغە بـردییەوە و قسـەی نەکـرد، دواتـر ڕووی لە مـن کـرد و "تـۆش وەکـو ئیحسـان کەری؟" لەبەر ئەوەی دەمزانـی خـووی چـۆنە، گـوتم: "بەڵـێ". ئەویـش گـوتی: "باشـە"، یـانی کەراتیـیەکەمم قبوولکردبوو؛ بۆیە وەڵامەکەی پـێ خۆشـبوو. دوای ئەو دیـدارە زوو زوو دەچوومە سەردانی، تەبعەن لەگەڵ ئیحسـان. بەڵام قەت نەبـوو لە شـوێنی پیاوانمـان دانـێ و قسـەمان لەگەڵ بکـا، هەندێکجار بە تەبیعاتە جوانە هەمیشەییەکەی یەکێکی جنێوبـاران دەکـرد، هەنـدێکجاریش گـاڵتەی خۆشـی دەکـرد، منیش لێـرە

هەندێك لەو گاڵتانەی دەنووسمەوە کە بۆ من بووەتە یادگاری.

خەڵکی دێرینی ئیستانبووڵ، ڕێستورانتی پاندەلی، لە ئیمۆنونو، پێدەزانن، کە دەکەوێتە تۆزێك ئەولاتری بازاری میسری، ناوی شوێنەکە لە ناوی خاوەنەکەیەوە وەرگیرابوو. تەواوی ئەدیب و شاعیرانی ئیستانبووڵ و ئەنقەرە و تورکیا لەوێ یەکدییان دەدیت، حەددی من نییە، وەلێ منیش دەچووم. پاندەلی ئەفەندی دەرچووی قوتابخانەی هەیبەلیائادای ڕووم ئۆرتۆدۆکسی بوو، تورکی و یۆنانی و فەڕەنسیی باش دەزانی، لە پاڵ ئەوە کەسێکی نوکتەچی و زیرەك بوو، کەسێك گەر دوو جار چووبا ڕێستورانتەکەی ئەخلاق و کەلتوور و دڵ و دەروونی دەخوێندەوە. ئەوەی دەچووە ئەوێش داوای خواردن و خواردنەوەیان نەدەکرد، چونکە پاندەلی سەیری دەموچاوی دەکردن و دەیزانی چی بۆ سەر مێزەکانیان دەنێرێ. بەیانیان خۆی دەچووە بازاڕی میسری و بێ ئەوەی سەیری نرخەکان بکات، باشترین ماسی و گۆشتی دەکڕی، ماسی فرۆشەکان و قەسابەکانیش لەبەر ئەوەی تەبیعاتی ئەویان دەزانی، بۆیە باشترین بەرهەمەکانی خۆیان بۆ وەستا پاندەلی هەڵدەگرت.

پاندەلی بەردەوام لەسەر پێ لە پشت ئەو ساردەکەرەوە درێژە بە جام دروستکراوە دەوەستا کە لە شوێنەکەیدا هەبوو. بەردەوامیش لەناو بەرداخێکی تایبەت عارەقە ڕاکیەکەی وەك شیر لەبەردەمی نەدەبڕا، بەپێی ئاستی ڕۆشنبیریی میوانەکانی، قسە و سوحبەتی لەگەڵیان دەکرد. ئەوسا حەسەن عەلی یوجەل، باوکی جان یوجەلی دۆستم، هەم شاعیر و هەمیش وەزیری پەروەردە بوو، لە هەمان کات موشتەری پاندەلیش بوو.

وەستا پاندەلی، نەیزەن تەوفیقی زۆر خۆش دەویست. بۆئەوەی بێتە ڕێستۆرانتەکەی بە چەندان کەسی گوتبوو تا

بیهێنن. ڕۆژێك منیش ویستم ببمە پردی نێوانیان، بۆیە بە نەیزەنم گوت: "بۆ نایەی سەرێك لەو ڕێستۆرانتە بدەین؟". ئەویش ئاوا وەڵامی دامەوە: "ئەو کافرانە بگێ و وەلیان بکە، موشتەرییەکانی وەکو گوو وان، من هەر نامەوێ بشچمە ئەوێ". منیش هەمان ئەو قسانەم بۆ پاندەلی گێڕاوە و بە خەمناکییەوە گوتی: "ڕاست دەکات، چی بکەین قەدەر ئێمەی کردووەتە چاودێری مێز و کورسی". بەڵام سەرەڕای ئەوە، وەستا پاندەلی ڕۆژێك کەیفی خۆشبوو و لەگەڵ حەسەن عەلی یوجەل قسەی دەکرد، لەناو قسەکانی گوتی: "کاك حەسەن بە هۆی ئەوەی دەستت دەڕوا، ئەرکی تۆیە نەیزەن تەوفیق لە ژیانێکی ئاوا سەفیلانە دەربهێنی" حەسەن عەلی لە وەڵامدا: "وەستا واز لەو سەرسەرییەی بهێنە، سەرخۆشێکە بۆ خۆی، ئەو خوێڕیە نابێتە پیاو". لەبەر ئەوەی خۆشی دەویستم ئەوانەی بۆ باس دەکردم. ئەوسا بەشەناوخۆیی قوتابیانی فوراتم هەبوو، منیش زۆر بە وردی کەرستەکانی خواردنم بۆ بەشە ناوخۆیی دەکڕی، بۆیە، لای دووکانداڕەکان، ناوم بە پاندەلی ڕۆیشتبوو؛ ئەوەش هۆیەک بوو تا لەیەکدی نزیکبینەوە. هێنام و بردم کەم و زۆر، گفتوگۆکەی نێوان وەستا پاندەلی و حەسەن عەلیم بە نەیزەنی گوت، ئەویش وەك هەموو کات سەرخۆش و لە کەیف و سەفای خۆی بوو، بۆیە گوتی: "یاااا".

لە سەردەمی سوڵتان حەمیدەوە، نەیزەن، مانگانە پێنج لیرەی زێڕی لە شارەوانیی ئیستانبوول وەردەگرت، دوای گۆڕانی سەردەم، گوایە وڵات بوویتە کۆمار، لە بری لیرەی زێڕ پێنج لیرەی کاغەزیان دەدا نەیزەن، بەڵام ئەو حەزی لە پارە نەدەکرد و پارەشی هەڵنەدەگرت، بۆیە دەیگوت: "ئەو گووە بۆ ئەوە نییە بیخەیتە نێو گیرفانت، بۆیە پێویستە هەر کە هاتە دەستت

ڕاستەوخۆ خەرجی بکەیت". ئیدی بۆیە ئەو پێنج لیرەیەی ببوە کاغەز، سێ چوار مانگ جارێك کە بیری هاتباوە دەچووە لای ژمێریاری شارەوانی و وەری دەگرت. جارێك دەچێ پارەکەی وەرگرێ، بەڵام فەرمانبەرەکان بە ڕەقی پێی دەڵێن: "بەڕێزم ئیدی مووچەکەت نەماوە".

تا کۆتایی هاتنی سەردەمی ئەتاتورك و ئینۆنو، پارێزگاری ئیستانبووڵ و ئەنقەرە و ئیزمیر، بەبێ هەڵبژاردن سەرۆکایەتیی شارەوانیان بەڕێوە دەبرد. دکتۆر لوتفی کردار، پارێزگاری ئیستانبووڵ و سەرۆکی شارەوانی، کاتێك وردبینیی بوودجە دەکات، ئەو مووچەیەی نەیزەنی دەکەوێتە بەرچاو و دەبینێ بە بریاری سەردەمی پادشایەتی مووچەیەکی لەو شێوە دراوە بە نەیزەن، بۆیە پارێزگار دەڵێ: "چۆن دەبێ لەسەردەمی کۆمار شتێکی ئاوا هەبێت، ئەوە هی سەردەمی پادشایە نەك کۆمار"، بۆیە مووچەکەی دەبڕن. لەبەر ئەوە نەیزەن لە لوتفی کردار تووڕە بوو. ڕۆژێك بەرامبەر پارکی فاتیح، کاتێك لە مەیخانەیەك دانیشتووە، گوێیان لە دەنگێکی سەیر و زۆر دەبێت، دێتە دەرەوە و دەبینن ئینۆنۆی سەرۆکی کۆمار بەویندا تێپەڕ دەبێت، بۆیە مانتۆڕ و ئۆتۆمبێلەکان بەیەکەوە هۆڕین لێدەدەن، بە ڕێکەوت بەهۆی قەرەباڵغی شوێنەکە، ئۆتۆمبێلەکەی ئینۆنۆ لەبەردەم مەیخانەکە دەوەستێ، نەیزەنیش بە چاوە مەخموورەکەی سەیری ناو ئۆتۆمبێلەکە دەکا و دەڵێ، ئەوانە کێنە؟ ئیحسان ئەداش لە تەکیەوە دەڵێ عیسمەت پاشایە، دواتر دەڵێ ئەی ئەو پیاوە کێیە دەڵێی پەیکەرە؟ ئەویش دەڵێ لوتفی کردار. لوتفی کردار کەسێکی درێژ و ئەسمەر و سەروکەلە درشت بوو، ڕێك وەکو کوڕە کوردێك. کڵاوێکی لەسەر بوو، ڕێك وەك ئەوەی نەیزەن دەیگوت بە پەیکەر دەچوو نەك مرۆڤ.

## ساڵانی جەنگ (كۆبوونەوەی قاهیرە)

ئەو یادەوەرییانەم هیـی سـەردەمی سـاڵانی دووەمـین جەنگـی جیهـانین. لە نـاو خەڵـك و میـدیا و سیاسـەتدا دژبەرییەكـی زۆر دروست ببوو، هەندێك لەناو كەیف و هەندێكیش لەنـاو دەرد و كەسەر دەژیان. بـۆ هەر كەسـێك ڕۆژانە ١٥٠ گـرام نـان و ١٠٠ گـرام زەیتـی زەیتـوون و ٢٠٠ گـرامیش شـەكر دابەش دەكـرا. هەمـوو شـتێك بە پسـوولەی خـۆراك وەردەگیـردرا، بۆیـە، گەر پارەشت هەبوایە، نەتدەتوانی زگت تێر بكەی. بۆ شـیری منـداڵی بچووك، باوكەكان دەچوونە چایەخانە و داوای چای بە قەنـدیان دەكرد، كە چا دەهات لە پڕێك شەكرە قەندەكەیان دەخستە نـاو گیرفانیان و چایەكەیان بە تـاڵی جێدەهێشـت و پـارەی كابرایـان دەدا و دەردەچوون. بەوشێوەیە لە چـوار پێـنج چایەخـانە هەمـان كاریان دووبارە دەكردەوە. چـونكە ئەوكـات لە ئیسـتانبووڵ گەر بە ملیۆن پارەشت دابایە چایەخانەكـان، بە ئاشـكرا نەیاندەهێشـت قەندەكە بخەیتە گیرفانتەوە، بۆیە ئەوانەی منداڵی ساوایان هەبـوو، بەناچـاری و بە دزیەوە ئەو كارەیـان دەكـرد. مـن ئەو كێشـانەم نەبـوو چـونكە بەڕێـوەبەری بەشـەناوخۆیی بـووم و بە مـۆری بەشەناوخۆیی و واژووی خـۆم دەمتـوانی بەپێـی پێویسـت نـان و سەموون لە فرنیەكان وەرگرم.

لەلایەك دۆخی خەڵك ئاوا بوو، لەلایەكی دیكەش، مشـتومڕە سیاسییەكانی ئەوسا بەشێوەیەكی گشتی بەو جۆرەبوون بوو:

میـدیا بەسـەر دوو لایەن دابەش ببـوو، بەشـێكیان لایەنگـری ئینگلیـز و بەشێكیشـیان لایەنگـری ئەڵمـان بـوون. ئەو گـرووپەی لایەنگریی ئەڵمانیای دەكـرد، لەلایەن پەیـامی سـەفاو و حوسـێن

جاهید سەرپەرشتی دەکران، ئەحمەد ئەمین یەلمانیش لەبەر ئەوەی لەگەڵ سۆڤیەت ڕێکەوتنی هەبوو، پشتگیری لە زەکەریا و سەبیحە و سەرتەل دەکرد. حکوومەتیش خۆی بە بێلایەن پیشاندەدا، بەڵام بەهۆی ئەو دۆستایەتییەی لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە لە نێوانیان مابۆوە، هەموو لایەك لەو باوەڕەدابوون حکومەت لایەنگریی ئەڵمانیا دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی تورکیا دەوروبەری بە هێزەکانی ئینگلیز و سۆڤیەت تەنرا بوو، بۆیە، پێویستی دەکرد خۆی بە بێلایەن پیشان بدات. ئینگلیز زۆر هەوڵیدا تا تورکیش بخزێننە ناو جەنگەکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. جارێك لە ئەدەنە و و جارێکیش لە میسر عیسمەت ئینۆنۆی سەرۆککۆمار بانگکرا، ڕۆزفێلت و چەرچل، زۆر جەختیان دەکرد کە تورکیا بچێتە ناو جەنگ، تا چەندین جار هەڕەشە و فرت و فێڵیشیان بەکارهێنا، بەڵام نەیانتوانی باوەڕ بە ئینۆنۆ بهێنن.

لە خوارەوە باسی کۆبوونەوەی قاهیرە دەکەم کە ڕووداوێکی سەیری تێدا ڕوودا.

ساڵی ١٩٥٦ لە شەقامی ئیستیقلال لە بەیئۆغلوو، لە پشت ئامادەیی گەڵەتەسەڕای، بەناوی ڕێستورانتی بەیئۆغلوو شوێنێکی گەورەمان هەبوو، دەتوانم بڵێم لە تەواوی تورکیا یەکمجار بوو ڕێستورانتێکی ئاوا بکرێتەوە. لە پاڵ ئەوە مارکێتێکی دەوڵەمەند و جوان و تایبەت، کە چەندان جۆر میوە و سەوزە و ساندویچ و تۆستی لێدەفرۆشرا.

ڕۆژێك دوو ئەفەندی بەتەمەن بەیەکەوە هاتنە ڕێستورانتەکە، بەرەو پیریان چووم و هەردووکیانم ناسییەوە. یەکێکیان تاهیر تانەری پرۆفیسۆر، کە مامۆستای یاسای تاوانمان بوو لە زانکۆ، ئەوەی دیکەش نومان مەنەمەنجی ئۆغلووی وەزیری پێشووی

دەرەوەی تورکیا[1] بوو، هەردووکیان خانەنشین ببوون. دەستی مامۆستاکەم ماچکرد و بە تەمای گارسۆنەکان جێم نەهێشتن و خۆم خزمەتم کردن. دواتر، مامۆستاکەم منی بیرهاتەوە و زۆر خۆشحاڵ بوو. لەبەر ئەوەی دەمزانی دۆخی ئابووریی خانەنشینان لە تورکیا چۆنە، بۆیە، بێ ئەوەی وابکەم بەسەر خۆیاندا بشکێنەوە، گوتم: "هەر میوانێکمان یەکەمجار کە سەردانمان دەکات، پارەی لێ وەرناگرین". دواتر کەزانیم بێتاقەت بوون، شتێکی ڕەمزیم نووسی. دوو میوانەکەم بە هەرزانیی نرخەکانمان سەرسام بوون، بۆیە، مامۆستاکەم چەند جارێك سەیری لیستی خواردنەکانی کرد و بە دڵتەنگییەوە گوتی: "کوڕم ئاوا خواردن هەرزان بفرۆشی زەرەر دەکەی". منیش داوام لێ کردن زوو زوو بێن و سەردانمان بکەن، بۆیە ناوە ناوە دەهاتنە لامان. ئیدی پەیوەندییەکەمان لە پەیوەندییەکی قوتابی و مامۆستاوە، چووبووە قۆناغی پەیوەندی نێوان دوو برادەر، ئەوانیش زۆر لە مێژ بوو بەیەکەوە دۆست بوون. هەردووکیشیان لە ڕێکەوتننامەی لۆزان ڕاوێژکاری یاسایی عیسمەت ئینۆنۆ بوون. لە یەکێك لە سەردانەکانیدا، نومان مەنەمەنجی ئۆغلوو، یادەوەرییەکی خۆی بەوشێوەیە گێڕاوە:

"چەرچەڵ و ڕۆسفێلت، لە ساڵی ١٩٤٣، بۆ بەشداریکردنی تورکیا لە دووەمین جەنگی جیهان، من و ئینۆنۆیان بانگهێشتی قاهیرە کرد. ئینۆنۆ نزیکی جەنگەکە نەدەکەوتەوە، چونکە تیۆری ئەو لە کۆبوونەوەی ئەدەنە و قاهیرە بەو شێوەیە بوو: حاڵی حازر سوپاکەمان لەو ئاستە نییە بەشداریی جەنگ بکات،

---

[1] نومان مەنەمەنجی ئۆغلوو (١٨٩٣ – ١٩٥٨) سیاسەتمەدار و دیپلۆماتکار، لەنێوان ساڵانی (١٩٤٢ – ١٩٤٤) وەزیری دەرەوەی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

سوپاکەمان ئامادە و پڕ چەك بکەن و بیگەیەننە ئاستی سوپاکانی خۆتان، ئەوسا بزانن چۆن دێینە ناو جەنگ. کەچی چەرچڵ و ڕۆسڤێلت بڕوایان بە تورك نەبوو، چونکە دەیانگوت ئەی گەر دوای ئامادەکردن و پڕ چەککردنیان تورك چوونە پاڵ ئەڵمانیا؟. ئەوجارە لە لایەکی دیکە لێمان سووڕانەوە و پرسی کوردیان هێنایە سەر مێزی دانوستاندنەکان و بە ڕووداوێکی لەو شێوەی خوارەوە ویستیان چاوترسمان بکەن:

شاندە ئینگلیزییەکە لەبەر ئەوەی هاتبوونە جیهانی ئیسلامی، بۆیە لەناو شاندەکەیان چەندان ڕۆژهەڵاتناسیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، کە زۆر زمانیان دەزانی. سەرەتا چەرچڵ بە ئینۆنۆی گوت:

"پاشا تۆ کوردی دەزانی؟"، عیسمەت پاشا سەری سوڕما، چونکە نەیدەزانی چ بڵێ، بەر لەوەی ئینۆنۆ وەڵام بداتەوە من سەری قسانم وەرگرت و گوتم: "گەورەم ئێمە کوردی نازانین، لای ئێمە بە کوردیش قسە ناکرێ، زمانێکی ئاواش لە تورکیا نییە". چەرچڵ لە یەکێك لە پیاوەکانی پرسی: "مستەر ئەو قسەیە ڕاستە؟ ئایا زمانێك نییە بە ناوی کوردی؟" چەرچڵ کە ئەو پرسیارەی لەو پیاوە کرد کە بە مستەر بانگی کرد، دیار بوو بە ئامادەکارییەوە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە هاتبوو، بۆیە هەستاوە سەر پێ و گوتی: "چۆن ئەو زمانە نییە گەورەم، بەڵکو زمان و ئەدەبێکی زۆر دەوڵەمەندیشیان هەیە. گەر بتانەوێت شیعرێکتان لە دیوانی جزیری بۆ دەخوێنمەوە؟" چەرچڵ گوتی: "بیخوێنەوە".

لە شیعرەکە تێنەدەگەیشتین، بەڵام زمانەکە لە فارسی نزیك بوو، ئاوازێکی بە ئاهەنگیشی هەبوو. کە لە شیعر خوێندنەوەکە بۆوە، مستەر گوتی ئەوە شیعرێکی کوردی بوو گەورەم. چەرچڵ گوتی: "مادەم وایە شیعرەکەمان بۆ بنووسەوە و بۆشمان

وەربگێڕە سەر زمانی ئینگلیزی". لە ماوەیەکی کورت وەرگێڕانەکە تەواو بوو، ئینجا سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا گوتی دە بیکەنە فەرەنسیش، کردیانە فەرەنسیش، ئینجا وەریانگێڕایە سەر تورکی، جا چەرچڵ ئاوا لەسەر قسەکانی ڕۆیی: "جەناب وەرە پێم بڵێ لەو سێ زمانە بۆ ئەوەی هەمان هەستی زمانە ئۆرجیناڵەکەی تێدا دەرببڕدرێت ئایا وەرگێڕ ناچار بووە چەند وشەی بێگانە بە زمانەکەی خۆی تێدا بەکار بهێنێت؟". دەستمان بە ژمارکردنی وشە بێگانەکان کرد. لە وەرگێڕانە فەرەنسییەکەدا هیچ وشەیەکی بێگانە نەبوو، لە ئینگلیزییەکە چوار پێنج وشەی بە بنەچە لاتینی هەبوو، لە تێکستە کوردییە ئۆجیناڵەکە سێ چوار وشەی عەرەبی دۆزراوە، بەڵام کە هاتینە سەر وەرگێڕانە تورکییەکە، جگە لە ئامرازەکانی لکاندن، هیچ وشەیەکی تێدا نەبوو کە تورکی بێت، بەڵکو هەموو وشەکان عەرەبی و فارسی و زمانە جیاوازەکانی ئەورپا بوون. چەرچڵ هەر چوار وەرگێڕانەکەی لەسەر چوار پەڕ لە پێش ئێمە دانا و گوتی: "شەرم نییە بەڕێزینە، سەیرکەن ئەوەش دەوڵەمەندی زمانی کوردییە کە ڕێژەیەکی زۆری گەلەکەتان زمانی دایکیانە و ئێوەش دەڵێن نییە".

دواتر نومان مەنەمەنجی ئۆغلوو پێی گوتم: "لەو ماوەیەی وەزیری دەرەوە بووم، هیچ ڕۆژێك هێندەی ئەو ڕۆژە بەسەر خۆمدا نەشکامەوە و بێزار نەبووم، بە بیریشم نایێ کە ڕۆژێکی دیکەی ئاوام بەسەر هاتبێ".

## گەشت

زانیمان دۆخی ئیستانبووڵ لە ساڵانی جەنگ چۆن بوو، دەبا سەیرێکی کوردستانیش بکەین. لە گۆرانییەکدا دێڕێك هەیە دەڵێ: "وەرە ببینە، بۆ ئەوەی بزانی سەفالەت چییە". لە شوباتی ساڵی ١٩٤٤ چوومە نوسەیبینی ناوچەکەی خۆمان، دایکم و خوشك و براکانم لەوێ بوون، من چەندان کارتۆنی گەورەی جلوبەرگ و خواردنم لەگەڵ خۆم بردبوو، ئەوسا بە شەمەندەفەر گەڕامەوە، چونکە تا نووسەیبین وێستگە هەبوو. بەبەراورد لەگەڵ خەڵك، خێزانەکەمان هەژار نەبوو، بەڵام سەرباری ئەوەش دڵخۆشیی دایکمم بیرناچێتەوە کاتێك پۆشاك و خواردنەکانی بینی. سەرجەم هەژارەکانی گوندەکەمان و لادێکانی دەوروبەری نزیك خۆشمان هاتبوونە سەرسەری دایکم، سەرنجم دا ئەوەی مشتێك شەکری وەردەگرت، لە خۆشیا وایدەزانی هەموو دونیای بە دیاری دراوەتێ، بۆیە ئێستاشی لەگەڵدابێ، ئەو ساڵانە بە سەردەمی برسیەتی و نەهامەتی ناودەبردرێ. ئەو گرانییە، وەك کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان، ببووە ئاماژەیەکی مێژوویی، چونکە هەرچی پیاوە بە گەنج و پیرەوە حکوومەت، بۆ ماوەی چوار ساڵ، بردبوونییە سەربازیی زۆرەملێ. لەو ماوەیەش خەڵك برسی و نەداربوون. سەربازەکان زۆربەیان تووشی وەرەم و خورشتی پێست دەبوون، حکوومەت ئەرزاقی لە خەڵکەکە بڕیبوو، بۆیە، بە ناچاری لە چیاکان بە کۆکردنەوەی گیاوگۆڵ خەڵك هەوڵیان دەدا لەبرسان نەمرن، لە برسێتیان چا و شەکر و قاوەیان لەبیرکردبوو، گەر یەکێك تۆزێك چاشی هەبووایە لەبەر ئەوەی شەکری نەبوو، بۆیە چایەکەیان بە ترێ، یان هەنجیر

دەخواردەوە. بەڕوو و گێوژیش بە میوە تایبەتییەکانی چیاکان دادەندران، هەموو ئەو نەهامەتییە لەلایەك، لەلایەکی دیکەش خەڵك لە ژێر ترسی جەنگ وماڵوێرانیدا بوون. ئەوسا، وەك ئێستا هیچ ئامرازێکی پەیوەندی نەبوو، خەڵك ئەو ڕۆژنامە تاك و تەرایانەی دەستیشیان دەکەوت، نەیاندەزانی بیخوێننەوە، گەر تورکی زانێك ڕۆژنامەکانیشی بۆ بخوێندبانایەوە، کەس باوەڕی پێنەدەکردن.

به بۆچوونی خۆم چووبووم تا، لە ناوچەکەی خۆم، تۆزێك ورەم بەرزبێتەوە، بەڵام بە پەرێشانی گەڕامەوە، جا دۆخی تەواوی کوردستان ئەوسا بەو جۆرە بوو.

## نەجیب فازل کسەکورەك

به بنەچە خەلکی ماڕاشە، لە بنەماڵەی دوول کادیرئۆغلوو. خێزانەکەی کورد بوو، خۆشی تووشی نەخۆشی دەمار ببوو، چونکە هیچ چارەسەرێکیش سوودی نەبوو. ئیدی ببووە نیوە شێتێك. بەپێی گێڕانەوەی ئەو بێ، تا خۆی دەخیلی بەر دەرگای شێخ عەبدولحەکیم نەکرد، نەخۆشییەکەی هێور نەببووەوە. ئیێ کاتێك دەبێتە موریدی شێخێکی کورد و خۆشی زاوای کوردان بوو، ئیدی نێوانی لەگەڵ کورد خۆشببوو. لەبەر ئەو دوو هۆکارە خۆی زۆرم لێ دەهاتە پێش وخۆی لێ نزیک دەخستمەوە. ڕۆژێك گوتی: "سەیرکە مووسا وەلاهی تورکم، بەڵام سوێند دەخۆم کورد لە تورك سادق تر و بە باوەڕتر و باشترن". بێگومان منیش گوتم: "ئەستەغفیروڵلا".

زوو زوو یەکدیمان دەدیت، بەڵام کە بزر بوو، منیش لێم نەمپرسی، توومەزە ئەو زاوایەمان دەستگیرکرابوو. ڕۆژێك لەناو

یەکێك لە پاپۆرەکانی کادیکۆی تووشی یەك بووین، لێم پرسی لە کوێ بووی ئەو ماوە وا دەنگت نەبوو؟ گوتی دەستگیرکرام و منیان بردە ژووری ژمارە ۳۸ی بەندیخانەی حەربییە، لەوێ رۆژێك مامەوە، بەڵام گەر تا بەیانی سورەتی ئیخلاسی شەریفم نەخوێندبا، رەنگ بوو بە تەواوەتی شێت بم. لەو رێکەوتە ژووری ژمارە ۳۸ ئەو ژوورە بوو کە پێنج مانگ و نیو لێی زیندان کرام. کە ئەوەم بۆ نەجیب باسکرد زۆر سەیری پێهات، لەگەڵ ئەوەی تەمەنی لە من گەورەرتیش بوو، بەڵام ویستی دەستم ماچبکات، ئینجا گوتی: "برادەر گەر تۆ پێنج مانگ و نیو لەوێ مابیتەوە، کەواتە پیاوێکی ئاسایی نیت و دەبێ وەك حەزرەتی یوسف و حەزرەتی ئەیوب سەیرت بکەین".

یادەوەری و بەسەرهاتەکانی نەجیب فازڵ زۆرە، بەڵام نامەوێ لەوە زیاتر درێژی بکەمەوە.

## گۆڤاری شەرق، پاڵاسی گەشتیاری، پۆستەی شەرق

لێرە تۆزێك گەڕاومەتەوە سەردەمانێکی زوو. دوای ساڵی ۱۹۵۱ رۆژنامەی (دیجلە کایناى) ئەرکی خۆی جێبەجێ کرد. پارتی دیموکرات لە تورکیا دامەزرا، بۆیە بە قەناعەتەوە ئەو بڵاوکردنەوەمان راگرت. لە شوێنی ئەو، بە هاوکاریی کەمال سولکەر، مانگانە دەستمان بە بڵاوکردنەوە گۆڤاری (شەرق) کرد.

لە گۆڤاری شەرق، بە ئاماژەدان بەو زوڵمەی لە سەردەمی جەهەپە دەکرا، زیاتر کارمان لەسەر بەیاننامەکانی مافی مرۆڤ دەکرد، بۆ ئەوەی کوردیش مافەکانی خۆی لە چوارچێوەی ئەو بەیاننامانە دەستەبەربکات. بۆیە، نووسینەکانیشمان لەو بازنەیە

دەخـولاوە، بەڵام تەنیـا توانیمـان دوو ژمـارە بـڵاو بکەیـنەوە. بە پشـت بەسـتن بەو بیـرۆکەیەی، گەر بچـمەوە ڕۆژهەڵات زیـاتر سـوودم دەبێـت. ئەو گۆڤـارەی کە خـۆم خـاوەنی بـووم و لە چاپخـانەکەی خـۆم چاپـدەکرا، بڵاوکـردنەوەیم ڕاگـرت و چاپخانەکەشم فرۆشـت و گەڕامەوە نوسەیبین و لە گونـدەکەی خۆمان، زیڤینگێ و ستیلیلێ، نیشتەجێ بووم.

ڕۆژنـامەی (دیجـلە کاینای)مـان لەبەر تـرس و بـێ ویسـتی خـاوەنی چاپخـانە و دڵەڕاوکێـی هەنـدێك کەس و لایەن بە قورسی بڵاو دەکردەوە. ڕۆژێـك لەگەڵ جەمـال کوتـای، نەوەی بەدرخان پاشـا و کـوڕی دادوەر کـاك تـاهیر، یەکـدیمان ناسـی. ئەوسـا بەنـاوی (ڕۆژنـامەی خەڵـك بە قروشـێك) ڕۆژنـامەیەکی ئێـوارانی بـڵاو دەکـردەوە. هاوبەشـی کـارەکەی، کـوڕی جەلال بەیار بوو. بەڵام، کە یەکدیمان ناسی، هاوبەشەکەی تازە مردبوو. جەمال کوتای ناسیاویماڵباتی ماڵی خەسووم بوو، بۆیە بە خـاڵە نـاوم دەهێنـا. ڕۆژێـك پێـی گـوتم: "سـەیرکە مووسـا، ئـامێرێکی چاپکردنمان هەیە و بە نیازی فرۆشتنین، گەر بیکڕی لەو باوەڕەم سەرجەم کارەکانی خـۆتی پـێ جێبەجـێ دەکەی. داوای ٢٥٠٠٠ لیـرە دەکەیـن، بەڵام گەر بـۆ تـۆ بێـت هەوڵ دەدەم بە هەرزانتـر بتـدەنێ، چـونکە مـن خـاوەنی نـیمە و چاپخـانەکە هـی ماڵبـاتی بەیـارە". چـووم ئـامێرەکەم بینـی و بە دڵـم بـوو، بـۆ کڕینـی، خـانووەکەی خـۆم فرۆشـت، کە لەنـاو دوو دۆنـم بـاخچە بـوو لەپشت مزگەوتی سۆکوللو لای مەیدانی سوڵتان ئەحمەد. ئەوسـا خـانووەکەم بە ٢٦٠٠٠ هەزار لیـرە فرۆشـت و بە ١٧٠٠٠ لیـرە چاپخانەکەم کڕی.

سـاڵی ١٩٥١ تەواوی چـالاکیە کەلتـووری و میـدیاییەکانی خۆم کۆتایی پێهێنا و چوومەوە ڕۆژهەڵات. زۆر مانـدوو ببـووم،

دەمویست ماوەیەك لە لادێکەمان لەناو سروشت بژیم. تراکتۆرێکی ئینگلیزیم کڕی و لە زەوی عەنتەری باپیرە گەورەم دەستم بە کشتوکاڵ کرد. لە گوند لەگەڵ خێزانەکەم دادەنیشتم، ژیانێکی زۆر سادە و خۆش دەژیام، ژیانی سەردەمیانەم لەخۆم قەدەغەکردبوو، بەڵام برادەرانم وازیان لێنەدەهێنام. ڕۆژێك، یوسف عەزیز ئۆغلوو، منی داوەتی دیاربەکر کرد، ئەو پەرلەمانتارێکی بەرێزی پارتی دیموکرات بوو.

لەسەر تکای یوسف عەزیز ئۆغلوو و عەبدوڵا ئەکینجی چوومە دیاربەکر. گوتیان: "مووسا لە گوندی شێخانی مێردین، گەنجێکی چاوچنۆك هاتووەتە دیاربەکر، سەرەتا شیشی تکە و جەرگی بە قروشێك دەفرۆشت، دواتر تەرفیعی کرد و دووکانێکی بچووکی کردەوە و توتن و جگەرەی قاچاغی فرۆشت، بۆیە نازناوی بووە پاکەتچی، یانی شێخ مووس پاکەتچی. ئەو شێخ مووسە چاوچنۆکە لە ماڵێکی کاولی ئەرمەنییەکان دادەنیشت، ڕۆژێك لە ماڵەکەی کوپێك زێڕ و مجەوهەرات دەبینێتەوە، بۆیە کابرا ئەو زێڕ و مجەوهەراتانەی فرۆشتووە و ئەوڕۆ بووەتە یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی دیاربەکر.

بەرامبەر کۆشکی ماڵی پارێزگار پارچە زەوییەکی بچووك هەبوو کە بە زەوییە گەورەکەی شارەوانییەوە لکابوو. ئێستا ئەندازیارێکمان دۆزیوەتەوە لە خێزانی مادەنلی سەرافیانی ئەرمەنییە. ئەو ماڵباتە کاتی خۆی لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان بەرەو ڤیەننا ڕایانکردبوو، کەچی ئێستا کوڕەکەیان لەسەر ئاستی ئەورووپا ئەندازیارێکی ناودارە. ئێمەش دەمانەوێت کار بە پارەی ئەو پیاوە جاهیلەی دیاربەکر بکەین، پڕۆژەی میوانخانەیەکی جوانمان بە سەرافیان نەخشاند و چووین بە پاکەتچیمان گوت: "شێخ مووس سەیرکە، ئەو زەوییەی شارەوانی کە بە ماڵەکەی

تۆوە لکاوە، دەیخەینە سەر ناوی تۆ، تۆش دەبیتە خاوەنی میوانخانەیەکی گەورەی گەشتیاری، وەرە و مەڵێ نا، چونکە سوودێکی زۆر دەکەین، لەبەر ئەوەی ئەو ماوەیە بێگانەیەکی زۆر بۆ نەوتی باتمان و ئەو فرۆکەخانەیەی لە دیاربەکر دەکرێتەوە، لەگەڵ دانانی ئەو چەکی ئەتۆمانەی دژی یەکێتی سۆڤیەت لێرە جێگیر دەکرێن سەردانی ناوچەکە دەکەن". دوای قسەکانمان پاکەتچی لێی پرسین میوانخانەکە بە چەند تەواو دەبێت؟ لە وەڵامدا پەرلەمانتار و ئەندازیار پێکەوە گوتبوویان پێنجسەت هەزار لیرە. پاکەتچیش گوتبووی: "باشە". دوای تەواو بوونی کارە فەرمییەکان و دانانی بناغە، بەر لەوەی دەست بە دروستکردنی هەیکەل بکرێت، پارەکە تەواو ببوو، بەڵام پاکەتچیان هەڵخەڵەتاندبوو چونکە میوانخانەکە بە شەش ملیۆن لیرە ئینجا تەواو کرا. دوای تەواو کردنی، بەدوای بەڕێوەبەرێکدا دەگەڕان بۆ ئەوەی هۆتێلەکەیان بۆ بخاتە کار و سەرپەرشتی بکات، بۆ ئەو مەبەستە منیان بانگهێشت کردبوو، تا وەکو بەڕێوەبەرێك، میوانخانەکەیان بۆ بەکار بخەم. من بیستبووم کە خاوەنەکەی کەسێکی لە خۆبایی و نەزان و جاهیلە، بۆیە گوتم: "براینە، بەڕێوەی دەبەم، بەڵام لە ژێر چاودێریی خاوەنێکی بێ مێشك ناتوانم ئەو کارە بکەم"، ئەوان دڵنیایان کردمەوە کە خاوەنەکەی بە هیچ شێوەیەك خۆی لە ئیشەکانی من هەڵناقورتێنێ.

کارەکەم قبووڵ کرد و دوو سەت و پەنجا هەزار لیرەم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و هاتمە ئیستانبووڵ، سەرەتا چوومە میوانخانەکانی پارك هۆتێل و پەرا پالاس و تۆکاتلییا، تا چۆنیەتی کارکردنی ئەوان لای خۆم تۆمار بکەم. نموونەیەك لە کاغەزەکانیانم لەگەڵ خۆم هێنا و چووم بەناوی خۆمانەوە

چاپمکردن، دواتر سەرجەم پێداویستییەکانی میوانخانەیەکی ٧٠ ژووری و سێ ساڵۆن و ڕێستورانتێکم کڕی.

ساڵی ١٩٥٣، هێشتا ساردکەرەوەی گەورەی لە جام دروستکراوی ڕێستۆرانتەکان لە ڕۆژهەڵات نەبوو، من ئەوسا دوو دانەم لەو ساردکەرەوانە کڕی، بەو مەرجەی هەر کاتێك تووشی کێشەیەك بوون، وەستای تایبەت لە ئیستانبوولەوە بێن و چاکی بکەنەوە. ئەوسا قسەیەك لەناو خەڵکی دیار بەکر باو بوو کە دەیانگوت داری سنەوبەر لە دیاربەکر نابیتێ، بەڵام من چوومە باخچەی کۆلێژی دارستان لە بویوك دەرە و لەوێ چەندان جۆر بنە داری سنەوبەر و فستق و مازوو و چەند بنەدارێکی دیکەشم کڕی.

سەرجەم ئەو کەلوپەلانەی کڕیبووم، لە ڤاگۆنێکی شەمەندەفەرم بار کرد و خۆشم سواری هەمان شەمەندەفەر بووم و گەڕامەوە دیاربەکر. لە ماوەی پازدە ڕۆژ میوانخانەکەم بەشێوەیەکی زۆر تایبەت و بێ کەم و کوڕی خستە ئیش.

ساڵی ١٩٨٩ مەدام میتران لە هەمان هۆتێل ببووە میوان، ئەوڕۆژە منیش داوەتکرابووم، سەیرمکرد لەسەر هەمان ئەو ڕیزەوەی ساڵی ١٩٥٣ دەڕۆن کە من دامنابوو. ئەو دار چنارانەی لە باخچەکەم ڕواندبوو، گەورە ببوون و خەریك بوو سڵاوم لێ بکەن، دوای ئەوە ئیدی خەڵك بینیان دارچنار، وەك شارەکانی ڕۆژئاوا، لە دیاربەکریش گەورە دەبێت.

لە هۆتێل مووچەکەم ١٢٥٠ لیرە بوو، لە کاتێکدا مووچەی پارێزگاری دیاربەکر ٤٥٠ لیرە بوو. ئەو میوانە ئەمریکییانەی دەهاتنە لامان ئەوەندە سوپاسگوزارمان بوون، بەقەد مووچەکەم بەخشیشیان بۆ جێدەهێشتم. ستەڤونسۆنی بەربژێری سەرۆکی ئەمریکا، کە بە دەنگیکی کەم هەڵبژاردنەکەی دۆڕاندبوو، ببووە

سەرۆکی کۆمپانیای پەرسۆنسی جیهانی لە باتمان، کە لە زۆر وڵاتی دیکەش لقی هەبوو. ڕۆژێك ستەڤونسۆنی هاتە هۆتێلەکەم، ئەوسا دەفتەرێکی جوانی بەرگ زیوم دروست کردبوو بۆ نووسینی یادەوەری و تێبینیی میوانەکان، ئەو میوانەم لە دەفتەرەکە ئەو چەند دێڕەی نووسی: "من چاوەڕێی شتێکی دیکەم لە ڕۆژهەڵات دەکرد، کەچی هەستدەکەم لە نیۆرکم نەك دیاربەکر، زۆر بە هەڵە باسی ڕۆژهەڵاتیان بۆ کردبووین، پیرۆزبایی لە بەڕێوەبەری میوانخانەکە مووسا عەنتەر و تەواوی خەڵکی دیاربەکر و ڕۆژهەڵات دەکەم."

بۆ من، پێهەڵدانی بەرپرسێکی ئەمریکی زۆر گرنگ نییە، بەڵام حەزم لێ بوو ئەو بەسەرهاتەشم بۆ ئەوانە بگێڕمەوە کە لە دوای من لێرە دەژین.

ئیدی توریستیك پالاس و دەوروبەرکەم ببووە ناوەندێکی سیاسی. تازە بانگەشەی هەڵبژاردن دەستی پێ کردبوو. بەوهۆیەوە، ئێمەش سەرمان زۆر قەرەباڵغ بوو. ڕۆژانە چەندان فڕۆکە لە دیاربەکر دەنیشتنەوە، بۆیە، ڕێککەوتنێکم لەگەڵ هێلی ئاسمانییەکەی کرد و دوو ژوورم تایبەت کرد بە کارمەندانی ئەو فڕۆکانەی دەهاتنە دیاربەکر، یەکێکیان بۆ کاپتن و کارمەندە پیاوەکانیان، ژوورەکەی دیکەش دوو کچی هۆستێسمان لێی دەمانەوە. ئەم ڕێککەوتنە لە بەرژەوەندیی من بوو، چونکە یۆرگۆی شێفمان، کە لە ئیستانبووڵەوە هێنابووم، زۆر شارەزای کارەکەی خۆی بوو، ئەو هەموو ڕۆژێك پێداویستییەکانی دەدامێ و منیش دەمکردە لیست و دەمدا کاپتنی فڕۆکەکە، ڕۆژی دواتر لە گەڕانەوەیدا کاپتن چەندان جۆر ماسیی تایبەت و قرژاڵی دەریایی و میدیە و ڕۆبیانی لە ئیستانبووڵەوە بە تازەیی بۆ دەهێنام. بەهۆی کابانی و دەستاوە خۆشەکەی ڕەمزی

شێفمان، چێشتخانەکەمان لە هیچ خواردنێکی جۆراوجۆری ڕۆژئاوایی کەم نەبوو. لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، وامان لێهات، جگە لە پارێزگار و سەرۆکی شارەوانی و پەرلەمانتاران، نەمدەتوانی کەسی دیکە لەبەر نەبوونی شوێن وەربگرین، ئەوەی دەماوە ئەمریکییەکان و ئەوروپییەکان بوون. جەلال بەیار کە سەرۆککۆمار بوو جارێك لام مایەوە. بۆ شیڤی داوای گۆشتی کوڵاو و محەلەبی تێکەڵاوی کردبوو، شێفەکەشم ئەو خواردنانەی زۆر بەلەزەت بۆ دروستکرد. هیچ کات خۆشیم لە جەلال بەیار نەهاتووە و لەو باوەڕەم ئەویش هەمان هەستی بۆمن هەبووە. بەیار، دوایین جار کە هاتبووە لام، ساڵی ١٩٥٠ بوو لە ئیستانبووڵ بۆ بەشداری بۆنەی شەوانی دیجلە، ڕێکەوت وای خواست ساڵی ١٩٥٤ کە هاتە دیاربەکر بێتە میوانخانەکەم، کاتێك بینیمی ناسیمیەوە و بە هەڵسوکەوتێکی ساختە گوتی: "مووسا تۆم زۆر خۆشگەرەکە". خواردنی ڕێستورانتەکەمانی بەدڵ بوو، داوای کرد لە هەر یەکێکیان قاپێکی دیکەی بۆ تێبکەینەوە.

وەك باسمکرد، هۆتێلەکەمان ببووە ناوەندێکی سیاسی، هەڵبژاردنیش دەستی پێ کردبوو، هەڵبژاردنی ناوخۆی حیزب کرا. دیموکراتەکانی دیاربەکر بەسەر دوو بەرە دابەش ببوون، یەکێکیان پارتی نووری ئۆنوڕ و ئەوەی دیکەش پارتی جەمیل پاشازادە و ئەسەد جەمیل ئۆغڵوو و موستەفا ئیکینجی و یوسف عەزیزئۆغڵوو. لە هەڵبژاردنی ناو حیزبدا، پارتەکەی عەزیز ئۆغڵوو و جەمیل ئۆغڵوو، کە بە بەرە کوردییەکە دەناسران، سەرکەوتن. ئەسەد جەمیل ئۆغڵوو هاتە لام و گوتی: "دوازدە برادەرم هەیە، سەمەد ئاغائۆغڵووی جێگری سەرۆکی پارتی دیموکراتیش لێرەیە، بۆیە، فەرمان بە هاوکارەکانی ڕێستۆرانت

بکە مێزێکی بێ قسوورمان بۆ ئامادە بکەن و دەست لە هیچ خەرجییەک نەگێڕنەوە و تێچووەکەی لەسەر من". منیش لەسەر قسەی ئەو ڕێنماییم بە گارسۆنە ڕوومییەکەم دا، چی پێویستە بۆی بکرێت. ئێوارە هاتنە لامان، بەڵام تا دەهات قەرەباڵغ دەبوون، مێزی دیکەمان بۆ زیاد کردن، وای لێهات تەواوی گرووپە ئۆپۆزسیۆنەکان لەگەڵ نووری ئۆنوور هاتن، تا لەسەر مێزەکەبوونە بیست کەس. عارەقی ڕاکییان وەك ئاو دەخواردەوە، سەمەد ئاغائۆغلوو لەگەڵ موستەفا ئێکنجی بەتەنیا دانیشتبوون، منیشیان داوەتی سەر مێزەکەیان کرد، بەڵام بە بەهانەی ئەوەی ئیشم هەیە نەچوومە لایان.

مێزێکم لە نزیکەوان دانا و لەگەڵ نەجات جەمیل ئۆغلووی هاوپیشەم دانیشتین. لەگەڵ تێپەڕینی کات ئەو جاهیلانەی لەولاتر دانیشتبوون هەر خەریکی خواردنەوە بوون، بەدەم دانیشتنەوە قرەقڕ لە نێوان نووری ئۆنووری لە هەموویان جاهیلتر و کاك ئەرسەم دروستبوو، کە پێشتر لە بەرەی نووری بوو، بەڵام لەناو هەڵبژاردن چووبووە بەرەکەی دیکە. کاك ئەرسەم یەکەمجار لە دیاربەکر قەنەی کێشابوو، بۆیە پێیان دەگوت ئەرسەم قەنە. نووری ئۆنوور گوتی: "باشە قەنە تۆ کە چوویە ئەو بەرەی دیکە چیت قازانج کرد؟" ئەرسەمیش: "جا چبووە نووری، گیانی برادەران ساغ بێ". کە وای گوت، نووری ئۆنووری سەرخۆش ئاوا وەڵامی داوە: "قەباحەتی برادەرەکانتە، کە کەسێکی بێ کاریگەریی وەك تۆ لای خۆیان وەردەگرن". یوسف عەزیز ئۆغلوو لە تەك نووری ئۆنوور دانیشتبوو، ئەسەد جەمیل ئۆغلووش بەرامبەری. یوسف عەزیز ئۆغلوو بە ئاماژەکردن بە سەمەد ئاغائۆغلوو، بە کوردی گوتی: "کاك نووری شەرمە بێگانەمان لەناوە، تکایە وسبە". نووری ئۆنوورڕ لە ژێر کاریگەریی

هەستی دۆڕاندن دەنگی بەرزکردبۆوە، ئەوجارە ئەسەد جەمیل ئۆغلوو هەولی بێدەنگکردنیدا: "تکایە کاك نووری ئەو مێزە لەسەر شەرەفی من ئامادەکراوە، چونکە من داوەتم کردوون، تکا دەکەم". بەلام نووری ئۆنوور گوتی: "ئەو مێزەی دەگ..م". ئەسەد جەمیل ئۆغلوو، بە گەنجی، ئەوکاتەی قوتابی کۆلێژی کشتوکال بوو لە پاریس، ببووە پالەوانی بۆکسێنی ئەوروپای ناوەڕاست، کە گوێی لەو جوێنە بوو هەستاوە سەر پێ و بۆکسێکی لە دەموچاووی نووری ئۆنووڕدا و بە زەویدا خست، نووری ئۆنوور قاچی لە ئاسمان و سەر و کەلەشی لە زەوی دەخشا، بەلام هەولی دەستبردنی دا بۆ دەمانچەی بەر پشتی، بەلام من و نەجات جەمیل ئۆغلوو دەستمان گرت و دەمانچەکەمان لە کەمەری دەرهێنا و بە هاوکاریی چەند کەسێك بردیانەوە مال.

ئەو ئێوارەیە، پەیامنێری ڕۆژنامەی دونیا، فیکرەت ئۆتیامیش لەوێ بوو. دوای ڕووداوەکە شەرەف ئۆلوغ، کە لە دیاربەکر خۆشەویست نەبوو، چونکە لەکاتی لە سێدارەدانی شێخ سەعید بە دۆقەکردن لەگەل داواکارە گشتیەکان و جەلادەکانی شێخ پیرۆزبایی لێ کردبوون، بۆیە، ئێمە و چەندان بە شەرەفی دیکەی ڕۆژهەلاتی بەلێنمان دابوو دۆقەی لەگەل نەکەین، دوای ڕووداوەکە لە ڕێگای فیکرەت ئۆتیامی هەرزەکار نامەیەکی ئاوای لەسەر ڕووداوەکە بۆ میدیای ئیستانبوول نارد:

"دوێنێ شەو پارتی دیموکرات، کە دابەشی سەر دوو بەرە بووینە، لە توریستیك پالاس کۆبوونەوە، ئەو شوێنەی مووسا عەنتەر سەرپەرشتیی دەکا. یوسف عەزیز ئۆغلوو و موستەفا ئیکنجی و ئەسەد جەمیل ئۆغلوو، لە ڕۆژهەلات لایەنگری کوردستانێکی سەربەخۆیان دەکرد، نووری ئۆنووڕ و

برادەرەکانیشی دژی ئەو بۆچوونە بوون، بەڵام کوردە سەرسەختەکان، هێرشیانکردە سەر نووری ئۆنوور، لە ئەنجامدا بە هاوکاریی کارمەندانی میوانخانەکە لەوێ بە زەحمەت ڕزگارکرا و بەهۆی ئەو لێدانانەی بەری کەوت، نووری ئۆنوور گەیەندرایە نەخۆشخانە".

لەبەر ئەو ڕووداوە، هەڵبژاردنی پێشوەختە لە دیاربەکر هەڵوەشایەوە، بەڵام شەرەف ئولوغ بە بەکارهێنانی فیکرەت ئۆتیام سیناریۆیە درۆیەکەی سەری نەگرت، چونکە دووەم پیاوی پارتەکە سەمەد ئاغا ئۆغلوو شاهێدی چۆنیەتی ڕوودانی شەڕەکە بوو.

لە ڕووی مێژووییەوە شوێنی نییە، بەڵام مادەم کاتی هاتووە دەمەوێ باسی ئەو بیرەوەریەشتان بۆ بکەم:

نووری ئۆنوور، دواتر لە سەر لیستی دیاربەکر بووە پەرلەمانتار. لەگەڵ ئەوەی بە بنەچە خەڵکی گوندی (دەریندیبی) ناوچەی کەرجەوسی مێردینە، واتا هاوشاریی خۆشمە، بەڵام بەردەوام دژی من بووە و خۆشی نەویستوومە و بەردەوامیش زمانی لێداوم. ساڵی ١٩٥٨، خالیس ئۆزتورکی، پەرلەمانتاری ئاگری و کوڕی سیکانلی عەبدولمەجیدی شۆڕشگێڕ لە بەرخودانی ئاگری، کە زۆرم خۆش دەویست، ڕۆژێك لە ڕێگەی دیاربەکرەوە دەچووە ئەنقەرە، بۆ بەڕێکردنی، لەگەڵ چەند برادەرێك بەیەکەوە چووینە فرۆکەخانە، بەرێکەوت نووری ئۆنووریش بە هەمان فرۆکە گەشتی دەکرد، لە تێرمیناڵی فرۆکەخانە گەیشتینە یەك، خەریك بوو دەست بخەینە یەخەی یەکدی، چونکە پێی گوتم: "مووسا دەتخەمە زیندان و بە ئیعدام کردنت دەدەم"، وەڵامم داوە: "ئەو گووەت پێناخورێ". کاك خالیس چوو تا لێی بدات، بەڵام نەمانهێشت، فرۆکە هات و

ئەوان ڕۆیشتن.

ڕۆژ هــات و ڕۆیـــی، لە ١٧ی مـــانگی یـــازدەی ١٩٥٩ دەستگیرکراین و خراینە زیندانی حەربییە، لە لاپەڕەکانی داهاتوو بە درێژی باسی ئەو زیندانیکردنەم دەکەم، بەڵام بەسەرهاتەکانم لەگەڵ نووری ئۆنوور تا کۆتایی لێرە درێژە پێدەدەم.

نـووری ئۆنـوور قسـەکانی خـۆی هێنـابووە جـێ، مـن و هاوڕێکـانم دەسـتگیرکراین، ئەوکـاتەی لە ژوورەکـانی زینـدان بـووین، لە دەرەوە کودەتـا ڕووی دا، ئەوجـارە پەرلەمانتارەکـانی پـارتی دیمـوکرات دەسـتگیرکران و لەگەڵ کاربەدەسـتانی ئەو پارتە بردرانە دوورگەی یاسیادا. وا ڕێکەوت دوای ماوەیەك ئێمە ئازاد کراین. دوای دەرچوونم ڕۆژێـك عەقیـدێکی ناسـیاوم لێـی پرسیم دەتەوێ وەك بینەر بەشداریی دادگـاییکردنی گیراوەکـانی دوورگەی یاسیادا بکەی؟ منیش گوتم هەر زۆریشم حەزلێیە. بۆ ئامادە بوونم لە دادگا کارتێکی بەشـداریکردنی دامـێ. ڕۆژێکـی هەینی لەبەردەم مزگەوتی کۆشکی دۆڵمە باخچە سـواری پـاپۆڕ بـووین بەرەو دوورگەکە، لـە ڕێگـا ئەفسـەرێك لە بڵنـدگۆکەوە گوتی: "لە ناو دادگا لەگەڵ زیندانییەکان، قسـەکردن و پێکەنـین و ئامـاژەی جەسـتە قەدەغەیە، بە پـێچەوانەوە تووشـی سـزادان دەبـن". سـێ جـۆر کـارت بەسـەر بینەرەکـان دابەش کرابـوون، کارتە ڕەنگ سوورەکان درابـوون بەوانەی کە دیموکراتەکانیـان خۆشنەدەویسـت و ڕەنگـی کەسـکیش درابـووە ئەوانەی خـزم و کەسـی گیراوەکـانن، ڕەنگـی سـپیش درابـووە ئەوانەی تەنیـا ویستوویانە ئامادەی بینینی دادگاییکردنەکە بـن، کـارتەکەی مـن سوور بوو.

گەیشتینە دوورگەکە و دادگایی کردنەکە، لە هۆڵی وەرزشی قوتابیانی قوتابخانەی بەهارییە، بەڕێوەدەچوو. هۆڵەکە بەشێوەیەك

ڕێك خرابوو کە شوێنی بینەر و دادوەر و داواکاری گشتی و ٦٠٠ تۆمەتباری لێ دەبۆوە. من لە پێشی پێشەوە. نزیك لە دەرگای هاتنە ژوورەوە دانیشتبووم، دوای ماوەیەك چەند ژەندرمەیەك لە هێزەکانی وشکانی و ئاسمانی و دەریایی هاتن و دانیشتن. دەستەی سەرۆکایەتیی دادگا هاتن، دواتر بینیم جەلال بەیار لە پێشەوە و لە دواوەشی عەدنان مەندەرێس و پەرلەمانتارەکانی بە نۆرە هاتنە ناو هۆڵەکە. لەبەر تەنگیی ڕێگاکە هەموو تاوانبارەکان، کە دەهاتنە ناو ساڵۆنەکە لە پانتۆڵەکەم دەخشان. نۆرە هاتە سەر دیاربەکر و بینیم نووری ئۆنوور بووەتە مشتێکی بچووك و بە پەرێشانی دێتە ژوورەوە. ڕێك کە گەیشتە بەردەمم، بە هێواشی و بە کوردی پێم گوت: "حەچە کەرە"، نووری کە ئەوەی لە من بیست و سەیری کردم، زیاتر چووەوە ناوخۆی و سەری کز کرد و ڕۆیشت.

لە ڕۆژێکی ئاوا ناهەمواردا شکاندنی هاوشارییەکی خۆم ڕاست نەبوو، بەڵام کاك نووری حەق بوو کە ئاوای لەگەڵ بکرێ، خوا لە کەموکوڕییەکانی ببورێت، ئەویش کۆچی دوایی کرد.

هەڵبژاردن کرا و پارتی دیموکرات سەرکەوت، میوانخانەکەم وەك ڕێستۆرانتی کەرپووچی ئەنقەرەی لێهاتبوو، ببووە ناوەندێکی سیاسیی دیاربەکر. بەر لەو هەڵبژاردنە، ساڵی ١٩٥٤، بەهاوکاریی کاك ئەحمەدی ئەندازیاری باڵا، بڕیاری دەرکردنی ڕۆژنامەیەکمان دا. ئامێری چاپکردنمان کڕی، نەجدەت جەمیل ئۆغلوومان کردە بەڕێوەبەری نووسین، ڕۆژنامەش یەك دوو وتار و ڕاپۆرتم خستە ئەستۆی خۆم. ڕۆژنامەکە ناوی (شەرق پۆستاسی) بوو، ئەو گۆشەیەی منیش دەمنووسی ناوی (پۆستەی دواکەوتوو) بوو. ڕۆژنامەکە لەماوەیەکی کورت لە تەواوی

کوردستان دەنگی دایەوە و پێشوازییەکی گەرمی لێکرا. ئەوسا ڕۆژانە ٥٠ دانە لە ڕۆژنامەی (هوریەت) دەهاتە دیاربەکر و بەشێکیشی دەنێردرایەوە، بەڵام ڕۆژنامە دوو لاپەڕەییەکەی ئێمە، ڕۆژانە هەزار دانەی لێ دەفرۆشرا، هەر دەشمانتوانی ئەوەندەی لێ چاپ بکەین. ئەو ڕۆژنامانەی لە ئیستانبووڵەوە دەهاتن، بە هوریەتیشەوە، نرخیان ١٥ قرووش بوو، ئەوەی ئێمە بە ٢٥ قرووش دەفرۆشرا. بەم شێوەیە ساڵ و نیوێك بەردەوام بوو. لەبەر ئەوەی لایەنگری پارتی دیموکراتمان دەکرد، چیمان گوتبا ئازاد بووین، بۆیە، ئەو زوڵمەی جەهەپە لە ماوەی ٢٧ ساڵدا بەرامبەر بە گەلی کورد کردبووی، هەموویمان خستە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکە.

جگە لە خستنەرووی زوڵمەکانی جەهەپە هیچی دیکەمان نەدەنووسی. لاپەڕەی دواوە جێگیر بوو، بۆیە تەنیا بەرواری دەگۆڕدرا. لاپەڕەکانی دیکە خشتەی کاتەکانی گەشتەکانی شەمەندەفەر بوو، بە پیتی گەورەش (هاووڵاتی ببە ئەندامی کزڵای) یمان دەنووسی، هەندێك جاریش ڕێکلامی گشتیمان بڵاودەکردەوە. لە لاپەرەی یەکەمیش هەندێك نووکتە و نووسینی من بڵاو دەکراوە. خوێنەر تەنیا لەبەر نووسینەکانی من ڕۆژنامەکەیان دەکڕی. لەبەر دەرگای چاپخانە منداڵ چاوەڕێی دەرچوونی ڕۆژنامەکەیان دەکرد و دواتر دەیانبرد و بانگیان دەکرد نووسینی عەنتەر ئابێ... نووسینی عەنتەر ئابێ، ئیدی لەماوەیەکی کەم ڕۆژنامەکەیان دەفرۆشت، چونکە لەگەڵ دەرچوونی سەرجەم تیراژەکەی بۆ فرۆشتن دەڕفێندرا. نزیکەی سێسەت تا چوارسەت دانەی ڕۆژنامەکەمان بۆ تەواوی شارەکانی کوردستان و ئەو شارانەی کوردی لێیە بۆ کڕیارە بەشدارەکانمان دەنارد. جا نەك تەنیا بۆ ناوخۆی تورکیا، بەڵکو بۆ سووریا و ئەوروپاشمان دەنارد. زۆری بەسەر نەچوو ئیدی

ورده ورده پارتی دیموکرات وەك جەهەپەی لێهات. منیش ماوەی سەربازیم هاتبوو و چوومە سەربازی. بۆیە ماوەیەکی کورت دوای من ڕۆژنامەکە داخرا، زۆر بە داخەوە ئێستا تەنیا دانەیەکیشی لەبەردەستم نەماوە.

لەو ماوەیەدا، لە دیاربەکر و تەواوی کوردستان، هەستێکی سەیری ڕۆحی هەبوو. خەڵکەکە لە زوڵمی ۲۷ساڵەی نا مرۆڤانەی جەهەپە ڕزگار ببوون و شانیان لەژێر بارێکی قورس تۆزێك پشووی دابوو و تازە بە تازە هەناسەیەکیان هاتبۆوە بەرێ. ئەوانەی ڕاگوێزرابوون گەڕابوونەوە ناوچەکانی خۆیان و سەرلەنوێ ببوونەوە خاوەنی ماڵ و موڵکی خۆیان. خۆفرۆشەکانی سەردەمی جەهەپە بە دوای کونێکدا دەگەڕان خۆیانی لێ بشارنەوە، جورئەتی ئەوەیان نەبوو سەیری ناو چاوی هیچ کەسێك بکەن، ئەوانەی چەندان ساڵ بوو پەرلەمانتار بوون هیچیان مافی خۆ هەڵبژاردنەوەیان نەبوو. شەرەف ئولوغ و ماڵباتی برنجی و دیجلە و هاوشێوەکانیان، خۆیان لە ئیستانبوڵ و ئەنقەرە پەناگیرکردبوو، سەڵتەنەتی پۆلیس و ژەندرمە کۆتایی پێهاتبوو، بیرۆکراتەکان، بەرامبەر خەڵك، خۆیان خستبووە ناو قاڵبێکی ڕێز و حورمەتی ناچاری. چاودێری گشتی هەڵگیرا و کۆشك و شوێنی مانەوەشی کرا بە پەیمانگای کچان، خەڵکیش بە نەمانی شەڕ و ئەو چاودێرییە چڕەی بەسەریانەوە بوو، خۆشحاڵ بوون.

بە گشتی خەڵك، وەك ژانی هەڵدانەوەی قەتماغەی برینێك هەستی بەو زوڵم و زۆردارییە دەکرد کە بەرامبەریان کرابوو، بۆیە، ڕۆژنامەی (شەرق پۆستاسی) و (ئیلەری یورد) کە لە ساڵی ۱۹۵۸ دەرمانکرد، ژان و حەسرەتی ۲۷ ساڵی ئەو خەڵکەی دەخستەوە سەر زاران.

## ساڵانی سەربازی

لە ساڵانی خزمەتی سەربازی، لە بەشی لۆجیستیك بووم. بۆیە، شەش مانگ لە قوتابخانەی پێویستییەکانی سەربازی لە ناوچەی ئەیوویی ئیستانبوول مامەوە. ڕۆژانی شەممە و یەکشەممە دابەزینمان هەبوو، منیش دەچوومەوە ماڵ. لە دەرگای قوتابخانەوە تا بەر دەرگای ماڵ، پۆلیسی سڤیل چاودێرییان دەکردم. ئەو برادەرانەی لە ئاست و تەمەنی من بوون، یەك لە دوای یەك لە قوتابخانە دەردەچوون و دەنێردرانە بەش و شوێنی جیاواز بۆ خزمەتی سەربازی. ڕۆیشتنی منیش لەسەر ئان و ساتی خۆی بوو. ڕۆژێك، لە بەیازیت، کامیل یلدرمم بینی و ئەو گفتوگۆیەمان کرد:

کامیل یلدرم: "کاك مووسا ئەو جلە ئەفسەرییانەت زۆر لێهاتووە".

من: "زۆرم نەماوە و ئیدی بۆ ماوەیەکی درێژ جلی سەربازێکی ئاسایی لەبەردەکەم".

کامیل یلدرم: "مادەم موستەفا ئەکینجی لێرەیە، بۆ حاڵی خۆتی پێ نالێیت؟".

من: "لە کوێ ببینم، ئەو بۆ لە من ناپرسێ؟".

کامیل یلدرم: "کاك موستەفا و یوسف عەزیز ئۆغلوو، لە یانەی ئەنادۆلوو لە بویووك ئەدا دەمێننەوە، من ئەمشەو دەچمە لایان و پێیان دەڵێم".

من: "خۆت دەزانی".

ئەوکات موستەفا ئەکینجی و دکتۆر یوسف عەزیز ئۆغلوو، دوو پەرلەمانتاری پارتی دیموکرات و دوو کەسی نزیکی

عەدنان مەندەریس بوون. ڕۆژی دواتر لە قوتابخانە لە ڕێگەی بڵندگۆوە: "مووسا عەنتەر وەرە ژووری فەرماندە". دۆستەکانم دڵتەنگ بوون، چونکە وایانزانی ناوم بۆ خزمەتی سەربازی هاتۆتەوە. ئەفسەرێك منی بردە لای عەمیدی فەرماندەی قوتابخانەکە، کە چوومە ژوورەوە بینیم موستەفا ئەکینجی لای فەرماندەکەمان دانیشتووە، لەگەڵ بینینی من هەستاوە سەر پێ و لە باوەشی کردم و ئەولا و ئەملای ماچکردم و ڕووی لە فەرماندەکەمان کرد: "سەیرکە پاشا من زۆر برازام هەیە، بەڵام لە هەموویان خۆشەویستتر و ئەزیزتر مووسایە". پاشاش ئابڵەق بوو و نەیدەزانی چی بکا: "دانیشە کوڕم". دانیشتم و موستەفا ئەکینجی بە لێزانانە بەسەر منیدا هەڵدەدا. بەر لە دەرچوون پێی گوتم: "کوڕم سەیرکە، پاشا وەك خاڵتە، گەر پێویستت بە شتێك بوو، بێ شەرمکردن وەرە و بیڵێ"، پاشاش بە گوتنی "ئەی چۆن بەسەرچاو" وەڵامی داوە. کاتێك لای فەرماندە دەرچووین ٥٠٠ لیرەی دامێ، تا بەر دەرگای باخچەکەش پاشا کاك موستەفای بەڕێکرد، منیش لەگەڵیان بووم، ئینجا بە سڵاوێکی سەربازی لە پاشا جیا بوومەوە. هەر من کێشەم نەبوو، بەڵکو پاشاش کێشەیەکی گەورەی هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەوساڵە تەرفیعی پلەی سەربازیی بۆ نەهاتبۆوە، چونکە دەبوو ببێتە لیوا. بۆیە، ئەویش داوای هاوکاریی لە کاك موستەفا کردبوو، بۆ ئەوەی پاشا چاوی لە من بێت کاك موستەفاش بە ڕاستی هاوکاریی کردبوو، دوای ماوەیەك فەرماندەکەمان پلەکەی بۆ لیوا بەرز بۆوە.

لە قوتابخانە زۆرم دەخوێند، چونکە حەزم چووبووە وانەکان، سەرجەم نمرەکانم ١٠٠ بوو، بۆیە بە پلەی یەکەمی سەر قوتابخانەکەم دەرچووم، بەڵام ئەوکات خوالێخۆشبوو، ئۆرهان ئاپئایدن، پارێزەری مەندەریس بوو، بورهان ئاپئایدنی برایشی لە

هەمان خولی ئێمە بوو. ئەویش پارێزەری دیموکراتەکانی دەکرد و هەموو ڕۆژێك لە ڕۆژنامەکان ناوی دەردەچوو، بەڵام ئەو جگە لە ڕۆژی ناو تۆمارکردن و ڕۆژی وەرگرتنەوەی بڕوانامەکەی هیچ ڕۆژێکی دیکە نەهاتە قوتابخانە، بەڵام ئەو پلەیەی کە بە توانای خۆم بەدەستم هێنابوو، ئەوان بەبەرچاوی منەوە لە ڕێوڕەسمێکدا بەویان بەخشی.

تیروپشك کرا و ناوم لە فەرماندەی تۆپخانەی گەلی بۆلوو هاتەوە. لەوێش، لەبەشی لۆجیستی فەرماندەکە داندرام. بەبێ دواکەوتنیش، دۆسیەی کوردایەتی و کۆمۆنیستیم گەیشتە فەرماندەیی. ڕائیدی بەڕێوەبەری بەشی لۆجیستیمان زۆر قسەی ناخۆشی پێدەگوتم، هەردەم هەڕەشەی دەکرد و دەیگوت: "دەزانم چ گوونێکی" بۆیە گەر قسە بکەی ئاشکرات دەکەم، بەڵام من بەهۆی ئەو تەجروبەیەی لە قوتابخانە هەمبوو، لە ماوەیەکی کەم بەشی لۆجیستیم سەرلەنوێ ڕێکخستەوە. ساڵێك بەر لەوەی من بچم، تۆپ بە ئەسپ دەگوازرانەوە، بەڵام دواتر ئەسپ لە سوپا دەرهێندرا و ئامرازی دیکەی گواستنەوە شوێنی گرتەوە. ڕائیدەکەمان ئەو جوانووانەی تەمەنیان نەگەیشتبووە شەش مانگ، لەگەڵ جۆ و ئەسپەکان لە لیستی پێویستیەکانی بەشەکەمانی دەرهێنابوون، بەڵام کاتێك لیستی کەلوپەلەکان لە ئەنقەرە دەچێتە بەردەستی ئەنجوومەنی ژمێریاری بۆ وردبینی کردن، ئەو کلاواتەیان دۆزیبۆوە، بۆیە، ڕۆژێك هاتنە فەرماندەکەمان و ڕائید ئولڤیان دەستگیرکرد.

لە چەند پشکنینێکی پێشوو، موزەفەر ئالکوشی فەرماندەی یەکەکەمان، کارەکانی منی بە دڵ بوو، بۆیە، بانگی کردم و منی کردە بەڕێوەبەری بەشی لۆجیستی بە وەکالەت. تا ئەوکات دوو تەتبیقات کرابوو، هەردوو جارەکەش منیان جێ هێشتبوو،

بەڵام لەو ڕۆژە بە دواوە لە هەمـــوو تەتبیقاتەکـــان لە پـــاڵ فەرمانـدەی کەتیبەکەمـان چادریـان بـۆ منـیش هەڵـدەدا، لەبەر ئەوەی بەخـۆم چادرەکـانم دەدانـێ، بـۆیە، باشـترینیانم بـۆ خـۆم هەڵدەگرت. ڕۆژ هـات و ڕۆژ ڕۆیـی لە ئیسـتانبووڵەوە شـاندێك هاتن و زەمـی منیـان لای مـوزەفەر ئـاڵاکوش کردبـوو، پاشـاش ڕووی تێکردبوون و گوتبـووی: "هەسـتن ونـبن لەبەرچـاوم، مـن لێرە لەژێـر فەرمـانی پـۆلیس کـار نـاکەم، ١٥٠ ئەفسـەری یەدەك هاتووە، لەناویانـدا یەکێکـی تێـدایە بە پیـاو بچـێ، ئەویـش ئێـوە سەرتان خستووەتەسەری، بریـا هەموویـان وەك ئەو بـان، زیانیـان نەبوو گەر کۆمۆنیستیش بان".

**ئیستانبووڵ ١٩٥٦**

ئەو ماوەیە وازم لەسـەرجەم کارەکـانم هێنـابوو. بۆیـە، ناچـار بووم سەرلەنوێ کارێکی تازە دابمەزرێنمەوە، چونکە بە درێژایی ژیـانی سیاسـیم، لە هـیچ لایەکەوە پـارەم وەرنەگرتبـوو، لە هـیچ شوێنێك لە پێنـاو خەبـاتی سیاسـیم، نە لە حکـوومەت نە لە هـیچ شـوێنێکی دیـکە سـوودی مـاددیم نەکردبـوو، چـیم کردبـێ بە قازانجی کاری خۆم کردوومە.

بیرم لەوە نەدەکـردەوە سـەرلەنوێ بەشـە نـاوخۆیەك دروسـت بـکەم، بەڵکـو دەمویسـت (کـانتین) دووکـانێکی لەفە بـکەمەوە، چونکە هەم بە پـارەیەکی کەمتـر دادەمەزرا و هەمـیش قـازانجی زۆرتر بوو، بۆیە شوێنێکی تازەم دامەزرانـد. لەوێ، سـاندەویچ و تۆست و چەندان جۆر شەربەتی میوە و دۆ و بیـرەم دەفرۆشـت، گەر سەرنجیش بدەن، بۆ دروستکردنی ئەو خواردنـانە پێویسـتت بە پـارەیەکی زۆر نیـیە، چـونکە ڕۆژانە دەمکـڕی و ڕۆژانەش

دەفرۆشـرا، بە چەنـد هەزار لیـرەیەك كـارەكە بەڕێوەدەچـوو، سوودەكەشی نزیكەی پەنجا لە سەت بوو.

بەزازێـك بـای هەزاران لیـرە قومـاش دەكڕێـت و لە دووكـانەكەی دادەنێـت، لە مـاوەی یەك دوو سـاڵ یەڵا تەواوی قوماشەكە دەفرۆشێت، ئەوسا وەك ئێستاش دۆخی ئابووری ئاوا گران نەبوو، كەلوپەل گەر نەفرۆشابا لە شـوێنی خـۆی نرخـی گـران نەدەبـوو، بەڵام لەبەر ئەوەی كـارەكەی ئـێمە ڕۆژانە بـوو، بۆیە ئەو سەرمایە كەمەمان ڕۆڵی سەرمایەیەكی گەورەی دەگێڕا. لە ڕووی سیاسیشـەوە لە ئیسـتانبووڵ و تەواوی توركیـا لە ڕووخـانی پـارتی دیمـوكرات بەولاوە هـیچ چـالاكیەكی دیـكە لەئارادا نەبوو.

پـارتە نهێنیەكـانی كۆمۆنیسـتی و سۆسیالیسـت خۆیـان بـێ هەسـت و خوسـت كردبـوو، منـیش بە ژیـانێكی ئـاوا خـامۆش ڕانەهـاتبووم، بـۆیە جـار بەجـار لەگەڵ قوتـابییە كوردەكـان كۆدەبووینەوە، لە نێویاندا چەندان خوێندكاری كوردی عێراق و سـووریا و ئیـرانیش هەبـوون، هەمـوو جـارێكیش لە گفتوگۆكانمان، لەناو ڕووداوە سیاسیەكانی جیهان، باسـی كێشـە سیاسیەكانی كوردیشمان دەكرد. وردە وردە چـالاكیی قوتابیـان لە زانكۆكان دەستی پێ كردبـوو، منـیش بەپێـی توانـا پاڵپشـتیم دەكردن، جگە لە عورفی ئاق قۆین و زیا شـەڕەفخان ئۆغلـوو و حەسەن ئاككوش، كە دواتر هاتنە نـاو گرووپـی ٤٩ كـانەوە، لە ئیسـتانبووڵ و ئەنـقەرە ڕائیـد شـەوكەت تـوران و دەوروبەرەكەیشمان دەناسـی، بەو شـێوەیەش چـووینە نـاو سـاڵی ١٩٥٨.

لە عێـراق، كودەتـا كرابـوو و بـارزانی لە یەكێتـی سـۆڤیەت گەڕابـۆوە. لەوێ ڕۆژی خـۆش چـاوەڕوانی كـوردی دەكـرد.

دەوڵەتی عێراق ئاڵای کوردستانی قبوولکردبوو، لەگەڵ ئەوە لە دەستووریش ئامـاژەی بەوە کردبـوو کە خەڵکـی عێـراق لە هەردوو گەلـی عەرەب و کـورد پێـك دێـت، بـۆیە هەمـوو چالاکییەکی کوردی ئازاد بوو، ڕۆژنامەی کـوردی دەردەچـوو، لە قوتابخانەکـان پەروەردەی کـوردی بە قوتابیـان دەدرا. ئەو گۆڕانکـارییە سیاسـییانە وای کـرد کـاریگەریی لەسـەر جووڵانەوەکانی کوردستانی تورکیـاش هەبێ، بـۆیە لەو مـاوەیە دیسـان بە زگـورتی چـوومەوە دیـاربەکر و بڕیـاری دەرکردنـی ڕۆژنامەیەکم دا.

### ١٩٥٨ - دیاربەکر (ئیلەری یورد)

ئەوکـاتەی چـوومە دیـاربەکر ڕۆژنـامەیەك بە نـاوی (ئـیلەری یورد) دەردەچوو، خاوەنەکەی عەبدولڕەحمان دۆلاك دەرچـووی کـۆلێژی زانسـتە ئاینیەکـانی بەشـی ئیمـامەتی بـوو، وەکـو ڕۆژنامەکانی دیکەی شارەکە نا سیاسی و نـاوچەیی بـوو. دۆلاك بۆ ئەوەی لە ڕێکلام کـردن شـتێکی دەسـتکەوێت ڕۆژنـامەکەی دەردەکرد، بەپێی یاساش دەبوو ٢٥ تا ٣٠ دانە دوای چـاپکردنی بدرابا دامودەزگاکـانی میـری، ئەویـش تیـراژەکەی هەر ئەوەنـدە چاپـدەکرد کە دەیـدایە فەرمانگەکـان، یـانی بە کـوردی و بە کـورتی ڕۆژنـامەکە کڕیـار و خـوێنەری نەبـوو. لەگەڵ جانیـپ یلدرمی پارێزەر بانگی عەبدولڕەحمان دۆلاکمـان کـرد و پێمـان گوت: "کارگێڕیی ڕۆژنامەکە بۆ ئێمە جێ بهـێڵە، کـاك جانیـب دەبێتە بەڕێوەبەری نووسین، منـیش وتـاری تێـدا بـڵاو دەکەمەوە، گەر بیریشت بێ چوار پێنج ساڵ پێش ئێسـتا گۆڤـاری شـەرقمان بڵاودەکردەوە، دڵنیابە ڕۆژنامەکەت وەك ئەو ناودار دەبێت، ئـێمە

کار دەکەین و تێچووەکەی لە ئەستۆی خۆمان دەگرین و سوودەکەشی با بۆتۆ بێت"، ئەویش بە داوایەکەمان ڕازی بوو.

نیو تۆپ کاغەز هەبوو، بەڵام چەند مانگێك بوو مەرەکەبی ئامێری چاپەکەی نەمابوو، بۆیە بەشێك لەو لاپەڕانەی بڵاوی دەکردەوە نەدەخوێندرانەوە، لە عەبدولڕەحمان دۆلاکم پرسی: "بۆ ئاوا ڕۆژنامە بڵاو دەکەیتەوە؟"، گوتی: "کاکۆ وەڵا مشك چەند شوێنێکی ناو ئامێری چاپکردنەکەی خواردووە، بۆیە مورەکەب ناگاتە ئەوێ تا بە جوانی چاپی بکات". ئامێرەکەمان تەعمیر کردەوە و مورەکەب و کاغەزمان کڕی و دەستمان بە بڵاوکردنەوە کرد. لە یەکەم ژمارەی دوای وەرگرتنی ڕۆژنامەکە ڕامانگەیاند کە ئیدی هەموو ڕۆژێك من وتار لەو ڕۆژنامەکە بڵاو دەکەمەوە، بۆیە ئەو ژمارەیەمان بۆ ئاگاداریی خەڵك، بەبێ بەرامبەر لە دیاربەکر بڵاو کردەوە. بەم شێوەیە خوێنەر ئاگاداربوون نووسینەکانم لەو ڕۆژنامەیە بڵاودەکەمەوە، ئیدی لەو کاتەوە ڕۆژنامەکە ناسرا و پێشکەوت و سەدان کەس داوای ئەوەیان دەکرد ڕۆژانە وەکو کڕیارێك ڕۆژنامەکەیان بۆ بنێردرێت، چونکە ئەوانە لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان بوون، ڕۆژنامەکەمان، بۆ زانکۆکانی ئەنقەرە و ئیستانبوولیش نارد، تا وای لێهات چەندمان لە توانا با تیراژی ڕۆژنامەکەمان پتر دەکرد.

ڕۆژێك کچێکم دیت لە بەردەم مزگەوتی ئولوو دەرۆزەی دەکرد، جەرگم بۆی سووتا، ئەو کچە جوانە دەستەکانی کردبۆوە و دەیگوت: "ژ بۆ خودێ سەدەقەکی"، لە خەڵك دەپاڕاوە و داوای هاوکاریی دەکرد، دەستم خستە گیرفانم و چەند قروشێکم دایێ. لێم پرسی تورکی دەزانی؟ ئەویش بە بنزاری دیاربەکری گوتی: "تێدەگەم بەڵام ناتوانم قسەی پێ

بکەم"، کە ڕۆیشتم لە دواوە ئەو نزایەی بۆ کردم "خوا لە گوناهەکانت ببوریت". ئەو نزایە منی شێت کرد، کچەکە بەو نزایەی وەك ئەوەبوو پێم بڵێ ئێوە بۆ من لەو دۆخە ڕزگار ناکەن، بۆیە ئێوەش گوناهبارن. بەدەم ڕێگاوە ئەوەندەی بیر لەو نزایە بکەمەوە، ئاگام لە خۆم نەمابوو، بۆیە خۆم بە گوناهبار دادەنا. ڕۆژی دواتر لە ژێر ناونیشانی "ژ بۆ خودێ سەدەقەکی" ڕووداوەکەی دوێنێم کردە وتارێك و بڵاوم کردەوە.

وتارەکە وەك بۆمبا دەنگی دایەوە، داواکاری گشتیی دیاربەکر ڕاستەوخۆ، بە تۆمەتی ئەوەی چۆن دەبێ بە کوردی وتار بنووسرێ دۆسیەیێکیان لەسەر کردمەوە، بەڵام من وازم نەهێنا. هەستام دیمانەیەکی خەیاڵییشم بە کوردی نووسی، ئەویشیان لەسەر کردمە دۆسیەیەکی دیکە، چونکە دیمانە خەیاڵییەکانم سیاسی بوون و دۆخی نالەباری کوردستانم باس دەکرد. لەناو یەکێکیاندا دیمانەیەك بوو لەگەڵ دەرۆزەکەرێکی ئیختیار. پرسیاری ئەوەم لێ کرد بۆچی دەستت پان دەکەیەوە؟ وەڵامەکەیم بە کوردی بەو شێوەیە نووسی: "ئەی من چی بکەم، تۆ دەبینی، هەردوو چاوم کوێرە، کوڕێکم هەبوو ئەویشیان لە سێدارەدا، دایکیشی لە دوای ئەو بە زگی دا و مرد، ئێستا من بێ خاوەن و پەرێشان ماومەتەوە". ئەو نووسینەشم داوایەکی لەسەر دروست کرا، تەنیا لەبەر ئەوەی بە کوردیم دەنووسی دۆسیەم لەسەر نەدەکراوە، بەڵکو تۆمەتی ئەوەشیان دامە پاڵ کە ڕووداوی کۆن بەبیری خەڵك دەهێنمەوە و تۆوی نیفاق و فەساد لەناخی خەڵك دەچێنم، بەڵام بەسەر هەموو دۆسیەکاندا سەرکەوتم، چونکە داواکانم لەلایەن پارێزەری کوردی بە ناموسەوە بەرگری لێدەکرا، جاری وا هەبوو لە یەك دانیشتنی دادگا ٣٥ پارێزەر بەیەکەوە پارێزگارییان لە دۆسیەکەم دەکرد.

هۆڵە بچووکەکەی دادگای دیاربەکر، شوێن نەدەما بۆ ئەوانەی دەهاتن و گوێیان لە دادگاییکردنەکە دەگرت، چونکە زۆرجار لە نێوان من و دادوەردا پرسیار و وەڵامی سەیر ڕووی دەدا.

لەو بارەوە دەمەوێ یەك دوو نموونەتان بۆ باس بکەم:

کاك ئەحمەدی دادوەری تاوانە بەراییەکان، لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا پێی گوتم: "کاك مووسا بۆچی بە کوردی دەنووسن؟"، منیش ئاوا وەڵامم داوە: "جەنابی دادوەر، لە ئیستانبووڵ یەهوودی و ئەرمەنی و ڕوومەکان ڕۆژنامە دەردەکەن، جگە لەوە ڕۆژنامەی ئینگلیزی و فەڕەنسیش دەردەچێ، بۆیە گەر من بە کوردی بنووسم چی دەبێت؟". دادوەر: "بەڕێزم ئەوان کەمینەن"، منیش: "جەنابی دادوەر یانی لەو وڵاتە کەمینەکان مافان لە زۆرینەکان پترە؟ چونکە گەر بە قەد کەمینەکان مافم نەبێت، من چی لە زۆرینە بوون بکەم، تکایە ئێوە بڕیار بدەن تا منیش بە کەمینە هەژمار بکرێم". دادوەر و داواکاری گشتی و پارێزەرەکان پێکەنین. دادوەر گوتی: "مووسا چی دەڵێی، ئەو کارە بە بڕیارێکی من چارەسەر دەبێت؟" لەبەر ئەوەی دادوەریش هاوزمانم بوو بۆیە ئەوەندەی لە توانای با منی لە یاساکان دەپاراست.

لە ڕووداوی دووەم، دادوەر عەلی بوو، کاك عەلی خەڵکی ئەلعەزیزلی بوو، لە ڕووی مێشك و جەستەوە کەسێکی نا ئاسایی بوو، قاچەکانی کورت و لە ناوقەدیشی بۆ سەرەوە وەك دەبابە وابوو، بۆیە لە دیاربەکر پێیان دەگوت: "عەلی قوون شۆڕ".

ئەوکات لە عێراق کەسێکی فاشیستی عەرەب لە مووسڵ بە ناوی جەنەڕاڵ شەواف لە عەبدولکەریم قاسم یاخی ببوو، عەبدولکەریم قاسمیش بەرپرسیاریەتی دامرکاندنەوەی

سەرهەڵدانەکەی ڕادەستی بارزانی کردبوو، بارزانیش لەگەڵ پێشمەرگەکانی چووبوونە مووسڵ و بە هاوکاریی خەڵکی کورد، لە ماوەیەکی کەم کۆتاییان بە جووڵانەوەی یاخییەکان هێنابوو و جەنەڕاڵ شەواف و ئەوانەی بەشداریی جووڵانەوەکەشیان کردبوو، گولەباران کرابوون و ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی هاوکاریی ئەو جەنەڕاڵەشیان کردبوو، بە سزای خۆیان گەیاندران، ئەوانەی بە سەلامەتیش ڕایانکرد، خۆیان گەیاندبووە سووریا و ئوردن و حیجاز. لەناو ئەو عەشیرەتانە گەورەترینیان عەشیرەتی شەمەڕی بوو. میدیاکانی ئیستانبوڵ کوردیان بە هێرشێکی وەحشیانە بۆ سەر عەشیرەتی شەمەڕی تۆمەتبار دەکرد، منیش وتارێکم بەم شێوەیەی خوارەوە نووسی، بە ناونیشانی (شەمەڕی کێیە):

"لە یەکەمین جەنگی جیهان، سوپای عوسمانی لە بەرەی جەبهەی عێراق شکان و بە پەرت و بڵاوی هەڵدەهاتن، چەکدارانی عەشیرەتی شەمەڕی، باوەڕیان وابوو سەربازانی عوسمانی لە کاتی هەڵاتن بۆ ئەوەی زێڕەکانیان لێ زەوت نەکرێ، هەرچی لیرەی هەیان بووە قوتیان داوە، بۆیە ئەو سەربازە عوسمانیانەی دەکەوتنە دەست ماڵباتی شەمەڕیەکان، دەکوژران و ڕیخەڵۆکانیان دەردەهێنان، تا ئاڵتوونە قوتدراوەکانیان دەربهێنن، بۆیە ئەو عەشیرەتەی میدیاکانمان بە ئاخ و ناڵە بۆی دەگریێن، ئاوا بوونە".

بە تۆمەتی ئەوەی دەست وەردەدەمە ناو کاروباری ناوخۆیی وڵاتێکی دراوسێمان منیان دایە دادگا، دادوەر چەند جارێك لێی پرسیم بۆچی بارزانیت خۆش دەوێ و لە عەرەبیش پەست و تووڕەی؟ منیش گوتم: "جەنابی دادوەر ئەوە چ جۆرە پرسیارێکە، بە ڕێك و ڕەوانی پرسیارم لێ بکەن، تا منیش

وەڵامتـان بـدەمەوە، چـونکە لێـرە هـیچ هەسـتێکی تـایبەتیی خۆشەویسـتی و ڕقلێبـوونەوە نیـیە، بەڵام جەنـابی دادوەر بـا مـن پرسیارێکتان لێ بکەم. بۆچی ئێـوە ڕقتـان لە بـارزانی دەبێـتەوە و عەرەبتان خۆش دەوێت؟"، دادوەر گوتی: "تۆ نـاتوانی پرسـیار لە من بکەی"، منیش گوتم: "مادەم وایە با کاتیب بنووسـێ چـونکە وەڵامتـان دەدەمەوە". ئەویـش گـوتی: "باشـە بیڵـێ"، گـوتم: "مـن دەیڵێم و ئەو کچە کاتیبەت با بنووسێت". ڕووم لە کچە کـرد و گوتم: "جەنابی دادوەر کاك عەلی لەبەر چ هۆکارێك لە بارزانی پەسـتبێت، منـیش لەبەر هەمـان هۆکـار خۆشـم دەوێ"، دادوەر گوتی: "ئاوا نابێت"، منـیش بە "دەبـێ" وەڵامـم داوە. لە کۆتاییـدا دادوەر کـاغەزەکەی لە ئـامێری چـاپکردنی کـچەکە دەرهێنـا و دڕاندی.

وای لێهـاتبوو نووسـین و وتـاری هەمـوو ڕۆژێکـم دەبـووە دۆسـیەیەکی تـازە لە دادگـا و سـەرجەم داواکانیشـم بە تەواوی کوردسـتان و ئیسـتانبووڵ و ئەنـقەرە بـڵاو دەبـۆوە. بیرمکـردەوە مادەم هەموو ڕۆژێك لە دادگام، با شتێك بنووسم تـا هـیچ نەبـێ ئەوەندە هاتووچۆیەی دادگام بهێنـێ. شـیعرێکی درێـژم بە نـاوی کمـڵ نووســی و بە تـورکیش نـاوەڕۆکەکەیم ڕوونکـردەوە. لە کۆتایی دا بە کچەی ناو پـاڵەوانی شـیعرەکەم گـوت: "خوشـکم دڵتەنگ مەبە، ئیدی براکانت دەگەنە فریات بۆ ڕزگارکردنـت لە ســزای فرســەتخوازەکان" لە مــاوەیەکی کەم شــیعرەکە کەوتە سەرزمانی زۆربەی گەنجە کوردەکان، میـدیای تـورکی دونیـای لێ ویران بوو، سەرجەم ئەو ڕۆژنامانەی لە ئیستانبووڵ و ئەنـقەرە و ئیزمیر دەردەچوون وتاریان لەسـەر نووسـیم. لەناویانـدا تـاك و تووك دەیانگوت گەر شـیعرێك بە کـوردی بنووسـرێ ئاسـاییە،، بەڵام زۆربەیان ئاگریـان لـێ هەڵدەسـتا، بە تـایبەتی فـاتیح ڕفقـی

ئاتـای لە ڕۆژنـامەی ئولـوس داوای سـەر پەڕانـدنی دەکـردم. لەلایەکـی دیـکە قوتابیـانی کـوردی زانکۆکـانی ئیسـتانبووڵ و ئەنقەرە بە کەلەجانەوە شیعرەکەیان ئەزبەر دەکرد. لە ئیسـتانبووڵ و ئەنقەرە و شارە کوردییەکـان، سـەدان کـاردانەوەی ئەرێنـی و پیرۆزبایی و تەلەگرافی دەستخۆشـیم بـۆ هـات. ڕۆژنامەکەشـمان ببـووە ناوەنـدێکی دروسـتکردنی ڕووداو، لەسـەر ئەو شـیعرەش داوایان لە دژم تۆمار کرد، بەڵام لە دادگا لەوەشم بردەوە.

ماوەیەك بۆ بانگەشەی هەڵبژاردن، عیسـمەت پاشـا، دەسـتی بە خولێکی گەڕان کردبوو بەناو شارەکانی تورکیا. لە چەندان شـار ڕێگایـان نەدەدا پڕوپاگەنـدە بکـات. لەبەر ئەوە گەشـتەکانی شەمەندەفەر و فڕۆکە و پاپۆڕ ڕادەگیران، هەرچۆنێـك بـوو پاشـا تـوانی بچێـتە شـاری ئوشـاك. ئەو دژی پـارتی دیمـوکرات نمایشـێکی گەورەی ڕێکخسـتبوو، بەڵام عیسـمەت ئینۆنـۆ لە ساتەوەختەی هاتنە خوارەوەی لە شـەمەندەفەر یەکێـك بەردێکـی تێدەگرێ و سەری دەشکێنێ، بۆیە پاشـا سـەرتاپای گیـانی بـووە خوێن. من عیسمەت پاشـام خۆشنەدەویسـت، ئێسـتاش هەر ڕقـم لێیەتـی، بەڵام ناشـرینی ڕووداوەکە بـووە هەوێنـی ئەو شـیعرە کورتەم:

"ئوشاك بە مێرگ و کانییە
یەك بەردێکی هاوێشتییە،
سەری پاشای شکاندییە
کاکۆ ئەوە نە دیموکراسییە
کارێکی زۆر بێ ناموسییە"

دوای نووسـینی شـیعرەکە، ڕۆژی دواتـر لە ڕۆژنـامەم بڵاوکردەوە، دوو ڕۆژ پاش بڵاوبوونەوەی، بە واژووی عیسـمەت ئینۆنۆ، تەلەگرافێکم بەو ناوەڕۆکەی خوارەوە بۆ هات:

"مووسا عەنتەر بەهۆی ئەو ڕێگایەی گرتووتانە بەر بۆ سەرکەوتنی دیموکراسی، پیرۆزباییتان لێدەکەم و چاوەکانت ماچ دەکەم".

ئەو تەلەگرافەشم لە چوارچێوەی نووسینێکی ئاوا لە ڕۆژنامە بلاوکردەوە:

"کاتێك خوێنی سوورم، لە سەرە سپیەکەی عیسمەت پاشا بینی، بیرم لە چیا سپیە خوێناوییەکانی ئاگری و ساسۆن و دێرسیمی کوردستان کردەوە". ئەو نووسینەشم دۆسیەکی لەسەر کراوە، بەڵام دیسان بە ڕووی سپیەوە لێی دەرچووم.

بە خێرایی چووبووینە ناو ساڵی ۱۹۵۹، ئیدی هەموو لایەك ڕۆژنامەکەمانیان، تەنیا وەکو ناوەندێکی میدیایی نا، بەڵکو، وەکو ناوەندێکی شۆڕشگێڕیی جودا دەبینی. پاریزەر، لە قارسەوە بە فرۆکە دەهاتنە دیاربەکر، تا بەرگری لە دۆسیەکانم بکەن، هۆڵی دادگا و باڵەخانەی دادگا، لە ڕۆژی دادگاییەکاندا دەبوونە جێی دیدار و کۆبوونەوەی خەڵك، دژی ئەو پاڵەپۆستۆ سیاسی و حکوومییانەی لە دیاربەکر لەسەرمان بوو. لە زانکۆکانی ئیستانبووڵ و ئەنقەرە، قوتابییە کوردەکان و تورکە چەپەکانی کۆلێژی سیاسەت، بە گوتنەوەی دروشم و نووسینی پانکارت و بەستنی کۆڕ و سمینار، پشتگیریان دەکردین. دەسەڵاتی پارتی دیموکرات ئەوسا وەك گێژی لێهاتبوو، لەگەڵ ئەو چالاکییانەی ئێمە زیاتر واقیان ورمابوو. جەلال بەیاری سەرۆککۆمار، هەموو یاساکانی خستبووە ژێر پێی و تەلەفۆنی بۆ پارێزگاری دیاربەکر کردبوو و فەرمانی دابوو "سەرم پان بکاتەوە".

لەلایەکی دیکەش، بەهێزبوونی بارزانی لە عێراق و جووڵانەوەکانی ئێمەیان لە تورکیا بەیەکەوە دەبەستەوە، تا وای لێهاتبوو ڕووداوەکانمان گەیشتبووە ناو موناقەشە و ڕۆژەڤی

پەرلەمانی تورکیاش. وەك لەسەرەوە باسم کرد، پەرلەمانتاری شاری نیدە، کاتێك لە ڕیزەکانی سوپا عەمید بوو، بە جەنەڕاڵی ناوداری ئەڵمانی ڕوومەڵیان دەچواند. ئاسم ئەرەن پێشنیازێکی دابووە پەرلەمان، گوایە لە کەرکوك کوردەکان تورکەکان دەکوژن، بۆیە دەیگوت: "ئایا حکوومەت بەرامبەر ئەمە بیر لە پیادەکردنی هەمان کار دەکاتەوە؟"، یانی داوای ئەوەی لە حکوومەت دەکرد، بۆچی لە کەرکوك تورك بە دەستی کورد دەکوژرێ و ئێمە لێرە کوردەکان نەکوژینەوە؟ بەڵام خوێندکارانی ئیستانبووڵ و ئەنقەرە، بەرامبەر بەو پێشنیارە، خۆپیشاندانیان کرد و نارەزایەتییەکی گەورەیان دەربڕی.

### ناکۆکییەکانی نێوان حەسەن دەیار و تارق زیا

ساڵی ١٩٥٨، سیاسەتێکی ئاقلانە لە هیچ لایەك نەمابوو، خەڵك ئەوەندە بە ڕووداوە سیاسییەکانەوە وەڕەس ببوو، کاریگەریی دۆخە سیاسییەکە گەیشتبووە دیاربەکریش، لە کاتێکدا ئەو شارە لە هەموو لایەکەوە داتەپی بوو، کەچی سیاسییەکانمان، لەسەر ئەوەی کێ دەبێتە سەرۆکی ڕێکخراوی مانگی سوور کەوتبوونە گیانی یەك. لەلایەك فراکسیۆنی تارق زیا و لەلایەکی دیکەش فراکسیۆنی حەسەن دەیار هەبوو.

ڕێك بەروارەکەیم بیر نایەتەوە، بەڵام هەڵبژاردنەکە لە یانەی بازرگانەکان بەڕێوەچوو، هەردوو لا بەناو یەك کەوتن، تا ئێستاش ئەو فەرمانەی حەسەن دەیاری زازا لە دیاربەکر دەگوترێتەوە کە بە لایەنگرانی گوتبوو: "هێرش بۆ سەر کراڤاتەکان". کاك ئیلیاسی سووریانی بەڕێزی دکتۆری ددانی هاوشاریم، لە ترسی گیانی خۆی لە پەنجەرەوە خۆی فڕێدا خوارەوە و مێشکی پرژا و کۆچی دوایی کرد.

ئەوانی دیکەش، خەڵك و هێزەكانی ئاسایش لێكیان جیا كردنەوە. بەڵام ڕووداوەكە كۆتایی نەهات، لەلایەك نزیكەی ١٥٠ – ٢٠٠ زازای تەور بەدەست و شەق وەشێنی لایەنگری حەسەن دەیار و لەلایەكی دیكەش فیداییەكانی دكتۆر زیا ئەكینجی لەناوچەی لیجەوە هاتبوون، هەردوو لا خۆیان ئامادە كردبوو بۆ ڕووداوێكی خوێناوی. تەواوی شارەكە بە هەستیارییەوە مامەڵەی دەكرد، دكتۆر زیا دۆستم بوو، حەسەن دەیاریش هەموو كاتێك دەیگوت: "مووسا تۆ خۆشەویست و بەڕێزی لەلام"، لەبەر ئەوەی ڕووداوەكە منیشی بێتاقەت كردبوو، بۆیە بیرم كردەوە و پلانێكی ئاوام بە مێشكدا هات:

حەسەن دەیار لە ناوچەی داغ كاپی، كۆگایەكی داری هەبوو كە دابەشی دیاربەكری دەكرد. هەستام چوومە نوسینگەكەی، كە منی بینی بۆ پێشوازیم هاتە بەر دەرگا و یەكیدمان ماچكرد، بەڵام هەر چوار دەوری شوێنی كارەكەی بە پیاوە تەور بە دەستەكانی گیرابوو، گوتم: "حەسەنی برا، ڕووداوەكە زۆر ناشرینە، بەڵام زۆر سادەیە، ئێ خۆ مانگی سوور ڕێكخراوێكی خێرخوازییە، ئاخر گەر لە سەر بوونە سەرۆكی لقێكی ئەو ڕێكخراوە خوێن بڕژێ، تەواوی خێرخوازان و خۆبەخشانی مانگی سوور و خاچی سوور و ڕێكخراوەكانی دیكەی خێرخوازیی جیهان زۆر دڵتەنگ دەبن و ئێمەش شەرمەندە. بۆیە، تكات لێدەكەم لەسەر داوای من و لەبەر خاتری برای خۆت با وا بكەین ئەو ڕووداوە وەك ئەوەی هەر ڕووی نەدابێت".

حەسەن دەیار زۆر بە ڕێزەوە گوتی: "كاك مووسا وەڵاهی زۆر برینداریان كردوومە، بەڵام خاتری تۆ زۆر گەورەترە، بێتاقەت مەبە و چی بڵێی ئاوا دەبێت". منیش گوتم: "مادەم وایە

هەستە بابڕۆینە لای تاریق، بەڵام من و تۆ بە تەنیا دەڕۆین".
ئەویش گوتی: "باشە". پیاوەکانی لەو هەڵوێستە واقیان وڕما.

حەسەن دەیار قۆڵی خستە ناو قۆڵم و بە شەقامەکانی دیاربەکر، وەك نواندنی نمایشێك چووینە لای دکتۆر تاریق لە نۆرینگە پزیشکییەکەی. لە ڕێگا ئەوەی ئێمەی دەبینی سەری سوڕدەما و نەیدەزانی چ ڕوودەدات، حەسەنم دانیشاند و لەو بەینەش جانیب یلدرم هات، لەولاتر تاریقیشمان ڕازی کرد و بە یەکدی ماچکردن ئاشت بوونەوە و تەواوی دیاربەکر ئۆخەیەکی بەبەردا هاتەوە.

سەیر ئەوەبوو، کاتێك لە ساڵی ١٩٥٩ دەستگیرکرام، ئەو ڕووداوەیان لە ئەمنییەت بە تاوان بۆ هەژمارکردبووم و بە تووڕەییەوە گوتیان: "هەتیو کاتێك لە دیاربەکر، پارێزگار و فەرماندەی سەربازی و بەڕێوەبەری پۆلیس و داواکاری گشتی و دادوەر هەبێت، ئاشتکردنەوەی ئەوانە کەی کاری تۆیە؟". دوای ئەو قسەیە تێگەیشتم کە هێزە ئەمنییەکان دەیانویست ڕووداوێکی خوێناوی لەناو خەڵکی دیاربەکر ڕووبدات.

# بەشی سێیەم
# چلونۆیەکان

ئەوکاتەی ئێمە سەرقاڵی ڕێکخستنی ئەو کارانە بووین، حکوومەتیش بە دەستی بەتاڵ دانەنیشتبوو. دوای ئەو کودەتایەی دژی پارتی دیموکرات کرا، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی دەستمان کەوت، کە لەلایەن ئافجی ئۆغلووهوە لە گۆڤاری (یۆن) بڵاوکراوە، جەلال بەیار و جەودەت سونای تورانجیی جێگری سوپاسالار و تەوفیق ئیلەری وەزیر و عەدنان مەندەرێسی سەرۆکوەزیران و فاتن ڕووشتووی وەزیری دەرەوەی تورکیا، کۆدەبنەوە. ئەرگوون گۆك دەنیزی بەڕێوەبەری بەشی کێشەی کورد لە ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا، ڕاپۆرتی ئامادەکراوی خۆی دەخوێنێتەوە، کە بە شێوەیەکی گشتی سەرە قەڵەمەکانی بەو شێوەیە بوو:

١- گەر لە تورکیا هەزار ڕووناکبیری کورد لەناو ببەین، بەلای کەمەوە کێشەی کورد ٣٠ ساڵ دەچێتە دواوە.

٢- لە ئۆپەراسیۆنەکان، کاتێك ڕووناکبیرەکان دەستگیر دەکەین، دەبێ لە ژێر ناوی کۆمۆنیست بوونیان ئەو کارە بکرێ، چونکە کورد حەزیان بە کۆمۆنیستەکان نییە و پشتگیرییان ناکەن.

٣- نابێ ئەو کەسانەی لە پاڵ پارتێکی سیاسی بە هێز کار دەکەن بکەونە ناو چوارچێوەی ئۆپەراسیۆنەکە.

دوای خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە، جەلال بەیار و جەودەت سونای دەڵێن زۆر باشە، جەلال بەیار، بە پشتبەستن بە تەجرووبەکەی دێرسیمی، دەڵێ: "پێویستە لە ڕەگەوە لەناویان ببەین". تەوفیق ئیلەری دەپرسێ: "برادەرینە ئێوە من دەناسن و دەزانن دۆستی کورد نیم، بەڵام گەر ئۆپەراسیۆنێکی ئاوا بکەین، ئامان، کوردستانیش وەك جەزایری لێنەیەت؟" چونکە (ئەوسا لە جەزائیر شەڕ و پێکدادانێکی زۆر بە هێز لە نێوان فەڕەنسا و شۆرشگێڕە جەزائیرییەکان هەبوو بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەیان). لە وەڵامدا فاتین ڕوشتوو زۆرڵوو دەڵێ: "شتی وا چۆن دەبێ؟ من لە ئێستاوە دەست لەکار دەکێشمەوە، خۆمان لە دەرەوە چاو و ڕووی ئەوەمان نییە سەیری کەس بکەین، کۆمەڵکوژیی ئەرمەن و ڕووم و کوردمان بەچاو دادەنەوە، ئێستا، کە خەریکە ئەو برینانە قەتماغە دەگرن، ناتوانین بەرگری لە کۆمەڵکوژییەکی دیکەی لەو شێوەیە بکەین". تەنیا عەدنان مەندەرێس دەمێنێتەوە، ئەویش دەڵێ: "باشە برادەرینە بەپێی ڕاپۆرتی ئەمنییەت بێ، ئەو تاوانانەی باسیان کردووە، سزاکانیان لە سێدارە دانە، مادەم وایە با ئێمە ٥٠ کەسیان لێ دەستگیر بکەین و بیاندەینە دادگا و بە بڕیاری دادوەریش لە سێدارەیان بدەین، بەو شێوەیە گەر هەر جارە و ٥٠ کەسیان دەستگیر بکەین و لە سێدارەیان بدەین، لە ماوەیەکی کەم ئەو هەزار کەسە کۆتایی پێدەهێنین"، هەموو بڕیار لەسەر ئەو بۆچوونە دەدەن.

بەر لە هەموو شتێك، دادگای سەربازیی ئەنقەرە، بەیانی دەستگیرکردنی ٥٠ کەس دەردەکا بەبێ ناوهێنانی هیچ کەسێك، دواتر لیستەکە دەداتە ئاسایشی نیشتمانیی تورکیا، دواتر ئاسایشی نیشتمانی ناوی کێ لەو لیستە ٥٠ کەسییە بنووسێ، سەرەتا ئەوان

دەستگیردەکەن. لە ئیستانبووڵ، شوێن بۆ ئەو کەسانە ئامادە کرا کە بڕیار بوو دەستگیر بکرێن. لە سەردەمی عوسمانییەکان لە پشت باڵەخانەی "حەربییە"، لە شوێنی خوێندنی زستانەی قوتابیانی قوتابخانەکە، هۆڵێکی داخراو هەبوو، لەوێ بە قەبارەی یەك مەتر و دوو مەتر، نزیکەی ٤٠ ژووری داخراویان دروستکرد. دوای تەواوی بوونی شوێنەکە لە ١٧ی مانگی دوازدەی،١٩٥٩ کە ئێمە ئەو ڕۆژمان بە (شەبی ئاروز) ناودەهێنا کە ڕۆژی کۆچی دوایی مەولانەیە، لە تەواوی تورکیا، من و برادەرەکانم دەستگیرکراین. سەیریان کرد ٥٠ کەسیان دەستگیر کردووە، بەڵام ژوورەکان ژمارەیان ٤٠ دانەیە. دوای چەندان ساڵ، کە چووینە بەردەم دادوەر ٤٩ کەس بووین، بۆیە بەو ڕووداوەیان دەگوت ٤٩ یەکان، هۆکارەکەشی ئەوە بوو، ئەمین باتووی هاوشاریم، قوتابی پۆلی سێیەمی کۆلێژی یاسا، لە زیندان کۆچی دوایی کرد. بۆیە، ٤٩ کەس ماینەوە. کە ئازاد کراین چوومە ژوورەکەی ئەمین، بە خوێنی خۆی لەسەر دیوارەکانی ئەمەی نووسیبوو:

"گەر سەرپشك بم لەوەی، ئایا دەمەوێ ببمە گوڵی باخچەی کۆیلایەتی، یان دڕکێك لە باخچەی ئازادی؟ بە دڵنیاییەوە ئەوەی دووەمییان هەڵدەبژێرم".

مادەم باسی ئەمینم کرد، با تۆزێك درێژەی پێبدەم. کاتێك ساڵی ١٩٦٢ ئازاد کراین، بە دوای دۆزینەوەی گۆڕی ئەمین کەوتم، چونکە زانیبووم تەرمەکەی برابووە نەخۆشخانەی حەیدەرپاشای سەربازی. چوومە نەخۆشخانەکە و تکای ئەوەم لە کاتبەکانیان کرد دۆسیەی ئەمینم بدەنێ، بەرامبەر ئەوەش پارەم

دانێ، ئەوانیش ژمارەی کێلی گۆڕەکەیان دامێ لە گۆڕستانی (کەرەجە ئەحمەد)[1]، دوای وەرگرتنی ژمارەی کێلەکەی چوومە گۆڕستانەکە و قەبرەکەیم دۆزیەوە، لەگەڵ کۆچۆی برادەرم زیخ و چگڵمان برد تا گۆڕکەی چاك بکەین، بەڵام بەر لە من ئەو هەڤاڵەم گەیشتە سەر گۆڕەکە و هاواری کرد: "کاك مووسا، کاك مووسا، گۆڕەکەیان هەڵداوەتەوە و هیچ تەرمێکیشی لەناو نییە". کە چووم، بینیم گۆڕەکە هەڵدراوەتەوە و پۆلیس یان ئاسایشی نیشتمانی هێسکی ئەمینیان فڕێداوەتە شوێنێکی نادیار.

بەر لەوەی بچمە سەر گێڕانەوەی ژیانی ناو زیندانم، دەمەوێ باسی بیرەوەرییەکی خۆمتان بۆ بکەم، کە لە کاتی هێنانمیان لە دیار بەکرەوە بۆ ئیستانبووڵ بەسەرم هات:

شەوی ۱۷ مانگی دوازدەی ۱۹۵۹ دەستگیریان کردم و منیان بردە فەوجی تۆپخانەی دیاربەکر. بەرەبەیان، جێبێکی داخراو و چەند زیلێکی تژی لە سەرباز، منیان بردە فرۆکەخانەی سەربازیی دیاربەکر. لەوێ ئەفسەرێکی ماف پەروەر هاتە لام و بڕیاری دەستگیرکردنەکەی بۆ خوێندمەوە. سەرنجمدا و دواتر تێگەیشتم، کە نووسینی ڕاپۆرتی دەستگیرکردنەکەم و واژووەکانی سەر ڕووپەڕەکە، لەگەڵ نووسینی ناوەکەم وەك یەك نەبوو. ئەفسەری ماف پەروەر ڕۆیشت، دواتر ڕائیدێك هاتە لام و گوتی: "سەیرکە کاکە، تۆ دەستبەسەریت و من تا

---

[1] بە گەورەترین گۆڕستانی تورکیا دادەنرێت و لە سەدەی ١٤ دروستکراوە، بۆیە بە کۆنترین گۆڕستانی ئیستانبوڵ دادەنرێت. جگە لە گۆڕی چەندان کەسایەتی ناودار لە بواری جیا جیا، بە پێی زانیارییەکانی محەمەد تاهیر بورسەلی (١٨٦١ – ١٩٢٥) بێت، کە لە پەرتووکی (عوسمانلی موئەلیفلەری) باسی کردووە، دەبێت گۆڕی نالیی شاعیریش لەو گۆڕستانە بێ. (وەرگێڕ).

ئیستانبوولت دەبەم، لەگەڵ کەس قسە مەکە تا وا نەکەم ڕێکاری توند و سەختتر لەوەی ئێستا بگرمە بەر. بلیتی فڕۆکەکەمان ئامادەیە و تۆزێکی دیکە بێ کێشە دەڕۆین". منیش سەرێکی باشەم بۆ لەقاند. کاتی چوونە ناو فڕۆکەمان هات و منیش هەستامەوە، بینیم وەك مەراسیمی سەربازی لە فڕۆکەخانە بۆ چاودێریکردنی من سەرباز بەڕیز وەستاون، لەناویشیاندا چەند ئەفسەرێکی پلە باڵاشیان لەگەڵ بوو. من لە پێشەوە و ڕائیدەکەش لە دواوە، بەسەر پلیکانەکانی فڕۆکەکە سەرکەوتین. لەدەرگای فڕۆکە هۆستێستێك گوتی: "بەڕێزم پلیتەکەت؟"، بڕیار بوو قسە نەکەم، بەڵام بەیەك ڕستە گوتم"لای پاسەوانەکەمە"، کچەش کە ئەو ڕیزە سەربازەی دوای منی بینی، وایزانی فەرماندەیەکی سەربازیی گەورەم، بۆیە بە پەلە پلیتەکانی لە ڕائیدەکە وەرگرت و لە ڕیزی پێشەوەی دانایین. قایشەکەم بەستا و هەمان کچ هات و لێی پرسیم: "گەورەم هیچ فەرمانێکتان نییە؟"، منیش وەك فەرماندەیەکی بە غروور تەنیا سەرم بۆی لەقاند، بەو هەڵسوکەوتەی منیش کاکی ڕائید لە بن سمێران پێدەکەنی. لە ئاسمان خزمەتێکی تایبەتی منیان کرد، کە گەیشتینە ئیستانبوول و هاتینە خوارەوە زگورتیاتیم دەستی پێ کرد و لەگەڵ هەڤاڵەکانم دەستمان بە ژیانێکی پڕ لە کارەسات کرد.

## حوجرەی ژمارە ٣٨

حوجرە، واتا ژوورێکی تاکەکەسی بچووکی زیندان، بەڵام، ڕاستتر وایە بڵێین ئەو شوێنەی من و تەواوی هەڤاڵانم قەبر بوو، نەك حوجرە. ئینجا نەك وەك قەبری دەوڵەمەندەکانی گۆڕستانی زنجیرلیکۆی، کە بە مەڕمەڕ و بەردی جوان نەخشێندراوە، بەڵکو

ڕێك وەك قەبری ئەو بێکەسانەی لە نەخۆشخانەیەك دەمرن و شارەوانی لە گۆڕستانێکی لاچەپ قەبرێکیان بۆ لە خۆڵ و قوڕ هەڵدەبەستێ.

حوجرەکەی من تەختەیەك کە دۆشەکێکی لەسەر بوو، بەڵام چ دۆشەکێک! گوشێکی گەورە بوو و چەند چاکەتێکی دڕاو و سێ چوار کاسکێتی بێ بەهای سەربازی و چەند دانەیەك لەو قوماشە سوورانەی ئینزیبات لە قۆڵیان دەبەست، لەگەڵ بە میقداری کافرێك وردکە ڕەژووی تێدابوو. بالیفمان نەبوو، بەڵام بۆ بەخۆدادان دوو بەتانی کۆنی پیسی دڕاویان دابووینێ.

بە پاك و خاوێنی چووبووین، بەڵام لە ماوەی دوو سێ ڕۆژ خورشتێکی زۆر پیس سەرتاپای جەستەی داگرتم، سەیرم کرد هەموو لەشم بووەتە ئەسپێ، ئەو خوران و ئەسپێ تێکەوتنەم لە پەرتووکی (کمل) بە درێژی باس کردووە، لە شوێنێکی پەرتووکەکە بە ئەسپێ دەڵێم: "ئەسپێی گێژ، لە بری ئەوەی بچی خوێنی ورگزلە گەورەکانی ئەمریکا بمژی کە خوێنیان لێ دەتکێ، هاتووی خوێنی هەژار و نەدارێکی لاوازی وەك من دەمژی کە هیچ خوێنم نییە"، بەڵام ئەسپێکە تێناگا... ماوەی پێنج مانگ تا لەگەڵ ئەسپێ ڕاهاتین زۆرمان بە دەستیانەوە چێشت، چونکە لە ماوەی ئەو پێنج مانگە قەدەغە بوو خۆمان بشۆین، بۆیە هەندێك شوێنی جەستەم پێشکە ئەوەندە پێوەی دابوو، هەمووی ببووە برین. برینەکانیشم پڕ ئەسپێ ببوون، شێوەیەك تا ئێستاش شوێنەواری ئەو برینە پڕئەسپێیانەم لەجەستە ماوە.

حوجرەکانمان سۆبەی لێنەبوو، لە دەوروبەریشمان هیچیان بۆ گەرمکردنەوە دانەنابوو، سەرباری ئەوەش بەفر و باران لە ژوورەکانمان دڵۆپەیان دەکرد و تەڕیان دەکردین. هەندێکجار ئەوەندە لەسەرمان دەلەرزیم، دەتگوت ماوەیەکی درێژ وەرزش

دەکەم و دوای مـــاوەیەك گەرم دەبـــوومەوە. قەدەغەبـــوو لە حوجرەکانەوە قسە لەگەڵ یەکدی بکەیـن، نەك هەر قسـەکردن، بگرە ڕێیان نەدەدا فیکە لێدەین و گـۆرانییش بڵێـین. بـۆیە دوای مـاوەیەکی زۆر هەڤاڵانمـان دوو شـێوازیان دۆزیبـۆوە بـۆ ئەوەی بتوانن قسە لەگەڵ یەکدی بکەین.

یەکەمیان بە مشکان پۆستیان بۆ یەکدی دەنارد.

مشـــکی گەورە گەورەی بەقەد جورجێـــک لە ژوورەکـــان هەبوون، ئەوان ئێمەیان بە مردوو دەزانی، بۆیە لێمان نەدەترسـان، ناوە ناوە گەزەشیان لێدەداین. مشکەکان ئەو کاخەزانەی تۆزێـك خـــواردنی وەك پەنیـــر و حەلـــوای لەنـــاو دەمـــاوە، دەیـــانبردە حوجرەکانی دیکە، ئێمەش گەر بمانویستبا شتێك بەیەك بڵێـین لە نێوان خۆمان، ئەوە لەسەر کاغەزی ئەو خواردنانە دەمان نووسـی و لە زەوییەکە داماندەنا، هەندێك خواردنیشمان لەناو دەهێشتەوە، ئینجا مشکەکان بە بۆنکردنی کاغەزەکە دوای مـاوەیەك دەهـاتن و دەیانبردە حوجرەیەکی دیکە. ئەو هەڤاڵەی کاغەزەکەشی لا بە جێ دەما نووسینەکانی دەخوێندەوە، زۆر جار کەسی دووەمـیش خواردنێکی لەناو دادەنا و لە زەویی دادەناوە، ئیـدی بەو شـێوەیە کەم کەم قسەمان لەگەڵ یەکدی دەکرد.

**ڕێگای دووەمی قسەکردن:**

هەواڵ گۆڕینەوەمـــان بریتـــی بـــوو لە کـــۆدێکی ١٤ پیتـــی کـوردی، وەك ئەلفـابێیەکی تـایبەت بـوو، بە شـێوەیەك بە هێـزی مست لە دیوارەکانمـان دەدا، ئەمە زۆر بـاش بـوو بـۆ لەیەکـدی گەیشـــتنمان، دواتـــر بۆمـــان ڕوون بـــۆوە کە بەڕێـــوەبەرایەتی گرتووخانەکەمان چەندان شارەزای ئەمریکی و تورکیان هێنـابوو تـا لەو کـــۆدەی ئـــێمە بـــگەن، بەڵام ئەوانـــیش ســـەریان لێـــی دەرنەچووبوو.

ڕۆژێك عەمیدێك هاتە حوجرەکەم و گوتی: "بەو برادەرانەت بڵێ ئەو کارە نەکەن، ئەگەرنا من دەزانم چۆن بێدەنگیان دەکەم"، ئەو کەسێکی کەڵەگەت و بە هەیبەت بوو، منیش پێم گوت: "جەنابی عەمید ئەوانە زۆربەیان گەنجن و خوێنیان گەرمە، چەندین مانگە بەو مەرجە قورسانەی لەسەرمانە لە ژوورەوەن، قسەکردن و فیکە لێدان و گۆرانی وتنیش قەدەغەیە، ئەی چی بکەن؟ ئەوان بۆ گۆڕینی ئەو جەوە کارەساتبارە تاق و تۆق دەکەن، گەر دەتانەوێت لەگەڵ ئێوەش جارێك تاقیدەکەینەوە". لە حوجرەکەی تەنیشتم کاك عەبدولڕەحمانی لێبوو، ئەو هەرچی دەکرد فێری ئەو کۆدەی نێوانمان نەدەبوو، بەڵام هەر بۆ دەنگ دروستکردن ئەویش بەشداریی لەگەڵ ئێمە دەکرد. دوو لیرە و نیوی ئاسنم دا عەمیدەکە و پێم گوت: "فەرموون بە کۆدی مۆرس لەگەڵ ئەوەی تەك من قسە بکەن"، ئەویش پارەکەی وەرگرت و دەستی بە لێدانی دیوارەکەی عەبدولرەحمان کرد، عەبدولرەحمانیش لە ژوورەوە بە هەمان شێوە، بەڵام تۆزێك بە درێژتر وەڵامی لە دیوار دانەکەی داوە، کەچی هیچ تێنەگەیشت، منیش گوتم: "جەنابی عەمید ئەوە هەموو تەق و ڕەقەکەی نێوانمانە کە ئێوە بە کۆدی تایبەتی دەزانن"، بۆیە کابرا باوەڕی کرد و ڕۆیشت.

یادەوەرییەکانی حوجرەی ژمارە سی و هەشتم زۆرە. کاتی خۆی دوای دەرچوونمان بە گەرمی ئەو یادەوەرییانەم ئامادە کردبوو بۆ چاپکردن، بەڵام ساڵی ١٩٧٢ ئەوانیش لەگەڵ ئەرشیف و پەرتووکخانەکەم دەستیان بەسەردا گیرا و فەوتان. بۆیە، دەمەوێ دیسان هەندێك لە یادەوەرییەکانم بنووسمەوە.

## هەندێك حوجرەی دیكە

لە ڕاڕەوەكەی ئێمە، نوورەدین یلماز و جەودەت ئەدەباغ و سەعید قرمزی تۆپراك و ئۆرفی ئاق قۆینلوو و سەعید ئەلچی و مەدات سەرهات و یاشار كایا و محەمەد عەلی دینلەر و ئەسەد جەمیل ئۆغلوو و عەبدولرەحمان دۆلاك و نەجاتی سیاهكان، لای یەك بووین. لەگەڵ ئەو برادەرانە، جا گەر ڕێكەوتیش با، هەندێكجار بە نهێنیی یەكدیمان دەدیت. لەوێ تەنیا یەك ئاودەستمان هەبوو، هەندێكجار لە تەنگاویان چەند كەسێك بەیەكەوە لە دەرگامان دەدا، من لە هەر چوونە سەر ئاوێكم، لەگەڵ ئەوەی سەربازەكان ڕێگاشیان نەدەدا، بەڵام هاوارم دەكرد "مەترسن و ڕۆژێك دێ خۆرمان هەڵبێ"، ئەوانیش بە هەمان هەست بەرزییەوە وەلامیان دەدامەوە. یاشار كایا بە تەمەن لە هەمووومان بچووكتر بوو، خراپترین حوجرەش بەر ئەو كەوتبوو. خەمی ئەوم بوو بۆیە بە بەشی كارگێڕییم گوت: "با یاشار بێتە حوجرەكەی من و منیش ببەنە شوێنی ئەو"، وەك ئەوەی حوجرەكەی من زۆر خۆشبێت، بەڵام ڕازی نەبوون. زێرابی پیسایی بە ژێر حوجرەكەی یاشاردا تێدەپەڕی، بۆیە ئەو نەك نەیدەتوانی پاڵداتەوە، بەڵكو دەرفەتی دانیشتنیشی نەبوو، ئەمە وایكردبوو بەردەوام لەسەر پێ بووەستێ. یاشار كاتێك گوێی لە دەنگی من دەبوو، دەهاتە پشت دەرگای حوجرەكەی و دڵی منی دەداوە و دەیگوت: "مەترسە كاكە، ئێمە نەوەی ئەحمەدی خانین". سەعید ئەلچی زۆر بە توندی تووشی سیل ببوو، بەردەوام لە ژێر دەرگای حوجرەكەی خوێن و بەڵغەم دەتكاوە، كەچی بەو حاڵەوەش دەنگی بۆ من بەرز دەكردەوە و دەیگوت:

"کاکە مووسا خۆ بە عینادی نییە، ئیدی من نامرم". حوجرەکەی من لەگەڵ حوجرەی ئۆرفی بەرامبەر یەك بوو، ئەویش نەخۆشییەکی قورسی لە گورچیلەکانی هەبوو، بۆیە دەمەوێ لەناو ئەوانەدا باسی دوو دانەیان بکەم:

ئۆرفی، شەوێك دیسان پارەی دابووە پاسەوانەکان، ئەوانیش لە نیوەی شەو ڕێگایاندا بێتە لام، پێم گوت: "ئەوەت چۆن کرد ئۆرفی؟"، ئەویش گوتی: "بێخەمبە تەرتیبم کردووە"، لەبەر دەرگاکەم ئەو بە دەنگە گڕەکەی خەریکبوو قسەی بۆ دەکردم، لە پڕ ئەفسەری چاودێریی شەوانە هات تا چاوێك بە حوجرەکاندا بخشێنێت، کونی دەرگای حوجرەکەم کردەوە و گوتم: "ئەفسەری چاودێر هات هەستە بڕۆ"، لەو قسانە بووین ئەفسەرەکە ئۆرفی بینی، بە ناچاری تا دەرچوونی داوای لێبووردنم لە ئەفسەرەکە کرد، ئەویش بە "باشە باشە" چووە دەرەوە، بەڵام باش بوو لەسەر ئەو ڕووداوە ڕۆژی دواتر هیچ ڕووی نەدا.

ڕۆژێکی دیکە دیسان ئۆرفی بە دەنگێکی بەرز گوێمان لێبوو هاواری کرد: "دەرمان، دەرمان"، لەبەر ئەوەی دەرمانەکانی لە ئیدارە دادەندرا، بۆیە سەربازێك هات و گوتی: "کامەیان مامە؟"، ئۆرفی وەڵامی داوە "حەبە پەمبەکە، پەمبەکە"، جگە لەوە داوای دەرمانە سپی و کەسکەکانیشی کرد، سەربازەکەش حەبەکان و ئاوی بۆ هێنا، دوای کەمێکی دیکە دەستی بە هاوار کردەوە: "چا، چا"، ئەمجارە چایان بۆ هێنا، دواتر هاواری کرد: "قاوە، قاوە"، لە بری پاسەوانی قاوشەکەمان ئەوجارە ڕائید ڕاسی کاسرگا هات و بەسەریدا هاواری کرد: "برادەر چیت دەوێ؟ ٤٠ کەس لێرەیە، وەك ئەوەی هیچ کاریان نەبێ، دەتەوێ سێ چوار سەرباز بەردەوام بەس سەرقاڵی فەرمانەکانی جەنابت بن؟"،

ئەویش بەو دەنگە گڕ و گەورەیەی وەڵامی داوە: "جەنابی ڕائید، داوای مافی چوونە ئاوەدەست دەکەم". نا حەقی نەبوو، چونکە گورچیەلەکانی باش کاریان نەدەکرد، بۆیە دەبوو زوو زوو بچێتە سەرئاو، بەڵام ئەمە ئاسان نەبوو.

لە حوجرەکەی تەنیشتم نەجاتی سیاکانی لێبوو، لەبەر ئەوەی نەشتەرگەریی بۆ کرابوو، ماوەیەك بەر لە دەستگیرکردنی لە نەخۆشخانە مابۆوە، بۆیە نزیکەی پازدە ڕۆژ دوای ئێمە هێنایانە لامان. ئەویش بە تەمەن هێشتا زۆر لاو بوو، بەپێی ئەو قسانەی بۆی باس کردین، زۆر کەسێکی بە کەیف و زەوق بووە، ئەو شەوەی هێنابوویانە حوجرەکەی، دەمژمێر سێی شەو پیاوێکی زلی ترسناك کونی دەرگای حوجرەکەی کردۆتەوە و پێی گوتووە: "برادەر تۆ تازە هاتووی؟"، ئەویش بە ئەرێ وەڵامی داوەتەوە، ئیدی نەجاتی وای هەستکردووە دەیبەن و لە سێدارەی دەدەن، توومەزە ئەوەی کونی دەرگاکەی کردبۆوە ئۆرفی بووە، چونکە ئەو بەر لە زیندان ئۆرفی نەدەناسی بۆیە بەو نیوەی شەوە زۆر ترسابوو. من بەر لە زیندانیش نەجاتیم دەناسی و خۆشمدەویست، ئەو ڕۆژەش بینیم کە هێنایانە لای ئێمە، بۆیە ئاگاداری هاتنەکەی بووم.

لە دوا مانگەکانی زیندانمان، کوڕێکی سەربازی باشمان لابوو، بەرامبەر پێنج لیرە نووسینەکانی نێوانمانی لە نێوان حوجرەکان دەهێناو دەبرد، لەبەر ئەوەی نەجاتی هێشتا ئیفادەی نەدابووە داواکاری گشتی، بۆیە بە بۆچوونی خۆم شتێکم بۆ نووسی و بەو کوڕەدا بۆم نارد، لەسەر هەمان پەڕ بۆم نووسی، پێویست بە ترس ناکا، بەڵام ئەو بەر لەوەی نامەکەی منی پێبگا، بەردەوام لە چاوەڕوانیی ئەوەدا بووە کەی بۆ لە سێدارەدانی دەبەن.

لە ڕاڕەوی حوجرەکانی ئێمە، نوورەدین یڵمازی پەرلەمانتاری ئێستای مێردین و محەمەد عەلی دینلاری پارێزەریش دەستگیرکرابوون، ئەوکات نوورەدین و محەمەد لە ئەنقەرە قوتابی کۆلێژی یاسا بوون. نوورەدین هەر کاتێک گوێی لە دەنگم دەبوو، دەیگوت: "کاکۆ ئێمە دەڵێین ئازادی، بەڵام ئەوانە دەمانخەنە زیندان، بەڵام خەم مەخۆ هیچ نابێ"، محەمەد عەلییش بە بنزاری بۆتانی، هەندێك شیعری لە دیوانی جزیریی، باوە گەورەی خۆیان بۆ دەخوێندینەوە، یەکێکیان تا ئێستاش لە گوێم دەزرینگێتەوە:

"بەختمان وەك ڕووباری نیلە،
بەڵام ئەم دیجلە و فوراتین".

کە گوێم لەو دوو گەنجە جزیرییە دەبوو، ئەو ڕۆژە زۆر ئاسوودە دەبووم و وەك ئەوەبوو چووبمە سەر چیای جودی کە بە هێمای ئاشتی دادەندرێت. تێپەڕینی سەعید کرمزی تۆپراك بە بەردەم دەرگای حوجرەکەم بە سەرێکی بەرز و سینگێکی دەرپەڕیوی ئازایانە و خەسڵەتە مەردایەتییەکەی، هۆکارێکی دیکەی دڵخۆشیم بوو. بەڵام لەگەڵ برادەرەکانی دیکەی ڕاڕەوەکانی دیکە هیچ دیدەنییەکمان نەبوو. مادەم شوێن و کاتیشی هاتووە، دەمەوێ ئاماژە بە شتێك بکەم. بەر لەوەی بکەوینە زیندان، ئۆرفی و حەسەن ئاکووش زۆر خۆشییان لەیەك نەدەهات، بەڵام ئۆرفی شتێکی بێمانای بە مێشکدا دەهات، چونکە هەستی دەکرد حەسەن ئاکووش ڕۆڵی هەبووە لە دەستگیرکردنەکەی، بۆیە هەرکاتێك دەیانبردە سەر ئاو، بە دەنگێکی بەرز دەیگوت: "حەسەن تۆ کردت منیش کردم"،

دروشمێکی دیکەشی دوو دێڕی گۆرانییەکی حەسەنێ جزیری بوو:

**"بەفر دەبارێ، بەفر دەبارێ،**
**لەسەر چیای کوردستان بەفر دەبارێ".**

لە ٢٧ی مانگی دوازدەی ١٩٥٩ تا ١٠ مانگی سێی ١٩٦٠ لەو حوجرە کولەمەرگییەدا ماینەوە، لەوێ نەك ڕووناکی ڕۆژ نەدەگەیشتە ژوورەکانمان، بەڵکو کاتێك کارەبا دەبڕا نەماندەتوانی بستێك پێش خۆمان ببینین، بۆیە، نینۆکەکانمان ئەوەندە چڵکیان گرتبوو، وەك ئەوەبوو بە بۆیە ڕەش کرابن، جگە لەوەی نینۆکەکانمان ئەوەندە درێژ ببوون، کە لە ڕادەبەدەر بێزاری دەکردین. ناچار بە ددان هەوڵی کرۆشتنی نینۆکی خۆمان دەدا. چڵ ڕۆژ جارێك چەند سەربازێك دەهاتن و بەیەك مووس بێ ئەوەی لە ڕدێن تراشین بزانن، لە نزیك کونی ئاوەڕۆی ڕێڕەوەکەمان بە تۆزێك تەڕکردن دانە دانە ڕدێنیان دەتراشین، لەبەر کولی مووسەکان و ساردی ئاوەکە و نەبوونی کەف، دەمووچاومان هەمووی دەبووە خوێن و برین، لە بری شوشتن بە ئاو یان کۆلۆنیای سەرتاشی، دەمووچاومان بەو چەند پارچە ڕۆژنامەیە دەسڕیەوە کە پێش ڕدێن تراشین دەیاندایێ، لە سەرووی هەمووشیەوە شتێك بەناوی کات و سات لای ئێمە نەمابوو، چونکە نەماندەزانی لە چ ڕۆژ و کاتێك دەژین، چونکە هەر لە سەرەتاوە سەعاتەکانی دەستیان لێ وەرگرتین.

بەیانیان، برسیەتیمان بە شلەساوار دەشکاند و بە تەواوەتی لەگەڵ دونیای دەرەوە پەیوەندییەکانمان پچڕابوو، تاکە دەنگێکی لە دەرەوە گوێمان لێبووایە، دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای مەراسیمی ئاڵا هەڵکردنی قوتابخانەی حەربییەی تەك زیندانەکەمان بوو لە

ڕۆژانی شەممە و یەك شەممە، هەندێکجاریش گوێمان لە دەنگی هەورەتریشقە و برووسکی ئاسمان دەبووین. خواردنەکانمان سەگی ماڵێکی دەوڵەمەند نا، بەڵکو بەڕاستی سەگی شوانێکیش نەیدەخوارد، لەناو قاپێکی پاقری کون کونی پیس و کۆن، هەندێك ساوار و تەڕە پیازی پیربوویان تێکەڵ بەیەك دەکرد و لە پێشیان دادەناین، ئاوی خواردنەوەشمان لەناو بەرداخێکی وەك قاپی خواردنەکە لەگەڵ نانی نیوەڕۆ و ئێوارە دەهات، بەڵام ئەمەندە توێنیەتی نەدەشکاندین، بۆیە هەندێکجار کە دەچووینە ئاودەست، بەرداخەکانمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، جا گەر ئەو هابووایە لەوێ دوای دەست بە ئاو گەیاندن، بەرداخێك ئاویشمان دەخواردەوە، یان بەرداخەکەشمان پڕ ئاو دەکرد و لە گەڵ خۆمان دەمانهێناوە.

بەرەبەری کۆتایی زیندانییەکەمان هەندێك کاغەز و پێنووسیان داینێ، بۆ ئەوانەی جگەرەشیان دەکێشا، لە ماوەی ١٥ ڕۆژ ٥ جگەرەی سەربازییان دەداینێ، شقارتەیەکیشیان داینێ بۆ جگەرە پێ کردن، بەڵام من هەم شقارتەکە و هەمیش کاغەزەکانم جگە لە جگەرە پێ کردن و نووسین، هەمان کات بۆ دەرکردنی ئەسپێش بەکار دەهێنا، چونکە ئەسپێکانم لەناو کاغەزەکان دادەنا و ئاگرم تێبەردەدا، دەنگی "قرچە قرچی" سووتانی ئەسپێکان، وەك ئەوە دەهاتە بەر گوێم کە تۆڵەی خۆم لەوانە دەکەمەوە کە منیان خستۆتە ئەو زیندانە.

کاتێك ژیانی حوجرە و زیندانمان بەو شێوەیە بوو، لە سەربازە کوردەکەی زیندانەکە زانیمان ئەمینی هاوڕێمان کۆچی دوایی کردووە و پێش گیان سپاردنیشی مکوڕ بووە بینالتی جەنەڕاڵی ناوەندی فەرماندەیی بۆ بانگ بکەن، کاتێکیش جەنەڕاڵ هاتووە، ئەمین پێی گوتبوو: "گەورەم من دەمرم

بمگەیەننە دکتۆر"، بەڵام بینالتی دەڵێ: "ناتۆپی نا خەمت نەبێ"، ئینجا ڕۆیشتووە و بە سەربازەکەی تەك خۆشی گوتووە ئەو دەرگایەی بەسەردا داخە. پاشان زانیمان سەربازەکان بە نیوە مردوو نیوە زیندوو ئەمینیان بردوەتە نەخۆشخانەی حەیدەر پاشا. بەڵام لە ڕێگا پێشنەوەی بگەنە نەخۆشخانە ئەمین گیانی سپاردووە. کە ئەو هەواڵانەم زانی، لە قەهران دین و هار بووم، بۆیە پێشنیازێکی ئاوام بۆ برادەرەکانم کرد: "هەڤاڵان لە بری ئەوەی لەناو ئەو پیس و پلتۆخییە وەك ئەوەی مردنمان زۆر ئاسایی بێت گیان لەدەست بدەین، با دەرگاکانمان بشکێنین و بەرەو ڕوویان بینەوە، جا خوای دەکرد یەك یەك دەیانکوشتین، خۆ هیچ نەبێت هەر یەکێکمان دەبینە شەهیدێکی ڕێگای گەل و نیشتمانەکەمان".

مەدەت، نێوانی لەگەڵ پاسەوانەکان خۆشبوو، ناوە ناوە پارەی دەدانێ، کیلێنی دەرگای حوجرەکەی ئەویش شکابوو، دوای ئەوەی هەڤاڵانمان لە ڕێگەی کۆدی قسەکردنەکەمانەوە ڕێککەوتن، بریاردرا سەرەتا مەدەت بێتە دەرەوە و ئینجا بچێ دەرگای یاشار بکاتەوە، دواتر دەرگای هەڤاڵانی دیکە. ڕۆژی سەرهەڵدانەکەمان پێنجشەممە دوای نانی بەیانی بوو.

کاتی سەرهەڵدانەکەمان هات و لە ماوەی پێنج خولەك دەرگای تەواوی حوجرەکان کرانەوە، پاسەوانەکان چاویان نەبلەق بوو. دوای ماوەیەکی کەم ڕائید ڕاسی کاسرگای بە قارە قاڕ، وەك جارانی پێشوو هاتە ژوورەوە و گوتی: "بە زووترین کات هەرکەسە و بچێتەوە حوجرەی خۆی"، بەڵام پێمان گوت: "ناچینەوە ژوور". ئەو هەر دەیگوت کۆتایی بەو دۆخە بێنن. کە ئەو خەریکی ئەو قسانە بوو، یاشار و مەدەت و سەعید، بە جووڵەیەکی خێرا دەمانچەکەی بەر پشتیان دەرهێنا، بۆیە یەکسەر

جەنابی ڕائید وەك پشیلەیەکی لێهات، هەڤاڵانیشمان ویستیان بە دەمانچەکە حەنەکی خۆیان بە ڕائید بکەن، بەڵام من ڕێگریم لێ کردن و ڕازیم کردن دەمانچەکەی بدەنەوە. بەپێی یاسا هاتنە ناو قاوشی زیندان بە دەمانچەوە قەدەغە بوو، بەڵام کاسرگا، لەبەر مشەوەشیان بە دەمانچەوە هاتبووە لای ئێمە. دوای ئەوەی دەمانچەکەی وەرگرتەوە، پشتی تێکردین و یەکسەر ڕۆیشت. دوای ئەو ئەفسەرێکی دیکە هات و گوتی: "ئەوەی ئێوە دەیکەن لە ڕووی یاساییەوە تاوانە، بۆیە، گەر هەرکەس بچێتەوە حوجرەکەی خۆی ڕووداوەکە ناخەمە ناو دۆسیەی تۆمارکردنی ڕووداوەکانی ڕۆژانە". گوتمان باشە ئێمە نازانین سزای خستنە حوجرەمان لەسەرە یان نا؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی: "فەرمانەکە لە ئەنقەرەڕا ئاوا هاتووە"، منیش دۆخی هەڤاڵانم پیشان دا کە وەك ئەوەبوو لە قەبر هەڵستابینەوە: "جەنابی ئەفسەر دەبینم سەر سینگت هێمای تەرازووی کۆلێژی یاسای ئیستانبوولی لەسەرە، ئاشکرایە کە ماف پەروەرن، گەر ئامانجتانە لە پێناو وەرگرتنی مووچەیەکی هەزار لیرەیی مانگانە وەك جەلادێك تەنیا فەرمانەکانی ئەنقەرە جێبەجێ بکەن کێشە نییە، بەڵام کەسێکی گەنج و قۆزن، ئەگەر لە ناوچەی بەی ئۆغڵوو شوقەیەك بەکرێ بگرن و چەند ئافرەتێکی سۆزانیشی لەناو دانێن، لە شەوێکدا مووچەی مانگێك قازانج دەکەن، لە هەمان کات کارەکەش لەو ئیشەی ئێستاتان زۆر بەشەرەفتر و بە ناموستر دەبێ"، جەنابی ئەفسەر بێ ئەوەی نقەیەك بکات و ئاوڕ لە دواوە بداتەوە بەجێیهێشتین.

هەندێکمان تێدا بوو دوای ڕووداوەکە زۆر ترسابوون، بۆ نموونە عەلی کەرەهان لە حوجرەکەی خۆیشی دەرنەچوو. کاتێك برادەران دەرگای حوجرەکەیان کردبۆوە گوتبووی:

"دایخەن دایخەن، من دەرناچم". دوای ماوەیەك، پاشا لەگەڵ چەند ئەفسەرێك، بەیەکەوە هاتنە لامان و بەڵێنی دا لەگەڵ ئەنقەرە قسە بکات. ئینجا بە درێژی دەستی بە ئامۆژگاریکردن کرد. ئێمەش ڕەدی قسەکانیمان دەداوە و سکاڵامان لە دۆخی خۆمان دەکرد. عەبدولڕەحمان دۆلاکی هەڤاڵمان مەلا بوو، بۆیە، دەستی بە خوێندنی چەندان سورەتی قورئان کرد و دواتریش بۆی وەردەگێڕا، دوای ئەوە پاشا گوتی: "سەیرکەن، ئەو برادەرەتان چەند شتی جوان دەڵێت"، بەڵام بێ ئەوەی هیچی پێ بکرێت ئەویش ڕۆیشت. دوای ماوەیەك ڕائید و داواکاری گشتی هاتن: "بەڕێزینە لە نێوان خۆتان دوو کەس هەڵبژێرن پاشا دەیەوێت قسەیان لەگەڵ بکات"، هەڤالانیش من و شەوکەت تورانیان وەکو نوێنەری خۆیان دەستنیشانکرد. سەرەتا منیان بردە ژووری پاشا، منیش ئەوەم بۆ باسکرد کە ئێمە وەکو دەستبەسەرێك سزای زیندانی کردنی حوجرەمان نییە. ئەگەر بەو بارودۆخەی ئێستاشمان بەردەوام بین، زۆربەمان دەمرین. بەڵام ئەو گوتی: "نەخێر"، ئینجا بەردەوام بوو: "بڕۆ بە برادەرەکانت بڵێ بچنەوە حوجرەکانی خۆیان، چونکە ئەو کارە ئاوا چارەسەر نابێت، بەڵام بەڵێن بێت من لە ماوەیەکی کورت چارەسەری دەکەم". من قبوولم نەکرد و گوتم: "ناچم و ئەوەش بە هەڤاڵانم ناڵێم"، پاشاش بانگی سەربازەکانی کرد و فەرمانی پێ کردن: "باشە مادەم بیبەنەوە". ڕائید کاسرگا و دەستەیەک سەرباز منیان بردە شوێنێکی دیکە، توومەزە ئەو شوێنەی منیان بردێ، شوێنی کۆبوونەوەی سەرجەم زێرابەکانی پیسایی باڵەخانەی حەربییە بوو، لە کەنار پیسایی زێرابەکە سەربازەکان لەسەر دوو کۆلکە داری پتەو ژوورێکی لە دار دروستکراویان ئامادە کردبوو، ئیدی شوێنی مانەوەم لەوێ بوو.

دوای من، جەنابی ڕائید، بۆ قسەکردن شەوکەت تورانی بانگی ژوورەکەی دەکات و پێی دەڵێت: "برادەرەکەی دیکەش ئەو داواکارییەی منی قبوولکرد، تۆش بڕۆ بە برادەرەکانت بڵێ، بچنەوە حوجرەکانی خۆیان و لە ماوەیەکی کورتیش من لە ئەنقەرەوە فەرمانێك دێنم و هەمووتان لە حوجرەکانتان ڕزگار دەکەم". هەرچۆنێك بێ ڕائید باوەڕ بە هەڤاڵەکانم دەهێنێ و بەڵێنیان دەداتێ و ڕازییان دەکات هەرکەسە و بچێتەوە حوجرەی خۆی. دواتریش، لەبەر دەرگای هەر حوجرەیەك سەربازێکی حەربە بە دەست دادەنێت و ئیدی دۆخەکە پشتگوێ ناخات.

من لە شوێنە نوێیەکەم کاتێك بۆ ڕۆژی دواتر بەرەبەیان داهات، تاشتیان بۆ هێنام تا لەناو زێرابی پیسایی گوو نان بخۆم، بەڵام ڕەتمکردەوە، ئیدی ژەمە خۆراکەکانی دیکەشم نەدەخوارد، بەم شێوەیە سێزدە ڕۆژ لەسەر ئەو تەختەیە هیچ زادێکم لە زارم نەنا. ئەو خواردنەی بۆ من دەهات، گەنجێکی ئەرمەنیی ناوی کیرکۆربوو ئامادەی دەکرد. ئەو هەموو بەیانییەك بە هەنجەتی ئاو هێنان، قۆریەك چای پڕ شەکری بۆ دەهێنام و دەمخواردەوە. شەوی پێنجەمم بوو لەو شوێنە، بە چرپە یەکێك لەبەر دەرگا بانگی کردم: "مامە مامە"، منیش وەڵامم داوە: "ها چییە؟"، ئەوجارە بە کوردی: "مامە پیلانیان داناوە تۆ بکوژن، من و برادەرێکی پاسەوانم جلێکی سەربازیت بۆ دەهێنین و دەترفێنین، ئەگەرنا باوەڕبکە دەتکوژن... من خەڵکی بینگۆلم و ناوم کەنعانە". منیش پێم گوت نامکوژن و لێرە هەڵنایەم و دڵیشم نایەت ئێوە بخەمە مەترسییەوە، بەڵام چاکەیەکم لەگەڵ بکە و پێنووس و کاغەزێکم بۆ بهێنە دەمەوێ نامەیەکی لەسەر بنووسم و داواتان لێدەکەم بیبەن و بیدەنە ماڵەوەمان.

لە ماوەیەکی کەم کاغەز و پێنووسێکی بۆ هێنام، منیش بە

کورتی بەسەرهاتی خۆمم بۆ نووسین، لە کۆتاییش بە تێبینی ئاگادارم کردنەوە کە ئەو نامەیە بگەیەننە دەست عیسمەت ئینۆنۆ و عەونی دۆغان و بورهان فەلەك و نادر نادی و ئەحمەد ئەمین یالمان و سەندیکای پارێزەرانی ئەنقەرە و ئیستانبوول. نامەکەم دا دەستی گەنجەکە و ڕۆژی دواتر هەمان گەنج نامەیەکی بە دەست و خەتی خێزانەکەم بۆ هێنامەوە، کە وەڵامی نامەکەم بوو سەبارەت بە وەرگرتنی نامەکەی من، لەگەڵ ئەوەش ١٥٠ لیرەشی بۆ ناردبووم. خێزانەکەم، نامەکەی منی لەگەڵ دەستگیراندارە پارێزەرەکەی مەدەت سەرهات گەیاندبووە ئەو شوێنانەی من لە نامەکەدا ئاماژەم پێ کردبوون، لەسەر قسەی منیش دەستیان بە جموجۆڵ کردبوو. دوای ئەوەی لە زیندان دەرچووم زانیم کە لە سەردانێکی سامسوونیدا عیسمەت ئینۆنۆ پاپۆرەکەی وەستاندووە تا ئەو هەواڵەی ئێمە وەك نادادییەک لە وڵاتەکەی بە خەڵك بڵێ، کەچی ڕێگای پێنەدراوە بێتە خوارەوە، بەڵام ئەو وتانەی گەیاندۆتە میدیای تورکیا سەبارەت بەو نامەیەی من و کەم تا زۆر باسی شتێکی ئاوای کردبوو:

"لە کاتێکدا حکوومەت بە دۆخێکی ناسکدا تێدەپەڕێت، کەچی دەسەڵات ئەو هاوڵاتییە ڕۆژهەڵاتییانەی ئێمەی لە کونجی زیندان کردووە. ئەمەش پێچەوانەی مافی مرۆڤ و دیموکراسییە، لە هەر لایەکیشەوە لێی بڕوانی تاوانە، بۆیە، ئەوانەی ئەو تاوانەیان کردووە با باش بزانن، من و تەواوی هاووڵاتییانی ڕۆژهەڵات خۆمان لە ڕیزی ئەوان دادەنێین و هەمان هەست و بۆچوونمان هەیە و لێپێچینەوەش لەگەڵ تاوانبارانی ئەو تاوانە دەکرێت". شوێنی نییە بەڵام دەمەوێ ئاماژە بە شتێك بکەم، لە ٢٧ی مایس، دوای ئەوەی لە حوجرەکانمان دەریان هێناین، لە شوێنی ئێمە، پەرلەمانتار و وەزیرەکانی پارتی

دیموكرات و بەرپرسی زینـدانەكەمان كەمـال بینـاتلی و بەڕێوەبەری كـارگێڕی ڕاسـی كاسـرگا، لە هەمـان حوجرەكـانی ئێمە زیندان كران...

بـا دووبـارە بگەڕێـنەوە ئەو شـوێنەی منیـان لـێ دانـابوو. لە دوازدەمـین ڕۆژ بینـیم لەنـاو پیسـایی گـووەكە حەیزەرانێـك دانـدراوە، منـیش هەڵمگـرتەوە و لای خـۆم شـاردمەوە، چـونكە نـیەتم بـاش نەبـوو. چەنـد دەمژمێرێـك دواتـر لە پـڕ دەرگـا ئاسنینەكەی ژوورەكە كراوە و بینیم كسرگا و چەنـد سـەربازێك لەبەردەم دەرگـا وەسـتاون، كسـرگا گـوتی: "مووسـا... مووسـا... هەستە پاشام لە تۆ خۆشبوو"، منیش خۆم لێ گێل كرد و گوتم: "چ، چ؟"، دوای ئەو پرسـیارە ئەو هـاتە پـێش تـا قسـەكەم بـۆ دووبارە بكاتەوە، تەواوێك لێم نزیك بۆوە، منیش بەو حەیـزەرانە دارەی لای خـۆم شـاردبوومەوە، بەو تـۆزە هێـزەی لە جەسـتەم مابوو، دارێكم لە تەختـی نێوچاوانیـدا، كاسـكێتی سـەری كەوتە نـاو گـواوەكە و خـوێن بە لەشـیدا هـاتە خـوارەوە، هەر زوو بە سەربازێك كاسكێتەكەی دەرهێنا و گوتی: "وازی لێبێنن شـێت و هار بووە". دەرگاكەیان بەسەرمدا داخستەوە و ڕۆیشتن.

عەریفێك لە بەندیخانەكە هەبوو، سەربازەكان بە (بابە) بانگیان دەكرد، كەسێكی قژ سپی و مێرانە بوو. ئەو هەر ڕۆژێك نـۆبەتی چاودێریكردنی هەبوایە لە ڕێـرەوی زینـدانەكەی ئێمە، دەرگـای دانە دانەی حوجرەكانمـانی دەكـردەوە و دەیگـوت: "گەنجیـنە بەهیـوای دەربازبوونتـان، بـێ خەمـبن خـوا زولمـی زاڵمـان هەڵناگرێت". لە ڕۆژی سێزدەهەمینی شـوێنە تەنیـاكەم، بـێ حـاڵ ئاگام لە خۆم نەبوو، لە پڕ چـاوم كـردەوە بینـیم عەریـف بابـا لە تەكم وەستاوە، بەر لەوەی دەست بە قسە بـكەم گـوتی: "مووسـا كوڕم تۆ هێشـتا گەنجـی و مـاڵ و منـداڵت هەیە، ئەوانە زاڵمـن،

ئەوەی لەگەڵ ڕائید کسرگا کردت، بووەتە کارێکی زۆر گەورە لەسەرت، هەرچەندە باشت کرد، بەڵام تکا دەکەم دڵم مەشکێنە و هەستە با بڕۆین، برادەرەکانیشت لەناو خەم و ماتەمدان و وا دەزانن تۆ مردوویت". قبووڵم کرد، بەڵام نەمدەتوانی هەستم و لەسەر پێیەکانی خۆم بوەستم، ئیدی بە هاوکاریی سەربازەکان و حەیزەرانەکەی دەستم ماوەی ٢٠٠ مەترمان بە دە خولەك بڕی. عەریف بابا، لەگەڵ خۆی کورسیەکیشی هێنابوو، ناوە ناوە منی لەسەر دادەنیشاند. چووینەوە ناو قاوشەکەمان و بە کوردی دەنگم هەڵبڕی و بانگم کردن: "هون چەوانن گەلی هەڤالان؟"، بە بیستنی دەنگی من بووە هۆسە و هەڵلا و بە دەنگی بەرز و پڕ کەیف لە خۆشیی هاتنەوەم کردیانە جەژن.

لە کاتێکدا ئێمە دۆخمان لە ژوورەوە ئاوا بوو، لە دەرەوەش وردە وردە ڕۆژانــی بەرپـابوونی کودەتـا نزیـك دەبـووەوە. جـووڵانەوەی قوتابیـان دەسـتی پـێ کردبـوو. لە دەرەوە، حکوومەت، چەندی زیاتر دەکەوتە ژێر پاڵە پەستۆی دژەکانی، لە ژوورەوە پاڵەپەسـتۆی سـەر ئـێمەی کەمتـر دەکـردەوە. لە کۆتاییەکانی مانگی نیسان، دەرگای حوجرەکانمان کرانەوە، ئیدی پێ بە پێ ئەو خواردن و پۆشاکانەی خێزانەکانمان بۆیان دەهێناین دەمانخوارد و لەبەرمان دەکردن.

دوای ماوەیەکی کەم لە ئامادەکاری، ئێمەیان بردە شوێنی ئاشپەزخانەی باڵەخانەی حەربییە، بە بەراورد لەگەڵ شوێنی پێشوومان، ئەو شوێنە وەك بەهەشت بوو. لە ناو باخچەکەکانی هامیدیەی لێبوو، هەموو کاتێکی ڕۆژ دەمانتوانی پیاسە بکەین و کاتی خۆمانی لێ بەسەر ببەین. قەرەوێڵە و پێخەفی تازەیان بۆ هێنابووین، بەر لەوەی بشمانگوازنەوە، بۆ ئەوەی لە پیسیی جەستە و ئەسپێکانی لەشمان ڕزگار بین، چەندان گەرماویان بۆ ئامادە کردبووین.

لەسەرەوە باسی حوجرەکەی یاشار کایا و بچووکیی تەمەنیم کردبوو. ئەو گەنجە خراپ نەخۆش کەوتبوو، دوای ئەو هەموو کۆشش و هەوڵە زۆرە، کەچی نەدەهاتەوە دۆخی ئاسایی خۆی، بەردەوامیش کێشی لە دابەزین دابوو، ورده ورده دۆخی خراپتریش دەبوو، کاتێك تەندروستیی یاشارم بە دکتۆر ناجی کوتلای دەگوت، ئەو بەردەوام ئەو وەڵامەی دەدامەوە: "کاکۆ وەڵا هیچی نییە، نەخۆشییەکەی لە گرێی دەروونییەوە سەرچاوە دەگرێ"، بەڵام تا دەهات یاشار تای زیاتر دەبوو، ناچار حاڵ و حیسابەکەمان بە بەشی کارگێڕی ڕاگەیاند. کاتێك یاشاریان بە تەندروستییەکی نالەبارەوە بردە نەخۆشخانەی سەربازی، لەبەر ئەوەی دەترساین وەك ئەمین بەر لەوەی بگاتە نەخۆشخانە گیان بدات، من و چەند برادەرێك دەستمان بە گریان کرد. لە پڕ بینیم دکتۆر ناجی کوتلایش لە گۆشەیەك خۆی گرمۆڵە کردووە و هونگور هونگور دەگریێ. بە تووڕەییەوە ڕووم تێ کرد: "بۆ چی دەگرییێی؟ چاوت ڕۆن یاشار بە گرێیە دەروونییەکەیەوە دەمرێ"، ناجیش لە هەڵەکەی خۆی گەیشتبوو، بۆیە بە گریان و فیغان زیاتری فرمێسك دەڕشت، بەڵام ناجی بۆ یاشار نەدەگریا و مەبەستی ئەو نەبوو، چونکە هەمووی لە هەڵەیەکی پزیشکی و کەم و کووڕیی زانیاریی زانستی بوو.

زۆر شوکر، یاشار چاك بۆوە و گەڕاوە ناومان. ئەو بە هۆی نالەباری و پیسی حوجرەکەی تووشی گرانەتا ببوو. بەپێی قسەی دکتۆرەکان بێت کە بە یاشاریان گوتبوو، ئەو نەخۆشیەکەی لە میکرۆبی ناو زێرابی پیسایی ژێر حوجرەکەیەوە گرتووە، خەسڵەتی میکرۆبەکەش وایە دوو مانگ دوای ئەوەی دێتە ناو جەستەت ئینجا کاریگەرییەکانی خۆی بە دیار دەخات.

لەبەر ئەوەی ئۆرفی نەخۆش کەوتبوو، بۆیە ڕێگایان پێدا

شەوانیش بچێتە ناو باخچەکە، ڕۆژێك لە ٢٧ی مایسی ١٩٦٠ دەمەوبەیان کاتێك هەموومان لە خەودا بووین، دەمژمێر پێنجی بەیانی لەگەڵ دەنگی ئۆرفی بە ئاگا هاتین کە دەیگوت: "کوڕینە... کوڕینە... هەڵسن لە خەو کودەتا کراوە"، توومەزە ئۆرفی گوێی لە دەنگی ئەو ڕادیۆیە بووە کە لە ئۆدەی سەر ژوورەکەی ئێمە چەند ئەفسەرێك گوێیان لێ گرتبوو. هەستاین و جلەکانمان گۆڕی، دەمەو چێشتانان هەواڵەکە بە تەواوی پشتڕاستکراوە، هەموومان کردمانە جەژن و ئاهەنگ.

لەگەڵ ڕۆژ هەڵاتن چەند سەربازێك هەمان هەواڵیان بۆ هێنابووین، لە ماوەیەکی کەمیش زانیمان جەنابی کاسرگە و ئەمین کالافات و سەرجەم ئەو وەزیر و پەرلەمانتارانەی پارتی دیموکرات، کە ئەو ڕۆژە لە ئیستانبوول بوون، دەستگیرکران و لەهەمان حوجرەکانی ئێمەیان کردوون. ئیدی سەردەمێکی تازە دەستی پێ کردبوو، ئیدی ئێمە مەغدووری دەستی دەسەڵاتی ڕووخێندراو بووین. وتەبێژی کۆمیتەی ناوەندیی کودەتا ئالپ ئارسلان تورکەش[1] بوو. ئەو هەموو ڕۆژێك چەندان بەیاننامەی یاسایی بڵاو دەکردەوە. بۆ نموونە تورکەش بەو دەنگە ئیزعاجەی لە ڕادیۆ دەیگوت: "ئاگاداری! لەسەرجەم زیندانەکانی تورکیا، هەرچی ئەفسەر هەیە دەم و دەست ئازاد بکرێن، جگە لە دەستگیرکراوەکانی باڵەخانەی حەربییە لە ئیستانبوول..."، ڕۆژی دواتر تورکەش بە هەمان دەنگ و تۆنی ڕۆژانی پێشووتر

---

[1] ئالپ ئارسلان تورکەش (١٩١٧ – ١٩٩٧) دامەزرێنەری پارتی نەژاد پەرستی تورکی MHP و ڕابەری بزوتنەوەی گورگە بۆرەکان. لە نێوان سالانی (١٩٧٥ – ١٩٧٨) جێگری سەرۆکوەزیرانی تورکیا بووە. دەستێکی باڵای هەبووە لە دژایەتی کردنی گەلی کورد و زمانەکەی. (وەرگێڕ).

ئەوجارە بۆ قوتابییە دەستگیرکراوەکان و ڕۆژی دواتر بۆ ڕۆژنامەنووسەکانی زیندان و لە کۆتاییشدا بۆ سەرجەم سیاسییەکان هەمان ئاگاداری و فەرمانی بڵاوکردەوە، بەڵام بەردەوامیش هەموو ڕۆژێك دەیگوت جگە لە زیندانییەکانی گرتووخانەی حەربییە.

جگە لە ئێمە، هیچ زیندانییەکی سیاسی لە تورکیا لە بەندیخانەکاندا نەمابوو، جگە لە ٧ ئەفسەر، کە گوایە ئەوانە بە نیازبووینە، بەر لەوەی کودەتای گشتی بکرێ، کودەتا لە دژی پارتی دیموکرات بکەن. دواتر، سەرۆکی ئەو ئەفسەرانە، فاروق گوڤەنتورك لە ناوەندی فەرمانەدەیی دادەمەزرێتەوە، لە کاتێکدا هەر لەوێش دەستبەسەر بوون، ئیدی ئەو بووە فەرماندەی زیندانەکەی ئێمەش. ئەو زوو زوو دەهاتە لامان و لەگەڵمان دادەنیشت و بەدەم چا خواردنەوەش وەك دۆستێك قسەی لەگەڵ دەکردین. وەك خۆی باسی دەکرد، گوایە زۆر لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا ماوەتەوە، بۆیەش، بەردەوام ئاماژەی بەوە دەکرد خۆشی لە کوردان دێت. برادەرانیش دەزانن وەك ڕێزگرتنێك بە (ئاپۆ) ناوی دەهێنام. ئیدی ئەوەندە بووینە دۆستی یەکدی، لە ٣٠ی تەباخ، کاتێك پلەی سەربازیی بووە لیوا، دوای مەراسیمی ئاهەنگی ڕێزلێنانی بە بۆنەی بەرز بوونەوەی پلەکەی، دەمژمێر یەکی شەو هاتە قاوشی زیندانەکەمان و گوتی: "ئەرێ کەی کاتی نووستنە، سەیرکەن بوومە پاشا، بۆ پیرۆزبایم لێناکەن؟". هەموو هەڤاڵانمان لە جێگاکانی خۆیان هاتنە دەرەوە و پیرۆزباییان لێ کرد، منیش لێی چوومە پێش و پێم گوت: "باشە پاشا، پیرۆزباییت لێدەکەین بە بۆنەی بەرز بوونەوەی پلەکەت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی لە دەست ئەوانە ڕزگارمان بوو کە تۆیان عێدز دەکرد، کەچی هێشتا نەبووینەتەوە هاووڵاتییەکی

ئاسایی؟"، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە: "باوەڕ بکەن، بۆ ئازاد بوونتان لە هەوڵ و کۆششدام، پەنا بە خوا بەمزووانە لێرە دەردەچن"، ئێمەش وەك یەکێك، کە هەمان دۆخی ئێمەی هەبوو، بە چەپڵە ڕێزان بەڕێمانکرد و ڕۆیشت.

گوڤەن تورك کەسێکی سەیر بوو، حەزی لە نووسین بوو، بۆیە، جار بە جار هەندێك شتی دەنووسی، ڕۆژێك گوتی: "ئەگەر ڕۆژێك نووسینێکم لە ڕۆژنامە بڵاو کرابێتەوە و هەمان ڕۆژ کاتێك سواری پاپۆڕ دەبم گەر یەکێك ببینم ڕۆژنامەکەی لە دەستە و نووسینەکەی من ناخوێنێتەوە، خۆم پێناگیرێ و لێی توورە دەبم". دواتر بووە فەرماندەی فەیلەقی دیاربەکر، وەك فەریقیش خانەنشین بوو. ئەو تا ئێستاش لە ژیان ماوە، بەڵام دوای ئەوەی خانەنشین بوو، پێچەوانەی ئەوەی دەیگوت خۆشیم لە کوردان دێت، پەرتووکێکی خراپی دەرچوو کە زۆر بە نارێکی باسی شێخ سەعیدی کوردی و مەدرەسەی نوور دەکات، زۆر حەز دەکەم ڕۆژێك تووشم بێت و لەسەر ئەو پەرتووکەی مشتومڕی لەگەڵ بکەم.

### شۆڕشی هەواگۆڕکێ

ئێمە، لە بەرواری ١٧-١٢-١٩٥٩ تا ڕۆژی گواستنەوەمان، ١٩٥ ڕۆژ لە حوجرەی کولەمەرگیدا ماینەوە. لەو ماوەیە، هەڤاڵێکمان گیانی سپارد، زیاتر لە نیوەشمان نەخۆش کەوتین و سەقەتبووین، هەندێکمان تووشی سیل بووین، هەندێکمان تووشی قورحە بووین، بەشێکی زۆریشمان تووشی ڕۆمانتیزمێکی قورس و کەژۆك بووین، هەندێکمان تووشی نەخۆشیی دڵ و گورچیلە بوون، بۆیە لە ماوەی چەند ساڵێك دوای دەرچوونمان ٢٤ هەڤاڵمان لە تەمەنێکی گەنجیدا بەهۆی

ئەو نەخۆشییانەی لە حوجرەکانەوە تووشمان بوو، گیانیان سپارد. ئەوانەی مانەوەش، بەشێکی زۆریان تا کۆتایی ژیانیان بە دەست ئەو نەخۆشییانەوە دەیانناڵاند.

ئێمەیان بردبووە ئاشپەزخانەکەی قوتابخانەی حەربییە، هەر چوار لای ئەو شوێنە تازەیەمان بە باڵەخانەی سێ نهۆمی دەورە درابوو، پەنجەرەکانمان بەسەر باخچەی قوتابخانەکەدا دەیڕوانی، کە شوێنی مانەوەی سەرباز و ئەفسەرەکان بوو. بەر لەوەی بمانهێننە ئەو شوێنە، نزیکەی شەش مانگ و نیو، نەك تیشکی هەتاومان بەرنەکەوتبوو، بەڵکو هیچ ڕووناکییەکی بەردەوام لە قاوشە کۆنەکەمان نەبوو، بۆیە، هەر کە گوازراینەوە و ئەو باخچە بچووکەمان بینی، بەردەوام لەوێ خۆمان دەدا بەر تیشکی هەتاو.

ڕۆژێك، کە لەناو باخچە بووین، ئەو ئەفسەرانەی سەیری ئێمەیان دەکرد، هاتن و گوتیان: "یەڵا بۆ ژوورەوە"، ئێمەش لە هۆکارەکەیمان پرسی، لە وەڵامدا گوتیان: "فەرمان بەو شێوەیە، ئیدی تەنیا دەمژمێرێك پێش و دوای نیوەڕۆ دەتوانن بێنە ناو باخچە"، بەڵام من و هەڤاڵانم گوتمان: "ناچینە ژوورەوە". دوای ئەو وەڵامە سەربازەکان ڕۆیشتن و هەندێك ئەفسەری پلە باڵاتر هاتن، بەڵام گوێمان بەوانیش نەدا، دواتر، جەنەڕاڵ جەمال تورانیی فەرماندەی سوپای یەك، هاتە لامان. ئەو بە لەشە قەبە و دەنگە وەحشییەکەی نەڕاندی: "یەڵا بۆ ژوورەوە، ئێوە ناچاری جێبەجێکردنی یاسا سەربازییەکانن، ئەگەرنا ئەو بێ فەرمانییەتان بە ڕووبەڕووبوونەوە بۆ هەژمار دەکەم؟! چونکە دەزانن سزای ڕووبەروو بوونەوە لە سێدارە دانە".

من بەرامبەر جەنەڕاڵ جەمال لەسەر زەوی دانیشتم و بە هەمان تۆنی دەنگی ئەو بەسەریدا هاوارم کردەوە، ئەسەد جەمیل

ئۆغلـووش کـڵاوەکەی سـەری بەهەمـوو هێـزی خـۆی لە دەموچـاوی گـرت و گـوتی: "ئەوەیە ئەخلاقـی سـوپای تـورکی قارەمـان کە باسـی دەکەن؟! چـونکە گەر دیلـیش بووینـایە ئـاوا مامەڵەتان لەگەڵ نەدەکردین، ناچینە ژوورەوە، گەر دەشـتانەوێت هەموومان بدەنە بەر حەربەکانتان". دواتر هەمـوو هەڤاڵان هەمـان کاردانەوەیەن پیشاندا. پاشا واقی وڕمابوو، بـۆیە، بەر لە ڕۆیشـتنی تەنیا گوتی: "باشە بۆخۆتـان بیـری لـێ بـکەنەوە". لەگەڵ فـاروق گـوڤەن تـورکیی بەڕێـوەبەری بەنـدیخانەکە نێوانمـان خۆشـبوو، دوای مـــاوەیەك ئەو هـــاتە لامـــان و گـــوتی: "بـــۆ ئەوەی داواکارییەکـــانی ئێـــوە بە جـــێ بگەیەنـــم، بەیـــانی فەرمانێـــك دەردەکەم، بەڵام ئێسـتا بـڕۆنە ژوورەوە". لەسـەر ئەو بەڵێـنەی گوڤەن تورك بە ئـێمەی دا چـووینە ژوورەوە، چـونکە باوەڕمـان پێی هەبوو. وەك ئەوەی گوڤەن تـورك بەڵێنـی پێـدابووین، ڕۆژی دواتـر پێیـان ڕاگەیانـدین کە لە بەیـانییەوە تـا درەنگـانی شـەو دەرگـای قاوشـەکەتان کـراوەیە و چ کاتێـك بتانەوێـت دەتـوانن بچنە ناو باخچە.

## جیا بوونەوە

بە تێپەڕینی کات، لە زینـدانی حەربییـە لە ڕووی نەتەوەیـیەوە نا، بەڵام لە بۆچوونی سیاسی و ئایدۆلۆژییەوە دابەشـی سـەر دوو بەرە بووین. لە ڕاستیدا، جیاوازیی بیروبۆچوونمـان بـۆ سـەردەمی پێش دەستگیرکردنمان دەگەڕاوە. بەشێکمان چەپ و بەشـێکیش پارێزگـــار بـــوون. زیـــا شـــەڕەفخان ئۆغلـــوو، ســـەرکردایەتیی پارێزگارەکـــانی دەکـــرد، کە هەریەکە لە شـــەهابەدین ســـەپتی ئۆغلوو و مـحەمەد عەلـی دینـار و عەبـدولڕەحمان ئەفە و عەلـی کەرەهان و سـەعید ئەلچـی و سـەلیم کهـچ ئۆغلـوو و حەیـدەر

ئاکسوو بوون. بەڵام، ئەمانە ژمارەیان لە چەپەکان کەمتر بوو. چەپەکان پێکهاتبوون بوون لە جەزمی باڵکاش و خالیس یۆکوش و نازمی باڵکاش و عیسمەت باڵکاش و محەمەد ئایدەمیر و ئۆککەش قەرەداغ و فەوزی ئاڤشار و جانیب یلدرم و سەعید جەمیل ئۆغلوو و نەجاتی سیاکان و ئۆرفی ئاق قۆینلوو و نوورەدین یلماز و حەسەن ئاککوش و فایەق ساڤاش و ئۆغوز ئوچۆك و خەلیل دەمیرەل و موحسین شاڤاتا و شەوکەت توران و یاڤووس چاملیبەل و یوسوف کاچار و زیا ئاجار و فازڵ بوداك و من.

زیا شەرەفخان ئۆغلوو بە گەنجەکانی دەگوت: "لەبەر کوردپەروەریمان دەستگیرکراین، گەر تۆمەتی کۆمەنیستیشمان بەسەردا ساغ بکەنەوە، بە دڵنیاییەوە لە سێدارە دەدرێین.". بەم شێوەیە مێشکی چەند هەڤاڵێکی زیتەڵەی بۆ لای خۆی پەلکێش کردبوو، ئیدی ئەوان لە چەپەکان جیا ببوونەوە و بە تەنیا نانیان دەخوارد. کاتێکئازادبووی لە زیندان چ خواردنێک دەخۆی، دەستمان بە پارە کۆکردنەوە کرد. ئەو ماوەیە پەرتووکی چاك چاکیش بڵاودەکرانەوە، بۆیە بیرمان لەوە کردەوە لەو پارەیەی بۆ خواردن کۆی دەکەینەوە هەفتانە بای پێنج لیرە پەرتووکیش بکڕین. دەستمان بە جێبەجێکردنی بیرۆکەکە کرد. یەکێك لە هەفتەکان زیا شەرەفخان ئۆغلوو گوتی: "با پەرتووك نەکڕدرێ، چونکە ئێوە تەنیا ئەو پەرتووکانە دەکڕن کە چەپەکان دەیخوێننەوە"، منیش بە گاڵتەوە وەڵامم داوە: "تۆش چ پەرتووکێکی وەك چوونە ناو مەسیحیەت و بەتەڵ غازی و ئەفسانەی شەهرەمانت پێ خۆشە لە لیستی هەفتانە بنووسە تا بیکڕن، ئەگینا بەو یەك دوو گەنجەی بەردەستت بڵێ، هەڤاڵینە ئێمە پەرتووك و مەرتووك ناکڕین، چونکە بەو پارە هەفتانە

دەتوانین ژەمێکی دیکە تکەی گۆشت بخۆین". پێویست ناکا لێرە ناوی بهێنم، بەڵام ئەو گەنجە زیرەکەی خوێندکاری کۆلێژی یاسا، کە کاك زیا مێشکی شوشتبۆوە، ئیدی ناوی ببووە تکەی گۆشت، چونکە ئەو ئاوای پێگوتین.

هەڤاڵ ئۆرفی، بە شەوق و ڕەونەق و فیداکار و چاونەترس و بە ڕەوشت، لەگەڵ تێپەڕینی کات کەوتبووە ژێر کاریگەریی گرێی دەروونیی بەندیخانە. لەلایەکی دیکەش نەخۆشیی هەردوو گورچیلەکەی ببوونە دوو ڕووی دراوێك تا وا لە ئۆرفی بکەن ببێتە کەسێکی بێ هەست. زوو زوو لەگەڵ ئەو گەنجانە بەشەڕ دەهات، لە کاتێکدا ئەوان لەتەمەنی کوڕی ئەودا بوون، خۆی پێنەدەگیرا و جنێوی پێدەدان، گەنجەکانیش وەك ڕێزێك لە گەورەیی تەمەن و ئاشنا بوون بە ڕابردووەکەی دەنگیان لێوەنەدەهات. چەندجارێك بە شێوەیەکی مەعقوول داوام لێ کرد ئاوا هەڵسوکەوت نەکات و بەبیرمدەهێناوە کە ئێمە لەوان گەورەترین و دەبێ ئەوان وەك ڕۆڵەی خۆمان تەماشاکەین و لە بری جنێو پێدانیان، دەبێ دڵنەواییان بکەین. بەڵام، ئەو قسانەی من، لای ئۆرفی هیچ پارەی نەکرد. ڕۆژێکیان هەندێك بە توندی پێم گوت کە وا نەکات، بەڵام ئەو ئۆرفیەی هەرگیز وەڵامی منی نەدەداوە، لێی خوڕیمەوە و گوتی: "هەتیو چیم لێ دەکەی یانی؟"، منیش بە هێمنی پێم گوت: "ئۆرفی نەفرەتت لێ دەکەم"، کەچی ئەو گوتی: "بۆ تۆ پاپای؟ چیت پێ دەکرێ بیکە"، منیش بە باشە وەڵامم داوە. گەنجەکانم کۆکردەوە و دۆخەکەم تێگەیاندن: "سەیرکەن ئیدی کەس لەگەڵ ئۆرفی قسە نەکات"، گەنجەکانیش خوا خوای شتێکی ئاوایان بوو، چونکە لەسەر تکا و ئامۆژگاریی من قسەیان لەگەڵ دەکرد.

بەیانیی ڕۆژی دواتر ئۆرفی کە هەڵسابۆوە، یەکەم کەس

یاشار کایا بەرەو ڕووی بۆوە و پێی گوتبوو: "سڵاو یاشار"، بەڵام یاشار ڕووی خۆی وەرگێڕابوو، دواتر تووشی فایەق ببوو و گوتبووی: "سڵاو فایەق"، بەڵام ئەویش وەڵامی نەدابۆوە، تا گەیشتە ناجی کوتلای هەمووی ڕوویان لێ وەرگێڕابوو و کەس قسەی لەگەڵ نەکردبوو. ئۆرفی بە تووڕەییەوە بەبەردەممدا تێپەڕی و هاواری دەکرد: "پاپا وا نییە! پاپا ببێتە دایکم و ژنم پاپا!"، منیش ڕووم لێی وەرگێڕا. ڕەنگبوو ئۆرفی شایەنی ئەو سزایە نەبووبێ، بەڵام منیش دۆخی دەروونیم زۆر ئاسایی نەبوو، بۆیە، هەر کاتێك ئەو ڕووداوەم بیردێتەوە هەست بە ئازاری ویژدان دەکەم.

یادەوەرییەکانی بەندیخانە بنی نایە و تەواو نابێت، دوای سی ساڵیش، وا لەژێر کاریگەریی ئەو ڕووداوانە یادەوەرییەکانم دەنووسمەوە. بەڵکو منداڵانی کورد، دوای من، وەك پرەنسیپێك سوود لەو هەموو سەربووردانە ببینن، بۆیە یادەوەرییەکانم بۆ ئەوان تۆمار دەکەم.

ئەودەمای، لە تورکیا، سەرژمێریی دانیشتوان دەکرا. ڕۆژێك پێشتر، ئاگاداریان کردینەوە گرووپێکی سەربازی دێن و ئێمەش دەژمێرن. ئێوارە لە نێوان خۆمان بابەتەکەمان کردەوە و شەن و کەوی ئەوەمان کرد، بۆ ئەوەی ڕێککەوین تا بەیانی چۆن وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە دەڵێ (زمانی دایکت تورکییە یان کوردی؟) بە ڕاست و چەپمانەوە بڕیارمان لەسەر ئەوەدا وەڵامی ئەو پرسیارە بەوە بدەینەوە کە زمانی دایکمان کوردییە. هەر بۆ سەرکێشیش، لە وەڵامی زانینی زمانێکی بێگانە، تورکیمان هەڵدەبژارد.

ڕۆژی دواتر، لە کاتی دەوامی فەرمی، چەند ئەفسەرێك هاتنە بەندیخانە. کۆبووینەوە و ئەوانیش دەستیان بە ژماردنمان کرد،

بەپێی ئەو بڕیارەی دابوومان جوولاینەوە، وەڵامەکانمان زمانی دایکمان کوردی و زمانی بێگانەش تورکی بوو. نۆرەی ئۆرفی هات و گوتی: "زمانی دایکم تورکییە"، دوای ئەوە پرسیاری ڕەگەز دەکرا، (پیاو یان ئافرەت؟)، کاتێك ئەو پرسیارەیان لە ئۆرفی کرد، ئەسەد جەمیل ئۆغلوو لەولاوە هاواری کرد بۆ ڕەگەزی ئەو بنووسن: "ژنانی". دوای ئەو قسەیە وای وای ئۆرفی بەو جەستە زەبەلاحەی چۆن خۆی لەو خرتو خۆڵە وەردا و هەستاوە و هێرشی کردە سەر ئەسەد، بە هەزار حاڵ تا گرتمان، ئیدی ئەو ڕۆژە ئاوا تێپەڕی.

لەو سەردەمەدا، تێرمێك بڵاوبۆوە بەناوی سۆسیالیزەیشن، گوایە بەشێك لە ماڵ و موڵکی ئەو کەسانەی زۆر دەوڵەمەندن دەدرێتە خەڵك. ئۆرفی خاوەن کارگە بوو، بۆیە، هەموو ڕۆژێك ترمزێکی گەورە شەربەتیان بۆ دەهێنا و ڕۆژی دواتر ترمزەکەیان بە بەتاڵی دەبردەوە. شەوێك، دەمژمێر یەك، من خەوتبووم، ناجی کوتلای و سەعید قرمزی تۆپراك، هەڵیانستاندم: "کاکە دە هەڵسە"، منیش هەڵستام، ئەوان منیان بردە باخچەکە، چونکە ئەوسا ئازاد بووین هەر کاتێك بچووباینە دەرەوەی قاوشەکانیشمان. ئینجا گوتیان: "سەیرکە کاکە، لە پشت ئۆرفی سوراحییەکی پڕ شەربەتی لیمۆ هەیە، ئێمە دەترسێین بیهێنین، تۆ بیهێنە تا ئێمەش هەندێکی لێ بخۆینەوە، دواتریش شتێکی دیکەی بۆ تێدەکەینەوە و لە شوێنی خۆی دایدەنێینەوە"، هەرچەندی گوتم نابێ، بەڵام ئەوان وازیان نەهێنا. دڵم نەشکاندن و چووم لە ڕەفی پشت سەری ئۆرفی سوراحییەکەم هێنا و دامە دەستیان. لە چاونوقانێك "قولپ قولپ" هەموویان خواردەوە و هەندێکیشیان پێشکەشی من کرد، بەڵام نەمخواردەوە و هۆکارەکەشم ئاوا بۆ شی کردنەوە: "کوڕینە بەیانی ئۆرفی

هەڵدەستێ و ئەو ناوە جنێو باران دەکا و دەڵێ، واو وا لەوەی بکەم بردوویەتی و لەوەش بکەم کە خواردوویەتییەوە، هیچ نەبێ ئەو جنێوانەی دەیدا با نیوە بە نیوە بێ، من هێنام و ئێوەش خواردتانەوە". دوای خواردنەوەی شەربەتەکە سوراحییەکەیان پڕ ئاو کرد و هەندێك شەکر و خوێ و لیمۆیان تێکرد و لە شوێنی خۆیان داناوە. بەیانی هەرسێکمان بەیەکەوە چاودێریی ئۆرفیمان دەکرد، هەر کە ئۆرفی دەستی بۆ سوراحییەکە برد تا بەسەر دەوی خۆی وەکات، لەیەکەم قومیدا تێگەیشت و هاواری کرد "وای وای هەتیوی بێ نامووسینە، دیارە ماڵی ئۆرفی گۆلکتان سۆسیالیزە کرد ها".

چەند ڕۆژێك بەسەر ئەو ڕووداوە تێپەڕی، بەڵام ئۆرفی تا دەهات زیاتر شێت و هار دەبوو. ڕۆژێك هاواری کرد "فریامکەون فریامکەون، تەنیا لەبەر ئەوەی گوتوومە زمانی دایکم تورکییە ئەوانە دەیانەوێت بمکوژن"، چەند ئەفسەرێك بەدەم هاوارەکەیەوە هاتن، پرسیان چی بووە؟ منیش پێمراگەیاندن کە ئۆرفی بە نەخۆشییەکی قورسەوە دەناڵێنێت و ئەمەش وای لێ کردووە تووشی بێ هیوایی بێت، بۆیە گەر بیبەنە شوێنێکی ئارام کارێکی باشی لەگەڵ دەکەن. لە ماوەی چەند ڕۆژێك، بە فەرمانی فارووق پاشا، ئۆرفیان بردە یەکێك لەو حوجرانەی کە پێشتر لێی دەماینەوە، بەڵام ئەوجارە دۆخی ئەو حوجرانە وەکو پێشوو نەبوو، ئۆرفی لەوێ زۆر ئازاد بوو.

وەك لەسەرەوە ئاماژەم پێ کرد، حوسەین ئاککوش دەرچووی بەشی ئابووری بوو، لە زانکۆی سۆربۆنیش دکتۆرای تەواو کردبوو. ئەو لەگەڵ ئۆرفی زویربوون و قسەیان لەگەڵ یەکدی نەبوو. هەردووکیان، لەگەڵ ئەوەی لە سەرووی سیساڵی بوون، بەڵام ژنیان نەهێنابوو، هەر هەردووکیشیاان تۆمەتی

ژن نەهێنانیان دەخستە ئەستۆی یەکدی. هۆکارەکە بەو شێوەیە بووە، یەکێکیان کچێکی خۆش دەوێ و دەیەوێ هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات، بەڵام ڕاستەوخۆ ئەوەی دیکەیان دەچێتە داخوازیی هەمان کچ و کارەکەی لێ تێکدەدا.

لە بەندیخانە خواردنمان بۆ دەهات، وەك ئاشکراشە لە یاسای لۆجیستیکی سەربازی، زینندانیش بەشێکە لەو دەزگایە، "بەندکراوانی سەربازی، وەك سەربازێکی ئاسایی خواردن وەردەگرن". لەبەر ئەوەی ماوەی سەربازیم وەك ئەفسەرێك لەبەشی لۆجیستی سوپادا بەڕێکرد بوو، دەمزانی ئەو قانوونە لە سەردەمی سوڵتان مەجیدەوە جێبەجێ دەکرێ. هەموو ڕۆژێك خواردنی چل نەفەرمان بۆ دەهات، لەبەر ناخۆشی تامەکەی سەموونەکەمان دەگێڕاوە و ئەوی دیکەمان لە گۆشەیەکی باخچەکە دەڕێشت. بە تێپەڕینی کات سەدان کۆتری کێوی فێر بوون، بۆ خواردنی ئەو چێشتانەی فڕێمان دەدا، دەهاتنە ناو باخچەکە. لەناو ئەو کۆترانە دانەیەکی سپییماڵیش تێکەڵیان ببوو و دەهاتە باخچەکە، هەڤاڵە گەنجەکانیشمان ئەو کۆترە سپیەیان بە ئۆرفی دەچواند.

نامەوێ لێرە باسی هەندێك یادەوەری بکەم، کە بۆ خوێنەر سەرنجڕاکێش نییە، ئەگەرنا بێت و لێرە باسی خۆ شوشتنی هەڤاڵان و جل شۆرین و کارەکانی دیکەی ناو بەندیخانە بکەم، زۆر بەسەرهاتی خۆش و ناخۆش هەیە تا بینووسم، بەڵام ئێرە شوێنی نییە. وەلێ، تا یەك دوو چیرۆکی تایبەت بە عەلی کەرەهان باس نەکەم، ناچمە سەر بەشێکی دیکە.

یەکێکیانم بە کورتی باسکردبوو، کە هەڤاڵان کاتێك دەرگای حوجرەکەیان کردبۆوە گوتبووی: "وازم لێ بهێنن، من نایەمە دەرەوە و بەگەر ئێوە ناکەوم. بۆیە، تکایە دەرگاکەم

داخەن". دووەم چیرۆکی ئەو ئەگەرچی تایبەتە، بەڵام با ببێتە وانەیەك بۆ ئەو گەنجانەی دوای خوێندنەوەی ئەو پەرتووکە، گەر کەوتنە حوجرەی بەندیخانە، تا وانەیەکی لێ وەربگرن.

عەلی کەرەهان، لەگەڵ کچی کاك شاکیری ڤیرانشەهیری هاوزمانمان زەماوەندی کردبوو، هاوسەرەکەی دەرچووی کۆلێژی ئەدەبیات بوو، ئەو ژن و مێردە خاوەنی دوو منداڵ بوون. ئەوسا کاك عەلی یاریدەدەری داواکاری گشتی بوو لە دادگای باڵا، بۆیە، لە تەواوی ساڵەکانی بەندیخانە لەهەر دەرفەتێکدا ئەو ڕستەیەی زۆر دووبارە دەکردەوە: *"ئەوکاتەی من دادوەر بووم لە شەمزینان"* ئینجا دەستی پێ دەکرد کە چیی کردووە، تا دەگەیشتە پۆستەکەی بەر لە زیندانی، بەشێوەیەك تەواوی پۆستەکانی خۆی بۆ سەربازە قاپشۆرەکانی بەندیخانەکەش گێڕابۆوە.

توومەزە، بەر لەوەی دەستگیربکرێین، عەلی لەگەڵ نیعمەت ئارزکی خانمە ڕۆژنامەڤان بەیەکەوە دەژیان، کاتێك ئێمە لە حوجرەی تاکەکەسی بووین، لەبەر ئەوەی خێزانی عەلی بەو کەین و بەینەی نێوان مێردەکەی و ئەو ئافرەتە ڕۆژنامەڤانەی زانیبوو، لە کۆبوونەوەیەك کە نیعمەت ئارزك دەبینێ، هێرشی دەکاتە سەر و تیر قسەی ڕەق و ساردی پێدەڵێت. ئەوسا نیعمەت ناوی بە خراپی ڕۆیشتبوو، بۆیە، لەبیبە خانم ئەوەی بۆ ئاشکرا ببوو کە ئەو ژنە مێردەکەی بە گرتن داوە. دوای ئەو شەڕ و دەمەقاڵێیەی نێوانیان، هەردووکیان نامەیان بۆ عەلی نووسی؛ لەبیبە دەیگوت: "هەتیو عەلی، شەرمت لەخۆت نەدەکردەوە لەگەڵ ئەو بێ ڕەوشتە هەڵدەستای و دادەنیشتی؟ سەیرکە لە نێوچاوانی ئەو، من و تۆ و منداڵەکانمان پەرێشان بووینە، هەر بۆ زانیاریشت، ئەو ژنە پۆلیسی نهێنی بووە و کاری

خۆی کردووە و تۆی بە گرتن داوە". هەرچی نیعمەتە لە نامەکەی ئاوای بۆ عەلی نووسی بوو: "ئەی هاوار کاك عەلی، تۆ چۆن لەگەڵ ئەو ژنە حەیزەران بەدەستەی کۆڵانان، هاوسەرگیریت کردووە؟ ئایا تۆ شایستەی ئەو ژنەی؟ وەڵاهی خەسار بووی و بۆتۆ شەرمە". دوای ئەو نامانە، عەلی بۆ هەردووکیان دوو وەڵام دەنووسێت، سەرەتا ئەو چەند دێڕە بە ژنەکەی دەڵێ: "دۆتمام، تۆ دایکی منداڵەکانمی، ڕووناهی هەردوو چاومی، چی بکەم کە بە هەوەسێکی کەرانەی پیاوان لەگەڵ ئەو قەح....، هاتینە لای یەك، لە کەم و کورپییەکەم ببوورە. بەڵێنت دەدەمێ جارێکی دیکە ئەو هەڵەیەم دووبارە نابێتەوە". دوای ئەو نامەیە بەم شێوەیەی خوارەوەش وەڵامی نامەکەی نیعمەت خان دەداتەوە: "خۆشەویستم بەقەد دووری نێوان ئاسمان و زەوی حەقی تۆیە، بەڵام تۆش دەزانی لەناو کوردان بە خۆشەویستی هاوسەرگیری ناکەین، بەڵکو بە ئادابی بینین ژن دەهێنین، ئەوەی منیش هەر ئاوا بوو، وەك خۆشت دەزانی، هەر کاتێك دەرفەتم هەبووایە ئەوم جێدەهێشت و دەهاتمە لای تۆ".

لە بەندیخانە کاتێك نامەمان دەنووسی، بۆ ناردنی نامەکە سەرەتا ڕادەستی بەشی کارگێڕیمان دەکرد، ئەوانیش کۆنترۆڵیان دەکرد، ئینجا دەیان ناردە ئەو ناونیشانەی نووسیبوومان. زۆربەی نامەکانیش بە مۆری چینی دادەخران، بەڵام دادوەرە زیرەکە شەمزینییەکەمان، هەردوو نامەکە لە یەك کاتدا دەداتە کارگێڕی بەندیخانە، ئەوانیش دەبینن نامەکان هیچ شتێکی وای تێدا نییە، بۆیە هەموو نووسینەکە کۆنترۆڵ ناکەن، بەڵام بە هەڵە نامەکەی لەبیبە خانم لە زەرفی نیعمەت خان دادەنێنەوە و نامەکەی نیعمەت خانیش لە زەرفی لەبیبە خانم دادەنێن و دەینێرن. دوای

هەفتەیەك، لە ڕۆژی موهاجەی بەندیخانە، خێزانی عەلی سەردانی هاوسەرەکەی دەکات. لەو دیدارە لەبیبە خانم هیچ نەما بەو بەستەزمانەی نەکا، بۆیە ئەو بە ڕەنگێکی زەرد لە ژووری میوانەکان گەڕاوە، پرسیم: "خێرە عەلی شپرزە و تێکچووی، هەواڵێکی ناخۆشیان بۆ هێنابووی؟"، ئەویش گوتی: "مووسا هەر مەپرسە ڕەزیل و سەفیل بووم"، ئینجا ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. دوای نیوەڕۆ جارێکی دیکە عەلیان بانگهێشت کردەوە و گوتیان سەردانیکەرت هەیە. لە گەڕانەوە ئەوجارە ئۆرفی لێی پرسی: "عەلی دیسان براژن هاتبوو؟" ئەویش وەڵامی داوە: "نا گیانەکەم، ئەوجارە جاریە خانم هاتبوو". دوای ئەو وەڵامە ئۆرفی بەو هەیکەلە گەورەی خۆیەوە، دەستی لەسەر سینگی دانا و لەبەردەم عەلی بە چۆکدا هات و بە شێوەیەکی گاڵتە ئامێز گوتی: "سوڵتانم ئەو جاریەیە نادەیە ئەو بەندەی خۆت؟"، بەڵام عەلی زۆر تووڕە بوو، نەچووباما نێوانیان ئیشەکە گەورە دەبوو. ئینجا عەلی بۆی باسکردین کە لەلایەن نیعمەت خانیشەوە وەك خێزانەکەی شورت و شۆی بە قسەی ناخۆش شکێندرابوو.

دوای ئەو ڕووداوە، نیعمەت ئارزك لە عەلی دوور کەوتەوە و پەرتووکێکی کاریکاتێریی بەناوی (مەحموود کوردی) لەسەر عەلی بڵاوکردەوە. لە پەرتووکەکە تەواوی ژیانی تایبەتی و خێزانیی عەلیی تێدا باس دەکرد. دیار بوو نیعمەت خانم خۆی بۆ کورد تەرخان کردبوو، چونکە دوای عەلی بیستمەوە کە لەگەڵ کینیاس کارتاڵ لەیەك نزیك بوونەوە. کاتی خۆی، نیعمەت خانم هاوسەری شەریف ئارزکی بەڕێوەبەری ئاژانسی ئەنادۆڵوو بوو، خانمێکی ڕۆشنبیر و دونیا دیتەبوو، چەندین زمانی دەزانی، لە پاڵ ئەوە خاتوونێکی زۆر جوانیش بوو. ساڵی ١٩٨٩ کۆچی دوایی کرد. گەر بە شێوەیەکی فەرمیش نەبا،

بەڵام بە براژنـی کـوردان هەژمـار دەکـرا، خـوا لە گوناحەکـانی خۆشبێت.

### ئەنقەرە

لە سەرەوە، بە درێژی باسی فاروق گوڤەن تـورکم کـرد. بەر لەوەی ئێمە ئـازاد بکـرێین ئەو بـۆ شـوێنێکی دیـکە گواسـتراوە، بەڵام بەر لەوەی بـڕوا ڕاپـۆرتێکی لەم شـێوەی خـوارەوەی بـۆ ئەنقەرە ناردبوو:

"سـەرجەم گیـراوە سیاسـییەکانی تورکیـا ئـازاد کـران، تەنیـا ئەوانەی بەندیخانەی حەربییە نەبێ، بۆیە یـان بیانـدەنە دادگـا و بڕیارێـك لە چارەنووسـیان بـدەن، یـاخود مـن بەرپرسـیاریەتەکە دەخەمە ئەستۆی خۆم و ئازادیان دەکەم".

بەر لەوەی وەڵامـی ئەنـقەرە بێتەوە، فـارووق پاشـا لای ئـێمە نەمـا، لە شـوێنی ئەو عـزەت پاشـای بە بـنەچە دیـاربەکری هـاتە شوێنەکەی، بەپێی ڕێکارەکانی ئەوکاتە دوای هاتنی بەڕێـوەبەری تازە پشوویەکی زیاترمان دا. دوای ماوەیەك ئاگاداریان کردینەوە خۆمـــان ئامـــادە بکەیـــن و دوای هەفـــتەیەك بـــۆ ئەنـــقەرە دەگوازرێینەوە.

بەیانییەك سەعات شەش، ئۆتۆبووسێکی مارسیدیسـی نـاوازەی ئەوسا هاتە دوامان. بەبـێ کەلەپچەکـردن سـواری ئۆتۆبووسـەکە بووین، بەڵام چەند ئەفسەرێك لەگەڵمان سـەرکەوتن، لە پـێش و پاشیشمان چەند ئۆتۆمبێلێکی سەربازی ئێمەیان دەپاراست. دەمەو نیوەڕۆ لە شوێنێکی تایبەت بە سوپای تورکیا لـە نـاوچەی بۆلـوو وەستاین، ئەوێ شوێنی پشوودان و کات بەسەر بردن بـوو، بـۆیە ئەفسەرە نیگابانەکەی تەکمـان گـوتی: "بـرادەرینە لە مـاڵی سـوپا بخـۆن و بخـۆنەوە، بەڵام بە هـیچ لایەکـدا مەچـن". ئەو هەڤـاڵە

گەنجانەی ماوەیەکی زۆر بوو نەك تامی ویسکی بەڵکو بۆنیشیان نەکردبوو، وەك ئەو باڵندەیەی لە هێلانەکەی دەردەچێ بە هیچ ڕانەدەوەستان، نەك تەنیا گەنجەکان بە ڵکو منیش، لەگەڵ ئەوان، بەدەم خواردنەوە مەیخانەی شوێنەکەمان بەتاڵکرد، لە ڕادەبەدەر زۆرمان خواردەوە.

چەند مانگێك بەر لەوەی بچینە ناوچەی (سەرین کویوو) لە ئەنقەرە، حکوومەت باڵەخانەیەکی سپی بە باخچەی بۆ ئێمە بەکرێ گرتبوو، تا کاتی گەیشتنیشمان تەواوی پێداویستییەکانی مانەوەی بۆ ئامادە کرا. ئیدی لەوێ دەستمان بە ڕۆژ ژماردن کرد تا کاتی دادگایی کردنمان، لەلایەن دادگای سەربازی، دێ. دوای ماوەیەك، پێنج شەش کەسی نوورجی[1] دەوڵەمەندیشیان هێنایە لامان. کاتێك ئەوان هاتنە لامان، ئەو برادەرانەی لافی موسوڵمانیەتیان لێدەدا، چوونە پاڵیان، بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکە ئایینییەکانیشیان ژوورێکی بچووکیان

---

[1] جەماعەتی نوور، نورجییەکان، یانیش جولانەوەی ڕیسالەی نوور، بزاڤێکە دوای نووسینی بەرهەمە ناودارەکەی سەعیدی کوردی (نورسی) بە ناوی (ریسالەی نوور) لە سەدەی بیستەم دروستبوو. ئەوانە بزاڤێکی سوننی ئیعتیقادی، فیقهی ئیسلامی بوون. سەرەتای دروستبوونیان بۆ ڕوونکردنەوەی ڕیسالەی نوور و تێگەیشتن و بڵاوکردنەوەی بووە لە تورکیا، لەژێر ناوی خزمەتکردنی قورعان و ئیمان، کە دواتر تەنیا ناوی خزمەتەکەیان زیاتر گرنگی پێداوە. دوای کۆچی دوایی شێخ سەعید، قوتابیانی، بۆ زیاتر ناساندنی ڕیسالەکە، بە شار و شارۆچکەکانی تورکیا و باکووری کوردستاندا بڵاودەبنەوە،، بەڵام ئەم جیابوونەوە و لەیەك دوورکەوتنەوەیە دەبێتە هۆکارێکیش بۆ جیابوونەوەی بیر و باوەڕ و بۆچوونیان لە زۆر ڕووەوە. ئەم گرووپە، دواتر لە تورکیا تێکەڵی سیستەمی سیاسی دەبن. لە نموونە هەرە دیارەکانیش، جەماعەتی گولەنن کە بە باڵێکی پێشکەوتووی ناو بزووتنەوەی نوورجییەکان دادەنران. (وەرگێڕ).

کردە مزگەوت و عەبدولڕەحمان دۆلاکیش بووە پێشنوێژیان. لە ماوەیەکی کورت هەشت نۆ هەڤاڵمان بوونە کڵاو لەسەر. ئەوان ناحەقیشیان نەبوو، چونکە لە ئێمە زیاتر سوودمەند بوون، لەبەر ئەوەی هەموو ڕۆژ گۆشتی بەرخ و سینیی بۆرەك و پاقلاوە بۆ ئەو نوورجییە دەوڵەمەندانە دەهات و لەگەڵ ئەوان برادەرە کڵاو لەسەرە تازەکانیشیان پارووی چاکیان لێ با دەدا. دوای ماوەیەك، هەڤاڵانی دیکەمان بە گاڵتەوە گوتیان: "با ئێمەش بچین و لەگەڵیان دەست بە نوێژکردن بکەین، هیچ نەبێ ئێمەش نانەکەیان لەگەڵ دەخۆین". لە هەمووشیان زیاتر سەعید قرمزی تۆپراك وای دەگوت، کەچی ئەو لە حەوت پشتیماڵباتەکەیان کەسیان نوێژیان نەدەکرد. ئێمەش بە پێکەنین و حەنەکەوە بەسەر بابەتەکە تێدەپەڕین، بەڵام بەردەوام ئەو بەیتەی نەبیم بیردەهێنانەوە:

**"ئایا لوقمەی گۆشت واجبە؟**
**ئایا تۆ نانت بەس نییە؟**
**لێت بە زەهر بێ ئەو لوقمەیە،**
**گەر پەزمان دابیتیەوە دوای نان".**

ئەو قسانەمان تەنیا بۆ حەنەك کردن و شۆخی بە برادەرەکانی دیکەمان دەگوت. مەسەلەی نوێژ و ئیمامەتییەکە مانگێکی خایاند، چونکە خەلیل دەمیرەلی ئەندازیاری دارستان، ساز ژەنێکی ناوازە بوو، عەبدولرەحمان دۆلاکیش کەسێکی بێ ورە بوو، بۆیە ڕۆژێك عەبدولرەحمان بە جۆش و خرۆشەوە لەبەردەم خەلیل کاتێك سازی دەژەند، دەستی بە سەماکردن کرد، لەو کاتەدا نوورجییەکان بینیان و لێی تووڕە بوون، بۆیە ئەو سەماکەرەیان لە پێشنوێژیی خۆیان دەرکرد. دوای ئەوە، هەڤاڵان

لەسەر ئەو بابەتە سەریان دەخستە سەر عەبدولڕەحمان، ئەویش دەیگوت: "وەی دایکیان ئاواو ئاوا لێ بکەم، جا یەك مانگە بەبێ دەستونوێژ هەڵگرتن ئیمامەتییان بۆ دەکەم".

دوای ماوەیەك، بە هەنجەتێکی پووچ، گوایە بنکەی ئاسمانیی سەربازیی شاری (ئێسکی شەهیر) بەنیازی کودەتایە، چەند عەریفێکی سەر بە خۆیانیانیان هێنا لامان. ئەوانە بەرامبەر بە ئێمە تا بڵێی بە ڕێز و حورمەت بوون، ئێمەش هەم هاوکاریی ماددی، هەمیش هاوکاریی یاسایی ئەوانمان دەکرد. عەریفێکی گەنجیان تێدابوو تازە هاوسەرگیریی کردبوو، ئەو زوو زوو هەڵدەچوو. ڕۆژێك لەگەڵ هەڤاڵان دانیشتبووین، ئەویش هات و دوای سڵاو کردن گوتی: "بەڕێزینە سەیرکەن، بێ شەڕەفم گەر ڕۆژێك دەوڵەتی کوردیتان دروستکرد، من نەیەم و لە هێزی ئاسمانیتان خزمەتی سەربازی نەکەم و زۆربەی شوێنە گرنگەکانی تورك بۆمباران نەکەم". دیسان ئەرکەکە کەوتە سەر شانی من و دڵنەواییم کردەوە و داوام لێ کرد خۆڕاگر بێ و پێیشم گوت هیچ نییەتێکمان نییە تورکیا بۆردوومان بکەین.

دواجار، دۆسیەی ئەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵمان، گەیشتە دادگا. ئێمەش بەپێی ئەو دۆسیەیەی لەسەرمان کرابۆوە، لە نێوان خۆماندا بۆ ڕاهێنان، بەر لەوەی بچینە بەردەم دادوەر دادگایەکمان دروست کرد و سێ کەسمان لە نێوان خۆمان کردە دادوەر و یەکێکیشمان کردە داواکارێکی گشتیی عاسی. سەرجەم دۆسیەی هەڤاڵانمان بە تەواوی وردەکارییەوە دادگایی کرد. بەڕاستی ئەو ڕاهێنانە لە ڕۆژی دادگایی سوودێکی زۆری هەبوو. چونکە بەشێکی زۆری هەڤاڵانمان دەرچووی بەشی یاسا نەبوون، هەندێکیشیان شارەزاییان لەسەر بڕگە و ماددە یاساییەکان زۆر کەم بوو.

چوونە بەردەم دادگای سەربازی، سەرجەم میدیا بیانی و تورکییەکان لەوێ بوون، بۆ نموونە (تاس، ڕۆیتەرز، BBC). بۆیە ئەو ڕۆژە لە بری ٥٠ کەس لەبەر ئەوەی هەڤاڵ ئەمینمان شەهید بوو، بە ئێمەیان گوت ٤٩ یەکان، هەر لەوێوەش ئەو ناوەمان بەدواکەوت.

لەیەکەم دانیشتن لێکۆڵینەوە لە ڕاستیی ناسنامەکانمان کرا، بە شێوەیەکی گشتیش ناوی خۆمان و باوکمان، ناوی ئیسلامی بوون. بەڵام ناوی دایکەکانمان کوردی بوو، بۆ نموونە (کارۆ، داداك، بەرفێ، کۆچەرێ، ستێرێ، فەسلا، زینێ). ئەوەش بەسەر میدیاکارەکانەوە تێپەڕ نەبوو، چونکە ڕۆژی دواتر لە وتار و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکان نووسیبوویان: "گەر بە ناوی دایکیانەوە نەبووایە، ئێمە نەماندەزانی ئەوانە کوردن".

دانیشتنەکان لەلایەن دادوەرێکی گەنجی زیتەڵەی دەم بەخەندە بەڕێوەدەچوو، ناوی جەمال کۆرکماز بوو. هیچ نییەتخراپییەکی لەسەر و سیمایدا نەدەبیندرا. پێم وابێ ئێستا لە ئەنقەرە پارێزەری دەکات. ئەها هەندێکجار بە منداڵێك دەڵێن ماشەڵڵا زۆر وریایە، بە بۆچوونی منیش کاك جەمال کاتی خۆی لەو منداڵانە بووە. ئێمە لە کاتی مافی قسەکردنماندا هەڵدەستاینەوە و بە تووڕەییەوە باسی دار و بەرد و شاخ و داغمان دەکرد، بەو دۆخەوە چیمان بە مێشکدا هاتبا بە درێژی باسمان دەکرد، کاك جەمالیش گوێی بۆ دەگرتین و وەك ئەوەی دەنگمان لەسەر کاسیەتێك تۆمار بکات، هەمووی دەنووسیەوە. چونکە لە ڕووی ویژدانیەوە باوەڕی بەوە هێنابوو ئێمە لەسەر حەقین. دوایە بیستمانەوە ئەویش هەر کورد بووە و خەڵکی ئیسلاحیەیە.

ئەو برادەرانەی لە ژیاندا ماون، تاکتیکەکانی ڕۆژی

دادگاییکردنم دەزانن، لەبەر ئەوەی دەمزانی داواکارە گشتییەکان سەت دەرسەت نوێنەری فاشیسزمن، بۆیە بەردەوام تا ئاستی جنێو پێدان هێرشم دەکردە سەریان، چونکە ئەوان لە مانای دادگا و دادوەرییان نەدەزانی.

مەغۆلییەکان کاتی خۆی بە (داواکاری گشتیان) دەگوت (مودەعی عمومی). یانی پارێزەری گشتی، بەڵام ئەوانەی سەردەمی کۆمار، وەك چۆن هەموو شتێکیان گۆڕی و پێچەوانەیان کردبووەوە، داواکارییە گشتییەکانی ئەوساش ئەشهەد و بیلا ئەو ناوەشیان تەنیا بۆ پاراستنی فاشیستەکان بەکار دەهێنا، چونکە بۆ ئەو داواکارە گشتیانە گرنگ نەبوو کە دەستگیرکراو لە زیندان ئەشکەنجەدراوە یان تاوانیان بۆ هەڵبەستووە، ئاخر ئەوان چەند نەخوێندەوارێکی داشی دامەن و بۆ چەند قرووشێك مووچەی مانگانەی حکوومەت، پارێزگاری لە ڕاپۆرتێکی نالۆژیکی بێ ویژدان دەکەن، کە پۆلیس بە شەق و پێلەقە و لەژێر ئەشکەنجە، ڕاپۆرتەکەیان بە کەسی دەستبەسەر واژوو کردووە.

من و هەڤاڵانمان، بەو هەستەی بەرامبەر بە داواکارە گشتییەکان هەمان بوو، لە دادگای سەربازی هەناسەمان بەبەر ئەو فاشیستانە نەدەهێشت، سەرئەنجام لەماوەی چوار پێنج مانگ، سێ داواکاری گشتیان گۆڕی، چونکە وەڵامی هەموو پرسیارێکی ماقوولیشیانمان بە پێچەوانە دەداوە. لە دانیشتنێکدا، محەمەد تورانی داواکاری گشتی، پرسیارێکی خێزانی بێ مانای لێ کردم کە هیچ پەیوەندیی بە بابەت و شوێنەکەوە نەبوو، منیش لە وەڵامدا گوتم: "ئەو پرسیارە لە شکۆی دادگا ناوەشێتەوە و هیچ پەیوەندیشی بە دۆسیەکەمەوە نییە"، ئینجا درێژەم پێدا: "ئەو مێشکەی ئەو پرسیارەی لا دروستبووە، لە ئاست ستانداری ئەو

سەدەیە نییە، بۆیە، لەو وەڵامەش تێناگا کە من دەیدەمەوە، جا پێویست ناکا وەڵامی پرسیارێکی ئاوا نا پێویست بدەمەوە و دادگا سەرقاڵ بکەم"، دوای ئەو وەڵامەم داواکارە گشتییەکە شێت و هار بوو. جەنابی حاکم جەمال، بە خەنینەوە ڕووی لە داواکارە گشتییەکە کرد: "کاك محەمەد تۆ دەتەوێت ئەو پیاوە لە سێدارە بدرێت؟"، بۆیە لە دانیشتنی داهاتوو کاك محەمەدی داواکاری گشتی، پرسیاری لەسەر هیچ شتێك نەکرد، دواتر لە جێی ئەو یەکێکی دیکە هات کە بەسەر و سیمای دیار بوو کەسێکی بێ زەڕە، بۆیە، ئێمەش مامەڵەمان لەگەڵ ئەو بەستەزمانە باش بوو، چونکە نە ئەو ئێمەی بێزار دەکرد، نە ئێمەش ئەو، سەرجەم بڕیارە ماقوڵەکانی کاك جەمالی دادوەریشی جێبەجێ دەکرد.

دوای ماوەیەکی کەم، دادوەر دەستی بە دەرکردنی بڕیاری ئازادکردنی ئێمە کرد، ئیدی ڕۆژانە لەگەڵ هەر دانیشتنێك چەند هەڤاڵێکمان ئازاد دەکران. لەگەڵ ئەو دۆستانەی چەندان ساڵ بوو لە زیندان بەیەکەوە بووین، وردە وردە کاتی جیابوونەوەمان دەستی پێ کردبوو، ئەمە بۆ هەردوولامان جێگای دڵتەنگی بوو، لەماوەی مانگێك هەمووومان ئازاد کراین و هەریەکەمان بەلایەکدا چووین.

ئەگەرچی بڕیارەکانی ئەو دادگایە بۆ ئێمە خۆشبوون، بەڵام ڕەنگە وەك پێویست نەبووبێ. سەرجەم هەڤاڵانمان، بە چەپ و ڕاستەوە، هیچ نەرمییەکمان بەرامبەر بەو داوایەی لەسەری دەستگیرکرابووین نەنواند، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم، ئێمە ئەوسا، وەك ئەو گەنجانەی ئەمڕۆ لە تەمەنی ڕۆڵە و نەوەکانمانن، داوای ئەو مافە سەرەتاییانەی کوردمان نەکرد کە ئەوان ئێستا لە پێناویدا خەبات دەکەن، پێم وایە ئەمە بۆ ئێمە کەموکوڕییەکی

مێژوویی بووە، بەڵام، لەو باوەڕەدام بۆ ئەو گەنجانەی ئەمڕۆ و بەیانی بناغەیەکی پتەوە و باشیشمان دانا. لەو دەستگیرکردنەماندا، بە خوێنـــدەوار و نەخوێنـــدەوارمانەوە، ٤٩ کەس بەپێـــی هەلومەرجەکانی ژیانی ئەوڕۆمان سەرمان بۆ کەس دانەنواند و ئەو زولـــم و زۆرداریـــیە نامرۆڤـانەی حکـــوومەتی ئەوســـا و پێشووتریشمان هێنایە زمان، بەردەوام ئەوەمان پیشان دەدا کە کوردێکی ماف خوراوی کۆڵنەدەرین لە خەباتی کوردایەتیماندا.

لە ماوەی ئازادکردنماندا ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا. ئەسەد جەمیل ئۆغلوو، ئەوسا تەمەنی نزیکەی ٦٠ ساڵ بوو، کاتی خۆی کە لە پـــاریس بەشـــی کوشـــتوکاڵی خوێنـــدبوو، بەنـــاوی عوسمانییەکان بەشداریی لە پاڵەوانیەتی بۆکسی ئەوروپا کردبوو، هەر لەو پاڵەوانیەتیەش ببوە یەکەمی سەر ئەوروپا. کاتێك بڕیاری ئازادکردنی دەرکرا، بەرامبەر دادوەر هەستاوە و دەستی ڕاستی کردە بۆکسێك و گوتی: "من نامەوێ ئازاد بکرێم، چونکە بەو دەست و بازووەم، لە ئەوروپا ئاڵای تورکیام بەرزکردۆتەوە، بەڵام ئێستا پەشیمانم، بریا لەگەڵ بۆکسی یەکێك لە یاریزانە ڕکابەرەکانم بە زەویدا بکەوتباما و هەڵنەستاباماوە، چونکە لە کەیەکەوە من و ڕۆڵەکانم لەو حوجرە کولەمەرگیانەدا ڕزاینەوە. من بە چ ڕوویەکەوە بچمە دەرەوە کاتێك یاشار کایا و ئۆغوز ئوچۆك دەهێڵنەوە کە لەتەمەنی نەوەکانی منن؟". دوای ئەوە کاك جەمال گوتی: "کاك ئەسەد دڵتەنگ مەبە، لە ماوەیەکی نزیك ئەوانیش ئازاد دەکرێن، چونکە ئێمە بەپێی ڕیزبەندیی دۆسیەکان بڕیارەکان دەردەکەین، گەر بشمزانیبا وا دڵتەنگ دەبی، نۆبەتی دۆسیەکەی تۆم دەگۆڕی و بەر لە تۆ ئەو دوو گەنجەم ئازاد دەکرد، بۆیە لەسەر حەقن و سەغڵەت مەبن". ئێمە مامە ئەسەدمان بە هەزار حاڵ ڕازی کرد و لە زیندان هێنامانە دەرەوە،

بەڵام تا هەموومان ئازاد کراین، لە ئەنقەرە چاوەڕوانیی کردین، کاتێکیش هەموومان ئازاد کراین گوتی: "ئیدی دەتوانم بە ڕوویەکی سپییەوە بچمەوە دیاربەکر".

لە زیندان مامە ئەسەد ببوە مامۆستای وەرزشی ئێمە، چونکە ئەوکاتەی لە پاریس بوو، خۆی بە چەندان وەرزشی تایبەت و پێشکەوتوو بوو سەرقاڵکردبوو، بە تایبەتی وەرزشی سویسرپی زۆر بەلاوە سەرنج ڕاکێش بوو. هەموو بەیانییەك لە باخچەی زیندان ڕاهێنانی بە هەموومان دکرد، بەشێك لەو وەرزشانەش زۆر گران بوون، بۆیە ئۆرفی ڕەحمەتی لەو چەند وەرزشە بەخشرا بوو. ڕۆژێك بە ڕێکوپێکی وەرزشی خۆمان دەکرد، جەنەڕاڵ فاروق گوڤەن تورك هاتە لامان، ئێمەش وەك ڕێزێك وەرزشەکەمان وەستاند، بەڵام ئەو گوتی: "نا نا مەوەستن". هەر هێندەی بینیمان ئەویش کاسکێتەکەی سەری لەلایەك دانا و بەشداریی وەزشەکانی ئێمەی کرد. کاتێك ڕاهێنانەکەمان تەواو بوو، بیرم دێ پێی گوتم: "بریا قسە و قسەڵۆك و زۆریی کارەکانم نەبووایە و هەموو بەیانییەك لەگەڵ ئێوە وەرزشم کردبا".

من پاشانیش، لە دیاربەکر پەیوەندییەکانی خۆم لەگەڵ مامە ئەسەد نەپچڕاند، لەبەر ئەوەی باوەڕم بە مەردایەتی و دروستییەکەی هەبوو، بۆیە بەردەوام ڕێز و حورمەتی زۆرم پیشاندا. لەگەڵ ئەوەی تەمەنی گەیشتۆتە نەوەد ساڵ بەڵام هەر کاتێك دەمبینێ ماسوولکەکانی کورژ دەکا و دەڵێ: "مووسا وەرە بۆکسێکم لێدە". ماشەڵا تا ئێستا ماسوولکەکانی وەك گەنجێك بەهێز و لەسەرەخۆن.

ساڵی ١٩٧٠، هەموومان بەو ڕووداوەی خوارەوە تاساین: مامە ئەسەد کوڕێکی تاقانەی هەبوو، ئەو دەرچووی کۆلێژی پزیشکی

بوو، تاقانە کوڕ ببووە دکتۆری دڵ و هەناو، کاتێك لە دیاربەکر لە ئامادەکاریدا بووین تا بەشێوەیەکی شاهانە مەراسیمی پێشوازیی بۆ بکەین، هەواڵی وەفات و جەنازەکەی بە فرۆکە هاتەوە دیاربەکر. توومەزە ئەو کاتەی لە ماڵەکەی خۆی، سەرقاڵی ئامادەکارییەکانی گەڕانەوە بووە، لە پڕ دڵی وەستاوە. بەڵام، مامە ئەسەد بەرامبەر بەو ڕووداوە جەرگ بڕ و جەرگ سووتێنەرەش، هەر لەسەر پێی خۆی وەستا و دڵی ئێمەشی دەداوە.

لەسەرەوە ئاماژەم پێدا، کە مام ئەسەد برای جەمیل پاشازادە و ئەکرەم و کاك قەدرییە. کاتێك برا گەورەکانی ناچار بوون ڕاکەنە سووریا، ئەویش بە ناچاری بۆ ئیزمیر ڕاگوێزرابوو و چەندان ساڵ لەوێ مابۆوە، دواتر لەگەڵ خانمێکی ئیزمیری ژیانی هاوسەریی پێکهێنا. بەر لەوەی لە زیندان ئازاد بکرێین، دۆخی سیاسیمان ئاشکرا ببوو، کە دەرچووین دووبارە بەسەر گرووپی جیاواز دابەش بووین. زۆربەمان لە ئەنقەرە و ئیستانبووڵ دادەنیشتین، بەڵام ئەوانەی لە کوردستان نیشتەجێ بوون، لایەنگری چەپەکان بوون. لە ناوچەی (پازارجك) کاك ئۆککەش قەرەداغ، لەسەر ئەوەی چەند نامەیەکی بۆ ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد) ناردبوو، تۆمەتبار کرابوو، بە داخەوە، ئازاد بوونمان هەندەی بەسردا نەچووبوو، کەوتە ژێر ئۆتۆمبێلێکی بار هەڵگر و شەهید بوو، بە ڕێزەوە سەرم لەبەردەم یادەوەرییەکانی دادەنوێنم.

لە مالاتیا، عیسا موحسین شاڤاتا، ئەرکە نەتەوەییەکەی دابووە دەست منداڵەکانی، تا ئێستاش بە سەربەرزییەوە دەژی، بەڵام هۆکاری دەستگیرکردنەکەی بەسەرهاتێکی سەیر بوو، چونکە لەژێر کاریگەریی خوێنگەرمی و گەنجایەتییەکەی نامەیەکی بۆ

عەدنان مەنـدەرێس نووسـی بـوو و داوای لـێ کردبـوو ڕادیـۆی تورکیـا پەخشـی کـوردیش بکـاتەوە. یەکێکـی دیـکەش لەو تۆمەتانەی دەخرانە پاڵی، بەشداریکردنی بـوو لەو کۆنگرانەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین، سـەبارەت بە پرسـی کـورد، دەکـران. سـاڵێك دوای دەستگیرکردنمان لە دادگای سەربازی، کاتێك دادوەر لێی پرسی بۆچی نامەت بۆ مەندەرێس نووسیبوو، لە وەڵامدا گـوتی: "چۆن نەینووسم جەنابی دادوەر، ئەی شەرم نییە ئەوەنـدە ملیۆن کوردە بە زمانی خۆیان ڕادیۆیەکیان نەبێ پەخش بکات، چونکە لە ڕادیۆی عەرەبی و ڕووسی گوێمان لە پەخشی کوردی دەبێ، ئەی بـۆچی لە ڕادیـۆی تـورکی گوێمـان لە پەخشـی کـوردی نابێ؟". کاتێك لە دادگا ناسنامەکانمان پشتڕاست دەکراوە، شاڤاتا زۆر مەردانە شێوازێکی تایبەت بە خۆی هەبوو بۆ خـۆ ناسـاندن. دادوەر لێـی پرسـی: "چ کارێـك دەکەی؟" لە وەڵامـدا گـوتی: "بازرگانی ئاژەڵی زیندوو دەکەم"، بەڵام بەڕێز دادوەر جەمـال بە خەندەیەکەوە پرسیبووی: "ئەوە چ کارێکە؟" شاڤاتاش دەڵێ: "ئێ جەنـابی دادوەر وەك تـورك قەسـابی ئـاژەڵ و مـرۆڤ نـیمە، لە سووریا و لوبنان ئاژەڵ بە زینـدوویی دەفرۆشـم"، کـاك جەمیلـی دادوەری هاوشاریشی بە شێوەیەکی خۆش پرسـی بـووی: "باشـە ئەو ئاژەڵانـە بە قاچـاغ یـان بە فەرمـی دەبەیە ئەو وڵاتـانە؟"، شاڤاتاش بە پێکەنینەوە گوتبووی: "تۆ خۆش بـی، وەڵا بەهەردوو شێوە دەبێ"، دادوەریش دواتر بە پێکەنینەوە داینیشـاندبوو. پێشـتر ئاماژەم پێ کردبوو کە لەناو هەڤاڵانمان موحسین شاڤاتا و ئەسەد جەمیل ئۆغوڵوو و ئۆککەش قەرەداغـی، لە کوردسـتان دەژیـان، بەڵام زۆر سـەیر بـوو بەشـێك لەو بـرادەرانە دینـدار بـوون و بەشێکیشیان لە خێزانە فیوداڵەکانی کوردستان بـوون، بەڵام وەک زیـا شـەرەفخان ئۆغلـوو دەیگـوت، هەر لایەنگـری ئـێمەی

کۆمەنیستیان دەکرد، بۆیە هەم لە زیندان هەمیش دواتر لەگەڵ ئەو برادەرانە پەیوەندیمان هەر بەردەوام بوو.

ئارنۆڵد تۆینبیی مێژوونووسی ئینگلیزی، دەڵێ: "بۆ هەر گەلێك گەورەترین مالّوێرانی بریتییە لەوەی مێژووەکەی لەلایەن دوژمنەکانییەوە نووسرابێ". ئارنۆڵد تۆینبی بۆ ئەو مەبەستە نموونەی ئەسینای یۆنانی کۆن و ئیسپارتە و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش کورد و گەلە دوژمنەکانی دەوروبەری دەهێنێتەوە. لە کۆلێژی یاسای زانکۆی ئیستانبوول، ئەندرێ سچوارتز، وانەی یاسای خێزانی پێ دەگوتین و زوو زوو بەبیری دەهێنایەوە: "گەنجینە، ئەو یاسا مەدەنییەی ئیمڕۆی تورکیا، کە بە بنەچە یاسای مەدەنی سویسڕایە و بەشی یاسا پێوەی پابەندە، بە شێوەیەکی فراوان لە ژێر کاریگەریی یاساکانی کڵێسا داڕێژراوە". منیش دەڵێم، یادەوەرییەکانی ئێرەم بە شێوەیەکی گشتی لەژێر کاریگەری ئایینی نەتەوەیی کوردە، واتە زەردەشتی. هەموو کاتێك ئەوەش بۆ فەنتازی ناڵێم، بەڵام گەر ڕۆژی دوایی هەبێ، لەو باوەڕەدام هەر یەك لە پێغەمبەرانی خوا، محەمەدی عەرەب و عیسا و مووسا، گەر شەفاعەت بۆ کورد نەکەن و خاوەنداریەتییان نەکەن، دڵنیام من و گەلی کورد لەلایەن زەردەشتەوە شەفاعەتمان بۆ دەکرێ کە زۆر لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسڕائیلی باڵاترە، چونکە دەبینن کە نەوەی عەرەب چیان بە کورد کردووە، چ سەدام حوسێنی وەحشی دەڵێن، یان ئەو یاسر عەرەفاتەی، چەندان ساڵ وەك کەر بەشداری خەم و ناخۆشییەکانیانمان کردووە و تا ئەو ئاستەی گیانیشمان لە پێناوی بە فیدا داوە. جگە لەوانە، خانەکانی بەدلیس و نووسەری شەرەفنامە بە ئەمیر شەرەفخانەوە، پەڵەیەکی ڕەشن بە نێوچاوانی گەلی کوردەوە.

بۆ نموونە لە شەرەفنامە شەرەفخان سەرجەم ماڵباتە کوردییەکان بە ماڵباتە عەرەبییەکانەوە گرێ دەدات و دەڵێ: "زاناکان لەسەر ئەوە کۆکن، کوردەکان لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی جن و مرۆڤ هاتوونەتە دونیاوە، وەڵاهو ئەعلەم". یانی جەنابیان ئەو بۆچوونە بێ مانا و سەقەتە ڕەتناکاتەوە، کەچی دەڵێ: "خوا دەزانێ، لەوانەیە ئاوا بێ"، جا لە نەوەی ئەو، دواتر زانا و ئەمیر، شێخ ئیدریسی بەدلیسی هاتووە، شێخ ئیدریسیش عوسمانییەکانی هێنا کوردستان و کردنییە بەڵایەك بەسەرمانەوە، شێخ ئیدریس پەرتووکێکیشی بەناوی (هەشت بە هەشتی) لەسەر ئەو سوڵتانە عوسمانییانەی پێش سوڵتان یاڤووز نووسی. دەڵێم گەر من لەو سەردەمە ژیابام، پەرتووکێکم دەنووسی بەناوی (هەشت جەهەنەمی). لەسەر ئەو مەدح و سەنایەی بەدلیسی بۆ سوڵتانە عوسمانییەکانی کردووە، لە نێو کورددا بەم شێوەیەی خوارەوە چیرۆکێك بەسەر خانەکانی بەدلیس گوتراوە:

**"لۆ لۆ خانێ بەدلیسێ**
**تۆ لە باوك و باپیرانی خۆتەوە پیسی!".**

خۆشم سەیرم پێدێت لەو بەشە ئەوەندە باسی دین و ئیمان و شەریعەت و ئاخیرەتمان کرد، بەڵام بەو بۆنەیەوە بیرەوەرییەکی زیندووم هەیە دەمەوێ باسی بکەم. دیارە کە زیا گۆك ئالپ و دکتۆر عەبدوڵلا جەودەت لەسەردەمی خۆی کوردپەروەرێکی مەرد بووینە. هەردووکیان ڕۆڵەی یەك ناوچەن، هەردووکیشیان نازناوەکەیان کوردییە، وەك چۆن زمانی دایکیشیان کوردییە، یەکێکیان چەرمیك و ئەوەی دیکەشیان عەرەبە. مەلا حەسێنی خوێندەوار و مەولوود نووسی زازاکی، ڕۆژێك لەگەڵ ئەو دوو پیاوە لە شوێنێك بەیەکەوە دەبن. عەبدوڵا جەودەت و زیا گۆك

ئالـپ لێـی دەپرسـن: "تـۆ پیـاوێکی خوێنـدەواری، پێمـان بڵـێ چیرۆکی حەشری ڕۆژی دوایی چییە؟ دەڵـێن ڕۆژی حەشـر دێ و فریشتەیەك بە هەمـوو هێـزی فـوو لە ژێـر زەوی دەکـا و ڕۆح بەبەر ملیاران کەس دەکاتەوە و هەموویان وەکو پێشـوو زینـدوو دەبنەوە، ئینجا ئەوانە دێـن و لە پـێش خـوا لێپێچینەوەیـان لەگەڵ دەکـرێ. مەلا تـۆ چـۆن بـاوەڕ بە شـتێکی وا پـووچ و بـێ مانـا دەکەی؟". مەلا حەسێ بە گۆك ئالپی دەگوت (ئەستێرە ناس)، بە دکتۆر عەبدوڵا جەودەتیشـی دەگـوت (تەبیـب). لە وەڵامـی ئەو پرسـیارەیان، مەلا حەسـێ بە کـوردی ئەو وەڵامە نـازدار و زەریفەیان دەداتەوە:

**"تەبیب و ئەستێرەناس پێیان گوتم ڕۆژی حەشرێ نییە،**
**منیش دەڵێم لێرە دوور کەونەوە و زۆری مەڵێن،**
**گەر ئەوەی ئێوە ڕاست بێ هەمووومان وەك یەکین**
**بەڵام گەر قسەی من دەرچێ، دەبێ ئێوە هەر گوو بخۆن".**

ماددەم کاتی هاتووە، دەمەوێ بەسـەرهاتێکی تـایبەت بە مەلا حەسێشـتان بـۆ بـاس بـکەم. مـن مەلا حەسـێم نەبینـی، بەڵام خوالێخۆشبوو شێخ شەفیق ئاڤراسی، زۆر باسی ئەوی بۆ دەکردم. یەکێك لەو ڕووداوانەی گێڕایەوە بەو شێوەیە بووە:

سـەید عەبـدولقادر و مەلا حەسـێ ڕەفیـق بـووینە، سـەید عەبدولقادر سەرۆکی ئەنجوومەنی ئایـان و کـۆمەڵەی تەعـالی و تەرەقـی کـوردی بـووە، لە هەمـان کـات لە سـوڵتان عەبدولحەمیـدیش زۆر نزیـك بـووە. ئەوسـەردەمە مەلا حەسـێ نەخۆشی فتقی هەبووە، بۆیە، لەو سەردەمە ئەو جـۆرە نەخۆشـییە تەنیا لە نەخۆشخانەی جەراح پاشا نەشتەرگەری بۆ دەکـرا، بەڵام ئەو کارە تەنیا بە بڕیاری سوڵتان جێبەجێ کراوە. مەلا حەسێ، تا

نەشتەرگەرییەکەی بۆ بکەن، نامەیەك بۆ سەید عەبدولقادر دەنووسێ، سەید عەبدولقادریش مۆڵەتی نەشتەرگەریەکەی لە سوڵتان عەبدولحەمید وەردەگرێ و مەلا حەسێ لەسەر مێزی نەشتەرگەری درێژ دەکەن. کاتێك مەلا دۆخی شێواوی دکتۆرەکان دەبینێ، لێیان دەپرسێ: "چی دەکەن؟" ئەوانیش دەڵێن دەبێ: "لە هۆش خۆت ببەین، ئینجا نەشتەرگەرییەکە بکەین"، بەڵام ئەو بە توندی ڕەتی دەکاتەوە و دەڵێ: "ئەی گەر لەبەر دەستتان بە بێهۆشی مردم؟ ئەوکات، بێ تۆبە و ئیستیغفار، بەبێ ئیمانی گیان لەدەست دەدەم، بۆیە ئێوە نەشتەرگەرییەکەی خۆتان بکەن بەبێ ئەوەی من لە هۆش خۆم ببەن، سۆز بێت گەر نقەشم لێوە هات حەقی ئێوە بێ". دکتۆرەکان بە ناچاری بێ ئەوەی بەنج لە مەلا بدەن دەست بە نەشتەرگەرییەکە دەکەن، دوای تەواوبوونیشی ئینجا بە دەرزی لێف دوورینەوە برینەکەی دادەخەن، بەڵام مەلا نەك نقە، بەڵکو یەك ئاخ و ئۆفیش ناکا. خۆلێخۆشبوو سەید عەبدولقادر[1] لە کاتی نەشتەرگەریەکە لەسەر سەری دەوەستێ، بۆیە، ڕووداوەکە وەك خۆی بۆ سوڵتان عەبدلحەمید دەگێڕێتەوە، سوڵتانیش دەڵێ کە مامۆستا چاکبۆوە حەزدەکەم بیبینم. مەلا حەسێ چاك دەبێتەوە، سەید عەبدولقادریش دەیباتە کۆشکی یلدز. سوڵتان عەبدولحەمید ئەوکات لە کۆشکی یلدز دوو کەسی جێگای متمانەی پڕۆتۆکۆلی هەبوو، یەکێکیان عوسمانی کوڕە قۆزەکەی

[1] سەید عەبدولقادر (١٨٥١ — ١٩٢٥) سیاسەتمەداری کورد، کوڕی شێخ عوبێدوڵای نەهریە. کەسێکی دیاری باکووری کوردستانە. لە شۆرشی شێخ سەعیدی پیران بەشداریی کردووە و لە سێدارە دراوە. (وەرگێڕ).

بەدرخان پاشای کوردە، ئەوەی دیکەش خورشید پاشای لازە[1].
کاتێك خورشید پاشا دەبینێ، عوسمان پاشا زۆر ڕێز و حورمەتی مەلا دەگرێ، ئەویش بە گاڵتەیەکی ساردی لازانە، بە مەلا دەڵێ: "مامۆستا دەڵێن جارێك بە کەریان گوتوە تۆ کوردی، بەڵام کەر لە ڕقان یەك هەفتە جۆی نەخواردووە"، مەلا حەسێ لە وەڵامدا زۆر بە جددی، دەڵێ: "کورم کەرەکە لەسەر حەق بووە، چونکە بوختانیان بۆ هەڵبەستووە، لەبەر ئەوەی ئەو لاز بووە و یاری بە هەستی نەتەوەیی کراوە". بەپێی گێڕانەوەی شێخ شەفیقە ئەفەندی ئەو گاڵتەیە بەر گوێی سوڵتان عەبدولحەمید کەوتۆتەوە، بۆیە سوڵتانیش، تا خۆشەویستیی خۆی بۆ مەلا حەسێ دەربڕێ، چەندین دیاریی پێشکەشکردووە.

دەڵێن چ پەیوەندییەك لە نێوان تۆ و مەلا حەسێ هەیە؟ مەلا حەسێ وەك خۆت دەڵێی موسوڵمانە، تۆش ئایینی زەردەشتی لە سەرووی ئایینەکانی بەنی ئیسرائیل و عەرەبان دەبینی... منیش دەڵێم ئەوانە ڕاستن، بەڵام خاڵێکی دیکە هەیە کە من و مەلا حەسێ بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەویش کوردبوونمانە. جگە لەوە، مەلا حەسێ هاووڵاتییەکی بە شەرەف و بیرفراوان و مووسڵمانێکی ئیمان دروستی چیاکانی کوردستانە، کە پەیوەستە بە خاك و نیشتمانەکەی. وەك خۆی دەیگوت، گەر ڕۆژی حەشر نەبێ هەمووومان وەك یەکین، گەر هەشبێ، با شوێنی ئەو لە شوێنی من خۆشتر و جوانتر و بە ئیسراحەتتر بێ.

---

[1] لاز نەتەوەیەکن لە تورکیا بە درێژایی کەنارە ئاویەکانی دەریای ڕەش لە باکووری ئەو وڵاتە دەژین، زمانێکی تایبەت بەخۆیان هەیە. ئەو نەتەوەیە بەهۆی نزیکی داب و نەریتیان لە کوردەوە پێیان دەڵێن (کوردی دەریا دیتوو). (وەرگێڕ).

## جیهانی ئاشتی

دوای مەشەقەتێکی زۆر و تێپەڕاندنی کودەتایەکی تازە لە تورکیا، دووبارە گەڕاینەوە سەر جێبەجێکردنی داوا ڕەواکەمان. ئەحمەد حەمدی بەشاری لیبڕاڵ، بە پشت بەستن بە دۆستایەتی لەگەڵ ئەتاتورك، گۆڤارێکی بەناوی (بارش دوونیاسی) بڵاوکردەوە. بە کاك ئەحمەد حەمدییان دەگوت: "حەمدی بەندەر"، چونکە لە سەردەمی دامەزراندنی کۆمار یەکەم بەندەری ئیستانبووڵ ئەو دروستی کردبوو. کەسێك بوو لەسەر ئاستی تورکیا ناسراو بوو، کەسێکی شارەزا بوو لە ئابووری، لە هەمان کات هاوسەری شاعیر و نووسەر سوعاد دەروێش بوو.

ڕۆژێك، لە بارەگای گۆڤاری (بارش دوونیاسی - جیهانی ئاشتی) لە کادیکۆی، سەردانی کاك ئەحمەد حەمدیم کرد. خۆم پێناساند و گوتم: "گۆڤارەکەتان بەرووی هەمووی بۆچوونێکی جیاواز کراوەیە، بۆیە گەر قبووڵ بکەن وەك نووسەرێکی میوان، دەمەوێ چەند وتارێك لە گۆڤارەکەتان بڵاو بکەمەوە". باسی ئەوەم بۆ کرد چوار ساڵ لە زیندان چیم چێشت، لە هەمان کات باسی دۆخی نابووتی کوردستانم بۆ کرد، سەرەڕای نەبوونی مافە ڕەواکانی. بە قسەکانم زۆر هەستی جولا و گوتی: "کوڕم گەر ئەوانەی بۆ منت باسکرد بینووسییەوە، منیش بەبێ هیچ سانسۆرێك وەك خۆی بڵاوی دەکەمەوە، چونکە لەسەر حەقی".

یەکەم وتارم لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٦٢ لە دووەمین ژمارەی گۆڤارەکە لە ژێر ناونیشانی "هەڵستانەوەی ڕۆژهەڵات و داواکەی، واتا هەڵسانەوەی تورکیا" بڵاو کردەوە. وتارەکە بەو شێوەیە بوو:

"کێشـەی ڕۆژهەڵات بە ڕژێمـی تونـدئاژۆ و جێبەجێکردنـی قەدەغەکاری چارەسـەر ناکرێـت. لەبـڕی ئەوە، بە پابەنـدبوون بە ماناکـــانی دەوڵەتمەداریـــی ســـەردەمییانە و پەیڕەوکردنـــی ڕێچکەگەلێکی دیـکە، دەتـوانین ئەم بەشـەی نیشتمانمان بکەیـنە بەهەشتی وڵات، بگرە بەهەشتێك بۆ هەموو جیهانیش. هەڵگرتنی ئاغاگەرایی چ بەهایەکی هەیە؟ ئاغەگەرایی و خـودی ئاغاکـان، لەچوارچێـــوەی ئەو هەلـــومەرجە ســـەرەتاییەی ئەمـــڕۆ هەنە، کۆمەڵێک ئەرکیان لەسەرە. هەڵگرتنی ئاغـاگەرایی، بەبـێ هێنـانە کایەی ئۆرگـانگەلێکی نـوێ، کە ئەرکـی ئەوان ببینێـت و بەبـێ هەســـتاندنەوەی دانیشـــتووانی نـــاوچەکە لەڕووی مـــاددی و مەعنەویـیەوە، بە لەچـاوگرتنی فیتـرەت و باوەڕەکـانی خۆیـان، لەبری سوود، زیان بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

لەم نووسـینەدا، ڕێچـکەی کتـومتی چارەسـەری کێشـەکە دەخرێتەڕوو.

نووسینەکە وتارێکی درێژ بوو، کاتی خۆی هەمـان وتـارم لە پەرتووکی (کمـل)یش بـڵاو کـردەوە. لە داهـاتوودا دەمەوێ، بە درێژایی ژیانم لە چ کات و شوێنێك لە چ ڕۆژنامە و گۆڤارێـك چـیم بـڵاو کـردبێتەوە، کۆیـان بـکەمەوە و لە دوو تـوێی پەرتووکێکـدا چـاپی بـکەم. گەر تەمەن ڕێگـام بـدا بیـر لەوە دەکەمەوە ئەو نووسینەشی لەناو دانێم.

ئەوسا هەندێك دۆستمان، لە گۆڤاری (یۆن)ی دۆغان ئـاڤجی ئۆغلـوو، وتاریـان دەنووسـی. ڕاپۆرتەکـانی ئەوسـای میتـیش ئاماژەیـان بەوە دەکـرد: "کـورد بەزانـین بەسـەر ڕاسـت و چەپ دابەش بـوونە و دەسـتیان بەسـەر دوو گۆڤـاری هەرە گرنگـی ئیسـتانبووڵ داگرتـووە. مووسـا عەنـتەری پارێزگـار لە گۆڤـاری جیهانی ئاشتی و سـەعید قرمـزی تۆپراکی چەپـیش لە گۆڤـاری

یۆن. چونکە مووسا عەنتەر و سەعید قرمزی تۆپراك لە ڕووی بیر و بۆچوونەوە ناشێ دژی یەك بن، بۆیە ئەوە تاکتیکێکە بەکاری دەهێنن".

دوای ئەو نووسینەم لە گۆڤاری جیهانی ئاشتی، لە ڕێگای نووسینی وتارەوە باسی چەند بابەتێکی وەکو ئەدەبیاتی کوردی و دینداری لای کورد و ڕێژمانی کوردیم کرد، لەگەڵ باسکردنی ئەو سیاسەتە هەڵەیەی چەندان ساڵە ئەنقەرە بەرامبەر کورد جێبەجێی دەکات.

لەو سەر و بەندە لە ساڵی ١٩٦٢ ئەمریکییەکان دەربارەی پرسی کورد لە تورکیا سێ داواکارییان پێشکەش بە ئەنقەرە کرد:

١- "کردنەوەی ڕادیۆیەکی کوردی لە کوردستان لە ژێر چاودێریی تورکیا و ئەمریکا". تێچووی ئەو ڕادیۆیە ئەمریکا دەیگرێتە ئەستۆ، بە گوێرەی ئەو زانیارییانەش بێ کە میدیا بیانییەکان بڵاویان کردەوە، ڕادیۆکە تێچووی ٣٣ ملیۆن دۆلار بووە. تورکیا داواکەی ڕەتکردەوە، بەڵام شای ئێران قبووڵی کرد. بۆیە وێستگەی سەرەکیی ڕادیۆکە لە ناوچەی کرماشان دامەزرێندرا.

٢- سوپای تورکیا، وەك ئەوەی ئێستا، ئەوکاتیش زۆر بوودەڵە بوو، بۆیە، بەپێی ئەو ڕاپۆرتە سەربازییانە بێ کە فەرماندەکانی سوپای ئەمریکا دابوویانە پنتاگۆن، ئاماژە بەوە کرابوو: "ئەو کوردانەی لە ڕیزی سوپای تورکیان زۆر ئازا و سەرکەوتوون، بەڵام لەبەر ئەوەی شارەزاییان کەمە و خوێندەوارییان نییە، بۆیە وەك پێویست سوودبەخش نین". بە پشت بەستن بەو ڕاپۆرتە حکوومەتی ئەمریکا داواکارییەکی بەم شێوەیەی پێشکەشی تورکیا کرد: "ئێمە ئەو سەربازە کوردانە

بەپێی تایبەتمەندیی پرۆگرامی سەربازی سوپای تورکیا، بەڵام بە زمانی کوردی پەروەردەی سەربازییان دەکەین". ئەنقەرە ئەوەشی ڕەتکردەوە.

٣- دوای ڕەتکردنەوەی ئەو دوو داواکارییەی سەرەوە، ئەمریکییەکان گوتیان: "مادەم وایە با فەرهەنگی کوردی - تورکی و تورکی - کوردی لەسەر ئەستۆی ئێمە چاپ بکەین" بەڵام تورکیا ئەو داواکارییەشیان ڕەت کردەوە.

زۆری پێنەچوو، داواکاریی کۆتایی ئەمریکییەکان دزەی کردە ناو میدیای تورکی، گۆڤاری یۆن لەسەر بنەمای دوژمنداریی ئەمریکا، کاردانەوەیەکی توندی پیشاندا. بە پێشەوایەتیی سەعید قرمزی تۆپراك و لە ژێر چاودێریی حکوومەتی تورکیا، گەلێ گەنجی کورد چوونە بەردەم بارەگای گۆڤاری یۆن و خۆپیشاندانیان دژی حکوومەتی ئەمریکا کرد و ناڕەزایەتییان دەربڕی. کەچی من ئەو کارەم بۆ ئەوسا، پێ سادە و شۆڵێکی سەرنەکەوتووی چەپەکانی تورکیا بوو. لە گۆڤاری جیهانی ئاشتیش ئاماژەم بەوە کرد، ئەو گەنجە کوردانە هەڵخەڵەتێندراون. دوای ئەو ڕستەیەم، لە ژمارەی مانگی هەشتی گۆڤاری یۆن، سەعید قرمزی تۆپراك من و سەرجەم کارمەندانی جیهانی ئاشتیی وەکو بەکرێگیراوی بورژوازیەت لە قەڵەم دا و زۆر قسەی ناخۆشی پێگوتین.

دوای ئەو ڕووداوە، کاك حەمدیی هێمن و دونیا دیتەش زۆر تووڕە بوو، پارێزەرێکی بانگهێشت کرد و داوای کرد لە دادگا داوایان لەسەر تۆمار بکات، بەڵام من پێم گوت: "مامۆستا بۆچوونی فەلسەفیتان هەرچییە کێشە نییە، بەڵام دڵنیابن هەموو هەژار و نەداری کورد حورمەتی ئێوە دەگرن، تۆ ئەو کارە بۆ کوڕی خۆت جێبێڵە و دڵنیابە سەرجەم نووسەرانی گۆڤاری یۆن

شەرمەزار دەکەم". لە ژمارەی تەباخی ١٩٦٢ بە نووسینێکی توند، وەڵامێکی پڕ بە پێستی نووسینەکەی سەعید قرمزی تۆپراکم داوە، بەڵام ئەمڕۆ زۆر خەفەتبارم بۆ ئەوەی کە دکتۆر تۆپراك لە تەمەنێکی گەنج و لە کاتێکی نەگونجاودا بە هەڵەیەکی گەورە لە ڕیزی ئێمە جوودا بۆوە، کەچی دووبارە بە دڵتەنگییەوە یادی دەکەمەوە. بەهۆی کارکردنم لە گۆڤاری جیهانی ئاشتی دووبارە تووشی دادگا بوومەوە بوومە هۆی ئەوەی خوالێخۆشبوو ئەحمەد حەمدیی دۆستی نزیکی ئەتاتورکیش بە کوردپەرستی تۆمەتباربکرێت. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو دواتر تووشی شتی لەوە سەیرتریش بووین؛ چونکە ساڵی ١٩٨٧ لەسەر دۆسیەی گۆڤاری (بەرەو دوو هەزار) ئەتاتورکیشم کردە کورد پەروەرا بۆیە، بەشێوەیەکی زۆر نەویستراو، لەگەڵ ڕۆحی ئەو لەهەمان قەفەزی تۆمەتباری دادگایی کراین.

## چەنەقەلە - ڕاگواستن

لە ڕووداوەکەی گۆڤاری جیهانی ئاشتی، بەسەرهاتێکی لەبیر نەکراوم هەیە. لە دۆسیەی ٤٩ کان ساڵ و نیوێك لە زیندان ماینەوە، دواتر شەش مانگ بۆ چەنەقەلە ڕاگواسترام و ژیانم لە ژێر چاودێریی دەزگا ئەمنییەکان بەسەر برد. بەڵام گەر سەرنج بدەن هەستدەکەن ئەو چاودێری کردنە، فاشیستیترین جۆری ڕاگواستنە. ئەو کزڵ سوڵتان و خان ئیبنولخان و سوڵتان حەمیدەی کەمالیستەکان کەیفیان پێنەدەهاتن، کاتێك یەکێکیان رادەگواست بۆ شوێنێك، تەواوی تێچووی ژیانی کەسی ڕاگوێزراویان دابین دەکرد، هەندێکجار بە چەندان خزمەتگوزاریی سەردەمیانەش لە ئیستانبووڵ دوور دەخراوە، بەڵام وەرە ببینە سەکاریا و چەنەقەلە و دومڵوو پنار چۆن دروست کران! وەرن بزانن کاتێك کۆماری تورکیا یەکێك

ڕادەگوازێت پۆلیسە جاهیلەکانی چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، سەربازیش، ئەو کەسە گەر لە برسانیش بمرێت یەك قرووشی نادەنێ.

لەبەر ئەوەی پارەم هەبوو، بۆیە لە ڕقی ئەوان، لە هۆتێل تروڤای، خۆشترین میوانخانەی چەنەقەلە، لە ژووری ژمارە ٢٢ دەمامەوە. ئەوێ شوێنێکی زۆر خۆش و ئارام بوو، لەگەڵ ئەوەی خووی من نەبوو، بەڵام لە ڕقان دەستم بە ژیانێکی بورژوازیانە کرد. تەنیا بۆ ئەوەی لە داخی من بتەقن، هەموو ئێوارەیەك لە باڕی هۆتێلەکە لەگەڵ کوڕی خالتکی پارێزگارە وانییەکەی چەنەقەلە و بەڕێوەبەری پۆلیس و فەرماندە سەربازییەکان و کاربەدەستانی میتی ئەو شارە دەمخواردەوە و ڕێك لە ئاستی عەقڵی ئەوانیش نمایشی دەوڵەمەندییەکەی خۆمم دەکرد. ئەوانیش خەریك بوو لە داخان بتەقن، تا ئەو ڕۆژەی پۆلیس پێی ڕاگەیاندم لە فلانە بەروار لە دادگای میدیایی ئیستانبووڵ، لەسەر دۆسیەیەکی میدیاییم دانیشتنی دادگام هەیە و دەتوانم بڕۆم، چونکە ئەوسا بەبێ مۆڵەتی پۆلیس نەمدەتوانی لە سنووری شارەوانی چەنەقەلە دەربچم.

بۆ ئامادەبوونی دانیشتنەکەی دادگام هاتمە ئیستانبووڵ، کاك ئەحمەد حەمدیش هاتبوو، سڵاومان لەیەك کرد و گوتی: "کوڕم سەرفراز بە، نامیق کەمالی تورکیش ڕاگواستراوە بۆ ناوچەی ماگۆسای سەر بە قەزای بۆلایری چەنەقەلە، لەبەر ئەوەی تۆ تورك و کورد بە برای یەك دەزانی بۆیە پێتدەڵێم، دڵتەنگ مەبە و باوەڕ بکە تۆش نامیق کەمالی[1] کوردانی".

دانیشتنی دادگا دەستی پێ کرد، لەبەر ئەوەی ئەوەندە زۆر

---

[1] نامیق کەمال (١٨٤٠ – ١٨٨٨) نووسەر و شاعیر و ڕۆژنامەڤانێکی تورکە و بە شاعیری نیشتیمان دەناسرێت. (وەرگێڕ).

چووبوومە ئەو دادگایە، بۆیە لەگەڵ سەرۆکەکەی ببوومە نیمچە ڕەفیقێك، ناسنامەکەمی بە کاتیبەکە نووسی و پێی گوتم: "چ کارێك دەکەی؟". "کوردایەتی"، بەو وەڵامەم داواکارە گشتییەکە سەر و میزاجی تێکچوو. سەرۆکی دادگا بە خەندەوە پرسی: "ئەوە چ کارێکە؟"، وەڵامم داوە: "لەسەر کوردایەتی تاوانبار کرام، دادگای تێهەڵچوونەوەش بڕیارەکەی پەسەند کرد، ئێستاش لەبەر کوردایەتی لە چەنەقەلە لە ژێر چاودێری دامە، وا لای ئێوەش لەسەر کوردایەتی دادگایی دەکرێم، بۆیە لە دۆخێکی ئاوا گەر پیشەکەم کوردایەتی نەبێ دەبێ چی بێ؟" دادوەر پێکەنی و بە کاتیبەکەی گوت: "کچم بنووسە پیشەی ئازاد"، بەسەرێك قسەکەی دادوەر مانای ئەوە بوو، کوردایەتی پیشەیەکی ئازادە.

دەمەوێ یەك دوو بیرەوەری دیکەش لە چەنەقەلە بنووسمەوە.

ئەوسا، خەڵکی چەنەقەلە زۆر جاهیل و بێ ڕۆشنبیری بوون، لە کاتێکدا لە ڕووی جوگرافییەوە کەپووی بە کەپووی ئەورووپاوە نووسابوو، بەڵام، پتر بە شارێکی ئەفغانستان دەچوو. لە پەرتووکخانەی ئەو شارە ١٠ پەرتووکی باشی لێنەبوو بە کەڵکی خوێندنەوە بێت. لە تەواوی شارەکە نەك یەکێکی لێنەبوو وتارێك بخوێنێتەوە، بەڵکو کەسێك خوێندەواری بای نامە خوێندنەوەیەکیش نەبوو. کەچی لە شارەکە ڕێکخراوی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیزم هەبوو و نەمدەتوانی بە تەنیا بچمە دەرەوە، بەڵام دەبوو هەموو ڕۆژێکیش سەعات دەی بەیانی لە بنکەی پۆلیس واژووی ئامادەبوونم بکەم. ڕۆژانە لە ڕێگا تا بنکەکە ڕووبەڕووی چەندان قسەی ناشرین و جنێو دەبوومەوە.

لە کەنار دەریای چەنەقەلە، مەیخانەیەك هەبوو بە ناوی (ئاگۆرا)، هەندێجار لە کات دەستبەتاڵی بە تەنیا دەچوومە ئەوێ.

شەوێك، سەعید ناوێکی خەڵکی ئورفا، کە دواتر زانیم داواکاری گشتییە، هاتە سەر مێزەکەم. منیش دۆخەکەم بۆ باسکرد و ئەویش ئەو پێشنیازەی بۆ کردم: "کاکۆ گەر پارەی شەراب خواردنەوەت هەبێ من دوو گەنجت بۆ دەنێرم کە پارێزگار و بەڕێوەبەری پۆلیسیش لێیان دەترسێن". بەیانی هێشتا لە هۆتێل نەهاتبوومە خوارەوە، دوو گەنجی وەك شێری ئەسمەری قەرەج، پرسیاری منیان کرد، ئەوسا، بەشی هەرە زۆری دانیشتووانی چەنەقەلە قەرەج بوون و بگرە سەرۆکی شارەوانیش هەر لە خۆیان بوو. دەمزانی، تەواوی شارەکە و دەور و بەری زۆربەیان قەرەجن. لەگەڵ گەنجەکان یەکدیمان ناسی، بەر لەوەی لە هۆتێل دەرچین ئاماژەیان بە من کرد و ڕوویان لە خەڵکەکە کرد و گوتیان ئەوەی نزیکی ئەو کابرایە بکەوێتەوە چی خراپە پێی دەکەین، ئینجا هەزار جوێنیان بەو خەڵکەی ئەوێدا. لە هۆتێل دەرچووین و لەگەڵ ئەو دوو گەنجە چووینە بنکەی پۆلیس. لە ڕێگا، ئەو نەژادپەرستانەی ڕۆژانی پێشوو جنێو و قسەی ناشرینیان پێدەگوتم، کەسیان لەسەر ڕێگا نەمابوون. کە گەیشتینە بنکەی پۆلیس، ئەوان لەبەر دەرگا وەستان، من بۆ واژوو کردن چوومە لای ئەفسەری بەڕێوەبەر، ئەویش لێی پرسیم: "ئەوانە کێنە لەگەڵت؟"، منیش: "دۆستی مەیخانە و شەرابخواردنەوەمن، چونکە ئێوە من ناپارێزن، بۆیە بەناچاری ئەرکی پاراستنی خۆم کەوتۆتە سەرخۆم"، بەو شێوەیە تا تەواوبوونی ماوەی ڕاگواستنەکەم بەبێ کێشە لەو شارە دەسووڕامەوە.

وەك گوتم لە بێ ڕۆشنبیریی ئەو شارە خەریك بوو بخنکێم. بۆ دۆزینەوەی یەك دوو کەس، تا بتوانم هەندێك قسەیان لەگەڵ بکەم، سەردانی ناوەندی فتوای ئەوێم کرد. کەچی بینیم موفتی

چ موفتی، نازانی قورئان بە ڕێك و ڕەوانی بخوێنێتەوە و نەیدەزانی بە عەرەبی چ بە نان و ئاو دەڵێن. بە کورتی، کەسێکی دەمارگیر و نەخوێندەوار بوو، لەوێش کەسم نەبینیەوە و دەرچووم. بە دوای شوێنێکی جیاوازدا دەگەڕام، گوتیان لێرە پیاوێکی ئایینی یەهوودییەکان، واتە "مالم"ێکی لێیە. هەستام و چوومە پەرستگاکەیان. شوێنەکە تا بڵێی گەورە و خۆش بوو، باخچەیەکی ناوازەی لێبوو، هەرچوار دەوری باڵەخانەکەش بە دیواری سێ چوار مەتری گیرا بوو. زەنگی دەرگا کەسکەکەی باڵەخانەکەم لێدا، دەرگەوانێکی زۆر ڕێك و پێکی لە پارێزگار پۆشتەتر دەرگای لێ کردمەوە، بە ئادابێکی جوانەوە لێی پرسیم: "فەرموون چیتان دەوێ؟"، وەڵامم داوە: "دەمەوێ جەنابی مالم ببینم"، ئەویش داواکارییەکەی بە تەلەفۆن گەیاندمە ژوورەوە، هێندەی نەبرد فەرمووی ژوورەوەیان لێ کردم. باڵەخانەکە لە شێوازی پلیکانە و دەرگا و پەنجەرەکانی ئاستێکی بەرزی کەلتوور و زەرافەتی لێ دەتکا. کەسێکی دونیا دیتەی گەنجی ڕەنگ ئەسمەری بە ڕدێن پێشوازیی لێ کردم، بە ئاخاوتنێکی جوانی تورکی فەرمووی لێ کردم. ئەو گەنجە وەك من ناوی (مۆشە) بوو، ئەو لە ئامادەیی ئیستانبووڵ خوێندبووی و دکتۆراشی لە کۆلێژی ئایینزانیی شیکاگۆ بەدەست هێنابوو. بۆیە، دەڵێم هەمان ناومان هەبوو، چونکە، یەهوودی بە مووسا دەڵێن مۆشە. چووینە ژوورە ناوازەکەی، ئەوپەیکەرە بچووکەی ئەتاتورکی لەسەر مێزی موفتی چەنەقەلە بینیم، لەسەر مێزی مالم نەبوو، بەڵام لەسەر دیوارەکە ئەو دە فەرمانەی خوا هەڵواسرابوو کە بە حەزرەتی مووسای بەخشی بوو، ئەوانیش لەناو تابلۆیەك بە پیتی زێڕ دوای نووسینەوەی دەیان پاراست. ئەو فەرمانانە دواتر لە ئینجیل و قورئانیش باس کراوە. کە بریتین لەو چەند دانەیە:

(مەکوژە، مەدزە، درۆ مەکە، ناپاکی لە ئەمانەت مەکە، ڕێزی دایك و باوکت بگرە، سەرخۆش مەبە، خواردنی پیس مەخۆ، تاد...)، بەڵام ئەو ڕێسایانە بەر لە مووسا لە ئایینەکانی میسر و ئەلەن و زەردەشت و ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی دووریش هاتووە.

بە مالمم گوت: "برادەر من بە چەپ دەناسرێم و کوردایەتیشم لەسەر ماڵە، ئێستاش ڕاگوێزراومەتە چەنەقەلە، بێزار بوومە و بەدوای کەسێکی ڕۆشنبیردا دەگەڕێم، بەڵام گەر بەو دۆخەمەوە دەبمە مایەی سەر ئێشە بۆتۆ، با ئەوە دوایین دیدارمان بێت، بەڵام گەر بۆتۆ کێشە نییە، دەمەوێ ناوە ناوە بێمە لاتان و بۆچوونمان لەسەر پرسی کەلتووری بگۆڕینەوە". مالم پێکەنی و لەشوێنی خۆی هەستاوە و بە گوشینی دەستم ئەولا و ئەولای ماچ کردم و: "بە چ بۆنەیەکەوە برا گیان، ئێمە لە شوێنێکی خراپ نین، ئەوڕۆ تورکیا نیشتمانمانە، جگە لەوە ئەمریکاشم لەپشتە. بۆیە، هیچ دودڵ نیم، گەر دەتەوێ وەرە و لای من بمێنەوە و لەگەڵ تۆش بەردەوام بە تاکسی بەناو چەنەقەلەدا دەگەڕێین". دواتر یەکە و پێک شەڕابی کۆنمان خواردەوە. فەرمانی بە شۆفێرەکەی کرد ئۆتۆمبێلەکە ئامادە بکات، ڕووی لە منیش کرد "با قسەکانمان لەناو ئۆتۆمبێل تەواو بکەین، ئاشکرایە زۆر بێزار بووی، بۆیە با تۆزێك بگەڕێین".

بەروارەکەیم بیر نایەتەوە، بەڵام یەهوودییەکان جەژنێکیان هەیە بەناوی (نانی بێ خومرە، واتە بێ هەویرترش)، دوازدە ڕۆژ بەرۆژوو دەبن و لەو ماوەیە تەنیا نانێکی بێ خوێی لە شێوەی چیپس دەخۆن. هۆکارەکەیم لە مالم پرسی، ئەویش بەو جۆرە وەڵامی دامەوە: "کاتێك حەزرەتی مووسا بەنی ئیسرائیل لەژێر زوڵمی فیرعەون ڕزگار دەکات، لەماوەی ١٢ ڕۆژ لە سیناوە دەگەنە فەڵەستین. بۆ خواردن تەنیا هەندێك ئاردیان پێ بووە و

کردوویانەتە هەویر و ئەنگوتکی بچووك بچووکیان لێ دروست کردووە و لەبەر هەتاوی بەتینی گەرمی سینا، هەویرەکەیان لەسەر تاشە بەردەکانی ناوچەکە برژاندووە و شتێکی لێ دەرچووە وەك ئەو نانەی ئەورۆ دەیخۆین. بۆ ڕێزگرتن لەو ڕۆژانە، لەهەمان بەرواری ئەو کۆچکردنە، ئێمەش تەنیا نان دەخۆین". مالم منی بردە باخچەکەیان، لەناو باخچەی ئەو باڵەخانە مۆدێرنە چادرێکی ڕەشیان هەڵدابوو؛ لەوێ یەهوودییە دیندارەکانی چەنەقەلە بە جلوبەرگی میللی خۆیان دانیشتبوون و هەر لەوێش دەمانەوە، ئەوەشیان وەکو حورمەتێك بۆ ژیانی ئەوسا دەکرد کە لەو ١٢ ڕۆژەدا زەحمەتی زۆریان چەشتووە. لە ڕۆژی دوازدەهەم وەکو جەژنی ڕەمەزانی ئێمە، لە کڵێسای (هاڤرا) ڕێورەسمی ئایینی جێبەجێ دەکەن.

لە ئایینی موسەوی وەك ئایینی زەردەشتی و ئایینی عیسا و محەمەد قیبلەیەك نییە تا ڕووی خۆیانی تێبکەن ئینجا خواپەرستی بکەن، بەڵکو لەناوەڕاستی سینەگۆکی شوێنی عیبادەتکردنیان مێزێکی خڕی لە شێوەی ڕۆژیی دوایی دادەنێن و مالم و یاوەرەکانی دەچنە سەری، جەماعەتیش وەک لاکێشەیەک لە هەر چوار لای دادەنیشن. منیش داوەتی ئەو بۆنەیە کرام و لە پاڵ جەماعەت منیش چوومە ڕیزەوە، وەك ئەوان دەستم خستە سەر سینگم، مالم دەستی بە نزاکردن کرد و لە کۆتایی هەموو ڕستەیەکیش ناوی (ئیسرائیل)ی دەهێنا، دوای ئەو، تەواوی جەماعەت دەیانگوت ئامین، تەبعەن منیش وامدەگوت. دواتر زانیم ئەوە نزایەکی چاکەیە بۆ قەومی ئیسرائیل، بۆیە مالم چاوی لەسەر من هەڵنەدەگرت، بەڵام سەرنجمدا دوای گوتنی ناوی (ئیسرائیل) چەند چرکەیەك دەوەستان. دواتر لەتەك مالم لەناو چەند تاسێك هەندێك شەراب و چەند پارچە نانێکی ڕەقی بێ

خومرەیان بۆ ناردینە خوارەوە، لەبەر ئەوەی یەکەمجارم بوو، سەرەتا پێشکەشی منیان کرد، بۆیە، بیرمکردەوە دەبێ پارچەیەك لە نانەکە بخۆم و دواتر قومێك شەڕابی بەدوادا بخۆمەوە. هەر ئاوام کرد، دوای من بینیم هەموو جووەکانیش ئاوایان کرد و ئیدی جەماعەت پەرتەیان کرد.

مالم وەك دۆستێك دەستەکانی گرتم و منی بردە ژوورەکەی خۆی، لە ڕێگا ئەو چەند شتەی پێ گوتم: "مووسا، برا گیان، سەرجەم جووەکانی ڕێورەسمەکە وایان زانی تۆ چل ساڵە جوویت، ئافەریم بۆ تۆ". کە لە قسەکانی بۆوە گوتم منیش دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم: "ئێوە بۆ خۆشی و ئاشتیی ئیسرائیل نزاتان دەکرد، سەرنجمدا ئێوە هەندێك دەوەستان، منیش ئەوکاتە دەمگوت (کوردستان)، یانی داوام لە خوا دەکرد، نزاکانمان هەم بۆ ئیسرائیل هەمیش بۆ کوردستان بێت".

ماوەی سزاکەم، لەگەڵ چەندان یادەوەری دیکەی تاڵ و شیرین تەواو کرد و گەڕامەوە ئیستانبووڵ. بەڵام وەك ئەو بۆچوونەی هۆبز هەیبوو لەسەر سیاسەت: "بۆچوونی سیاسی وەك خورییە، چەندی بیکوتییەوە توندتر و بە بەهاتر دەبێ". بۆیە، منیش چەندی زیاتر ناحەقییان بەرامبەرم دەکرد و زوڵمیان لێکردبام و پتریان ئەشکەنجەدابام، زیاتر لەسەر بۆچوونەکانم سوور دەبووم.

## برینا ڕەش

دەمەوێ دیسان بگەڕێمەوە حوجرەی کولە مەرگیی ژمارە سیی و هەشتم. گەرچی چەند کەسێکی وەك ئۆرفی ئاق قۆینلوو و ئەسعەد جەمیل ئۆغلوو و موحسین شاقاتا بە تەمەن گەورە بوون بەشێکی زۆری هەڤالانی ئەوێم وەك ڕۆڵەی من بوون. چەند کەسێکی وەك زیا شەڕەفخان ئۆغلوو و عەلی کەرەهانیش خۆیان لە ئێمە جیا دەکردەوە. ئەمڕۆ، لەناو ئەو برادەرانە، نزیکەی بیست کەسیان لە ژیان ماون و شاهێدی ئەو نووسینانەن. هەم لە زیندان هەمیش لە دەرەوە بە شەوکەتێکی باوکانە ئاگام لەو گەنجە بە شەڕەفانەی گەلەکەم بوو.

لە دوادوایی ژیانی ناو حوجرەمان، ئەها وەك لەسەرەوە ئاماژەم پێ کرد، بەرامبەر بە پێنج لیرە ئاگاداری هەواڵی یەکدی دەبووین. سەیرمکرد، ئەو ڕۆڵە خۆشەویستانەم چەندان مانگە لە دۆخێکی زۆر ناخۆشدان، بۆیە، منیش بە شێوازی نووسینی خۆم چیرۆکێکی خەندە ئامێزم نووسی و بۆم ناردن. زۆریان پێخۆشبوو و گوتیان: "کاکە تخوا شانۆنامەیەکمان بۆ بنووسە". برادەرانم شاهێدن کە ڕۆژی دواتر (برینا ڕەش)م نووسی، ئینجا ئەوەشم بۆ ناردن، بەڵام زۆربەیان باوەڕیان نەکرد، چونکە پێیان وابوو پێشتر نووسیوومە. من شانۆنامەکەم لەوێ نووسی، چونکە بەو هێزەی ئەوان پێیان بەخشیم، لە ماوەی یەك ڕۆژدا تەواوم کرد. دیسان دەیڵێمەوە و بۆ ئەمەش برادەرانم دەزانن، لەو بار و دۆخەی ناو حوجرە بێ هەڵەچنی کە ئازاد کراین شانۆنامەکەم چاپکرد.

لە ماوەیەکی زۆر کورت باسی ئەو دۆخە نالەبارەی

کوردستانم تێدا کرد، کە سەرجەم بەسەرهات و ڕووداوەکان چیرۆکی ڕاستەقینەی گەلەکەم بوون. دواتر، لەلایەن زۆر کوردی بە ئەمەکەوە دەستخۆشیم بۆ هات، دوای ئەوەی شانۆنامەکە وەرگێردرایە سەر زمانی چێکۆسلۆڤاکی و بەلجیکی و هۆڵەندی و دانیمارکی و سویدی و چەندان زمانی دیکە،، ئینجا نمایش کرا و کاردانەوەیەکی باشی لێکەوتەوە، بەڵام ئەوە لە تورکیا قەدەغە بوو.

ڕۆژێك، شەهاب باڵجی ئۆغلوو، بە تەلەفۆن بانگهێشتی لای خۆی کردم، منیش چوومە لای. دیار بوو وێنەکێشێکی سویدی بە سوود وەرگرتن لە وێنەی ناو دەقە شانۆییەکەم چەندان تابلۆی کێشابوو، دوای دروستکردنیان زۆر پارەی قازانج کردبوو، بۆیە بە پارەی ئەوکات سێ هەزار و پێنجسەت لیرەی بۆ منیش ناردبوو، ئەوە یەکمجارم بوو بە هۆی نووسینەکانمەوە پارە قازانج بکەم، بۆیە، لەگەڵ ئەوەی نەمویست پارەکە وەرگرم، بەڵام لەبەر پێداگریی شەهاب پارەکەم هێنا.

ساڵی ١٩٥٠، پارتیزانێکی ساختەی پارتی دیموکرات، کە تا ئەوسا بوونی کوردی پێ هەزم نەدەکرا، دژی شانۆنامەی (برینا ڕەش) بە دروشمی (کورد نابنە پیاو، کورد نابنە ڕووناکبیر) شانۆنامەیەکی سووك و بێ نرخ و دوژمندارانەی دژی گەلی کورد نووسی. بۆ تێگەیشتن لەو بۆچوونەم پێویستە شانۆنامەکە بخوێندرێتەوە. جا لە شانۆگەرییەکە بۆچوونی (کوردەکانی پارتی دیموکرات)ی ئەوسای تێدا باس کرابوو.

لە تەواوی ناوچە کوردییەکانی تورکیا، ساڵانە گەنم لە مانگی ١٠ تۆ دەکرێت، بەڵام لە مانگی نیسان حکوومەت بە هەزارن تۆن گەنمی ژەهراوی کراوی لە ڕێگای ئاغا و شێخە لایەنگرەکانی لە ناوچەکە، بەناوی گەنمی تۆکردن دابەش

دەکرد. ئەو گەنمە ژەهراوی کراوە لەلایەن ئاغای زەوییەکانەوە لە جۆ هەرزانتر بە خەڵکی هەژار و نەداری کورد دەفرۆشرا، کەچی ئەو گەنمانە بە نەزانی لەلایەن خەڵکەوە دەکرا بە ئارد، ئاردەکەش دەکرا نان، بەڵام وەرە و ببینە ئەو گەنمەی پێویست بوو دژی حەشەرات بەکار بهێندرێت، بە زانین بۆ لەناوبردنی گەلی کورد بەکار دەهێندرا. لە ماوەیەکی کەم، بە تایبەتی لەسەر منداڵان، کاریگەرییە نەرێنیەکانی دەرکەوتن، ئەو برینەی بەهۆی خواردنی ئەو نانەوە لەناو خەڵك بڵاو ببۆوە پێیاندەگوت (برینا ڕەش).

ئەوکات، لە ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد)، لە دیار بەکر، کارم دەکرد. ئەو پرسەم زۆر هێنا سەر زاران، بەڵام ئەو وەحشیانە بۆ بنبڕکردنی ڕەگی کوردستان سڵیان لە هیچ نەدەکردەوە. من بۆ زانینی ئەو دۆخە ئەوسا لە دیاربەکر لە ناوچەکانی چونگوش و دیجلە و هازرۆ و لیجە و هیلڤان و چنار و بیسمیل دەستم بە گەڕانێك کرد. لەوێ سەردانی نەخۆشخانە بێ دکتۆرەکانی ئەو قەزا و ناحیانەم کرد. ئەو منداڵانەم بینی کە بەو برینە گەورە گەورانەی بە لەشیانەوە بوو، وەك فەرخە مەیموونیان لێهاتبوو. منداڵەکان دەموچاویان ڕەش ڕەش هەڵگەڕابوو، هەموو جەستەشیان ببووە یەك پارچە موو. بە ئاشکرا شوێنی ئەو پارچە گۆشتە ڕزیوانە لەسەر دەم و چاو و جەستەیان دەبیندرا، کە هەرگیز چاك نەدەبوونەوە، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆری منداڵەکان بمرن. ئەو ڕووداوە لە ساڵی ١٩٥٨ ڕووی دا بوو. گەر ئەمڕۆ سەرژمێرییەك بکرێ، کەمیی ڕێژەی دوو گیان بوونی ئافرەتانی کورد لەو ناوچانە زۆر بە ئاشکرا بە دیار دەکەوێت.

ئەو ڕووداوە زۆری کارتیکردم، بۆیە، هۆکارێکی سەرەکیی

نووسینی شانۆنامەکەم بوو. لە ڕۆژنامەی ئیلەری یورد ئەو ڕووداوەم زوو زوو دەخستە سەر ڕوپەڕی ڕۆژنامەکە، بەڵام وەزارەتی تەندروستی بە ڕاپۆرتی ساختە زوو زوو دەیویست وەڵامم بداتەوە، گوایە ئەو نەخۆشییە پەیوەندیی بەو گەنمەوە نییە کە دابەشکراوە، بەڵکو سەرچاوەکەی دەچێتەوە سەر پێشتریێ. ڕووداوەکە دەنگدانەوەیەکی زۆری دروستکرد، بگرە نازم حیکمەتیش لە مۆسکۆوە پشتگیری کردم و شیعرێکی نووسی بەناوی (گیرۆدەبوونی وەزیری تەندروستی بە برینی ڕەش).

دەربارەی برینا ڕەش بەسەرهاتێکم هەیە لە پەرلەمانی تورکیا. دانیشتنێکی دادگام هەبوو لە ئەنقەرە، زۆر برادەریشم لەوێ پەرلەمانتار بوون، بۆیە، کە چوومە ئەوێ چەند دانەیەکی پەرتووکەکەم لەگەڵ خۆم برد. لەناو پەرلەمانی تورکیا، چەندین پەرلەمانتاری ناوچە کوردییەکان لە دەورم کۆبوونەوە، لەگەڵ ئەوان بەدەم چا خواردنەوە یەکە و دانەیەك لە پەرتووکەکەم بە دیاری دانێ. ئەوسا مامۆستا قادرجان کافلی لە ڕۆژنامەی (تەرجوومە) بەردەوام وتاری ئایینیی دەنووسی، ئەویش هاتە لامان. کاتێك پەرتووکەکەی بەدەستەوە گرت، برادەرانی دیکەمان سەریان خستە سەری و پێیان گوت: "مامۆستا تۆ هەموو ڕۆژێك وتاری ئایینی دەنووسی، بەڵام لەژێر نووسینەکانت وێنەی ڕووتی ئافرەتان بڵاو دەکریتەوە، ئەوە چۆن دەبێت؟". مامۆستا وەڵامی دانەوە: "کورم ڕۆژنامەکەی من وەك ئیستانبوولە، لەلایەك گۆڕی حەزرەتی سوڵتان ئەیوبی لێیە، لەلایەکی دیکەشی قەحپەخانەی قەرەقۆی". ئێمە پێدەکەنین و مامۆستاش سەیری پەرتووکەکەمی دەکرد: "ئەوە چ جۆرە پەرتووکێکە، نیوەی تورکییە و نیوەی کوردییە!" مامۆستا ئاوای بە من گوت.

"پەرتووکەکەم وەك تورکیایە، نیوەی تورك و نیوەی کوردە"، منیش ئاوا وەڵامم داوە، ئەوجارە ئەویش لەگەڵ ئێمە پێکەنی.

پاشان، جیهاد بابان هاتە لامان، ئەو پەرلەمانتاری جەهەپە و سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئولوس) بوو، لێی پرسیم ڕۆژنامەکەمان دەخوێنییەوە؟ منیش گوتم: "لەبەر ئەوەی لە ئیستانبوول نامێنمەوە، بۆیە هەموو ژمارەکانی ناگاتە دەستم، بەڵام ئەو دوو ڕۆژەی لە ئەنقەرەم چەند لاپەڕەیەکم لێ خوێندۆتەوە، بەڵام بەهۆی وتارێکیانەوە لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکە پەشیمان بوومەتەوە". چونکە بیرۆکەی نووسینەکەی بەو شێوەیە بوو: سولەیمان دەمیرەلی سەرۆکوەزیران، چووەتە کۆبوونەوەی CENTO[1]، دەمیرەل لەگەڵ ئێران و عێراق و پاکستان لەسەر پرسی کورد گەیشتوونەتە ڕێککەوتنێك. جیهاد بابانیش ڕێککەوتنەکەی پێ باش بووە، بۆیە بۆ پرسی باڵای نەتەوەیی تورکیا داوای لە پارتەکان دەکرد یەکگرتوو بن. کاتێك وتارەکەیم بۆ پوخت کردەوە، شەرم دایگرت و گوتی: "مووسای برام، تۆ دەتەوێ هەموومان وەك خۆت بە ڕەوشت بین، کەچی ئێمە بووینە قەحپەی ناو سیاسەت". هەر لەبەر ئەو قەحپاتیەشی، مامی ڕاستەقینەی، شوکروو بابان ڕێگای نەدەدا بچێتەماڵەکەی. باش بوو جیهاد بابان منداڵی نەبوو، تا ئەویش وەك کامەران ئینان ببێتە پەڵەیەکی ڕەش بە نێوچاوانی کوردەوە.

---

[1] Central Treaty Organization ڕێکخراوی ڕێککەوتنی ناوەندی، یاخود ناوە کۆنەکەی (میساقی بەغدا)، ڕێکخراوێکی بەرگریی هاوبەش بوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٥٥ – ١٩٥٩) لە لایەن بەریتانیا و تورکیا و عیراق و ئێران و پاکستان دامەزرێندرا بۆ ڕێگری کردن لە فراوان بوونی نفوزی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. (وەرگێڕ).

بەو دواییــانە، گەنــجە کوردەکــانی ســووریا، برینــا ڕەشــیان کردبــووە کــوردی و ئینجــا لە چوارچێــوەی فیلمێکــدا وێنەیــان گرتبــوو، بەرامــبەر بەو هەســتە نەتەوەییەیــان بەنــاوی خــۆم و گەلەکەم سوپاسگوزارییەکیان قەرزدارم.

## کمل

دەڵێن خوا مرۆڤی بێکاری خۆشناوێت، مـن بـۆ خۆشویستنی خوا نا، بەڵام لە ترسی ئەوەی گەلەکەم خۆشی نەوێم، قەت بێ کار نەدەوەستام. مـاوەیەك بەر لە ئێسـتا، بەشـێك لەو نووسـینانەی بـڵاوم کردبـوونەوە، هەمـوویم کـۆکردنەوە و لەژێـر ناونیشـانی (کمــل) لە دوو تــوێی پەرتووکێکــدا چــاپمکردن. شــانۆنامەی کملیشــم لەنــاو ئەو پەرتــووکە دانــابوو. دەتــوانم بڵــێم ئەو پەرتووکەشم هەڵلای دروست کرد، بۆیە، بە بڕیاری حکوومەت هەمــووی کــۆکراوە و دواتــر درامە دادگــا، بەڵام بەلای کەمەوە نزیکەی هەشت نۆ هەزار دانەی گەیشتە دەستی خەڵك. بەشـێك لەو نووسینەی خـوارەوە کە لەنـاو پەرتـووکەکەم هەیە، دەمەوێ لێرە بینووسمەوە:

## قوربانی

"ســاڵی ١٩٥٨، پەیمانگــای پەروەردە، لە دیــاربەکر دەکــراوە، جەلال یاردمجیی وەزیری پەروەردە خەڵکی ئــاگری بــوو، بەڵام جەلال بەیار بــووە ڕێگــر لەبەردەم کــردنەوەی ئەو پەیمانگــایە و جەلال یاردمجیشی لە پۆستەکەی دوور خستەوە و لە شوێنی ئەو تورانجی تەوفیق ئیلەری دانا. جەلال بەیار و وەزیرە تــازەکە، بـۆ کــۆکردنەوەی ئەو پەیمانگــایە، لە ترابــزۆنەوە هــاتنە دیــاربەکر. ســەرۆکی شــارەوانیی دیــاربەکر، کە خەڵکــی شــارەکە نەبــوو،

هەرچی ئۆتۆمبێلی گواستنەوە هەبوو، هەمووی کۆکردەوە و هەرچی بێ کاری ئەو شارەش هەیە سواری کردن و بردنییە فرۆکەخانە، بۆ عیبرەتی عالەم منیش چووم. کاتێك جەلال بەیار و تەوفیق ئیلەری لە فرۆکە دابەزین، بەرانێکی ڕۆژهەلاتییان هێنا پێشەوە تا لەبەردەمی سەری ببڕن و بیکەنە قوربانی، بەلام بەرانی بەستەزمان چاوی ئەبلەق ببوو، وەك ئەوەی بلێ "من دەکەنە قوربانیی ئەوانە!"، بۆیە گەر لە ترسان زمانی وشك نەبوایە، بە دلنیاییەوە تفێکی لە ڕووی سەرۆکی شارەوانی دەکرد. بەران ئاوا هەلسوکەوتی دەکرد وەك ئەوەی بلێ "من ناترسێم، پارچە پارچەم بکەن و فڕێم بدەنە پشت شووراکانی دیاربەکر، با سەگەکان بمخۆن، خۆ هیچ نەبێ سەگی دیاربەکرین". لە بەینێکدا چاوەکانی کەوتە سەر چاوی منیش، بە درێژی چاومان بڕییە ناو چاوی یەکدی، بەلام هەر زوو هەستی کرد منیش وەك ئەوم، وەك ئەو منیش بێچارەم، بۆیە، ئیدی ملی بۆ چەقۆیە بێ شەرەفەکەی قەساب درێژکرد. قەسابەکە (ئەلاهوو ئەك...) تەواوی نەکرد و چەقۆ نەعلەتیەکەی ملی بڕی، بۆیە من (بەر)م لە شوێنی ئەو تەواو کرد".

### بیست و سێیەکان

لەگەل دەرچوونی پەرتووکەکانم و بلاوکردنەوەی گۆڤارەکانی دیجلە، فورات و دەنگ، دیسان جوولانەوەیەکی تازەی قوتابییانی کورد دەستی پێ کرد. حکوومەت بە دوای هەنجەتێکدا دەگەڕا تا بمانخاتە زیندان، چونکە هەم دۆخی نائاسایی ئاسایش هەبوو، هەمیش ئەو قوتابییە کوردانەی ئێران و عێراق کە لە ئیستانبوول دەیانخوێند، زوو زوو دەهاتنە لام.

دیسان دەستگیرکراینەوە، بۆ ئەمەش تۆمەتێکی سەیریان بۆ

دۆزینەوە. عەبدولستار هەمەوەندی، ناوێکی کلاوچیی فێڵباز، بە ناوێکی زۆر سەیر لە بەغدا نووسینگەیەکی کڕین و فرۆشتنی زەوی و خانووی کردبۆوە، بە بروانامەیەکی ساختەش زەوی بەولا و ئەملادا فرۆشتبوو، کاتێکیش دەستی کەشف دەبێ، بەرەو سووریا ڕادەکات. ئەو لە شەیتان گەلەك زۆرزانتر بوو، لە یەك کاتدا ئیمامی مزگەوت و پارێزەر و ڕۆژنامەڤان بوو! کاتێك دەستگیرکرا وێنەیەکی خۆی لەگەڵ بارزانی و جەمال عەبدولناسر لە باخەڵی گیرابوو، لەگەڵ مۆرێکی (ئیخوان موسلمین). ناسنامە فەرمییەکەی بەو شێوەیە بوو: (ئەلحاج حوسێن مەحامی عەبدولستار هەمەوەندی). جگە لە وێنە و مۆرێك، حەفت باولی تژی کەلوپەلی جیاوازیشی پێبووە، لەناو ئەو باولانە تەلەفزیۆنیشی تێدابووە. کاتێك دەستگیرکرا لە سێ لای جیاوازەوە نامە و وێنەی هاوسەر و منداڵەکانی بۆ دەهاتە بەندیخانە. ماشەڵلای لێبێ یەکێ لە مووسڵ و ئەوی دیکە لە بەغدا و یەکێکیش لە قاهیرە، چونکە سێ هاوسەری هەبوو. عەبدولستار کێشی نزیکەی ١٣٠ کیلۆ دەبوو.

عەبدولستار، کاتێك لە سووریا تەلەفزیۆنەکەی دەباتە حەلەب بۆ چاککردنەوە، لەوێ نووری دێرسیمی دەبینێت، بۆیە، خۆی وەك ڕۆژنامەنووسێك پێ دەناسێنێت و دەڵێ: "دەچمە ئیستانبوڵ"، کاك نووریش دەڵێ: "مادەم دەچییە ئەوێ، دوو برازای ڕۆژنامەنووسم لەوێ هەیە، بیانبینە و ئەوانیش هاوکاریت دەکەن". لەو دووانە یەکێکیان من و ئەوەی دیکەش دۆغان کلچ بوو. دوای هاتنە ئیستانبوڵی سەرەتا دۆغان کلچ دەبینێ، لەبەر ئەوەی ئەویش دێرسیمی بووە، دەڵێ: "نووری دێرسیمی ماممە و چی پێویست بێ من هاوکاریت دەکەم و پێوست بە مووسا عەنتەر ناکات". دۆغان کلچ لە هەمەوەندی دەپرسێ پێویستت بە

چییە؟" ئەویش پێی دەڵێت: "ئەندامی ئیخوان موسلمینە و دەیەوێت قونسوولی ئیسرائیل ببینێ، تا داوای هاوکاریی لێبکات بۆ ئەوەی چەك و بەلەم و پارەی پێ بدات". دۆغان کلچیش دەڵێ: "زۆرباشە، بەس بۆ منیش لە لیستەکەت چاپخانەیەك زیاد بکە". دواتر تەلەفۆن بۆ قونسوڵخانەی ئیسرائیل دەکەن و لە گازینۆی تاشلاك ڕێککەوتێکی یەکدی بینین دادەنێن، تورمەزە ئەوانەی قسەیان لەگەڵ کردبوون، میت بوونە. ڕۆژی دواتر کاتێك دەچنە شوێنی یەکدی بینینەکە هەردووکیان دەستگیردەکرێن. لە کاتی پشکنینیان ناونیشانی ماڵەکەی منیش لە باخەڵی عەبدولستار دەدۆزنەوە. ڕۆژانی دواتر لە ڕۆژنامەکانەوە بە مانشێتی "ئەو پیاوەی بارزانی بۆی ناردم". بە وێنەیەکی سەیر و سەمەرەوە، هەمەوەندی هەواڵی دەستگیرکردنی بڵاو دەبێتەوە.

ئەوانەی ئەوجارە لەگەڵمان دەستگیرکران هەریەکە لە (زیا شەڕەفخان ئۆغلوو، سەعید ئەلچی، مەدەت سەرهات، یاشار کایا، ئەنوەر ئای تەکین، ئەرگوون کۆینجوو، عەلی ئەناگۆر، ئەدیب کاراهان، حەسەن بولوش، دۆغان کلچ، سەیدی شهاسانلی، کەمال بینگۆلی، محەمەد بیلگن، فەتحولا کاکی ئۆغلوو؛ لە کوردەکانی عێراقیش ئیبراهیم مام خدر، غازی دزەیی، نەجات ڕەمزی، فوئاد دەروێش، تەلعەت شەریف موختار، سەید عەبدولڕەحمان، جەمال عەلەمدار. لە کوردەکانی ئیرانیش فیروز فەلەحات خەیرەتمان لەگەڵ بوو).

وا ڕێك دەکەوت دەستگیرکردنەکانمان بەردەوام لەگەڵ بۆنەیەکی مێژوویی ڕێك بکەوێت. گرووپی چل و نۆکان لە بەرواری ١٧-١٢-١٩٥٩ دەستگیرکراین، واتا لە ڕۆژی کۆچی دوایی مەولانا، کە دەکاتە شەوی ئارووزدا. لە دەستگیرکردنی

ئەوجارەشمان کە پێیان دەگوتین بیست و سێیەکان، لە هەمان بەرواری وەفاتی نازم حیکمەت بوو. دوای دەستبەسەرکردنمان ئێمەیان بردە باڵ مومجوو، ئەوێ کاتی خۆی کێڵگەی سوڵتان حەمید بوو لە کۆشکی یلدز، کە بەقەد کۆگایەکی وەستان و چاکردنەوەی فرۆکە گەورە بوو، لەوێ لەناو یەکێك لەو کۆگایانەیان داناین. لەوێ چەندین دەستگیرکراوی دیکەش هەبوون کە لەسەر دۆسیەی جیاواز جیاواز گیرابوون. بۆ نموونە چەپ و نوورجی و ئەندامانی پارتی دیموکرات و چەندان کەسی دیکە کە ڕۆژانە فەرتەنەیان دروست دەکرد. کۆگاکە یەك پارچە بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بەتاڵ بوو ئێمە گرووپ گرووپ شوێنی خۆمان دامەزراند، بەڵام قسە لەگەڵ یەکدی کردن قەدەغە بوو.

عەبدولستار هەمەوەندی، لە حوجرەیەکی تەنیا زیندانی کرابوو، بەڵام لە ژوورەکەی ئەو نزیك لە بنمیچی شوێنەکە کونێکی دووکەڵکێشی سۆبەی لێبوو. ڕۆژێك لەوێوە (تەق) نینۆك بڕێکی لێ بەرداوە لامان، لەناویشی بە زمانی عەرەبی لەسەر کاغەزێکی بچووك چەند شتێکی نووسی بوو، برادەرە عێراقییەکانمان نووسینەکەیان خوێندەوە و بەو شێوەیە بۆیان وەرگێڕاین: "کوردی عێراقە و لە عەشیرەتی هەمەوەندییە و کەسێکی زۆر نزیکیشە لە بارزانی، ئاماژەی بەوەش کردبوو کە مان لە خواردن دەگرێ، بەڵام لە دەرگای سێیەمی پشتەوەی باخچەکە لە قۆرتێك هەموو ڕۆژ دەمژمێر ١٠ خواردنی بای پێویستی بۆ دانێن، تاکو لە برسان نەمرێت". ئێمە باوەڕمان کرد، بۆیە هەڤاڵان ئەو ئەرکەیان بە من سپارد، ئیدی هەموو ڕۆژێك لە کاتی دیاری کراو چەند خواردنێکی باشی وەك کفتە و سوجوق و پاسترمە و بۆرەك و نانم لەوێ بۆ جێدەهێشت. دوای

گەڕانەوەم، عەبدولستار بە هەیکەلە گەورەکەیەوە کاتێک دەچووە ئەدەبخانە، لەسەر ڕێگە خواردنەکەی هەڵدەگرت و دەیخوارد، ئەو بەزمە نزیکەی ٤٠ ڕۆژی خایاند. لەبەردەم دەرگای حوجرەکەی دەرگاوان هەبوو، ئەوان دەیانگوت ئەو کابرایە هەمەوەندییە هیچ خواردنێك قبوول ناکا، کەچی دۆخی لە ئێمە باشترە، بۆیە چەند دکتۆرێك لە نەخۆشخانەی حەیدەر پاشاوە هاتن و سەیری دۆخی تەندروستییان کرد، بەڵام بێ ئەوەی بزانن چیەتی گەڕانەوە، لە ڕاپۆرتەکەشیان نووسیبوویان: "هیچی نییە". ڕۆژێك عەمیدێکی سەربازی هات و گوتی: "سەرم لەو کارە سوڕماوە"، وەڵامم داوە: "لەوەی باشتر، کابرا بێ ئەوەی نان بخوا دەژی".

دوای ماوەیەك مانەوەمان، ئێمەیان دایە دادگای ناوەندی سەربازیی ئیستانبووڵ، بەڵام دادگا دۆسیەکەمانی ڕەتکردەوە، ئەوجارە ئێمەیان دایە دادگای عورفی کارگێڕی، بەڵام ئەوێش ڕەتیانکردینەوە، لە کۆتاییدا ئێمەیان گواستەوە بۆ بەندیخانەی سەربازیی ماماك لە ئەنقەرە.

بەر لەوەی ئەو بەشە تێبپەڕێنم، دەمەوێ چەند یادەوەرییەکی بەندیخانەی باڵ مومجووم بگێڕمەوە.

دووبارە ئەندازیاری سەرەکیی چل و نۆکان، زیا شەرەفخان ئۆغلوومان لەگەڵ بوو. بەڵام ئەوجارە تەنیا دۆستی سەعید ئەلچی بوو، ئەویش تەنیا هێسك و پێست مابۆوە. ئێمە ئەو خواردنانەی بۆمان دەهات تێری نەدەکردین، بۆیە، پارەمان خڕکردەوە تا خواردن لە دەرەوە بکڕین، لەبەر ئەوەی سەعید لاواز بوو من بەشێك لە خواردنەکەی خۆم دەدا ئەو، ئەویش دەچوو دەیدا زیا، کەچی زیاش خواردنەکەی لەو کوڕە لاوازە بێ حاڵە وەردەگرت و دەیخوارد. لەو چێشتانەی لە بەندیخانەش بۆمان

دەهات، گەر پشکە گۆشتێك کەوتبا ناو قاپەکەی، سەعید بە ملاکێك ئەو پشکە گۆشتەی هەڵدەگرت و دەیدا زیا، ئەویش بە ئیشتیهاوە گۆشتەکەی ئەوی نۆش دەکرد. ئەو دۆخە ئەوەندە ئێمەی عادز و بێتاقەت کرد، ناچار هەردووکیانمان لەسەر سفرەکانمان دەرکردن. ئیدی بە تەنیا نانیان دەخوارد، سەعید لەناخی دڵیەوە بە زیای دەگوت (بابە)، بەڵام زیا باوکێکی زۆر بێخێر بوو.

ئەورۆ، کاتێك ئەو بەسەرهاتانە دەگێڕمەوە، زۆر سوپاس بەشێك لە برادەرانمان ماون تا قسەکانم پشتڕاست بکەنەوە.

### ئەدیب کەرەهان

ئەدیب کەرەهان دۆستێکی مێرانەمان بوو، کەسێکی زیرەك و ڕۆشنبیر و ڕاستگۆ بوو، بەڵام بەدبەخت و هەژار و دەربەدەر. ڕۆژێك بەو پارەی کۆمان دەکردەوە، هەناردم کیلۆیەك قاورمە و چەند جۆرە پەنیرێك و کیلۆیەك سجوق و پاسترمەمان بۆ بکڕن تا بەیانیان تاشتی بکەین. ئەدیب لە قاتی دووەمی قەڕوێلەکەمان دەخەوت، بەرامبەر پەنجەرەیەکی گەورە، کەناری پەنجەرەکە بۆ ئێمە وەك ساردکەرەوەیەك بوو، بۆ پاراستن و تێکنەچوونی، خواردنەکانمان لەوێ دادەنا، دوای دوو ڕۆژ بینیم خواردنەکان نەماون. ئەدیب هیچ ئاگاداری پاك و خاوێنیی خۆی نەدەبوو، گۆرەوییەکانی بەردەوام بۆن کەلاکیان لێدەهات. شەوێك ئەدیب گۆرەوییەکانی داکەندبوو، لە تاریکیان خستبوویە ناو قاپی مرەباکەی پشت سەریەوە، بەیانی کاتێك داوای نانی کردبوو تا لەگەڵ مورەبا بیخوا (حینگ حینگ پێدەکەنێ)، ئەوە هەر خووی پێکەنینی ڕەحمەتیش بوو بەردەوام، بینیمان ئەو لەسەر

پێکەنین بەردەوامە و گۆرەوییەکانی لەناو مورەباکە دەرهێناو گوتی: (تشت نابە)، ئینجا دەستی بە مورەبا خواردن کرد.
حەزمکرد بەو یادەوەرییە کورتە یادی ئەدیب بکەمەوە.

## ئەندازیار تەحسینە شێت

رۆژێك گەنجێکیان هێنایە لامان ناوی تەحسین بوو، ئەو ئەندازیارێکی باڵا و دیموکراتێکی تۆخ بوو. شەوێك ئەوەندەی خواردبۆوە لە مەستیان ئاگای لە خۆی نەمابوو، ئیدی لە بەرژەوەندی پارتی دیموکرات قسەی کردبوو و قسە و جنێوی زۆریشی بە سوپا دابوو. بۆیە، هەر ئەو شەوە دەستگیریان کردبوو و خستبوویانە لای ئێمە. کابرا، بە سەر و ڕووخساریدا دیاربوو کەسێکی بێ شعوورە، گوێی بە یاساکانی بەندیخانە و کارە قەدەغکراوەکان نەدەدا. رۆژێك هاتە لای ئێمە "کاك مووسا کاك مووسا، من کوردم خۆش دەوێ و خێزانەکەشم کوردی ناوچەی هنسە، ئەوەندە لە خێزانەکەم رازیمە، بێ شەرەفم گەر دە جاری دیکەش بێمەوە دونیا و لەگەڵ کورد هاوسەرگیری نەکەم، بەڵام گەر ڕێگام بدەن، لە ڕقی ئەو ئەفسەرانە دەمەوێ هەندێك بزەڕێنم". سەیرم کرد ئەو کابرایە تەواو نییە، بۆیە گوتم: "باشە"، تەحسین چووە سەر کورسییەك و وەك کەرێکی بەڕەڵابووی ناو گژوگیای بەهار دەستی بە زەڕین کرد، دواتر هاتە خوارەوە و سوپاسی کردم و ڕۆیشت.
چەند بەسەرهات و چیرۆکێکی دیکەی تەحسین هەیە، دەمەوێ بیگێڕمەوە.
کاتێك تەحسینیان هێنا لامان، بەو جلانەوە خستیانە لای ئێمە کە لەکاتی دەستگیرکردنەکەی لەبەری بوو، کاتێك دەرپێ قوتەکەی و کراسەکەی بە ئاوی سارد شوشت و ویستی لەوێ

هەڵیبواسێ، سەربازە نۆبەتچییەکە گوتی: "قەدەغەیە" و نەیهێشت تەحسین کارەکە بکات. ئەویش هەستا هەردووکی بە دوو قۆبچەی گیرفانەکانی پشتەوەی پانتۆڵەکەی هەڵواسی و لە باخچە دەستی بە هەڕوەڵە کرد. کاتێك ئەو دەهات و دەچوو، کراس و دەرپێ قووتەکەی لە پشتی وەك ئاڵای سەر گالیسکە دەشەکاوە. لەو کاتەدا جەمال تووڕاڵی فەرماندەی سوپای یەك هاتە لامان. کاتێك فەرماندە، تەحسینی ئاوا بینی: "هەتیو کا وەرە بزانم ئەوە چییە کردووتە؟"، تەحسینیش: "سەربازەکانت دەڵێن قەدەغەیە جلەکانم لەسەر تێل هەڵبواسم، تۆش هەڵواسینی سەر سمتم لێ قەدەغە دەکەی؟"، دواتر فەرماندە گوتی: "باشە بڕۆ لەسەر تێلەکان هەڵی واسە".

ڕۆژێك تەحسین دیسان هاتەوە لام "کاك مووسا وەرە با دوای ئازاد کردنمان لەگەڵ تۆ قوتابخانەیەکی فێربوونی زمانی کوردی بکەینەوە، دڵنیام پارەی دونیا قازانج دەکەین"، منیش گوتم: "تەحسین ناهێڵن قوتابخانەی کوردی بکەینەوە، چونکە هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە پۆلیس دێ و باڵەخانەکە بەسەرماندا دەڕووخێنن" کەچی تەحسین گوتی: "من چارەسەری ئەویشم دۆزیوەتەوە". منیش پرسیم: "ڕێگا چارەکە چییە؟"، تەحسین گوتی: "گەر لە هەرچوار دەوری قوتابخانەکە ئاڵا و وێنەی ئەتاتورك هەڵبواسین، ئەوە باڵەخانەکە بەسەرماندا ناڕووخێنن!".

### شێخ ڕەفعەت

ماوەیەك دوای زیندانی کردنمان، کەسێکی دیندار دەموچاو نوورانیی قۆزیان هێنا لامان و لەلای گرووپی نوورجییەکانیان دانا. بینیمان هەموو گیراوە نوورجییەکان دەستی ماچ دەکەن و لەسەرووی خۆیان دانا. تومەزە کابرا شێخە و بە

گەنجی لە ناوچەی بەی ئۆغڵوو لە قەحپەخانەی بەناوبانگی نەبانۆز وێنەی ڕووتی گرتووە و دواتر ئەلبوومێکی بەناوبانگی وێنەی سێکسکردنی هەبووە.

ئەویش وەك دادە نیعمەتی فرۆشیاری بەناوبانگی یانەسیب تۆبەی کردووە و گەڕاوەتەوە و بووەتە موسوڵمانیکی عەیار بیست و یەك. ڕەفعەتە فەندی ببووە نوورجی، بە تەواوی خۆی بۆ ختمی بەدیعولزەمان تەرخان کردبوو. ڕۆژێك لەگەڵی دانیشتم، سەیرم پێهات چونکە کابرا ئەوەندە خۆی خستبووە خزمەتی بەدیعولزەمان، بەشێوەیەك چەندان ڕیسالەی ئەوی لەبەر کردبوو، لەگەڵ ئەوەی نەشیدەزانی بەڵام دەیگوت: "سەیدا بۆ ڕیسالەی نوور دەڵێ، ڕیسالەکانی من بۆ دووبارە سوپاسگوزاری کردنی ڕاستییەکانی قورئانە"، لێم پرسی: "ڕیفعەتە فەندی دەزانی (تەرەشوور) چییە؟ سەیرمکرد دەیەوێ بڵێ لە مانایەکی گشتیدا یانی دووبارە هەڵاتنەوەی قورئان".

بەیانییەك، ڕەفعەتە فەندی بە ڕاکردن بەرەو شوێنەکەی ئێمە هات و خۆی خستە پاڵ من و گوتی: "فریامکەون فریامکەون و من لەو کافرانە ڕزگار بکەن" پرسیم: "خێرە ئەفەندی؟". ئاوا وەڵامی دامەوە: "برا ئەو گەنجە چەپانەی بەرامبەرم، شەوێ مەسینەی دەستونوێژ هەڵگرتنەکەیان بردوومە و میزیان لەناو کردووە، بە تاریك و ڕۆنی بەیانی هەستاوم دەستونوێژ هەڵگرم، بەڵام هەموو گیانم بێ نویژ بووە. کاك مووسا، عەمیدی زیندان زوو زوو دێتە لات و قسەشت لای ئەو دەڕوا، بۆیە، تکات لێدەکەم پێی بڵێ تا من بێنییە لای خۆت". وا ڕێککەوت لە کاتی قسەکردنمان کابرا هات، منیش دۆخەکەم بۆ باسکرد و گوتم: "جەنابی عەمید تکات لێدەکەم ئەو پیاوە بەتەمەن و ڕۆشبیرەی وەك من، گەر ڕێگا بدەن قەروێڵەکەی بهێنێتە لامان،

ئێمە بۆ خۆمـان سـەر دەخەیـنە سـەری یەکـدی و دەمەتەقـێ دەکەیـن"، ئەویـش ڕازی بـوو. شـێخ ڕیفعەتـم هێنـا لای خـۆم، هەندێك جلوبەرگم دایە، ئەویـش زۆر سوپاسـگوزار بـوو. دوای بیسـت ڕۆژ ئـازادکرا، لەیەکێـك لە ڕۆژەکـانی سـەردانیکردنی بەنـدیخانە هـاتە لام، بە پـارەی ئەوڕۆ بـای نـزیکەی دووسـەت سێسـەت هەزار لیـرەی لە خۆشـترین و گرانتـرین خواردنەکـانی ئیستانبوولی لەگەڵ خۆی بۆ هێنـابووم. لـێم پرسـی: "بـۆ ئەوەنـدە خۆت ئەزیەت دا شێخم؟"، ئەویـش گـوتی: "جا چیم کـردووە برام، ئێوەی کورد لە نەتەوەی مامۆستای پیرۆزن، جا سـەرەڕای ئەوەش پیاوەتیی ئێوەم بە چاوی خـۆم بینـی، گیـانم بە قوربـانی ئێـوە بـێ، بەڵام داواکـارم ئەو خواردنـانە نەدەیە ئەو گەنـجە کافرانە".

## کیرکۆری ئەرمەنی

بەسەرخۆشییەوە ستایشی چوونی نازم حیکمەتـی کردبـوو بـۆ یەریڤانی پایەتەختی ئەرمەنستان و دواتریش باسـی خۆشەویسـتیی خەڵکی ئەوێی کردبوو بۆ نازم حیکمەت، جگە لەوە، گوتبـووی نازم حیکەمەت پیـاوێکی گەورە و شـاعیرێکی نـاوازەیە. لەسـەر ئەوە ئەوەندەیان لە کیرکۆر دابوو، قاچ و قولی هەمووی شـین و مۆرببـۆوە. بەو دۆخەوە هێنایـان و فڕێیـان دایە سـەر یەکێـك لە قەڕوێڵەکانی کۆگاکە. لە بێ ئاگایی خۆی، هەمان شەو مشـك و جورج وایان زانیووە مـردووە، بۆیە دەسـتیان بە گـاز لێگـرتن و خواردنی کردبـوو، بەڵام کیرکـۆر بە ئاگـا دێـتەوە و هەسـت بە ژانی چەقینی ددانـی مشـەکەکان دەکـات لە جەسـتەیی و پـڕ بە قورگی هاوار دەکـات، بە خێرایـی پزیشـکەکان دەیگەنـێ و بەو حـاڵەی خـۆیەوە چەنـدان دەرزی دژە ژەهربـوون و هـاریی

لێدەدەن. لەگەڵ تێپەڕینی کات کیرکۆر چاك بۆوە و هەستاوە سەر پێکانی، ڕۆژێك هاتە لام: "مامە مووسا مرۆڤ چۆن دەبێتە موسوڵمان؟" منیش گوتم: "وەڵاهی نازانم، بەڵام ئەوەندەی زانیاریم لەسەری هەیە، سەرەتا ناوت دەگۆڕی و سوونەت دەکرێی و دواتریش لەلای لێژنەی فەتوا بۆنەیەکی بچووکت بۆ ساز دەکرێ"، ئەویش گوتی: "بە هەمووی ڕازیمە، نەك تەنیا سوونەت، حەز دەکەن چووکم لە بنڕا لێ بکەنەوە، تەنیا با ناوم بکەنە نازم حیکمەت".

گەر سەرنج بدەن، لەو بەندیخانەیە، تەحسین و ڕیفعەت و کیرکۆر هاتنە لام، ئەوانە بۆچی هاتن؟ دەمەوێ بە کورتی باسی ئەوەشتان بۆ بکەم:

بەتەمەنترین کەس لە ناو ئەو ٢٣ کەسەی دەستگیرکرابووین، من و کاك زیا بووین، گرووپەکانی دیکەش چاودێریی ئێمەیان دەکرد. کاك زیا لەناو گرووپی برادەران پشت گوێ خرابوو، منیشیان وەك برا گەورەی خۆیان هەژمار کردبوو. من خەسڵەتێکم هەبووە لە زیندانەکان؛ ئەوانەی بە تەمەن لە من بچووکتر بوونە، بە سۆز و میهرەبانیی باوك و دایکێك بۆ منداڵەکانی مامەڵەم لەگەڵ کردوون. جگە لە چەند گەنجێك، کە بەردەوام هەڵەیان دەکرد، کەچی ئەوانیش هەر وەك برا گەورە و باوکی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ کردووم، زۆربەی هەڤاڵانیش بەو شێوەیە قبووڵیان کردووم. کاتی وا هەبووە تەنیا ٣ کەس و جاری واش بیست و سێ کەس بووینە، هەندێکجاریش گەیشتووینەتە سەت و پەنجا کەس، بەڵام ئەو ڕێسایە هیچ نەگۆڕاوە.

### دووبارە ئەنقەرە

لە ئەنقەرە، قوتابخانەی ئەفسەریی یەدەگیان بۆ ئێمە کردبـووە بەندیخانە. کاتی خۆی لە قوتابخانەکە، لە هەر بەشێك بـۆ دانـانی چەك و تفـاقی قوتابییەکـان چەنـدان ژووریـان لە شـێوەی بەنـدیخانەی تاکەکەسـی دروسـتکردبوو، کە چـووینە ئەوێ ئێمەیـان لەو شـوێنانە دانـا. لەگەڵ کراوەیـی باڵەخـانەکە، بـاخچەیەکی گەورەشـی لێبـوو، جـگە لەمـانە هەمـوو جـۆرە سەردانیکردنێکیشمان ڕێگا پێدراو بوو. جارێکیان، یوسف عەزیز ئۆغلووی پەرلەمنتاریش هاتە سەردانم، دوای ئەو سـەردانە، شـەر لە نێوان وەزیری ئەوسای تەندروستیی تورکیـا و یوسـف عەزیـز ئۆغلوو و وەزیری ناوخۆ دروستببوو، حفزی ئۆغووز، لە تۆمـارە فەرمییەکانی پەرلەمان، ئەو وتارەی پێشکەش کردبوو:

"دکتـۆر یوسـف زیـا ئۆغلـوو، لە زینـدان، سـەردانی مووسـا عەنتەری کورد پەرستی کـردووە. ئەگەر عەزیـز ئۆغلـوو دەڵـێ کورد پەروەر نییمە، با بێ و لەبەردەم پەرلەمانتـاران ئەوە ئاشـکرا بکات". یوسف عەزیـز ئۆغلـووی ڕەحمەتـیش هـیچ حسـاب بـۆ قسەکانی حفزی ئۆغوزی نەتەوە پەرست و شێت ناکا، بۆیە هەر وەڵامیشی ناداتەوە.

با ئێمە جـارێکی دیـکە بگەڕێـینەوە لای هەمەوەنـدی. ئەوسـا گوێگرتن لە ڕادیۆ قەدەغە بوو. بۆ ئەو مەبەسـتە، دوو سـێ جـار ئێمەیـــان پشـــکنی، لە هەر جارێکیانـــدا ڕادیۆیەکیـــان لای هەمەوەنـدی دەدۆزیـیەوە، ئیـدی گـوتم ئەوە دواجـارە، بەڵام ماوەیەك دواتر هەمەوەنـدی لەخەوی هەڵسـتاندم. ڕادیـۆی شـامی کردبۆوە، بە عەرەبییەکی جوان گوتی: "ئوستاد دەتەوێـت گـوێ

لە ڕادیۆ بگریت؟"، لەبەر ئەوەی من لە کاتی خۆ شووشتن هەمەوەندیم بینیبوو چۆن ورگی نیو مەتر هاتبووە سەر ئەندامی نێرینەی و کارگێڕی زیندانیش زۆر ورد و هەستیار بوون بەرامبەر بە ڕادیۆ، بۆیە ئامۆژگاریم کرد: "هەمەوەندی ڕادیۆ قەدەغەیە، چەندین جاریش ئاگادار کراوینەتەوە گەر ڕادیۆتان لایە بیدەنە یەکێك لە سەردانیکەرانتان تا لەگەڵ خۆیان بیبەنەوە، تۆش ڕادیۆکەت بدە من تا بیدەمە یەکێك و لەگەڵ خۆی بیباتە دەرەوە، کاتێك دەریش چووی جارێکی دیکە ڕادیۆکەت وەردەگریتەوە!". بە داواکارییەکەم ڕازی بوو، بۆیە، ڕادیۆیە لە بەرگ گرتووەکەی پێدام، منیش لەتەك ئەفسەرەکان ڕادیۆکەم دا دکتۆر ناجی کوتلای. ئێوارە دیسان هەمەوەندی هاتە لام: "کاکۆ نایەی گوێ لە ڕادیۆ بگری؟"لێیمخوڕییەوە: "هەتیو ئەوە چییە؟". بە هێمنی وەڵامی دامەوە: "کاك مووسا ڕادیۆکەم لای خۆم هێشتەوە و لەناو بەرگی ڕادیۆکەش کاغەز و زبڵی ڕۆژانەم تێکردبوو، بەڵام تۆ واتزانی ڕادیۆکەی لەناوە".

لەگەڵ ئەوەی هەمەوەندی بەردەوام ئیسراحەتی تێك دەداین، کەچی چاودێرێکی یەعقووب ناوی ئەفسەری شێتمان هەبوو، ئەویش بەردەوام ئێمەی دەشکاندەوە. ئەو هەرچەند زیاتر دەیویست ئێمە بشکێنێتەوە، ئێمەش زیاتر حیسابمان بۆ نەدەکرد و بە پیاومان دانەدەنا. ڕۆژێك ئێمەی لە چێشتخانە کۆکردەوە، شتێکی بێ مانای بەو شێوەیە گوت: "برادەرینە ڕاستە من خەڵکی ئێدرنەمە، بەڵام بێ نامووس بم، قەرەج نیمە"، منیش گوتم: "هەڵا هەڵا جەنابی ئەفسەر کێ دەڵێ تۆ قەرەجی؟" ئەویش ڕووداوە مێژووییەکەی قەرەجانی بەو شێوەیە باسکرد: "بەرێزم ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زوو زوو دەچووە جەنگ بۆ ئەورووپای ناوەڕاست، ئەوسا ئیمپراتۆریەتەکە سەربازیان لە عێراق و مسر و

سووریا و کوردستان کۆ دەکردەوە، جگە لە وڵاتانی باڵکان و ڕوومەلی ژێر فەرمانڕەوایی خۆی، لەگەڵ ئەوانە سەربازەکانی ناوچەی مارماراشی بانگهێشت دەکردەوە بۆ جەنگ. عوسمانییەکان قانوونێکی ئاواشیان هەبووە؛ "قەرەج نابردرێتە سەربازی"، بۆیە دوای کەم بوونەوەی نفووسی ئەو ناوچەیە، قەرەجیان هێنا شوێنەکانیان، بەشێوەیەك چەندان خێزان کە قەرەجیش نەبوون، بەڵام بۆ ئەوەی لە ماوەی سەربازی ڕزگاریان بێت، خۆیان بە قەرەج ناونووس کرد". لەبەر ئەوەی ئەفسەرەکە کەسێکی موو زەرد بوو، بەم شێوەیە دڵی ئەفسەرەکەم داوە: "ئەفسەرم لەو ناوچانەی باست کرد بە قەرەج دەڵێن هاووڵاتی ئەسمەر، هەر ئاواشە چونکە بنەچەکەیان دەچیتەوە سەر هیندستان و پاکستان. ئێوە سەیرێکی ئاوێتە بکەن و بزانن هیچ سیمایەکی ئەسمەری قەرەجانتان پێوە دیارە؟". کابرا زۆر ئاسوودە بوو، ئیدی زۆر لە جاران باشتر لەگەڵ ئێمە مامەڵەی دەکرد، چونکە بەو قسانە ئەوم لە قەرەج بوون ڕزگارکردبوو.

وەك ئەوەی لە ئیستانبوڵ بەسەرمان هات، لە ئەنقەرەش بە دوای دادگایەکدا دەگەڕان بۆ دادگاییکردنمان، دادگای عورفیی کارگێڕیی فەرماندەیی هێزی زەمینی و دادگای سەرۆکایەتیی سوپا، لەبەر ئەوەی شوێنی تاوانەکەمان ئیستانبوڵ بوو و هیچ یەکێك لە ئێمەی دەستگیرکراو، سەرباز یان سەر بە سوپا نەبووین، بڕیاری نابەرپرسیاریەتی لەبەرامبەر دادگایی کردنمان دەرکرد. دوای ماوەیەك لەو شوێنەی لێی بووین، ئێمەیان گواستەوە بەندیخانەی تاکەکەسیی پاڵاس پاندیراس ماماك.

ژوورەکانمان بە ڕیزبەندی (ئەلف و بێ) ڕێکخرابوو. ژوورەکەی من ناوی ژمارە (١) بوو، بەڵام شوێنەکەمان زۆر سەیر بوو، چونکە تەختەی خەوتن و دەرگا و پەنجەرەی هەموو

یەك پارچە بوو. لە ژوورەکان شوێنی خۆ شوشتن و دۆلابێکی جل هەلگرتن هەبوو. بۆ نانخواردنیش شوێنێکی دیکە دیاری کرابوو. دەرگاکان ئاوا دروستکرابوون، گەر قوفل بوبا ۱۰۰ ساڵیش لە ژوورەوە مابای نەتدەتوانی بێیتە دەرەوە، بۆیە بەردەوام دەرگاکانمان بە کراوەیی جێدەهێشت. ئێمە زۆر کات لە ڕێڕەوەکە دادەنیشتین، جگە لەوەش ڕۆژانە دەمژمێرێك پێش و پاش فراڤین دەمانتوانی بچینە بەر هەتاو بۆ ناو باخچە.

لەبەشەکانی دیکە، تەلعەت ئایدەمیر[1] و هەڤالانی قوتابخانەی حەربییەی لێبوو، بەڵام کاتێك ئێمە چووینە ئەوێ دادگایی کردنی تەلعەت تەواو ببوو. هەمان کات فەتحی گورجانی بە ڕەگەز چەرکەز بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەرچوبوو، بەشێك لە برادەرانی دیکەش سزای جیاواز جیاوازیان بۆ بڕابۆوە.

لەگەل گەیشتنمان، کارگێڕی بەندیخانە ۷۰۰-۸۰۰ لاپەڕەی لە شێوەی پەرتووکێك لەسەر بەلگەکانی دادگاییکردنی تەلعەت ئایدەمیر و گرووپەکەی بەسەر ئێمە دابەش کرد. ئامانجی کارگێڕی بەندیخانەکە ئەوەبوو تا ڕقمان لێیان ببێتەوە، چونکە بەپێی ئەو بەلگانەی خوێندمانەوە، دادوەر بە تەلعەتی گوتبوو: "بۆچی ئەو کودەتا سەربازییەت کرد؟"، تەلعەت ئایدەمیریش لەناو ئەو هەشت هۆکارەی کە وەك وەڵامێك دابوویەوە دادوەر، لە هەموویان بەهێزتری لەسەر کێشەی کورد بوو. بەپێی ئەو بەلگەی درابووە ئێمە، تەلعەت لە ئیفادەکەی دەلێ: "بەڕێزم، لە

---

[1] تەلعەت ئایدەمیر (۱۹۱۷ – ۱۹٦٤) ئەفسەرێکی سوپای تورکیا بوو دوای بەشداریکردنی لە جەنگی کۆریا، لە نێوان ساڵانی ۱۹٦۲ – ۱۹٦۳ کودەتایەکی سەربازیی کرد، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو و دەستگیرکرا. (وەرگێڕ).

ســەرجەم ئەو حکــوومەتە یەك لە دوای یەکــانەی لە تورکیــا هــاتوونەتە ســەر دەســەڵات، کێشــەی کــورد چارەســەر نەکــراوە. بۆیە، بەنیاز بووین لە ڕەگەوە بنبڕی ئەو پرسە گرنکە بکەیـن کە لەســــەرووی هەمــــوو کێشــــەکانی مەملەکەتەکەمــــانەوەیە". لە فەرهەنگی سەربازیی سوپای کۆماری تورکیا، هەمووما دەزانین "بنبڕکردن" بۆ چ مانایەك بەکار دەهێنـدریت، ئەو وشـە بە مانـای "کۆمەڵکوژی" دێت. بۆ نموونە کۆمەڵکـوژی دژی شۆڕشـەکانی شـێخ سـەعید، ئـاگری، زیـلان، ساسـۆن و دێرسـیم لە مێـژووی بەنێوبانگی تورك! بە "بنبڕکردن" ناوی بردراوە.

لەگەڵ تێپەڕینــی کــات، توانیمــان لەگەڵ تەڵـعەت بەیەکەوە دانیشـین. بەڵام، زۆر بە سـارد و سـوڕی. لەو مـاوەیە یەکێـك لە نەوەی ئیبراهیم هـاکی ئەفەنـدیی نووسـەری (مەعریفەتنـامە)، کە کەسێکی ناڕاست و نزا خوێنێکی کلاوچی بـوو، دەسـتگیرکرا و هێنــدرایە لای ئـێمە. ئەو، هەمــوو ڕۆژێــك دەیگــوت دەبــمە ســەرۆککۆمار و ڕەگــی کــورد لە بنـڕا هەڵدەکێشــم و تورکیـا دەکەمە بەهەشت، ئەو بەردەوام دەهاتە لای تەڵـعەت ئایـدەمیر و بەرامبەر بڕێك پارە دەستی بۆ دەخوێندەوە و فاڵی بۆ دەگـرتەوە، چونکە تەڵعەت دەیویست بزانێ لە سێدارە دەدرێ یان نـا؟ بەڵام فاڵ گـرەوەکە زۆر زۆر عاقـڵ و شـەیتان بـوو، شـتی وای بـاس دەکرد وەك چیرۆکی هەزار و یەك شەوە سەیر بوو.

سـینەمایەکی بچـووك لە بەنـدیخانە هەبـوو، ئـێمە و هەڤـاڵانی تەڵعەت بەرامبەر پەنجا لیـرە هەفتـانە ئەو سـینەمایە تەسـکەمان بە کرێ دەگرت، هەڤاڵانی ئێمەش دەچوون تا سەیری فیلم بـکەن، بەڵام من نەدەچووم. ڕۆژێك برادەران زۆر تکایـان کـرد، منـیش

دڵم نەشکاندن و ڕەگەڵیان کەوتم، سینەماکە لەگەڵ ئەوەی هەر بەقەد ژووریّك دەبوو، بەڵام وەك ڕیّزیّك من و تەڵعەتیان لەسەر دوو کورسیی پیّشەوە دانیشاند.

کاتیّك فیلمەکە دەستی پیّ کرد، زۆر ویّنەی بیزارکەر و ناشرینم بینی، گوتم: "کاك تەڵعەت باشتر ئەوەیە بچینە دواوە، چونکە لیّرە ناتوانین سەیری فیلمەکە بکەین"، ئەویش بە داواکارییەکەم ڕازی بوو. کورسییەکانمان هەڵگرت و چووینە دواوە. کە دانیشتین، کاك تەڵعەت گوتی: "ئەڵڵا، بەڕاستی ئیّرە زۆر خۆشترە". تومەزە سەرۆککۆماری داهاتوومان و زۆردارمان هەموو شەویّك لە پیّشەوە دادەنیشت. ڕۆژیّك دیسان پیّی گوتم: "کاك مووسا ئیّوە بۆ زوو زوو نایەنە سینەما؟" وەڵامم داوە: "کاك تەڵعەت هەم بە هەندیّك کارەوە سەرقاڵم، هەمیش ئەو فیلمانەی دەیهیّننە ئیّرە زۆر فیلمی سادەن" ئەویش گوتی: "نا کاك مووسا، فیلمی زۆر جوانی کۆمەڵایەتیی وەك لەیلا سایار و ئیسماعیل دومبولوو، ئۆزتورك سەرەنگیل پەخش دەکریّ، کە ئەکتەرەکانیان لەسەر ئاستی جیهان ناسراون"، کە ئاوای گوت، منیش بە گوتنەوەی ڕاستەکەی بابەتەکەم داخست، ئیدی بەو شیّوەیە ئاستی ڕۆشنبیریی ئەویشم بۆ دەرکەوت.

هەمەوەندی کەسیّکی بیّعار و هاروهاج بوو، دین و ئیمانی نەبوو، بەڵام کاتیّك ڕەمەزان هات، لەناو دۆڵابەکەی جلوبەرگیّکی سەیری دەرهیّنا و لەبەری کرد. واتدەزانی ئەوە موفتی و شیّخی ئیسلام (زەمبیلی عەلی ئەفەندییە). لە بەندیخانە بەو تورکییەی فیّری ببوو، دەستی بە هاوارکردن کرد، فەرماندەیی بەندیخانە هاتن، کاتیّك جلوبەرگەکەیان بینی، خەریك بوو دەستی ماچکەن، هەمەوەندیش دەستی بە

وتارەکەی کرد: "تورك موسوڵمان نینە، چونکە لەو ڕەمەزانە پیرۆزە ڕۆژوو ناگرن و نوێژی تەراویح ناکەن". ئێمە لە بن سمێڵان پێدەکەنین، بەڵام ڕائیدی بەستەزمان باوەڕی بە قسەکانی ئەو سەر و سیما ئیماندارەی بەرامبەری هێنا، بۆیە هەمەوەندی لە ناخی دڵەوە بووە پێشنوێژی مزگەوت. هیچ کاممان نەدەچووینە نوێژکردن، بەڵام جەماعەتی تەڵعەت ئایدەمیر مزگەوتیان پڕدەکرد. بەو شێوەیە تا ڕەمەزان تەواو بوو، بە سێ ڕۆژی جەژنیشەوە، هەمەوەندی بەربانگ و سحووری لەگەڵ ئەوان خوارد. ڕۆژێك بە هەمەوەندیم گوت: "برا گوناحە تۆ دەستونوێژت نییە، لەشت خاوێن نییە، چۆن دەبێ بەو شێوەیە بچی پێشنوێژی بکەی؟". کەچی ئاوا وەڵامی دامەوە: "تورك کەمیان بە من کردووە! تا من زگم پێیان بسووتێ؟ وازیان لێبێنە هیچ نابێ".

چەند مانگێك ئێمەیان لەوێ هێشتەوە، تا دادگایەك دۆسیەکەمان قبووڵ بکات، بەڵام دواتر زانیمان کە فایلەکانمان چووەتە دادگای تێهەڵچوونەوە و بڕیار دراوە ئێمە لە دادگای پێنجەمی سزا گرانەکانی ئیستانبول دادگایی بکرێین.

ئێمەیان بردە فڕۆکەخانەی ئەتیمەسگوت، دوو دوو کەلەپچەیان لە دەست کردین و ئێمەیان سواری فڕۆکەیەکی کەلوپەل گواستنەوە کرد. کورسی نەبوو تا لەسەری دابنیشین، بەڵام چەند کورسییەکی وەك شوێنی دانیشتنی پارکەکانی لێبوو، ئێمەیان لەسەر ئەوان دانیشاند. چەند ئەفسەرێکیش لەگەڵمان هاتنە ئیستانبووڵ. من و هەمەوەندییان بەیەکەوە بەستبۆوە، لە ڕێگا ئەفسەرێك بە کەلەجانەوە هاتە لامان دانیشت، لێم پرسی: "جەنابی ئەفسەر خێرە ئینشاڵلا؟"، بە ترسەوە: "چی بڵێم کاکە گیان، لەسەر چیاکانی بۆڵووینە ئێستا، دەرەوە تەم و مژە و

بارۆمەتری فڕۆکەکەش تێکچووە، بۆیە کاپتن نازانێ بچێتە کوێ؟". هەممەوەندی لە تەك منەوە بە عەرەبی گوتی: "ئیشغول"، ئەفسەرەکە گوتی: "ئەوە چی دەڵێ؟" منیش وتەکانی ئەفسەرەکەم پێ گوت. هەممەوەندی هاواری کرد: "باولی ژمارە پێنجم بۆ بهێنن، من بارۆمەترێکم پێیە". کەلەپچەکانی دەستیان کردینەوە و هەممەوەندی باولەکەی کردەوە و لەناو قوتوویێك بارۆمەترێکی گەورەی دەرهێنا و دایە دەست ئەفسەرەکە، ئەویش ڕاستەوخۆ بۆ کاپتنەکەی برد، زۆری پێنەچوو ئەفسەرەکە بە دڵخۆشییەوە گەڕاوە: "کاپتن دەڵێ خوا لێتان ڕازی بێ، ئەوە لە بارۆمەترە ئۆرجینالەکەی ئێمە باشترە". دوای ئەوە وەك پاداشتێك دووبارە کەلەپچەیان لە دەست نەکردینەوە.

هەممەوندی بەردەوام بوو لەسەر.ئەوەی ئێمە تووشی سەرسوڕمان بکات. لە فڕۆکەخانەی یەشیلکۆی دابەزین، سواری ئۆتۆمبێل کراین، بەڵام ئۆتۆمبێلەکان هیچ جووڵەیەکیان نەدەکرد، چەندان دەمژمێر تێپەڕی بەڵام ئێمە هەر لەشوێنی خۆمان بووین، تووەمەزە داواکاری گشتیی کۆماری ئێمەی وەرنەدەگرت، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە و ئەوانە لەسەر سوپا هەژمارن. بۆیە، بۆخۆیان چیان دەوێ با ئەوە بکەن. دەوروبەری عەسر، گوتیان: "کوڕینە لە بەندیخانەی سەربازی ئۆرهانییە میوانداریتان دەکەین؛ بۆیە تا ئەنقەرە پرسەکە یەکلایی دەکاتەوە، ئێوە لەوێ دەمێننەوە". لە ڕێڕەو و نووسینگەکانی بەندیخانەی ئۆرهانییە شوێنیان بۆ ئامادە کردین، لەوێش ماوەیەك ماینەوە، دوای چەند ڕۆژێك ئێمەیان بردە بەندیخانەی بەناوبانگی سوڵتان ئەحمەد لە ئیستانبووڵ.

## بەندیخانەکەی سوڵتان ئەحمەد

ئەو بەنـدیخانەیە زۆر تایبەتمەنـدیی خـۆی هەبـوو، یەکێـك لەوانە ئەوەبوو شـوێنەکە لەسـەردەمی سـوڵتان مەحمـوود لەلایەن ئەڵمانەکانەوە دروستکرابوو، لەناویدا کڵێسـا و مـزگەوت هەبـوو، لەناوەوەی قاوشی جیاواز جیاواز بۆ دەستگیرکراوی منداڵ و ژن و سەرسـەری و دەوڵەمەنـد و دز و دەسـتگیرکراوی سیاسـیی تێـدابوو. جـگە لەمـانە، شـوێنێکی تـایبەت و زۆر نایابیشـی بـۆ دەستگیرکراوە نەخۆشەکان تێدابوو. ژووری تایبەتی بۆ پارێزەران هەبوو، جگە لەوەی چەند هۆڵێکی تێدابوو بۆ بینینی بەنـدکراوان کە شوێنی هەزار کەسی تێدا دەبووەوە. بەڕێوەبەری بەندیخانەکە کوردێك بوو ناوی حوسنوو کۆنوکچوو بـوو. ئەو بەناوبـانگترین بەڕێوەبەری بەندیخانە بوو لە تورکیا. بۆ چالاکیی جیاواز جیـاواز کتێبخـانەیەکی دەوڵەمەنـد و مارکێـت و ڕێسـتورانت و شـوێنی چەند چالاکییەکی وەرزشیی وەك یاری بالەشـی لـێ بـوو. جـگە لەمانە قاوەخانە و سەرتاشخانەی خۆی هەبوو. بەندیخانەکە جۆرە پـارەیەکی تـایبەت بەخـۆی هەبـوو بە نـاوی (مـارك). کاتێـك کەسێك دەبردرا ئەوێ، سـەرجەم پارەکـانی لـێ وەردەگیـردرا و لای ژمێریـاری ئەوێ بـۆی هەڵـدەگیردرا. بەرامبـەر ئەوەش بـای پێویسـتی خـۆی مـارکی دەدرایە؟ ئەوسـا پـارەیەکی زۆر کـۆ دەبۆوە و بەو پارەیە کاروبـاری ڕێسـتورانەتەکە بەڕێـوە دەبـردرا. یەکێك لە هەرە هەڵسوکەوتە سەیرەکانی حوسنوو کۆنوکچووی بەڕێوەبەری بەندیخانەکە ئەوەبوو، ئەو دەسـتگیرکراوانەی سـزای لە سێدارەدانیان بـۆ بڕابـۆوە، لە بەنـدیخانەی تاکەکەسـی زینـدان نەدەکـرد. بە بۆچـوونی حوسـنوو ئەو کەسـەی سـزای لە

سێدارەدانی بۆ دەرچووە تا کاتی جێبەجێکردنی سزاکەی، دەبێ بە ئازادی بژی و هیچ جیاوازییەکیشی لەگەڵ زیندانییەکانی دیکە نییە، بۆیە، دەبێ وەکو ئەوانیش سوود لە هەموو خزمەتگوزارییەکان وەربگرێت، وەختێکیش کاتی لە سێدارەدانی هاتبا ئەو کەسەی دەبرد و لە سێدارەی دەدا. ئەو دەمەی ئێمە لەوێ بووین دوو کەس لە سێدارەدران، دوای لە سێدارەدانیش بەڕێوەبەر ئاڵای بەندیخانەکەی بۆ ماوەی هەفتەیەك نیوە هێنایە خوارەوە و بۆ هەفتەیەکیش گوێ لە ڕادیۆ و میوزیك گرتنیشی قەدەغە دەکرد.

پێشتر، لە بەندیخانە سەربازییەکان، بە هەر شێوەیەك بێ دەمانتوانی هەمەوەندی کۆنترۆڵ بکەین، بەڵام لەو شوێنە تازەیەمان کە نزیکەی ۱۷۰۰ بەندکراوی لێبوو، دەستمان بەسەریدا دانەشکا. لەلایەك ئیشی قۆڕ و بێ مەعنای دەکرد، لەلایەکی دیکەش دەیگوت: "من کوردم و پیاوی بارزانیمە"، بۆیە، ئێمەی شەرمەزار کردبوو. بۆچارەسەری ئەو کێشەیە چووینە لای بەڕێوەبەر و شەرحی حاڵی خۆمان کرد: "جەنابی بەڕێوەبەر، هەمەوەندی عەرەبە و هیچ پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە. پێم وابێ ئێوە بەشێکی تایبەتتان هەیە بۆ بیانییەکان، بۆیە تکا دەکەین ئەو لای ئێمە لابەن". بەڕێوەبەر ئێمەی بە دڵ ساردی نەناردەوە و داواکارییەکەمانی قبوولکرد. دوای ماوەیەکی کورت، هەمەوەندییان بردە بەشی بێگانەکان. جگە لەمە بە کوردەکانی دیکەی بەشەکانی دیکەشم ڕاگەیاند تا ئەوە لە بەندیخانە بڵاو بکەنەوە کە هەمەوەندی کورد نییە و هیچ پەیوەندیشی بە ئێمەوە نییە. ئیدی قسەمان لەگەڵ هەمەوەندی نەدەکرد، ئەو هەڤاڵانەی لە ئێمەش نزیك بوون، هەمان مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد، بەو شێوەیە لە ماوەیەکی کەم تەواوی بەندیخانە

و بەشی کارگێڕی زانییان هەمەوەندی هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە.

دوای هەفتەیەك، بینیمان هەمەوەندی یاتاغی لە کۆڵ ناوە و سەربازەکانی بەندیخانە ئەویان داوەتە بەر شەق و پێلەقە و دەیبەنە بەشی دز و تلیاك کێشەکان. تۆمەزە شەو لەپاڵ گەنجێکی هۆڵەندی خەوتووە و دەستدرێژی سێکسیی کردووەتە سەری، بەڵام ئەو قبوولی نەکردووە، بەو شێوەیە ئێمەش لە بەڵای هەمەوەندی ڕزگارمان بوو.

نزیکەی دوای دە ساڵ، کاتێك لە مەیدانی تەقسیم لە ئیستانبووڵ پیاسەم دەکرد، هەمەوەندیم بینی، دەستی لە ملم کرد، بە سەرسامییەوە لێم پرسی: "هەمەوەندی خێرە؟ چۆن توانیت بێیە تورکیا؟". دەستی بردە باخەڵی و پاسەپۆرتێکی دیپلۆماسیی سووریی دەرهێنا و پشتگیری شوێنی کارەکەی پێ پیشاندام، بینیم بە فەرەنسی و عەرەبی لەسەری نووسراوە هەمەوەندی سەرۆکی ئینیستیتوتی پاریس. نازانم ئێستا ماوە یان نا، بەڵام بە گوزارشتی خۆی "خوا هەموو کەسێکی بە خێر و چاکەکار لە شەڕی ئەو بە دوور بگرێ".

### کاردینال ئەملیانووس

کاتێك باسی ئەو یادەوەرییانەم دەکەم، دەمەوێ هەندێکیش باسی بەڕێز کاردینال ئەملیانووس بکەم، کە زۆر کاری گرنگی کردووە. ئەو کاردیناڵە بە ڕەگەز ئەمریکییە، جێگری پاتریارکی ڕووم بوو لە ئیستانبووڵ، بە تۆمەتی ئەوەی دژی گەلی تورك چالاکی نهێنیی کردووە، لە تورکیا دەردەکرا، بۆیە، تا وادەی دیپۆتکردنەوەکەی هێنایانە بەندیخانە. کەسێکی ڕۆشنبیر و قۆز و

بە زەوق و سەلیقە و ڕێك پۆشێکی کارامە بوو. بەڕێوەبەری زیندانەکەمان بانگی کردم و پێیراگەیاندم ئەمیلیانووس لای تاوانبارە خوێڕییەکان دانانێ و بۆ ئەویش شوێنێکی تایبەتی نییە لە بەندیخانە تا لێی بمێنێتەوە، بۆیە، تکای کرد تا چەند ڕۆژێك لای خۆمان شوێنی بۆ بکەینەوە، منیش داواکارییەکەم پەسند کرد. کاردینالەکەمان وەك چۆن چەندان زمانی ئەوروپی دەزانی، بە هەمان شێوە بە تورکییەکی جوان و ڕەوانیش قسەی دەکرد، من و هەڤاڵانمان ڕێزێکی زۆرمان لێنا، ئەویش لای ئێمە زۆر خۆشحاڵ بوو.

بەشێوەیەکی گشتی، کاردینال ئاگاداری ئەو داوایە بوو کە لە پێناویدا خەباتمان دەکرد، بەڵام، لەو ماوەیە لەکاتی گفتوگۆ و دەمەتەقێی ڕۆژانەماندا وردەکاریی خەباتی ڕێبازەکەمان و داوا ڕەواکەمانی بە ورد و درشتی زانی، لەگەڵ زۆربەی بۆچوونەکانیشمان هاوڕابوو؛ پەیمانی ئەوەشی پێداین دوای دەرچوونی لە زیندان و گەڕانەوەی، لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی ئەوروپا و شارەکانی ئەمریکا، بەر لەوەی باسی کێشەکانی خۆی بۆ ڕاگەیاندکاران بکات، باسی کێشەی گەلی کورد دەکات و جیهانی لێ ئاگادار دەکاتەوە. وەك ئەوەی پەیمانی دابوو، بەراستی سۆزی خۆی هێنا جێ، چونکە دوای ماوەیەك بینیمان لە ڕاگەیاندنەکانی تورکیاوە چەندان وتار و ڕاپۆرت بە ناونیشانی ئەو پاپازەی وەهمی دابەشبوونی تورکیا دەکات لە جیهان، نووسران.

دادگایی کردنمان، لە دادگای پێنجی سزا قورسەکانی

ئیستانبووڵ دەستی پێ کرد. سەرۆکی ناوداری دادگاکە تالیب گۆران بوو، بەپێی ئەو دەنگۆیانەی لەسەر ئەو سەرۆك دادگایە هەبوو، کابرا هیچ بریارێکی لە دادگای تێهەڵچوونەوە ڕەتنەکراوەتەوە، ئەو قسانەش تا ڕادەیەکی زۆر ڕاست بوون. تالیب گۆران بە مانای وشە کۆنترۆڵی تەواوی دادگای لەلابوو، چونکە هیچ داواکارێکی گشتی و ئەندامەکانی دیکەی دادگا لە قسەکانی ئەو دەرنەدەچوون. پرسی ئێمەی کردبووە کاری ڕۆژانەی خۆی، چونکە تا کاتێکی درەنگ دادگاییکردنمان بەردەوام دەبوو. نۆبەتی دادگاییکردنی هەر کەسێك هاتبا بریاری ئازادکردنی دەردەکرد، بۆیە، لەماوەی چوار پێنج ڕۆژ هەموومان بریاری ئازادکردنمان دەرچوو، لەماوە چەند ڕۆژێك گشتمان لە زیندان دەرچووین.

ئەگەرچی دەریشچووین، کەچی کێشە و بەڵا هەر یەخەی بەرنەدەداین. باسی ئەوەم کردبوو چەند قوتابییەکی عێراقی و ئێرانیش لەگەڵ ئێمە دەستگیرکرابوون. ئەو هەڤاڵانە لە کۆلێژی جیاواز دەیانخوێند. دەنگۆی ئەوەمان لە کەسێکی خێرخوازی ناو میت بیست کە ئەو قوتابییانە ڕەنگە ڕادەستی حکوومەتی عێراق بکرێنەوە، ئاشکراش دیاربوو گەر ئەوانە ڕادەستی بەغدا بکرێنەوە ڕاستەوخۆ لە سێدارە دەدرێن، چونکە ئەوسا حکوومەتی عێراق و بارزانی لە جەنگێکی بەهێزدا بوون. جیا لەمانە، باوکی ئیبراهیم مام خدر، مام خدر لە تەمەنی هەشتا ساڵی لەلایەن عەرەبەوە لەناوەڕاستی قەسەری گەنم بەستبوویانەوە و سووتاندبوویان، جگە لەوەی عەرەب دەستیان گەیشتبا هەر گوندێکی کورد، بە گەورە و بچووکەوە دەیانسووتاند.

دوای بڵاوبـــوونەوەی ئەو هەواڵانە زۆر تێـــك چـــووین، نەمانــدەزانی چــی بکەیــن، زۆرمــان بیــر کــردەوە و لەگەڵ قونسوڵخانەی سوید پەیوەندییەکی دیپلۆماسیمان بەست و باسی دۆخی ئەو قوتابییانەمـان بـۆ کـردن. خۆشـبەختانە ئەوان پەیمـانی چارەسەرکردنی کێشـەکەیان دا. بڕیـاردرا ئەو هەڤـاڵانە بە نیـازی سەردانیکردنی ئەدرنە سـواری شـەمەندەفەر ببن و لە ئیسـتانبووڵ بڕۆن، بەڵام دوای ئەوەی شەمەندەفەر خاکی تورکیای تێپەڕانـد، لەیەکەم خاڵی وەستانی شەمەندەفەر لەنـاو خـاکی یۆنـان خۆیـان ڕادەســتی پۆلیســی ئەوێ بــکەن[1]، لەوێشــەوە دیپلۆماتکــارانی قونسـوڵخانەی سـوێد ئەوان لە پۆلیسـی یۆنـانی وەردەگرێـت و دەیانبـاتە سـوێد. تەواوی پـلانەکەم وەك خـۆی بەو هەڤـاڵانەم ڕاگەیاند. بەپێـی پلانـی داڕێـژراو دەسـتمان بە جـووڵە کـرد، بەو شێوەیە ئەوان توانیان لە خاکی تورکیـا دەرچـن. ئێستا لە سـوێد دکتـۆر ئیبــراهیم مـام خــدر و ئەنــدازیاری بیناســازی جەمـال عەلەمدار و دکتـۆر سـەعیدی عەبـدولڕەحمان لەو گـرووپە سـەر بەهەشانە بوون.

یادەوەرییەکانی ئەو زوڵمانەی بەرامبەرمـان کـران بە نووسـین تەواو نابێـــت، بەڵام گەر ســـەرنج بـــدەن هەر لە ســـەرەتاوە یـادەوەرییەکی خۆشـم نەبـووە، بەڵام گەر لەبەشـەکانی دیـکە یــادەوەریی ناواشــم نووســی ئەوە دەبــێ وەك بەســەرهاتێکی

---

[1] ئەوسا شەمەندەفەر دوای تێپەڕینی دوو خاڵی وەستان بـە تێپـەڕینی بـەناو خاکی یۆنان دەگەیشتە ئێدرنە.

کۆمیــدی تراژیــدی ســەیری بکەیــن. لە ئەدەبیــاتی تورکیــدا قســەیەکی مــاقول هەیە بــۆ ئەو حــاڵەی ئــێمە (پیکەنیــنم بــە بەستەزمانی حاڵی خۆم دێت!).

## بەشی چوارەم
## ڕووداوەکانی نیوان سەعید ئەلچی و دکتۆر سەعید قرمزی تۆپراك

ساڵی ١٩٦٤، کاتێك لە بەندیخانەی سوڵتان ئەحمەد بووم، فایەق بوجاکی هاوڕێی دێرینم، کە لە ساڵی ١٩٤١ وە یەکدی دەناسین و دۆستی یەکدین، هاتە سەردانم. پرسیاری ئەوەی لێ کردم دەیەوێ بەشێوەیەکی نایاسایی پارتی دیموکراتی کوردستان دروست بکات. لەسەر ئەو بیرۆکەیەی داوای بۆچوونی منی کرد و پرسیاری ئەوەشی لێ کردم لە ئەگەری دروستکردنی پارتێکی ئاوا لەگەڵی بەشدار دەبم یان نا؟ فایەق بوجاك خۆی کارنامەی پارتەکەشی لەگەڵ هێنابوو، دوای خوێندنەوەی لەو چەند خاڵەی خوارەوە بۆچوونی خۆم پێ گوت:

١- نامەوێت لە هیچ پارت و ڕێکخراوێکی نهێنی کاربکەم.

٢- دەکرا کاری ڕێکخستن، بە هەندێك قوربانیدانەوە، بە ئاشکرا بکرێ.

٣- کارنامەکە ڕۆحێکی پارێزگارانەی پێوەی دیار بوو.

نەچوومە ناو ئەو پارتە، بەڵام دۆستایەتیم لەگەڵ فایەقی خۆشەویست بەردەوام بوو. مادەم کاتی هاتووە دەمەوێ یادی هاوڕێیەتی کاك فایەق بکەمەوە، چونکە لە ساڵی ١٩٦٩، ئەزیزی و خۆشەویستیی خۆم لە چاپکردنی فەرهەنگی زمانی (کوردی – تورکی) بۆ ئەو برادەرەم دەربڕی و پەرتووکەکەم پێشکەشی

ئەو کردبوو، تا هیچ نەبێت بتوانم تۆزێك دۆستایەتی خۆمی بۆ بەیان بکەم.

دوای دەرچوونمان لە زیندان، سەعید ئەلچی لە دیاربەکر نیشتەجێ بوو، دواتر چووە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان. کاك فایەق هێرشی کرابووە سەر و شەهید کرا، بۆیە، پارتەکە بەبێ سەرۆك مابۆوە، لێرەش بە پێویستی نازانم بە دوور و درێژی باسی چۆنیەتی کوشتنی فایەق بکەم، چونکە چەند دەستێکی جاهیل و سیاسی یەکیان گرت و ئەویان شەهید کرد.

دوای فایەق، سەعید ئەلچی بووە سەرۆکی پارتەکە، سەعید قرمزی تۆپراك لەگەڵ دکتۆر فایەق سەڤاش بەیەکەوە چوونە لای بارزانی. ئەودەمای بارزانی لە گەرمەی شەڕ دا بوو لەگەڵ فاشیستە عەرەبەکانی عێراق. بارزانی، لە ناوچەی زاخۆ، کامپێکی بە هەموو پێداویستییەکەوە، بۆ سەعید قرمزی تۆپراك و فایەق سەڤاش دروستکرد. ئەو کامپە، هەم نەخۆشخانە، هەمیش وەك ناوەندێکی پێگەیاندن و پەروەردەکردنی کادیری حزبی بوو. زۆر گەنجی کوردی تورکیا و عێراق و سووریا و ئیران لەو کەمپە بە پەروەردەی گەریلایی تێپەر دەبوون. سەرۆکی کامپەکە دکتۆر سەعید قرمزی تۆپراك (شڤان) بوو. شڤان هەم پزیشکیی دەکرد، هەمیش گەریلای پێدەگەیاند، هەمیش چەندان چالاکیی کەلتووری و فەرهەنگیی ڕێکدەخست. لەبەر ئەوەی خەلکی دێرسیم بوو، بۆیە پێشتر شێوەزاری کورمانجیی نەدەزانی، بەڵام کە دوای سێ ساڵ بینیمەوە بەشێوەیەك زمانەکەی باش ببوو، خەریك بوو هەندێك هەڵەی زمانەوانیم بۆ چا بکاتەوە. ئاوا باشیش فێری کورمانجی ببوو، هەر ئەوسا بە هاوبەشی لەگەڵ کامەران بەدرخان، چەندان نووسینی تایبەتیان بڵاو کردەوە.

دکتۆر سەعید قرمزی تۆپراك، ویستی لە تورکیا ڕێکخستنی

حزبی دروست بکات، بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا ڕێی لەو ویستەی دەگرت، ئەگەرچی پێشتر داوای داخستنی ئەو پارتەی کردبوو، تا سەر لە نوێ (KDP) بکاتەوە، بەڵام داواکەی ڕەتکرابۆوە. بەو شێوەیە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نێوانی هەردوو سەعید تا دەهات نا سەعیدتر دەبوو. سەعید قرمزی تۆپراك، سەعید ئەلچیی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە کەسێکی دواکەوتوو و نەزانە و بە دوای بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانییەوەیەتی، سەعید ئەلچیش، سەعید قرمزی تۆپراکی بە سیخوڕی کردن بۆ (CIA) تۆمەتبار دەکرد، تا ئەو ئاستەی دەیگوت (میت و سی ئای ئەی) بە هاوبەشی ئەویان ناردۆتە عێراق تا بارزانی بکوژێت. ساڵی ١٩٦٩ دکتۆر قرمزی تۆپراك (شڤان) لە ئەنقەرە و قەزا و ناحیەکانی ڕێکخستنی پارتەکەی دروستکرد، ڕۆحێکی چەپانەش بەسەر کارنامەی پارتەکەیدا زاڵ بوو.

دوای ئەو ڕووداوە کورتانەی باسمکرد، ساڵی ١٩٧٢ لە لایەن فەرماندەی بەڕێوەبەرایەتی دۆخی لەناکاوی کارگێڕی عورفی دیاربەکر، لە ڕادیۆوە فەرمانی خۆ ڕادەستکردنیان بڵاو کردینەوە، ئێمەش خۆمان ڕادەستکرد. سەعید ئەلچی لە گوندی تاهووتی سەر بە نوسەیبین لەگەڵ گەنجێك بەناوی محەمەدی بەگێ، دەچنە شارۆچکەی زاخۆ لە عێراق. ئەوێ ناوچەیەکی ئازادکراو بوو، لەژێر کۆنترۆڵی عوسمان قازیی نوێنەری بارزانی، لە هەمان کات عوسمان دۆستێکی نزیکی شڤانیش بوو. سەرجەم ئەو نووسینانەی سەعید ئەلچی سەبارەت بە شڤان نووسیبووی هەمووی گەیشتبووە دەست عوسمان، بەڵام ئەو نووسینەکانی نەدەگەیاندە دەست بارزانی، بەڵکو دەیدا دەست شڤان. هەردوو سەعید لای عوسمان بەیەك دەگەن، سەعید ئەلچی داوا دەکات

بچێتە لای بارزانی، شڤانیش دەڵێ: "ئاساییە دەتبەم، بەڵام چەند ڕۆژێك وەرە و کامپەکەم ببینە". شڤان هەست بەوە دەکات سەعید ئەلچی لای بارزانی دژی ئەو قسە دەکات، عوسمان قازیش لەبەر ئەوەی ئاگاداری کێشەکەبوو، بۆیە نایەوێت ئەلچی و شڤان بەیەکەوە بچنە لای بارزانی، بەڵام ئەلچی سوورە لەسەر ئەوەی مەلا مستەفا ببینێت. دواجار هەردووکیان بە ئۆتۆمبێلێك ڕۆیشتن. لە ڕێگا دەمەقاڵێیەکی توند لە نێوانیان دروست دەبێ، لە چۆڵەوانییەك شڤان، ئەلچی و محەمەدێ بەگێ لە ئۆتۆمبێل دێنێتە خوارەوە و دەیانداتە بەر گولە و هەر لەوێش دەیان شارێتەوە. من ئەو ڕووداوانە وەك بیرەوەرییەکم دەنووسم، نەك وەك گەواهیدەرێك کە ڕووداوەکەم بینیبێت. لەبەر ئەوەی چەندان ساڵ هەردووکیانم خۆشویستووە و لەگەڵ هەر دووکیان زۆر ڕۆژی تاڵ و شیرینمان لە شوێنی جیا جیا بەسەر بردووە و لە بەندیخانەش هەر بەیەکەوە بووینە. بۆیە، هەوڵم داوە بزانم ڕووداوەکە چۆنبووە.

کاتێك لە بەندیخانەی سەربازیی دیاربەکر بووم، چەند جارێك خێزانی ئەلچی هاتە لام و پرسیاری هاوسەرەکەی لێ کردم، پێم گوت هیچ شتێك نازانم، چونکە بەراستی ئەوسا هیچم لەبارەیەوە نەدەزانی. لە لێپێچینەوەیەکی دەزگای هەواڵگریی تورکیا دا، سەرۆکی بەشی دیاربەکری ئەو دەزگایە، عەمید فایەقی ئەفسەر لە هێزی ئاسمانی، هەمان پرسیاری لێ کردم، کاتێك بێ ئاگایی خۆم پێڕاگەیاند، ئەو گوتی: "ڕێکخستنەکانمان چوونە گۆڕی ئەلچی و بەگێیان هەڵداوەتەوە و وێنەیان گرتووە"، بۆیە دەزانین ڕووداوەکە چۆن بووە، بەڵام نازانم دواتر ڕووداوەکە لەلایەن میتەوە لە عێراق بڵاوکرایەوە،

یان کەسانی دیکە بەسەرهاتەکەیان بۆ بارزانی باسکردبوو، چونکە دوای زانینی چۆنیەتی ڕوودانی کوشتنەکە، مەلا مستەفا زۆر تووڕە ببوو، بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنی شڤان و گەنجێکی بەناوی قولوپلو چەکۆ دەرکردبوو، دواتریش هەردووکیان درابوونە دادگای شەرعی. دوای ئەوەی هەردووکیان تۆمەتەکەیان بەسەردا ساغ دەبێتەوە، بە هەمان سزا هەردووکیان دەدرێنە بەر گولە و شەهید دەبن.

کورد لە عێراق و سووریا و تورکیا و ئێران، بە تەواوی لە ژیانێکی نا ئازاد و ژێر دەستە دەژیان، بۆیە دەبوو ئەو جووڵانەوە ئازادیخوازانەی ئەوسا بە ناچاری دەست لەناو دەست بەیەکەوە کار بکەن. ئەو ڕووداوە لە خەباتی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد بچووکە، بەڵام پێویستە وانەیەکی گەورەی لێوەربگرین، بەڵام کەسەری گرانم، لە جووڵانەوە جیاوازەکانی دواتریش ڕووداوی لەو شێوەیە لەولا و ئەملا ڕووی دەدا. من بوومە شاهێدی چەندان ڕووداو لە نێو کورد، چونکە کاتی خۆی لەناوچەکەی من ئەو ڕێکخراوە کوردییانە بێ ئەوەی هێزە سەربازییەکانی دوژمن لەناویان بیات، خۆیان دەبوونە هۆکاری لەناوبردنی براکانی خۆیان.

تا ئێستاش ئازار و ناسۆری ئەو ڕووداوەم لە دڵدایە، وەلێ هەموو ئاواتم ئەوەیە ئەو ڕووداوەی بە هەڵە ڕووی دا ببێتە نموونەیەك بۆ لەیەکدی نزیك بوونەوەی کورد، نەك دووبارەکردنەوەی ئەو جۆرە کردەوانە، ئاواتەخوازیشم خزم و کەسوکاری شڤان و ئەلچی و هەموو گەلی کورد، ئەو کارەساتە وەك هەڵەیەکی مێژوویی قبوولبکەن و ئەنجامەکەی

نەهێندرێتەوە ناو خێزان و نەبێتە هۆی ئەوەی ئافات و ڕووداوی گەورەتری لێبکەوێتەوە، چونکە منیش یادەوەری ئەو دوو ڕۆڵەیەم تا مردن لە دڵمدا بە زیندوویی دەهێڵمەوە.

## پارتی کرێکارانی تورکیا و هەڵبژاردنەکانی ١٩٦٥

لە بەشەکانی پێشووتر، ئاماژەم بەوە کردبوو، لە ژیانمدا جگە لە پارتی کرێکارانی تورکیا، نە بە نهێنی نە بە ئاشکرا ئەندامی هیچ پارتێکی دیکە نەبووم، چونکە لە ماوەی ڕابردوو لە ساڵی ١٩٩٠ لە دیدارێکدا، کە گۆڤارێك لەگەڵی ساز کردبووم، ئەوان منیان وەکو ئەندامێکی (TKP) پارتی کۆمۆنیستی تورکیا ناساندبوو، کەچی لە ڕاستیدا من هیچ کات ئەندامی ئەو پارتە نەبوومە. بەڵام، دوای هاتنم بۆ ئیستانبووڵ، لەگەڵ نازم حیکمەت و تەواوی کۆمۆنیستەکانی تورکیا یەکدیمان ناسی و بوومە دۆست و هاوڕێیان. بۆ نموونە، لەگەڵ چەندان کەسایەتیی وەك عەزیز نەسین و بەهیجە بۆران و محەمەد عەلی ئایبار و سەباحەتین عەلی و ڕەها ئیسڤان و ڕەفعەت ئیلگاز و کەمال سولکەر و حیکمەت کڤلجملی و میهری بەلی و سەعدوون ئەرەن و ڕاسح ئیلەر و عەدنان جەمگیل و نیهات سارگن و چەندان کەسایەتی دیکە یەکدیمان ناسی. بەڵام بەردەوام لەگەڵ ئەو دۆستانە بۆچوونی جیاوازمان هەبوو. بە دڵنیاییشەوە ئەو جیاوازی بیر و بۆچوونەشمان لەسەر پرسی گەلی کورد بوو. ئەوسا لە تورکیا، کۆمۆنیست بوون دەرد و کێشەیەکی گەورەی ئەو کەسانەی پارێزگاریان لەو بۆچوونە دەکرد، جا کێشەی کوردیشی بهاتبا سەر، کەس لە ژێر باری بەرپرسیاریەتییەکەی دەرنەدەچوو. چونکە ئەوان پێیانوابوو گەر ئەو بۆچوونی کۆمۆنیستییە لە تورکیا سەربکەوێ، وڵاتەکە دەبێتە خاوەن

سیستەمێکی سۆسیالیست، لە ئەگەرێکی ئاوادا دەوڵەتێکی لەو شێوەیە مافەکانی گەلی کوردیش دەدات، بەڵام من پێموابوو کێشەی کورد، کێشەی هەرە سەرەکیی ئەنقەرەیە، بۆیە گەر لە سەرەتاوە ئەو پرسە چارەسەر نەکرێ، ئەوە هیچ کێشەیەکی دیکە مەحاڵە بگاتە ئەنجام، بەو پێیەش بە شێوەیەکی سروشتی ناتوانن هێزی دینامیکی نەتەوەیی گەلی کورد بخەنە پاڵ هێزی خۆیان، بۆیە زۆر جار بە گاڵتەکردنەوە دەمگوت: "گەر لە سەرەتاوە مافی گەلی کورد نەدەن، دەبێ سەت ساڵ لە مەیخانەکانی ئیستانبووڵ هەر باسی جوانی بیرۆکەی کۆمەنیستی بکەن".

مافی خۆتانە گەر لێم بپرسن گەر بۆچوونتان لەیەك جیاواز بووە و هەمان کات ئەوان دونیا بینییەکانی تۆیان وەك بیرۆکەی خۆیان نەدەبینی، ئەی بۆچی دۆستایەتیت لەگەڵیان درێژە پێدا؟ لە وەڵامی ئەو پرسیارەش دەمەوێ بڵێم؛ جگە لەوانە، سەرجەم پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی دیکەی تورکیا خاوەن بیر و بۆچوونێکی فاشیستی دوژمنکارانە بوون بەرامبەر بە گەلی کورد، چونکە تورانییەکان و کەمالیستەکان خاوەن هەمان بیرۆکەی سیاسی بوون. هیچ نەبێ ئەوان بە درۆ بێ یان ڕاستی، خۆیان دەڵێن لە داهاتوو گەر سەربکەوین، مافی گەلی کورد دەدەین، یانی هەر هیچ نەبێ دانیان بەو مافانە دەنا، کە دەسەڵاتی ئێستا لە ژێر پێی نابوو.

خەڵکی دەڵێن "باش و خراپ تۆ کوڕی ئاغایەکی خاوەن زەویوزاری، لە ماردین شێخ هەیە هاوکاری لە حکوومەت وەردەگرێ و مێشکی خەڵك دەشواتەوە، جگە لەوەی تۆ لە شوێنێکی ناودار بە ئەشکەوتیش گەورە بووی، کەچێ سەرەڕای هەموو ئەوانە بوویتە کورد پەروەر، بەڵام بۆچی نەبوویە کورد

پەروەرێکی پارێزگاری ڕاسترەو، لە بری ئەوە بوویتە کوردێکی چەپ؟". بەو شێوەیە دەتوانم وەڵامی ئەو پرسیارەش بدەمەوە. ساڵی ١٩٦٢ لە گۆڤاری (یۆن و بارش دونیاسی) زۆر هاوڕێی کورد پەروەرمان بەهۆی چالاکییەکانیانەوە بوونە هۆی ئەوەی جەنەڕاڵ زیا سەلشك سەرۆکی ئەوسای میت، وتارێك بۆ گۆڤاری (یۆن) بنێرێت تا بڵاو بکرێتەوە. ئەو مەبەستی بوو لە ڕێگەیەوە تورکە چەپەکان بترسێنێت و ڕێگایەکیان پێ پیشان بدات. سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی تورکیا لە نووسینەکەیدا بۆچوونی حکوومەت و دەسەڵاتی بەوە بەیان کردبوو، تا چەپە تورکەکان هیچ سوودێك لەو کوردە چەپانە وەرنەگرن ئەو هەموو کورد وەك کۆمۆنیست دەبینێت.

دەتوانم بڵێم کوردپەروەرییەکی بە ناموس و شەرەفمەندانە پاڵی پێوەنام تا ببمە چەپ، چونکە تا ئێستاشی لەگەڵدابێ،مەگەر گەلانی ژێر دەستە تەنیا لە ڕێگای سۆسیالیزمەوە بتوانن مافی خۆیان بەدەست بهێنن و ئازاد بن. ئەمڕۆ کوردستان بە پەیکەرێکی مێژوویی دەچێت، وەك پەیکەری ئاپۆلۆن، بۆیە سەری لە مۆزەخانەیەکی ئەڵمانی و بەشێکی دیکەی جەستەی لە مۆزەخانەی تورکیا و بەشەکانی دیکەشی لە مۆزەخانەکانی دیکەی وڵاتانی جیهانن. چەند سەیرە، دەبینین کوردستان مۆزەخانەی چوار وڵاتی دەوڵەمەند کردووە.

هەندێك هۆکاری دیکە هەن، کە کاریگەری لەسەر بیروبۆچوونی سیاسی و ئەخلاقیی مرۆڤ دروست دەکەن. لە ناوچەکەی خۆمان، تەمەنی منداڵیم لەناو زوڵم و زۆرداری و خوێن و وەحشیەت تێپەڕی، لە کاتێکدا ئەوسا لە ئەورووپا ڕێکخراوی پاراستنی مافی ئاژەڵان هەبوو، بەشێوەیەك گەر خاوەنی هەر ئەسپێك بارێکی زۆر لە ئاژەڵەکەی بار بکات، ئەوە

خاوەنەکەیـان دەدا دادگـا و سـزایان دەدا، بەڵام کـورد، لای دەوڵەتی تورکیاوە هێندەی ئەو ئاژەڵانەشـی ڕێـز و مـافی نەبـوو، گەرچـی ئێسـتاش هەر نییەتـی. سـەیرکەن چەنـد شـتێکی نـاخ سوتێنەر بوو ئەوسا کە ناویان لە پرۆسەی کـورد کوشـتن نـابوو (خـاوێنکردنەوە)، ئەو کـارەش بە شـێوەیەکی بەربـڵاو و ئاشـکرا دەکـرا، بە شـێوەیەك، ئیـدی کـوردیش ئەوەیـان وەك شـتێکی ئاسـایی و سرووشـتی دەبینـی، چـونکە وایانـدەزانی ئەرکـی حکوومەتی ئەنقەرە کورد کوشتنە. ناحەقیـان نەبـوو لەبەر ئەوەی کورد، جگە لە کوشتن و زوڵم وزۆر، هیچ شـتێکی دیکەیـان لە حکوومەت نەبینـی بـوو. مـن ئەوانەم لە یادەوەرییەکانی منـداڵیم باسکردبوو، بۆیە، وتەیەکی بەر لە پەنجا ساڵی مەهاتمـا گانـدی وەك یـادەوەری و ڕێـبەر لێـرە دووبـارە دەنووسـمەوە: لە سـاڵی ١٩٤٧ هیندسـتان گەیشـتە سـەربەخۆیی خـۆی، غانـدی لە قوتابخانەیەك دەڵێ: "گەنجینە ئێوە لە ئێمە بە بەخت ترن، چونکە ئیـدی لەنـاو هەوایەکـی شـەڕەفمەندانە گەورە دەبـن"، بەڵام مـن لەناو ئەو هەوایە گەورە بووم کە لەسەرەوە باسـمکرد، بـۆیە گەر نەبوومایەتە چەپ ببوما چی؟!.

سـاڵانی ١٩٣٧، ١٩٥٩، ١٩٦٣، دوای تێپەڕینـی چەنـدان ڕووداوی جیـاواز، بینیمـان لە تورکیـا ئەهـا خەریـکە پـارتێکی چەپ، واتـا پـارتی کرێکـاران دادەمەزرێ. پەیـڕەوی پـارتەکەم خوێندەوە و بۆ ئەو سـەردەمە بە پەیڕەوێکـی بـێ زیـانم زانـی و بـوومە ئەنـدامی پارتەکـە، کە ناوەنـدی سـەرەکیی ئەوسـای لە ئیستانبووڵ بوو. سەرۆکی پارتەکە کەسـێك بـوو بە نـاوی عەلـی ئایبار، کە لەسـەردەمی خوێنـدکاریمەوە ڕێـزی زۆرم لێگرتـووە، خۆشـی خـاوەنی زنجیـرە گۆڤـاری (حـوریەت) بـوو. بەشـی ڕێکخسـتنی پـارتەکە لای بـاهیچە بـۆران و سـەعدوون ئـرەن و

چەنـد هـاوڕێیەکی دیـکەی ناسـراو بـوو. ئەم حـزبە تـازە وەك پەیمانگـایەك بـوو، چـونکە خۆمـان ئەنـدامەکانیمان پەروەردە دەکرد. چەند ڕۆژێکـی دیـاری کـراوی هەفتە، لەسـەر پـرس و بـابەتی جیـاواز کـۆڕ و سـمینارمان ڕێکدەخسـت. مـن بەرپرسیاریەتی بابەتی کێشەی کوردم لە ئەستۆ گرتبوو. عەلـی ئایبار و باهیجە بۆران و مامۆستاکانی دیکەمان سمینارەکانیان بە دڵ بـوو، ئیـدی تـا هەڵبژاردنەکـانی سـاڵی ١٩٦٥ بەو شـێوەیە بەردەوام بووین.

یەکێك لە یاساکانی ئەوسای هەڵبژاردن (میللی باقیە) بـوو. بەپێـی ئەو یاسـایە، هەر پـارتێکی سیاسـی بە جیـاوازیی چەنـد دەنگێـك دەیتـوانی بەسـەر ڕکابەرەکەیـدا سـەربکەوێت و بچێتە پەرلەمـان. واتـا بەپێـی ئەو یاسـایە، هەر پارتێـك سـەرجەم ئەو دەنگانەی بۆ کۆ دەکراوە کە لە تورکیـا بەدەسـتی هێنـاوە. واتە، گەر پەرلەمانتارێـك لە ڕێـژەی پێویسـت دەنگـی زیـاتری هێنابـا، ئەوە دەنگەکانی دیکەی بۆ ئەو بەر بژێرەی دوای خۆی دەچـوو کە دەنگی پێویستی نەهێنـابوو. بەو شـێوەیە، بەربژێـری دووەم بە دەنگـــی مـــاوەی بەربژێـــری یەکەم دەچـــووە پەرلەمـــان و ئەو بەربژێـــرانەی نەشکەیشـــتبوونە ڕێـــژەی یاســـایی دیـــاریکراو، دەنگەکانیـان بـۆ ئەو بەربژێـرانە دەبـوو کە دەنگـی پێویسـتیان نەهێنـابوو، تـا بە دەنگـی ئەوان ئەو ڕێـژە یاسـاییە تەواو بـکەن و بچنە پەرلەمان. ڕەنگە ئەو قسەیەم بەلاتانەوە سەیر بێـت، بەڵام لە ڕاسـتیدا مـن نەمدەویسـت بـبمە ئەنـدامی پەرلەمـانی وڵاتێکـی فاشیست، بەڵام، ڕۆژێك تاریق زیا ئەکنجی و نیهـات سـەرگن و چەنـــد هـــاوڕێیەکی دیـــکەی حـــزب هـــاتنە لام، لەگەڵ ڕەتکردنەوەیەکی توندی داواکەیان، بەڵام وازیان نەهێنـاو سـوور بوون لەسەر ئەوەی لەو هەڵبژاردنە ببمە سەرۆکی لیستی پـارتەکە

لە مێردین. تازە لە بەندیخانە ئازاد ببووم و هیچ پارەم نەبوو، قبووڵم نەدەکرد پارە لە هیچ کەسێکیش وەربگرم. لەو سەر و بەندە، شانۆنامەی (برینی ڕەش)م لە سوێد وەرگێڕابووە سەر زمانی ئەو وڵاتە و وێنەکێشێکیش لە ژێر کاریگەریی ئەو وێنانەی لە شانۆنامەکەمدا نووسیبووم، سوودی وەرگرتبوو و چەند تابلۆیەکی کێشابوو، وەك لە پێشووتریش باسمکرد لە ڕێگای شەهاب باڵجی ئۆغلوو نزیکەی سێ هەزار و پێنجسەت لیرەی بۆ ناردبووم، منیش بەو برە پارەیە چوومە ناو بانگەشەی هەڵبژاردن. دوو مانگ زووتر لە وادەی دیاری کراو چوومە نوسەیبین، لە وێستگەی شەمەندەفەر خەڵك بە كۆمەڵ هاتنە پێشوازیم، لە ڕاستیدا زۆر جار ڕەخنەم لەو جۆرە پێشوازییانە گرتبوو، چونکە هیچ خۆشیم لێی نەدەهات و بە کاری کەسانی بورژوازیم دەزانی، ئاخر زۆربەی پارتەکان لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردن ئەو کارەیان وەکو نمایشێکی خۆ دەرخستن زۆر دووبارە دەکردەوە. کاتێ سەرانی دەوڵەت لە ئەنقەرەوە دەهاتنە ئیستانبووڵ، من بێزم لەو مەراسیمانەی پێشوازیکردنیش دەبۆوە کە لە گاری حەیدەر پاشا بۆیان ڕێکدەخرا. ئەوەی منیش لە نوسەیبین بەهەمان مەراسیم دەچوو، بۆیە، ڕقم لە خوێنی خۆم دەبۆوە کاتێك خۆم وا دەبینی. ئیدی منیان لەسەر شانی خۆیان دانا و بە چەپڵە و هەلهەلە لێدانەوە چووینەوە لادێکەی خۆمان، ئیدی لەوێوە دەستم بە کاری بانگەشەی هەڵبژاردن کرد.

بەر لە من، وایان لە خەڵکی گەیاندبوو پارتی کرێکارانی تورکیا پارتێکی کۆمۆنیستی خراپە. بەڵام، خەڵکی ناوچەکە کە منیان وەکو بەربژێرێك لەناو ئەو پارتە بینی، لەبەر نازناوی خێزانیمان سەیریان پێهات، کەچی تێمگەیاندن کە خەباتی نەتەوەییمان لە ڕێگای پارتی کرێکارانی تورکیاوە جێبەجێ

دەکەین. لە ڕێگەی وەرگێڕیشەوە قسەم لەگەڵ هاوشارییان و هاوگوندییان و خزم و کەسوکارەکانیشم نەدەکرد، چونکە هەموو وتارەکانم بە کوردی دەدا و بە کوردیش قسەم لەگەڵ دەنگدەران دەکرد. کارەکان بە ڕێگایەکی ئومێد بەخش دەچوونە پێش، بەشێوەیەك ماوەیەکی زۆر بەر لە هەڵبژاردن پارێزگاری مێردین پیرۆزبایی بوونە پەرلەمنتاری لێ کردم. ڕۆژێك زۆر بەپەلە لەلایەن ڕێکخستنەکانی پارتی کرێکارانی تورکیای داربەکرەوە نامەیەکم بەدەست گەیشت و داوایان لێ کردم بە زووترین کات سەردانیان بکەم. سەرۆکی ڕێکخستنەکانی پارتی کرێکارانی تورکیای داربەکر، تارق زیا ئەکنجی بوو. چوومە بارەگای حزب و خەڵك بە چەپڵە ڕێزان پێشوازییان لێ کردم. تارق لە دەموچاویدا دیار بوو زۆر تێکچووە، داوای کرد هەردووکمان بەیەکەوە چەند قسەیەك بکەین: "کاك مووسا لەگەڵ ئەوەی ئێمە گوتمان لە مێردین هەڵبژاردن بۆ هەڵبژاردنی بەربژێر ناکەین و تۆ دەکەینە سەرۆکی لیست، بەڵام حزب داوای کردووە هەڵبژاردنی پێشوەختە بکرێ". ئەوسا لە پارێزگای مێردین ڕێکخستنەکانی حزب تەنیا لە ناوچەی دێریك هەبوو، بۆیە ئەوانیان ڕازی کردبوو کە دەنگ بدەنە من. پرسیارم کرد: "باشە لەگەڵ کێ دەکەومە پێشبڕکێ بۆ هەلبژاردنی پێشوەختە؟" کاك تاریق لە وەڵامدا گوتی: "تۆ لەگەڵ جانیب یلدرم و چەند هەژار و نەدارێك ڕکابەری دەکەی". کە گوێم لەو وەڵامە بوو شێت و هار بووم، بەڵام تارق درێژەی پێدا: "ئەورۆ دوا ڕۆژە، بەڵام تا بەیانی کاتت هەیە، تۆش برۆ لە نوسەیبین و جزیرێ ڕێکخستنێکی بیست کەسی دروست بکە، چونکە لە هەڵبژاردنی پێشوەختە جانیب سەرناکەوێ و تۆ براوە دەبی". من زیاتر سەرم گەرم بوو و پێم ڕاگەیاند: "من هیچ

بیرۆکەیەکی ئاوام نەبوو، تۆ هاتی و داوات لێ کردم خۆم هەڵبژێرم، جانیب هەڤاڵێکی زۆر خۆشەویست و ڕاستگۆی ٣٠ ساڵەمە، من چۆن دەچم بە خەڵك بڵێم دەنگ بە جانیب مەدەن و ئەو کەسێکی باش نییە، تا دەنگ بە من بدەن". زۆر بە توندی ئەو بۆچوونەم ڕەتکردەوە. بەیانی ڕۆژی دواتر، هەر زوو تەلەگرافێکم بۆ کۆمسیۆنی هەڵبژاردنەکان و پارێزگاری مێردین نارد و پێمراگەیاندن من وەکو بەربژێرێکی پارتی کرێکارانی تورکیا نا، بەڵکو وەکو بەربژێرێکی سەربەخۆ بەشداریی هەڵبژاردنەکان دەکەم.

خزمەکانم ئۆتۆمبێلێکی جێبیان بە دیاری دامێ، بەو ئومێدەی گەر لە داهاتوو پارەم هاتە دەست پارەکەیان بدەمەوە. لادێ بە لادێ دەستمان بە گەڕان کرد و خەڵك کاردانەوەیەکی باشیان هەبوو. دۆخی جانیبیش هیچ بە ئازار نەبوو، چونکە بەپێی ئەوەی باسیان دەکرد، دکتۆر تارق زیا ئەکنجی، بۆ ئەوەی جانب لە دیاربەکر لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، ئەو سیناریۆیەی دانابوو. هەڵبژاردن کرا، بەڵام بەردەوام نزیکەی بیست ئۆتۆمبێلی میت و ئاسایش بە دوامدا دەسووڕانەوە. بچووباما هەر شوێنێك، ئەوان لە دوای من دەچوونەوە شوێنەکە و هەڕەشەیان لە خەڵك دەکرد گەر دەنگ بدەنە من، زەرەر و زیانێکی زۆریان لێ دەکەوێ. لە مەزبەتەکانی هەڵبژاردنی ١٩٦٥ ژمارەکان دەریانخست، هیچ بەربژێرێکی پارتی کرێکارانی تورکیا هێندەی من لە هیچ شوێنێکی تورکیادا دەنگی نەهێنابوو. لە هەندێك شوێن وەك ئەو یاسایەی لەسەرەوە باسمکرد بە ناوی (میللی باقیە) هەندێك بەربژێر بە سێ چوار هەزار دەنگ بوونە پەرلەمانتار، بەڵام من دە هەزار دەنگم هێنا، لەگەڵ ئەوەی چوار هەزار دەنگیشم ڕەتکرایەوە، بۆیە گەر پارتی کرێکارانی تورکیا ئەو یارییەی

لەگەڵ من نەکردبا، جگە لەوەی خۆم دەبوومە پەرلەمانتار، لە سایەی دەنگە زیادەکانیشم یەك دوو پەرلەمنتاری دیکەشیان دەردەچوو.

لەناوەڕاستی بانگەشەی هەڵبژاردن دادگای هێزی ئاسمانی ئەنقەرە بڕیاری تاوانبار کردنی منی ڕاگەیاند و سزای ڕاگواستنیشمی بۆ چەنەقەلە بڵاو کردەوە. میدیای تورکیش پروپاگەندەیەکی فراوانیان دژی من دەستپێکرد، بە تۆمەتی ئەوەی لە سنووری عێراق، لە کاتی پشکنینی پێشمەرگەکانی بارزانی بە کوردی پێم گوتوون: "پێشمەرگەینە سلاوتان لێبێت"، ئەوانیش پێیان گوتووم: "ساغ بی". گوایە فەرماندەی ئەو پێشمەرگانەش گوتوویەتی: "لە ژێر فەرمانی جەنابتانین". بۆیە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٥ مان بەو شێوەیە تێپەڕاند، بەڵام دیسان پەیوەندییەکانی خۆم لەگەڵ پارتی کرێکارانی تورکیا نەپچڕاند و تا ساڵی ١٩٧١، کە دەستگیر کرام، ئەو پەیوەندییەم هەر بەردەوام بوو.

### گۆڤاری ڕۆژهەڵات (دۆغوو)

لەمێژ نەبوو، دوای ڕاگواستنم بۆ چەنەقەلە، گەڕابوومەوە ئیستانبووڵ. لەسەر نووسینی شانۆنامەی (برینا ڕەش)، کە بە کوردی بڵاو ببۆوە، بەردەوام لە ڕێی دادگا بووم، پەیوەندیشیم لەگەڵ پارتی کریکارانی تورکیا هەبوو. هەموو ڕۆژێکیش گەنجە چەپە تورك و کوردەکان دەهاتنەماڵەکەم. سەبارەت بە ماڵەکەمان، لە ڕاپۆرتیکی نهێنیی میتدا هاتبوو: "ماڵی مووسا عەنتەر وەك قونسوڵخانەی کوردستانە لە ئیستانبووڵ". لە ئەوروپا و ئەمریکا و پەیمانگای نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات و پەیمانگای کوردی ئەریڤان زوو زوو پەرتووك و بڵاوکراوەم بۆ دەهات، بە

کورتی ماڵەکەم لە شەقامی سوعادیە ئەمین عەلی پاشا، کە ژمارە ١٠ بوو، ئاسایشی زۆر بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو.

راستییەکەی، هیچ نیەتێکی خراپم بەرامبەر تورکیا نەبوو! بەڵام هاتنی یلماز گونەیی و حوسێن جەواهیر و عومەر ئایینا و دەنیز گەزمیش بۆ ماڵەکەم، حکوومەتی زۆر نارەحەت کردبوو. لەو سەر و بەندە، گەنجێك هاتە لام، ناوی محەممەد گونەش شاهین بوو، ئەو بە بنەچە خەڵکی دێرسیمە و دوای کۆمەڵکوژی دێرسیمیش ماڵباتەکەی ڕاگوێزراون و خۆشی لە مێرسین گەورە بوو، گوایە، ئەگەر من بە نووسینی وتار هاوکاریی بکەم، ئەویش مانگانە، سەبارەت بە خەباتی کورد، گۆڤارێکی زانستی بڵاو دەکاتەوە. منیش پێمڕاگەیاند گەر گۆڤارێکی زانستی چەپ دەرکات، منیش بە داواکارییەکەی ڕازی دەبم. لەبەر ئەوەی هەردووکمان هەمان نیەتمان هەبوو، بۆیە لەسەر کارەکە ڕێککەوتین.

ژمارەی یەکەمی لە ١-١٢-١٩٦٩ بڵاوکرایەوە، ئەوکات، میهری بەللی، لەسەر پێشکەشکردنی کۆنفرانسێك لە کۆلێژی زانستی ڕامیاری ئەنقەرە بە ناونیشانی (ڕاستییەکانی گەل) دەستگیرکرابوو. ئێمەش وتارەکانی ناو کۆنفرانسەکەیمان لە گۆڤارەکەمان بڵاوکردەوە، دەمەوێ لێرەش یەکەم پەرەگرافی ئەو نووسینەتان بۆ بنووسمەوە:

"ئایا لەگەڵ هاوێشتنی هەنگاوی شۆڕشگێڕانە بۆ پێشکەوتنێکی دەستە جەمعی نەتەوەیی لە تورکیا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دەوڵەت، دۆخی گرووپ و نەتەوەکانی ناو تورکیا چی لێدێت؟ بە تایبەتی چۆن ڕێگا چارەیەك دەدۆزرێتەوە بۆ چارەسەری پرسی کورد؟". نووسینەکە بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا دەگەڕا، لەگەڵ کورتکردنەوەی مێژووی بەرخودانی

نەتەوەیی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەر لە شۆڕشی نەهری لە ساڵی ١٨٨٨ تا شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلا. بۆ هەمان ژمارە، وتارێکم لە ڕاسیح نووری ئیلەریش وەرگرت لەژێر ناونیشانی (بۆچی ناوچە کوردییەکان پشتگوێ دەخرێن؟).

خۆشم لە ژێر ناونیشانی (دەربارەی زمانی کوردی) وتارێکم نووسی، لە داهاتوودا ئەو وتارەشم لەو پەرتووکە بڵاودەکەمەوە کە بە نیازی چاپکردنیم. لەگەڵ ئەوەی گۆڤارەکەمان لاواز بوو، بەڵام پڕ وزە بوو، ئەو ژمارانەی بڵاومان دەکردەوە، هەر زوو هیچی لێ نەدەماوە. دەمەوێ لێرە ئاماژە بەوەش بکەم تا دەرکردنی بەرواری ئەو گۆڤارە هیچ نووسەرێکی چەپی توورکی دەربارەی کێشەی کورد قەڵەمیان باش بەدەستەوە نەگرتبوو، بەڵام بۆیەکەمجار ئەوە لە گۆڤاری ڕۆژهەڵات ڕووی دا.

لە ژمارە دووی گۆڤارەکە، چارەسەرێکی لینینیزمان بۆ کێشەی کورد بڵاوکردەوە، لەگەڵ ئەو نووسینە پۆترێتێکی ئەویشمان دانا: "لینینی قارەمانی شۆرشگێڕ و مامۆستای گەورە و دامەزرێنەری ڕیکخراوی پارتی کۆمۆنیستی، لە دونیادا بۆ یەکەمجار لە پێناو نەهێشتنی چەوسانەوە و زوڵمکردن دەوڵەتێکی سۆسیالیستیی دامەزراند و کۆتایی بەو نا یەکسانییە هێنا و بووە پێشەوای شۆڕشی پرۆلیتاریا لە ڕووسیا".

لە تورکیا، بۆ یەکەمجار لەو گۆڤارەوە بە تیۆرێکی سۆسیالیستییانە، شەن و کەوی کێشەی کوردمان کرد. بۆیە، لەیەك کاتدا هەم سوپاس و پێزانینێکی زۆری چەپە کورد و تورکەکانمان بۆ دەهات، هەمیش نامەی دەستخۆشی و بەردەوامیمان لە کوردستانەوە دەگەیشتە دەست، کەچی حکوومەت، تەنیا لەبەر ئەوەی لەسەر بەرگی گۆڤارەکەمان

نووسیبوومان "بژی برایەتی کورد و تورك"،خۆی لە کاردانەوەی بەرامبەرمان نەگنخاند. بۆیە، لە مانگی یەك و دوای دەرچوونی تەنیا دوو ژمارە، بڕیاری داخستنی گۆڤارەکەمان درا و گونەش شاهیناری بەڕێوەبەری نووسینمان دەستگیرکرا. ماوەیەکی کەم دوای ئەو ڕووداوە، بە بەهانەی جوولانەوەی کرێکاران لە ئیستانبوول، منیش دەستگیرکرام و گواسترامەوە ئەنقەرە. دوای من، پارێزەر جانیب یلدرمی بەڕێوەبەری ڕێکخستنی پارتی کرێکارانی تورکیا لە دیاربەکر و دکتۆر تارق زیا ئەکینجیش، دوای دەستگیرکردنیان، هێندرانە هەمان شوێن.

### زیندانیکردنەکەی ساڵی ١٩٧٠

من لە ئیستانبووڵ و دوو هاوڕێشم لە دیاربەکرەوە، هێنرراینە ئەنقەرە و دراینە دادگای دووی سزا قورسەکانی ئەو شارە. ئاشکرا بوو کە داواکاری گشتی ویستێکی کلاسیکی هەبوو بۆ لە سێدارەدانی کوردان، بۆیە، داوایان دەکرد گیانمان بکێشرێ. زیندانییەکانی ئەوێ ڕێزێکی زۆریان لێگرتین، لەبەر ئەوەی کاتی گەیشتنیشمان شەو بوو، بۆیە تا شوێنێکمان بۆدەکەنەوە، ئەو شەوە خۆیان خستە پاڵ یەکدی و سێ قەرەوێڵەیان داینێ. دەستگیرکراوەکانی قاوشەکەمان تاوانباری ئاسایی بوون. بەیانییەکەی چووینە ناو باخچە، حوسێن جەواهیر منی بینی و هاتە لام و دەستی لە مل کردم و یەکدیمان ماچ کرد. ئەو لەگەڵ دوازدە هاوڕێی گەنجی بەندکرابوون. پرسیاری ئەوەی لێ کردم حەزدەکەم چ بخۆم؟ بە "بەخوا نازانم" وەڵامم داوە، لەسەر تەکلیفەکەی بەردەوام بوو: "هیچ شتێکی ئامادەکراومان نییە کاکۆ، بەڵام چیمان هەبوو بەیەکەوە دەیخۆین، گەر زۆریش بمێننەوە، ئێوەش دەبەینە قاوشەکەی لای خۆمان". ژەمی فراڤین و شیڤمان بەیەکەوە خوارد، بەڵام ئەو گەنجانە خواردنەکانی

بەندیخانەیان بە دڵ نەبوو، بۆیە، دوای هاتنی خواردنەکان ترش و خوێ و بەهاراتیان پێدا دەکرد تا تۆزێك چێشتەکان تامیان هەبێ، لە ڕێستورانتی بەندیخانەکەش هەندێك خواردنی وەك شێخ مەحشی و کفتە و هەندێك شیرینیان دەهێنا و هەموویمان بەیەکەوە دەخوارد. چەند ڕۆژێك ئاوا بەردەوام بووین، ڕۆژێك بە حوسێنم گوت: "برا گیان ئێوە قوتابیینە و ئەو خواردنانەش بە پارە دەکڕن، لە کاتیکدا ئێمە هەر سێکمان هەبوونین، بۆچی پارە لە ئێمەش وەرناگرن؟". حوسێن دڵی بەو قسانەم خۆش بوو، بۆیە بە شەرمێونی و زەردەخەنەوە گوتی: "جا کاکۆ وەڵڵا پارەشمان هەر بای یەك ڕۆژی دیکە مابوو، بۆیە نەماندەزانی چ بکەین"، دوای ئەو قسانە، بڕێك پارەم لە تاریق و جانیب وەرگرت و خۆشم هەندێکم خستە سەری و دامە حوسێن.

لە زانکۆی تەکنیکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، پانێلێك بۆ دەنیز گەزمیش ڕێك خرابوو، پێش بەڕێوەبردنی پانێلەکە، داوای بۆچوونی ئێمەیان کردبوو لەسەر باسکردنی پرسی کورد. من و حوسێن بەیەکەوە نووسینێکمان ئامادە کرد و لە پانێلەکە خوێندرایەوە و کاردانەوەیەکی چاکیشی لەلایەن ئامادەبووانەوە لێ کەوتبۆوە.

لەو دەستگیرکردنەمدا، یەك دوو بەسەرهاتی خۆشم هەیە و دەمەوێ لێرە باسیان بکەم.

ئەو شەوەی گەیشتینە بەندیخانە، بەیانییە زووەکەی، تاشتیان لەناو سینییەکی گەورە بۆ هێنایین، پرسیم کێ ناردوویەتی؟ ئەو گەنجەی تاشتیەکەی هێنابوو زۆر لەسەرەخۆ و بەشێوەیەکی فەرمی: "بەڕێزم مام دەرەبەگ بۆی ناردووی"، تووەمزە دواتر زانیم کەسێکی خەڵکی ناوچەی لیجەی دیاربەکر ئەو دیارییەی بۆ ئێمە ناردبوو.

بەڕێوەبەری بەندیخانەکەمان کوردێکی خەڵکی موش بوو،

بەندکراوەکان زۆر لێی دەترسان، بەڵام ڕۆژێك دوای چوونە ئەوێمان، لە بڵندگۆکانی زیندانەکەوە گۆرانی کوردی لێدرا، بەندکراوەکان گوتیان تا ئێستا شتی وا لێرە قەت ڕووی نەداوە، هەبێ و نەبێ ئەو گۆرانییانە بۆ پێشوازیی ئێوەیە.

دواتر لەگەڵ بەڕێوەبەر یەکدیمان ناسی، تا ئەو کاتەی لەوێ ماینەوە زۆر بەڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ کردین، هەژار و نەدارەکانی ئەوێش بەهۆی ئەوەوە تۆزێك ئەرکی سەرشانیان کەم بووە. دوای پازدە ڕۆژ مانەوەمان لەوێ، بڕیاری ئازادکردنمان دەرکرا. دوای دەرچوونمان، هەم ئێمە، هەمیش حوسێن و هاوڕێکانی و تەواوی بەندکراوەکانی دیکەش، بە ڕۆیشتنمان زۆر دڵتەنگ بوون.

## کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات

لە زمانی تورکیدا، وتەیەکی بەو شێوەیە هەیە: "لە کوێرێکیان پرسی چیت دەوێ؟ ئەویش گوتبووی دوو چاوی ساغ"، باشترین وەڵامیش بۆ ئەو پرسیارە هەر ئەوەیە ئیدی. چەندان ساڵە لە تورکیا، ئەوەندەی لە دەستم هاتبێت، پرسی کێشەی کوردم بەشێوەیەکی یاسایی و ئاشکرا هێنابووە زمان. لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات و بەشداریکردنم بەرامبەر ئەو داواکارییانەی لە منیان دەکرد، پێموابوو ئەو کۆمەڵەیە ڕێگایەکی گونجاوە بۆ ئەو داوایەی چەندان ساڵە خەباتی بۆ دەکەم، چونکە لە کاتێکدا ڕۆژهەڵات لە ڕووی ئابووری و کەلتوورییەوە زۆر پشتگوێ خرابوو، داواکارییەکی ئاوا گەر لە هەر کوردێك کرابا، بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتێك بکاتەوە بە گیان و ماڵ بەشداریی دەکرد.

من لە سەرەتای دامەزراندنیەوە تا کۆتاییەکەی بە گیان و

بەماڵ هاوکاریی ڕێکخراوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵاتم کرد. داواکاری گشتیی دۆخی لەناکاوی کارگێڕی عورفیی دیاربەکریش، لەو ڕاپۆرتەی وەك تۆمەت لەسەریان ئامادە کردبووم، بە ڕێگا پیشاندەر و هاندەری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات تۆمەتباریان کردم.

ناوەندی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات لە ئەنقەرە بوو، بەڵام نوێنەرایەتیان لە ئیستانبووڵیش هەبوو، بۆیە، ئەندامانی ئیستانبووڵی ئەو ڕێکخراوە زوو زوو دەهاتنە ماڵەوەمان و لە شوێنی کارەکەشم زۆریان سەردان دەکردم. منیش چەند ڕۆژێکی دیاری کراوی هەفتە لە بەیاز سەرای ناوچەی بایەزیت سەردانم دەکردن. چەند جارێك داوەتی کۆبوونەوەکانی ئەنقەرەش کرام.

لێرە دەمەوێ باسی چەند پێشهاتێك بکەم، کە بەهۆی کەم ئەزموونیی کۆمەڵەکە لەسەر چەند بابەتێکی جیاواز ڕووی دا.

دەستەی کارگێڕیی کۆمەڵەکە، هەرچی قوتابی دەرکراوی بە ڕەگەز کوردی ناو ڕێکخراوەکانی قوتابیانی تورکیا هەبوو، هەموویان بردبووە لای خۆیان، لەگەڵ تێپەڕینی کات ئەو کلاوچی و سەروشکلە گەورەکراوانە بە پەروەردەی کەمالیستی، تەنیا لەبەر ئەوەی کورد بوون، ئەوێیان پڕ کردبوو. ئەو کەسانەی ئامادەم بۆ کردن خۆیان باش دەناسن، بۆیە، لێرە نامەوێ ناویان بهێنم و دەرفەتی ئەوەیان بۆ دروست بکەم تا بەرگری لە خۆیان بکەن، ئەو کەسانە هەندێکیان تا ئێستاش لە تورکیان، هەندێکیشیان، بە ناوی کوردایەتی، خۆیان لە پاڵ ئەوروپا نا.

یەکێکی دیکە لە کێشەکانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات، سەرەڕای ئەوەی چەندین جار ئاگادارمکردنەوە، ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەوەی ڕێکخراوێکی

یاسایی بوو، بەڵام هەندێك كار و كردەوە و جووڵانەوەی بێ سوود و بێ بەهای منداڵانەیان دەكرد و زیانیشیان بە گەلی كورد دەگەیاند. ئەو كارانە زۆر بە نەزانی لە كۆلێژەكانی خوێندن و ناوەندی ئەنقەرە و نوێنەرایەتیی ئیستانبوولی كۆمەڵەكە دەكران، بۆیە، بە ئاسانی بەهانەی دژ بە خۆیان دەدا دەست حكوومەت. دواجاریش كە كودەتای ١٩٧١ ڕووی دا، لێكدانەوەیەكیان بۆ ئەنجامەكانی كودەتاكە نەبوو و وازیان لەو كردەوە بێ سوودانە نەهێنا، لە كاتێكدا جووڵانەوەی كورد خۆی لەژێر ئەركێكی قورس دابوو، كەچی كارەكانیان بوونە ڕێگا خۆشكەر بۆ ئەوەی ئەو جووڵانەوەیە تووشی نسكۆیەكی گەورە بێ. مانگێك بەر لەوەی كودەتاكە بكرێت دەستگیركرام، لە ئیستانبووڵ قیامەت هەڵسابوو، ئەلرۆمی قونسوڵی ئیسرائیل ڕفێندرابوو، پۆلیسیش بە دوای دەنیز گەزمیش و هاوڕێكانیدا دەگەڕان. لەو سەروبەندە، هێزەكانی ئاسایش منیان لە ماڵەكەم دەستگیركرد. بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی ئیستانبووڵ لە خانی سانساریان لە سیركەجی بووە ڕۆژی حەشر. هاواری ئەشكەنجەدان چەندان كۆڵانی دەبڕی. بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس بە سیاسیەكان ئاخنرابوو، كاتێك بەسەر پەیژەكانی ناو باڵەخانەكەدا سەردەكەوتین، تووشی جەمیل گولمەزی هاوڕێی ئامادەیی ئەدەنەم بووم. ئەو بەڕێوەبەری بەشی دووەمی ئەوێ بوو، لێی پرسیم: "كاك مووسا خێرە ئینشاڵا؟" وەڵامم داوە: "خێر ماوە هەتیو، وەك دەبینی وا دەمبەنە ئەشكەنجەدان". ئەویش چەماوە و دەستەكانی ماچ كردم، دواتر منی بردە لای ئیلگازی بەڕێوەبەری بەشی یەكەمی ئەوێ، كە دواتر لەلایەن گەنجە شۆڕشگێڕە بەناموسەكانەوە كوژرا، بە فەرمان: "هەتیو سەیركە، گەر یەك پەنجە بگەیەننە كاك مووسا، دایكت وا و وا لێ

دەکەم". ئیلگاز گوتی: "من تێکەڵ نابم، بەڵام دەینێرمە بەندیخانەی تاکەکەسی و لەوێ چی لەوانی دیکە بکرێ هەمان شتیش لەگەڵ ئەو دەکرێ"، جەمال: "هەتیو شتی وا نییە، بۆیە دەبێ پاسەوانێکی تایبەت لای ئەو دابنێی، بۆ ئەوەی کەس پەنجەی بۆ درێژ نەکا"، بەڵام ئیلگاز گوتی: "کەسم لا نییە تا ئاگاداری بێت"، جەمیل وەڵامی داوە: "من لەبەشەکەی خۆمانەوە یەکێك بۆ پاسەوانی دەنێرم"، بۆیە، ئیلگاز ناچار بوو داواکارییەکە قبووڵ بکات.

ڕۆژێك دواتر، ئەنوەر ئایتەکینی هاوشاریمیان هێنا ئەوێ، کە ئێستا خاوەنی وەشانخانەی سۆسیالە. بۆ ئەوەی لە ئەنوەریش نەدرێت بە پاسەوانەکەی لای خۆم گوت، ئەوە برامە و دەبێ بهێندرێتە لای من، بۆیە ئەویشیان هێنا لام. دواتر حەسەن عزەدین دینەمۆیان هێنا ئەوێ، کە لای من خاوەن حورمەت و خۆشەویستییەکی زۆرە، ئەوسا تەمەنی نزیکەی ٦٥ساڵێك دەبوو. لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی بۆ ئەو قاوشەی لێی بووین، پۆلیسە بێ شەرەفەکەی دواوەی پێلەقەیەکی بەهێزی لە پشتی دا، کاك حەسەن لەو ناوە گلۆر بۆوە، ئینجا بەسەریدا هاواری کرد: "هەتیو کەی عاقڵ دەبن؟". بە پۆلیسەکەی لای خۆم گوت ئەو ئیختیارەش ناسیاومە و دەمەوێت بیهێنیتە لای من، پاسەوانەکە ئەویشی هێنا لامان. تەبعەن ئەو داواکارییانەم بێ بەرامبەر نەبوو.

ڕۆژی دواتر ڕوشەن ئاسلان و شەرافەدین کایایان هێنا لامان و لە ژوورێکیان کردن، پۆلیس بە ڕقەوە چووە بەر دەرگای ژوورەکەیان، کاتێك زانیی ئەوان پارێزەرن و لە مووشەوە هێندراون، نەڕاندی بەسەریانەوە: "هەی دایکتان ئاوا و ئاوا، هیچ کار نەمابوو بوونە پارێزەر؟". دەبینن چۆن ئەو پۆلیسانە، تەنیا بۆ دۆزینەوەی بەهانەی لێدان، چ پرسیارێك لەو کەسانە دەکەن کە

زۆر لە خۆیان ڕۆشنبیرتر و نیشتمان پەروەرترن؟ لەوێ، جگە لەوە، بوومە شاهێدی زۆر ئەشکەنجەی دیکە. دوای دوو ڕۆژ منیان بردە سالۆنێك، لەوێ دوو پۆلیسی سڤیل و ئیلگازی بەڕێوەبەری بەشی یەکەمی بنکەکە چاوەڕێیان دەکردم، پۆلیسە مەدەنییەکان چاویان بەستامەوە و بەتانییەکیان بەسەر دادام، دواتر ئیلگاز پێلەقەیەکی ئاوای لە پشتم دا، لەگەڵی بەربوومەوە سەرزەوییەکە، بەربوومەوە و سەرم بە سەبەکە کەوت و خوێنی لێهات، ئینجا بە ڕق و قینەوە گوتی: "ئینجا ئێستا دەچییە لای بارزانی یانیش دەچیتەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتوویە ئەو دونیایە"، ئەو دەیویست قینی دڵی دەر بکات، بۆیە ئاوای کرد. دواتر لەوێوە منیان بردە بەندیخانە تاکە کەسییەکانی کۆشکی زیڤەربەی ناودار و لەوێ بەندیان کردین.

## کۆشکی زیڤەربەی

ژوورە تاکەکەسییەکەم نزیکەی پەنجا سانتیمێک لە ئاستی دەرگاکە قوڵتر بوو، واتا کە دەهاتییە ژوورەوە دەبوو یەك دوو پلیکانە بێیتە خوارەوە، لەگەڵ چوونە ژوورەوەم تەنیا دەرپێ قوتەکەی بەریان لەبەرهێشتمەوە و ئەوەی دیکەیان هەموو لەبەر داکەندم، وەك ئەوەی حەنەکی خۆیانم پێ بکەن، گوتیان: "خوا نیسراحەتت بداتێ" و ڕۆیشتن. دواتر لە هەر چوار لای دیواری ژوورەوەی شوێنەکەم، بە بۆڕی ئاوی ساردیان بەسەردا کردم، ئیدی تا ڕۆژی دواترێ، بە ڕووت و قووتی لەناو ئاو لەسەر ئەو زەوییە ڕەق و تەقە مامەوە. ماوەیەکی زۆر دوای کردنەوەی، ئاوەکەیان گرتەوە. ڕۆژی دواتر جەلادە بەڕێزەکانم هاتنە ژوورەوە و جلەکانیان لەبەر کردم، ئەو ئاوەی لە زەویەکەش مابۆوە، بە گونییەکی خوری وشکیان کردەوە، زۆری پێنەچوو

لیوایەك و سێ کەسی سیڤیل هاتنە ژوورەوە، لیواکە بە ڕق و قینەوە بەسەریدا نەڕاندم و گوتی: "مۆژدەمان پێیە بۆ تۆ، تەرمی قونسوڵی ئیسرائیلمان دۆزییەوە"، هەستم کرد خۆیان بۆ ئەشکەنجەدانم ئامادە کردووە، یەکێك لەو سڤیلانەی لەوێ بوون بە لیواکەی گوت: "گەورەم، ئەوە مووسا عەنتەری کورد پەرستە، ئیسرائیل هاوکاریی بارزانی دەکات، بۆیە ئەو پیاوە خراپە بەرامبەر ئیسرائیل ناکات"، لە ژیانمدا یەکەمجار بوو کورد پەروەرییەکەم و بارزانی بە چاکە بۆم بشکێتەوە!.

ئەو کەسەی گوتی مووسا عەنتەر کورد پەرستە، دواتر لە شوێنێکی دیکە دیتمەوە، ناوی حوسێن بوو، بەڵام لە بیرم نەماوە نازناوی چی بوو، لە ئەنقەرە لەناو دەزگای هەواڵگریی تورکیا، ٣٥ ساڵ بوو بەرپرسی دۆسیەی کورد بوو. دواتر یەکدیمان ناسی، گەر بە درۆش بێت بووینە دۆستی یەکدی. ساڵی ١٩٧٢ کاتێك لە بەندیخانەی سەربازیی دیاربەکر دەستگیرکرابووم، بەبیانووی میوان منیان بانگهێشتی فەرماندەیی شوێنەکە کرد، میوانەکە کاك حوسێن بوو. ئەوکات ئەو عەمید فارووقی بەرپرسی میتی دیاربەکریشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئێمەی بە یەکدی ناساند و داوای لێ کردم ببمە دۆستی دەوڵەتی تورکیا، بۆ ئەوەی ببمە سیخوریشیان پارەیەکی زۆریان بۆ دانابووم، منیش گوتم: "جا وا بەبەلاش و بە کەرانە بوومەتە دۆستی دەوڵەت"، ئەوانیش پێکەنین، داواکارییەکەیانم ڕەتکردەوە، بەڵام ئەو پاستە و چکۆلاتانەم لێ وەرگرتن کە بۆیان هێنابووم. کە گەڕامەوە قاوشەکە دیدارەکەم بۆ هەڤاڵان باسکرد و ئەو دیارییانەی هێنابووشیان دامان نا و بەیەکەوە خواردمان.

**دیاربەکر - ١٩٧١**

لە دوازدەهەمین ڕۆژی مانگی سێی ساڵی ١٩٧١، لە ڕێگای ڕادیۆوە، لەلایەن فەرماندەیی بەڕێوەبەرایەتی دۆخی لەناکاوی کارگێریی عورفی دیاربەکر، فەرمانی بە زووترین کات خۆ ڕادەستکردنی من و چەندان هەڤاڵمان بڵاو کرایەوە. ئەوسا لە ئیستانبووڵ بووم، بۆیە چوومە ناوەندی میت لە زیڤەربەی و داوام لێ کردن بمبەنە دیاربەکر تا خۆم ڕادەست بکەم، بەڵام پێیانگوتم ناتوانین ئەو کارە بکەین، منیش جەختم لەوە کردەوە کە بەتەنیا ناچمە ئەوێ، چونکە ئێوە میتۆدتان وایە: "گەر بە تەنیا بچمە دیاربەکر، لە ڕێگا بۆسەم بۆ دادەنێنەوە و دەمگرن، ئینجا تۆمەتی ئەوەم دەدەنە پاڵ کە دەمویست بۆ لای بارزانی هەڵبێم، جا ڕەنگە هەرلەوێ بشمکوژن"، زۆرمان هێنا و برد، نە من باوەڕم بەوان هێنا بمبەنە دیاربەکر، نە ئەوان توانیان باوەڕم پێ بهێنن تا بە تەنیا بڕۆم، ناچار منیان بردە هۆبەی یەکی دەزگای هەواڵگریی تورکیا. لەوێ هەمان شتم بەوانیش گوت، بۆیە پۆلیسێکیان لەگەڵ ناردم و لە نیوەی شەو، دوای گەیشتن، خۆم ڕادەستی فەرماندەیی بەڕێوەبەرایەتی دۆخی لەناکاوی کارگێری عورفی دیاربەکر کرد.

دوای ئەوەی گەیشتینە دیاربەکر، لە بەندیخانەی هێزی وشکانی شوێنیان بۆ کردینەوە و ئێمەیان لەوێ دانا. ئەوێ ئەوەندە دەستگیرکراوی تازەی بۆ هاتبوو کێت ویستبا دەتدۆزییەوە، بە تایبەتیش کە زۆربەی هەرە زۆریان کورد بوون. زۆربەیانم دەناسی، گوێم لە ناوی بەشێکی زۆریشیان ببو، ژمارەی ئەوانەی نەشمدەناسین لە بن نەدەهات، یانی شوێنەکە

ئەوەنــدەی لە کــامپێکی دیلــی جەنــگ دەچــوو، ئەوەنــدە بە بەنــدیخانە نەدەچــوو. لەوێ، مەهــدی زانــا و جانیــب یلــدرم و ئەدیب کەرەهــان و تــارق زیبا ئەکنجــی و تەواوی خێــزانەکەی، لەگەڵ منداڵەکانی ئەمینێ پەریخانێ ناودار، سەعید و شـوکروو و حەسەن و ئەمین، باتمانی و نەوەکـانی و سـەرۆکی شـارەوانی موستەفا و شاسلانی کوڕی، جەمیلێ چەتۆ و کوڕی کاك چەتـۆ و موستەفای کـوڕی و سـەرۆکی عەشـیرەتی دیکـانی مێـردین ئیســماعیل ئاغــا و نوســرەتی کــوری و تەواوی ماڵبــاتەکەی. لە جزیرێ شەرەفەدین کایا و لە سیلۆپی کاك تـاهیر و عەبدولقادر و تەواوی ماڵباتی ئۆکتەن و تەواوی پیاوەکانی باتەڵ باتێ. جـگە لەمانە، زۆر گەنجیش لەسـەر دۆسیەی کـۆمەڵەی شۆڕشـگێڕانی کەلتـــووری ڕۆژهەڵات و کۆمەڵناســـی بەڕێـــز و حـــورمەت ئیســماعیل بێشــکچی و چەنــدانی دیــکەی لێــبوو، بە کــورتی سەرجەم ڕووناکبیر و بەناموسەکانی گەلی کوردیـان لە تەواوی ناوچەکانی کوردستان لەوێ کۆکردبۆوە.

لەو دەســتگیرکردنەم زۆرم یــادەوەری هەیە، بەڵام دەمەوێ چەنـد دانەیەکیـان لێـرە بنووسـم، چـونکە گەر بمەوێـت باسـی هەموویــان بــکەم، دەبــێ پەرتــووکێکی گەورە تەنیــا بــۆ یادەوەرییەکانی ئەوێم تەرخان بکەم.

شــێخ تــاهیری تەمەن ٨٥ ســاڵی شــێخەکانی زیلانــیش دەســتگیرکرابوو، ئەو زانــایەکی گەورەی ئــایین بــوو، تــاکە هۆکاری دەستگیرکردنەکەشی، کە وەك تۆمەت دابوویـانە پـاڵی، بریتـی بـوو لە نزاکـردن بـۆ سـەرکەوتنی مەلا مسـتەفا بـارزانی. هەمــوو ڕۆژێــك لە بەنــدیخانە ئەفســەری نــۆبەتچی دەهــات و سەرژمێری بەنـدکراوەکانی دەکـرد. ئێمەش بـۆ ئەوەی کێشـە و گرفت دروست نەبێ، وەك بەرخ دەبـووینە سـێ سـەرەی یەك بە

دوای یەك و لە یەکەم کەس تا کۆتا کەس خۆمان دەژمارد. بەیانییەك، کاتێ خەریکی خۆ ژماردن بووین ئەفسەرێکی پلە دوو هاتە ژوورەوە، شێخ تاهیریش لە قاوشەکەی خۆیان دەستونوێژی هەڵدەگرت، ئەفسەرەکە بانگی کرد، بەڵام ئەو گوێی لێ نەبوو، گەر گوێشی لێ بووبا لەبەر ئەوەی تورکی نەدەزانی بۆیە هەر تێنەدەگەیشت، ئەفسەرە دڕندەکە چووە لای شێخ و شانی گرت و بە زەوی دادا، ئینجا لەسەری نەڕاند و پێی گوت: "هەتیو هەستە لەگەڵ تۆمە"، شێخیش لەسەر زەوییەکە بە چاوەکانی ئاوا سەیری ئەفسەرەکەی کرد، وەك ئەوەی بیەوێت بڵێ: ئەوە چ جۆرە مرۆڤایەتییەکە؟. من لە سرەکەی خۆم دەرچووم و یەخەی ئەفسەرەکەم گرت، "هەتیوی بیژی، تۆ باوکت نییە؟ باپیرت نییە؟ ئەو ئیختیارە لە شوێنی باب و باپیری هەموومانە، ئێمە لێرە وەك تۆ بۆ مووچە وەرگرتن کاری بێ ناموسی ناکەین، ئەوانەی لێرەن لە پێناو ناموس و شەرەف و مرۆڤایەتی دەستگیرکراون، بۆیە سیکتر بەو هەژمار و شتی واش ناکەین ئەمڕۆ". ئینجا هەڤاڵانیشمان پشتی منیان گرت. دوای ئەو قسانە، ئەفسەرەکە بە ترسەوە، بێ ئەوەی سەیری دوای خۆی بکات، بە خێرایی چووە دەرەوە. دوای ماوەیەك موقەدەمی فەرماندەی بەندیخانەکە هات و پرسیاری منی کرد، داوای باسکردنی ڕووداوەکەی لێ کردم، منیش وەك ئەوەی ڕووی دا بوو بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە، ئینجا پێم گوت: "تزا بکەن ئەو ئەفسەرە چەتوونەمان لەبەر دەست و پێی خۆمان نەنا و بە زیندوویی دەرچوو، چونکە حەقی کوشتنی هەبوو". موقەدەمەکە دەستی بۆ لە ملیدام، بۆیە ئیدی ئەو ئەفسەرەمان نەدیتەوە، چونکە گواستراوە بۆ شوێنێکی دیکە.

دە پازدە قوتابیشیان لە ئامادەیی سیڤەرەك دەستگیرکردبوو و

هێنابوویـــاننە لای ئـــێمە، بەڵام دوای ئەوەی زۆر ئەشـــکەنجە درابوون. ئەوسا، لە سەیران تەپە، سێ باڵەخانە هەبـوو، یەکێکیـان شـــوێنی لێپێچیـــنەوە، واتـــا شـــوێنی ئەشـــکەنجەدان بـــوو، ئەوەی دووەمیـان شـوێنی دەستبەسـەرکردن بـوو، ئەوەی سـێیەمیش ئەو شـوێنە بـوو کە ئـێمە لێـی دەمـاینەوە. ئەو گەنـجە خوێنگەرمـانە دوای ئەوەی زۆریـــان لێـــدابوون، ئینجـــا بردبوویـــاننە بەشـــی دەستبەسەرکردن، دوای ڕۆژێك ئینجـا هێنانیـانە لای ئێمە، بەڵام دواتر دەرکەوت بە هەڵە لای ئێمەیـان دانـابوون، چـونکە هێشـتا مافی ئەوەیان هەبووە زیاتر ئەشکەنجەیان بدەن. چەند ئەفسەرێك هـــاتن و داوای ئەوانیـــان کـــرد، بەڵام هەڤاڵانمـــان داواکەیـــان ڕەتکردەوە و گەنجەکانیان ڕادەست نەکردن، ناچـار دوای ئەوان چەنـد ئەفسـەرێکی پـلە بـاڵاتر هـاتنە نـاو کێشـەکە، موناقەشـە و دەمەقاڵێ تا درەنگـانێکی شـەو بەردەوام بـوو، بەڵام ئـێمە سـوور بووین لەسەر ئەوەی ئەو گەنجانەیان نەدەینەوە.

دەمژمێر پێنجی بەرەبەیان، ئەوکاتەی هەموومان لـە خەوێکـی قووڵدابووین، لەگەڵ دەنگێکی زۆر و ڕینگ و هـۆڕی پەنـجەرە و دەرگاکـانی قاوشـەکە بە ئاگـا هـاتین، موقەدەمێـك بە نـاوی محەمەد هاواری دەکرد: "بەپەلە لەخەو هەڵستن چونکە تەنیا پێنج خولەك مۆڵەتتان هەیە"، ئێمە هێشتا لەناو جێگاکانمان نەهـاتبووینە دەرەوە، بەڵام لە پەنجەرەی قاوشەکانەوە بۆمبی گـازی فرمێسـك ڕێژیان بەو ناوەدا بڵاو کردەوە، لە ماوەی چەند چـرکەیەك چـاو چاوی نەدەبینی، دەرگاکانیشیان بۆ ئەوە کردبۆوە تا بتوانین بچینە دەرەوە؛ هەر لە دەرگای قاوشەکەوە تـا تێلەکـانی سـەر دیـواری بەندیخانەکە سەربازی دار بە دەست ڕیز ببوون، ئەوانە فەرمانیـان پێکرابـوو لە دەرگـای قاوشـەکەوە تـا نـاو بـاخچەکە بمانـدەنە بەرداران، بەشـێکی زۆری هەڤاڵانمـان شـەلاڵی خـوێن بـوون و

ئینجا دەگوازرانەوە بەشی دیکە. زۆر سەیر بوو، تارق زیا ئەکنجی بەر سەربازێکی بالا کورت کەوتبوو، بۆیە زۆری پێنەکەتبوو، سەربازەکە لە کاتی لێدان پێی گوتبوو: "هەتیو خۆت بچەمێنەوە، ناتگەمێ" ئیدی پاشترێ، تارق زیا ئەوەی وەك یادگارییەك بۆ دەگێڕاینەوە. من لەو لێدان و کوتانە کەوتمە دواوە، چونکە بە مێشکی خۆم لە خەمی ئەوە بووم، کەس لە ژوورەوە نەمێنێتەوە نەوەك بەهۆی نەمانی ئۆکسجین بخنکێت، بەڵام ئاگام لێنەبوو بەدەم گەڕانەوە هاتبوومە بەر دەرگای چوونە دەرەوە، لەوێ ئەفسەرێك پیلی گرتم و ڕایکێشامە دەرەوە، چاوەکانم سووتابوونەوە و فرمێسکی بە خوور لێ دەهاتە خوارەوە، هیچ شوێنێکم نەدەبینی، ئەفسەرەکە منی لە شوێنێك دانیشاند، چونکە پێموابێ سەربازەکان لە لێدانی هەڤاڵانمان شەکەت و ماندوو ببوون، کاتێك بینیبووشیان من بەتەمەنم، بۆیە دەستیان لێنەدام. دوای یەك دوو دەمژمێر گازەکەی ناو قاوش نەما و سەربازەکان چوونە ژوورەوە و ئەو چەند یاتاغەی ئاگری تێبەر ببوو بەپەلە کوژاندیانەوە. لە ژوورەوە هەرچیمان هەبوو، هەموویان فڕێدا ناو باخچەکە. سی و پێنج هەڤاڵمان بە قورسی بریندار ببوون، محەمەد ئەمین بۆزئارسلان یەکێك بوو لە بریندارەکان، دوای هەفتەیەك، کاتێك برینەکانی چاك بۆوە ئینجا هێنایانەوە لامان. هەرچی پەرتووك و دەفتەر و پێنووسمان هەبوو، هەموویان لەگەڵ خۆیان برد و ئاگریان تێبەردا.

لە ماوەی ئەو زیندانیکردنەم چیرۆکێکم لەسەر کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان لەناوچەی چونگوش نووسی بوو، لەو باوەڕدام ئەوە تاکە چیرۆکی ڕیالیستی بوو لە تورکیا دەربارەی کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان. ئەوانەی پەیوەندییان بە کۆمەڵکوژییەکەوە هەبوو، بوونە شاهێدی ڕووداوەکە، قسەم

لەگەڵ ئەوانەش کردبوو کە لە ژیان مابوون، بگرە تویژینەوەم لەسەر دۆزینەوەی شوێنی تاوانەکەش کردبوو. چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ کاك چونگوش و پیاوێکی پارێزگاری دیاربەکری دکتۆر ڕەشید ناو کردبوو، کە بە قەساب ناسرا بوو. دیمانەیەکیشم لەگەڵ کاك محەمەدی کوڕی گوللو ئاغای ڕێبەریان لەسەر ئەو ڕووداوە کردبوو، هەر بۆیەش، لەسەر ئەو نووسینە درامە دادگا. دادوەر لێی پرسیم: "مووسا عەنتەر تۆ بە بنەچە ئەرمەنیت؟" منیش بە "نەخێر" وەڵامم داوە و بەو شێوەیە درێژەم پێ دا: "من کوردم، بەڵام لەو فەلاکەتانەی بەسەرمان هاتووە لەگەڵ ئەرمەنییەکان دەگەینەوە یەکدی". بۆ ئەوەی ڕووداوەکە لەوەی زیاتر ئاشکرا نەبێ، چیرۆکەکەی منیان سووتاند و بڕیاری ئازادکردنی منیشیان دەرکرد.

لەو دەستگیرکردنەم ٣٢ مانگ لە ژوورەوە بووم، بەڵام من لەوێ بە دوو تۆمەت و دۆسیەی جیاواز دادگایی دەکرام. یەکێکیان لەسەر دۆسیەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات، ئەوەی دیکەشیان لەسەر دۆسیەی جزیرێ و سلۆپیی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا بوو. دۆسیەی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕانی کەلتووری ڕۆژهەڵات دیار بوو چۆنە. لەو دوو دادگاییکردنەم دەمەوێ باس لەو چەند یادەوەرییە بکەم کە بەسەرمهات.

دانیشتنەکانی دادگا تا بڵێی بە سەیر و سەمەرەیی تێدەپەڕی، هەڤاڵە دەستگیرکراوەکانم خووی من دەزانن لە چۆنیەتی وەڵامەکانم بۆ دادوەر و داواکارە گشتییەکان، چەندی لەدەستم بێ، هۆڵەکەی دەکەمە سەکۆیەکی شانۆیی، هەمان کات چەندی لەتواناشمدا بووایە هێرشم دەکردە سەر داواکارە گشتییەکان. دادوەری دانیشتنەکەمان ناوی حەمدی بوو، داواکارە

گشتیی،ەکەش عەمید سەعید دەباك بوو. زانیبوومان سەعید دەباك خەڵكی ڕووهایە، بەڵام کەسێکی زۆر بێ ئاست و کەم توانا بوو، وەك کامەران ئینان ئەویش دژی جنس و نەتەوەی خۆی بوو. جەنابیان نامەی تۆمەتەکانی منی خوێندەوە، لەناو خاڵەکانی نامەکە بەو شێوەیە باس لە زمانی کوردی کرابوو: "کورد بە نۆ هەزار وشە قسە دەکەن، لەو ژمارەیە نزیکەی سێ هەزار و شتێکی عەرەبیە، هەزار و شتێکیشی فارسییە، نزیکەی هەزار وشەشی تورکییە، یانی ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا سی و پێنج وشەی کوردییە، بەڵام، کورد سەرجەم ئەو وشانەی قسەی پێدەکەن، وا دەزانن کوردییە و بە کوردیی دادەنێن، بۆ نموونە، لەگەڵ ئەوەی وشەی (مەعدەنووس) تورکییە، بەڵام دەڵێن ئەو وشەش کوردییە". داواکارە گشتییەکە لە خوێندنەوەی نامەی تۆمەتە هەڵبەستراوە بێ سەر و بەرەکانی بۆوە. ئێمە لەگەڵ هەڤاڵانمان لە نێوان خۆماندا بە دادوەری دانیشتنەکانمان دەگوت (حەمدی کۆر) کاك حەمدی پلەی ڕائید بوو، هەستمان کرد زۆر خۆشی لەو داواکارە گشتیە نایەت، لە چاوەکانی ئەوەم خوێندەوە کە دەیەوێت داواکارە گشتیەکە سووك و چرووك بکەم، بۆیە، بە پێکەنینەوە گوتی: "ئێمە مووسا عەنتەر بە شارەزای زمانی کوردی دەزانین، بۆیە دەربارەی تۆمەتەکانی ناو نامەکەت سەبارەت بە زمانی کوردی، با ئەو وەڵام بداتەوە". من زانیم کارەکە دەبێ وەك شانۆی لێبێت، بۆیە، هەستامەوە و دەستم بە قسەکردن کرد: "جەنابی دادوەرانی بەڕێز، نازانم لە ماڵەکانتان کۆریتی مریشکتان هەیە یان نا؟" دادوەر گوتی: "بۆچی دەپرسی؟"، وەڵامم داوە: "گەر کۆریتی مریشکتان لە ماڵەوە هەبێ داوا دەکەم بەیانی بەر لەوەی بێنە ئێرە، پێنووس و کاغەزێك بەدەستتانەوە بگرن و برۆنە بەردەم کۆریتی مریشکان

و سەرنج لەو دەنگانە بدەن قا قا، قو قو، جك جك، تاد... کە مریشکەکان دەری دەبڕن، لەوێ دەبینن گوێتان لە چەندان دەنگی جیاواز دەبێ، ئینجا هەست دەکەن بە لای کەمەوە پەنجا وشە دەنووسنەوە کە لە زاری مریشکەکانەوە دەردەچێ. دوای ئەوەی وشەکانتان نووسییەوە، ئەو پرسیارەتان بە مێشکدا دێت، ئایا ئەو کوردە بە قەدەر مریشکیش وشەی نییە و لەوانیش کەمتری هەیە؟ تەنیا سی و پێنج قا قا و قو قو ماوەتەوە. جگە لەمە، زانیومانە بەڕێز سەعید دەباك هاوشارییەکی خەڵکی ڕووهامانە، ئاشکراشە خەڵکی عەنتاب و شارەکەی ئەو زۆر حەزیان بە کولێرە بە گۆشت و چی کۆفتەیە، مەعدەنووسیش یەکێکە لە پێکهاتە گرنگەکانی ئەو دوو خواردنە، هەر بۆیەشە خۆمان بە خاوەنی مەعدەنووس دادەنێین و بە کوردیی دەزانین، بەڵام لێرە بەناوی تەواوی گەلی کوردەوە دەمەوێ سۆزتان بدەمێ؛ بەڕێز دەباکیی داواکاری گشتی، گەر داوای ئازادکردنمان بکات، ئێمەش پەیمانت پێ دەدەین وەك گەلی کورد ئیدی نەڵێین مەعدەنووس وشەیەکی کوردییە" دوای ئەو قسانە بەشێك لە هەڤاڵان و چەند ئەندامێکی دادگا پێکەنین. کاك سەعیدی داواکارە گشتییە بە تەمەنەکەش لە شەرمان سوور هەڵگەڕا.

من چەندان ساڵ بوو بە تۆمەتی کوردایەتی و کۆمۆنیستی دادگایی دەکرام. نامەی تاوانبارکردنەکەم، لە دۆسیەی دادگاییکردنم لەسەر پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا لە جزیرێ و سلۆپی، پێنج شەش ڕووپەڵ بوو. بۆیە، وەسیەتم کردووە ئەوەی لەسەر ئەو دۆسیەیە دادگایی کراوە لە داهاتوو، لەسەرجەم دامودەزگا کوردییەکان پەیکەریان بۆ دروست بکرێ. هەر لەو دادگایی کردنەدا، ئیسماعیل بێشکچی، بە

تۆمەتی هاندان بۆ خەباتی کوردایەتی تۆمەتبار کرابوو، ئینجا دەربارەی ئەو چی نەنووسرابوو! بۆ نموونە داواکاری گشتی دەیگوت: ئیسماعیل بێشکچی گوتوویەتی ئەتاتورك دوژمنی کوردایەتییە و هەر ئەویش غیانەتی لە کوردان کردووە. دیسان داوای قسەکردنم کرد و گوتم: "ئەو داواکارە گشتییە ئەسمەرەی ئێرە، یان قەرەجە، یانیش بە بنەچە عەرەبە، بۆیە، هیچ ئاگاداری برایەتیی کورد و تورك نییە. زیا گۆك ئالپی کورد خەڵکی گوندی ناوچەیەکی نزیکی ئێرەیە بەناوی چەرمیك، بەڵام ئەو بەپێی دۆخی ئەوسا، بناغەی تورکایەتی داناوە، بە عەشقی خەیاڵی ئاسیای ناوەڕاست لە نووسینەوەی ڕووداوی سیمبوڵی تورکایەتی (کزل ئێلما) سڵی نەکردۆتەوە، کەچی ئێمەی کورد لەوە تووڕە نەبووین، بگرە بەخیلیشمان پێی نەبرد، هیچ کاتێکیش پێمان نەگوت، هەتیو زیا گۆك ئالپ تۆ پیشتر کورد پەروەر بووی، خێرە ئێستا بوویتە تورانی؟ چونکە بیرمان کردەوە، ئێمەی کورد چەندان سەدەیە لەژێر دەستی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی وەك بێ مێشك دەردەکەوین، بۆیە چ کێشەیەکی تێدایە گەر زیا گۆك ئالپیش ببێتە یەکێك لەوان، فەرزمان کرد ئەویش لە تڕی سەی چوو، وەك ئەوەمان دانا کە لە یەمەن هاونیشتمانییەکمان کوژرابێ، بەڵام دەبینم ئەو داواکارە گشتییە ئەسمەرە زۆر بێ ویژان و بەخیلی بەرە، چونکە گەر پیاوێکی مەرد بوایە، دەیتوانی ئاواش بیر بکاتەوە: زیا گۆك ئالپ کۆمەڵناسێکی بە بنەچە کورد بوو، بەڵام بنەچەکانی تورکایەتیی دامەزراند، بەرامبەر ئەوەش ئیسماعیل بێشکچی بە بنەچە تورکە، بەڵام بنەچەکانی کوردایەتی دادەنێت، بۆیە، گەر ئاوا لێکی بدەیتەوە، دەبێ کارەکانی ئیسماعیل بێشکچیش بە شتێکی ئاسایی وەربگری". لەگەڵ ئەوەی ئەو قسانە هیچ سوودێکی

لۆژیکی بۆ دادگای کارگێڕی عورفی نەبوو، بەڵام شەرەفەدین ئەلچی و تاهیر ئۆکتان کە تورکییەکەیان لە گوێگران و دادوەران و تۆمەتبارەکان باشتر بوو، دەستیان بە پێکەنین کرد، جا داواکاری گشتی گەر تووڕەش بێت کێ بە خەیاڵیدادێت.

دانیشتنەکانی دادگا بەردەوام بوون، ژمارەمان ۹۰ کەس بوو، هەموومان نزیکەی هەشت ساڵ سزامان بەسەردا سەپێندرا، دادگای تێهەڵچوونەوەی سەربازیش ڕەزامەندی لەسەر بڕیارەکە دا، لەو دادگاییکردنەشماندا چەند هەڤاڵێکمان هەبوو، بە تۆمەتی جیا جیا دادگایی کران. بۆ نموونە ئەروح لە وان و ناوچەکانی باکووری کوردستان چەند تۆمەتێکی بێ بنەمایان دابوونە پاڵ. ئەڕۆح کوڕی یاقووب ئاغای ئاگرییە، یەکێکە لەوانەی بەشداریی سەرهەڵدانی ئاگریی کردووە. خەلیل ئاغای تەمەن حەفتا و پێنج ساڵ و کوڕەکانیشی، لەگەڵ ئێمە بوون. خەلیل ئاغا لە دادگاییکردنەکە دادوەر لێی پرسی: "خەلیل ئاغا تۆ کوڕی یەعقووب ئاغای ناوداری؟"، خەلیل ئاغا هیچ تورکیی نەدەزانی، بۆیە بە وەرگێڕەکەی گوت: "چ د بێژی چ د بێژی؟" وەرگێڕەکە وتەکانی دادوەرەکەی بۆ کردە کوردی، لە وەڵامدا خەلیل ئاغا گوتی: "بەڵێ"، ئینجا دادوەر گوتی: "لە دۆسیەکەتدا هاتووە، تۆش لەگەڵ باوکت دژی سوپا جەنگاوون؟"، خەلیل ئاغاش بەو دەنگە گڕ و بە هەیبەتە پیاوانەیەی، بە زمانی کوردی، بەو شێوەیە وەڵامی دادوەری دایەوە: "ئۆهۆۆۆ تۆ سەیری عەقڵی دادوەر بکە؟ ئەوانە تێپەڕین، تێپەڕین. مستەفا کەمال پاشا دوای ئەوەی باوکم و برا گەورەکەم و سێ ماممی لە سێدارە دا، ئینجا لە ئێمە خۆشبوو، تۆ چی دەڵێی کوڕی خۆم؟" بەڵام سەرەڕای ئەو وەڵامە دادوەر حەفت ساڵ و نیو، سزای زیندانی بەسەر خەلیل ئاغا و ئەو کوڕ و خزمانەی سەپاند

کە لەگەڵی دەستگیرکرابوون. ئەو بڕیارەش لەلایەن کۆماری تورکیا نا، بەڵکو لەلایەن دادگای باڵای تێ هەڵچوونەوەی فەرماندەیی سوپای تورکیا، پەسند کرا.

ساڵی ١٩٧٤ هەڵبژاردن بەڕێوەچوو، کوڕە ڕەشەکەمان بولنت ئەجەڤیت[1] و نەجمەدین ئەربەکانی[2] مامۆستامان، حکوومەتێکی هاوبەشیان پێکهێنا. هەردوو لا، لەسەر پێنج ماددەی لێخۆشبوونی گشتی ڕێککەوتن، بۆ ئەمەش هەردوو لا ڕەزامەندییان پیشاندا. پارتی داد دژی لێخۆشبوونە گشتییەکە کاری دەکرد، کاتێك لێخۆشبوونەکە لە پەرلەمانی تورکیا گفتوگۆی لەبارەوە دەکرا، پەرلەمانتارێکی ئیستانبووڵ لە وتارێکیدا گوتبووی: "ئێوە هەوڵی دەرکردنی لێخۆشبوون بۆ کۆمۆنیست و ئەوانە دەدەن کە دەیانەوێت ئەو وڵاتە پارچە پارچە بکەن"، ئەو پەرلەمانتارە مەبەستی کوردەکان بوو، کە بەبۆچوونی ئەو تورکیا پارچە پارچە دەکەن. ئەوسا دژی ئەو لێدوانە، پەرلەمانتارێکی پارتی گەلی کۆماری "جەهەپە"، ئێستا ناوەکەیم نایەتەوە یاد، ئەو چەند دێڕەی گوتبوو: "هەموو کەسێك داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو گرووپە دەکات کە لێی ئەندامە، ئێوە داوای لێخۆشبوونی دز و مافیا و پیاوکوژەکان دەکەن، بەڵام ئێمە داوای لێخۆشبوون بۆ چەپەکان و کوردەکان دەکەین، کە بەبۆچوونی ئێوە وڵات

---

[1] بولەنت ئەجەڤید (١٩٢٥ – ٢٠٠٦) سیاسەتمەداری تورك لە نێوان ساڵانی (١٩٧٤ – ٢٠٠٢) چوار جار پۆستی سەرۆکوەزیرانی تورکیای لە قۆناغی جیا جیا وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

[2] نەجمەدین ئەربەکان (١٩٢٦ – ٢٠١١) سیاسەتمەداری تورك، لە نێوان ساڵانی (١٩٩٦ – ١٩٩٧) سەرۆکوەزیرانی تورکیا بووە. ئەربەکان ساڵی ١٩٨٧ بە سکرتێری گشتی پارتی ڕەفا هەڵبژێردرا و لەوێشەوە پەرەی بە بیرۆکەی میللی دا بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە تورکیا. (وەرگێڕ).

دابەش دەکەن، بۆیە، کێ داوای لێبووردن بۆ کێ دەردەکات با لەسەر ئەوان هەژمار بکرێت".

لە پەرلەمانی تورکیا، چوار ماددەی یەکەم بە دەنگی پارتی گەلی کۆماری CHP و پارتی ئاشتی نەتەوەیی MSP[1] دەنگی زۆرینەی هێنا. هەرچی تایبەت بوو بە ماددەکانی ١٤١ و ١٤٢ بۆ لێبووردنی گشتی، ٢٣ پەرلەمانتاری پارتی میللی نەتەوەیی لە کۆی ٢٥ پەرلەمانتاریان بە دژ دەنگیان پێدا، بەو شێوەیە لە تەواوی تورکیا تەنیا سێ و پێنج گیراوی کورد پەروەر لە زیندان mainەوە.

لە زیندانی دیاربەکر، بەشێك هەبوو بە ناوی بەندیخانەی ئافرەتان، کاتێك چووینە ئەو زیندانە تەنیا سێ ئافرەتی تاوانباری لێبوو، بۆیە، ئەوانیان بردە بەشی گرتووخانەی منداڵان. شوێنەکەیان باخچەیەکی خۆش و دوو نهۆمی خاوێن و لە ژوورەکانیش گەرماو هەبوو. بەراورد بە گرتووخانەکانی دیکە ئەو شوێنە تازەیەمان فراوان و خۆش بوو. لەگەڵ داواکارە گشتییەکەی بەندیخانە نێوانمان زۆر باش بوو. ڕۆژێك سەلاحەدین جیزرەلی ئۆغلووی دیاربەکریی دۆستی ئەزیزم و وەزیری تەندروستی لە کابینەکەی ئەجەڤیت سەردانیان کردم، داواکاری گشتیی دیاربەکر و پارێزگاری ئەوشارەش لەگەڵ ئەو هاتبوون. لە تورکیا تەواوی تاوانبار و تۆمەتبارە ئاسایی و سیاسییەکان ئازاد کرابوون، تەنیا ئەوانەی وەك ئێمە نەبێت کە بە تۆمەتی کوردایەتی لە زیندان هێشترابووینەوە. سەلاحەدین بە

---

[1] پارتی سەلامەتی نەتەوەیی، لە ساڵی ١٩٧٢ لەلایەن سلێمان عاریف دامەزرا، دواتر نەجمەدین ئەربەکان بۆ ماوەیەك بووە سەرۆکی پارتەکە و دواتر لە ساڵی ١٩٨١ داخرا. (وەرگێڕ).

شەرم و دڵتەنگییەوە بەوانەی دەوروبەری خۆی گوت: "دەزانن دۆخی ئەو برادەرانە و ئەو حکوومەتەمان بە چی دەچێ؟ بۆ نموونە بیر لەوە بکەنەوە پیاوێکی بە ناموس بۆ پەیداکردنی نان بۆ ماڵ و منداڵەکەی دەست بە بازرگانی دەکات، بەڵام گرووپێك ئەشقیا دێنە بەردەمی ڕێگای پێدەگرن، بە ناچاری باوکی ئەو خێزانە بە شەڕەفە ڕادەکاتە چیا، بەڵام لە ڕێگا دەستگیردەکرێ و ئەشقیاکان فەرهوودی دەکەن. ئێمەش بەرامبەر بەو برادەرەمان وەکو حکوومەت ڕێك ئاوا دەکەین، بۆیە، تکا لە ئێوە دەکەم تا کێشەی ئەو دۆستانە چارەسەر دەکرێت، هیچ کەسێك کێشەیان بۆ دروست نەکا و ئیسراحەتیان تێك نەدا". لەبەر ئەوەی داواکارە گشتییەکەی بەندیخانە لەگەڵ من دۆست بوو، ڕووی لە وەزیر کرد و گوتی: "جەنابی وەزیر، حەز دەکەن لەو برادەرەمان بپرسن دۆخیان چۆنە، باوەڕ بکە دەرگاکانیشیان کراوەیە، چونکە منیش ڕێك وەك ئێوە بیردەکەمەوە"، نازانم لە بەختی خۆمان بوو یان بە ڕێکەوت بوو کە داواکارە گشتییەکە کوردێکی خەڵکی عەنتاب بوو.

دواتر زانیمان سەلاحەدین جزیری ئۆغلوو، لەگەڵ چەند پەرلەمانتارێکی بە بنەچە کورد و تورکی بە ڕەوشت، زۆر لە نەجەفید دەکەن، ئەجەفیدیش ناچار دەبێ دەستلەکارکێشانەوە پێشکەشی فەخری کۆروتورکی سەرۆککۆماری تورکیا بکات و پێشی دەڵێت: "من لەگەڵ پارتی میللی نەتەوەیی بێ پەیمان حکوومەتی هاوبەش پێکناهێنم". تومەزە ڕۆژێك بەر لەوەی ئەو یاسایانەی تایبەت بە لێخۆشبوونی گشتی بچێتە پەرلەمان و لەوێ دەنگی لەسەر بدرێت، سولێمان دەمیرەل و تورکەش، پەرلەمانتارانی MSP هەڵدەخەڵەتێنن بەوەی لە دەنگدان دژی کێشەی کورد بوەستنەوە، بەرامبەر بەمەش زۆر بەڵێن و پەیمانی

قەبە قەبەیان پێدرابوو. کۆرتورك بە بیستنی ڕووداوەکە بێتاقەت دەبێ، بۆیە، داوا لە ئەجەڤید دەکا چارەسەرێك بۆ دۆخەکە بدۆزێتەوە. ئەجەڤید لە کۆتاییدا لەسەر پرسەکە پەیوەندی بە محێدین تایلانی سەرۆکی دادگای دەستووری دەکا، ئەویش ئەو قسانە بە سەرۆکوەزیران دەڵێ: "ئێوە و چەند هاوڕێیەکتان لیستێکی واژووی نارەزایەتی لەسەر دەرچوونی یاساکە بۆ ئێمە بەرز بکەنەوە، من کێشەکە چارەسەر دەکەم". لە ماوەیەکی زۆر کورت داواکارییەك بە واژووی بولند ئەجەڤید و ۹۰ پەرلەمانتاری جەهەپە بۆ دادگای دەستووری بەرز دەکرێتەوە.

ئێمە ئیدی خۆمان بۆ ئەو سزایە دەروونییە ئامادە دەکرد کە لە زیندان و ڕاگواستن بۆمان براوەوە، چونکە ئەوەندەی من لە بیرم ماوە، حەفت ساڵ و نیو سزای بەندیخانە و پێنج ساڵیش لە موغلە سزای ڕاگواستنم بۆ دەرچوبوو. سزای هاوڕێیە گەنجەکانمان بەراورد بە ئێمە زیاتر و گرانتریش بوو، بۆ نموونە سزای گەنجێکی کوردی تەمەن بیست و پێنج ساڵان شازدە ساڵ زیندانی کردن و نۆ ساڵێش ڕاگواستن بوو.

کاتێك ئێمە سەرقاڵی ئامادەکردنی قاوشەکەمان بووین بۆ مانەوە، بیرم نایەت چ ڕۆژێک بوو، بەڵام ڕۆژێك لە ڕادیۆ، لە بولتەنی هەواڵەکانی حەفتی ئێوارە، هەواڵی بڕیاری دەرکردنی لێخۆشبوونی گشتی بۆ ئێمەش بلاو کرایەوە. تومەزە دوای بەرزکردنەوەی واژووەکانی ئەجەڤید، دادگای دەستووری بە جێبەجێکردنی یاسای (پرەنسیپی یەکسانی) بڕیاری ئەوەی دابوو کە پێویستە ئێمەش بکەوینە ناو چوارچێوەی لێبووردنە گشتییەکە.

بە شێوەیەکی گشتی، دادگای دەستووری کاتێك بڕیارەکانی

پەرلەمانی تورکیای ڕەتکردبۆوە، لە هەمان کات بۆ جارێکی دیکە داوای گفتوگۆی لەسەر بابەتەکە کردبوو، بەڵام سەبارەت بە بڕیارەکەی ئێمە دادگای دەستووری فەرمانی کردبوو بە پەرلەمانی تورکیا بڕیاری لێخۆشبوونە گشتییەکە بە زووترین کات بەسەر هەموو گیراوەکان جێبەجێ بکات. دەمژمێر هەشتی ئێوارە داواکاری گشتی هات و پێیراگەیاندین دەتوانین لە بەندیخانە بچینە دەرەوە و ئیدی ئازادن. منیش پێم گوت: "هەر یەکێك لە ئێمە خەڵکی ناوچەیەکی جیاوازی کوردستانە، ئێستا دوای بیستنی هەواڵی ئازادکردنمان خزم و کەسوکارمان بەڕێکەوتوونە بۆ ئەوەی بێن و لەگەڵ خۆیان بمانبەنەوە، بۆیە، گەر لێرە دەرچین، ڕەنگە لە میوانخانەکان بە گرانی بماندۆزنەوە، پێیشمگوت: سی و سێ مانگە بە زوڵم و ناحەقی ئێمەتان لێرە ڕاگرت و زیندانیتان کردین، ئەوشەویش وەك میوانێك لێرە ڕامانگرن، بەیانیش وەك مرۆڤ ماڵئاوایی دەکەین و دەڕۆین، بەڵام گەردەنی ئەو حکوومەتە فاشیستەشتان ئازا ناکەین". داواکارە گشتییەکە داواکەی قبوولکردین، بەڵام لەبەر ئەوەی لە فەرمانە ڕۆتینیەکان زۆر دەترسا، بۆیە، تا بەیانی لای ئێمە مایەوە، بەڵام ئێمە لە خۆشیان و ئەویش لە ترسان، کەسمان خەومان نەچووە چاو.

بەیانی ئەو ڕۆژەی لای کوردان هەردەم پیرۆز بووە، لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرز بۆوە، لەبەردەم دەرگای بەندیخانەوە تا شورا خەمگینەکەی دیاربەکر ئۆتۆمبێل و قەرەباڵغیی خزم و ناسیارەکانمان درێژەی کێشابوو. ئەوان هاتبوون تا ئێمە لەگەڵ

خۆیان ببەنەوە، هەموومان بە هەستێکی زۆر سەیری پێناسەنەکراو لەیەك جیا بووینەوە، بەڵام تا ئێستاش دۆستایەتیم لەگەڵ ئەو هاوڕێیە بە شەرەفانەی ئەو ڕۆژەم بەردەوامە. دەمەوێ بڵێم گەر بەراستی دوارۆژ هەبێ، دەمەوێ لەوێش هەر لەگەڵ ئەوان بم، جا جیاوازی نییە لە بەهەشت بێ یان دۆزەخ.

زۆر شتی دیکە هەیە بۆ باسکردن، بەڵام ئەوەندە بەسە، چونکە پێم وایە دوای تێپەڕینی هەزاران ساڵ بەسەر زوڵم و زۆرداریی مەغۆل و تاتار، بەڵام مێژوونووسەکان تا ئێستا پڕ بە پێستی خۆی ڕووداوەکانیان نەهێناوەتە سەر زمان و لەسەر ڕووپەڵەکانی خۆیان مافێکی تەواویان بە چیرۆکەکان نەداوە، ئەی من چۆن لێرە ئەو هەموو زوڵمەی کۆماری تورکیا بنووسمەوە؟ بۆیە، من ئەو بیرۆکەیەم لای خۆم چەکەرە پێ کردووە: منداڵ و گەنج و پیر و ژن و پیاو، ئەوەندەی لە دەستم بێت، هاوکاریی هەموو کوردێکی بەشەرەف بکەم، ئێستا تەمەنم حەفتا و پێنج ساڵە، گەر بەیانی نەمام، لێرە وەسیەتم بۆ کورد ئەوەیە تەنیا وابکەن لە گۆڕەکەم پشوویەك بدەم و هیچی دیکە.

## بەشی پێنجەم
## گەڕانەوە بۆ لادێ

دەڵێن کاتێك خودا بیویستبا مەلای مەشهوور دڵخۆش بکا، سەرەتا گوێ درێژەکەی لێ ون دەکرد. دوای گەڕانیکی زۆر کاتێك مەلای مەشهوور کەرەکەی دەدیتەوە زۆر دڵخۆش دەبوو. دۆخی ئێمەش ڕێك ئاوایە، تورك تاوانباریان دەکردین و دەکەوتینە زیندان، ئینجا لێمان خۆش دەبوون و ئێمەش دڵخۆش دەبووین. من، دوای سێ و سێ مانگ لە دەستگیرکردنم، ئیدی ڕقم لە سیاسەت و حکوومەت و دەوڵەت و ئەو شارە گەورە پڕ مێشك پووچانە و مرۆڤە سەر بە شەبقە خۆ بە ڕۆشنبیر زانەکان و کراڤات لە ملە بێ سوودەکان دەبۆوە، کە جگە لە زۆر خواردن هیچی دیکەیان نەدەزانی. بە تایبەتیش تا دەرچوونی بڕیاری لێخۆشبوونی گشتیمان دۆخی تەندروستیم تا دەهات خراپتر دەبوو.

لە کۆشکی زیڤەربەی، ئەفسەرێك قژی ڕاکێشام و سەری بە دیوارێك دادام و بە سەختی بریندار بووم، لە ئەنجامدا چاوی ڕاستەم کوێر بوو، گوێچکەی ڕاستیشم توانای بیستنی نەما. مانەوەی کاتێکی زۆریش لە بەندیخانەی تاکەکەسی، وایکرد قاچەکانم تووشی ڕۆمانتیزمێکی توند ببن، بە جۆرێک، بەبێ هاوکاریی کەسێکی دیکە نەمدەتوانی بە ڕێگادا بڕۆم. لەگەڵ

هەمـوو ئەو کەموکـوورِییە تەندروسـتییانە، هەڵکشـانی تەمەن و ئیختیار بوونم بەرەو بیرۆکەی پشوودانێکی درێژ پاڵیان پێوەنام. بیرم لێـی کـردەوە و لە دڵـی خـۆم گـوتم: هەتیـو مووسـا، بـاش بـوونی دۆخـی تورکیـا و برایەتیـی نێـوان کـورد و تـورك بـۆتە میراتی تۆ؟؛ وازبێنە دۆخیان چۆنە با بۆخۆیان ببینن! لە زیڤینگـێ و ئاکار سوو، چەند پـارچە زەویـیەکم لە بـاب و بـاپیرانمەوە بـۆ بەجـێ مـابوو، بۆیـە، چـوومەوە و لەلادێـکەی خۆمـان نیشـتەجێ بووم، شوێنەکەی زیڤینگێشمان کردە فەلاحەتییەکی بچـووك. ئەو هەزار دۆنــمە زەویــیەی هەشــم بــوو، بە نیــوەیی دامە چەنــد جووتیارێك. جگە لەمانە، لە ئاکار سوو دە دۆنـم زەویـی بەراوم هەبوو، لەوێ خـانوویەکم دروسـتکرد و ئەوەی مـاوەش کـردمە باخچەی سەوزە و میوە. لە زڤینگێ کـۆمەڵێ سـەر مەڕ و بـزنم کـڕی و بەخێـوم کـردن، لەبەر ئەوەی زۆر حەزم بە گیانـداری مـاڵیش بـوو، بـۆیە، لە بـاخچەکەی ئاکارسـوومان مریشـك و کەروێشك و کۆتر و ئەسپ و پشیلە و سەگم بەخێو دەکرد.

بەشداریی هیچ ڕووداوێکی سیاسیم نەکـرد، چونکە کاتێـك زۆربەی ڕێکخــراو و پارتەکــان دەهــاتنە لام، یەك وەڵامــی هەموویــانم دەداوە، لەبەر ئەوەی هــیچ جــووڵانەوەیەکم بەلاوە گرنگ و باش نەبوو. سەرەڕای ئەمـانە جەمیـل مـاهۆی خەڵکـی گوندی جیبیلگراف، لە بەیرووتەوە هـاتە نوسـەیبین و لەوێشـەوە بۆ لای من. بەیەکەوە چامان خواردەوە، دواتر هەستا و چـووەوە گونـدەکەی خـۆی. دوای ئەو دەمژمێـر پێنجـی شــەو ســوپا ماڵەکەمیــان دەورەدا، منیــان دەســتگیرکرد و لەگەڵ خۆیــان بردمیان، کاتێك خەڵکـی گونـد سـەرقاڵی ئەوەبـوون ئەو بـاولەی ئامـادەم کردبـوو بـیخەنە ئەو ئۆتـۆمبێلەی منیـان پـێ دەبـرد، ئەفســەرەکە بە تــووڕەییەوە "هەڵا هەڵا، دەڵێــی مووســا عەنــتەر

دەبەینە فرۆکەخانە تا گەشت بکات، ئەو ئامادەکارییە چییە؟".
۲۰-۱۲-۱۹۷۹ من و دوو گەنجیان خستە شوێنێك لە فەرماندەیی لیوای سەربازیی مێردین، دوای ماوەیەك ئەفسەرێك هات و پێی گوتین: "ناتوانن هەر کاتێك ویستتان بچنە توالێت، بەڵکو ڕۆژێ تەنیا سێ کەرەت نەبێ، ئەویش بەیانیان و نیوەڕۆیان و ئێواران".
پێم گوت: "پرۆستاتم هەیە، هەموو نیو دەمژمێر جارێك دەبێ بچمە سەر ئاو، بۆ ئەمە گەر بکرێ، پارەتان پێدەدەم تا مەسینەیەکم لە دەرەوە بۆ بکڕن تا پێویستی خۆمی پێ جێبەجێ بکەم"، ئەفسەرەکە گوتی ڕاست دەکەی. دوای ماوەیەك بێ ئەوەی پارەم لێ وەربگرێت چوو مەسینەیەکی هێنا و گەڕاوە لامان. دوای چەند ڕۆژێك لەوێ ئێمەیان گواستەوە، مەسینەکەشم لەگەڵ خۆم برد، ئەفسەری ئەو شوێنە تازەی ئێمەیان بۆی برد، لێی پرسیم: "ئەو مەسینەیە چییە؟"، منیش بۆم باسکرد کە پرۆستاتم هەیە و ئەفسەری ئەو شوێنەی لێوەی هاتووین بۆی هێناوم تا پێویستی خۆمی لێ جێبەجێ بکەم. کاتێك سەرقاڵی ئەو قسانە بووین عەریفێك گوێی لێمان گرتبوو، بەڵام وشەی پرۆستاتی بە پرۆتیستانت تێگەیشتبوو، بۆیە تا ئەو هەڵە تێگەیشتنە ڕاستکراوە، سەرجەم سەرباز و کاربەدەستەکانی بەندیخانە وەك گاوڕێك لەمنیان دەڕوانی.

ئەو دوو گەنجەی تەك منیان بردە لێپێچینەوە، ئاخر، ناوی ئەشکەنجەدانی دەستبەسەرکراوەکان، لێپێچینەوە بوو. بۆیە، هەر یەکێکیان کە دەهاتەوە، نیوە مردوو کرابوو. چاودێریم دەکردن و هەستم بەوە دەکرد، ئەوانەی ئەشکەنجەدرابوون دڵخۆشبوون بەوەی لە سزاکە تێپەڕیون، ئەوانەشی هێشتا لێپێچینەوەیان لەگەڵ نەکرابوو، لەناو ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر بوون. چوومە لایان و تۆزێك ئارامم کردنەوە و پێم گوتن: "گەنجینە بۆ وا خۆتان

تووشی ئەو دڵەڕاوکێیە کردووە؟ دەڵێی لە دەرەوەهیچ شەڕتان نەکردووە، ئێرەش هەر ئاوایە، بەڵام لە بری ئەوەی لێیان بدەی تەنیا پێتدەکەوێت، لە بری ئەوەش تۆڵەی خۆتان بۆ کاتێکی دیکە هەڵدەگرن و تەواو".

شەوی سەری ساڵمان لە ژێر دڵۆپی بنمیچی ژوورەکەمان بەسەربرد. تك... تك... دڵۆپە ئاو بەسەرماندا دەهاتە خوارەوە، بەڵام گەنجەکان زۆر دڵتەنگ بوون، ڕووم تێ کردن: "یەڵڵا گەنجینە وەرن با یاری کەرەمستانێ_ یارییەکە و ئەنگوستیلەی لەکڵاو یان گۆرەوی دەشارنەوە_ بکەین"، تا بەیانی گەر کەمیش بووبێت، بەڵام تۆزێك ئەو گەنجانەم بەو یاریە سەرقاڵ کرد. دوو ڕۆژ دواتر چاویان بەستامەوە و منیان بردە ژووری لێپێچینەوە ناودارەکە، تا ئەوێ بەناو بەفردا تێپەڕین. دوو سەرباز لە ڕاست و چەپم قۆڵیان گرتبووم، سەرەڕای ئەمە لە پڕ من و یەکێك لە سەربازەکان کەوتینە ناو چاڵێکی قووڵ، توومەزە قۆرتەکە بۆ مەبەستی ڕاهێنانی سەربازی ئامادەکرابوو، بەڵام بەفر دایپۆشی بوو. پاڵتۆکەم دڕا و قاچ و قولاق و چۆکەکانم خوێناوی بوون. لە چاڵەکەیان دەرهێنایین و ئێمەیان بردە هۆدەیەکی گەرم، لەوێ ئەفسەرێك، یەکێك لە سەربازەکانی تەك منی دا بەر شەق و شلاقان و پێی گوتن: "هەتیوینە چاوتان کوێر بوو ئێوە؟" ئاوا قسەی بەو دوو سەربازە دەگوت و ڕووی لە من کرد "مووسا عەنتەر خەنی لە خۆت حاڵی ئەوەت نەماوە ئەشکەنجەت بدەین، بەڵام بە درێژی قسە لەسەر هەموو شتێك دەکەین". منیش گوتم: "خۆتان دەزانن". قسەمان لەسەر چەند بابەتێکی لا بەلا کرد، بەڵام هێشتا چاوم بەسترابۆوە. لەناو پرسیارەکانیدا بۆچوونی منی دەربارەی سوپای تورکیا پرسی، منیش پێم گوت: "شارەزاییەکی ئەوتۆم لەبارەی سوپا نییە، نە

ئەفسەرم نە بەرپرسێکی سەربازی، چونکە هەموو پەیوەندیی من بە سوپاوە تەنیا دوو ساڵ بووە لە خزمەتی سەربازی وەکو جێگری ئەفسەر، ئەویش لەبەشی لۆجیستی بووم، نەك لە بەرەکانی جەنگ". ئەفسەرەکە گوتی: "تۆ واز لەوانە بێنە، تۆ دەزانی ئێمە دەمانەوێت بزانین چ زانیارییەکت لەسەر سوپا هەیە، بۆیە بۆمان باسکە، بەڵێنیشت پێ دەدەین نە وەڵامەکانت بنووسینەوە و نە دەنگیشت تۆمار دەکەین." منیش گوتم باشە و ئەو وەڵامەم داوە: "سوپا بە ڕێکخستنی کاروباری زبڵدانی شارەوانی دەچێت، چونکە ئەو زبڵدانە شەقامەکەی خۆی پیس دەکات، بەڵام کەناس دێت خاوێنی دەکاتەوە، بەو شێوەیەش ئەو کارە بەردەوام دەبێت. سوپای تورکیاش وەك ئەو نموونەیە کە باسمکرد. بۆنموونە چەند کلاوچییەك پەرلەمان دادەمەزرێنن، ئینجا حکوومەت پێك دەهێنن، جا هەموو تورکیا پیس دەکەن، کاتێکیش ناتوانن کارێك بگەیەننە ئەنجام، بە ناچاری دۆخی لەناکاو ڕادەگەیەنن و بانگهێشتی سوپا دەکەن، سوپاش کاتێك دێت بەوەندە شارەزاییەی هەیەتی شوێنەکە خاوێن دەکاتەوە و دواتر دەڕوا. جا دۆخەکە بەو شێوەیە بەردەوام دێ و دەڕوا". ئەفسەرەکە لێی پرسیم: "باشە گەر تۆ بوویتایە چیت دەکرد؟" وەڵامیم داوە: "گەر من بوومایە لە شوێنی سوپا، یان هیچ نەدەهاتم، یانیش کاتێك دەهاتم وەك هیتلەر و مۆسۆلینی و فرانکۆ پێمدەگوتن یەڵڵا هەتیوینە ئێوە نازانن ئەو وڵاتە بەڕێوەبەن و ئێمە ئەو کارە دەکەین". ئەفسەرەکە قسەکانمی بە دڵ بوو، بۆیە گوتی: "تۆ بەیانی دەچیتەوە ماڵەوە". سەعات ١٢ی شەو، کاتێك بەفر هەموو لایەکی سپی پۆش کردبوو، لەسەر ڕێگای مێردینیان دانام.

**کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠**

لە ناوچەی بۆڵوو، کەتیبەیەکی کۆماندۆی سوپای تورکیا هاتبوونە لادێکەمان. دەمژمێر سێی شەو کاتێك لەناو جێگا لە خەوێکی قوڵ و شیرندابووم، دەرگای ماڵەوەمان درایە بەر پێلەقە. ڕمب... ڕمب... ڕمب... ڕمب. بەر لەوەی دەرفەتی ئەوە بدەن دەرگا بکەمەوە، پەنجەرە و دەرگایان شکاند. نەقیبێك و ئەفسەرێکی پلە دوو و سەربازێکی شەبقە شین هاتنە ژوورەوە، بەر لەوەی لە ناو جێگاکەم بێمە دەرەوە، نەقیبەکە بە پۆستاڵە قورپاوییەکەی، بەسەر یاتاغەکەم کەوت و سەرجەم پەرتووکەکانی پشت سەرمی بە دەموچاوم دادا و ئەوانی دیکەشی فڕێدا زەوییەکە، لێپرسیم: "ناوت چییە؟" منیش لە وەڵامدا گوتم: "مووسا"، گوتی: "پاشناوت نییە؟" گوتم: "عەنتەر"، نەقیبەکە خۆی لە هێڵی نەزانیدا و گوتی: "ها ئەو مووسا عەنتەرە بێناموسە تۆی؟!" پێم گوت: "بێ ناموس نیمە". کاتێك ڕۆیشتن، ئەفسەرەکە بە نەقیبەکەی گوت، پەرتووکەکان لەگەڵ خۆمان ببەین؟ بەڵام نەقیبەکە گوتی: "لێی گەڕێ تا دەتۆپێ با پەرتووك بخوێنێتەوە. جا ڕووی لە من کرد و هەڕەشەی لێ کردم بەوەی تا ئەوکاتەی ئێمە لێرەین لە ماڵەوە نایەیتە دەرەوە"، ئینجا موختاری گوند و ئەنجوومەنی پیران و پازدە بیست گەنجیان دەستگیر کرد و لە داریان بەستانەوە. تەنیا بۆ ئەوەی چاو ترسێنمان بکەن، هەندێکیشیان سەرا وبن هەڵواسی بوون. ئەو ماڵانەی پیاویان لێ نەمابوو سەرباز زۆر بێ حەیایانە بەناویاندا دەسووڕانەوە. ئەو ئەشکەنجە بۆ ماوەی مانگێك بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی هەندێك چەکیان لە ناوچەکە کۆکردەوە، ئینجا ڕۆیشتن.

ساڵی ١٩٨٤، ژن و مێردێکی سویدی، وەك دوو (توریست — گەشتیار) هاتبوونە تورکیا. بەر لەوەی بێن منداڵەکانم لەوێ داوایان لێ کردبوون لەگەشتەکەیاندا منیش ببینن. کاتێك ئەو دوو گەشتیارە هاتن فەرماندەی قەرەقۆلی ناوچەکەشمان لەگەڵیان بوو، دوای هەندێك گەڕان و نان خواردن ئینجا گەڕانەوە. لە بەدبەختی من وشەی (توریست — گەشتیار) بەهەڵە لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە ببووە (تیرۆریست). ئەو هەڵە تێگەیشتنە تا گوێچکەکانی فەرماندەی لیوای سەربازیی ناوچەکەمان ڕۆیشتبوو. دوای دوو ڕۆژ، لە نیوەی شەو هێزەکانی ئاسایش بەسەریان داداین و من و عەلی ئۆڕاڵی نەوەمیان بە چاو بەستراوی لەگەڵ خۆیان برد، دیسان ئێمەیان بردە فەرماندەی ژەندرمەی مێردین.

لە بەندیخانەی تاکەکەسیان کردم، سێزدە ڕۆژ لەوێ مامەوە، بەڵام مانم لە خواردن گرت و هیچم نەخوارد، ئەوان زۆریان لێدەکردم تا دەست لەو کارە هەڵگرم، بەڵام من سوور بووم لەسەر نان نەخواردن. لێیان دەپرسیم بۆ هیچ ناخۆیت؟ منیش پێمدەگوتن: "دەبینم لەو شوێنەی نەوەکەمی لێیە، کاتێك دەیانبەنە سەرئاو چۆن ئەشکەنجەیان دەدەن، جا لە بری ئەوەی بەرگەی ئەشکەنجەی ئەو گەنجانە بگرم، هیچ ناخۆم تا نەچمە سەر ئاو، بەو شێوەیەش ئێوە پرۆتێستۆ دەکەم".

بە چاو بەستراوی منیان بردە ژووری لێپێچینەوە و پرسیاری بێ سەر و بەر و لات و پاتیان لێدەکردم، لەناو قسان بووین، لە پڕ گوێم لێبوو، (ڕەپ) هەموو هەستانەوە سەرپێ، تێگەیشتم کەسێکی لەوان گەورەتر هاتووە. کاتێك دەستی بە قسەکردن کرد، زانیم فەرماندەی ژەندرمەیە، لە دەنگییەوە ناسیمەوە. لەگەڵ ئەو دەستمان بە قسەکرد و ئەو گفتوگۆیە لە نێوانمان دروستبوو:

فەرماندە: "مووسا عەنتەر بۆ خاتری خوا شتێکت لێ دەپرسم بە ڕاستی وەڵامم بدەوە".

من: "بەڕێزم، سوێندم مەدەن، چونکە لە ئسوڵی یاسای سزاداندا، تەکلیفی سوێند خواردن لە تۆمەتبار ناکرێت. چیتان هەیە بیپرسن، ئەگەر پرسیارەکە لەبەرژەوەندیی من بێت وەڵام دەدەمەوە، گەر دژی منیش بێت چەندی لە دەستم بێت لە وەڵامەکەدا لۆف و دەوران لێ دەدەم".

فەرماندە: "نا بەخوا پرسیارەکە ئاوا نییە... دەمەوێ بپرسم وەك ئەوەی لە پەرتووکە پیرۆزەکان هاتووە، ئایا مرۆڤ لە ئادەم و حەواوە پەیدا بووە، یانیش وەك ئەو تیۆرییەی داروین دەڵێ، مرۆڤ لە ئاژەڵانەوە بنەچەکەی هاتووە، تۆ باوەڕت بە کامەیانە؟"

من: "بەڕێزم، من بە یاسای سزادانی تورکیی ژمارە ١٦٣ نەهاتوومەتە ئێرە، بۆیە ئەو پرسیارەی ئێوە کردتان دەکەوێتە دەرەوەی هۆکاری دەستگیرکردنەکەی من".

فەرماندە: "نەخێر نەخێر، مادەکانی ١٤١-١٤٢ش ناتوانێ لەحەقی تۆ بێت، جا تۆ وەڵامی پرسیارەکەم بدەوە".

من: "لەسەر ئەو بابەتە دەمەوێ بڵێم من باوەڕ بە هیچ پەرتووکێکی پیرۆز ناکەم، جا زەبوور بێ یان تەورات، یانیش قورئان، چونکە لەو پەرتووکانە خوا جوبرائیلی بۆ هەر حەفت قولینچکی گۆی زەوی ناردووە، ئەویش لە هەر یەکێکیان مشتێك خۆڵی هێناوە، خوداش لەو خۆڵە قوڕی دروست کردووە و شێوەی مرۆڤی داوەتێ، دواتر فووی لێ کردووە و ئادەمی خەڵق کردووە، حەواشی لە پەراسووی ئادەم دروست کردووە، لە ئەنجامی جوت بوونی ئادەم و حەواش مرۆڤ دروست بووە! "بەو شێوەیە بێت مرۆڤ بە دەستی لێزانانە و وەستایانەی خودا دروست کراوە، بەڵام من باوەڕم بەوە نییە. لەبەر ئەوەی گەر

مرۆڤ دروستکراوی دەستی خودا با، ئاوا ساختەچی و بێ ویژدان و زاڵم و وەحشی دەرنەدەچوو؟ حاشا، من خۆم بە دوور دەگرم لەوەی بڵێم مرۆڤ دروستکراوی دەستی خودایە، بەڵام باوەڕم بەوە هەیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵەوە هاتبێ، چونکە دوای تێپەڕینی ملیۆنان ساڵ، تا ئێستا زۆر خووی ئەو ئاژەڵانەمان لەسەر ماوە کە بە ئەژدادی خۆمانیان دادەنێن؟".

فەرماندە: "ئاخر مووسا چۆن دەبێ؟"

من: "سەیرکەن، کەر و هێستر لووشکە داوێن، ئێمەش بەهەمان شێوە لووشکە داوێین، شێر بە چنگی دەست و نینۆکەکانی پڕ دەداتە نێچیرەکانی، ئێمەش هەمان کار دەکەین، سەگ گاز دەگرێت، ئێمەش دەیکەین، پشیلە بەسەر دار و دیوار هەڵدەگەڕێ، ئێمەش هەمان کار دەکەین، هەموو ئاژەڵێکی بە هێز زوڵم لە لاوازەکان دەکەن، بەهێزەکانی ئێمەش زوڵم لە لاوازەکانمان دەکەین". قسەکانم تەواو کرد و ئەوانەی ئەوێ دەستیان بە پێکەنین کرد، فەرماندەکەش پێکەنی، ئینجا پێی گوتن: "هەتیوینە بە چی پێدەکەنن، کابرا ئەو قسانەی لەگەڵ ئێوەیە". ئینجا ڕووی لە من کرد: "گەر ئاوا بێت تۆ ئیسلامەتیت پێ باش نییە؟" منیش پێم گوت: "لەگەڵ ئەوەی کەسێکی دیندار نیمە، بەڵام ئایینی ئیسلام بە هیچ ئایینێکی دیکە ناگۆڕمەوە". فەرماندەکە پرسی"چۆن شتی وا دەبێت؟"، لەبەر ئەوەی ئیدی گفتوگۆکە چووبووە ناو چوارچێوەیەکی حەنەك و پێکەنین، منیش نموونەیەکی ئاوام بۆ هێنانەوە و بەردەوامیم بە قسەکانم دا: "حەز دەکەن با بچینە سەر بابەتی ڕۆژی دوایی. خوا بەپێی ڕیزبەندیی پایەبەرزیی لێپێچینەوە لەگەڵ نەتەوەکان دەکات. سەرەتا مووسا و جووەکان بانگهێشتی حزووری خۆی دەکات و لە مووسا دەپرسێت، من لەگەڵ تۆ قسەم کرد، دە فەرمانەکەشم

بە شێوەی نووسین دایتێ، وەك پێغەمبەرێکیش لە دونیا تۆم بۆ زۆر کار ڕاسپارد، بۆم باس بکە بزانم چیت کرد؟ مووساش لە وەڵامدا دەڵێ: من و گەلەکەم کارمان کرد و مرۆڤایەتیمان فێری کارکردن و قازانج کردن کرد، ئەتۆممان داهێنا و کارێکمان کرد ئەو وڵاتانە لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان هەر کاتێك ویستیان نەجەنگن. لە ڕێگای تیۆری سۆسیالیزمی کارڵ مارکسەوە کۆتاییمان بەو نایەکسانییە هێنا کە لە سەردەمی فیرعەونەوە بەرامبەر بە مرۆڤەکان دەکرا، ئینجا مووسا ناوی چەندان زانا و دانای یەهوودی دەژمێرێت کە خزمەتی مرۆڤایەتییان کردووە. خوا لە کارەکانی مووسا ڕازی دەبێ و دەڵێ مووسا و نەتەوەکەی ببەنە بەهەشت. ئەمجارە بانگهێشتی عیسا دەکا، تەواوی کریستیانەکانی جیهان و عیسا دەچنە خزمەتی خوا. ئینجا خوا لە عیسا دەپرسێ ها کوڕم تۆم لە نووری خۆم دروست کرد، دوای تەمەنی سی و سێ ساڵی بۆ ئاسمانەکان، واتا بۆ لای خۆم بەرز کردیتەوە، من تۆم بۆ ئەوە ناردە سەر زەوی تا شکست بە شەیتان بێنیت و ڕێگای ڕاست پیشانی مرۆڤەکان بدەیت و ئەو پەیمانەی بە حەزرەتی ئادەمم دابوو بیهێنییە جێ، دەی پێم بڵێ بزانم چیت کرد؟ حەزرەتی عیسا وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: چۆن چیم کردووە موقەدەس بابە، تۆ باز و قەلەڕەشت دروستکرد، من فڕۆکە و هەلیکۆپتەر، تۆ فیل و حوشتر و بارگینت خەڵق کرد، من تریلە و لۆری و پاسم دروست کرد، تۆ ڕۆژت بە هەتاو و شەویشت بە مانگ ڕووناك کردەوە، گەلەکەی منیش بە داهێنانی کارەبا تەواوی جیهانیان ڕووناککردەوە، تۆ نەفتت دروست کرد و لە قووڵایی هەزاران مەتر لە ژێر خاك لە مرۆڤت شاردەوە، ئێمەش دەرمانهێنا و خستمانە خزمەتی مرۆڤایەتی، ئێوە چەندەها ڤایرۆس و

نەخۆشیتان دروست کرد، بەڵام گەلەکەی من چەندەها چارەسەر و دەرزی و داو و دەرمانیان داهێنا و پێشمان بەو کارەساتە گرت. لەگەڵ ئەوەش، کریستیانەکان چەندان شتی دیکەیان داهێنا و خستیانە بەردەم خزمەتی مرۆڤایەتی. جگە لەوەی لە ڕووی ئەخلاقییەوە نەتەوەی کریستیان لە نەتەوەکانی دیکە بە ئەخلاق ترن، ئینجا خوا دەڵێ باشە باشە کورم، ئینجا عیسا و گەلەکەی دەنێرێتە بەهەشت.

نۆبەتی حەزرەتی محەممەد دێت، ئەویش بە شێوەیەك دێتە بەردەم خزمەتی خوا کە لە دواوەی دونیایەك عەرەبی بەدەوی و تورك و کورد و بەربەر و ئەفریقی و فارس و ئەفغانیی لەگەڵە. خوا هەمان پرسیار لە محەممەدیش دەکا و دەڵێ: یا محەممەد من تۆم وەك ڕەسولوڵلا، حەبیبولڵلا ناردە سەرزەوی، ئەرك و فرمانەکانیشتانم بە قورئان بۆ تۆ و گەلەکەت نارد، ئەی تۆ چیت کرد و چ سوودێکت هەبوو بۆ مرۆڤایەتی؟ لە وەڵامدا حەزرەتی محەممەد مەرجەکانی ئیسلام دەژمێرێ (شەهادەت هێنان، نوێژکردن، بەڕۆژووبوون، حەج، زەکات) خوا تووڕە دەبێت و دەڵێ ئەی ها لەگەڵ تۆ، ئەوانە ببەنە دۆزەخ.

دوای ئەو قسانەم بینیم لەوێ قیامەت ڕانەبوو، زانیم ئەوان بیر لە قسەکان دەکەنەوە، بە خەیاڵ ئاوا وێنای دەکەن، بەڵام لەو باوەڕەدام ئەوانەی ئەو ڕستانە دەخوێننەوە بۆچوونێکیان لەلا دروست بێت لەسەر ئەو بابەتە. ئینجا فەرماندە دوای قسەکانی من گوتی: "وەڵا کاکە تۆ ڕێکخستنێکی مەترسیداری، بە شەڕەفم یەك مانگ لات بمێنمەوە، هەم دەمکەیتە کورد پەروەر هەمیش بێ دینم دەکەی"، ئینجا فەرمانی بەوانەی ئەوێ کرد، بەیانی بمبەنەوە ماڵ.

بە نووسینی ئەو شتانە کەس وا هەست نەکات هیچ ئایینێك

لە ئاینێکی دیکە بە بەرزتر دادەنێم، وەك لەسەرەتاش باسمکرد، من کەسێکی باوەڕدار و دیندار نیمە، بۆیە، دەمەوێ شیعرێکی شاعیری گەورەی کورد جگەرخوێن لێرە بنووسمەوە، کە بۆ ئەوانەی نووسیووە شێخ و مەشایخەکان دەپەرستن:

**"دین مەبە، ئەو نە دینە."**

گەڕامەوە لادێکەم و دەستم بە ژیانی شوانکارەیی خۆم کردەوە، بەڵام لە چواردەورم ئەوەندە زوڵم و تیرۆری دەوڵەتم دەبینی، بەرگەگرتنیان ئاسان نەبوو، شوکرانەبژێربووم کە هێشتا شێت نەبوویمە. مادەم کاتیشی هاتووە دەمەوێ ئەو چیرۆکە کورتەی مێژووی کوردیتان بۆ باس بکەم:

زاڵی باوکی ڕۆستەم بەتەمەندا دەچێت، بۆیە کاتێك ڕۆستەم لە تەمەنی ١٤-١٥ساڵیدایە تەواوی بەرپرسیاریەتی و قارەمانیەتیی دەداتێ، وەك نموونەی سوڵتان موراد و سوڵتان فاتیح لە مێژووی عوسمانیدا. دوژمنەکانی سوود لەو دەرفەتە دەبینن و دێن هەموو مەڕ و ماڵاتەکەی لێ دەدزن، ڕووداوەکە دەگەیەننە زاڵ، لە وەڵامدا زاڵ دەڵێ: "هیچ کیشە نییە، ئێمەش زۆرمان دەست بەسەر مەڕ و ماڵاتی ئەواندا گرتووە"، ئەوجارە دوژمن دێتەوە و لە مێژووی عەشیرەتی ڕۆستەمدا قەباحەتترین کار دەکەن و تەواوی گوریسی چادرەکان دەبڕن، ئەو ڕووداوەش بە زاڵ دەڵێن، بەڵام ئەو دیسان دەڵێ: "کێشە نییە ئێمەش چادرەکانی ئەوانمان پارچە پارچە کردبوو"، دوژمن جارێکی دیکە دێت و ئەوجارە دەستدرێژی دەکاتە سەر کچ و ژنەکانی عەشیرەتەکەی ڕۆستەم، بەڵام ئەوجارە کاتێك ئەو ڕووداوە بە زاڵ دەڵێن، دین و هار دەبێ و دەڵێ: "ناموس ها" ئینجا داوای چەکەکانی دەکات، دواتر دەڵێ: "هەندێکم لەسەری بدەن تا سەرم گەرم دابێ"، ئینجا ئەسپەکەی خۆی بەناوی (ڕەخشێ بەلەك)ی بۆ

ئامادە دەکەن، جا میزراق و گورزەکەی هەڵدەگرێ و بە دوای دوژمندا دەگەڕێ، بەو تەمەنە ئیختیارییەوە هەموو دوژمنەکانی پەرێشان دەکات. خەڵکی ئێمەشی کوشتبوو ئەشکەنجەی زۆری دابوون، بەشێوەیەك بەشێکیان لە ژێر ئەشکەنجە شێت ببوون.

ئیدی چیبکەن، هەر لە کۆنەوە ئێمە ئەو ئەشکەنجە و ژیانە کولە مەرگییە دەبینین، بەڵام دواتر بیستمەوە گوو دەرخواردی گەلەکەم دەدەن و دەستدرێژیی سەر ناموسیان دەکەن، بەڵام باو باپیرانی من وەك ڕۆستەم و زاڵ گورزیان نەبووە، بۆیە، منیش گوتم پێنووسەکەمم بدەنێ، ئینجا تۆبەکەم شکاند و دەستم بە نووسین کردەوە. ساڵ ببووە ١٩٨٧.

لەو ڕۆژەوە، دیسان بە پشت بەستن بە ویژدان و زانیارییەکانم، هەموو ئەو بۆچوونانەم دەنووسم کە سوود بە گەلەکەم و مرۆڤایەتی بگەیەنێت. کاتێك سەیری دواوەش دەکەم و دەمەوێ حەق و حیسابێك لەگەڵ ویژدانی خۆم بکەم، هەموو تاوانەکانم تەنیا ئەوە بوو داواکاری و بۆچوونەکانم لە چوارچێوەی ئەوەیە کە کورد بە شێوەیەکی مرۆڤانە ژیانیکی ئاسایی بەسەر ببات، بۆیە، پێویستیش ناکات بڵێم هەموو تاوانێکی لەو شێوەیەش بۆ من مایەی شەڕەف و گەورەییە.

## دوا دەستگیرکردنم

لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٨٩، پارتی سۆسیالیست لە دیاربەکر پانێلێکی لە ژێر ناونیشانی (گۆڕانکارییەکانی ئەورپا بەرامبەر بە کورد) ڕێکخستبوو. لەبەر ئەوەی وەکو قسەکەرێك داوەت کرابووم، بۆیە منیش بەشداریم کرد. پانێلەکە لە ساڵۆنێکی سینەمایی زۆر گەورەی دیاربەکر بەناوی سینەما دیلان بەڕێوەچوو، سەرباری ئەوەی شوێنەکە زۆر زۆر قەرەباڵغ ببوو، بەڵام پلانەکان تا بڵێی بە باشی بەڕێوەچوون.

ڕۆژنامەنووسێك بە بینینی حەشاماتی ئەو خەڵکە لە منی پرسی: "کاك مووسا دەڵێن ئەو خەڵکە هەمووی لەبەر تۆ هاتووە، نەك بۆ پارتی سۆسیالیست". وتەکانم لە پانێلەکە تەواو بوو، بەڵام بێ ئەوەی ئاگادار بم، پۆلیس هەمووی تۆمار کردبوو. بۆیە داوایەکیان لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی دیاربەکر دەرهەق کردمەوە، بەبێ ئامادەبوونی من دادگا لە ٢٣-١-١٩٩٠، بڕیاری دەستگیرکردنی دەرکردم، ئینجا دانیشتنی دادگاییکردنیشم بۆ ١١ی نیسانی هەمان ساڵ دوادەخات. بەهۆی ئەوەی دانیشتنی دادگایان ئەوەندە دواخست، هەستمکرد نیەتیان بەرامبەرم چاك نییە، چونکە، سەبارەت بە بڕیاری دادگا، ئاگادارکردنەوەیەکی فەرمیشیان بۆ نەناردم، هەموو ئەو زانیاریانەشم بەڕێکەوت لەلایەکەوە پێگەیشت.

بۆ ئەوەی ئامادەی دانیشتنی دادگا بم، دوو ڕۆژ زووتر بە فڕۆکە چوومە دیاربەکر، پۆلیس ئاگاداری هاتنەکەم بوو، بۆیە لە فڕۆکەخانە دەستگیریانکردم، لەوێشەوە منیان بردە دادگا، دوای ئەوەی لە ڕاستیی ناسنامەکەم دڵنیابوون، منیان بردە زیندانی ناوداری تیپی E لە دیاربەکر. لەوێ ناویان تۆمارکردم، منیش داوامکرد لە قاوشی ژمارە ٣٥م دانێن، ئەوانیش ڕازی بوون، بەڵام دوای ماوەیەك بە فەرمانێك منیان گواستەوە بۆ زیندانی ئاسایی تاوانباران لە دیاربەکر. لەوێش لە بری ئەوەی لە قاوشی بەتەمەنەکانم دابنێن، منیان لە قاوشی منداڵان دانا. بەوشێوەیە وەك ئەوەی ئەحمەدی خانی دەیگوت، کورد هەر لە لەدایکبوونییەوە مەحکوومە، جا لە تەمەنی حەفت ساڵییەوە تا حەفتا ساڵی دەبێ بەختمان وەك یەك بێت.

دوای دوو ڕۆژ منیان بردە دانیشتنی دادگا، لەگەڵ ئەوەی دانیشم بەوەدا نا ئەوە دەنگی منە تۆمارکراوە، بەڵام دادگا بۆ دڵنیابوونەوە لە تۆمارە دەنگییەکە، دۆسیەکەمی بۆ شوێنێکی دیکە بەرز کردەوە و بەو شێوەیەش بیست ڕۆژی دیکە دانیشتنەکە دواخرا، منیش ئەوەم بە هەنگاوێکی باش نەدەخوێندەوە، چونکە دەمزانی ئامانجیان ئەوەیە بە هەر هەنجەتێك بێ ماوەیەکی زیاتر لە زیندان بمهێڵنەوە، چونکە لەسەر ئەو دۆسیەیە دەتوانرا بەبێ دەستگیرکردنیش دادگاییم بکەن.

یەکی مایسی ساڵی ١٩٩٠ لە دوایین دانیشتنی دادگا ئامادەبووم، ڕاپۆرتی بەدواداچوون بۆ تۆمارە دەنگییەکەشم

کرابــوو، ئەوە پشتڕاســت کرابــۆوە کە دەنــگەکە هیــی مــنە. پارێزەرەکانم بە درێژی بەرگرییان لە من کرد، سـەرۆکی دادگـا داوای لێ کردم خۆشم بەرگـری لە خـۆم بـکەم، منیش لەسـەر داواکــارییەکەی ئەو گــوتم: "دادوەرە بەڕێزەکــان، دەمەوێ زۆر شت بلێم، بەڵام ئێرە دیاربەکرە، بۆیە نامەوێ نمایشی هێزوتوانای خۆم بکەم. وەلێ جەنابی سەرۆکی دادگـا، تەنیـا ئەوەنـدە دەڵـێم گەر ئێوە کورد بـن و باوکتـان کـۆچی دوایـی بکـات، ئێـوەش دواتر کوڕێکتان ببێ و بتانەوێ نـاوی باوکتـان لەو منـداڵە بنـێن، بەڵام حکــوومەت بە بەهــانەی قەدەغەیــی ڕێگــری لە کــارێکی ئاواتــان بکــات، ئەرێ ئێــوەش بــن شــێت و هــار نــابن؟! جەنـابی داواکاری گشتییش، لە نامەی تۆمەتەکـانی جەنابـت باسـتان لەوە کــردەوە مــن خەڵکــی هــان دەدەم تــا ســەبارەت بە پرســە نەتەوەییەکان بێنە جۆش و خـرۆش، بەڵام بە پـێچەوانەوە خەڵـك جۆش و خرۆشی منی زیاد کرد، بڕیاریش هی ئێوەیە".

سەرۆکی دادگـا داوای بۆچـوونی ئەنـدامانی دادگـای کـرد، داواکاری گشتی داوای ئازادکردنمی کـرد، سـەرۆکی دادگـا و ئەندامانی دیکەش بۆچوونیان لەگەڵ بۆچوونی داواکاری گشـتی هەمان شت بوو، بۆیە بڕیاری ئازاکردنیان دام.

سـەرەڕای ئەوهەمـوو کـارانەش، بەڵام کێشـەکەم هەر تەواو نەبیوو، چونکە دوای ئەوەی پۆلیس منی لە بەندیخانە ئـازادکرد، بەڵام تا دەمژمێر ١٠ی شەو، منی لە هۆبەی یەکی بنکەی پۆلیس هێشتەوە، تـوومەزە بیریـان لەوە کردبـۆوە لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە یەکی مایس بووە، بۆیە منیان لای خۆیان هێشتۆتەوە تـا بەهـۆی

منەوە هیچ ڕووداو، یان خۆپیشاندان و ناڕەزایەتییەك لە کاتی دەرچوونم ڕوو نەدات. دەمەوێ بڵێم هەموو ئەوانە کۆتاییان هات و ئەوە دوایین دانیشتنی دادگا و دەستگیرکردنمە، بەڵام ئێستا لە دادگای ئاسایشی دەوڵەتەوە دوو تا سێ داوای دیکەم لەسەر کراوەتەوە.

ژیانی ئەوجارەی بەندیخانەم زۆر خۆش بوو، چونکە لەناو ئەو هەموو منداڵە جوان و زیتەڵەیە، خۆم وەك باپیرێك یان وەك مامۆستایەك دەهاتەبەرچاو، زۆربەیان بەهۆی دزیکردنەوە دەستگیرکرابوون. ڕۆژانە ئیفادەی یەك بەیەکیانم وەردەگرت، هەمووشیان وەك نموونەکەی ڤیکتۆر هۆگۆ، منداڵە برسییە بێ دەرامەتەکان بوون. هەموویان منداڵی برسی، بێ خاوەن، بێ کار، ئاوا بە جێهێڵدرابوون، بۆیە، یان دزییان دەکرد، یانیش لەبرسان دەمردن، چونکە ئەوان نە چووبوون لە بانقەکان قاسەی پارە بشکێنن، نەدە چووبوونە ماڵە دەوڵەمەندەکان زێڕ و کەلوپەلی گرانبەها بدزن، بەڵکو هەموو قەباحەت و دزییەکەیان بریتی بوو لە بردنی شفتیەك، دزینی پانتۆڵێك یان پێڵاوێکی لاستیك، تاد... هەموو ئەوانەش تەنیا بۆ بەردەوامیی ژیانیان بوو. کاتێك باسی بەسەرهات و ڕووداوەکانی خۆیان دەکرد، ئەوەندە شەرمن و قشت بوون نەبێتەوە، ئەوان بە تۆمەتی دزی کردن دەستگیرکرابوون، بەڵام من ئەوانم بەو حاڵەی خۆشیانەوە زۆر پێ لەسەرووی منداڵە بەناز و فیزەکانی شەقامی بەغدادی ئیستانبوڵ بوو، بەتایبەتیش ڕۆژی جێ هێشتنی زیندانم هەرگیز بیر ناچێتەوە، چونکە لە دوای من دەستیان بە گریان و فیغانێك

کرد دەتگوت ڕۆژی حەشرە، کە لە ٧٥ ساڵی تەمەنمدا قەت دۆخی وا تراژیدیم نەدیتبوو.

## دەربارەی بیرەوەرییەکانم

ئەوانەی ئێوە دەیخوێننەوە یادەوەریی خۆمە دەیانووسم، لە هەمان کات ئەو نووسینانەم یادەوەریی نەتەوەیەکی زوڵملێکراوە بەناوی کورد و هیی وڵاتێکە بەناوی کوردستان، لە سەردەمێکی دیاری کراو و وڵاتێکی ناسراو. من، وەکو هەندێك لەو نووسەرانەی یادەوەرییەکانیان دەگێڕنەوە، باسی ئەوە ناکەم دایکم منی زۆر خۆش دەویست و خواردنی خۆشی بۆ دروستدەکردم، بەتایبەتی ئەوانەی من زۆرم حەز لێبوو، یانیش بڵێم لەگەڵ خێزانەکەم زۆر باش لەیەك دەگەیشتین و ژیانێکی خۆش و بەختەوەرمان هەبوو. من، نامەوێ باسی ئەو بابەتە تایبەتییانە بکەم. چونکە باسکردنی ئەو مژارە کەسیانە، لەناو کۆمەڵگایەکی پەرێشانی وەکو ئێمە،هیچ واتایەك نادا، لەبەر ئەوەی هەموو دایکێك بەشێوەیەکی سروشتی ڕۆڵەکەی خۆی خۆش دەوێ و هەموو ژن و مێردێکی بە ناموسیش بە ڕێز و خۆشەویستییەوە لەژێر بنمیچی ماڵێك بەیەکەوە ژیان بەسەر دەبەن. ئامانجی من باسکردنی خێزانە گەورەکەیە، باسکردنی کۆمەڵگای کوردی و وەرگێڕان و باسکردنی دەرد و کەسەرەکانیەتی بۆ سەر ڕووپەڵەکانی مێژوو، تا شتێك لەبارەی ئەو ژیانەی ئێستامانەوە بۆ منداڵانی کورد لە داهاتوو جێ بهێڵم، بەپێی توانا و زانیارییەکانیشم هەوڵ دەدەم لە ڕێگای نووسینی

یادەوەرییەکانمەوە ڕێگایەکی ڕاست بۆ ئەو منداڵانە دیاری بکەم بۆ داهاتوویان.

جگە لەوەی ئەو پەرتووکە یادەوەریی تایبەتی کەسێکە، لەهەمان کات مێژوویەکی سادەی کوردستانیشە، بۆیە، لەو ڕووەوە ئامانجی سەرەکیی، وەك هەموو پەرتووکێکی مێژوویی، باسکردنی ڕووداو و بەسەرهاتەکانە بۆ نەوەی نوێ، لەبەر ئەوەی نەوەی تازەش زۆر پێشکەوتووتر دەبن لە نەوەی کۆن، بۆیە پێویستە ئەوان لەو هەڵانە دووربکەونەوە کە نەوەکانی پێش خۆیان تووشی ببوون، تا لە ڕێگایەکی ڕاستەوە خەبات و کاری خۆیان بکەن.

من هیچ کات نەمویستووە ببمە کەسێکی زانیاری فرۆش و ئەوەی بینیومە بە خەڵکیی بفرۆشمەوە، بۆیە، پێم وایە یەکێك لەو هۆکارانەی ئەمڕۆ دەتوانم بە ڕوویێکی سپی بچمە بەردەم ئەو نەوە تازەیە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا زۆر دوو دڵیش بووم لە نووسینەوەی ئەو یادەوەرییانەم، بەڵام وەك لە پێشەکیی بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکەش ئاماژەم پێ کرد، زۆریان داوا لێ کردم بۆ کارێکی ئاوا، لەبەر ئەوەی نزیکەی ٧٧ ساڵی تەمەنم لە پێناو باشترکردنی ژیانی کولەمەرگانەی کوردستان تەرخانکردووە، بۆیە، ئەو داواکارییانە لەو تەمەنەم وەکو ئەرکێکی نیشتمانی و دۆخێکی ڕۆحی پاڵی پێوەنام بۆ بە جێهێنانی. لەگەڵ ئەو دەستخۆشی و تەقدیرانەی لە دەرەوە و ناوەوەی وڵات بەدەستم گەیشت دوای بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی یادەوەرییەکانم، زیاتر جۆش و خرۆش دایگرتم تا

دەست بە نووسینی بەرگی دووەمیش بکەم، گەر تەمەنیش ڕێگام پێبدا، بیر لە نووسینەوەی بەرگی سێیەم و چوارەمیش دەکەمەوە[1].

ئەوەی دەیخوێننەوە، یادەوەریی ٧٧ ساڵی کەسێکە لەناو نەشکەنجە و ئازار و چەوسانەوە، بۆیە، کەس چاوەڕوانی دێڕی بە باق و بریقەی ژیانی ئیستانبوولم لێنەکات، چونکە، هیچ یادەوەرییەکی شیرینم نییە تا بینووسمەوە. تەواوی بیرەوەرییەکان، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بە زوڵم و ئەشکەنجە و زیندانیکردن تێپەڕیوە. هەر دێڕێکی ئەو پەرتووکە دڵتەنگی و خەمباریی تاکەکەسین، یانیش باسکردنی چۆنیەتی کۆمەڵکوژیی گەلەکەمە. هەندێکیشیان باسی ڕاگواستن و سووکایەتی پێ کردنی بە ناحەق و چەندان ڕووداوی بێ ناموسی و بێ ئەخلاقییە بەرامبەر نەتەوەکەم کراوە، کە شەرم دەکەم لێرە باسیان بکەم، بۆیە، من چۆن ئەو ڕووداوانە بە دێڕی جوان و وشەی ڕازاوە لە قالێبکی ئەدەبی باس بکەم؟ لەگەڵ ئەوەی یادەوەرییەکانم هەموویان هەر باسی چەوسانەوەش بێت، بەڵام ئەمانە لاپەڕەی شەرەفمەندانەی ژیانی من و گەلەکەمن. ئەو پەرتووکەی من، وەك ئەوانەی کەنعان ئێڤرن و ئیحسان سەبری چاغلایانگل، تەنیا باسی خوێن و پەتی سێدارە نییە. بەڵکو، گەر دەربڕین ڕێ بدا، پەرتووکەکەم هاواری بەشەرەفانەی قارەمانێکە دژی ئەو هیچ و پووچانەی دەیبەنە سەر کورسیی لە سێدارەدان، یاخود بێباکانە خوێنی دەڕێژن.

---

[1] تەمەن ڕێگا نادات مووسا عەنتەر بەرگی سێیەم و چوارەمی بیرەوەرییەکانی بنووسێتەوە، چونکە لە بەرواری ٢٠-٩-١٩٩٢ لە دیاربەکر شەهید دەکرێت. (وەرگێڕ).

یادەوەرییەکانی حەفتاساڵی ڕابردووم، بۆ مێژووی تورکیا، بریتییە لە نووسینەوەی هەڵە کۆمیدییەکانیان، چونکە بەردەوام دەڵێن: "بەڕێزم هۆکاری هەرە سەرەکیی دواکەوتنمان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئێمە ۲۰۰ ساڵ دوای ئەوروپییەکان قبووڵی وەرگرتنی دەزگای چاپکردنمان کرد". بەڵام کەسیان هەڵناستێتەوە و بڵێ ئەوەی تێپەڕی تێپەڕی، بەڵام ئێستا بە پارەی ئیسرائیل چەندان ئامێری زۆر پێشکەوتوومان بەدەست گەیشتووە، بەو شێوەیە کێشەی نەبوونی چاپخانەشمان نەماوە، ئەی بۆ هێشتا ٤۰۰ ساڵ دوای ئەوروپییەکانن و دیموکراسی و یاساکانی مافی مرۆڤ قبووڵ ناکەن؟ سەیری ڕووڕەشی ئەو دەوڵەتە بکەن، دەربارەی ئاخافتن بە زمانی کوردی، چونکە ئەوڕۆ تورکیا ڕێگا بە ۲۰ ملیۆن کوردی وڵاتەکەی نادا بە زمانی دایکی خۆی قسە بکات، یان چەندان ڕۆژنامەنووس و کارەبەدەستانی دەوڵەت قسەکردنیان بە کوردی پێ جوان نییە.

گەر سەرنج بدەن، لە تورکیا دۆخێکی زۆر سەیر هەیە، بەشێوەیەك هێزە داپڵۆسێنەر و فاشیستەکان لە ڕۆژێکدا دێنە سەر دەسەڵات، تا ئەو ئاستەی دەستوور و پەرلەمانە کۆمیدییەکەمان دەخەنە ژێر پێیان، بەڵام کە دێتە سەر باسی دیموکراسی، هەمان تاس و حەمام دێتەوە گۆڕێ و دەڵێن: "بەڕێزم دیموکراسی هێدی هێدی بەرهەم دێ".

دەمەوێ لێرە نموونەیەك بهێنمەوە هەرچەندە بۆ نووسینەوەشی جوان نییە، بەڵام هەر دەمەوێ باسی بکەم. پیاوێکی قەبە بە ئافرەتێکی لەشفرۆش دەڵێ: "ئەی هاوار ئافرەت تۆ دوای ئەو هەموو سەرجێیە چۆنە دوو گیان نابی؟" ئافرەتەکەش بەو شێوەیە وەڵامی دەداتەوە" چۆن دووگیان بم ئەفەندی؟ یەکێکتان دەکا و ئەوەی دیکە خراپی دەکا." بۆ باسی ئەو نموونەم کرد دەزانن؟

چونکە تورکیا ڕێك وەك ئەو نموونەیە، چونکە هەر دەبینم یەکێك دێ پایەکانی دیموکراسی دادەنێ، بەڵام دوای ئەو یەکێکی دیکە دێتە سەر دەسەڵات و ئەوەی پێش خۆی بە دڵ نابێ و هەمووی دەڕووخێنێ و لە سەرەتاوە دەست پێدەکاتەوە. جا لەگەڵ هاتنە سەر دەسەڵاتی هەر کەس و لایەنێك گوێمان لەو ڕستە سواوە سەت بارە کراوە دەبێتەوە: "وردە وردە دیموکراسی بنیاد دەنێین." هەر لە مستەفا کەمال و عیسمەت ئینۆنۆ و جەمال پاشا و ئەوانی دوای ئەوانیش، تا کەنعان ئێڤرینی کۆچەری بەرەگەز یوگسلاڤیی، کە پەنجا ساڵ نا بەڵکو هەموو تەمەنی خۆی بە خوێن ڕشتن بەسەربردووە، جا لەو تەمەنە لە ترسی ئەوەی لە ڕابردوو کردوویەتی لە ژێر سێبەری پەرژینی بە تێل و پاریزگاریی سەگە ڕاهێنراوەکان دەژی، جگە لەوەی بەردەوامیش هەست بەوە دەکات هاکا لەلایەك بە نیشانشکێنیك دەکوژرێ.

ئەی هاونیشتمانی و هاووڵاتییانی بەڕێز و عەزیزم، ئەی مرۆڤدۆستانی جیهان، لەو یادەوەرییانەمدا گەر سەرنج لە تابلۆی دیموکراسی تورکیا بدەن، دەبینن لەناو ئەشکەنجە و ئەزیەتی سەرجەم گەلانی تورکیا زۆرترین پارچەی کێکەکە بەر کورد کەوتووە، بۆیە، تکاکارم هەرگیز کاتێك ئەو پەرتووکە دەخوێننەوە چاوەڕوانی بەسەرهاتی خۆش و شیرینم لێ نەکەن وەك ئەوەی لە بەشێك لە ڕۆمان و یادەوەریی کەسانی دیکە دەیخوێننەوە، چونکە من تەنیا بەسەرهاتەکانی خۆمتان بۆ دەگێرمەوە، بەبێ هیچ وەسفێکی ئەدەبی.

لەبەرگی یەکەمی یادەوەرییەکانم بە کورتی باسی هەندێك ڕووداو و کەسایەتیم کردبوو، بەڵام بەپێی ئەو تێبینی و نۆتانەی لە خوێنەرانمەوە بەدەستم گەیشتووە، دوای بڵاوکردنەوەی

بەرگـی یەکەمـی، خـوێنەران داوای زیـاتر باسـکردنی ئەو بەشـە دەکەن، بە ورد و درشـــتی. دەمەوێ ئەوەشـــتان پێبڵـــێم لە بڵاوکردنەوەی ئەو پەرتووکە مەبەستم قازانجی پارە نییە، چونکە لەو تەمەنەهیچ پێویستییەکم پێی نییە، لەبەر ئەوەی کاتێك دۆخی کورد پەرێشان و سەرگەردان بێت هیچ نیەتـێکم نیـیە بە پـارەی زۆر ژیانێکی خۆش بەسەر ببەم، گەر هەستێکی واشم هەبێت، بە کارێکی دزێوی دەزانم بۆخـۆم. بەڵکـو ئامـانجمە لەو پەرتـووکە بەشێوەیەکی زیندوو بۆ نەوەکانم و تەواوی مرۆڤدۆستانی جیهان شـتێك بـکەم کە سـوودیان پێبگـات، بـۆیە گەر لەو بۆچـوونەم سەرکەوتن بەدەست بهێنم، خۆم بە بەختیار دەزانم.

# بەشی یەکەم
# کەسایەتییەکان و ڕووداوەکان

### کینیاس کارتال و جوانەگا

لای من، وەبیرهاتنەوەی ڕووداوەکان زۆر سەیرە، چونکە پێموابێ جوولەکە کۆنەکانیش وەك من بووینە، لەبەر ئەوەی بە هەموو لادەر و لات و پاتیکیان گوتووە پێغەمبەر، ئینجا دواتر گوتوویانە تا ئێستا ۲۰ هەزار پێغەمبەر هاتۆتە سەر دونیا. من نامەوێ ببمە یەکێك لە پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل، چونکە بە بیروباوەڕی ئێمە، لە دوای حەزرەتی محەمەد هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نایەتە دونیا، بەڵام دیسان ڕووداوێکی لەو شێوەیەی حەزرەتی محەمەد هەیە کە دەڵێ: "ڕۆژگارێك دێت، هەرکەسێك لە نەتەوەکەم کە مێشك و هۆشی لەسەر خۆی بێت وەك موسوڵمانێك، دەبێتە هاوتا و ئاوکووفی پێغەمبەرێکی بەنی ئیسرائیل".

ساڵی ۱۹۵۷، لەسەر داوەتی کینیاس کارتاڵ، چوومە وان. دیتم سەرجەم کارەکانی لادێکەیان بە دەستاڕ و پێداویستیی زۆر سەرەتایی و زۆربەی کاری گواستنەوەشیان بە ئاژەڵی بار و گا دەکەن. بە مامە کینیاسم گوت: "مامە ئەو کارانە چۆن بەو گایانە بەڕێوەدەبەن؟ چونکە لای ئێمە بۆ بارهەڵگرتن تەنیا ئەسپ و هێستر و کەر بەکار دەهێنین، چۆنە ئێوە هەمان کار بەو گایە بێ مێشکانە دەکەن؟ لە کاتێکدا مێشکیان زۆر وشکە و ئاوا بە

ئاسانی فێری کارەکان نابن". لە وەڵامدا مامە کارتاڵ گوتی: "مووسا، کوڕی خۆم، ڕاهێنانی گا زۆر ئاسانە، وەرە با بۆت باسکەم چۆنە: ئەو ئاژەڵە کاتێك جوانەگایە و تەمەنی زۆر هەڵنەکشاوە باش ئاگامان لێی دەبێت، دواتر دوو جۆرکی گەورە پڕ خۆڵ دەکەین، تا دەگاتە نزیکەی دوو سەت کیلۆ، ئینجا بەباشی دەیبەستینەوە، دواتر لە دەشتایەکی پان و بەرین بەرەڵای دەکەین، لەگەڵ ئازاد بوونی ئەو ئاژەڵە لوشکە داوێ و هەڵدەپەڕێ و جوولەی سەیر سەیر دەکات، بەڵام دواتر لەژێر ئەو بارە قورسە ماندوو دەبێ و لەناو ئاو و ئارەقە هەڵدێ، لە کۆتاییدا خۆی ڕادەستی قەدەر دەکات، بەو شێوەیە تا نزیکەی هەفتەیەك یان دە ڕۆژ لەسەر ئەو کارە بەردەوام دەبین، دواتر دەبێتە ئاژەڵێکی چاکی بارهەڵگر".

من ئەو یادەوەرییەم لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاك کینیاس بۆ ئەوە گێڕاوە: لە ماوەی ٧٠ ساڵی کۆماری تورکیا ناسنامەی کوردی قەدەغەکرا، هەتا هێنانی ناوی کوردیشیان، بەو یاسایە هەڵبەستراوانەی خۆیان، وەك تاوان هەژمارکرد، بۆیە، وەك چیرۆکی گاکەی مامە کینیاس بەو لۆژیکە نەوەیەکی ئاوایان بەرهەمهێنا، کە خەڵکێکی زۆر دژی ناوهێنانی کوردن. دوایین نموونەشمان لە ٦-١١-١٩٩١ لە پەرلەمانی تورکیا دیت، لە ڕووداوی سوێندخواردنی لەیلا زانا و خەتیب دیجلە. بەشێوەیەك چەندان زرتە زەلام و ئەو سولێمان دەمیرەڵەی بە کەسێکی عاقڵ و تێگەیشتوومان دەزانی، بەو هەیکەلە گەورە و دەستە چەپەڵانەی دژی ئەو دوو کوردە لە پەرلەمان لە مێزەکەی پێش خۆی دەدا، هەندێکیشیان پڕیان دەدا ئەو لۆگۆ ڕەنگا و ڕەنگانەمان کە لە یەخەی لەیلا زانا و خەتیب دیجلە بوو.

باشە ئەی پیاوە مێشك وشکەکان، ئێمەی کورد سەدان ساڵە

بەردەوام ڕێــز و حــورمەتی ڕەنــگە نەتەوەیــی و ئاڵاکەتانمــان نەگرتــووە؟ لە ئێــوەش زیــاتر لە ڕێگــای ئەو ئــاڵایە خوێنمــان نەڕژاوە؟ تەنیا لەبەر ئەوەی لە کۆندا ئاڵاکەتـان نـاوی (سـانجاق) بوو، کە بە مانای بەرماڵ و جەسارەت و قارەمانی دێـت، ئێمەی کــوردیش ماناکــانی نــاو ئەو ئاڵایەمــان لە خــۆی و نەتەوەکەی بینی، بۆیە، بە گیان و بە ماڵ بۆ هەمان مەبەسـت گیـانی خۆمـان فیــدا کــرد. باشــە ئەی بــۆ ئەو کــوردە بێبەخــتەی ناوەڕاســتی ئەنــــادۆڵوو چ خەوشــــێکی هەبــــوو کە ئەو هەڵســــوکەوتە وەحشییانەتان دژی قردیلەکەی پیشاندا؟.

## ئەفسەری یەدەگیم و گەلی بۆڵو

لە ســاڵانی ســییەکان، لە قوتابخــانەی ئامــادەیی، ســێ وانەی پەروەردەی سەربازی لە کۆتایی هەموو ساڵێك بە قوتابیـانی ئەو قۆناغە دەگوتراوە. من لە ئامـادەیی ئەدەنەی کـوران دەمخوێنـد، لەگەڵ وانەکان دەرسی سەربازیشمان هەبوو، مامۆستاکەمان پلەی سەربازیی ڕائید بوو، هێشتاش ناوەکەیم نەزانی، چونکە ئەوکـات تۆپی بۆفۆرست زۆر بەناوبانگ بوو کە لە بەشی تۆپخانەی سوپا بەکار دەهێندرا، بۆیە، ئێمەش بەو مامۆستایە ڕائیـدەمان دەگـوت بۆفۆرست.

ڕۆژێك لە ئەدەنە چووینە کامپی سەربازی، بینیم سـەربازێکی بەتەمەن، وەك ئەوەی بیەوێــت لەو نــاوە پیاســە بکــات نەك ئەرکێکی سەربازی بە جێ بهێنێـت هەر وادەکـات بە ئەسـپێکی جوانەوە زوو زوو بە تەنیا بە پێشمان دا دێت و دەچێت. لێینزیك بوومەوە و سلاوم لێ کرد، بەڵام سـەربازەکە تـورکی نەدەزانـی، چونکە بە کوردی وەڵامی دامەوە، بۆیە دەستمان بە قسان کرد:

- لێم پرسی کاکۆ ناوت چییە؟

- جارولّلا
- ئەویش پرسی تۆ خەڵکی کوێی؟
- منیش پێم گوت خەڵکی نوسەیبینم
- کوڕی کێت پێ دەڵێن؟
- من کوری عەنتەرم، لە عەشیرەتی تەمیکا.
- منیش خەڵکی ڕایتمێمە لە عەشیرەتی دەکوشوری.

گفتوگۆکەمان لەوە درێژتر بوو، بەڵام هەر ئەوەندەم بیر ماوە. ئەو ناوی جارولّلا بوو، لە عەشیرەتی دەکوشوری نوسەیبین بوو، ناسیاوی هاجۆی برا گەورەی عەشیرەتەکەمان بوو. باسی ئەوەی کرد کاتێك وەکو بەندییەک هەڵهاتووە، چووەتە لای تاهیری مەحموود و حوسێنێ ئەسعەدێی مامم لە سووریا، ئەوانیش زۆر بە دەمیەوە چووبوون، بۆیە، منیش پرسیاری مامەکانم لێ کرد، ئەویش ئەو قسانەی مامەکانمیی بۆ گێرامەوە کە پێیانگوتووە: "کوڕم ئێمە فەرمانمان بە عەشیرەتی خۆمان کردووە ئەو کەسانە بپارێزن کە لە کێشەی دوژمنداری و نەتەوەیی تێوە دەگلێن، چونکە تورك بەو یاسایانەی خۆیان دایان ناوە ئەو کەسە بە تاوانبار دادەنێن". کاتی خۆی ئەو سەربازە تەمەن مام ناوەندییە کوردە، لە شۆڕشی حاجۆ ڕۆڵێکی گرنگی بینیبوو، لە هەمان کات بۆفۆرستی فەرماندەی کامپەکەمان ئەوسا لە کوردستان ئەفسەری پلە یەك بووە. لە یەکێك لە شەڕەکانی نێوان کورد و تورك لە ناوچەی دێرا چۆمەرا، بۆفۆرستی ئەفسەری پلە یەك لەگەڵ گرووپەکەی لە شەڕەکە دەشکێن و خۆشی دەکەوێتە دەست هێزە کوردییەکان، بەڵام ئەو جارولّلایە پارێزگاریی لێدەکا و دوای ڕزگارکردنیشی دەینێرێتەوە ناو هێزەکانی تورکیا.

دوای تێپەڕینی سەردەم و دروستبوونی چەندان گۆڕانکاری،

لێبووردنی گشتی دەردەکرێت و جارڕوڵڵا بە تەمەنێکی درەنگەوە لە بەشــی تۆپخـانە لە ئەدەنە دەچێـتە خزمەتــی ســەربازی. هەر چۆنێـك بێـت وا ڕێـك دەکەوێـت ڕائیـد بۆفۆرسـت جـارڕوڵڵا دەناسێتەوە. بۆیە، ئەو پۆز و کەیـف و سـەفایەی جـارڕوڵڵا دوای ئەوە دەست پێدەکات، چونکە ڕائیدەکە ئەوی وەکو مەردێـك و دۆستێکی نزیکی خۆی داناوە، بەشـێوەیەك جـارولڵای لە هەمـوو ئەرکێك بەخشیبوو تا ماوەی سەربازییەکەی بە ئاسانی تێبپەڕێت.

ساڵی ١٩٤١، چوومە کۆلێژی یاسای زانکـۆی ئیسـتانبوول. لە زانکـۆش ٢ سـاڵ پەروەردەی سـەربازی وەك ئەرك بـوو. بـۆیە، ئەوەی ئەو پێــنج ســاڵەی پەروەردەی ســەربازییان بینیبــوو، بڕوانامەیەکیـان تـایبەت بەو پەروەردە سـەربازییە دەدایە. منـیش یەکێـك بـووم لەو کەسـانەی ئەو بڕوانـامەیەم وەرگرتبـوو، بەڵام هەر چۆنێك بێ، من وەکو کەسێکی ئاسـایی نەبـوومە عەریـف، چونکە بەندیخانە و لێپێچینەوە و بینە و بەردەکانیـان، منیـان لەو ئەرکە نیشتمانییە سارد دەکردەوە. جا بۆ ئەوەی نەچـمە خزمەتـی سەربازی هەموو مـاف و ڕێگاکـانم بەکارهێنـا، بەڵام دواجـار بە ناچـاری لە سـاڵی ١٩٥٥ بڕیارمـدا ئەو ئەرکە جێبەجـێ بـکەم. تەمەنـم لە سـەرووی سـی سـاڵی بـوو، بـۆ ئەو مەبەسـتە چـوومە ئەنـقەرە و لەوێ چاوپێکەوتنیـان لەگەڵ کـردم و منیـان لەبەشـی زەمینیـی سـوپا دانـا. ولاش زاوا ڕائیـدەکەم، کـوردی وان بـوو، نــازانم ئەو لە هێــزی دەریــایی چ پلەیەکــی هەبــوو. بەڵام ئەو مــاوەیەی لە ئەنــقەرە بــووم لای ئەوان دەمــامەوە، وەلــێ زۆر دڵتەنگ بووم. ڕۆژێـك بە ولاش زاواکەم گـوت: "کـاك ڕەمـزی دوای ئەو تەمەنە بچم هەستە و دانیشە و پشوودە و وریابە فێـری سەربازان بکەم؟، ئاخر هیچ مەعقول نییە"، کاك ڕەمـزی پێکەنـی و گوتی: "مووسا من ئێستا نامەیەك دەنووسم و دەتـدەمێ، تـۆش

بیبە قوتابخانەی عەریفی. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە عەقیدێکی کوردە، تۆش باسی حاڵی خۆتی بۆ بکە، دڵنیابە چارەیەکت بۆ دەدۆزێتەوە". ڕۆژی دواتر لە ئەنقەرە چوومە قوتابخانەی عەریفی و بە هەزار حاڵ بە فەرماندەی ئەوێ ڕاگەیشتم، چونکە خەریك بوو لە شوێنەکەی خۆی بڕوات.

عەقید: "هەتیو بڵێ بزانم چیت دەوێ؟"

من: "جەنابی فەرماندە نامەیەکیان بۆ ناردوون، گەر دەرفەت بدەن بتاندەمێ".

عەقید: "بینە بزانم چ نامەیەکە".

نامەکەم دایێ و دوای خوێندنەوەی لێی پرسیم:

عەقید: "باشە چیت دەوێ؟".

من: "فەرماندەم دوای ئەو تەمەنە هەڵسە و دانیشەی سەربازانی گەنج بە من ناکرێ، بەڵام ١٥ ساڵە بەشە ناوخۆیی قوتابیان بەڕێوە دەبەم، بۆیە، گەر لە بەشی لۆجیستیم دابنێن زۆر سوودمەندتر دەبم بۆ ئێوە".

عەقید: "باشە تۆ خەڵکی کوێی؟".

من: "خەڵکی نوسەیبینم، بەڵام ولاش زاوای ڕائید ڕەمزیم".

عەقید: "تۆش وەك ڕەمزی کوردێکی بۆگەنی؟ بۆیە بە ڕەمزی بڵێ ئەگەر دوو هەزار و پێنجسەت لیرە نەداتە قوتابخانەکەمان بۆ بەنزین، بێ ناموسم گەر لە گرانترین بەشت دانەنێم، یەڵلا ئێستاش سیکتر بە و بە ڕەمزی بڵێ ئەو خۆی دەزانێ".

بەو شێوەیە لە سەربازێکی ئاسایی ڕزگارم بوو، لە شوێنی ئەو بوومە ئەفسەری یەدەك، ئەوەی پێیدەڵێن عەریف، چونکە لەوێ بە پلەی دووەم بە سەرکەوتوویی لە قوتابخانەکە دەرچووم.

من لە تەمەنی منداڵیمەوە حەزم لە نان و سەموون نەبووە،

بۆیە ئەو خوەشم بۆ هەموو برادەرانم شیکردبۆوە، چونکە هەندێك برادەرم هەبوو نانیان بە مەعکەڕۆنی و برنج و ساواریشەوە دەخوارد. منیش لەوان تووڕە دەبووم و دەمگوت: "ئەی هاوار برنج خۆی نیشاستەی تێدایە، ئێوەش دەچن نانی پێ دەخۆن". ڕۆژێك دەستەیەک لە ئەنقەرەوە، هاتنە قوتابخانەکەمان، تا دوای دەرچوونیان لە قوتابخانە، تیروپشکی دابەشکردنی کاری بەشەکان بەسەر قوتابیان بکەن. لەناو لیستەکە بەشی فرنییش هەبوو، برادەرەکانم سەریان دەخستە سەرم و دەیانگوت: "مووسا، ئینشاڵا لە ئەرکی سەربازی ناوت بۆ بەشی فرنی دەردەچێ". ناوم خوێندراوە و چوومە پێش، دەستم بردە ناو تورەگەی قورعەکە و کاغەزێکم دەرهێنا، لەسەری نووسرابوو، فەرماندەیی دووی گەلی بۆلوو، بەشی فرنی. من بەو هەڵبژاردنە دڵتەنگ بووم، بەڵام ٩٠ برادەرم دڵخۆش بوون و پێکەنین. دوای وەرگرتنی ١١٠ لیرە، بڕیاردرا دوای دوو هەفتە بچینە ناو ڕیزەکانی سوپا. من لە ئیستانبول دادەنیشتم، ماڵ و منداڵەکانیشم هەر لەوێ بوون. چوومە گەلی بۆلوو و دەستم بە ئەرکەکانی خۆم کرد. بوومە فەرماندەی بەشی فرنی، ڕۆژانە ٢٤ هەزار نانمان بۆ ئەو سەربازانەی ئەوێ دەکرد. لە فرنەکە ٥ وەستای سڤیل و ٤٠ سەرباز لەناو پیسی و پۆخڵی پەرێشان ببوون، لەگەڵ دەستبەکار بوونم، قۆڵم لێی هەڵماڵی و لەسەر گیرفانی خۆم چیمەنتۆ و کاشی و گێچ و سبووغم کڕی. لە ماوەیەکی کەم، فڕنییەکەمان کردە دەسکە گوڵ، خاوێن و باوێن بۆوە. فەرماندەی فەیلەقەکەمان موزەفەر ئاڵاکوش، پلەی فەریق بوو. ڕۆژێك هاتە پشکنینی فەوج، کە فڕنیی ئاوا بە جوانی و بریقاوەیی دیت، تووشی سەرسوڕمان بوو. پرسیاری لە عەقیدەکە کرد، بۆ نۆژەنکردنەوەی ئێرە پارەتان لە کوێ هێناوە؟

عەقیدەکەش گوتی: "خوا لێی ڕازی بێت، عەریفێکمان تازە بۆ هاتووە، ئەو هەموو شتێکی لەسەر گیرفانی خۆی کردووە". پاشا بانگی کردم و لێی پرسیم: "کوڕم تۆ خەڵکی کوێی؟" پێم گوت: "بەڕێزم خەڵکی مێردینم!" ئەویش گوتی: "کوڕم مەڵێ بەڕێزم، بڵێ فەرماندەم"، منیش گوتم: "باشە فەرماندەم".

لە گەلی بۆلوو شوێنێك هەبوو ناویماڵی سوپابوو، خواڵێخۆشبوو، جەنەڕاڵ ڕاغب گوموش پالا، لە کەنار دەریا دروستیکردبوو. بەپێی ستانداردەکانی ئەو سەردەمە، شوێنێکی زۆر چاك و بێ کەموکووڕی بوو. بۆ مانەوەمان لەو شوێنە فەرمانێکی بەو شێوەیە هەبوو بۆ عەریفەکانی وەکو ئێمە: مانەوە لە میوانخانەی ئەوێ لە ژوورێك کە گەرمکەرەوە و بانیۆی تێدابوو، مافی چوونە گازینۆشت هەبوو، هەموو ئەمانە بۆ مانگێك ٣٠ لیرە و بۆ دوو مانگ ٦٠ لیرە، بەڵام لە مانگی سێیەم دەردەکرایت.

ئەوکاتەی تازە چووبووین، لە گازینۆکە ئەفسەرەکان بەپێی پلە و ڕوتبەی سەربازییان دادەنیشتن. فەرماندە و عەمیدەکان لە ڕیزی پێشەوە، عەقید و ڕائیدەکانیش لە دوای ئەوان، لە دواوەی ئەوانیش نەقیب و ئەفسەری پلە یەك و لە دواوەی دواوەش ئەفسەری پلە دوو و عەریفەکان دادەنیشتن. ڕۆژێك لەوێ دانیشتبووین، پێویستیم بەسەرئاو بوو، لە کاتی چوون بینیم فەرماندە، واتا پاشا و چەند ئەفسەرێکی پلەبەرز سەرقاڵی یاریی شەترەنج بوون، بێ ئەوەی ئاگام لەخۆ بیت زۆر بە سەیری تەماشام کردبوون. پاشا بەتەمەن بوو، بەڵام زۆر چوست و چالاك و وریا بوو، بۆیە، زوو هەستی پێ کردبوو ئاوا سەیریان دەکەم، لە گەڕانەوەم منی بانگکردە لای خۆی، لە نێوانمان گفتوگۆیەکی بەو شێوەیە ڕووی دا:

فەرماندە: "کوڕم تۆ خەڵکی کوێی؟"

من: "خەڵکی مێردینم فەرماندەم".

فەرماندە"دەزانی یاری شەترەنج بکەی؟"

من: "دەزانم بەڕێزم".

فەرماندە: "مادەم وەرە دانیشە".

دانیشتم و بینیم پاشا و عەمید بەیەکەوە یاری دەکەن، بەڵام کەسیان یاریزان نەبوون، بیرم کردەوە گەر یارییان لەگەڵ بکەم، دەتوانم لێیان ببەمەوە، بە شێوەیەکی سروشتیش ببووە عادەت فەرماندە یاریی لە عەمیدەکە دەبردەوە. بەڵام من ئاوا بیرم نەکردەوە، چونکە پێموابوو گەر لێم بباتەوە، جارێکی دیکە بە پیاوم نازانێ، لەناو ئەو بیرکردنەوانەدا بووم، عەمیدەکە یارییەکەی دۆراند و هەڵسا. پاشا گوتی: "وەرە دانیشە کورم"، بەرامبەر یەك دانیشتین و دەستمان بە یاری کردن کرد. لە ماوەیەکی کورت کش و ماتم بە پاشا کرد، دوای ئەوە عەمید و ئەفسەرەکانی ئەوێ هەستانە سەر پێ "شتی وا چۆن دەبێ بەڕێزم؟"، بەڵام لەبەر ئەوەی پاشا پیاوێکی ماقووڵ بوو، وەك منیش کورد بوو و خەڵکی چەمیش گەزەکلی بوو، بۆیە گوتی: "بۆ نابێت؟ ئەو گەنجە لێی بردمەوە، چونکە لە ناوچەکەی ئەوان زۆربەی خەڵکەکە لە شەترەنج یاریزانی چاکن"، ئینجا ڕووی لە من کردەوە و گوتی: "دیسان یاری بکەینەوە کوڕم؟"، منیش گوتم: "فەرمانتە گەورەم"، دیسان دەستمان بە یاری کردەوە و لە ماوەیەکی کورت هەمدیسان کش و ماتم بە پاشا کرد.عەمید و ئەفسەرەکانی دیکە تووڕە بوون، بەڵام پاشا توند دەستەکانی گوشیم و هەردوو لای ماچ کردم و پیرۆزبایی لێ کردم. دوای ئەو یارییە لەگەڵ ئەو بووینە برادەرێکی چاك، بەشێوەیەك دوای ئەوەی لە ماڵی سوپاش دەرچووم و چوومەوە شوێنی سەربازانی

ئاسـایی، ئۆتـۆمبێلی بە دوادا دەنـاردم و بانگهێشـتی دەکـردم بـۆ ئەوەی یاریی شەترەنج بەیەکەوە بکەین .

یەکەکەی من فەیلەقی دووی فەوجی تۆبخانە بوو، شـوێنێکی زۆر شـــڕ و بـــێ خـــزمەت بـــوو، دوای مـــاوەیەکی کـــورت فەرماندەکەمان هاتە فەوج و منی تەنیا وەکو بەرپرسـی فـرن نـا، بەڵکو منی لە فەوجەکە کردە بەرپرسی خواردن و خـواردنەوە و کۆگـای خـواردنیش، بـۆیە، ئیـدی بەرپرسـیارەتیم زیـاتر بـوو. چێشـتخانە و شوشـتنگەی قـاپ و قاچـاغ و کۆگـای خـواردن هەڵگرتن زۆر بێ سەر و بەر و پیس و پۆخڵ بوو. لە ماوەیەکی کورت هەموویم زۆر ڕێك و پاك کـردەوە، بـۆیە، لە مـاوەیەکی کەم تەواوی ئەفســـەرەکانی فەوجەکەم، لەگەڵ ئەوەی پـــلەی سـەربازیم زۆر لەوانـیش نزمتـر بـوو، بە ڕێـز و خۆشەویسـتییەوە لێـیـان دەڕوانـیم. گەر باسـی کارەکـانم بـکەم لە فەوج، چەنـد بەرگێك دەگـرێ، بەڵام بـا ئەوەنـدەش بڵـێم، کاتێـك برادەرێـك ئەرکی سەربازیی تەواو دەبوو و شـوێنەکەی جێدەهێشـت کەس نەیدەزانی کێ ڕۆیشتووە، بەڵام کاتێك من ماوەی سـەربازییەکەم تەواو بوو، تەواوی فەوجەکە بە ڕێوڕەسمی سەربازی ماڵئاواییـان لێ کردم.

بەو شـێوەیە، بەشـێك لەو یادەوەرییـانەی لە بەرگـی یەکەمـی پەرتـووکەکەم، دەربـارەی یادەوەرییەکـانی مـاوەی ئەرکـی سـەربازیم نەمنووسـیبوون، لێـرە دەرفەتـم بـۆ دروسـتبوو باسـی هەندێکی دیکەشیان بکەم.

## پێکچوونی کورد و تورك

هەستدەکەم کورد و تورك، تەنیا هاووڵاتی یەك وڵات نین، بەڵکو هەمان کات لە شانس و بەخت و نێوچاوانیشیان وەك یەکن. واتا هاوبەش و مەحکوومی هەمان بەختی باش یان بێ بەختینە. چونکە پێم وایە ئەمڕۆ کێشە و گرفتی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە. لەسەر ئەو بابەتە، خوالێخۆشبوو دکتۆر محەمەح شوکرو سەکبانی دۆستی نزیکم، لەبەر ئەوەی خۆی لەناو دۆخەکە بوو، ئاوای بۆ گێڕامەوە. پێموابێت ئەوەندەی لەبیرم ماوە ئەو بەو شێوەیە بۆی باسکردم. چونکە لەبەر هەڵکشانی تەمەنم یادەوەرییەکانم ڕەنگە دژی هەندێك ڕاستی بێت، یان هەندێکیانم بیرچووبێتەوە و نەتوانم وەك خۆیان بیگێڕمەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی پلەی یەکمیان هەیە لە ناوهێنانیان لەکاتی گێڕانەوەی یادەوەرییەکانم، بەداخەوە کەسیان لە ژیاندا نەماون، بەڵام من ویژدانم لە ژیان ماوە. من نامەوێ وەك ئەو نووسینانەی لە سەردەمی کۆماری تورکیا نووسراون نەوەی نوێ بۆ ڕێگایەکی هەڵە ئاراستە بکەم. بەڵکو بە پێچەوانەوە دەمەوێ ڕێگایەکی ڕاست پیشانی گەنجە تورك و کوردەکانی نەوەی نوێ بدەم. ئەو ڕێگایە هەندێك کات بە گوڵ و گوڵزار ڕازاوەیە و بە کەنار دەریایەکی شین و بێگەرد تێپەڕ دەبێت، هەندێکجاریش وەك ڕێگا خۆڵاویە مین ڕێژکراوە ناچارییەکانی کوردستانە. ئێوە گوێ بەوە مەدەن میت، بە پشت بە ستن بە پەرتووکەکەی دکتۆر محەمەد شوکروو سەکبان بەناوی (کوردەکان تورکن)، دەربارەی نەتەوەی کورد چ دەڵێ، چونکە من باسی ئەو بابەتەم لە بەرگی یەکەمی

پەرتـووکەکە کـرد، لەبەر ئەوەی دکتـۆر چەنـدان جـار بـۆی باسکردم لە ژێر فشاری چ هەستێك ئەو پەرتـووکەی نووسـیووە، بۆیە، با ئێستا ڕێگا بەو ڕوونکردنەوەیەی دکتۆر سـەگبان بـدەین لەسەر نووسینی ئەو پەرتووکە:

"سییەکانی سەدەی بیستەم، مستەفا کەمال پاشـا و حکـوومەتی ئەنــقەرە، بەدوای ئەوەوەبــوون کــورد بتــوێننەوە، لە هەمــوو دامودەزگاکانی حکوومەت و ناوەندەکانی میـدیا، بەیەك دەنـگ بە شـێوەیەکی زۆر نـاچیز و پـووچ دەیـانگوت (کـورد تـورکە). لەلایەکی دیکە کورد حاڵی وەك دۆخی ئەو مـێگەلە مەڕە بـوو، کە ڕەوە گـورگێکی برسـی بەنـاوی وەربووبێـت، کـوردی بـێ خـــاوەن و بـــێ شـــوانیش، لە تورکیـــا، کەوتبـــوونە ژێـــر کۆمەڵکــوژیەکی وەحشــیانە. مـن یەکـێکم لەو ١٥٠ کەسـەی ئەتاتورك بە خۆفرۆشی نیشتمان تاوانبـاری کـردین. بـۆیە، پەنـام بردە بەر نووری سـەعید پاشـای سـەرۆکوەزیرانی عێـراق، کە لە ئامـادەیی گەڵەتەســەڕای خوێنــدوویەتی. ئەویــش منــی کــردە وەزیری تەندروستی عێراقی، بەڵام تێڕوانینی هەڵەی ئەنقەرە دژی مـن و گەلـی کـورد، سـەرەڕای ئەو زولـم و کۆمەڵکـوژی و ڕاگواستنەی لە کوردی تورکیا دەکرا، بـووە هۆکـاری ئەوەی ٦ مانگ تووشی نەخۆشی وەرەم ببم و لەسەر جێگا بـکەوم. دواتـر لە ئەڵمانیـا لە باشـترین و پێشـکەوتووترین نەخۆشـخانەی وەرەم خەوێنــــدرام، ڕۆژنامەکـــانی ئەڵمانیـــا هەمـــوو ڕۆژ ڕووداوە وەحشــییەکانی تورکیـان بڵاودەکـردەوە، منـیش بیرمکـردەوە: بەرپرسانی حکوومیی ئەنقەرە هەموویان جاهیلن، بۆیە با من بڵـێم (کورد تـورکە) تـا مسـتەفا کەمـال پاشـا واز لە کوشـتنی کـورد بهێنێت، کە بە مەراقەوە ئەو کارەی دەکرد، بـۆیە ئەو پەرتـووکە ساختە و هەڵبەستراوەم بەو شێوەیە نووسی".

ئەو وتانەی بەڕێز دکتۆر سەکبان بە درێژی لە بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکەم هەیە، بۆیە، با ئێستا بێینە سەر بیرەوەرییەکی دیکەی دکتۆر سەکبان، کە بۆ منی باسکرد:

"ئینگیلتەرە و فەڕەنسا و ئیتالیا و ئەمریکا و وڵاتە سەرکەوتووەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی، بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ وەرگرتنی بۆچوونی دانیشتووانی ناوچەکە، نەخشەی تازەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان دادەڕشتەوە. لە کاتی دانان و دروستکردنی نەخشەی تازە ناوی تورك و عەرەب و عەجەم نەدەهێندرا. لەسەر وڵاتە تازەکانی سەرنەخشەش ئەو گفتوگۆیە لە نێوان سەرۆکوەزیرانی ئینگلتەرە و سەرۆکی ئەمریکا ڕوو دەدات: سەرۆکوەزیرانی ئینگلتەرە، لەسەر نەخشە، وڵاتانی سووریا و ئێران و تورکیا پیشانی ئامادەبووانی ناو کۆبوونەوەکە دەدات! لەو کاتەدا سەرۆکی ئەمریکا دەڵێ: ئەی کوردستان کەوتۆتە کوێی ئەو نەخشە تازەیە؟ لۆرد کورزۆنی سەرۆکوەزیرانی ئەوسای ئینگلتەرە، کە دەسەڵاتێکی زۆری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست هەبوو و لە پەرتووکە نۆبەرگییەکەیشی لەسەر ئیران، بەرگێکی تایبەتە بە کورد. لەبەر ئەوەی کوردی باش دەناسی، بۆیە، لە وەڵامی سەرۆکی ئەمریکا دەڵێ: برادەران واز لە کورد بێنن تا مێشکی دێتەوە سەرە خۆی، بۆیە تا ئەوکات پێویست دەکات لە ژێر پێیان بفلیقێندرێنەوە، چونکە ڕەنگە ئەمە سوودیان پێبگەیەنیت. باشتر وایە بەو نموونەیە بۆتان زیاتر ڕوون بکەمەوە: لە زانستی پزیشکیدا، دکتۆرەکان بە سێ ڕێگا چارەسەری ئەو کەسانە دەکەن کە نەخۆشی مێشکیان هەیە، یانی ئەوانەی پێیاندەڵین شێت. ڕێگای یەکەم تیۆرییەکی دەروونییە کە مەعنەویاتی کەسەکە بەرز دەکرێتەوە. بۆ نموونە پێیدەڵێن تۆ کەی شێتی! بە پێچەوانەوە زۆر عاقڵی، بەڕێزی، هەتا

دوایـی. ئینجـا بەپێـی بیـر و بـاوەڕی نەخۆشـەکە ئەو کەسـە دەبردرێتە لای شێخ و مەلا، تا ئەوانیش چەند نوشـتە و نزایەکـی ئـاینی بە ملـی وەکەن یـان لە یەخەی بـدەن. گەر ئەوانەی باسمانکرد هیچ سوودێکی نەبوو، دەست بە ڕێگـای دووەم، واتە چارەسەری کیمیـایی، دەکرێـت. لەو ڕێگـایەدا داو و دەرمـان و دەرزی لە نەخۆشەکە دەدرێ، بەڵام گەر ئەمەش سوودی نەبوو، ڕێگای سێیەم تاقی دەکرێتەوە کە بریتیە لە چارەسـەری فیزیکـی جەستەیی، واتا نەخۆشەکە بە برسیەتی دەهێڵنەوە، لێـی دەدرێـت، دەترسێندرێت، ئاوی ساردی پێدادەکرێ و کارەبای لێدەدرێ، تا مێشکی دێتەوە سەرە خۆی، خۆ گەر هەر چاکیش نەبۆوە، ئەوە هەر بە شێتی دەمێنێتەوە. بۆیە بۆ چارەسـەرکردنی کـورد ڕێگـای چارەسـەری فیزیکـی سـوودی هەیە. ئەگەرچـی ئەو سـێ گەلە موسـولمانەی دراوسـێیان دوژمنـی کـوردن بەڵام بەوان دەیانبەستینەوە، چونکە ئێمە کریستیانین ئەوان ئێمە بە دوژمنـی خۆیان دەزانـن، ئـاخر بەبۆچـوونی ئەوان ئێمە کـافرین. هەر بـۆ زانیاریشتان تەنیا، عەجەم و عەرەب و تـورکیش دوژمنـی کـورد نیـنە، بەڵکـو هەزار دەبـێ ئەو شـێخ و ئاغـا و بەگ و میـرانەی کورد گەلەکەی خۆیان دەڕووتێننەوە و سـەرکردایەتییان دەکەن. یانی هەر خۆیـان دوژمنـی ڕاسـتەقینەی خۆیـانن، لەگەڵ ئەوەش، ئەوان بە گیان و ماڵ هەر لەگەڵیانن. نازانم دەزانن یـان نـا، بەڵام گەورە پیاوانی کورد هیچیـان خۆیـان بە کـورد نـازانن، چـونکە هەندێکیان دەڵێن سەیدین و خۆیـان بە نەوەی مـحەممەد دەزانـن، هەنـدێکی خـۆی بە عەباسـی دادەنـێ و هەنـدێکیش خۆیـان بـە نەوەی خالید بن وەلیدی قەسابی کوردسـتان، دادەنـێن. هەنـدێك میـر و گەورەی دیـاربەکر، کاتێـك لەنـاو عەرەب کەس نەمـا خۆیـانی بـدەنە پـاڵ، بە شـانازییەوە گوتیـان ئـێمە لە نەوەی

ئەشقییاکانی ئاق قۆینلوو تورکمان ئوزون حەسەنین، بۆیە ئێمە کوردستانمان بەسەر سێ دوژمنی خۆی دابەش کرد. دڵنیاشم کورد لەناو ئەو وڵاتانەی کە بە قسەی خۆیان برای ئایینی یەکدین، زۆر ئەشکەنجەی جەستەیی و زوڵمی دەروونییان بەرامبەر دەکرێت. بۆیە گەر نموونەی ئەوانەی نەخۆشیی مێشکیان هەیە و پێیاندەڵێن شێت، دوای لێدان و ئەشکەنجەدان مێشکیان بێتەوە سەر خۆیان، با هەوڵی ڕزگارکردنی خۆیان بدەن".

لێرە دوو ڕووداوی سەیری دیکەشتان بۆ باس دەکەم:

هەمان ئەو وڵاتانە، کاتێك دێنە سەر باسی دیاریکردنی سنووری نێوان تورکیا و سووریا، کلیمانکوی وەزیری دەرەوەی فەڕەنسا، دەڵێ: "لە چیاکانی کوردستانەوە تا چیاکانی ئەلبورس زنجیرە چیایەك هەیە، ئێمە، بە زەویی داوێنی ئەو چیایانە، واتە بە زەویە شاراوەکە دەڵێین سووریا، بە ناوچە شاخاویەکانیش دەڵێین تورکیا"، بەڵام لۆرد کورزۆن نارەزایی دەردەبڕێت و دەڵێ: "برادەرینە ئەو چیایانە زۆر چڕوپڕن و پڕ بەرزی و نزمین، چەندین دۆڵیشیان لەبەینیدایە، بۆیە لە داهاتوو دەبێتە کێشە لە نێوان ئەو دوو وڵاتە، بەڵام لە هەمووی باشتر دیاریکردنی هێلی ئاسنی شەمەندەفەری (حەیدەر پاشا – بەغداد)ە کە ئەڵمانەکان دروستیان کردووە، بۆیە، بە بەشی ژێرەوەی ئەو هێلە بڵێین سووریا، بە بەشی سەرەوەش تورکیا "ئیدی پێشنیازەکە بەو شێوەیە قبوول دەکرێ. بەڵام ئەو بن خەت و ژێر خەتە ئەوەندەی کێشە و ئاڵۆزی تێکەوت، تا سەر هێل، کە تورکیا بوو، چووە هەندێك شوێنی سووریا، کە ژێر هێل بوو.

**با ئێستا بێینە سەرباسی پێکچوونی تورك و کورد:**

لە سەرەوە، باسمان لە گەورەکانی کورد کرد، با ئێستاش بێینە سەر گەورەکانی تورك. تێبینیم کردووە، لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە تا ئێستا، لەناو سیاسەتمەداران و پیاوانی دەوڵەتی نەتەوەی تورکدا کەسێك هەڵنەکەوتووە پێنج قرووش بکات. لە سەردەمی عوسمانییەکان، کەسانی ناو ئینکیشاریەکان[1] و ئەوانەی لە ئەندەروون پێگەیشتبوون، هاتوون و خزمەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان کردووە. هەرچی پیاوی دەوڵەتیشە، لە بچووکەوە تا سەرۆکوەزیران، کە پێیان دەگوت سەدری ئەعزەم، ئەو منداڵانە بوونە کە لە ئەوروپاوە هێندراون یان لە جەنگەکان کەوتوونەتە دەستیان و دواتر لە قوتابخانەکانی دەوڵەتی عوسمانی پێگەیەندراون. بۆ نموونە ئیبراهیم پاشای بەناوبانگی زاوای قانوونی سوڵتان سلێمان، یۆنانییە. ئەحمەد مەلەك پاشا ئیتاڵی و سۆکوڵوو محەمەد پاشا، سرپییە. جا گەر بە مێژوودا بچینەخوارێ ئەوانی دیکەش هەر ئاوان.

**سەردەمی دروستکردنی کۆماری تورکیا:** لێرەش پیاوانی دەوڵەت و حکوومەت بەو شێوەیە بووە. لەسەردەمی عوسمانییەکان ئەو منداڵە گاوڕانە دێنن و پەروەردەیەکی جوانی

---

[1] هێزێکی تایبەت بوون لەناو سوپای عوسمانییەکان کە زۆربەی هێزی پیادەیان پێك دەهێنا. ئەو هێزە لە سەردەمی سوڵتان موورادی یەکەم لە ساڵی ١٣٦٣ لەگەڵ فراوانبوونی دەسەڵاتداریەتی عوسمانیەکان لەو منداڵە نا موسوڵمانانە دروست کرا کە دوای داگیرکردنی خاکەکەیان لە نێوان تەمەنی ٨ تا ١٨ ساڵی دەهێندرانەوە و دەخرانە بەر پەروەردەیەکی تایبەت، بۆ پەیوەست بوونیان بە سوڵتانی عوسمانییەوە. (وەرگێڕ).

نیسلامی دەکرێن، ئینجا دەخرانە سەر کارگێڕیی دەوڵەتی عوسمانی. بەڵام، ئەو دۆخە لەسەردەمی کۆماری تورکیا بەو شێوەیە نەبوو، بەڵکو هەرچی جوو و هەڵگەڕاوە و عەرەب و کورد و چەرکەز و لاز و هەندێکیش تورکی بێ عەقڵ هەبوو، لە کۆماری تورکیا بوونە دەسەڵاتدار. بۆیە، ئەو کێشانەی ئیمڕۆ تورکیا پێیەوە دەناڵێنێ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانی ناسنامە بە کۆمەڵەی سەرەتای دروستبوونی کۆماری تورکیا. دەتوانم پێشتان بڵێم، ئەو کەسانەی وا باسیان دەکەم کێ بوون، بەڵام دەڵێم با ئاوا بەبێ دەنگی تێپەڕێت باشترە، چونکە کەس نازانێ چ دەبێت و چ نابێت بەڵام، سەرەڕای ئەوەش، تا ئاماژە بە چەند دانەیەکیان نەکەم لێرە تێناپەڕم. بۆ نموونە، عیسمەت ئینۆنو کوردە، تەوفیق ڕوشتوو ئاراس دورزیی وەزیری دەرەوەی ئەوسای تورکیا، عەرەبە، ئیبراهیم تالی عەرەبی سوننەیە، ڕەوف ئۆربای چەرکەسە، ئەحمەد باروتچوو و حەسەن ساکا لازن. وەك نموونە با ئەوەندە بەس بێ و واز لە گەورەکان بهێنین.

من، لەبەر ئەو هۆکارانە، گەلی کورد و تورکم لەو ڕووەوە بەیەك چواند و لە بێ بەختی بەیەك ئاست هەژمارم کردن. بەڵام، دەبینم هێشتا کورد لەو ڕووەوە لە تورك بە شانسترن، چونکە گەورانی کورد بە ئاشکرا و پیاوانە دەڵێن: "ئێمە کورد نین"، بەڵام گەورەکانی تورك بەبێ ئەوەی شەرم لە خۆیان بکەنەوە، لەبەردەم گەلی تورك و کورد و هەموو جیهان دەڵێن: "ئێمە تورکین"، لە کاتێکدا لەو جیهانە جوانە ڕەگەز پەرستی هیچ واتایەکی نییە و منیش هەرگیز لەو کەسانە نەبوومە، بەڵام دەبینم ئەو کەسانەی نەتەوەیان نا دیار و لێڵە، لە کەسانی دیکە

زیاتر ڕەگەز پەرستی دەکەن، بۆیە بەو شێوەیە، نەتەوەی تورك و ڕەگەزەکەی لەبەردەم هەموو نەتەوەکانی جیهان بە خۆیانەوە شەرمەزار دەکەن.

## ئیبراهیم ئایسان

ئیبراهیم ئایسان، نموونەی کەسێکی چەلەنگی گەلەکەمان بوو، مەگەر بەس خۆی بزانێ لە کوێوە گەیشتبووە کوێ؟ ئەویش، وەك سەعیدی کوردی، بە درێژایی تەمەنی چەندان ناوی هەبووە، بۆ نموونە ئیبراهیمێ ئینکافی، براهیم چاڤووش، براهیم ئاغا، دوایین جاریش بەبێ ویستی خۆی نازناوی ئیبراهیم ئایسانیان دابووە پاڵ.

ئیبراهیم ئایسان بەردەوام پێی دەگوتم: "کوڕم، ئەو پاشناوەی بۆشمان زیادکراوە، سیمبولی ئەو زوڵمەیە کە لێمان دەکرێت. چونکە بەبێ ئەوەی لەو مرۆڤە بپرسن چ نازناوێکت دەوێ، پاشناوەکەی دەگۆڕن، چونکە ناشێ پاشناوێکی ئاوای بدرێتێ کە هیچ پەیوەندیی بە ناوی ماڵباتی ئەو کەسەوە نەبێ. حکوومەتی ئەنقەرە ناوی لادێکەشمانی لە (ئایینکافەوە بۆ کایا پنار) گۆڕی، گوایە ئێمە تورك بووینە! تۆ سەیری ئەو قەباحەتە بکە. ئاخر کاکە تورکبوون بە خورتی دەبێ؟ بۆیە، گەر ویستیان با لەسەر ناسنامە فەرمییەکەم ناوم بکەنە جەنگیز خان، یاخود تەیمورلەنگ، هەرگیزا و هەرگیز من نابمە تورك؟. کاتی خۆی لە کۆمەڵکوژیی کریستیانەکان خەڵکیان دەگرت و پێیان دەگوتن یان دەبنە موسوڵمان یانیش دەتانکوژین! زۆربەیان مەرگیان هەڵدەبژارد و ئیسلامەتییان پێ قبووڵ نەبوو، بەڵام هەندێکیان لە ترسان وازیان لە ئایینی خۆیان دەهێنا، بەڵام هەر

کاتێك ترس و تۆقین نەما، هەموویان بوونەوە کریستیان، ئەوەی ئێمەش بەو شێوەیە".

"من هەندێکجار ئەو زوڵمەی حکوومەت لە ئێمەی دەکا بە حەق دەبینم، چونکە لە ژیانمدا منیش نموونەیەکی ئاوام هەیە. سەردەمانی زوو، ژمارەیەکی زۆری کرێکار کاریان بۆ دەکردم، بەڵام ئەو پارەیەم نەدەدانێ کە حەقی خۆیان بوو، هەموو کەسیش دەیزانی من زۆرم پارە هەیە، چونکە گەر بڵێم نەمبووە کەس باوەڕ ناکات، وەك ئەوەی زۆر لەسەر حەق بم، زەڕ زەڕ هاوارم لەسەر دەکردن. ئینجا ئەو حکوومەتەی ئێستاشمان بەو شێوەیە، دەستی بەسەر نیشتمانی ئێمەدا گرتووە، بەڵام هیچ مافێکیشی نییە لە ڕاستیدا، ئەو مافەی باسی دەکا مافی چەك و چاو سوورکردنەوەیە و هیچی تر، چونکە، گەر حکوومەت بە زۆرداری ئەو کارە نەکا، چۆن دەتوانێ ئەوەی لە ژێر دەستیەتی ڕایگرێ؟ ئینجا خەڵك پێیدەڵێن ڕەگەز پەرست و ئەمپریالیست. ئەو خوەی تورك تازە نییە و بۆ مێژوویەکی زۆر دوور و درێژ دەگەڕێتەوە، چونکە سەلجوقییەکان و ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لە کۆماری تورکیای ئەمڕۆ زۆر زاڵمتر بوون. مووسا کوڕی خۆم، من کە باسی ئەوانە دەکەم تۆ وا باوەڕ نەکەی من ماف بە زوڵم و زۆرداریی ئەوانە دەدەم، بەڵکو باسی ئەوانەت بۆ دەکەم وەك ئەوەی کە هەن. لەیەکەمین جەنگی جیهانی، تەقریبەن لە زۆربەی بەرەکانی جەنگ شەڕم کردووە، نازناوی چاوشیەکەشم لەوێوە بەدوام کەوت، دواتر لە جەنگی سوێس بە دیلی کەوتمە دەستی ئینگلیزەکان، ئەوسا ئێمەیان بردە مسر، دواتریش گوازراینەوە بۆ هیندستان. من دەرچووی قوتابخانە نیمە، بەڵام ئەو بۆچوونانەی ئەمڕۆ پێت دەڵێم، لە جەسارەتی سەربازی و گەرمەی جەنگەکان فێریان بووم. دوای ئەمانە بوومە مقاولی

ئەڵمانەکـان، وەك دەزانـی ئەوسـا شـەمەندەفەرەکان بە خەڵـووز کاریان دەکرد، منیش لە دریێسیەوە تا نوسەیبین هەمـوو ڕۆژێـك هەزار تەن ڕەژووم دەدانـــێ، کـــارەکەم لەوان بە مقـــاوەلات وەرگرتبوو، شـوێنی وەرگـرتن و پێـدانی خەڵووزەکـان نـاوچەی شانیشـــە و تـــیهەلەف بـــوو. ڕێگـــایەکی تـــایبەتم لە نـــاوچە شـــاخاوییەکان دروســـت کردبـــوو، کە بارەکانمـــان بە ئەســـپ بەوڕێیەدا دەگواستەوە، هەمـوو ڕۆژێـك لادێیەکـان بە ئەسـپ و هێسـتر و کەر داریـان دەهێنـا و دەیانکێشـا و پارەکـانم دەدانـێ. ئەوســـا هێڵێکـــی تـــایبەتم بـــۆ لادێـــکەی ئێـــوە، زڤینگـــێش، دروستکردبوو، هەر بەو هۆیەوەش دۆستایەتیمان لەگەڵ عەنتەری باوکـت دروســتبوو. وای کـوڕی خـۆم گەر باوکـت دەبینـی، وەڵاهی ئەوەندەی بە دونیـادا گەڕام، پیـاوێکی هێنـدەی باوکـت قـۆزم نەدیـت، ئەو بەژن و بـاڵایەی هەیبـوو، ئەو دەموچـاوە شیرینەی بەردەوام پێـدەکەنی، لەگەڵ ئەو جەمەدانـیە تڕابـزۆنیەی دەیبەسـتا شـتی وا جـوان نەبـوو، ئینجـا کە خەنـجەرە دەسـك زیـــوینیەکەی لەبەر کەمەری دەنـــا قەت لە ســـەیرکردنی تێـــر نەدەبووی، بەڵام بەداخەوە لە تەمەنێکی زۆر گەنجی لێمـان دابـڕا و تووشی ئەو نەخۆشییە بوو".

"کاتێك ئەڵمانەکان، لەیەکەمین جەنگی جیهانی شـکان، لەپـڕ لەماوەی شەو و ڕۆژێك ڕۆیشـتن، مـن لەو نـاوە مـامەوە، لەگەڵ ئەوەی هێشـتا هەنـدێك پارەیـان لای مـن مـابوو، بەڵام خەڵـك ئیشـەکەیان ئەوەنـدە گەورە کـرد نەبێـتەوە، بەشـێوەیەك هەمـوو کەس دەیگـوت، ئیبـراهیم هەنکەفـی بە تـانکەر زێـڕی ئەڵمـانیی هەیە. من بەو قسانە وەڕەس نەدەبووم، چونکە هەرچۆنێـك بێـت خەڵـك بە دەوڵەمەنـدت بـزانن خۆشـترە لەوەی بە هەژارت لە قەڵەم بدەن، بەو پێیەی گەر وا بزانن دەوڵەمەندی خاوەن پـارە و

سەرمایەدار قەرزت دەداتێ، دەتوانێ خێرێک بکەی، ئەگینا فەقیری چ سوودێکی هەیە؟ بۆیە، لەلای خواش دەوڵەمەندەکان زیاتر جێگای ڕەزامەندین نەک هەژارەکان. چونکە خوا، حەفت ڕێگای بۆ چوونە بەهەشت داناوە، لەو ژمارەیەش پێنجیان بۆ دەوڵەمەندەکان کراوەن، بەڵام تەنیا دووانی بۆ هەژاران ئاسانە. ئەو پێنج ڕێگایەش بریتین لە سەدەقە و زەکات و سەرفترە و دروستکردنی شوێنێك کە خێری بەردەوام بێت، وەك مزگەوت، قوتابخانە، نەخۆشخانە تاد.. لەگەڵ حەجکردن کە تەنیا دەوڵەمەندەکان دەتوانن بیکەن. ئەوەی بۆ هەژارانیش دەمێنێتەوە تەنیا ڕۆژوو گرتن و نوێژکردنە. خۆ ئاشکراشە هەژار بە درێژایی ژیانی بەڕۆژووە، جا ڕۆژووی دوو ئایینیش نەك یەك، واتا ڕۆژووی ئیسلام و مەسیحیەت بەیەکەوە. چونکە کریستیان کاتێك بەڕۆژوو دەبن تەنیا بەروبوومی ئاژەڵی وەك گۆشت و چەوری و شیر و هێلکە ناخۆن، بەڵام ڕۆژووی موسوڵمانان نابێ هیچ خواردنێک بخۆی و هیچ خواردنەوەیەکیش بخۆیەوە، بۆیە، هەژار حاڵی ئاوایە. ئینجا یەك مانگ بەڕۆژوو دەبێت سەرەرای ئەوەی بەردەوامیش لە ژیان بەڕۆژووە، جا هەندێك خەڵکی گەمژە هەیە سێ مانگ بەڕۆژوو دەبێ نەك تەنیا مانگی ڕەمەزان. ڕێگای دووەمی چوونە بەهەشت بۆ نەداران نوێژکردنە، ئێ ئەویش هیچ پارەی تێناچێ و بەلاشە، ئاسانیشە وەك نۆبەتی سەربازی هەستە و دانیشە و تەواو. مووسا کورم سەیرکە عەرەب خۆیان نوێژکردنیان داهێناوە، کەچی خۆیان نوێژ ناکەن، سەرەڕای ئەمە، کاتێك ئێمە نوێژ دەکەین، دێن و گاڵتەمان پێ دەکەن و دەڵێن: "نوێژکردنی کوردان عیبادەت نییە، عادەتە".

وەك لەسەرەوە ئاماژەم پێ کردبوو، مام ئیبراهیم نموونەی زیرەکیی گەلی کوردە، نزیکەی سەت و شتێك ساڵ ژیا،

خۆشبەختانە تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد هەر لەلای بووم، کەچی ئەو هێشتا بەدوای ئیش و کارەوە بوو. ئەو لە ناوەندی شاری مێردین دادەنیشت و بەردەوامیش دەیگوت: "کوڕم زۆر بە داخەوە نەمتوانی بخوێنم، لەگەڵ ئەوەی لەسەردەمی ئێمە وەك ئەوەی ئێستا هەموو قۆناغەکانی خوێندن و ئەوەندە قوتابخانە زۆرەش نەبوو، بۆیە بریا هەندێك وانەم لە قوتابخانە ئایینیەکان و حوجرەی مزگەوت بخوێندبا، هەرنا بۆخۆم دەبوومە مەلا، چونکە باوکم زۆری حەز دەکرد من بە کەوا و سەڵتەی مەلایەتی ببینێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کەیفم بە مامۆستا و مەلاکان نەدەهات، بۆیە بەو بچووکییە لە حوجرە ڕامکرد. ئێستا بیر دەکەمەوە و لەبەرخۆم دەڵێم وەڵاهی کارێکی باشم کردووە کە هەڵاتووم، چونکە ئەو برادەرانەی خوێندیان بوونە قوتابی شێخ و نەوەی ئەو قوتابخانە و حوجرانە، بەڵام من ئەو مەراقی خوێندن و فێربوونەم بۆ منداڵەکانم جێ هێشت. فاتیحی کوڕە گەورەم، لە ئەڵمانیا بووە ئەندازیار، عەبدولڕەزاقی کوڕی بچووکیشم، لە زانکۆی ئیستانبووڵ کۆلێژی پزیشکی دداني تەواو کرد و بووە دکتۆر. منداڵەکانی دیکەشم هەموویان قۆناغی ئامادەییان تەواو کرد".

مام ئیبراهیم، پیاوێکی زۆر مەرد و چاو نەترس بوو، بۆیە دەمگوت: "مامە هۆکار چییە تۆ ئەوەندە سەخی و دەست کراوە و مەرد و پیاوانەی، ئەوەی تۆ دەیکەی زۆر لە پێویستی زیاترە؟" کەچی ئەو بە پێکەنینەوە دەیگوت: "ئێ کوڕی خۆم، ئێمەی کورد زانست و مەعریفەمان نییە، گەر پیاوەتی و جەسارەتیشمان نەبێ، خوا دەزانێ دەبێ حیسابی چیمان بۆ بکەن".

مام ئیبراهیم لەسەر جێی بوو، مردن زۆری بۆ هێنابوو، منیش ئەوسا لە گوند دەمامەوە. لەسەرە مەرگ بە نرکە نرك داوای

منی کردبوو، دکتۆر عەبدولرەزاقی کوری بە تەلەفۆن داواکەی باوکیی پێگوتم، منیش خۆم پێچاوە و چوومە ماڵەوەیان لە مێردین. بینیم گەورە و بچووك هەمووی دەگرین، زیڕ و هۆڕ و قیژەی ژنانە، هەر بابایە قژی خۆی دەڕنتەوە و خۆی لە خرتۆڵێ وەردەدا، مەلایەکیش لەسەر سەری یاسینی دەخوێند، چونکە هەموو ئاماژەکانی دیاربوو لەسەرە مەرگە. خۆم چەماندەوە و بە گوێیدا چرپاندم مامە هاتوومە لای تۆ، یەکسەر چاوی کردەوە، کاتێك منی بینی بە گریان و زەحمەتەوە توانی ماچم بکات و بە کوردی گوتی: "کوڕم بۆ خاتری خوا ئەوانە بێ دەنگ کە، ئینجا چیرۆکێکی کوردیم بۆ بگێڕەوە!" هەموو لایەك سەریان سوڕما. منیش لە پەنا گوێیدا چیرۆك و گۆرانی کوردیم بە تێکەڵی بۆ گوت. مام ئیبراهیم گیانی هاتەوە بەر و گوتی دامنیشێنن، دوای ئەوە خێزانەکەی گوتی: "مووسا، مامت هەفتەیەکە هیچی نەخواردووە، ڕازی نابێ مغەزیشی تێبکەین". منیش گوتم: "مامە چی دەکەی بکە، من بە دەستی خۆم بەرداخێك شەربەتی پرتەقاڵت بۆ دروست دەکەم و تکایە تۆش بیخۆوە". بە ئاماژەی باشە، سەری بۆ لەقاندم. مام ئیبراهیم زیاتر هاتەوە سەرەخۆی، ئەوجارە داوام لێ کرد: "مامە قاپێك چەلاوی گۆشتیش بخۆوە، خۆی چی دەبێ؟"، ئەویشی قبوولکرد. دوای خواردنەوەی چەلاوی گۆشتەکە مەلا پەرتەیان لێ کرد، تا ئێوارە بە خێزانی بەیەکەوە دانیشتین و قسەی خۆشمان کرد، هەتا زۆر حەنەکیشمان کرد. دواتر بۆ ئەوەی پشوو بدات ئێمە چووینە ژوورێکی دیکە، ئەویش لەسەر شوێنەکەی خۆی پاڵکەوت تا بخەوێت. هێشتا چەند دەمژێرێك نەبوو کەجێمان هێشتبوو، لە پڕ یەکێك لە نەوەکانی بە کەلەجانەوە هات و هاواری کرد، باپیرەم دەمرێ مامە! بە داخەوە تا ئێمە گەیشتینە

ژوورەکەی ئەو، مام ئیبراهیم دوایین هەناسەی دابوو و چاوەکانی تا ئەبەد لێکنابوو.

ئەو کاتێك بە زەیی بە کەسێکدا هاتباوە زوو زوو دەیگوت "ئاخ مالا منێ".

## یوسف عەزیز ئۆغڵوو

نازانم بە یوسف عەزیز ئۆغڵووی ڕەحمەتی بڵێم برا گەورە یانیش هاوڕێ؟ ساڵی ١٩٤١، دوای ئەوەی ئامادەییم تەواو کرد و هاتمە ئیستانبووڵ، کاك یوسفم ناسی. ئەو لە قۆناغی چوارەمی کۆلێژی پزیشکی بوو، منیش بوومە قۆناغی یەکەمی کۆلێژی یاسا، ئەوسا، لەبەر ئەوەی خوێنکی ڕۆژهەلاتیانەم هەبوو، بۆیە بەردەوام لای ئەو شەرمنیم پێوەدیاربوو، ئەو هەستی بەو خووەی من کرد و ڕۆژێك پێی گوتم: "مووسا دەمەوێ پێت بڵێم کە زۆر شانازی بەوە دەکەم برایەکی وەك تۆم هەیە، بە دۆستایەتییەکەی نێوانیشمان دڵخۆشم، بۆیە تکادەکەم لەگەڵ من خۆت سەغڵەت مەکە و ئاسایی هەڵسوکەوت بکە". پیاوێکی پڕ زەریف بوو، بە شێوازی جلوبەرگ لەبەرکردنی ئەوسای، کەس نەیدەزانی لە خێزانێکی دەرەبەگی کوردە. من بە بەراورد لەگەڵ ئەو و هەڤاڵەکانی دیکەمان، زیاتر لە ژێر کاریگەریی ئەرێتی فەلسەفە بووم، ئەوان زیاتر کەوتبوونە ژێر لایەنە نەرێنییەکەی. هەرگیز لە بیری ناکەم جەژنێکی قوربان هاتە بەشە ناوخۆییەکەمان و گوتی: "یەڵا کوڕینە با بۆ نوێژی جەژن بچینە مزگەوتی سولێمانییە" برادەران دەستیان بە خۆئامادەکردن کرد و بە پێکەنینەوە سەیرێکی منی کرد و گوتی: "مووسا تۆش وەرە برا"، منیش بۆ چوونە بەهەشت نا، بەڵام بۆ خاتری کاك یوسف

قبوولمکرد. ماوەیەك بەر لەو چوونە مزگەوت لە بەشە ناوخۆییەکەمان کۆنفرانسێکم لەسەر ئەفلاتوونی فەیلەسووفی یۆنانی سازدابوو، چونکە کردبوومانە بەرنامە، هەموو ئێوارانی رۆژی یەکشەممەی هەموو هەفتەیەك، برادەرێکمان دەربارەی بابەتێکی نزیك لەبەشەکەی خۆی وتارێکی پیشکەش دەکرد. ئەفلاتوون دەڵێ: "نزاکردن، پاڕانەوەی قەرەجانەیە". واتا بەبێ ئەوەی خۆت بە شتێك ماندوو بکەی، داوای شتێك لە خوا دەکەی، لە کاتێکدا خوا کەسی دەست بەتاڵ و قەرەج و دۆمی دەست پانکەرەوەی خۆش ناوێت. لە ڕێگای چوونە مزگەوت کاك یوسف پێی گوتم: "مووسا ئەوڕۆ تۆش لەگەڵ ئێمە نزا دەکەی؟" لە وەڵامدا گوتم: "وەڵاهی کاك یوسف من بۆ ئەو دونیا نزا ناکەم، بەڵام ئەمڕۆ لەناو ئەو هەموو سەرسەرییەی مزگەوت نزا دەکەم پێڵاوەکانم ون نەبێت".

چووینە ناو ئەو مزگەوتەی شوێنی ۲۵ هەزار کەسی لێدەبێتەوە، نەك لەناو حەرەم بەڵکو لە حەوشی مزگەوتیش هیچ شوێنێك نەبوو بۆ نوێژکردن، بە سەت دەردەسەری تا شوێنێکمان دۆزییەوە. بۆ ئەو جەژنە بە هەزار بێنەوبەردە شتێك پارەم کۆکردبۆوە و پێڵاوێکم کڕی بوو، زۆر نوێ و جوان بوو. دوای تەواو بوونی نوێژ و وتاری جەژن، جەماعەت بڵاوەیان لێ کرد، منیش بە دوای پێڵاوەکەمدا دەگەڕام، بەڵام دیار نەبوو. چووینە لای مەلای وتار خوێن، پرسیاری پێڵاوەکەم لێ کرد، کەچی مەلا گوتی: "ئاخر لەناو ئەو هەزاران کەسەی بۆ نوێژی جەژن هاتوون هیچ نەبێت ۱۰ هەزاری دزە". سەرتان نەیەشێنم، دوای گەڕان و ماندوو بوونێکی زۆر، بۆ ئەوەی بە پێی پەتی نەچمە دەرەوەی مزگەوت، نەعلێکی قاپ قاپەی داریان دامێ. لە ڕێگا تا گەیشتینەوە بەشە ناوخۆیی، تەق... توق... تەق... توق...

دەنگی قاپەکە سەرجەم هەڤالان و کاك یوسفیشی بە پێکەنین هێنابوو. لەبەر ئەوەی کاك یوسفیش لە هەموومان دەوڵەمەندتر بوو، بۆیە، بە بێئاگایی خۆم ژمارەی پێم و حەفت لیرە و نیوی دابووە دەرگاوانەکەمان، ئەویش نازانم چۆن بەو جەژنە دووکانێکی کراوەی دۆزیبۆوە و پێلاوێکی بۆ کڕیبووم.

لەبەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکە، باسی بێنەوبەردە سیاسییەکانی خۆمم لەگەڵ یوسف عەزیزئۆغلوو کردبوو، بۆیە، لێرە نامەوێ دیسان باسی بکەمەوە. ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو، کاك یوسف بووە وەزیری تەندروستی. ساڵی ١٩٦٣ کاتێك من لە ئەنقەرە دەستگیرکرابووم و ئەویش وەزیر بوو، لە بەندیخانە هاتە سەردانم. ئەو زیارەتە بووە بابەتی گەرمی پەرلەمان، ئۆغوز بەکاتای وەزیری ناوخۆی ئەوسای تورکیا، بۆ ئەوەی کاك یوسف بشکێنێتەوە و لە پۆستەکەی بدا، دەڵێ تۆ لە زیندان چووبوویە سەردانی مووسا عەنتەری کورد پەرست، ئەویش وەك وەڵامێك پێی گوتبوو: "چۆن ناچمە سەردانی مووسا، چونکە پێم وایە ئەو پیاوێکی بە نامووس و بەشەڕەفە، بەڵام گەر تۆ دەستگیر بکرێی، سەردانت ناکەم".

ساڵی ١٩٥٨، کەشوهەوای سیاسی لە باکوور و باشووری کوردستان گۆڕابوو، بارزانی لە ڕووسیاوە گەڕابۆوە، عێراقیش لەگەڵ تورکیا بۆ لەناو بردنی کورد واژووی لەسەر پەیمانی بەغدا کردبوو، بەڵام زۆری پێنەچوو مەلیك فەیسەڵ عەبدوللا و نووری سەعید لە کودەتایەکی سەربازی دەکوژرێن. دوای سێزدە ساڵ لە چوونی بۆ ڕووسیا، مستەفا بارزانیش داوەتی عێراق کرابوو. دیاربەکری دڵی کوردستانی تورکیا خەوتبوو، حکوومەتە فاشیستەکان ئەوەندەیان خەڵك ترساندبوو، هیچ تروسکایی و ڕووناکییەك لە چاوی خەڵکەکە نەدەبیندرا، زۆر

بەو دۆخە دڵتەنگ بووم، بۆیە، لە ئیستانبووڵەوە چوومە ئەوێ. دەستم بە کارکردن کرد بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد). لەوێ عەزیز یوسف ئۆغلووم بینی و نیەتی خۆم پێگوت، ئەویش پێی باش بوو، ئەو پێشنیارەشی بۆ کردم: "مووسا سەرقاڵی دروستکردنی کۆگایەکی دەرمانم، تۆش وەرە لەگەڵم کارکە، چونکە هەستدەکەم لەگەڵ من لەو کارە زۆر مورتاح دەبی، بەو پێیەی زوو زووش لە تەواوی دەرمانخانەکانی ناوچە کوردییەکان کارمان دەبێت، ئیدی تۆش هەموو ناوچەکانی کوردستان دەگەڕێی و دەیانبینی". داواکارییەکەم قبوولکرد و کۆگاکەمان کردەوە و دەستمان بەکارکرد. لە کۆگا بەرپرسیارەتیم چاودێریی گشتی بوو، بەو بۆنەیەوە لەگەڵ چاودێرییەکی توند و زۆری میت و پۆلیس، تەواوی کوردستان گەڕام. ئەگەر ئەمڕۆ هەندێك زانیاریم لەسەر جوگرافیا و دۆخی کۆمەڵایەتیی کوردستان هەبێ، بەشی هەرەزۆری هیی ئەو گەڕانەی ئەوسامە.

ساڵی ١٩٥٩ بە ناوی گرووپی چل و نۆکان دەستگیرکرام، لێرە باسی ئەوە ناکەم، چونکە لەبەشەکانی پیشوو باسمان کردبوو، کە چۆن دەستگیر کراین و سزادراین و سەقەت بووین و ئینجا ئازاد کراین. لە زمانی کوردی زۆر جار ڕستەی "ماڵا منێ" بۆ هەندێك کەس بەکار دەهێندرێ. لەبەر ئەوەی کاك یوسفیش هەم نەخۆشی شەکرەی هەبوو، هەمیش تووشی نەخۆشیی سیل ببوو، بۆیە لە ڕووی دەروونییەوە زۆر هەستیار ببوو. من بەردەوام لەبەر ئەو زەرافەت و هەست ناسکییەی دڵەخورپەی ئەوەم بوو شتێکی بەسەر بێت. کاتێك وەزیری تەندروستی بوو، لە دوورگەی هەیبەلی لە نەخۆشخانەی تایبەتی وەرەم خەوێندرابوو، کە لە بەندیخانە ئازادکرام، یەکەم کارم

چوونە لای ئەو بوو. لە ژێر دار سنۆبەرێك مێزێکی بەرامبەر بە دەریا دانابوو. لە دەرگا کاتێك گوتم سەردانی وەزیر دەکەم، یەکسەر بردمیانە ژوورەوە بۆ لای ئەو. زۆر دڵی پێخۆش بوو، بەڵام بە داخەوە تەنیا هێسك و پێست مابۆوە، جەستەیەکی لاواز و بەرز و زەریف، ئاگری لە هەناوت بەر دەدا. ویستم ماچی بکەم، بەڵام ڕێگای نەدا، تێگەیشتم لەبەر ئەوەیەتی تا میکرۆبەکەی بۆ من نەگوازێتەوە. بەڵام من هەردوو ڕوومەتی و لێوەکانیشم ماچ کرد، منیش دەمویست بەو کارەم ئەوەی پێبڵێم: "دکتۆر بریا هەموو میکرۆب و نەخۆشییەکەت بۆ من بێت و تۆ ڕزگار بوای لەو بەڵایە"، لە تەك ئەو دانیشتم و ئەوەندەی لەدەستم هات دڵنەواییم کرد و کەیفیم خۆشکرد، بەڵام لە کاتی قسەکردنی من، لە چاوە جوانەکانی فرمێسك ڕژا و گوتی: "مووسا، من وا دەمرم، بەڵام بەوە دڵتەنگ نیمە، بەڵکو بە تەنیا مانەوەی تۆ زۆر بێتاقەتم دەکا". دوای ئەو دیدارە، کاك یوسف کۆچی دوایی کرد. منیش تەنیا مامەوە، بەڵام ڕۆحی شاد بێ. بەس حەزدەکەم ئێستا گوێی لێمبێ تا بزانێت ئیدی نە من و نە ئەویش تەنیا نین.

کاك یوسف لە گەنجیدا، بەپێی عادەت و کەلتووری ئەوسای کوردەواری، دوای کۆچی دوایی مامی خێزانی ئەوی مارەکردبۆوە، ئێمەش هەموومان بە خێزانەکەیمان دەگوت (دادە). سەرەڕای خانمبوونی بەڵام لەبەر گەورەیی تەمەنی، منداڵی نەبوو، بەڵام تا دادەمان ساغ بوو کاك یوسف، لەبەر ئەوەی منداڵی نابێ، ژنی بەسەر نەهێنا. دوای ماوەیەك دادە کۆچی دوایی کرد. کاك یوسف بێوەمێرد کەوت، هەموومان ئەو دۆخەی ئەومان زۆر پێ ناخۆش بوو، تا دواجار کچی یەکێك لە شێخەکانی کولپمان بۆ هێنا. لەو ئافرەتە خوا منداڵێکی

پێدان، دکتۆر زۆر دڵخۆش بوو، بۆیە پێی دەگوتم: "مووسا گەر پێت خۆش بێت لەگەڵ تۆ بە ناولێنانی منداڵەکانمان میزۆپۆتامیا نۆژەن دەکەینەوە، کوڕی تۆ دیجلە و ئەوەی منیش ناو دەنێم فورات، بەو شێوەیە منداڵەکانمان مەملەکەتی خۆیان لەبیر ناکەن". بۆیە ناوی لە کوڕەکەی نا فورات.

لەگەڵ دکتۆر بیرەوەریم ئەوەندە زۆرە نەبێتەوە، بەڵام بۆ نووسینی هەر بیرەوەرییەك بیردەکەمەوە تا وردەکارییەکەیم بیردێتەوە، ئینجا دەست بە نووسین دەکەم، ئەوەش بۆ من زۆر زەحمەتە، چونکە لەگەڵ وەبیرهاتنەوەی هەر یادەوەرییەك دڵتەنگ دەبم و وەك مۆمێك دەتوێمەوە. دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە دوایین خزمەتی دکتۆر یوسف عەزیز ئۆغڵوو بۆ کوردستان بریتی بوو لە کردنەوەی بنکەی تەندروستی لەسەرجەم شار و شارۆچکەکانی، بۆیە، پێویستە لەسەر هەموو کوردێك بەرامبەر بەو خزمەتەی بۆی کردوون، بە پیرۆزی یادهی دکتۆر یوسف عەزیز ئۆغڵوو بکەنەوە.

منیش بە ڕێز و حورمەتەوە سەرم بۆ یادەوەرییەکانی دادەنوێنم.

### حەمباڵێکی قەرەقۆچانلی (دەپێ)

لە ناوچەی سوعادیەی ئیستانبووڵ، ماڵمان لە شەقامی ئەمین عەلی پاشا بوو، ژمارە ١٠-١. ئەو ناونیشانە لای دەزگای هەواڵگری تورکیا (میت) ناودار بوو، بۆیە، دەربارەی ماڵەکەم ڕاپۆرتێکی بەو شێوەی خوارەوەیان ئامادە کردبوو:

"ماڵی مووسا عەنتەر لە سوعادیە وەك قونسوڵخانەی کوردستانی لێ هاتووە لە ئیستانبووڵ". لەبەر ئەوەی مەسرەفم زۆربوو، بۆیە زۆرم کار دەکرد، بۆ نموونە ئیشی چاپخانە و

خواردنگە و بەشە ناوخۆیی قوتابیانم هەبوو، جگە لەمانە زەوی و خانووی ئەو ئەرمەنییانەشم دەکڕی و دەفرۆشت کە لە دەرەوەی تورکیا دەژیان و لە ئیستانبووڵ ماڵ و موڵکیان هەبوو، یانی بە جۆریك لە جۆرەکان کاری وەرگرتنی کۆمسیۆنی کڕین و فرۆشتنی خانووبەرەم دەکرد.

ڕۆژانی شەممە و یەکشەممە، ماڵەکەم پڕ دەبوو لەو قوتابییە گەنجانەی لە ئیستانبووڵ دەیانخوێند، ئەو لاوانە، هەم لەوێ یەکدییان دەناسی و هەمیش لەبەر ئەوەی لە خێزانەکانیان دوور بوون و لە غوربەتدا دەژیان، نانی ماڵەوەیان دەخوارد و تۆزێکیش حەسرەتی دووره وڵاتییان لای ئێمە دەڕەواندەوە. ئەمڕۆ ئەو گەنجانە لاپەڕەی زۆر جوانی ژیانیان نووسیوەتەوە. ئەوسا کاتێك دەهاتنە لامان هەرکەسە و کارێکیان دەکرد لای من، هەندێکیان خواردنی ناوچەکانی خۆیان دروست دەکرد، هەندێکیشیان باسی فۆلکلۆریان دەگێڕاوە، کاتێك خەندە و پێکەنینم لەسەر ڕووی ئەوان دەبینی، من و خێزانەکەشم دڵخۆش دەبووین.

ڕۆژانی چوارشەممە و پێنجەشەممان لە ڕاست و چەپی ناوچەی سوعادییە، لە بۆستانجی و ئەرنەکۆی، هەفتە بازاڕ هەبوو. وەك ئاشکرایە، لەو هەفتە بازاڕانە هەم بەرهەمی تازە دەفرۆشرا، هەمیش نرخیان هەرزان بوو، منیش، لەو ڕۆژە دیاری کراوانە دەچووم و پێویستی سەوزە و میوەی هەفتەیەکم لەوێ دەکڕی. ڕۆژێك لەگەڵ ڕەخشانی کچم چووینە هەفتە بازاڕی ئەرنەکۆی، لەوێ پیاوێکی تەمەن مامناوەندی سەبەتە لە پشتم بینی، لە سەر و سیمایدا دیار بوو کوردێکی بەستەزمانە، بانگیمکرد و ئەو کەلوپەلانەی کڕیبوومان خستمە ناو سەبەتەکەی ئەوەوە، لە ڕێگا بینیم دەستی چەپی کردووەتە

بۆکس و پەنجەکانی نووشتاوەتە ناو یەك، لێم پرسی:
"برادەر دەستت چی لێ هاتووە؟"
"مەپرسە کاکە، نازانم ئیدی شتێکی لێ هاتووە".
"تکایە پێم بڵێ چی لێ هاتووە؟"
پیاوەکە سەرەتا دوو دڵ بوو لە گوتنی، چونکە نەیدەویست ئاشکرای بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی پێم گوت منیش کوردم و وازیشم لێ نەهێنا و زۆرم لێ کرد تا پێم بڵێ، کابرا باوەڕی کرد و ئەو چیرۆکە ناخۆشەی بۆ گێڕامەوە:
"بەڕێزم ساڵی ١٩٣٩ لە دێرسیم سەرباز بووم، نەقیب کەنعانی فەرماندەمان، لە سەربازە کوردەکان تیمێکی کوشتنی پێك هێنابوو. ئەو منداڵ و ئافرەت و ئیختیارە دێرسیمییانەی لە گوند و ئەشکەوتەکان دەستگیردەکران، لەلایەن ئەو تیمەی ئێمەوە ڕەمی دەکران. لەکاتی کوشتنیان پەل هاوێشتنی ئیختیارەکان و زیق و هۆڕی منداڵەکان و لەباوەش گرتنی ڕۆڵەکان لەلایەن دایکەکانیانەوە منی تووشی داروخانێکی دەروونی کرد. دوای چەند کارێکی ئاوا بیرم لە خۆکوشتن کردەوە، بەڵام دواتر بۆ دەرباز بوون لەو گوللەباران کردنە ڕێگایەکی ئاسانترم دۆزییەوە، چونکە بینیم سەربازە برینداره‌کانی برادەرمیان دەبردە نەخۆشخانەی ئەرزرووم. ڕۆژێك کەوتبووینە ناو شەڕێکەوە منیش چەکەکەم خستە ناوەراستی دەستی چەپم و بە دەستی ڕاستم پەلاپیتکەی چەکەکەم تەقاند و بە چەند گولەیەك دەستی خۆم پارچە پارچە کرد. دوای ئەوە ئیدی چوومە ئەرزەرووم و لە جەلادایەتی براکانم ڕزگارم بوو، ئەو دەستەم ئەو دەستەیە کە دامە بەر گوللە.
کە لە قسەکانی بۆوە، ڕامگرت و دەستی چەپیم خستە ناو دەستەکانی خۆم و ماچمکرد، ڕەخشان و ڕەمزیی حەمبال

سەریان سوڕمابوو، بەڵام من ئەرکێکی پیرۆزم بەجێگەیاند و تا ئێستا قەت لەو دەست ماچ کردنە پەشیمان نەبوومەتەوە.

## ئیحسان سەبری چاغلایانگیل

هەندێجار زۆر خۆشیم بە وتە و فەرموودەی پێغەمبەران دێت، بۆ نموونە: حەزرەتی عیسا لە ئینجیلی لۆکا دەڵێ: "لە حزووری خوادا ئامادەبوونی دەوڵەمەند بە ڕووێکی سپی، لە وەی قورسترە حوشترێک بە کونی دەرزیدا ببەی". حەزرەتی محەمەدیش لە فەرموودەیەکدا دەڵێ: "یا ڕەببی لە دونیادا، کار و کردەوەی چاکم بە قسمەت بکە". وەك دیارە فەرموودە و وتەی پێغەمبەرانیش جۆرێکە لە پەند و یادەوەری. ئێستا لە خوارەوە بەشێک لە پەرتووکی ئیحسان سەبری، بە ناوی (یادەوەرییەکانم)، دەخوێننەوە، چونکە ئەوە نموونەیەکی زۆر زیندووە لەسەر ئەوەی ساڵەهای ساڵە چۆن لە تورکیا حوکمی گەلی کوردیان کراوە. سەیریش لەوەدایە ئێمە پیاوەکانی خۆمان ناناسین، جا یان ئێمە زۆر گێلین، یانیش ئەوان گەلەك زۆرزانن.

لە پەڕاوەکانی ناو مێژوو چیرۆکی زۆر جوان هەیە، بۆ نموونە گەر پیاوێك زۆر خراپە و ساختەچیاتی لەسەر ئاشکرابێ، ئیدی خەڵکەکە بە زەحمەت باوەڕی پێدەکەن. بەڵام سەیرکەن ئێمە چیمان کردووە؟ ئێمە کاك ئیحسانی بە ویژدانمان بۆ ماوەی چەندان ساڵ کردۆتە وەزیری دەرەوەی تورکیا، بووەتە سەرۆکی پەرلەمان، جگە لەمانە بۆ ماوەی چەندین مانگیش بووەتە جێگری سەرۆککۆمار، تا ئەو ئاستەی ویستوومانە بیکەینە سەرۆککۆماریش.

بەر لەوەی بەشێك لە نووسینەکانی ناو پەرتووکەکەی ئیحسان سەبری دانێم، دەمەوێ چیرۆکێکی مێژووی ئیسلامیتان

بۆ بگێڕمەوە، کە بە هەمان کاری سەبرییە فەندی دەچێ.

دەڵێن، دوای کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد، هەر یەکە و لە پاڵ خۆی هەرچی بە مێشکدا هاتبێ، گوتوویەتی پێغەمبەر ناوای گوتووە. وەك ئەو دەیان ئینجیلە درۆیانەی دوای کۆچی دوایی حەزرەتی عیسا نووسران، یان مەسەلەی بەرز بوونەوە بۆ ئاسمانەکان. ئیمامی بوخاری خاوەن زانست و زانیاریی ئیسلامی، هەستی بەو مەترسییە کردووە و فەرموویەتی: "وا باشە تا کات زۆر تێنەپەڕیووە و کوڕ و نەوەی بەشێك لە سەحابەکان لە ژیان ماون، بەناو جیهانی ئیسلامیدا بگەڕێم و فەرموودەی دروست و سەحیح کۆبکەمەوە". بوخاری بەرەو بەغدا بەڕێکەوتووە و پرسیاری ئەو کەسانەی کردووە کە کاری پێیانە، لەوێ پێیانگوتووە: "لە لادێیەکی نزیك بەغدا، پیاوێکی زۆر بەڕێز و دینداری نەوەی یەکێك لە سەحابەکان هەیە، ڕەنگە ئەو سوودی هەبێ بۆ تۆ". بوخاری بۆ دۆزینەوەی ئەو لادێیە بەڕێ دەکەوێ و ماڵی کابرا دەپرسێ، دوای دۆزینەوەی ماڵەکەی، خێزانی کابرا دەڵێ: "مامۆستا لەسەر خەرمانە، ئێوە فەرموون تا بانگی بکەین بێتەوە". بوخاریش دەڵێ: "نا خاتوون، من دەچمە لای". بوخاری دەچێتە سەر خەرمان بۆ لای مامۆستا، دەبینێ مامۆستا کەواکەی کردۆتەوە و بانگی جوانووێک دەکات و دەڵێ: "قوڕش موڕش". بوخاری دەپرسێ: "مامۆستا چی دەکەن؟"، ئەویش دەڵێ: "جوانووەکەمان بەلەسەبووە و دەمەوێ بیگرمەوە"، بوخاری دەپرسێ: "ئەی چ خواردنێکت لەژێر کەواکەت دانابوو تا ڕازی بکەی بێتەوە؟" مامۆستاش دەڵێ: "هیچم دانەنابوو، بەتاڵ بوو، بەس وامدەگوت تا جوانە ئەسپەکە هەڵبخەڵێت و بێتەوە". بوخاریش دەڵێ: "مادەم وایە هیچ شتێك لە تۆ ناپرسم، تۆ گەر ئاژەڵە هەڵبخەڵەتێنی، گومانی تێدا نییە منیش وا لێدەکەی".

دوای ئەو ڕووداوە بوخاری بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە بەغدا.

ئێستا ببینن،ئیحسان سەبری، لە لەدایك بوونیەوە لەپەرتووكی بیرەوەرییەكانی چۆن خۆی دەناسێنێ: "بنەچەی خێزانەكەی ئێمە قەفقاسییە. كاتێك من لە دایك بووم باوكم بەڕێوەبەری بەنداوی مانیسا بووە. لە سەردەمی سوڵتان حەمید، ئەوانەی لە ئیستانبوول لە دایك دەبوون، بانگهێشتی سەربازیی بە زۆر نەدەكران، چونكە ئەوسا سەربازی وەك ئێستا نەبوو، ئەوانەی دەچوونە سەربازی زۆربەیان نەدەگەڕانەوە، گەر بشهاتباناوە چەندان ساڵی پێ دەچوو. پێش ئەوەی بێمە دنیایە، دایكم چووەتە ئیستانبوول، بۆیە، من لەوێ لە دایك بوویمە، ئێستاش تەمەنم ٨٣ ساڵە". بە كورتییەكەی واتا ئەو پاڵەوانە نەتەوەییەمان هێشتا لە سەربازی قاچاغە. ئینجا بەو شێوەیە لە نووسین بەردەوام دەبێ: "سەبارەت بە تورگوت ئۆزاڵەوەندەم زانیاری نییە[1]، بەڵام لەبەر ئەوەی هێشتا زیندووە پاڵەپەستۆی خراوەتە سەر، بۆیە نامەوێ هیچی لەسەر بنووسم". كەچی ئۆزاڵ لە پاداشتی ئەوە گوتبووی: "ئەدی ئیحسان سەبری خەڵكی بورسا نییە ؟". منیش دەڵێم حاشا

---

[1] تورگوت ئۆزال (١٩٢٧ – ١٩٩٣) سیاسەتمەداری بە بنەچە كورد، لە نێوان ساڵانی (١٩٨٣ – ١٩٨٩) سەرۆكوەزیرانی توركیا بووە، دواتریش بۆ ماوەی چوار ساڵ پۆستی سەرۆكایەتی كۆماری توركیای لە نێوان ساڵانی (١٩٨٩ – ١٩٩٣) بەڕێوەبردووە. ئۆزال جگە لەو دوو پۆستە باڵایە، چەندانی پۆستی وەك سەرۆكی پارتی (دایك) و پۆستی چەندان وەزارەتی بەڕێوە بردووە. لەگەڵ ئەوەی ئۆزال ڕاستەوخۆ دانی بە كورد بوونی خۆی نەنا، بەڵام بەیەكەم كەس دادەنرێت دوای زیاتر لە حەفتا ساڵ قەدەغەیی زمانی كوردی لە توركیا، لەسەر ئەو زمانە هەڵگرت. بەهۆی ئەو هەوڵانەی ئۆزال دەیدا بۆ چارەسەركردنی پرسی كورد، تا ئێستا گومان لە چۆنیەتی مردنەكەی دەكرێت. (وەرگێڕ).

خەڵكی بورسا و زەكی مورەن[1] نابێ لەگەڵ ئەو خەڵكی یەك شار بن، چونكە ئیحسان شتێكی دیكەیە.

دەزانن ئەوانە بۆچی دەنووسم؟ چونكە دەمەوێ بزانن، حەفتا ساڵە كۆماری توركیا چۆن گەیشتۆتە ئەو دۆخەی ئێستای. گەر دەوڵەتمەدارەكانمان ئەو جۆرە پیاوانە بن، دەبێ نزا بكەین خوا تووشی بەڵای گەورەترمان نەكا. بەڵام دڵنەواییەكم هەیە، چونكە كەسی ئاوا گەر بچینە بنج و بنەوانی، ڕەچەڵەكیان یان بنجووە، یانیش كۆچەری قەفقاس و قرم و سەلانیك و ڕۆمین. بۆ ئەمەش، دەبێ سوپاسگوزار بین ئەوانە بە بنەچە كورد و توركی ڕەسەن نین، جا بەردەوام بەوانە دەڵێم هەڵگەڕاوە، بۆیە، هەندێك كەس لەسەر ئەوە لێم تووڕە دەبن، منیش پێیان دەڵێم بەڵێ برادەرینە كەسی هەڵگەڕاوە لای من ئەخلاقی لەژێر پرسیارە، چونكە ئەو هەڵگەڕاوانە یان ترسنۆكن یانیش زۆر خود پەرستن.

دەمەوێ لێرە، باسی ڕۆڵی ئیحسان سەبری، لە شۆڕشە قارەمانەكەی دێرسیمی سەید ڕەزا، بكەم. لەبەر ئەوەی ئەو چیرۆكە عیبرەتێكە بۆ هەموومان، بۆیە، دەمەوێ بەشێك لە پەرتووكەكەی چاغلایانگیل لێرە دابنێمەوە:

"دوای تێپەڕینی چەندین مانگ بەسەر دەستگیركردنی سەید ڕەزا و هاوەڵانی، پرۆسەی دادگایی كردنەكەی بەردەوام بوو، لەو سەروبەندە، ئەتاتورك بۆ كردنەوەی پردی (سینگەچ) لەسەر ئاوی موراتی دیاربەكر دێتە خارپێت، لەوێشەوە بە ڕێگای وشكانی بەسەر پردی (سینگەچ) تێدەپەڕێت.

بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس ئاگاداری كردمەوە، ئەتاتورك

---

[1] زەكی مورەن (۱۹۳۱ — ۱۹۹٦) هونەرمەند و شاعیری تورك، بە پاشای مۆسیقای كلاسیك دادەنرێت. (وەرگێڕ).

دەچین بۆ کردنەوەی پردی (سینگەچ) شۆرشی دێرسیمیش کۆتایی هاتووە، بەڵام شەش هەزار دەرپێ سپی لەبەری ڕۆژهەڵاتی خارپێتن، تا داوای بەخشینی گیانی سەید ڕەزا بکەن لە ئەتاتورك، بۆیە، نابێ ڕێگا بدەین ئەو دەرپێ سپی لەبەرانە بێنە مەیدان و ئەو داوایە لە ئەتاتورك بکەن. ساڵی ۱۹۳۷، دوای دەمژمێرەکانی نیوەڕۆی ڕۆژێکی پشووی فەرمیی هەفتە، دەبوو دۆسیەی سەید ڕەزا و جەماعەتەکەی دابخرێ، چونکە ئەتاتورك لە ڕۆژی دووشەممە دەهاتە خارپێت. بۆیە، ئەوەی فەرمانیان پێکرابوو بەر لە هاتنی ئەتاتورك سەید ڕەزا لە سێدارە بدرێت، ئەگینا گەر ئەو دەرپێ سپی لەبەرانە بچنە بەردەم ئەتاتورك، کار لە کار دەترازێ. ئەو سەردەمە، کاك شەفیقی پارێزگاری خارپێت و حاتەم سەنیهی داواکاری گشتی و کاك سەرەزلی ئیبراهیمی بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس برادەرم بوون.

شوکرو سۆکمەنسور پێی گوتم: پێویستییەکانی خۆت لە سڤیلەکانی بەشی سیاسی بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیس وەرگرە، چونکە پاراستنی ئەتاتورك لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە تا شوێنی مەبەست لە ئەستۆی ئێوەیە. دوای دیدارەکەمان لەگەڵ کاك شوکرو، لەگەڵ ماجار مستەفا و شەش کەسی دیکە بەڕێکەوتین و بە شەمەندەفەر چووینە خارپێت. چوومە لای کاك ئیبراهیمی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس و حاڵ و مەسەلەکەم بۆ باسکرد، بەڵام ئەو گوتی داواکاری گشتی شتێك ناکا لە دەرەوەی ڕێساکان بێت. بە ناچاری چوومە لای داواکاری گشتی و دووبارە دۆخەکەم بۆ باسکرد، ئەویش باسی لەوە کرد لەسەر ئەو پرسە لەلایەن وەزارەتی دادەوە ژمارەی نهێنیی دراوەتێ، بەڵام دادگاکان لە ڕۆژانی شەممە پشووی فەرمییانە و داخراون، بۆیە، لە ڕۆژێکی ئاوا وەرگرتنی ئەنجام زۆر زۆر زەحمەتە،

منیش ناتوانم کاریگەریم لەسەر دادگا هەبێ. ئێمە پەلەمان بوو چونکە دەمانویست بەر لەوەی ئەتاتورك بێت مەسەلەی دادگاییکردنی سەید ڕەزا یەکلایی بکەینەوە، بەو شێوەیە تا کاتی هاتنی ئەتاتورك دۆسیەکە بە تەواوی دابخرێت، چونکە من بۆ چارەسەرکردنی ئەو پرسە لەلایەن حکوومەتەوە بۆ ئێرە نێردرابووم.

جێگری داواکاری گشتی، هاوپۆلی بەشی یاسام بوو لە زانکۆ، ئەو پێشنیازی بیرۆکەیەکی ئاوای بۆ کردم: "تۆ بڕۆ بە پارێزگار بڵێ ئەو داواکارە گشتییە ڕاپۆرتی خۆی وەرگرێ و دەڕوا، دوای ئەو من کارەکەت بۆ دەکەم"، چونکە ئێمە لە ڕۆژی پشوو دەمانویست دادگا بڕیاری کۆتایی خۆی و فەرمانی لە سێدارەدانی سەید ڕەزا دەربکات. داواکارە گشتییەکە ڕاپۆرتی وەرگرت، ئەو برادەرەم بە پلەی جێگری چووە شوێنی داواکارە گشتییەکە، ئینجا دادوەری ئەو دادگایەمان لە ماڵەکەی خۆی دۆزییەوە. کاتێك چوومە لای، ئەو بڕیارەی دادگای دەنووسیەوە کە لەسەر ئەو دۆسیەیە لە دادگا دەرچووبوو. بۆچوونی خۆمانمان لەسەر پرسەکە بۆ باسکرد، بەڵام ئەو سەرقاڵی تایپکردنی بڕیارەکە بوو. سەردەم سەردەمی جەهەپە یە، هەموو کەس سڵ لە هەموو شتێك دەکاتەوە.

"ڕۆژی شەممان دادگا کۆنابێتەوە، بەڵام ڕۆژی دووشەممە دادگا کۆ دەکەمەوە و بڕیارەکە دەردەکەین و ئێوەش ڕۆژی سێشەممە فەرمانی لە سێدارەدانەکە جێبەجێ بکەن" دادوەرکە ئاوای پێ گوتم.

ئەو سەردەمە دوای بڕیاری دادگا، لەو ناوچەیە مافی تێهەڵچوونەوە بە بڕیارەکە لەلایەن دادگای باڵاوە نەبوو، بۆیە، عەبدوڵا پاشا، وەکو فەرمانـدەی دۆخی لەناکاوی ناوچەکە

بڕیارەکەی پشتڕاست دەکردەوە، چونکە پێی گوتبووین: "گەر فرمانەکە بگاتە لام، ئێمە لە جێبەجێکردنی ئەرکی پشتڕاستکردنەوە درەنگی ناکەین"، بۆیەش، واژووی خۆی لەسەر کاغەزێکی سپی کردبوو، بەشێوەیەك گەر لەسەرەوە بنووسن لە سێدارەدانی عەبدوڵا پاشا، دەبوو خۆی لە سێدارە بدا.

بە دادوەرمان گوت:

"ئەو ڕۆژەی ئێوە دەڵێن ئەتاتورك دێت، بەو شێوەیە ئامانجەکەی خۆمان ناپێکین، بەڵام دادوەر، بەگوتنی هیچ شتێکی دیکە لەوە زیاتر ناکرێ، کۆتایی بە قسەکان هێنا".

منیش لە خۆیانم پرسی:

"ئێوە هیچ کات نەبووە دوای تەواو بوونی دەوامی فەرمی، واتا دوای دەمژمێر پێنجی ئێوارە لەسەر دۆسیەیەك بەردەوام نەبووبن لە کارکردن؟ دادوەر لە وەڵامدا گوتی با با، شتی وا زۆر دەبێ، چونکە ڕۆژی وا دەبێ تا دەمژمێر نۆی شەو کار دەکەین."

پێم گوت: "کەوایە ئێوە پێنج سەعات لە کاتی خۆتان زیاتر تێپەڕیوون، گەر لە سەرەتای ڕۆژیش پێنج سەعات لە دەرەوەی کاتی خۆتان کارەکە بکەن نابێت؟ واتا ڕۆژی دوو شەممە پێنج دەمژمێر بەر لە دەستپێکردنی دەوامی فەرمی بڕۆنە دادگا و دۆسیەکە بکەنەوە و بڕیاری لەسەر بدەن. واتا ڕۆژی یەکشەممە پێنج دەمژمێر دوای فتاری ئێوارە، دەکاتە دەمژمێر ۱۱: ۲٤ شەو دەست بەکاری دادگا بکەن.

دادوەر گوتی: "بەڵام لەو کاتەدا کارەبا دەبڕێت".

ئێمە چارەمان بۆ ئەویش دۆزییەوە، چونکە بە لایت و ڕووناکیی ئۆتۆمبێلەکان دادگا و بەندیخانەمان ڕووناك کردەوە. ئەمجارە دادوەر گوتی: "ئاخر قازی نییە"، بەڵام چارەسەری

ئەویشمان کرد. ئینجا پرسیمان چەند کەس لە سێدارە دەدرێ؟ دادوەر گوتی: "ناتوانم بەر لە دەرچوونی بڕیارەکە ئەوە بڵێم، بەڵام داواکاری گشتی داوای لە سێدارەدانی ٢٧ کەسی کردووە". پێم گوت: "یانی ئێمە بەپێی ئەو ژمارەیە ئامادەکارییەکانی خۆمان بکەین؟" ئەویش لە وەڵامدا گوتی: "نازانم".

### هاتووی تا من لە سێدارە بدەی؟

"لە یاسای سزای لە سێدارەدان هاتووە، کاتێک کۆمەڵێک تاوانبار بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەردەچێ، دەبێ هەریەکێک لە شوێنێکی جیا سزاکەی بەسەردا بسەپێندرێت، ئەوانەی لە سێدارەش دەدرێن نابێ یەکتری ببینن. بۆیە لە هەر مەیدانێك چوار کورسی و کەلوپەلەکانی لە سێدارەدانمان ئامادە کرد. پارێزگار هات، بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکەش جەلادێکی قەرەجمان دۆزییەوە. دەمژمێر ١٢ی شەو چووینە بەندیخانە، بە لایتی ئۆتۆمبێلەکان شوێنەکەمان ڕووناك کردەوە، دادگا ٧٢ تۆمەتباری هەبوو، هەمووانمان هێنا و بردمانە دادگا. جەلادەکە بۆ هەر کەسێك داوای ١٠ لیرەی کرد، ئێمەش بەو پارەیە ڕازیبووین. تاوانبارەکان تورکییان نەدەزانی، بەڵام دادگا بڕیارەکەی خۆی بە تورکی خوێندەوە. حەوت کەس بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرچووبوو، لەناو بڕیارەکە فەرمانی ئازادکردن بۆ چەند تۆمەتبارێکیش دەرکرابوو، هەندێکیشیان سزای جۆرا و جۆری زیندانی کردنیان بەسەردا سەپێندرابوو.

کاتێك بڕیاری دادگا خوێندرایەوە، دادوەر وشەی لە

سێدارەدانی بەکار نەهێنا، بەڵام لەبەر ئەوەی باسی لە سزادانیان کردبوو بە مردن، بۆیە، دەستگیرکراوەکان زۆر بە ڕوونی لە سزاکەیان نەگەیشتن.

"هەڵا و هۆریا و خۆشی ئەوەیان لێ بەرز بۆوە کە لە سێدارە نادرێن".

ئێمە سەید ڕەزامان لەگەڵ خۆمان برد، ئەومان بردە ناو ئۆتۆمبێل و لە نێوان خۆم و کاك ئیبراهیمی بەڕێوەبەری پۆلیس دامنیشاند، دوای دەرچوونمان لە دادگا، ئۆتۆمبێلەکەمان لە مەیدانەکەی تەك قەرەقۆلی ژەندرمە وەستا. سەید ڕەزا کاتێك پەتی سێدارەی بینی لە دۆخەکە تێگەیشت، ئینجا ڕووی لە من کرد و گوتی: "هەڵدەواسرێم؟" بەردەوام بوو لە قسەکانی: "تۆ لە ئەنقەرەوە بۆ لە سێدارەدانی من هاتووی؟" سەیرێکی یەکدیمان کرد، یەکەم جار بوو لەگەڵ کەسێك کە لە سێدارە دەدرێت ئاوا چاو لە چاوی یەك بنێین، ئینجا سەید ڕەزا بە من پێکەنی. داواکاری گشتی پرسیاری ئەوەی لێ کرد ئایا دەتەوێ بەر لە لەسێدارەدانت نوێژ بکەی؟ بەڵام ئەو نەیویست. لێمان پرسی دوایین قسەت چییە؟ سەید ڕەزا وەڵامی داوە: چل لیرە و سەعاتێکم هەیە، بیدەنە کوڕەکەم. لەو سەر و بەندە، فندك حافز لە سێدارە دەدرا، بەڵام لە کاتی جێبەجێکردنی سزاکەی دووجار پەتەکەی ملی پچڕا. بۆ ئەوەی سەید ڕەزا لە سێدارەدانی فندك حافز نەیبینێ، لەبەردەم جامی ئۆتۆمبێلەکە وەستام، چەند خولەکێك تێپەڕی و هەڵواسینی حافز تەواو بوو. سەید ڕەزامان بردە مەیدانەکە، کەشوهەوا زۆر ساردبوو، هیچ کەسیش لە دەوروبەرەکە نەبوو، بەڵام وەك ئەوەی مەیدانەکە تژی خەڵك بێت، سەید ڕەزا بە تۆنێکی بەرز وتاری دەدا: "ئێمە منداڵی

کەربەلاین و تاوانمان نییە، بۆیە، ئەمەی ئێوە دەیکەن شەرمە، زولمە، تاوانە"، لەگەڵ وتەکانی ئەو تەزی بە هەموو جەستەم داهات، بەڵام ئەو پیاوە بەتەمەنە ڕەپ ڕەپ دەڕۆیشتە بەردەم پەتی سێدارە. جەلادەکە هاتە بەردەمی تا بیباتە سەر کورسییەکە و پەتەکەی لە مل بکا، بەڵام سەید ڕەزا پاڵی پێوەنا و خۆی پەتی سێدارەی لە مل کرد، شاپێکی لە کورسییەکەی داو خستییە خوارەوە، واتا خۆی بڕیاری لە سێدارەدانەکەی خۆی جێبەجێ کرد. ئەو کۆتاییە بۆ ئەو پیاوە بەقەد کوشتنی کوڕێکت گران و زەحمەتە، چونکە زۆر ناخ هەژێن بوو، بۆیە، جەسارەتی ئەو ئیختیارە زۆر شایەنی تەقدیرکردن بوو. لە ڕووی دەروونییەوە زۆر نارەحەت بووم، میزاجم تێکچوو، بە بەڕێوەبەری پۆلیسم گوت من زۆر سەرمامە دەچمەوە هۆتێل".

"کاتێك سەید ڕەزا لە سێدارە دەدرا، دەنگی هاواری کوڕەکەی لە دوورەوە دەگەیشتە گوێچکەمان: "بمبە کۆیلەت، بمبە بەندەت، بە فیداتان بم دڵتان بەو گەنجییەم بسووتێ، منیش لەگەڵ ئەو مەکوژن".

ئێوەش دەبینن لە دونیادا چ یادەوەرییەك هەیە. سەردەمانێك کارا عەلیی قەرەجی جەلادیش یادەوەرییەکانی خۆی نووسیبۆوە. لەوێ دەیگوت: "من زۆر هەوڵم دەدا ئەو کەسی هەڵی دەواسم ئەزیەت نەبینێت". بەڕێز کەنعان ئەڤرەن پاشاش، یادەوەرییەکانی خۆی نوسیبۆوە و بۆ عەدالەتی خۆشی ئەو نموونەی هێنابۆوە: "بۆ ئەوەی یەکسانی بەرقەرار بێت، ئێمە سەرەتا دوو گەنجی چەپ و دوو گەنجی ڕاستڕەومان لە سێدارەدا".

## شەرم مەکە

شەرمکردن وشەیەکە، هەم لەناو کۆمەڵگای کوردی، هەمیش لەناو فەرهەنگی ئیسلامی، بۆ زۆر ڕووداو و هەڵسوکەوت بەکار دەهێندرێت.

با بێینە سەر ناوی (کورد). نزیکەی ٧٠ ساڵە کاربەدەستانی کۆماری تورکیا و ئەو پیاوە پرۆفیسۆر و نووسەر و قەبە قەبانەی بە کرێ گیراون، هەموویان بەیەك دەنگ دەڵێن شتێك نییە ناوی کورد بێ. ئەوانەی پێیاندەگوترێ کورد لە ڕاستیدا تورکن، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ناوچەکانی ناوەراستی ئاسیا چیا و بەفر نەبووە، کاتێك تورك هاتۆتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لەناو بەفر بەپێ ڕۆیشتوونە لە ژێر پێیەکانیان لەسەر بەفر دەنگی (کارت... کورت... کارد... کورد) دەرچووە، لەوێوە بەو تورکانەیان گوتووە (کورت – کورد). ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوە لە دۆسیەیەکی دادگایی کردنیشمدا لەلایەن داواکارێکی گشتییەوە بەو شێوەیە دووبارە کراوە: "من لە بەدلیس کاری داواکاری گشتیم کردووە، ئەوسا بینیم شتێك نییە بەناوی کورد، بەڵکو کۆمەڵێك تورك زمانی تورکییان لە بیرکردووە و بە زمانێکی سەیری دروستکراو قسە دەکەن". جگە لەو قسانە، میتیش پەرتووکێکی بەناوی (کورد تورکە) بڵاوکردبۆوە، کە فەخری کریزی ئۆغڵوو، لەگەڵ شەش پرۆفیسۆر دەیانویست ئەوە بسەلمێنن کورد تورکن، وەك ئەوەی گەر کورد نەبێ تورك لەناو دەچێ. ڕۆژێك نووسەرێکی ئەڵمانیی دۆستم پێی گوتم: "ئەرێ ئەوە چییە بە ئەتاتورکتان گرتووە مووسا، ئێوە خەریکی چینە؟، وەك ئەوەی گەر ئەتاتورك نەبا هیچتان لەگەڵ کەر جیاوازیتان نەدەبوو".

لەناو ئاژەڵ و ڕووەکیش هەر جۆرەو گرنگییەکی خۆی هەیە، بۆ نموونە مەڕ بەرخی دەبێ، بەڵام هەم شیری چەورە هەمیش زوو شیری دەبڕێ. بزن درەنگ دەزێ کارەکەشی زۆر بە قیمەت نییە، بەڵام سێ چوار مانگ پاش مەڕ شیری تەواو دەبێت، بەخێوکردنیشی ئاسانە و گیانداریکی پیرۆزی چیاییە، زۆر خووشی بە کورد دەچێ، وەك عینادییەکەی و چیاییەکەی. لەبەر ئەوە بزنم خۆش دەوێ، هەر بەو هەستەشەوە لە لادێکەمان ژمارەیەکی زۆری بزنم ڕادەگرت، بەڵام کەیفم بەو دونگە نەرمەی مەڕ نەدەهات.

باشە ئەی پرۆفیسۆر و نووسەر و کەمالیستە ڕوورەشەکان، ئەی ئەوانەی دەیانگوت شتێك نییە بەناوی کورد، ئایا شەرم لە خۆیان ناکەنەوە ئەوڕۆ سەرۆکی حکوومەتی تورکیا دەڵێ: "کورد لە تورکیا هەیە، بەهەمان شێوە، ئەوان لە عێراق و سووریا و ئێرانیش پێکهاتەیەکی گرنگن و بە برای خۆمانیان دەزانین. بۆیە گەر لەوێ بەرامبەر بە کوردەکان کارێکی وەحشیانە بکرێ، ئەوەی ئەو کارە بکا دەبینێ چۆن بەرانبەری دەوەستین. بۆچی ئەو موسوڵمانانەی لە بولگاریاوە دێن برامانن، بەڵام موسوڵمانانی هەڵەبجە و کوردی عێراق نەبنە برامان!". ئەوەی ئەو قسانەی دەکرد بەڕێز سولێمان دەمیرەڵی سەرۆکوەزیرانی تورکیا بوو. ڕاستەکەی کاك سولێمان، لە ڕاستیدا نابێ ئاوا بێت! بەڵام بەر لە تۆ و لەکاتی سەرۆکوەزیراتیی تۆش، تەنیا لەبەر ئەوەی گوتوومانە کوردین زۆریان پێ کردین.

تۆ لە ئێمە خۆشمەبە، بەڵام ئێمەی کورد لەبەر ئەوەی مرۆڤی مەردین، قەینا لە تۆش خۆش دەبین، بۆیە ئەوە بەسە، تەنیا سەرۆکوەزیرانێکی ڕاست و ڕەوان و بێ خەوش بی. لە مێژووی ئیسلامیش بەر لە موسوڵمان بوونیان عومەر و عوسمان و تەڵحە

و خالیدی کوڕی وەلید ویستوویانە حەزرەتی محەمەد بکوژن، بەڵام دوای ئەوەی هاتنە سەر دینی محەمەد، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، خودا و محەمەد لەوان خۆشبوون و بوونە عەشەرەی موبەشەرە، یانی، کە موژدەی چوونە بەهەشتیان پێدرا، هێشتا لەسەر دونیا بوون.

بۆیە، جەنابی سەرۆکوەزیران، خۆت و ئینۆنوی جێگرت خۆتان هەڵیبژێرن ئایا دەتانەوێ بچنە بەهەشت یان دۆزەخ؟ چونکە دروشمە ناشرینەکانی وەك (خوێن لە زەوی نامێنێتەوە) بەکەڵکی هیچ نایەت، چونکە لە هەموو شوێنێك لەبەر سیاسەتی هەڵە زۆر خوێن لە زەوی ماوەتەوە، بۆیە ئێوە بۆ نەڕژانی خوێن و فرمێسك سیاسەتێکی جوان بکەن، ئەوسا هەم خوا، هەمیش هاوولاتییانت هاوکار و پاڵپشتت دەبن. جەنابی دەمیرەل، دەمەوێ بڵێم حکوومەتەکانی پێش ئێوە شتێکی ئاوایان کردبوو، خەڵك نەیدەتوانی بە ڕاست و ڕەوانی بۆچوونی خۆشی بڵێ، بەشێوەیەك بتگوتبا سلق و توور گرانە، یەکسەر داواکاری گشتی، بە یاسای (تیرۆر)، داوای دەستگیرکردنی دەکردی. لە نامەی تاوانبارکردنەکەشدا، بەو شێوەیە تۆمەتبار دەکراین: "جەنابی دادوەر سلق و توور بەرهەمێکی خۆماڵی و نەتەوەییە، لەناو سوپا یەکێکە لە خواردنە سەرەکییەکان. ئەوە بە مەبەست باسی سلق و توور دەکەن تەنیا بۆ ئەوەی زیان بە یەکپارچەیی نەتەوەییمان بگەیەنن، ببێتە دەرفەتێکیش بۆ هاوکاریی تیرۆر". ئەو دونیایە شتی زۆر سەیری تیدایە، چونکە چەند سەیرە کاتێك یەکێك چاڵ بۆ یەکێك لێدەدات، بەڵام خۆی دەکەوێتە ناوی. بۆ نموونە، لەسەردەمی سوڵتان حەمید، مەدحەت پاشا یاسای مەشروعیەت ئامادە دەکات، بەڵام دواتر خۆی بەپێی ماددەکانی ئەو یاسایە ڕادەگوازرێت و لە پلەوپایەکەی دوور دەخرێتەوە و

نەیتوانی جارێکی دیکەش بگەڕێتەوە. بە هەمان شێوە، ئەو یاسا قاچاغەی پارتی دایك (ئانا ڤەتەن)یش دەریکردووە، بەر لەوەی سەری ئێمە بخوات، سەری خۆیانی خوارد. پەنا بەخوا، ئەوانیش وەك مەدحەت پاشا ناگەڕێنەوە، گەرچی ئەوانە لە کوێ و مەدحەت پاشای ڕەحمەتی لە کوێ، نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە؟ چونکە ئەوانە ناگەنە مشتەخۆڵێکی سەر گۆڕەکەی مەدحەت پاشاش. لەبەر ئەوەی پاشا توانی بانکێکی کشتوکاڵی دابمەزرێنێ و بیکاتە دیاری بۆ گەلەکەی، بۆیە، یادەوەرییەکی شەرەفمەندانەی دوای خۆی جێ هێشت. بەڵام ئەوانەی ئەمڕۆ، بە هەزار پێچ و پەنا، تەنیا بۆ خۆیان بانك دەکەنەوە، تا سوود بە خۆیان و دەوروبەرەکەیان بگات.

با بێینەوە سەر وشەکەی خۆمان (شەرم مەکە). ئەو وشەیە، لەگەڵ درۆ تەواوکەری یەکدین. کەسێکی درۆزن شەرم ناکا و پیاوی بێ شەرمیش سڵ لە درۆکردن ناکاتەوە. بەو پێیە بێت، لێرە ئەو پرسیارە دێتە پێش، ئەرێ ئەوانەی ٧٠ ساڵە دەڵێن لە تورکیا کورد نییە، کەسی بێ شەرمن یاخود درۆزن؟ بە بۆچوونی من لە یەك کاتدا هەرووکیانن، هەم درۆزن هەمیش بێ شەرم. باشە ئەی گەر وابێت، دەبێ چی بەوانە بڵێین کە تەنیا لەبەر ئەوەی گوتمان کورد هەیە و دەبێ بە زمانی کوردی قسەی بکرێ، ئێمەیان دەستگیرکرد و خستینیانە زیندان و بە لێدان و ئەشکەنجەدانمان هەموو شوێنێکی جەستەیان سەقەت کردین، ئەی بەوان بڵێین چی؟ من وەك خۆم تەنیا لەبەرخاتری برایەتیی کورد و تورك لەوانە خۆشدەبم. خوالێخۆشبوو عەدنان مەندەرێس، دادگاییکردنێکی باڵای هەبوو، واتا دادگای خوا لە دونیاکەی دیکە. بۆیە، من تاوان و دۆسییەکانی ئەو کەسانە بەپێی یاسا و ڕێساکانی دادگای کۆماری تورکیا حەواڵەی

دادگای خوا دەکەم، جا تا ڕۆژی قیامەت بزانین چ وەڵامێك بۆ دۆسییەکان دێتەوە و چ بڕیارێك لەسەر ئەو تاوانانەیان دەدرێت. دەشترسێم دادگای دونیاکەی دیکە، وەك دادگای فەڕەنسی و ئەڵمانی و سویسری، زوو وەڵام بداتەوە و بەر لەوەی بگەنە ڕۆژی قیامەت، لەسەر دونیا خوا بەڵای خۆیان بەسەر ببارێنێت، چونکە خوا کەسی ناحەقی خۆشناوێت. هەر بۆیە، لە قورئاندا چەند جارێك ئەو ئایەتانە دووبارە کراینەوە "فَمَنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ"[1]. باشە، ئەی بۆ ئەوەی بزانین ئەوانە درۆزن و زاڵمن، پێویست دەکا ببینە فریشتە؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر، چونکە سەرۆکی داواکاریی گشتیی دادگای ئاسایشی دەوڵەتی ئەنقەرەش، گەر بیەوێت ڕاستی بدرکێنێت، دەزانێ ئەوانە چۆنن. جگە لەمانە، فەرموودەیەکی زۆر جوانی حەزرەتی محەمەد هەیە بۆ ئەو ساختەچیانە. فەرموودەکە بەو شێوەیە: "شەرم و حەیا لە باوەڕەوەیە"، دیارە ئەو پیاوانە ئیمانیشیان نییە، بۆیە ئاوا بێ شەرمن. ئیدی من، لەوە زیاتر چی بڵێم کە خوا پاداشتیان بە قەد وەرگرتنی مووچەکانیان نا، بەڵکو بە قەد کار و کردەوەی خۆیان بداتەوە.

### محەمەدێ خانۆ

منداڵی خێزانێکی هەژاری گوندی ئاکارسوو بوو. بەڵام کەسێك بوو هەموو ژیانی تژی بوو لە ئاکاری مرۆڤایەتی. لە لادێ زۆر لە من نزیك دەبۆوە، بۆیەش، زۆرم بیرەوەری لەگەڵیدا هەیە. زۆر حەزی لە خوێندن و خوێندنەوە و فەرهەنگ و کەلتوور بوو، هەموو گفتوگۆ و قسەکانی نێوانمانی ئەزبەر

[1] سورەتی ئالی عمران، ئایەتی ٩٤.

دەکرد. خوێندەوارییەکەی تەنیا بۆ ئەو چوار ساڵەی یاسای ١٩٤٤ی سەربازی دەگەڕێتەوە، بەڵام هیچ خۆشیی لە سەربازی نەدەهات، بەتایبەتیش ژەندرمەی تورك، چونکە زۆر قسە و جنێویان پێدابوو. بەڵام بەستەزمانە چی پێدەکرێ، بۆیە ماوەی سەربازییەکەشی بە ڕقەوە تەواو کردبوو. هەش بەسەر، بەزمی لەگەڵ سەربازی تورکان نەدەبڕاوە. خانۆ ماوەی سەربازییەکەی بە هەزار ناڵی عەلی تەواو دەکا، لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ لادێ، وەکو گوندییەکانی دیکە چەندین جار دەستگیر دەکرێ و بە ناحەق دەیدەنە بەر شەق و شولاقان.

محەمەد، کەسێکی زیرەك و بە هۆش بوو. لە بیرکاریدا وەك حاسیبە وابوو. زۆر سەیر بوو، هەر چ ژمارەیەکت بویستبا بە چەند چرکەیەك کۆ و دابەش و جارانی دەکرد و ئەنجامەکەی پێدەگوتی. ساڵی ١٩٤٥، لە ئیستانبووڵەوە چوومەوە گوند. لەگەڵ چاك و چۆنی هەموو ڕوویان لە من کرد و باسیانلەوەی کرد چ مشتومڕێکیان لەگەڵخانۆی هەیە. هەموو خەڵکی ئاوایی دەیانگوت بەردی ئاشی لە چەپەوە بۆ ڕاست دەسوڕێتەوە، تەنیا محەمەدێ خانۆ نەبێ، بە تاقی تەنیا، دەیگوت لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەسووڕێتەوە. هەرگیز لە بیری ناکەم، تەواوی ئاوایی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە ئێوارە پەنایان بۆ من هێنا. کاکە "محەمەدێ خانۆ لەسەرە و بە حیرسە، جگە لەمە خەڵکی ئاواییش بە نەزان دەزانێ، بەڵام بۆ خاتری خوا مووسا ئەوە لە ئاشی بەردین گەڕاین، بەڵام لە سەربازی کەی پیادە ڕۆیشتن و سوڕانەوە لە ڕاستەوە دەسووڕێتەوە بۆ چەپ؟" منیش گوتم ئێوە هەڵەن و محەمەد ڕاست دەکات.

محەمەدێ خانۆ، ساڵی ١٩٣٠، بە ماڵباتەوە لەدەست تیرۆری دەوڵەت هەڵاتبوون و کۆچیان کردبووە کوردستانی سووریا.

ئەوساڵە، باوکی کۆچی دوایی دەکات، لە شانسی ئەو دەغڵەکەشی بەر ڕەوە کلۆ دەکەوێ و هەمووی دەخورێ. لەوێ مامەکانی لە گوندی (حەرەم ڕەش) دەمێننەوە. ڕۆژێك لە گوند ئاهەنگێکی بووکگواستنەوە ساز دەکرێ.هەر لەو گوندەی، ئافرەتێکی عەرەبی بێوەژنی خاوەنی حەفت کوڕ، هەبووە و ناوی ئێرنا دەبێ، ئەو کوڕەکانی لاو بوونە، بۆیە، لەناو شایی محەمەد دەبینێ دایکی لەدەستی دوو کوڕی ئێرنا خەریکی شایی کردنە. ئاوای دەگێڕاوە؛ "دایکم باڵای کورت بوو، لە نێوان ئەو دوو کوڕە درێژە، لەکاتی ئاهەنگ گێڕان پێی لە زەوی دەبڕوە". وەلحاسڵ محەمەد بە بینینی ئەو دیمەنە زۆر دڵتەنگ و توورە دەبێت، لە داخا دەمانچەکەی بەر پشتی دەردەهێنێت و لە ناوەڕاستی گۆڤەند و دیلان چەند گولەیەك بە هەوا وەدەنێت. لێی دەپرسن بۆ وادەکەی؟ ئەویش دەڵێ: "ئێ ئەوڕۆ دایکم بە بووک دەچێت لە خۆشیا وادەکەم".

ژنە بەراییەکەی محەمەد کۆچی دوایی کردبوو، لەو ئافرەتە دوو کچی هەبوو، ماشەڵا کچەکانی زۆر جوان بوون. من بەردەوام کچە گەورەکەیم بە دایکە مەریەم دەچواند، بەڵام لە کۆتاییدا، دایکە مەریەم لەگەڵ ژەندرمەیەکی قەرەقۆلەکەی ئێمە ڕێك کەوت و حەزیان چووبووە یەك. محەمەدیش بە دڵ فراوانییەوە سەیری پێشهاتەکەی کرد و ئەو ژەندرمەی وەك زاوای خۆی قبوولکرد. ئەو بە منی دەگوت: "مووسا مادەم کچەکەم بە دڵیەتی، منیش بە دڵم دەبێ، ئێ کچە دایکیشی نەماوە، گەر منیش بەرد بخەمە سەر ڕێی خوا قبوول ناکات"، بەراستی منیش حەقم بەو دەدا. ژەندرمە یلمازی زاوامان خانەنشین بوو، ئەو خەڵکی گیرەسوون بوو لەناوچەی دەریای ڕەش، ئێستاش٭هەر لەوێ دادەنیشێ. بۆ سەردانی خەزوورەکەی

ناوە ناوە دەستی دایە مەریەم و منداڵەکانی دەگرت و لە لادێ دەهاتنە لامان، خوا دوو کوڕی قشتیلەی پێدا بوون، دواتر یەکێکیان بووە ئەفسەر و ئەوەی دیکەشیان مامۆستای ئامادەیی.

محەمەد باخێکی خۆشی هەبوو، لەوێ دارێکی گەورەی بە لق و پۆپی لێبوو، هەر لەوێ زۆر جۆر داری مێوی هەڵواسراویشی هەبوو، یەکێك لە جنسی ئەو ترێیانە (حەسەن) بوو، کە لەلادێکەی ئێمە زۆر کەم بوو. ئەو جۆرە مێوە هێشووی پڕ و جوانی دەگرت، جار بە جار لە بەری ئەو دارە سەبەتەیەك ترێی بۆ منیش دەهێنا. ڕۆژێك بە پشوو سوارییەوە هاتە لام؛ لێم پرسی "محەمەد خێرە؟ لە چ تووڕە بوویت؟"، بە هەناسە سوارییەوە: "مووسا چۆن تووڕە نەبم، گەر سەرنج بدەی ئەوساڵ هیچم لەو ترێیەی ناو باخچە بۆ نەهێناوی، خەڵك هیچی بەبەر ناهێڵێ. ئەوڕۆ چوومە ناو باخ دەبینم گەنجێك ترێی ڕنیوە و لێی دەخوا. لێم پرسی کوڕم بۆچی ئەو ترێیانەت ئاوا ڕنیوە؟ قەینا چەند هێشوەك لێدەکەیتەوە و دەیخۆی، بەڵام ئەو بەرهەمانەی دیکەت بۆ وا فلیقاندۆتەوە؟". بە بۆچوونی تۆ گەنجەکە چی وەڵام دابمەوە:

- ئەو ترێیە هی تۆ نییە کە دەیخۆم، لەناو ئەو باخەش لەو جۆرە ترێیەی لێ نییە، دەتوانم بۆ ئەوە بە قورئانیش سوێندت بۆ بخۆم.

- کوڕم سوێندی چی دەخۆی، وا هێشووە ترێیەکان لەناو دەستتن، ئینجا دەتەوێ گوناهباریشم بکەی.

بینیم ئەو گەنجە خۆشم لێ گێف دەکاتەوە، منیش تووڕە بووم و بە تەور هەردوو بنە مێوە تایبەتەکەم بڕی. منیش پێم گوت: "وەڵاهی بەداخەوە بۆ ئەو بنە دارانە، جا نازانی بڕینی داری بەر کەسکیش گوناهە"، ئەویش گوتی: "با گوناح بێت، با

داری خەڵك لەناو باخچەی من نەبێ. ئاخر هیچ ترێیان بۆ نەدەهێشتمەوە".

محەمەدێ خانێ بەردەوام دەیگوت: "مووسا حەیف من نەمخوێند، بەڵام قەینا چونکە لە بری خۆم منداڵەکانم نارده بەر خوێندن" کوڕێکی ئەندازیاری نەوتە و ئێستا لە ئوستووراڵیا کار دەکات، ئەو ناوی تاهیرە و وەك بابی خۆشی زیرەکە، سێ کوڕەکەی دیکەشی دەرچووی ئامادەیینە، هەمووشیان زیرەك و بەڕێزن.

محەمەدێ خانێ کابرایەکی عەسەبی و دەمدەمی بوو، لەبەر ئەوەی بەو دواییانە تووشی نەخۆشی دڵ ببوو، زوو زوو دەهاتە لام و دەیگوت: "بەو زوانە دەمرم"،چونکە بەهۆی بێ دەرامەتییەوە چارەسەری پێویستی وەرنەگرت، محەمەد گیان کۆچی دوایی کرد. خوا لە گوناحەکانی خۆشبێت.

**پرۆفیسۆر حوسێن شوکروو بابان**

لەگەڵ ئەوەی لە بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکە باسی بەشێك لە یادەوەرییەکانی خۆم و حوسێن شوکرو بابانم کردبوو، بەڵام، من و مامۆستا ئەوەندەمان بیرەوەری بەیەکەوە هەیە، چەندی باسکەم کۆتایی نایەت، چونکە بەسەرهاتەکانمان لە سەردەمی قوتابی و مامۆستایەتی دەستی پێ کرد، تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد. هاوڕێیەتیمان ٤٠ساڵی خایاند. لێرە، دەمەوێ دوو بیرەوەریی کورتی نێوانمان باس بکەم، کە مامۆستا کاتی خۆی بۆی باسکردبووم، لەو باوەڕەشدام باسکردنیان ببێتە مۆمێك بۆ ڕۆشنکردنەوەی هەندێك کەلێنی مێژوویی.

**یـــادەوەری لەگەڵ ئەتـــاتورك: لە موجـــادەلەی میللــــی**[1]، ئیســـتانبووڵ بەســـەر دوو بەرە دابەش بیـــوو، بەشـــێکیان ئەوەی بەزاریـــان داهاتبـا بە ئەتاتورکیـان دەگـوت و داوای دەســەڵاتی ئینگلیزو و پاشـایەتییان دەکـرد. بەشێکیشـیان شـەرمن و نابووتـانە لایەنگری ئەتاتورك بـوون. شـوکروو بابـان لەبەرەی دووەم بـوو. ڕۆژێـك مامۆسـتا بە شـێنەیی باسـی چەنـد بەسـەرهاتێکی بـۆ دەکردم، لەپاڵ ئەوەی وتارێکی نووسراوی ئەوساشی بەو شێوەیە بە پوختی بۆ گێڕامەوە: "برادەر باشە ئەوە دامـان نـا کەمـال پاشـا ئەشقیا و حەسوودە و دژی سوڵتان هەستاوەتەوە، بەڵام، باشە ئەو کابرایە هیچ کارێکی باشی نەکردووە؟ چونکە کاتێك ڕەخـنە لە یەکێك دەگرین دەبێ لایەنە بـاش و خراپەکـانی بەیەکەوە بـاس بکەین. باشە گەر خۆشی ئەوەندە پیاوێکی خراپ بێت، ئەی ئەو پیـاوانەی دەوروبەری چـی؟". دوای بڵاوبـوونەوەی وتـارەکە، ئەتاتورك دەیخوێنێتەوە نووسـینەکەی بە دڵ دەبێـت. مامۆسـتا بەو شـــێوەیە بەردەوام بـــوو لەســـەر گێـــڕانەوەی هەنـــدێك لە بەسەرهاتەکانی:

"مـن و بـاوکم و مـامم، لەگەڵ ئەوەی لە کـۆمەڵەی تەعـالی کوردی بـووین، بەڵام دوای دامەزرانـدنی حکـوومەتی ئەنـقەرە،

---

[1] یاخود جـەنگی ئـازادکردنی تـورك، یـان جـەنگی ئـازادی. بـەو جەنگـە دەگوترێت کە دوای دۆڕانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە یەکـەمین جـەنگی جیهـانی، دژی وڵاتـانی هاوپـەیمانی سـەرکەوتووی جەنگەکـە، لـەناو ئـەو نەخشەیەی تورك پێیدەڵێن میساقی میللـی، لـە باشـووری ڕۆژئـاوای تورکیـا یۆنـان و لـە ڕۆژهـەڵات فەڕەنسـا و ئەرمەنییـەکان بـۆ پاراسـتی تـەختی پادشایەتی لە چەندان بەرەوە تورك و کورد و عەرەب و لاز و چەرکەز لە نێوان ساڵانی (١٩١٩ – ١٩٢٢)لە پـاڵ یـەك دژی ئـەو وڵاتانـە و پاراسـتی تورکیا جەنگان. (وەرگێڕ).

هیچیـــان لێنەکــردین. بەڵام ســـەرجەم ئەو نووســـەرانەی دژی حکوومەت و ئەتاتورك دەیانووسی، لەگەڵ ئەندام و کـارگێڕانی کۆمەڵەی تەعالی کوردی، وەك سەید عەبدولقادر و محەمەدی کوڕی، لە سێدارەدران. دوای ئەوانیش لیستێکی ١٥٠ کەسیان ئامادەکرد بۆ لە سێدارەدانی چەندانی دیکە، بەڵام ئەوانەی ناویان لەولیستەبوو، لەترسان هەموویان تورکیایان جێ هێشت. لەناویاندا ڕەفیق جەواد و ڕەفیق خالید و جەمیل پاشا و بەدرخانییەکانیش هەبوون. نووسینیش لە حوسێن جاهید یالچن و ئەحمەد ئەمین یالمان قەدەغە کرا، چونکە ئەوسا حوسێن جاهید گۆڤارێکی زانستی و وەرگێڕانی بلاو دەکردەوە".

مـــاوەیەك لە ئەنـــقەرە ڕۆژنـــامەی (حـــاکیمیەتی میللیـــیە) دەردەچوو، ئەوسا ئەتاتورك (مستەفا کەمال پاشا) بانگهێشتی کردم و ئەو تەکلیفەی پێشکەش کردم: "مامۆستای بەڕێزم، ئێمە ڕۆژنـامەیەك دەردەکەیـن، بەڵام چەنـدی دەیهێنـین و دەیـبەین لەدەستمان دەرناچێـت، داوات لـێ دەکەم بێیـت و سەرپەرشتی ڕۆژنامەکە بکەی". منیش گوتم: "پاشام بۆچی مـن؟ لە کاتێکـدا لێرە چەنـدان ڕۆژنامەنووسـی چـاکی وەك کـاك فـالیح ڕفقـی و حەمدوڵا سوبحی و یـونیس نـادیی لێیـە، ئەوان زۆر نووسـەری چـاکترن و دەتـوانن ڕۆژنـامەکە زۆر بەباشـی بەڕێـوە بـبەن". ئەتاتورك گوتی: "بەڵام مامۆستا خەڵـك حەیـان لە نووسینەکانی ئەوان نییە، بەڵام ئەوانەی تـۆ دەخوێنـدرێتەوە و خۆشەویسـتن". منـیش گـوتم: "نووسـین گەر باسـی شـتی ڕاسـتی بکـات خۆشەویست دەبێ، بۆیە، گەر بێمە سـەر ئەو کـارە ڕێگـا دەدەن باس لە شتە ڕاستەکانی ئەو وڵاتە بکەم؟" ئەتاتورك: "یانی چۆن؟" منیش وەڵامم داوە: "بۆ نموونە دەڵـێم جەنـابی حەزرەتـی کەمـال پاشـا دیکتـاتۆرە، بەڵام لەو سـەردەمە جـگە لە دەسـەڵاتێکی

دیکتاتۆر هیچ لایەنێکی دیکە ناتوانێ ئەو کۆمەڵگایە پەرت و بڵاوە چاك بکاتەوە". ئەتاتورك دەموچاوی خۆی پێك دادا و گوتی: "باشە مامۆستا ئێوە بڕۆن، گەر پێویست بێت بانگهێشتتان دەکەینەوە". چوار پێنج ساڵ بەسەر ئەو دیدار و گفتوگۆیە تێپەڕی. ڕۆژێك ئەتاتورك دیسان بانگهێشتی ئەنقەرەی کردمەوە و ئەوجارە پێی گوتم: "مامۆستا قوتابییەکانی تۆ دەکەینە وەزیری دارایی، بەڵام هەموو شتێك وێران دەکەن، هیچ نەبێ ئێوە وەرن و ئەو هەڵانەی ئەوان ڕاست بکەنەوە". منیش پێم گوت: "باشە گەر بێم قسەم دەڕوا؟". ئەتاتورك گوتی: "یانی چۆن؟"، منیش پێم گوت: "بۆ نموونە ئێستا ئێوە لەو بوودجە کەمەی تورکیا، ٢٥ لە سەدتان بۆ سوپا تەرخان کردووە، بۆیە ئەو بڕە زۆرەی بوودجە گەر بەردەوام بێت بۆ سوپا، نەك من، هەر کێ بێت ناتوانێ دۆخی دارایی تورکیا ڕاست بکاتەوە"، ئەتاتورك دیسان بە تووڕەبوونێکی شاراوەوە گوتی: "باشە باشە ئێوە بڕۆن، گەر پێویست بکا بانگهێشتتان دەکەینەوە".

**بیرەوەری مۆسکۆ:** بەقەد ئەوەی لەسەر ئەو بەسەرهاتە لەبیرم ماوە لە زاری مامۆستاوە بۆتان دەگێڕمەوە:

"دوای دروستبوونی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩١٧، یەکەم وڵات ئەفغانستان بەفەرمی ناساندی. دووەم وڵاتیش دەسەڵاتداریەتیی عوسمانییەکان بوون. هەمان ساڵ، من و چەند کەسێکی خاوەن بەرژەوەندی چووینە مۆسکۆ، ئەوسا نزیکەی هەموو ڕۆژێك شەڕ و پێکدادان لە نێوان (بۆلشەفیك و مەنشەڤیك) هەبوو. لەگەڵ لینین دیدارمان کرد و یەکدیمان ناسی، دواتر ستالینیشمان بینی. زۆر بەدەم و خولقمانەوە هاتن، بەتایبەتی چیچەرینی وەزیری دەرەوەی ئەوسای یەکێتی سۆڤیەت، زۆر ئاگادارمان بوو. هەر بە ڕێکەوت زانیم ئەویش

لەهەمان کۆلێژی من دەرچووی بەشی سیاسەتە لە پاریس. بۆیە، بەو بۆنەیەوە بە چاوێکی برایانە سەیری دەکردم. لەسەردەمی قەیسەری ڕووسیا (پەترەسبۆرگ) پایەتەخت بوو، بەڵام دواتر لینینگراد کرایە پایەتەخت. باڵەخانەی باڵیۆزخانەی ئێمەش هەر لەوێ بوو.ماڵێکی بچووکیان پێداین و لەوێ دەماینەوە، لەبەر ئەوەی هەموومان بە زگورتیاتی چووبووین، شوێنەکە لەگەڵ بچووکیشی بۆ ئێمە سەر و زیاد بوو. وەزیری دەرەوە زوو زوو دەهاتە لامان و لە کەم و کووڕیی پێویستییەکانی دەپرسین و جار جارەش لەگەڵ ئێمە بەدەم قسەکردنەوە هەندێك کاتی بەسەر دەبرد. ڕۆژێك برادەران گوتیان: "کاك شوکروو مادەم چیچەرین ئەوەندە تۆی خۆش دەوێ، داوای ماڵێکی تۆزێك گەورەتری لێ بکە بۆ مانەوەمان". قسەکەیانم چووە مێشك و لە سەردانی داهاتووی وەزیری دەرەوە داواکارییەکەم پێشکەش کرد، ئەویش بە پێکەنینەوە: "وەی بەسەرچاو، بڕۆنە خۆشترین ناوچەی مۆسکۆ و باشترین و گەورەترین ماڵ بۆخۆتان دەستنیشان بکەن و تەنیا ژمارەی خانووەکەم بدەنێ و کارتان بە هیچەوە نەبێت". لەگەڵ برادەران دەستمان بە گەڕان کرد. لە مۆسکۆ، وەك شەقامی ئیستیقلالی تەقسیم لە ئیستانبووڵ، شەقامێکی ئاوا درێژ هەبوو. لەوێ، وەك باڵەخانەی گەلەتەسەرای، شەقامی ئیستیقلال باڵەخانەیەکی ناوازەی لێبوو. هەموومان ئەو شوێنەمان بە دڵ بوو. شوێنەکە لەناو باخچەیەکی گەورە و ڕازاوە بوو، هەستت دەکرد لەناو کۆشکی شاهانەی. ژمارەی خانووەکەمان وەرگرت و دامە چیچەرن. بە پێکەنینەوە ژمارەکەی لێ وەرگرتم و گوتی: "لە ماوەی چوار پێنج ڕۆژ وەڵامت دەدەمەوە". دوای دوو ڕۆژ وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت هات و کۆشکەکەی ڕادەست کردین. لەگەڵ

پیاوەکانی ئەو چووینە شوێنەکە، لە کۆشکەکە دوو خانمی بەتەمەن دەمانەوە، سەرجەم کەلوپەلەکانی ناو کۆشکەکەیان لە سالۆنێك کلیل دا، چونکە سەرجەم چایدان و فنجانی قاوە و تاخمی نان خواردنیان لە زیو و زێڕ نەخشێندرابوو. جگە لە چەندان سەماوەر و سینی تایبەتی مەی گێڕان و چەندان مجەوهەرات، بە شێوەیەك، دەسکی گیسکی زەوی پاك کردنەوەکەش لە زیو نەخشێندرابوو. لەلایەکی دیکە، چەندان مافووری گەورەی دەستکردی ئێرانی و تاخم سفرەی چینی و مێز و کورسیی زۆر تایبەت و شاهانە. پیاوەکانی وەزیر چەند دەستە یاتاغێك و هەندێك کەلوپەلی نان خواردنی ئاساییان دایە ئافرەتەکان، بەڵام ئەوان دەلەرزین و لە چاویان فرمێسکی لێ هەڵدەوەرا، یەکێکیان زۆر بە دایکم دەچوو، بۆیە، زۆر زگم پێسووتان. چونکە لە نێوچاوانی ئێمە ئاوایان بەسەرهات.

پرسیم:

"خانمینە لەناو ئەو کەلوپەلانە، خۆشەویستترین کەلوپەلتان کامانەن؟ بەڵام ئەوان هۆڕ هۆڕ دەگریان"، لەبەر ئەوەی ئەوانیش فەرەنسیان دەزانی بۆیە ئاوا وەلامیان دامەوە: "مۆسیۆ تکا دەکەم، هیچمان ناوێ، گوتوویانە سەرتان دەبڕن". من قسەکەی خۆم دووبارە کردەوە، بۆیە، یەکێکیان ئاماژەی بۆ تاخمێکی نان خواردنی ١٢ نەفەری زێڕ کرد، لەبەر ئەوەی دیاری هاوسەرگیرییەکەی بوو. ئەوەی دیکەش داوای تاخمی پیاڵەی چا خواردنەوەی کرد کە بە زێڕ ڕووپۆش کرابوو، لەگەڵ سەماوەرە بە زیو نەخشێندراوەکە. چونکە دیاری باوکی بووە لە کاتی پێك هێنانی ژیانی هاوسەریی. پاسەوانەکانی وەزیری دەرەوە، گالیسکەیەکی بە ئەسپیان بۆ هێنان و خانمەکانیان سوار کرد و ئەوانیان بردە ماڵە تازەکەیان. ناونیشانی ئەوێشیان پێداین

تا دواتر ئەو کەلوپەلانەی ویستوویانە بۆیان بنێرین. لە دوای خۆشیان پەردەی گرانبەهای قوماشی بە دەست چنراو و چەندان مافووری دەستکرد و قەرەوێڵە و تاخمی دانیشتن و مێزی نان خواردنی داریان جێ هێشت. جگە لەو هەموو کەلوپەلە تایبەتانە، گرامافۆنێکی لێبوو بە قەد بەژنی پیاوێك، لە یەك کاتدا سێ چوار قەوانی میوزکی بەیەکەوە پێ لێدەدرا.

دوای چەند ڕۆژێك، چیچەرین لە ماڵە تازەکەمان سەردانی کردین، لێی پرسیم: "شوێنە تازەکەتان بە دڵە؟"، منیش زۆر سوپاسم کرد، لە پاڵ ئەوە خەمبار بوونی خۆشم بە حاڵی ئافرەتەکان بۆ بەیان کرد و داوام لێ کرد گەر ڕێگا بدات دەمەوێ ئەو چەند کەلوپەلەی داوایان کردبوو بۆیان بگەڕێنمەوە. جەنابی وەزیری دەرەوە دیسان بە پێکەنینەوە "شوکروو تۆ بۆ خەمباری ئەوانی! دەزانی ئەوانە کێنە؟ یەکێکیان بووکی مامی قەیسەر و ئەوەی دیکەشیان هاوگیانی بوو. ئەو ماڵ و مولکەی هەیانبوو، بەرهەمی ڕەنج و ماندوو بوونی جووتیاری هەژار و نەدارە". من پێداگیریم لەسەر ئەوە کرد کە یەکێکیان زۆر بە دایکم دەچوو بۆیە بەو هەستەوە دەمویست هەرچۆنێك بێ ئەو چەند کەلوپەلەیان بۆ بگەڕێنمەوە. وەزیری دەرەوە گوتی: "باشە کێشە نییە، چیان دەدەیتێ بیاندێ".

ڕۆژی دواتر گالیسکەیەکی جووت ئەسپم بە کرێ گرت. هەموو ئەو کەلوپەلانەی داوایان کردبوو، لەگەڵ بەشێکی زۆر لە کەلوپەلی پێداویستیی ڕۆژانە، لە کەلوپەلە هەرە باشەکانیانم خستە ناو عارەبانەکە و خۆشم سواری گالیسکەکە بووم و بۆ لای ئەوان بەڕێکەوتم. لە ڕێگا پرسیاری دووری و نزیکی ناونیشانی ئەو دوو ئافرەتەم لە عارەبانچییەکە کرد، چونکە سەعاتێک پتربوو بە ڕێگاوە بووین. لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین،

ئیدی لە مۆسکۆ دەرچووبووین. لە شارۆچکەیەکی دەرەوەی مۆسکۆ گالیسکەکە لەبەردەم ماڵێکی دوو نهۆمی وەستا. هاتمە خوارەوە و چوومە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتەکان. هەریەکە و لە ژوورێکی بەرامبەر یەك دەمانەوە، لە سەر و سیمایانەوە دیار بوو، بە بینینی من دڵخۆش بووینە. سەرەتا نەیانویست کەلوپەلەکان بۆخۆیان هەڵگرن، چونکە زۆر دەترسان، جا چۆن نەترسێن، لە کاتێکدا تەواوی پیاوەکانیان کوژرابوون. بەڵام دڵنیام کردنەوە کە مۆڵەتم لە وەزیری دەرەوە وەگرتووە تا ئەوانەتان بۆ بگەڕێنمەوە، ئینجا باوەڕیان کرد و کەلوپەلەکانیان لێ وەرگرتم. گوێم لێبوو یەکێکیان بە فەرەنسی بەوەی دیکەیانی دەگوت: "جا خۆزیا یەکێك هەبێ ئەوانەمان لێ بکڕێتەوە و بە پارەکەی خواردنی ڕۆژانەمان دابین بکەین". بۆ ئەوەی بەسەر خۆیاندا نەشکێنەوە من خۆم لێ گێک کردن وام پیشاندا گوێم لە هیچ نەبووە، ئینجا بە خورتی هەندێك پارەشم دانێ.

"گەڕامەوە مۆسکۆ، ئیدی ئێمە لە شوێنێکی باشتر بووین و بەراورد بە پێشوو ئیسراحەتتر دەژیاین، هەموو پێویستییەکی ڕۆژانەمان بەردەست بوو. بە تایبەتی ژوورێکی میوزیکمان هەبوو بە وشە پێناسە ناکرێ. لەوێ دوو پیانۆ و ئامێرێکی کۆردیۆن ڕوسی و قەوانە بەناوبانگەکەی لێبوو. بۆیە، هەر کاتێك دڵ تەنگ باین قەوانێکمان دەخستە سەر گرامافۆنەکە و گوێمان لە میوزك دەگرت و کوڕ و کوڕ دەستمان بە سەماکردن دەکرد. ڕۆژێك دیسان خەریکی سەماکردن بووین، چیچەرین هاتە لامان، من یەکسەر چوومە باخچە بۆ پێشوازیی، بەڵام هاتنی ئەو ڕۆژەی زۆر سەیر بوو. چونکە خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون چاکەت و پانتۆڵی ڕەش و دەستکێشی سپییان پۆشی بوو، هەمووشیان یەکەو چاویلگەیەکی ڕەشیان لە چاو

بوو. دۆقەم لەگەڵ کرد و پێی گوتم: "بە خۆتان خۆش بن!". منیش تێینەگەیشتم، تومەزە سولتان ڕەشاد کۆچی دوایی کردبوو، لەبەر ئەوەی ئێمەیان وەك باڵیۆز هەژمار دەکرد، بۆیە هاتبوون بۆ سەرخۆشیمان، بەلام بەر لەوان کەس ئەو هەواڵەی بە ئێمە نەگەیاندبوو. من لە دەرەوە کاتیك سەرقاڵی تازیەی سوڵتان بووم، لە ژوورەوەش برادەرە خرۆشاوەکانم بێ ئاگا لە دونیا سەرقاڵی سەماکردنی خۆیان بوون.

لێرە، بەوەندە یادەوەرییەی مامۆستا دەمەوێ کۆتایی پێبهێنم، گەر دەرفەت بوو لە بەرگی سێیەمی ئەو پەرتووکە بەشێك لە یادەوەرییەکانی دیکەی مامۆستاش لە زاری خۆیەوە دەنووسمەوە و لەگەڵ ئێوەی خوێنەر بەشی دەکەم.

### شێخ جەمیلێ تیلۆیێ

لە ناوچەی تیللۆی سەر بە پارێزگای سیرت، بەماڵباتی شێخ دەڵێن مەلا فەقیروڵلا. ئەو ناوە سەرەتا بەو شێوەیە هاتووە: شێخ ئیسماعیل یان سوڵتان مەمدوح، کوڕی فەقیرولایە. لێرە سوڵتان مەمدوح وەك سوڵتان شێخ موسە، یانی بە مانای سوڵتانی پیاوانی زانستی. ئەو خەسڵەتە تایبەتە بە پیاوانی ئەهلی زانست لە کوردستان، بۆیە، دوایین فەیلەسوف و خۆشەویستی کورد، سەعیدی نورسی، یانی سەعیدی کوردی نازناوەکەی (بەدیعولزەمان) بووە، بە واتای خاوەن زانیاریترین کەسی سەردەمی خۆی.

شێخ جەمیل ئەفەندی کوڕی سوڵتان مەمدوحی، خاوەنی حەفتا هەزار بەیتی شیعریە. لەسەردەمی دروستکردنی کۆماری تورکیا، لەبەر ئەوەی دژی کورد و کوردستان نەچووە پاڵ دەوڵەت، لە شۆڕشی شێخ سەعید خۆی و خێزانەکەی بۆ مانیسا

ڕادەگوازرێن. ماڵباتی شێخ خاوەن ڕێز و حورمەتێکی تایبەتن لە کوردستان، بەڵام لە مانیسا زۆر ڕۆژی ناخۆشیان بەسەرهات، کە حاڵی ئەو ماڵباتەی پەرێشان کرد. لەگەڵ ئەوەی بەهۆی زانست و زانیارییەکانی لەلایەن خەڵکی تورکی خێرخواز جار بە جار لە مانیسا هاوکاریش دەکرا، بەڵام ئەمە بۆ ئەوان وەك پێویست نەبوو. جارێك باسی بەسەرهاتێکی بۆ کردم لەگەڵ شێخ کاملی کوڕی کە ١٨ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو. وەك لە بەشەکانی پێشووتریش باسمکردبوو، کەسی ڕاگوێزراو، بەبێ مۆڵەتی وەزارەتی ناوخۆ، یان سەرۆکوەزیران نەیدەتوانی لە چوارچێوەی جوگرافی ئەو شوێنە دەرچێ کە بۆی ڕاگوێزرابوو.

ڕۆژێك، شوکروو ساراچ ئۆغڵووی سەرۆکوەزیرانی ئەوسا دەچێتە مانیسا، سەرۆکی شارەوانی ئەو شارە دۆخی شێخ جەمیل بۆ سەرۆکوەزیران باس دەکات. شوکروو سەراچ ئۆغڵوو بەردەوام لاف و گەزافی موسوڵمان بوونی خۆی و تەریقەتی نەقشبەندیی لێ دەدا، بۆیە، بانگی شێخ جەمیل دەکات و ڕێزێکی زۆری لێدەنێ، لەسەر داوای شێخیش ڕێگا دەدات هەموو ساڵێك لە مانگی ڕەمەزان سەردانی ئیستانبووڵ بکات. دوای ئەو ڕێگا پێدانە، شێخ جەمیل هەموو ساڵێکی مانگی ڕەمەزان دەهاتە ئیستانبووڵ. لەبەر ئەوەی عەبدولڕەحمان زاپسووی خەزووریشم پیاوێکی ئەهلی دین بوو، بۆیە دۆستایەتی و هاوڕێیەتیەکی پتەویان لە نێواندا هەبوو. هەموو ڕەمەزانێك، شێخ جەمیل سێ چوار شەو دەهاتە لامان، ئیدی بەو بۆنەیەوە لەگەڵ جەنابیان زۆر بیرەوەریم هەیە. ناوچەی تیللۆ ٥ کیلۆمەتر لە باکووری سیرتە، هەمان کات، ناحیەکە بە ناوەندی زانستیی ناوچەکەش دادەنرێت. ڕەنگە سەیر بێت، بەڵام ئەوسا لە ئیستانبووڵ ژمارەی ئەو کوردانەی خەڵکی سیرت بوون، لە

ژمارەی خەڵکی سیرت زیاتر بوون. دەبێ ئەوەش بڵێم، تەواوی خەڵکی سیرت و کوردستان ڕێز و حورمەتێکی بێپایانیان بۆ شێخ جەمیل هەبوو. ئەوساش، کوردەکانی ئیستانبووڵ دۆخیان، وەك ئێستا خراپ نەبوو، بۆیە، وەك عادەت و ئەرکێکی ئایینی بەردەوام هەرکەسە و بەقەد توانای خۆی ساڵانە لە مانگی ڕەمەزان زەکاتی دەبەخشی، بەشێك لەو زەکاتەشیان دەدا بە شێخ جەمیل، ئەویش تا ڕەمەزانی داهاتوو پێویستیی خێزانەکەی پێ دابین دەکرد.

دوای تێپەڕینی چەندان ساڵ، وەك ئەوەی شێخ جەمیل و ماڵباتەکەی تاوانیان کردبێ، لە ساڵی ١٩٤٧ بە لێبووردنی گشتی ڕێگایان پێدرا وەك چەندان خێزانی دیکەی کوردی ڕاگوێزراو، بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان. بۆیە، دوای ئەو بڕیارە شێخ جەمیل گەڕاوە ناوچەکەی خۆیان لە تیللۆ.

ساڵی ١٩٥٧، لەگەڵ دکتۆر عەزیز ئۆغلو، کۆگای دەرمانی ڕۆژهەڵاتمان بەڕێوە دەبرد، لەو سەر و بەندە، شێخ کاملی کوڕی شێخ جەمیل کۆچی دوایی کرد، بۆ سەرەخۆشیی ماڵباتەکەی چوومە تیللۆ. دەبێ ئەوە بڵێم کە تیللۆ شوێنێکی زۆر سەیرە، چونکە ناوەندێکی کۆنی ئایینی و زانستییە. مەزاری فەقیرۆڵڵا و سوڵتان مەمدوح هیچی کەمتر نەبوو لە مەزاری سوڵتان و شێخولئیسلامەکانی ئیستانبووڵ. قوبەی سەر مەزار و شەبەکە زیوییەکەی و مافوورە ڕاخراوەکان و سوڕەیا تایبەتەکانی ناو مەزارەکە کەشێکی تایبەتیان بە شوێنەکە بەخشی بوو. قوماشی سەر سندوقەکانی ناو چاکەکە کاری دەستی ئێرانی بوو. کلیلی ئەو شوێنەش تەنیا لای ماڵباتی ئەو چەند کەسە بوو کە لە ڕەچەڵەکی خوالێخۆشبووان بوون. ئەوکاتەی ئێمە چووین شێخ تۆفیق سەرپەرشتیی شوێنەکەی دەکرد، بۆیە، منی بە ناو

مەزارەکەدا گێڕا و هەموو شتێکیشی بە ورد و درشتی بۆ باسکردم. خوا لێیان خۆشبێت.

لە هەمان شوێن مەزاری ئیبراهیم حەقی ئەفەندیی بەناوبانگیشی لێبوو. ئەو قوتابی شێخ ئیسماعیل فەقیروڵڵا بوو. کەم کەس هەیە لە ناوچە کوردییەکان ئیبراهیم حەقی نەناسێت، لەگەڵ ئەوەش، دەمەوێ بە چەند ڕستەیەك باس لە ژیانی ئەو زاتە بکەم: ئیبراهیم حەقی خەڵکی حەسەن کەلەیە. بە سەیرکردنی بەرهەمە نووسراوەکانی، ئاستی زانست و عیرفانی ئەومان بۆ دەردەکەوێت. لە تیللۆ فەقێیاتی لای شێخ ئیسماعیل کردبوو، جگە لەوەی لە چەند شوێن و قوتابخانەیەکی دیکەش دەرسی جیا جیای خوێندبوو. پەرتووکە بەناوبانگەکەی بەناوی (مەعریفەتنامە) لە تەواوی جیهانی ئیسلامی و ئەوروپا سەنگی خۆی هەیە. ئەو پەرتووکە یەك بەرگییەی ئینسکلۆپیدیایەکی گەورەی زانست و کەلتوورە. جگە لە باسی بیرکاری و ئەندازیاری و گەردوون ناسی و پزیشکی و نەخۆشییە دەروونییەکان و سێکس و کۆمەڵناسی و مێژوو و جوگرافیا و ئیلاهیات. بە شێوەیەك تا ئەمڕۆ هیچ کەسێك ڕەخنەی لەسەر ناوەڕۆکی بەرهەمەکە نەگرتووە. لەبەر ئەوەی لەناو پەرتووکەکە زۆر بابەتی تەندروستی و چارەسەری نەخۆشی تێدایە بە بەکارهێنانی دەرمانی گیراوەی سروشتی، بۆیە، لە زۆربەی دەرمانخانەکان ئەو پەرتووکە بەردەست بوو. پێشنیازی خوێندنەوەی پەرتووکی (مەعریفەتنامە) بۆ خوێنەرەکانم دەکەم.

جگە لە (مەعریفەتنامە)، ئیبراهیم حەقی شتێکی دیکەشی کرد کە بەقەد پەرتووکەکەی ناوی داوە. ئەویش دوای دروستکردنی منارەیەك لە ڕۆژهەڵاتی مەزاری فەقیروڵلای مامۆستای. ئیبراهیم حەقی دوای دروستکردنی منارەکە لە چەند

ژمارەی خەڵکی سیرت زیاتر بوون. دەبێ ئەوەش بڵێم، تەواوی خەڵکی سیرت و کوردستان ڕێز و حورمەتێکی بێپایانیان بۆ شێخ جەمیل هەبوو. ئەوساش، کوردەکانی ئیستانبووڵ دۆخیان، وەك ئێستا خراپ نەبوو، بۆیە، وەك عادەت و ئەرکێکی ئایینی بەردەوام هەرکەسە و بەقەد توانای خۆی ساڵانە لە مانگی ڕەمەزان زەکاتی دەبەخشی، بەشێك لەو زەکاتەشیان دەدا بە شێخ جەمیل، ئەویش تا ڕەمەزانی داهاتوو پێویستیی خێزانەکەی پێ دابین دەکرد.

دوای تێپەڕینی چەندان ساڵ، وەك ئەوەی شێخ جەمیل و ماڵباتەکەی تاوانیان کردبێ، لە ساڵی ١٩٤٧ بە لێبووردنی گشتی ڕێگایان پێدرا وەك چەندان خێزانی دیکەی کوردی ڕاگوێزراو، بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان. بۆیە، دوای ئەو بڕیارە شێخ جەمیل گەڕاوە ناوچەکەی خۆیان لە تیللۆ.

ساڵی ١٩٥٧، لەگەڵ دکتۆر عەزیز ئۆغلو، کۆگای دەرمانی ڕۆژهەڵاتمان بەڕێوە دەبرد، لەو سەر و بەندە، شێخ کاملی کوڕی شێخ جەمیل کۆچی دوایی کرد، بۆ سەرەخۆشیی ماڵباتەکەی چوومە تیللۆ. دەبێ ئەوە بڵێم کە تیللۆ شوێنێکی زۆر سەیرە، چونکە ناوەندێکی کۆنی ئایینی و زانستییە. مەزاری فەقیرولڵا و سوڵتان مەمدوح هیچی کەمتر نەبوو لە مەزاری سوڵتان و شێخولئیسلامەکانی ئیستانبووڵ. قوبەی سەر مەزار و شەبەکە زیوییەکەی و مافوورە ڕاخراوەکان و سوڕەیا تایبەتەکانی ناو مەزارەکە کەشێکی تایبەتیان بە شوێنەکە بەخشی بوو. قوماشی سەر سندوقەکانی ناو چاکەکە کاری دەستی ئێرانی بوو. کلیلی ئەو شوێنەش تەنیا لای ماڵباتی ئەو چەند کەسە بوو کە لە ڕەچەڵەکی خوالێخۆشبووان بوون. ئەوکاتەی ئێمە چووین شێخ تۆفیق سەرپەرشتیی شوێنەکەی دەکرد، بۆیە، منی بە ناو

مەزارەکەدا گیرا و هەموو شتێکیشی بە ورد و درشتی بۆ باسکردم. خوا لێیان خۆشبێت.

لە هەمان شوێن مەزاری ئیبراهیم حەقی ئەفەندیی بەناوبانگیشی لێبوو. ئەو قوتابی شێخ ئیسماعیل فەقیرولڵا بوو. کەم کەس هەیە لە ناوچە کوردییەکان ئیبراهیم حەقی نەناسێت، لەگەڵ ئەوەش، دەمەوێ بە چەند ڕستەیەك باس لە ژیانی ئەو زاتە بکەم: ئیبراهیم حەقی خەڵکی حەسەن کەلەیە. بە سەیرکردنی بەرهەمە نووسراوەکانی، ئاستی زانست و عیرفانی ئەومان بۆ دەردەکەوێت. لە تیللۆ فەقێیاتی لای شێخ ئیسماعیل کردبوو، جگە لەوەی لە چەند شوێن و قوتابخانەیەکی دیکەش دەرسی جیا جیای خوێندبوو. پەرتووکە بەناوبانگەکەی بەناوی (مەعریفەتنامە) لە تەواوی جیهانی ئیسلامی و ئەوروپا سەنگی خۆی هەیە. ئەو پەرتووکە یەك بەرگییەی ئینسکلۆپیدیایەکی گەورەی زانست و کەلتوورە. جگە لە باسی بیرکاری و ئەندازیاری و گەردوون ناسی و پزیشکی و نەخۆشییە دەروونییەکان و سێکس و کۆمەڵناسی و مێژوو و جوگرافیا و ئیلاهیات. بە شێوەیەك تا ئەمڕۆ هیچ کەسێك ڕەخنەی لەسەر ناوەڕۆکی بەرهەمەکە نەگرتووە. لەبەر ئەوەی لەناو پەرتووکەکە زۆر بابەتی تەندروستی و چارەسەری نەخۆشی تێدایە بە بەکارهێنانی دەرمانی گیراوەی سروشتی، بۆیە، لە زۆربەی دەرمانخانەکان ئەو پەرتووکە بەردەست بوو. پێشنیازی خوێندنەوەی پەرتووکی (مەعریفەتنامە) بۆ خوێنەرەکانم دەکەم.

جگە لە (مەعریفەتنامە)، ئیبراهیم حەقی شتێکی دیکەشی کرد کە بەقەد پەرتووکەکەی ناوی داوە. ئەویش دوای دروستکردنی منارەیەك لە ڕۆژهەڵاتی مەزاری فەقیرولڵای مامۆستای. ئیبراهیم حەقی دوای دروستکردنی منارەکە لە چەند

شوێنێکی تایبەتیدا چەند ئاوێنەیەکی جێگیرکرد. ئینجا لەسەر لووتکەی ئەو شاخەی دەکەوتە ڕۆژهەلاتی منارەکە، کە ٣ کیلۆمەتر لێی دوور بوو، دیوارێك دروست دەکات، لەناوەڕاستیشی بەقەد گەورەیی پەنجەرەیەك بۆشایی جێدەهێڵێت. ئیبراهیم حەقی لەو کارەی لە ڕووی ئەندازیارییەوە وای لێکداوەتەوە تا هەموو ساڵێك لە بەرەبەیانی ڕۆژی نەورۆز لەکاتی ڕۆژهەلاتن تیشکی هەتاو لەو پەنجەرەیە بێتە ژوورەوە و دواتر بە ئاوێنەکانی منارەکە دەکەوێت، ئاوێنەکانیش ڕووناکی ڕۆژەکە لە ڕێگای پەنجەرە کراوەکانی سەر مەزاری فەقیروڵلا دەدەنەوە سەر گۆڕەکە. بەپێی ئەو ڕیوایەتانەی کراون، ئیبراهیم حەقی ئەفەندی گوتوویەتی: "من تەنیا بە ڕووناکی ڕۆژی نەورۆز دەتوانم مامۆستاکەم پیرۆز بکەم". لێرەوەش پیرۆزیی ڕۆژمان لە ئایینی زەردەشتیدا جارێکی دیکە بۆ ڕۆنتر دەبێتەوە.

لەگەڵ چەند دکتۆر و پارێزەرێك چوومە تیللۆ. دەستی شێخ جەمیلم ماچ کرد و سەرەخۆشی خۆمانم پێگەیاندن. هەستاین تا ماڵئاوایی بکەین، بەر لە ڕۆیشتن شێخ بە برادەرەکانمی گوت: "کوڕینە من هیچ شتێك بە ئێوە ناڵێم تەنیا ئەوە نەبێت کە زۆر نمەکی نانی مووسام کردووە و چاکەی زۆرم لێ بینیووە. ئێوە سەیری گەنجیی تەمەنی مەکەن، بەڵام ئەو ڕۆڵەیەکی خۆشەویست و دۆستێکی عەزیزمە. بۆیە، هیچ چارەتان نییە و ئەو ئێوارەیە ڕێگای پێ نادەم بڕوا". منیش داواکاریەکەی شێخم ڕەتنەکردەوە. هاوڕێکانم ڕۆیشتن و من مامەوە. دەستمان بە گێڕانەوەی بیرەوەرییە تاڵ و شیرینەکانی ئیستانبووڵ و سەردەمی ڕاگواستنی کرد. لەناو دەمەتەقێ و گفتوگۆکانماندا هەندێك پێکەنین و هەندێکیش بۆ هاوڕێیە کۆچکردووەکانی گریاین. ئێمە بە کوردی قسەمان دەکرد، بەڵام بەشێك لە برادەر و

میوانەکانی دیکەی شێخ بەو عەرەبیە سەیرەی سیرت قسەیان دەکرد. دوای ئەوەی سەعاتێک پترمان قسەکرد، شێخ بە زمانی عەرەبی بە میوانەکانی گوت: "بڕۆنە دەرەوە ئێمە لەگەڵ مووسا بە تەنیا جێ بهێڵن". کاتێك بە تەنیاماینەوە، ڕووی لە من کرد: "مووسا کوڕی خۆم، من تۆم زۆر خۆش دەوێ، عەبدولڕەحمان زاپسووی خەزووریشت کەسێکی زانسخوازە و وەك بڕام وایە، بۆیە من تەکلیفێکم لێت هەیە و تکا دەکەم مەڵێ نەخێر!" ئینجا ئەو گفتوگۆیەی خوارەوە لە نێوانمان دروستبوو:

شێخ: "کوڕم من دەمەوێ تۆ بکەمە خەلیفەی خۆم، چونکە ئێستا تەمەنم ٨٥ ساڵە و دوای خۆشم نە کوڕێکم هەیە بەردەوامی بە تەریقەتەکەم بدات، نە خزمێکی نزیکیش تا بیکەمە خەلیفە".

بە بیستنی ئەو داواکارییە سەرم سوڕما. بەم شێوەیە وەڵامم داوە: "ئەممان یاشێخ من چۆن دەبمە خەلیفە، چونکە بۆ وەرگرتنی ئەو ئەرکە پێویستە دەرچووی قوتابخانەیەکی ئایینی تایبەت بم، کەچی من بە ڕێك و ڕاستی نازانم نوێژیش بکەم".

شێخ: "کوڕم لە تەریقەتی ئێمە بوونە خەلیفە پێویستی بە دەرچوون لە قوتابخانەیەکی ئایینی نییە، چونکە ئێمە نەقشبەندی و قادری و ڕفاعی نین، چونکە لە تەریقەتی ئێمە ئەخلاق و ئیمانێکی پتەو گرنگە و تەواو، بە شێوەیەك فەقیروڵلای باپیرم شوانێکی کردبووە خەلیفەی خۆی". شێخ زۆر باسی چاکە و سوودەکانی خەلیفاتی بۆ کردم، بەڵام من، بە ڕێزەوە، داواکەیانم ڕەتکردەوە.

**گەڕەکەکانی تیللۆ:** لە ناوچەی تیللۆ پێنج گەڕەك هەیە بەو ناوانەی خوارەوە:

یەکەم: حوسەینی یانی سەیدەکان.

دووەم: عەبباسی.

سێیەم: ئەبوبەکری.

چوارەم: خالیدی.

پێنجەم: ناوچەی کوردە هەژارنشینەکان.

لە تیللۆ چوار قوتابخانەی باڵای ئایینی هەبوو. جگە لەمانە لە دێر زەمانەوە لە جیهانی ئیسلامی ئەوانەی لە بەغدا و میسر و ئیستانبووڵ و شام سوننەتی منداڵان دەکەن، هەموویان خەڵکی تیللۆن. بۆیە، خەڵکی تەواوی ئەو ناوچانە و ناوچەکانی دەوروبەر و سەررێگاکان، دوای منداڵ بوونیان، چاوەڕوانی هاتنی شێخەکانی تیللۆ دەکەن تا منداڵەکانیان بە دەستە موبارەکەکانی خۆیان سونەت بکەن. دوای سونەت کردنیان ئەو شێخانە چارەسەرێکی دەرمانی گیایی (ئەعشاب) لە شێوەی خەنە بەکار دەهێنن کە لە چیاکانی کوردستان کۆی دەکەنەوە، بەمەش لە ماوەی سێ تا چوار ڕۆژ دوای سونەتەکە برینی منداڵەکە چاك دەبێتەوە. بۆیە ئەمڕۆ من و ملیۆنان کوڕی دیکەی کوردستان کیرفەی شێخەکانی تیللۆین، هەر بۆیە ئەو ناوچەیە لەناو خەڵکی کوردستان و ناوچەکە جێگای ڕێز و حورمەتگرتنە.

دەمەوێ کۆتایی بەو بەشە بهێنم، چونکە بە نووسین هەرچەندی باس کەم ناتوانین حەقی تیللۆ بدەین. بەڵام پێشنیازم بۆ ئەو کەسانەی مەراقی بینینی شوێنی زانست و ئایینی کۆن دەکەن، بە زووترین کات سەردانی تیللۆ بکەن، تا بە چاوی خۆیان ئەو شتانەی باسمکرد ببینن.

**کارگەی دەرمانی تەگە**

ئەو کاتەی لە کۆگای دەرمانی ڕۆژهەڵات کارم دەکرد، ڕۆژێك سێ کەس لە ئیستانبووڵەوە هاتنە لام. یەکێکیان هاوڕێیەکی ئیستانبوولم بوو لە ماڵباتی تادەلی. ئەو ماڵباتە سەرۆکی ئەو خێزانە جووانە بوون کە پێنج سەدە پێش ئێستا لە ئیسپانیاوە بەرەو ئیستانبووڵ کۆچیان کردبوو، ئێستاش ئەوان خێزانێکی دیار و ڕێزگیراوی ئیستانبووڵن. وەك چۆن لای ئێمە سەیدەکان خۆیان بە نەوەی حەزرەتی محەممەد دادەنێن، ئەو ماڵباتە یەهوودیەش خۆیان بە نەوەی حەزرەتی مووسا هەژمار دەکەن. لای ئێمە، سەیدەکان حوسێنی و حەسەنین، واتا نەوەکانی حەزرەتی حوسێن و حەزرەتی حەسەنن. بۆ نموونە، شەریفەکانی مەککە، واتە نەوە و منداڵەکانی شەریف حوسێن و عەبدوڵای ئەمیری ئوردن و مەلیك فەیسەڵی عێراق، حوسێنینە. کەچی یەحیای ئیمامی یەمەن و شێخ سینوسی مەلیکی لیبیا و مەلیکی مەغریبیش نەوەی حەزرەتی حەسەنن.وەبگرە، مەلیکی مەغریب بە خۆی دەگوت حەسەنی دووەم.

سەیدەکانی جووانیش، وەك سەیدەکانی ئیسلام، دوو جۆرن. بەشێکیان لە نەوەی (تادەلا)ن، ئەمانە کاتی خۆی لە شاری تادەلای ئیسپانیا نیشتەجێ بوونە. بەشەکەی دیکەشیان (نازی کۆنن). بەهەرحاڵ لێرە مەبەستم نییە چیرۆکی نەوەی پێغەمبەران بنووسمەوە. چونکە تەواوی پێغەمبەران دیارە کە یان یەهوودی بوونە یانیش عەرەب. نەتەوەی وەك ئێمە لە چینی دووەم و سێیەمی مرۆڤایەتی حسابمان بۆ کراوە.

با بگەڕێینەوە سەر هاتنی میوانەکانم: لەگەڵ تادەلا دوو

جووی بەڕێزی دیکەش هاتبوون. تووماژە ئەوانە خاوەنی کارگەی دەرمانی (تەگە) بوون و دەرمانیان بۆ ئێمە دەنارد. هۆکاری هاتنیشیان بۆ دیاربەکر ئەوەبوو کە کارگەکەیان دەرمانی داوەتە کۆگاکانی دەرمانی ناوچە کوردییەکان، کە بە تورکی پێیدەڵێن (ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات)، بەڵام زۆربەی کۆگاکانی دەرمان سەنەدەکانیان یاخود بڵێین قەردەکانیان نەداوەتەوە. خاوەنی کارگەی دەرمانی (تەگە) ئەو کێشەی خۆیان بۆ تادەلا باسکردبوو، ئەویش گوتبووی: "کێشەکەتان ئاسانە، چونکە هاورێیەکم هەیە قسەی لە ناوچە کوردییەکان دەڕوا، لەو زیاتر کەس ناتوانێ ئەو کێشەیە چارەسەر بکا".

کێشەکانیان بۆ باسکردم، بۆ چارەسەرکردنیشی ڕێگاپێدانی تەواویان بە مۆری فەرمانگەی دادنووسی دامێ. وا ڕێککەوتین کە بەشێك لە قەرزەکان بکەینە قست و لە بەشێکیشیان خۆش بین، چونکە بڕە پارەیەکی زۆر کەوتبووە لای کۆگاکان، ئەوەی دیکەش دەبێت وەربگیردرێتەوە، بۆ لێخۆشبوونی بڕی پارە و چۆنیەتی قیستەکە دەستکراوەیی تەواوم هەبوو. پرسەکەمان لەگەڵ دکتۆر یوسفیش باسکرد، ئەویش ڕازی بوو. لەو کەین و بەینە منیش مەبەستم بوو بە کوردستاندا بگەڕێم.

ئیدی خەریك بوو ببمە ئەولیا چەلەبی، بۆیە، ئێستا چەند یادەوەرییەکی ئەو گەشتەمتان بۆ دەنووسمەوە:

**سەردانی عەنتاب:** لەبەر ئەوەی دوای دیدارەکە بەپەلە کەوتمە ڕێ، میت و پۆلیس تێنەگەیشتن بۆ کوێ دەچم. بۆیە، ئەو گەشتەم بە ئیسراحەت تێپەڕی، بەڵام لە سەردانەکانی دیکەم ئەی هاوار خوایە چ ڕووداو و بەسەرهاتی منداڵانەیان بەسەر هێنام، کە لە خوارەوە بۆتانی باس دەکەم.

جانتایەکی گەورەم پڕ دەرمانی کارگەی (تەگە)کرد، هەر کوردێکی هەژارم هاتبا سەر ڕێگا پارچەیەك دەرمان دەدایە، هەمووشیان دەرمانی چاکی دەرەوەی وڵات بوون، وەك دەرمانی سەر ئێشان و زگ چوو و قەبزی و ئازار شکێن و چەندان دەرمانی جۆراوجۆری منداڵان. بە ئۆتۆبووس دەچوومە عەنتاب، لەوێ محەمەد گونەی دۆستم، کۆگای دەرمانی (گونەی — باشوور)ی هەبوو. قەرزەکەشی ٨٠٠٠٠ لیرە بوو. پاسەکە لەسەر پردی (بیرەجیك) وەستا. ئەوسا وەك ئێستا ڕێستورانتی خۆش و گەورە نەبوو، بەڵکو لە دەرەوە لەسەر ڕەژوو جەرگ و کفتە و کەباب هەبوو وەك لەفە لەناو نان دەفرۆشرا.

بە ڕاستی بینینی ڕووباری دیجلە و فورات و چیاکانی کوردستان لای من وەك دۆخێکی دەروونی لێهاتووە و بە بینینی ئەو شوێنانە هەستدەکەم ئەژدادی خۆم بینیوە. بۆیە، دوای وەرگرتنی لەفەکەم بە باشم زانی خواردنەوەکەشم مشتێك ئاوی فورات بێ، بۆیە بە پێ شۆڕ بوومەوە کەنار ڕووبارەکە و لەوێ نانەکەم خوارد. خاوەنی ناوچەکانی ئەوێ لە کەنار ڕووباری فورات بە داری ناوچەکە کۆشکی جوان و مێز و کورسیان دروستکردبوو، شوێنەکەیان کردبووە نیمچە چایەخانەیەك. کە چوومە شوێنەکە چوار پێنج کەس لەوێ بوون. ئەوسا من لە ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد) بە کوردی و تورکی دەمنووسی، نەبێتە خۆ هەڵکێشان، چونکە هیچ حەزی پێناکەم، بەڵام لە هەمان کات حکوومەت و گەلی کوردم بە نووسینەکانم خرۆشاندبوو. ئەو ڕۆژەش بە مەبەست جلوبەرگێکی گەنجانەی ئەمریکی خۆ بە گەورە زانم لەبەر کردبوو. تیشێرتێکی قۆڵ کورت، وێنەی وەرەقەی کۆنکانی لەسەر بوو، لەگەڵ سەندەڵێکی مارکەی ئەوروپیی گرانبەها بەبێ گۆرەوی، لەگەڵ پاڵتۆیەکی دەلینگ

فش، بۆ جوانکاریش زنجیرێکی زێرم لە دەست و ملم کردبوو.

کە چوومە شوێنەکە، بە دەستووری ئیسلامییانە سلاوێکم کرد، ئەوانەی لەوێ بوون بە سەرسورمانەوە فەرموویان لێ کردم. چایان بۆ هێنام، منیش چەند داو و دەرمانێکم دانێ. لە نێوانمان گفتوگۆیەکی ئاوا دروستبوو:

ئەوان: بەڕێزم ئێوە خەلکی کوێنە؟

من: ئیستانبوول.

ئەوان: ئەی ئێوە چ کارەن؟

من: دەرمانسازم.

ئەوان: باشە، بەلام ئێمە تا ئێستا هیچ دەرمانسازێکی وەك ئێوەمان نەبینیوە. لای ئێمە کاك سولێمان هەیە هەمان کاری ئێوە دەکات، ئەو هەم شەلوار لەبەر دەکات، هەمیش وەك تۆ دەرمان بەبێ بەرامبەر ناداتە کەس.

من: ئاخر من خەلکی ئیستانبوولم، بۆیە لەنێوان بیرەجك و ئیستانبوول ئەوەندە جیاوازییە هەر دەبێ. ئینجا لێم پرسین ئێوە عەرەبن؟ تورکن؟ یەکێك لەناویان گەنج بوو، بە تورکییەکی باش قسەی دەکرد، دیار بوو تازە لە سەربازی هاتبۆوە و هێشتا تورکی لە بیر نەچۆبۆوە.

ئەوان: ما برا بۆ تورك و عەرەب بین، وەلا ئێمە کوردین.

من: کورد؟ بۆ کورد هەیە؟ کورد مانای چییە؟

ئەوان: ئەی چۆن کورد نییە، ئەی ئەوە ئێمە کوردین.

من: هەلا هەلا، جا ئێوە زمان و ڕادیۆ و ڕۆژنامەتان هەیە؟

ئەوان: بەلێ ئەی چۆن، ڕادیۆی بەغدا و ئەریڤان بە زمانی کوردی پەخشیان هەیە. جگە لەوانە ئێمە بە کوردی قسە دەکەین و لە دیاربەکریش ڕۆژنامەمان هەیە بە کوردی دەنووسێت.

مـن: باشـە ئەی کـێ ڕۆژنـامەکەی دیاربەکرتـان بە کـوردی دەنووسێت؟

ئەوان: مووسا عەنتەر.

مـن: بریـا ئەو ڕۆژنـامەیەم بینیبـا. بینـیم لە نێـوان خۆیـان بە کوردی دەستیان بە قسان کرد و یەکیکیان بە هاوڕێکانی گوت: "دانەیەك لەو ڕۆژنامەم لایە و پێشانی دەدەم؟".

ئینجا لە نێوان خۆیان بە کوردی بەردەوام بوون لە قسەکردن: "بـرا ئەو ڕۆژنـامەی پـێ پیشـاندە خـۆ چـی دەکـا، گەر ویسـتی شتێکیش بکا، ئێمە شەش و ئەو تەنیا، دەیهاوێینە ڕووباری".

کوڕە گەنجەکە، لەناو گیرفـانی چـاکەتەکەی، ڕۆژنـامەیەکی (ئیلەری یورد)ی دەرهێنا، لەو ژمارەیان من وتارێکم بەناونیشـانی (مامە کمل هات) بڵاو کردبۆوە، ئینجـا ڕۆژنـامەکەی کـردەوە و شیعرێکی خۆمی پێ پیشاندام. زۆر دڵخۆش بووم، قـورگم گیـرا و چـاوم پـڕ فرمێسـك بـوو، بەڵام خـۆم بەوان نەناسـاند. چـونکە دەزانـم لە چـاو و زیهنـی ئەوانـدا عەنـتەر پیـاوێکی گەورەی تـــووڕەی ســـمێڵ بـــابڕە، یـــانی بە ئەدگارەکـــانیەوە وەك پێشمەرگەیەکی قارەمانە بۆخۆی. جـا گەر ئەو عەنـتەرە تیشـێرت لەبەرەی بەرامبەریـان بناسـیبا دڵنیـام لە عەنـتەرەکەی دیـکە و نووسینەکانیشی سارد دەبوونەوە.

لەوان جیـا بـوومەوە و بەڕێکەوتیـنەوە بـۆ عەنتـاب، لەوێـش ڕاستەڕێ چوومە لای محەمەد. ئەویش بە گەرمی پێشـوازیی لـێ کـردم، ئینجـا بەڵـگەی ڕێگاپێـدانەکەم پیشـاندا و پـێم گـوت بـا سەری یەك نەهێشێنین، چونکە بۆم باسکرد ئەو قەرزانەی لایەتـی هـی جووەکـان نییە و پـارەکە هـی مـنە. لەسـەر ئەوە پێکهـاتین

دووسەت و پەنجا هەزار لیرەم بداتێ. منیش لە بری ئەوە فایز و سەت هەزار لیرەی لێ خۆشبووم. ئەو پێنج سەت هەزار لیرەی مابۆوەش بۆم کردە سێ قستی جیاواز.

سالی ١٩٥٩، عەنتاب لەگەڵ ئێستا زۆر جیاواز بوو، بەر لە هەموو شتێك هیچ چالاکیەکی سیاسی و کەلتووری و ڕۆشنبیری لێ نەبوو، هەموو خەڵك وەك ئەڵمانەکان بەردەوام کاریان دەکرد. لە هەموو ماڵ و بازاڕێك ئامێری دەستکردی ڕستن و چنین هەبوو. ئەوسا هەرچی کۆنە جلوبەرگی وەك گۆرەوی و بلوز و کڵاو و مل پێچی سوف هەبوو، لە ناوچە کوردییەکان، هەموویان کۆدەکردەوە و دەیانهێنا عەنتاب و لەوێ هەڵدەوەشێندراوە و جاجم و ڕایەخ و نیندەری لێ دروستدەکرا. ئەو خەڵکەی ئەو کارەشی نەدەکرد، زۆربەیان چێشتیان لێدەنا، یان لە مەیخانەکان ساقی بوون. بەپێی ئەوەی زۆر شار گەڕاوم، هەستم بەوە کردووە لە هەر شارێك شەقامێکی گەورە و ناودار هەیە، لەو جۆرە شەقامانەش، بۆ نموونە، شوێنی گەورەی جل فرۆشتن و ڕێستورانتی جوان و زێڕینگر و بانك هەیە، بەڵام ئەو شەقامە گەورە و ناودارە لە عەنتاب لەیەکەمەوە تا کۆتایی بەس چێشتخانە و ڕێستورانتە. ئەوانەی ئەو نووسینانەم دەخوێننەوە هەست نەکەن من لە بەهای عەنتاب کەمدەکەمەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، چونکە من کاتێك قوتابیی ئامادەیی بووم بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان و مامۆستا جەودەت بارلاس خەڵکی عەنتاب بوون، هەر ئەوانیش کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر بەرەو پێشچوون و سەرکەوتنەکانی قۆناغی خوێندنم هەبووە، هەر ئەوانیش منیان بە برا بچووکی خۆیان دادەنا و منیش ئەوانم بە برا گەورەی خۆم دانابوو.

لەو گەشتەم، لەگەڵ کاك محەمەدی کوڕی مامۆستا جەودەت یەکدیمان بینی، ئەوسا ئەو بەرنامەیەکی عەنتابییانەی لە تەلەفزیۆن پێشکەش دەکرد، لەبەر ئەوەی منیش حەزم دەکرد بۆ شەوێکیش بێت ببمە خەڵکی ئەو شارە، بۆیە لەگەڵ ئەو بڕیانماندا بە شوێنە خۆشەکانی شاردا بگەڕێین. محەمەد بارسلان گوتی: "کاك عەنتەر لێرە باڕێکی زۆر خۆشی ئیستانبووڵیان هەیە، شوێنێکی زۆر دڵگیرە، کچی جوانیشی زۆر دێتێ...". وەڵامیم داوە: "محەمەد گیان، باڕی ئیستانبووڵ لە ئیستانبووڵ خۆشە، تۆ بمبە شوێنێکی خۆشی عەنتابی"، گوتی: "مادەم وایە دەتبەمە مەیخانەی کاك حاجی". پێك هاتین و چووینە ئەوێ.

لە شوێنەکە دەرزیت بهاوێشتبا بە زەوی نەدەکەوت، کاك حاجی، محەمەدی هاوڕێمی دەناسی، بۆیە یەکسەر مێزێکی بۆ ئێمە جیاکردەوە و بە گارسۆنەکانی گوت بە باشترین شێوە خزمەتیان بکەن، ئینجا دەستی بە پرسیارکردن کرد:

کاك حاجی: کاکی من بەخێر هاتن سەر سەر و سەرچاوم. محەمەد میوانی هەموومانە، کەرەمکەن بێژن چی دەخۆنەوە؟

من: کاك حاجی هاتوومە خواردن و مەشڕوبی عەنتاب بخۆم.

کاك حاجی: مادەم وایە شەڕابی سووری عەنتابت بۆ دەهێنم. ئەی چی دەخۆن؟

کابرا وەك مامۆستای جوگرافیا خواردنی سەرجەم شارە کوردییەکان و شارەکانی سووریای بۆ ژماردین.

کاك حاجی: چ کەبابێك دەخۆن؟ مێردین، عەنتاب، ڕووها، ئەدەنە، حەلەب؟

من سەرم سوڕمابوو لە ژماردنی ئەو هەموو کەبابە جۆراوجۆرە. کاك محەمەد هەستی پێ کردم و بە پێکەنینەوە گوتی: "کاك حاجی خۆت دەزانی، شتێکی تێکەڵمان لە هەر

جۆرە و دانەیەك بۆ بێنە بزانین چۆنە". زۆری بەسەر نەچوو، شەڕابەکەمان بۆهات، دوای ئەویش لەناو قاپێکی پەلی گەورە کەبابەکانمان بۆ هات. زۆربەی جۆرکانیشی لەوانە بوون کە پێشتر تامیم دەزانین. هەندێکیانی بیبەری کەم تێکردبوو، بیووە کەبابی عەنتاب و ڕووها، ئەوانی دیکە بیبەری زۆر بوو بۆیە ناوەکانیان گۆڕابوو. مادەی سەرەکی هەموویان قیمە بوو ئیدی. بەڵام دوو جۆر کەبابیان بۆ هێنابووین یەکەمجار بوو ببینم، پێشتر لە هیچ شوێنێکیش نەمخواردبوو، لەو باوەڕەدام بەشێکی زۆری خوێنەرەکانیشم، جگە لەوانەی خەڵکی عەنتابن، گوێیان لەو جۆرە کەبابە نەبووە.

کەبابەکە بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

**یەکەم:** ناوکی میوەی هەنگی دونیایان دەرهێنابوو، لە شوێنی ئەو قیمەیەکی تێکەڵ بە بیبەر و بەهارات و ئاوی پیازیان لە جێیکردبوو، هەم شێوەکەی هەمیش تامەکەی زۆر جیاواز بوو، لەبەر ئەوەی لەناو هەنگی دونیاش بوو، بۆیە کەبابەکە تامێکی مزری هەبوو.

**دووەم:** پیازی وردیان تۆزێك کوڵاندبوو، بەبێ ئەوەی شێوەکەی تێك بچێت پەلك پەلکیان کردبوو، لە ناو ئەو پەلکی پیازە وردانەش قیمەیەکی بەبەهاراتی پڕ کەرەوزیان لەشوێنی دانابوو، ئینجا لەسەر قاپێکی فافۆن لەسەر ڕەژوو برژاندبوویان.

دوای خواردن و خواردنەوە و دەمەتەقێیەکی درێژ، چوومە ئەو میوانخانەی لێی دەمامەوە. بەیانی ڕۆژی دواتر، کاك محەمەد هاتە لام و گوتی: "کاکۆ دەتەوێ لە کوێ تاشتی بخۆین؟" منیش پێم گوت: "دەمەوێ پاچەیەکی بەیانیانی عەنتاب بخۆم بۆ تاشتی". سواری ئۆتۆمبێلەکەی بووین و چووینە لای پاچە فرۆشێك. بەڵام تا بڵێی شوێنێکی تایبەت و جیاواز بوو. تەواوی

شوێنەکە بە کاشی ڕووپۆش کرابوو، هەموو شوێنێك لە پاك و خاوێنیان دەبریسکاوە. خاوەنی ئەوێش کاك محەمەدی دەناسی، پێشوازیی لێ کردین و لەبەر ئەوەی زانیی منیش میوانی ئەوم، بۆیە زۆر بە گەرمی فەرمووی لێ کردم و ئینجا پرسی:

ئەو: کاکی من فەرمانکەن حەزتان لە چییە؟

من: وەڵا هاتووین پاچە بخۆین.

ئەو: زۆر باشە، بەڵام پاچەکەتان چی بێ و چۆن چۆنی بێ؟

من: پاچە هەر پاچەیە، چۆن چۆنییەکەی چۆنە تێنەگەیشتم.

ئەو: ئاخر پاچەکە زمان بێت، یان هی مێشك، یانیش قاچ، یانیش پرسیر و تێکەڵ بێت؟

من دیسان سەرم سوڕما، کاك محەمەدیش بەو حاڵەی من لە بن سمێڵان پێدەکەنی. ئینجا بە هانامەوە هات و ڕزگاری کردم و گوتی: "وەستا تۆ خۆت دەزانی چۆن دوو پاچەی خۆشمان بۆ دێنی".

لەناو دوو قاپی گەورە سەر و پێیەکی بە لەزەت و خۆشمان خوارد. دوای ئەو نان خواردنە، کارم لەگەڵ کاك محەمەد تەواو بوو. ئەوسا خەیری سەراج ئۆغلووی هاوڕێم، کە دۆستایەتیمان بۆ سەردەمی بەشەناوخۆیی دیجلە دەگەڕێتەوە، لە عەنتاب داواکاری گشتی بوو، ئەو خۆی خەڵکی سیرت بوو. تکام لە کاك محەمەد کرد تا دادگای عەنتابم ببا، ئەویش منی لەوێ دانا و ماڵئاواییمان لەیەك کرد. لەبەر ئەوەی خەیری، بە تەمەن، لە ئێمە گەورەتر بوو، بۆیە بە ئاغا ناومان دەهێنا. کە منی بینی بە داواکارە گشتییەکانی هاوپیشەی گوت: "سەیرکەن ئەو ئاپۆیە، ئاپۆکەی دیکە نییە". بە بینینم سەری سوڕما، بۆیە تەواوی ڕۆژەکەی بۆ من تەرخان کرد و وازی لە کاروبارەکانی ئەو ڕۆژەی هێنا، منیش پێم گوت: "ئاغا ئێستا تۆ داواکارێکی

گشتیی بە هێزی لە عەنتاب، بۆیە، ئەوجارە هاتوومەتە ئێرە، تۆش بیمە هەندێك شوێنی کە هەموو کەسێك ناتوانێ سەری لێ بدا".
ئاغا گوتی: "وەڵا مووسا لە عەنتاب جگە لە بەندیخانە هیچ شوێنێکی دیکەی قەدەغەکراوی لێ نییە، تا خەڵك نەتوانی بچیتێ، چونکە لێرە چالاکی سیاسی نییە تا شوێنی قەدەغەکراو هەبێ. هەرچی بەندیخانەکانیشە، پڕیەتی لە قاچاغچی و کەسانی بکوژ و تاوانبار". پێداگریم لەسەر ئەوە کرد بمباتە بەندیخانە. چووینە شوێنێك بە ناوی (خالیس خانە)، ئەوێ کڵێسایەکی زۆر گەورەی ئەرمەنی بوو، کە چەندان تایبەتمەندیی گەورەی لێبوو، وەك بۆشمان ڕوونە تورك بەردەوام خەڵکی شوێنە ڕەسەنەکان دەکوژن، یاخود دەریان دەکەن، ئینجا بە شوێن و سامانەکەشیان دەڵێن خەزێنەی دەوڵەت. بۆیە ئەو قەڵایە ناوازەی ئەرمەنیەکانیش ببووە خەزێنەی دەوڵەت. هەرچی ئەرمەنیی ناوچەکە هەبوو کۆمەڵکوژ کرابوون، بەشێك لە ناپاکەکانیش بەرەو سووریا و ئەورپا و ئەمریکا هەڵاتبوون.

لە قەڵاکە، قوببەیەکی شێوازی بیزانسی یاخود میزۆپۆتامیایی هەبوو، لەناو ئەو قوبەیە بە تەختە شوێنەکەیان کردبووە چوار قات، لەژێر ئەو قوببە خڕانەش تاوانبارەکان وەك ئاژەڵ بە ناچاری ژیانی خۆیان لێ بەسەر دەبرد. بەڵام خەیری جودایکردبوونەوە، واتە بەش بەشی کردبوون. بەشی یەکەمی تایبەت کردبوو بە تۆمەتبارەکان، قاتی دووەم تایبەت بوو بە قاچاغچییەکان و قاتی سەرەوەتر بۆ دز و ئەو کەسانە دابین کرابوو کە دەستریژیی سەر نامووسی ئافرەتانیان کردبوو، قاتی کۆتایش تایبەت بوو بە تاوانبارە پیاوکوژەکان. بەڵام بە ئاشکرا هەستم بەوە کرد هیچ ڕێزێك بۆ کڵیسا دانەندراوە، چونکە لای ئێمە ئەو شتانە هەر دەبێ، لەبەر ئەوەی لەو وڵاتەی ئێمە

پەروەردەی ئایینی نییە. هەرگیز بیرم ناچێتەوە کاتێك لە ئامادەیی ئەدەنە دەمخوێند، کڵێسایەکی ئەرمەنییەکانیان کردبووە سینەمای توران. ڕۆژێك منیش چوومە ئەو سینەمایە، بەڵام کە چوومە ژوورەوە، ئینجا هەستم کرد بە گوللە لێمدەدەن. چونکە مینبەری کڵێساکەیان کردبووە ئەدەبخانە. کە ئەممەم بینی، جارێکی دیکە نەچوومەوە شوێنەکە. دوای دەرچوونمان لە بەندیخانە، لەگەڵ کاك خەیری چووینە بازاری قەیسەریی عەنتاب. لە دەرەوە مزگەوتێکم بینی کە شێوازە ئەندازەییەکەی وەك ئەو کڵێسایە بوو کە کرابووە زیندان. لە دووکاندارێکم پرسی: "مامە گیان ئەو مزگەوتە، لەگەڵ ئەو کڵێسایەی کراوەتە زیندان ڕووکاری دەرەوەیان وەکو یەکە، ئەوە چۆنە ئەو مەسەلە؟". کابرا گوتی: "کوڕی خۆم هەم کڵێساکە هەمیش مزگەوتەکە لەلایەن ئەندازیارێکی ئەرمەنییەوە دروستکراوە. کابراش دوای تەواو کردنی گوتوویەتی کامەیان مانەوە، خوا لەبەر ئەو بمپارێزێت و بمخاتە ژێر ڕەحمەتی خۆی".

**سەردانی بەدلیس و موش و وان:** بە بیرم نایەت چ کەی بوو، بەڵام کۆتایی بەهار و سەرەتای وەرزی هاوین بوو. ئەوجارە بە شەمەندەفەر تا ناوچە کوردییەکان ڕۆیشتم، لە شوێنێك هەندێك ڕێبوار سواری شەمەندەفەرەکە بوون و هاتنە فارگۆنەکەی من، منیش حەزم دەکرد چەند کەسێك بێنە لام و بە تەنیا نەبم. لەناو ئەوانەی تازە سوار بوون یەکێکیان کوڕی جەمیل چەتۆی ناودار بوو. من لەبەر ناوی باوکی ڕێز و حورمەتێکی زۆرم لێنا، بەڵام کابرا هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو. ئەو سەیری پەنجەرەکەی دەکرد، کاتێك دەستمان بە قسان کرد، چونکە خەڵکی ناوچەکە بوو، لە هەمان کات کوڕی سەرۆکی

عەشیرەتی (پەنجیران) بوو. شەمەندەفەر بەناو دەشت و سەوزایی ناوچە کوردییەکان تێدەپەڕی، گەیشتینە شوێنێك و لە دەستە ڕاستی شەمەندەفەرەکەوە قوببەیەکم بینی، پرسیم:

من: "چەتۆ ئاغا ئەو قوببە چییە؟"

چەتۆ: "مووسا بەگ ئەوە گۆڕی شێخێکی پیرۆزە و لە هەمان کات جەنابیان هەموو ئومێدی ئێمەن".

من: "یانی چۆن؟"

چەتۆ: "٦٠ ساڵ بەر لە ئێستا شەڕێك لە نێوان تورك و کورد دروست دەبێ، تورکەکان هاوەنێك دەگرنە کوردەکان، بەڵام ئەو هاوەنە بە قوببەی مەزاری شێخ دەکەوێت، ئیدی دەبینن ئەسپێکی ڕەنگ بۆر، بە سوارچاکێکەوە لەوێ دەردەچێ و سوپای تورکان تەفروتوونا دەکا و هەموویان دەکوژێ".

من: "چەتۆ گەر وابێ ئەو شێخە کەسێکی زۆر بێناموس بووە، چونکە تا هاوەنێك بە گۆڕەکەی خۆی نەکەوت چاوپۆشی لە کۆمەڵکوژیی کورد دەکرد، ئینجا ئەفەندی دوای ئەوەیماڵی خۆی وێران کرا بە ئاگا هاتەوە و دژی زوڵمی تورك وەستا. چەتۆ توورە مەبە، بەڵام لەو باوەڕەدام ئەو شێخە کوردیش نەبێ، بەڵکو نەوەی زوڵم و زۆردارییە".

دوای ئەو قسانەی من، چەتۆ ئاغا دەهری بوو. کە گەیشتینە ناوچەکە، لە شەمەندەفەر هاتمە خوارەوە و بە پاس چوومە بەدلیس. لە ڕێگا پاسەکە لە شوێنێك لایدا. منداڵەکانی ناوچەکە هاتبوونە سەر شەقام و لەناو سەبەتەکانی دەستیان میوەیەکی ترشی وەك گێلاسیان دەفرۆشت، ئەوان بە کوردی بۆ سەرنشینەکانی ناو پاسەکە باسیان لە چاکی و تام و لەزەتی میوەکە دەکرد، تا بتوانن ئەوەی هێناویانە بیفرۆشن. لەناویاندا منداڵێکی تەمەن ١٠ساڵان هەبوو، بچووك و سەر خڕ لەنێوان

منداڵەکانی دیکە دەهات و دەچوو. منداڵەکان بە جلوبەرگیانەوە دیار بوو هەموویان کوردن، ئەوەش کاریتێکردم. منداڵە بچووکەکە جلوبەرگەکەی زۆر خراپ و شڕ و شیتاڵ بوو، دیار بوو جلەکانی هی خۆی نییە، چونکە چاکەتێکی گەورەی دڕاو، لەگەڵ پاڵتۆیەکی پینەکراوی لەبەر بوو. ئەوم بانگکرد و دەستمان بە قسەکردن کرد. میوەکانی لەناو چەند سەبەتەیەکی بچووك کردبوو، چەند سەبەتەیەکی بچووکتریشی لەسەر سینیەك دانابوو، بەو تەمەنە بچووکەیەوە بەراست و چەپدا دەچوو تا سینیەکەی لە دەست نەکەوێ، نرخی فرۆشتنی هەر سەبەتێکیش پێنج قروش بوو. ئینجا دەستمان بەو ئاخاوتنە کرد:

من: "کوری خۆم نرخی ئەو سەبەتانەی دەستت چەندە؟".

ئەو: "بە پێنج قروشە".

من: "ئەی گەر من هەموویت لێبکڕم تۆ بە چەندم دەدەیتێ؟".

ئەو: "وەڵا تۆ دەزانی، گەر دەتەوێ پارەشم مەدێ".

لە دڵی خۆم گوتم مووسا جا وەرە قوربانی منداڵێکی ئاوا مەردی کورد مەبە. سەبەتێکم لێ کڕی بە پێنج قرووش، بای یەك ملیۆنیش ماچم کرد، ئینجا ١٠ لیرەم دایێ بۆ خۆی. منداڵەکە سەری سوڕما و لە زۆری پارەکە ترسا.

من: "مەترسە کوڕی خۆم، منیش وەك باوکی تۆمە. تۆ باوکت نییە؟".

ئەو: "باوکم هەیە، بەڵام بەبێ بەرامبەر بۆ ماڵە شێخێك کار دەکات. چونکە دەڵێن ئەو شێخانە تەنیا دەتوانن نزا بۆ ئەو کەسانە بکەن کە لایان کار دەکەن. لەبەر ئەوەی پارەیان نییە بیاندەنێ".

لە ناو جانتاکەم هەندێك لە جلەکانی خۆم دەرهێنا و لەبەرم

کرد، چونکە لەبەر سەرما و خراپی جلەکانی دەلەرزی و لووتی سوور ببوەوە و لێوەکانیشی مۆر هەڵگەڕابوون. لەگەڵ ئەوەی لە کۆتایی وەرزی بەهاریش بووین، بەڵام ئەو ڕۆژە کەشوهەوا زۆر سارد بوو. سەبەتێکی دیکەشم لە میوەکانی دەستی کڕی و ئینجا پێم گوت: "ئەوەی ماوەتەوەش بیباتەوە بۆ لای دایك و خوشك و براکانی". بە هەستێکی زۆر سەیرەوە منداڵەکەم زیاتر لە ١٠ جار ماچ کرد، لەباوەشم کرد، ئینجا بەڕێمکرد بۆ ئەوەی بچێتەوە ماڵ. کاتێك پاسەکە دەستی بە جووڵە کرد، لەپەنجەرەوە بینیم ئەو منداڵە دڵخۆشە بە خێرایی ڕێگای لادێکەی خۆیانی گرتبوو.

**گەیشتمە بەدلیس:** لەگەڵ بینینی ئەو شارە هەستێکی سەیرم لا دروستبوو. وەك ئەوەی لە دەروازەی شارەکە جەستەی کاك یوسف زیا ببینم، کە لە ساڵی ١٩٢٥ لەلایەن کەمالیستە فاشیستەکانەوە هەڵواسرا. وام هەستدەکرد لەگەڵ لە سێدارەدراو شێخ سەباحەدین و سەید عەلی و محەمەد شیرین و ڕابەری شۆڕشی بەدلیس و قارەمانی کورد مەلا سەلیم دەجڤم. هەستم دەکرد ئەوان هەموو پێشنیازەکانیان بۆ من بریتییە لە ڕزگارکردنی شەڕەف و غروری کورد لە ژێر زوڵمی پۆستاڵی ئەو فاشیستانە.

لە بەدلیس، عادل شەڕەفخان ئۆغڵووی سەرۆکی شارەوانی هاوڕێم بوو. ئەو لە کۆنگرەی ئەرزڕووم هاوکارییەکی بەهێزی مستەفا کەمال ئەتاتورکی کردبوو. باسیم سەعدولا ئۆغڵووی دەرمانسازی کوڕی کاك سەعدولاش، لەگەڵ نووری عەتای دکتۆری میللیش هاوڕێم بوون. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوەندە میت و پۆلیسی بێ ئەخلاقی نهێنی بەدواوەم بوون، بۆیە، بۆ مانەوە تا زیان بە کەس نەگەینم و کێشەیان بۆ دروست نەکەم، نەچوومە

ماڵی کەسیان. بە ناچاری لە میوانخانەیەکی تازە دروستکراو مامەوە لەناو باخچەیەکی گەورەی چای. چوومە ژوورەوە و بە کارمەندی هۆتێلەکەم گوت: "کاکە گیان زۆر ماندوومە و ژوورێکی یەك نەفەریم بدێ". وەڵامی دامەوە" سوێند بە قورئان دەخۆم هیچ ژوورێکی یەك نەفەریمان نییە". پێم گوت: "مادام وایە پارەی دوو کەست دەدەمێ، بەڵام با کەس لەگەڵم نەمێنێتەوە، چونکە ئەوسا چەند کەسێك دەیانتوانی لە ژوورێکی میوانخانەیەك بمێننەوە". ئەویش بەو پێشنیارەم ڕازی بوو. مفتەکەم وەرگرت و چوومە ژوورەکەم، جلەکانم گۆڕی، ماندوو و شەکەت چوومە ناو جێگاکەم. زۆری پێنەچوو کابرا پیاوێکی هێنا سەرەوە تا لە ژوورەوە لەگەڵم بمێنێتەوە. منیش لەژێر بەتانی خۆم وەك خەواڵوویەك لێ کرد و بە لا چاوێکیش سەیری سەر و کەلەیم کرد، کابرا بە دەموچاوی ڕا دیار بوو میتە. هاوژوورییە تازەکەم جلەکانی لەبەر کردەوە، منیش هەر سەیریم دەکرد. پێڵاوەکانی داکەند و چاکەتەکەی لەبەر کردەوە، بینیم دەمانچەیەکی لەبەر پشتی دەرهێنا و خستییە ژێر بالیفەکەی. ئینجا پاڵی داوە و کەوتە ناو خەوێکی قووڵ، پرخە پرخی ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیی. زانیم کابرا خەوی گرانە، بۆیە، بە ئەسپایی چووم و دەمانچەکەی بن سەریم دەرهێنا و چووم لە پەنجەرەی توالێتی میوانخانەکەوە فڕێمدا ناو باخچەی چاکە.

بەیانی زوو لەخەو هەڵستاین و سلاومان لەیەك کرد، تا چووینە خوارەوە چەند خولەکێك قسەمان کرد، بەڵام کابرا زۆر پەشۆکابوو، دەمانچەکەی نەدەدۆزییەوە، نەیدەتوانێ بشڵێ دەمانچەکەم بزر بووە، چونکە بە منی گوتبوو بازرگانیی مەڕ و ماڵات دەکەم. کە چووینە خوارەوە تا لە هۆتێلەکە دەرچم، بە کارمەندی پێشوازیم گوت سەیری جانتاکەم بکە، دوایی نەڵێن

چەرچەف و شتی وات دزیوە، لەبەر ئەوەی جلوبەرگیشم زۆر ئەستوور نەبوو، بۆیە، کابرا زانی دەمانچەکەی لای من نییە، ئەوکارەشم بۆ ئەوە کرد تا هەستبکا دەمانچەکەیم لەگەڵ خۆم نەبردووە. دونیا تەواو ڕووناك بۆوە و چوومە لای برادەرانی بەدلیس، ئەوان بێتاقەتی ئەوەی بوون شەو لە هۆتێل مایمەوە. لە شوێنە مێژوویییەکانی شارەکە گەڕام، ئینجا چوومە سەر گومبەتی مەزاری کوفرەڤییەکان. دوای گەڕانێکی خۆش بەناو شاردا، چوومە ماڵی باسم سەعدوڵلای دۆستم، کاك باسم دۆستێکی نزیکی ئیستانبوولم بوو، بەڵام کاتێك لە ماڵەوەیان ئەو تفەنگەم بە دیــواری ماڵەوەیــان بینــی کە ئەتــاتورك دوای کــۆنگرەی ئەرزەڕووم بە دیاری پێیدابوو، سەر و دڵم تێکچوو، بۆیە یەکسە لەوێ دەرچووم و بەدلیسم جێ هێشت.

دوای بەدلیس، چووینە تاتوان و لەوێشەوە بە پاس چوومە وان. لە ڕێگا لە تەك شۆفێر دانیشتبووم. لێم پرسی: "برا ئەو ڕێگا و ناوچانەی پێیدا دەڕۆین ناوچەی عەرەبین یان تورکی؟" شۆفێرەکە وەڵامی دامەوە: "نا کاکە گیان نا، خەڵکی ئەو ناوچانەی ئێرە نە عەرەبن نە تورك، بەڵکو کوردی خائینی کوڕی خائینن. لەو ناوچەیە عەشیرەتی برۆکان هەیە، ئەوان لە ڕووسیاوە هاتوون، دوژمنی تورکانن، دەشڵێن ئەوان موسوڵمان نینە و ئێزیدینە و شەیتان دەپەرستن، ئێستاش کینیاس کارتاڵ دەپەرستن. گەورەترین سوێندیشیان (سەری کینیاس)ە. ئەوانە باوەڕ بە قورئان و ئیسلام ناکەن، بەڵام باوەڕ بەسەری کینیاس دەکەن. بۆم باسکرد، من دەرمانسازم و لە ئیستانبوولەوە هاتووم، تکایە لە باشترین میوانخانەی وانم دابنێن. خۆم هیچ تێك نەدا، ئەویش وایدەزانی من کەمالیستم، بۆیە، چیم دەگوت بۆی جێبەجێ دەکردم. ئینجا گوتی: "برا خۆشترین میوانخانەی وان لە

تەك تێرمینالی پاسەکانی ئێمەیە". گەیشتینە وان و منیش چوومە میوانخانەکە، بینیم کارمەندی پێشوازی لەسەر تەختەیەك بەرماڵێکی ڕاخستووە و خەریکی نوێژ کردنە، چاوەڕێمکرد تا کابرا نوێژەکەی تەواو کرد. داوای ژوورێکم لێ کرد بۆ مانەوە، کابراش سەیرێکی سەر و قیافەتی کردم و پێموابێ نەچوومە دڵی، بۆیە گوتی: "برا گیان ببوورە هیچ شوێنێکمان نییە بۆ مانەوە". لە کاتێکدا دڵنیابووم میوانخانەکە چۆڵە و کەسی لێ نییە، ویستم باوەڕی پێبهێنم تا شوێنێکم بۆ بکاتەوە، بۆیە گوتم: "برا گیان من لێرە بێگانە نیمە و زاواى ئارڤاسیەکانم و ناسیاوی کینیاس کارتاڵیشم". وەك ئەوەی تاسێکم لەسەری دابێت، کابرا چووە ئاسمان و هار بوو، ڕووی لێم کرد و بە غەزەبەوە: "مادام ناسیاری کینیاس کارتاڵی، ئەها سەیرکە بەرامبەر خۆمان کارتاڵ پالاس هەیە، زەحمەت نەبێ بڕۆ ئەوێ". ئیدی لەگەڵ کابرا سێ و دووی زیاترم نەکرد و ڕۆیشتم، شوکر بووم بەوەی کابرا تێر و پڕی لێ نەدام. سەرێکم بۆ کابرا لەقاند بەرەو کارتاڵ پالاس و لەوێ دەرچووم. لەوێ بێ ئەوەی خۆم بناسێنم ژوورێکیان دامێ، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم کاك کینیاس و عەبدولباریی برای، زانیبوویان من هاتوومە، بۆیە، هاتنە لام و منیان بردە ژوورێکی تایبەت.

ئەوسا لە پشت هۆتێلەکەی، کاك کینیاس چایەخانەیەکی هەبوو، چای بێ بەرامبەر دەدا خەڵك، کێ هاتبا پارەی لێ وەرنەدەگیرا، لە کاتیکدا خەڵکی وان بە هەشت نۆ چاش نالێن ئەلحەمدولیلا، بەڵام بە فەرمانی کاك کینیاس پارە وەرگرتن قەدەغە بوو. کاك کینیاس لەناو پارتی دیموکرات بوو، بۆیە، کاتێك منی بینی زۆر دڵخۆش بوو، خۆشی پیاوێکی بە سەلیقە و شیك بوو. ئەو دوای شۆرشی ڕووسیا لە ۱۹۱۷ وەك ئەفسەری

پلــە دوو خــۆی و خێــزانەکەی پەنایــان هێنــابووە بەر دەوڵەتــی عوســمانی، بەڵام ئەو ماڵبــاتە بە ڕەچەڵەك خەڵکــی ســیڤەرەك و ڤیرانشــەهیرن و کــاتی خــۆی بەرەو ڕووســیا کۆچیــان کردبــوو. منــیش بە دەرفەتــم زانــی و بە حەنەکەوە قســەکانی شــۆفێری پاسەکەم بۆ کــاك کینیــاس گێڕاوە. ئەویــش هــیچ بەســەر خــۆی نەهێنــا، بەڵام دوای دەمژمێرێــك بینــیم دوو گەنجــی کــورد بە قۆڵبەســتراوی شــۆفێرەکەیان هێنــایە لای کــاك کینیــاس. مــن و شۆفێرەکە چاومان ئەبڵەق ببــوو، شــۆفێرەکە لەوە واقــی وڕمابوو ئەو دەرمانســازە ئیســتانبوولییە چــۆن لەگەڵ کــاك کینیــاس بەو کوردییە ڕەوانە قسە دەکات. بە کاك کینیاسم گوت: "تکــادەکەم کــاکۆ هــیچ لەو شــۆفێرە مەکەن، چــونکە ئەوکــات مــن دەبــمە دوزمــان گەر ئەو کــابرایە هەرچــی لێبــێ". بە ڕەحمەتبــی کــاك کینیاس پێکەنی و بە کابرای گوت: "هەتیو تــۆ چ بێئەدەبییەکــت کردووە؟ خوا شاهێدە سزاکەت زۆر قــورس بــوو، بەڵام نــزا بــۆ ئەو پیاوە بکە چونکە لەبەر دڵــی ئەو هیچــت لێنــاکەم. دیــارە تــۆ هەرکەســێك بێــتە وان، ئــاوا باســی ئــێمەی بــۆدەکەی هــا؟ هەی خوێڕی. بۆیە جارێکی دیکە تــۆ لە ڕێگــای نێــوان (ئەرجــیش – وان) کــار نــاکەی، تێگەیشــتی؟". کــابرا لەبەر ئەوەی چــاوەڕێی ســزایەکی لەوە قورســتری دەکــرد، بــۆیە بە بێــدەنگی بە ســزاکە ڕازی بوو، ئینجا شۆفێرەکەیان ئــازاد کــرد و ڕۆیشــت. دواتــر لە کابرام پرسیەوە، گوتیان لە ترسان ناوچەکەی جێ هێشتووە.

ئێــوارەی ئەو ڕۆژە، کــاك کینیــاس، بە بــۆنەی هــاتنی مــنەوە ئێواره خوانێکی بۆ پارێزگار و بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسی وان و چەندان بەرپرسی ناوچەکە سازکرد. سوپاس بۆ خوا عەبدولباری کارتاڵ لە ژیاندایە و شاهیدی ئەو قسانەمە کە دەیکەم.

بەرپرسە سەربازی و ئەمنییەکان لە خۆشی ئەوەی خــواردن و

خواردنەوەیەکی بەلاشیان لە پێش بوو، مەشغول بوون و ئاگایان لە هیچ نەبوو، بەڵام من دەمزانی سوپایەك لە میت و پۆلیس بەدوای منەوەن. لە ناوەڕاستی خواردن و خواردنەوە و دەمەتەقێکاندا بەڕێوەبەری پۆلیسی وان لێی پرسیم: "کاك مووسا بەیانی دەچنە کوێ؟". منیش وەڵامم داوە: "نیازم وایە بچمە باش کالا، چونکە خێزانەکەم کچی عەبدولڕەحیم زاپسوی باش کالاییە، بۆیە دەمەوێ بچم و ئەوێ ببینم". بەڕێوەبەری پۆلیس وەڵامی دامەوە: "تکا دەکەم کاك مووسا ڕێگاکان زۆر خراپن، زۆر ماندوو دەبن تا دەگەنە ئەوێ". وەك ئەوەی بەڕاستی لە خەمی مندا بێت، زۆر جاهیلانە ڕۆڵی پیاوێکی چاکی دەگێڕا.

تا پێمان کرا خواردمان و خواردمانەوە، دواتر گەڕامەوە هۆتێلەکەم و بە مام کینیاسم گوت: "ئێوە گوێ بەو قسانەم مەدەن کە بە بەڕێوەبەری پۆلیسم گوت سەبارەت بە گەشتەکەی بەیانیم بۆ باش کالا، چونکە بەیانی بە فڕۆکە دەچمە دیاربەکر". بۆ بەیانی کاك کینیاس پلیتی فڕۆکەکەی بۆ هێنام و نزیکی سەعات ١١ بە ئۆتۆمبێلە جێبە داخراوەکەی منی بردە فڕۆکەخانە. دوای ئەوەی سواری فڕۆکەکە بووم، بە بەکارهێنانی ناوی کاك کینیاس بە فڕۆکەوانەکەم گوت: "دەمەوێ بەسەر چیای سوبحان و نەمرووتدا بفڕین". فڕۆکەوانەکە: "وەڵاهی ئێمە بەسەر چیای سوبحاندا نافڕین، بەڵام کڵێسای ئاهتەرمان و چیای نەمروتتان پێ پیشان دەدەم". فڕۆکەکە دەستی بە جووڵە کرد و بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە، بەر لەوەی تەواو بەرز بێتەوە فڕۆکەکە بەسەر دەریاچەی واندا تێپەڕی و لەوێشەوە بەسەر کڵێسای ئاهتەرمان لەسەر دوورگەی ناو دەریاچەکە تێپەڕی، ئینجا تەواو بەرز بۆوە و بەسەر چیای نەمرودیشدا تێپەڕیین، ئێستاش بیرم ناچێتەوە، خوایە گیان ئەوە چ جوانییەك بوو. ئەو دەریاچە شینە جوانەی

سەر ترۆپکی چیاکە وەك تاجێك بوو بەسەر نەمروتەوە. دواتر بەسەر چیاکانی ساسۆندا گوزەرمان کرد، ئینجا لە دیاربەکر دابەزیین.

بەڕێوەبەری پۆلیس باوەڕی بەوە کردبوو کە بەیانی من دەچمە باش کالا، بۆیە، لە بەیانی زووەوە هەرچی هێزی پۆلیس هەبوو ناردبوویە سەر ڕێگای هەکاری — باش کالا، بەڵام دواتر کەزانی گەڕایمەوە دیاربەکر، ئەوانیش بە دەستی بەتاڵی و ماندوو و شەکەتی گەڕابوونەوە. یەکێك لەو پۆلیسانەی بەدواوەم بوو، کوڕێکی بەڕێزی باڵابەرزی قژ زەرد بوو، بە بنەچە خەڵکی بۆشناك بوو، یەکدیمان دەناسی. ڕۆژی دواتر لە دیاربەکر منی بینییەوە و بە پێکەنینەوە گوتی: "کاك عەنتەر ئەی هاوار بۆ وات لێ کردین، بەو جێبە خراپانە بەناو ئەو ڕێگا ناخۆشە شاخاوییانە هەناومان هاتە دەرەوە، کەچی جەنابیشت بە فڕۆکە هاتییەوە ئێرە". منیش پێم گوت: "ئێ کاکی خۆم ئەوەش سزای خوای گەورەیە بۆ ئێوە، چونکە کاتێك من دەچمە ئیش و کاری خۆم، ئێوە بۆ بەدوای من کەوتوون؟".

بەرامبەر کۆگای دەرمان فرۆشییەکەمان کەسێك هات و مێزێکی دانا و دەستی بە بنێشت فرۆشتن کرد. هەموو ڕۆژێك مێزەکەی بەرامبەر بە شوێنەکەی من دادەنا. منیش کەسێکم هەبوو کاری بۆ دەکردم، بۆیە گوتم بەدواداچوونێکی ئەو کابرایەم بۆ بکە. تومەزە کاکەی بنێشت فرۆش لە هۆتێل پالاس دەماوە و شاهانەترین خواردن و خواردنەوەشی داوا دەکرد، جگە لەوانە ئەوکات جگەرەی (هارمانی) دەکێشا کە گرانترین جگەرەی ئەو سەردەمە بوو، لە کاتێکدا یەك بنێشت ئەوکات بە پێنج قرووش بوو. یانی تا ئێوارە ١٠٠ بنێشتی بفرۆشتبا دەیکردە پێنج لیرە، لە کاتێکدا خەرجییەکانی ڕۆژانەی نزیکەی بیست

لیرەبوو. تێگەیشتم کابرا چ کارەیە و بۆچی لەوێ بنێشت دەفرۆشێ. ڕۆژێك سەرم گەرم بوو، چوومە لای کابرا، بە توندی بیست قروشم لە جامی مێزەکەیدا و گوتم: "هەتیو بێنە چوار بنێشت" کابرا سەری سوڕما و گوتی: "کاکە ئەوجە بۆ خۆت تووڕە دەکەی؟". پێم گوت: "هەتیوی خوێڕی، ئێرە دیاربەکرە، جارێکی دیکە لێرە نەتبینمەوە ها، بەڵام گەر دەتەوێت جەنازەکەت بۆ خێزانەکەت بچێتەوە دیسان وەرەوە". ڕۆژی دواتر زانیم کابرا لە دیاربەکر ڕۆیشتووە و جارێکی دیکە نەگەڕاوە.

### ئەیوب ئۆغڵوو

ساڵی ١٩٤٣، لە شەقامی گەنج تورك لە ناوچەی لالەلی لە ئیستانبووڵ، بەشە ناوخۆیی قوتابیانم هەبوو. لەوێ شوێنی ١٥٠ قوتابیمان بە فەراحی هەبوو، بە قەرەپەستانێش دەمانتوانی ٢٠٠ قوتابی وەرگرین. پێشتر، لە ساڵی ١٩٤١ لە ناوچەی ڤەزنەجیلەر لە ئیستانبووڵ بەشە ناوخۆیی قوتابیانی دیجلەمان کردبۆوە. ئەو سەر بە ڕێکخراوی دیجلە بوو، بەڵام دوو ساڵ دواتر دوای ئەوەی توانیم لە ڕووی داراییەوە بەشە ناوخۆییەك بە تەنیا دروستبکەم، ناویم کردە بەشە ناوخۆیی قوتابییانی فورات. لە یەك کات، هەم خاوەنی، هەمیش بەڕێوەبەری ئەوێ بووم. لێرە، نامەوێ باسی ئەو دوو بەشە ناوخۆییە بکەم، چونکە هەم لەبەشەکانی پێشوو باسیم کردووە، هەمیش لە هەندێك بەشی داهاتوو هەندێکی دیکە باسی دەکەمەوە، بەڵام مەبەستی سەرەکیم لێرە باسکردنی ئەیوب ئۆغڵووە.

ساڵی ١٩٤٤، بۆ بەشە ناوخۆییەکەمان دەستمان بە وەرگرتنی قوتابیان کردبوو. ڕۆژێك باب و کوڕێك لە ترابزۆنەوە هاتنە

لامان. باوکەکە دەیویست کوڕەکەی لای ئێمە ناوی تۆمار بکرێ. باوك و کوڕە بەسەر و سیما و هەڵسوکەوتیانەوە دیار بوو کەسانی تێگەیشتوو و ڕۆشنبیرن. منیش ڕێزێکی زۆرم لێنان و بڕیارماندا کوڕەکەی لای خۆمان وەرگرین، لەبەر ئەوەی شوێنمان نەدەدا ئەو کەسانەی عەقڵمان نەیان بڕیبا، بۆ ئەوەش بەهانەمان بێ شوێنی بوو.

دەستم بە نووسینی زانیارییەکانی کوڕەکە کرد و لێم پرسی:

من: "ناوت چییە؟"

کوڕەکە: "سەلاحەدین".

من: "نازناوت؟"

کوڕەکە: "ئەیوب ئۆغلوو".

من: "ماشەڵا ناوێکی خۆشت هەیە، خەریکە دەبیتە سەلاحەدینی ئەیوبی".

کوڕەکە بە شەرمەوە پێکەنی، ئینجا باوکی هاتە نێوانمان و دەستی بە قسە کرد و ئەو گفتوگۆیەمان لە نێوان دروستبوو:

باوکەکە: "ئەی چۆن بەڕێزم، ئێمە لە نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبینە".

من: "ئاخر سەلاحەدینی ئەیوبی کوردە".

باوکەکە: "ئێمەش کوردین".

من: "ئەی چی دەکەن لە ترابزۆن؟"

باوکەکە: "یاڤووز سوڵتان سەلیم، کاتێك فەتحی کوردستانی کرد، ئێمە لە حەسەنکێف دەوڵەتێکی ئازاد و سەربەخۆی کوردیمان هەبوو، بەڵام کاتێك عوسمانییەکان هاتن هەموو شتێك سەر و بن بوو. بە فەرمانی سوڵتان ئێمە و هەزار خێزانی دیکەیان بۆ سەرخاك و گوند و ماڵە چۆلکراوەکانی ڕۆم لە ترابزۆن ڕاگواست".

مـــن: "گەر وا بێـــت دەبـــێ کـــورد زۆر بـــێ لە ترابـــزۆن، بەشێوەیەك دەبێ ئەو هەزار خێزانە ئێستا زۆر زیاتر بـووبن، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا ئەو خێزانانە دەزانن کوردن؟".

باوکەکە: "بەڵێ زۆربەیان دەزانن، بەشێکیشـیان بەهـۆی ژن و ژن خوازییەوە لەگەڵ نەتەوەی لاز، بنەچەی خۆیان بیرچۆتەوە و بـــوونەتە لاز، بەڵام ســـەرەڕای هەمـــوو ئەوانەش، لە ڕووی جەســتەیی و دابــونەریتی خــواردن و ماڵــدارییەوە کەلتووریــان لەگەڵ لاز لەیەك جیـاوازە. ئێمە وەکـو ماڵبـاتی ئەیـوب ئۆغلـوو یەکێکین لە کـۆنترین ماڵباتەکـانی ترابـزۆن، بەڵام سـەیرکە هـیچ شتێکمان بە لاز دەچـێ؟ کەچـی هەمـوو کەس وا دەزانـێ ئـێمە لازین".

دوای ئەو قســـانە، ئیـــدی بەدەســـت خـــۆم نەبـــوو کە هەڵسوکەوتێکی جیاوازم لەگەڵیان کرد و زۆر زیاتر بە دەمیانەوە چـووم. کاتێـك ئەوانـیش زانیـان مـن خەڵکـی مێـردینم، ئیـدی چـاوەڕێی هەنـدێك کـار ئاسـانییان لێـدەکردم. ئەو هاوشـاری و هاونەتەوەیی بوونە، لە ساڵانی دواتر تـا ئاسـتی خزمـایەتی نزیـك بـۆوە. سـەباحەدین ئەیـوب ئۆغلـوو، دکتـۆر جەمیـل جەمیـل ئۆغلـــووی زۆر خـــۆش دەویســـت. ڕۆژێـــك لە نـــۆرینگە پزیشکییەکەی جەمیـل لە کـادیکۆی، مامۆسـتا ئەیـوب ئۆغلـووم بینی. بەسەرهاتەکەم بۆ ئەویش گێڕاوە. پێکەنی و بەسەرهاتەکەی پشت ڕاست کردەوە و گوتی: "دکتۆر جەمیل جەمیـل ئۆغلـووم وەك ڕۆڵەی خۆم خۆش دەوێ، بۆیە، خوێنم بۆی دەجوڵێ".

کاك عومەر دیاربەکری، کوڕی جەمیل پاشا، کاتی خۆی بـۆ تراکیـــا ڕاگوێزرابـــوو، ئەوســـا ئەو لەگەڵ ئەوەی کوڕەکـــانی تەمەنیان گەورە ببوو، بەڵام دەرفەتی ئەوەی نەبووە سونەتیان بکا. بۆیە، سـاڵی ١٩٤٤ لە بەشـەناوخۆییەکەی مـن، جەمیـل و دکتـۆر

فاروق جەمیل ئۆغلووی برا گەورەی سونەت کران، ئەوسا من بوومە کریڤی کاك جەمیل، بۆیە، جەمیل بەردەوام لە حاڵ و ئەحواڵی من دەپرسیٚ و ڕێز و خۆشەویستی هەبوو بۆ من.

دکتۆر، دواتر لە نەخۆشخانەی زەینەب کامیل، وەکو پسپۆڕی ئافرەتان و لەدایك بوون، دامەزرا. بەڵام فەلەك زوو ئێمەی لەیەك کرد، بەوەش منی زۆر بەخۆیەوە پەرێشان کرد. چونکە دکتۆر جەمیل چووە پاریس و پێی گوتم، لە گەڕانەوە چیت بۆ بێنم برای کریڤیم؟ منیش وەك ئەوەی بزانم چیی بەسەر دێت، تەنیا گوتم: "تۆ بە سەلامەتی وەرەوە ئەوەندە بۆ من بەسە". بەڵام نەهاتەوە، چونکە لە پاریس لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا گیانی لەدەستدا و لە جێی دیاری، تابووتەکەیم بۆ هاتەوە. لە کاتی بەڕێکردنی تەرمەکەی، من و سەباحەدین ئەیوب ئۆغلوو و خانمە بەڕێزەکەی تا هێزمان تێدابوو بۆ ئەو کارەساتە دڵ تەزێنە گریاین.

ئاخ و هەزار داخ جەمیل، بەخوا لەبیرناکرێی برا.

**یوسرا**

تەباخی ساڵی ١٩٩١ بۆ من پڕ ئازارترین ساڵی ژیانم بوو. هەموو هاوینێك لە ئیستانبووڵەوە دەچوومەوە ستیلیلێی شوێنی باب و باپیرانم، ئەوساڵەش وەك پێشتریٚ گەڕامەوە لادێکەم. ئامانجم بوو لەو سەردانەم لەناو ماڵەکەی خۆم لە لادیٚ تۆزێك خۆم بدەمە بەر هەتاو و لە ڕووی دەروونییەوە ئارام ببمەوە و ئەو شێیەی بە درێژایی زستان لە ئیستانبووڵ چووبووە جەستەم، لە گەرمای گوندەکەمان بە تیشکی ڕۆژ لە جەستەمی دەرکەم. جگە لەوەی دەمویست لەگەڵ خزم و کەس و ناسیاوەکانمان لە نزیکەوە دانیشین و زیاتر فێری کەلتوور و دابونەریتیان ببم.

بەڵام، وەرن با بۆتان باسکەم پشووی ئەو ساڵەم چۆن لێ بووە ژەهری مار. ئەوکات نەك تەنیا لە لادێکەم، بەڵکو لە تەواوی ناوچەکە تیرۆرێکی نارەوای دەوڵەت دەستی پێ کردبوو، خەڵك و حکوومەت ڕوو بە ڕووی یەك وەستابوونەوە و بە چاوێکی دوژمنانە سەیری یەکدییان دەکرد. ئیدی مەسەلەکە ببووە (ئێمە و ئێوە). بۆ نموونە، گەر شەڕ و پێکدادانێك لە نێوان پەکەکە وهێزەکانی حکوومەتی تورکیا ڕووی دا با، خەڵك دەیپرسی: "چەند کەس لە ئێمە کوژراوە و چەند کەسیش لەوان؟". گەر لە پەکەکە ژمارەیەکی زۆر کوژرابا، تەواوی خەڵك تازیەیان دادەنا و خەفەتبار دەبوون، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانیان دادەخست و شیوەن دەگێڕدرا؛ بەڵام گەر لە هێزەکانی حکوومەت کوژراو هەبا، خەڵك دەیانکردە جەژن و خۆشی.

پێشمەرگەکانی[1] پەکەکە لە مانگی تەممووز بۆمبێکی کۆنترۆلکراویان لە گوندی هابیسە دانابۆوە، کە هەشت کیلۆمەتر لە لادێکەی ئێمە دوور بوو، لەبەر ئەوەی لەسەر هەمان ڕێگا خەلکی مەدەنیش بە ئۆتۆمبێل تێپەڕ دەبوون، بۆیە، پەکەکەش بۆمبی بە کۆنترۆلیشیان دانابوو. ڕێگای لادێکان خۆڵ بوو، بەڵام چەند دانەیەکیان نەبێت کە حکوومەت بەو دواییانە هەندێکی قیرتاو کردبوو. ئەنقەرە ئەو کارەی بۆ ئەوە نەکردبوو تا خەلکی ناوچەکە و ڕێبوارانی ئەو شەقامانە پشوویەك بدەن و ئیدی لە بری ڕێگای خۆڵ ڕێگای قیرتاوکراو بەکار بهێنن، بەڵکو لە ترسان ئەو کارەی کردبوو. تومەزە لەسەر ئەو ڕێگایە بۆمبی بە کۆنترۆڵ داندرابۆوە و شەڕڤانێکی پەکەکەش لەسەر چیا

---

[1] نووسەر لە چاپە تورکییەکەش بەهەمان شێوە نووسیویەتی پێشمەرگەکانی پەکەکە. (وەرگێڕ).

چاودێری ڕێگاکەی دەکرد. ئەو شەڕڤانە لەگەڵ هاتنی زیلێکی سەربازیی سوپای تورکیا بە کۆنترۆڵ بۆمبەکەی پێیاندا تەقاندبۆوە. ئۆتۆمبێلەکە ٢٨ سەربازی تێدابوو، دەم و دەست بیستیان مردن، هەشت سەربازەکەی دیکەش دوای ئەوەی بە سەختی بریندار دەبن، بە هەلیکۆپتەر دەگەیەنرێنە نەخۆشخانەیەکی دیاربەکر. بەپێی ئەو هەواڵەی دەگەیشتە بەر گوێمان چەندانی دیکەش لە ڕێگا و هەندێکیشیان لە نەخۆشخانە گیانیان لەدەستدابوو.

مشاوەرەیێکم لەگەڵ ویژدانی خۆم کرد، گەیشتمە ئەو بڕوایەی ئەو چالاکییانەی پەکەکە دەیکات، دژ بەو تیرۆرەی دەوڵەت گرتوویەتییەبەر، وەك وەڵامدانەوەیەکە، بۆیە، ئەوانەش کردەوەی تیرۆریستین. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ حکوومەت هێزی زیاتر دەناردە ناوچە کوردییەکان، ئەنقەرە، بە قەد ژمارەی دانیشتووانی ناوچە کوردییەکان، لە ژەندرمە و سەرباز و هێزی تایبەت و سەربازە ئەفریقییە بەکرێ گیراوەکانی هێنابووە ناوچەکە، جگە لە کوردە گوند پارێزە خۆ فرۆشەکان. باشە ئەی ئەو هەموو سوپا بە هێزەی تورکیا چی دەکا؟ بە دڵنیاییەوە تەنیا بۆ دەرخستنی هێز و توانای خۆیان ڕووداویان دروست دەکرد. بە تایبەتی ئەفسەرە پلە باڵاکانی سوپا. خەڵك ناڕازی بوون، دۆخی ئابووریشیان باش نەبوو، هیچ خزمەتگوزارییەکیش بۆ ئەو ناوچانە نەدەکرا، تەنیا هێزەکانی ئاسایش بەهێزدەکران. بۆ نموونە، لە ناوچە کوردییەکان خێزانێکی هەشت تا دە کەسی داهاتی ساڵانەی ١ -٢ ملیۆن لیرە بوو، لە کاتێکدا عەریفێکی سوپا مووچەی مانگێکی ٣ ملیۆن بوو، ئیدی ئەوەی دیکە بۆ ئێوە جێدەهێڵم کە جیاوازییەکە چۆن بووە.

ساڵی ١٩٨٠، کەتیبەیەکی کۆماندۆی سوپای تورکیا لە

ناوچەی بۆلۆوە هاتن. فەرماندەی کەتیبەکە پێی گوتم: "هەتیو چەقە چەق نەکەن، دەسەلاتەکانم ئەوەندە زۆرە، ئێستە دەتوانم بەو دار تووەوە هەڵتواسم و کەسیش نەتوانێ لێپێچینەوەم لەگەل بکات". بەرواری ١٠ی تەباخی ١٩٩١، هێزەکانی سوپا لە جزیرێ ئەوەی هاتبووە پێشیان ڕاست و چەپ گوللە بارانیان کردبوو. لەناو ئەوانەی گیانیان کوژرابوون، کچێك لەسەربان لەکاتی خەو لەناو جێگەکەی چەند گوللەیەکی بەردەکەوێت و بێ جوولە و لە قوولایی خەوی شیرین گیان دەسپێرێ؛ خوشك و برا بچووکەکانیشی برینداز بوون. ڕووداوەکە لە ناوچە کوردییەکان بووە هۆی دروستکردنی کاردانەوەیەك لەناخی خەلکەوە. وەکو پەرچەکرداری نارەزایەتی و پرۆتێستۆ، لە جزیرێ و سیلۆپی و شرناخ و نوسەیبین و لادێکەی ئێمە خەلك دەرگای دووکانەکانیان داخست. هێزەکانی سوپای تورکیا دەستیان بە جوولانەوە کرد و هەرچی دەرگا و قەپەنگی دووکانەکانی ئەو ناوچانە هەبوون، هەموویان شکاندن. بەلام، ئەمە وای کرد ڕق و قینەی خەلك زیاتر بێت. ئەوجارە خەلك دەستی بە ڕێپێوانی نارەزایەتی و خۆپیشاندان کرد. لە ١٣ تەباخی ١٩٩١ لە گوندەکەی ئێمە داوا کرا لەوێش ڕێپێوانێك بکرێ. هەرهێندەی نیەتێکی ئاوامان هێنا، هاکا زانیمان ئەوەندەیان سەرباز و ژەندرمە هێنان کە لە ژمارەی دانیشتووانی گوندەکەمان زۆر زیاتر بوون. لە مێردینەوە ڕائیدێك هات ناوی ڕەمەزان بوو، ئەو ئەفسەرە لە هێزی ژەندرمەی مێردین بەرپرسی بەشی لێکۆلینەوە بوو. یانی بە زمانی تورکی سەرۆکی ئەشکەنجەدان بوو. سەعات نۆی بەیانی، ژن و پیاو و گەورە و بچووك کۆبوونەوە و دەستیان بە

خۆپیشاندان کرد، ئەو ساتە پێویست بوو هەموو لایەك ببینی، کەس نەیزانی لەیەك کاتدا چەند هەزار فیشەك تەقێندرا، بەلای کەمەوە دە هەزار گوللە بەسەر ماڵەکەمدا هاویشتران.

پاشان، ڕائیدەکە داوای لە خەڵکەکە کرد بڵاوەی لێ بکەن، بەڵام کەس گوێی پێنەدا، ئەوجارە سوپا دەستیان بە دەستدرێژ کرد و تەقەیان بە سەر خۆپیشاندەراندا دەکرد. یوسرای تەمەن ٢٥ ساڵانی دایکی ٦ منداڵ، کە گەورەکەیان تەمەنی شەش ساڵ و بچووکەکەشیان شیرەخۆرە بوو، گوللەیەك بەر سینگی دەکەوێت و لە بڕبڕەی پشتی دەردەچێت و بڕبڕەی پشتی ورد و خاش کردبوو. بەپەلە گەیاندرایە نەخۆشخانەی مێردین، بەڵام نەتوانرا ڕزگار بکرێ و گیانی سپارد. ڕۆژی دواتر لە مێردینەوە تەرمەکەی گەڕاوە. دەستدرێژی کردنەکە سەعات ١٠ی بەیانی، واتە سەعاتێک دوای دەستپێکردنی خۆپیشاندانەکە کرابوو، لەناو سەدان خۆپیشاندەر یوسرا شەهید بوو، کچێکی گەنج و لاوێکیش بریندار بوون. لەگەڵ هاتنەوەی تەرمەکەی ماتەم و شین باڵی بەسەر لادێکەماندا کێشا، بەسەدان ئافرەت لە ماڵی یوسرا کۆبوونەوە. کاتی خۆی لە ئاهەنگی بووکگواستنەوە ئافرەتانی لادێ کە دەچوونە ماڵی زاوا هەلهەلەیان لێدەدا، بەڵام ئێستا ئەو هەلهەلە بۆ تەرمی شەهیدان لێدەدرێ.

کوڕ و پیاوانی گوند چوونە سەرقەبران، بەڵام فەوزی ئاسلانی سەرۆکی پێشووی شارەوانی، بە بەهانەی هەندێك کاروباری فەرمییەوە گوندی جێ هێشت؛ بۆیە، هەموو لایەك ڕق و قینیان بەرامبەری دروستبوو. منیش بە گوڵە سوور و زەردەکانی باخچەی ماڵەکەم دەستە گوڵێکم دروست کرد و بە گەڵا سەوزەکانیش پێچامەوە. ڕەنگی گوڵەکان ئاوا بوو کە

حکوومەت و دەزگا فەرمییەکان خورشتیان پێی دەگرت. ئینجا منیش لەگەڵ چەندانی دیکە چوومە گۆڕستان. ڕێگای قەبرستان بەبەردەم ماڵی یوسرا تێدەپەڕی، بۆیە گوڵەکانم لە ماڵی ئەوان دانا، کاتێك ئافرەتەکان من و ڕەنگی گوڵەکانی دەستیان بینیم، هەموو بەیەك دەنگ و بە خرۆشەوە دەستیان بە هەلهەلە لێدان کرد و ماڵەکەیان کردە ماڵی بووك و زاوا.

سەر قەبران دونیایەکی دیکە بوو، هەندێکیان گۆڕیان هەڵدەکەند و هەندێکیشیان مات و مەلوول دانیشتبوون، ڕق و قین بەسەر هەمووماندا زاڵ بوو. منیش بە تەنیا چووم لە سووچێك دانیشتم. زۆری پێنەچوو فەرحان مەتەی باوکی یوسرا و مەمۆی کوڕە پێنج ساڵانەکەی یوسرا هاتنە لام و دانیشتن؛ مەمۆ زوو زوو دەیگوتە باپیری: "کالۆ ئەوە گۆڕی کێیە؟". باپیریشی دەیگوت: "ئەوە گۆڕی سەربازێکە".

دوای تەواو بوونی هەڵکەندنی گۆڕەکە، تەرمی یوسرایان لەناو سەدان گوڵی ڕەنگاوڕەنگ هێنا. کاتێك مەمۆ زانی دایکی مردووە و ئەوەی دەنێژرێ تەرمی دایکییەتی، ئەویش بەو تەمەنە بچووکەیەوە ڕق و قینی خۆی پێ نەشاردراوە و ئەوەی بەزاری داهات گوتی.

دەڵێم، گەر یەکێك گیانی خۆی لەسەر دانابێ و بڵێ: "باشە حکوومەت و سەربازینە، یاسا گەر ئەوە بێت کە یەکێك، بە خۆپیشاندان، لێی لادا، ئەرێ سزاکەی لە سێدارە دانە؟ ئێوە بە ڕۆژی ڕووناك لەسەر شەقام خەڵك گوللەباران دەکەن و هاوولاتی دەکوژن؟ باشە زانیمان ئێوە تیرۆرستێکی فەرمینە، بەلام ئەی ئەو هەموو دادوەر و داواکارە گشتییەی دەوڵەت لە

کوێن و بۆچی نقەیان لێوە نایەت؟". ماوەیەك دواتر، لە نوسەیبین ئەو پرسیارەم لەچەند دادوەرێك پرسی، ئەوانیش ئاوا وەڵامیان دامەوە: "نەکەی کاکە گیان، وەڵڵا کارێکی ئاوا بکەین هێزە ئەمنییەکان ئێمەش گوللەباران دەکەن، چونکە ئێمەش وەکو خەڵك، جگە لە ئاپۆچیەکان، سڵ لە هێزە ئەمنییەکان دەکەینەوە و لێیان دەترسێین".

## محەمەد ئەمین بۆزئارسلان

محەمەد ئەمین بۆزئارسلان، لە ناوچە کوردییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا، بە موفتیی ناوچەی کولپی دیاربەکر دەناسرێت. ساڵی ١٩٥٨ لە دیاربەکر بووم و لە ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد) دەمنووسی. ئەو ڕۆژنامەی ڕۆژەڤی لە تورکیا دروست دەکرد. ئەوکات ڕۆژانە پەنجا دانە لە ڕۆژنامەی (هوریەت) دەهاتە ئەو شارە. نرخی هەر دانەیەکیش پازدە قروش بوو. لەو ژمارەیەی دەشهات چەند دانەیەکی لێ دەگەڕاوە و نەدەفرۆشرا، لە کاتێکدا چاپێکی ڕەنگاوڕەنگی جوانیشی هەبوو.

ئێمە چوار لاپەڕەکەی ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد)مان بە دەست دادەنا. لەگەڵ ئەوە ستاندارتی دوو لاپەڕەی کۆتایی ڕۆژنامەکە نەدەگۆڕدرا. کە خشتەی شەمەندەفەر و فڕۆکە و هەندێك ڕیکلامی فەرمی بوون. لە دوو لاپەڕەی ناوەوەش شتێکی ئاوا نەبوو، بەڵام لە گۆشەی لاپەڕەی دووەم، تەنزە وتارێکی من هەبوو. ناونیشانی ئەو وتارە تەنزەیەشم جێگربوو، وەك ناوی ڕۆژنامەکە، کە بیرۆکەکەیم لەوەوە وەرگرتبوو. ڕۆژنامەکە ناوی (ئیلەری یورد) بوو، واتا (نیشتمانێکی پێشکەوتوو). منیش بە

حەنەك كردن بە نیشتمان، بێگومان بۆ تەواوی تورکیا، ناوی گۆشەکەم کردبووە (چ نیشتمانێکی پێشکەوتووە؟!). ڕۆژنامەکە تەنیا لەبەر ئەو وتارە تەنز ئامێزە، ڕۆژانە هەزار دانەی بە بیست و پێنج قروش لێ دەفرۆشرا. هەندێك ڕۆژ داوای چاپی دووەمیشی دەکرا. عەبدولڕەحمان دۆلاکی خوالێخۆشبوو، خاوەنی ڕۆژنامەکە بوو. کاتێك دەیانگوت چاپی دووەمیش بکرێت، عەبدولڕەحمان یان دەیگوت کاغەز نەماوە، یانیش مەرەکەب. زۆربەی تێچووەکانی ڕۆژنامەکە من و جانیب یڵدرم لە ئەستۆمان گرتبوو. کاك عەبدولڕەحمانیش بە وردی ئاگای لەوە دەبوو، ئەو لاپەڕەی وتارەکەی منی تێدایە، بەجوانی چاپ بکرێ و لە خوێندنەوە هیچ کێشەیەکی چاپی نەبێت. بەڵام لاپەڕەکانی دیکەی بەشێوەیەك پشتگوێ دەخست، هەندێك ڕۆژ هەندێك لاپەڕە لە خراپیان سپی سپی وەك ئەوەی هیچیان لەسەر چاپ نەکرابێ دەردەچوون. ڕۆژێك لێم پرسی: "ئەو ڕۆژنامەیە بۆ ئاوا چاپ دەکەی؟". عەبدولڕەحمان لە وەڵامدا گوتی: "کاك عەنتەر مشك هەندێك پارچە لاستیکی ڕۆڵەی چاپخانەکەیان خواردووە کە لاپەڕەکانی دیکەی پێ چاپ دەکرێ". منیش دەچووم ڕاستەوخۆ ڕۆڵەیەکی تازەم دەکڕی.

زۆربەی زۆری وتارەکانم لەلایەن داواکاری گشتییەوە دۆسیەی لەسەر کراوەتەوە. دەفتەرێکی ڕۆژ ژمێرم هەبوو. هەموو پارێزەرە باشەکانی دیاربەکر، بۆ بەرگری کردن لە دۆسیەکەم لە ڕۆژی دادگاییەکانم ئامادەی دانیشتنەکان دەبوون. ڕۆژێك، هاوڕێی خۆشەویستم شەوکەت بەیسان ئۆغڵو، سەیری دەفتەرەکەی کردم و گوتی: "بەشەرەفم کاك مووسا بێ ناموسم گەر هەفتەیەك ناوم ببێتە مووسا عەنتەر و لە ترسان نەمرم. ڕاستە دەفتەرەکانی ئێمەش پڕە لە بەرواری دادگا، بەڵام هەمووی هی

تۆمەتبار و تاوانباری دیکەن، لەسەر ئەوە پارەش وەردەگرین. بەڵام سەیری دەفتەرەکەی تۆ دەکەم تۆمەتبار تۆی و کەچی پارەش وەرناگری، سەرەڕای ئەوە پارەش دەدەی. ئەوە چ کارێکە ئەوە چ فیداکارییەکە، وەڵڵا برا عەقڵی ئێمە توانای خوێندنەوەی عەقڵی تۆی نییە".

نامەوێ باسی ڕووداوی جیا جیا بکەم و لە ناونیشانی بەشەکە دەرچم، چونکە گەر وابێت زۆر درێژ دەبێتەوە. بۆیە، بابێینەوە سەر پرسی کاك محەمەد ئەمین.

لەو بێنەوبەردانەی لە سەرەوە باسم کردن، ڕۆژێك گەنجێکی کوردی وردەڵەی خوێنگەرمی زرنگ هاتە لام، ئەو سمێڵێکی باریکی قەترانیی هەبوو، کەسێکی ڕوو خۆش و شیرین بوو. خۆی پێ ناساندم: "من محەمەد ئەمین بۆزئارسلانم، موفتی ناوچەی کولپم". بەر لەوەی بێتەلام گوێم لە ناوی ببوو و کارەکانیم لە دوورەوە ستایش کردبوو. بەڵام چیتان لێ بشارمەوە، چونکە کە دەڵێن موفتی بەلای من و زۆربەمانەوە چاوەڕێی کەسێکی ڕیش درێژی سەر سپی حاجیماڵی خوا دەکەین، بۆیە، چاوەڕوانم نەدەکرد محەمەد ئەمین خاوەنی ئەو سەر و شکلە بێت.

هەر زوو چووە دڵمەوە. دەستمان بە چا خواردنەوە کرد. هەندێك شیعر و نووسینی خۆی پیشاندام کە بە تورکی نووسیبووی. کە خوێندمەوە هەستم بە جوان نووسییەکەی کرد. بە پشت بەستن بەو پێشبینییەی ئەو قەڵەمە دەتوانێ شتی جوانتریش بنووسێت، گوتم: "زمانم گۆ ناکات پێت بڵێم موفتی، بەڵام دەمەوێ بڵێم گەنجێکی بە قیمەتی کورد. دەمەوێ ئەوەت لێ نەشارمەوە کە ئێمەی کورد چەندی بە تورکی شیعر بنووسین، ناتوانین شاعیرانی تورك تێپەڕێنین. لە هەموو

ڕوویەکەوە ئێمەی کورد وەکو چینی دووەم و سێیەم سەیر دەکرێین، بۆیە، گەر بە زمانی شیرینی کوردیی خۆمان بنووسین، زۆر زیاتر جێی پەسەندی دەبێت. نامەوێ شەوق و زەوقی شیعر نووسینتان کەم بکەمەوە، لێ من زیاتر جەوهەرێکی میللی و زانستی لە ئێوەدا دەبینم. بۆیە، پێشنیازی من بۆ ئێوە لەمەودوا بۆچوونەکانی خۆتان بە کوردی بنووسن. لە کاتێکدا ئەوە بۆ ئێوە هیچ زەحمەتییەکی نییە، چونکە زمانی دایك و باوك و گەلەکەشت کوردییە".

بەو شێوەیەی باسمکرد، ساڵی ١٩٥٨، لەگەڵ کاك محەممەد لە دیاربەکر یەکدیمان ناسی. دواتریش بۆچوون و پێشنیازەکانی منی قبوولکرد، بۆیە، ئێستا زۆر سوپاس، محەممەد ئەمین بۆزئارسلان ئەستێرەیەکی گەشاوە و پارچەیەکی گرنگی کەلتوور و ئەدەبیاتی کوردییە. بەهۆی ئەو قسانەی بۆشم کرد، منیش هەستدەکەم بەشێك لەو سەرکەوتنانەی هەوڵی منیشی تێدایە، بۆیە شانازی بە بۆزئارسلانەوە دەکەم.

هەرچی بۆچوونی تورکەکانە لەسەر بۆزئارسلان، گوایە من بەو بۆچوونانەم ئەوم ژەهراوی کردووە. بۆیە، ئیدی ئەو زۆر نەهامەتیی هاتە ڕێگا و زۆریان پێ کرد، حکوومەتە فاشیستە یەك لە دوای یەکەکان وەك شەترەنج هەر ڕۆژەو ئەویان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگواستەوە، تا گەیشتە کش و مات. دواجار، وەکو موفتی بۆ ناوچەی قەزای شارکۆی ناودار بە شەڕابی سەر بە شاری تەکیرداغ گوازراوە. نیوەی زیاتری دانیشتووانی قەزاکە شەڕاب خۆر بوون، بۆیە، موفتی لەوێ چیی پێدەکرا؟ بەهۆی نزیکی لە من و نووسینەکانییەوە دواجار لە موفتیەتیان خست، چونکە ئەوسا پەرتووکێکی بڵاوکردبۆوە بەناوی شێخ و ئاغاکان. ئەم پەرتووکە دوایینجار بووە هۆی

ئەوەی پیشەی موفتیاتی لە دەست بدات، لە دەوڵەتێکی وەکو تورکیا کە پێیوایە سیستەمێکی سێکۆلارییە و ئایین و کاروباری دەوڵەت تێکەڵ بەیەك ناکات.

بۆز ئارسلان، لەبەر ئەوەی دەرچووی بەشی عەرەبی بوو، زۆر شارەزای زمانی عەرەبی بوو. لە ئیستانبووڵ هاتە لام، لەگەڵ ئەوەی بەسەر و سیمایدا سەغڵەتی کار لەدەستدانەکەی پێوە دیار نەبوو، بەڵام دواجار خاوەن ماڵ و منداڵ بوو، بۆیە، پێویستی بە داهاتێك بوو، بۆ بەخێوکردن و گەورەکردنیان. هەمان کات گەنجێکی زۆر خوێنگەرم و کارکەر بوو. بە شێوەیەك لە ماڵەکەی خۆی لە ماوەیەکی کەم ڕۆژانە حەڤدە هەژدە دەمژمێر کاری دەکرد و تا توانی مەم و زین بۆ سەر پیتی لاتینی وەرگێڕێ. هەمان کات وێنەیەکی جوانی ئەلف و بێی کوردیشی کێشا. دوای تەواو بوونیشیان هەردوو بەرهەم زۆر سەرکەوتوو بوون، دواتر چاپکرا و زۆریشی لێ فرۆشرا. دواتر لە پەرتووکە سێ بەرگییەکەی مێژووی کوردی، شێخ ئەبول حەسان ئەزراحی، بەرگی دووەمی پەرتووکەکەی بەناوی (دەوڵەتی کوردی مەڕوانی) لە زمانی عەرەبییەوە کردە کوردی بە پیتی لاتینی. دواتر پەرتووکی مێژووی کورد (شەرەفنامە)ی لە زمانی عەرەبیڕا کردە تورکی.

محەمەد ئەمین بۆزئارسلان و منداڵەکانی بوونە ئامانجی فاشیستەکان. دوای ململانێیەکی زۆر. غەنی کوڕی کە بەقەد باوکی پیاوێکی بەڕێز بوو، شەهید کرا. دوای ئەو ڕووداوە محەمەد ئەمین لەوە تێگەیشت ئیدی هیچ کارێك بۆ ئەو لە تورکیا نەماوەتەوە و دەرفەتی هیچی نەماوە بیکا، بۆیە، خۆی و منداڵەکانی ڕوویان لە سوید کرد و لەوێ بوونە پەنابەر. بۆزئارسلان، لەوێش، لە خزمەتی کورد و کوردستان و

ئەدەبیاتەکەی نەکەوت. بۆیە، گۆڤاری نەتەوەیی مێژوویی (ژین)ی کۆکردەوە و لە پەرتووکێکی پێنج بەرگی بە پیتی لاتینی بۆ زمانی تورکی و کوردیی وەرگێڕا و بڵاویکردەوە. دواتریش، گۆڤاری (هاوار)ی کۆکردەوە و تەرجومەی کرد، کە لە ساڵی ١٩٣٠ لە شام، لەلایەن گەورە نووسەرانی کورد کامەران بەدرخان و جەلادەت بەدرخان و جگەرخوێن و عوسمان سەبری و قەدری جان دەردەچوو. ئینجا ئەوانیشی بۆسەر پیتی لاتینیی زمانی کوردی تەرجوومەکرد و کردییە دیاریەك بۆ گەنجانی کوردی نەوەی تازە.

ساڵی ١٩٧١ لەگەڵ محەمەد ئەمین بۆزئارسلان لە دادگای دەسەڵاتی کارگێڕی، لەناکاو دوای دەستگیر کردنمان، دادگایی کراین، ئەو زۆر لە من گەنجتر بوو. بۆیە، هیواخوازم تەمەن درێژ بێ، تا بە پێنووسە گرنگ و سەنگینەکەی خزمەتێکی زیاتری گەلی کورد و ئەدەبیاتەکەی بکات.

### فالیح ڕفقی ئەتای

ساڵانی چلەکان، لە ناوچەی فەنەر یۆل، لە کۆشکی موراد پاشای بەدرخانی دادەنیشتم. تازە چووبوومە ناو ژیانی هاوسەرییەوە، عەنتەری کوڕە گەورەم تەمەنی سێ ساڵ و ڕەخشانی کچیشم یەك ساڵان بوو. ئەو کۆشکە ناوازە جوانەی ڕاغب پاشا، کە دوو حەوزی تێدابوو و ئەوڕۆ لە دەستی دەوڵەمەندەکانی ئەدەنەیە؛ ئەوسا یانەی بەلەمی مەڕمەڕە بوو، بەڕێوەبەرەکەشی فالیح ڕفقی ئەتای بوو. ڕۆژانی چوارشەممە ئەو شوێنە بۆ سەردانی خێزانی کراوەبوو، ئێمەش هەفتانە بە ماڵباتی دەچووینە ئەوێ. هیچ خۆشیم بە فالیح ڕفقی نەدەهات، بەڵام کابرا پارچەیەکی زیندووی مێژووی سەردەمانێك بوو. ئەو لە

جەمال پاشاوە بگرە، تا مستەفا کەمال ئەتاتورکی بینیبوو. لە یانەکەی زوو زوو سەردانی مێزی میوانەکانی دەکرد، زۆربەی کاتیش بێ پسانەوە سەردانی مێزەکەی ئێمەی دەکرد. زۆربەی کاتیش لامان دادەنیشت و بە زەوق و کەیفەوە دۆندرمەی دەخوارد و باسی بەسەرهات و بۆچوونەکانی خۆی دەکرد. من لەناو ئەو بەسەرهات و قسانەی فالیح ڕفقی سێ دانەیانی دەگێڕمەوە، کە هەم من پێمخۆشبوو، هەمیش لەو باوەڕەدام ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی خوێنەرانم بیری لێ بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەی من وەکو ئەو بە خۆشی ناتوانم بیگێڕمەوە، بەڵام ئەوەندەی لە هۆشم ماوە لێرە بۆتانی دەنووسمەوە.

ئێستاش با لە زاری فالیح ڕفقییەوە گوێمان لە بەسەرهاتەکانی بێ:

"ڕۆژێك لە یانەی (بویوك ئەدا – دوورگەی گەورە) بووین. باڵیۆزی ئینگلتەراش لەوێ بوو. ماوەیەك دوای دانیشتنی، باڵیۆز چووە دەرەوە و بە کەلەجانیشەوە بانگهێشتی منی کرد. ئینجا دار سنەوبەرەکانی دوورگەکەی پێ پیشاندام و گوتی: فالیح سەیرکە، ئەو دارسنەوبەرانە دەبینی؟ گوتم: بەڵێ. لێیپرسیم چی دەبینی؟ ئینجا سەیری ئەو ماڵە تورکانە بکە. پرسیم ئێ چی بووە؟ ئەویش گوتی: گەر سەرنج بدەی سەرجەم دارەکان ڕوویان لە دەریایە، بەڵام خانووی تورکەکان جگە لەوانەی ڕیزی پێشەوە، هیچ یەکێکی دیکەیان دەریا نابینن، واتا ئەو دارانە لە ئێوەی تورك زۆر عاقڵترن. ڕۆژێکی دیکە هەمان باڵیۆز چیرۆکێکی ئاوای بۆ گێڕامەوە: کاك فالیح من زۆر حەز بە ڕاوە ماسی دەکەم، ڕۆژێك چوومە ناو دەریای مەڕمەڕە بۆ ڕاوە ماسی، هاکا بینیم پۆلیسی دەریا چوار دەوریان گرتم و بە شەق و شولاقان منیان بردە بنکەی سەربازی گۆلجوك، توومەزە ئەو

شوێنەی من چووبووم ڕاوە ماسی لێ بکەم، لە ڕووی یاساییەوە جێیەکی قەدەغەکراو بووە. ساڵی ١٩٤٤ بوو و دووەمین جەنگی جیهانی بەردەوام بوو. ئەو پۆلیسانەی دەستگیریان کردبووم، پێگوتن: من باڵیۆزم و وڵاتەکەم دۆستی ئێوەیە، بەڵام قسەکانم پارەی نەکرد. تا بە هەزار حاڵ لە ڕێگەی نامە و تەلەگرافەکانی ئەنقەرەوە ئازاد کرام. بۆیە، کاك فالیح ئێوە لە ناوچە ئاوییە قەدەغەکراوەکان چیتان هەیە تا لە ئەوروپییەکانی بشارنەوە؟ لە کاتێکدا کەشتییە نابووتەکانتان بەر لەوەی بێتە لای ئێوە ئەو دەمەی لە کارگەکانی ئەوروپا دروستدەکرێن پلانی چۆنیەتی کارکردنی لەبەردەستمانە. دەشتوانن بە دزیی ئێمە شتێك بکەن، بەڵام ئەوسا ناچارن ئەو کەشتییە کۆنە ئەڵمانیانەی ئێوە پێیدەڵێن کەشتی (یاڤووز) بەکار بهێنن. لە دۆخێکیش وەهاشدا، من دەبێ ڕاپۆرت بنووسم بۆ هێزی دەریایی بەریتانیا و پێیانبڵێم ئاگادار بن، تورك دەیەوێت کەشتی (یاڤووز) نۆژەن بکاتەوە، ئەمەش مایەی پێکەنینە بۆ هەموو دونیا؟".

فالیح ڕفقی، ڕۆژێکی دیکە یادەوەرییەکی خۆی لەگەڵ ئەتاتورك بەو شێوەیەی خوارەوە بۆ گێڕامەوە:

"ساڵی ١٩٢٥، ڕۆژێك ئەتاتورك بانگهێشتی کردم و فەرمانی پێ کردم: فالیح تۆ فەرەنسی دەزانی، بۆیە، لە پیتە لاتینییەکان ئەلف و بێیەکم بۆ دروست بکە و بۆ ئەوەش تەنیا پێنج ڕۆژت لەبەر دەستە. وەڵاممداوە: پاشام چۆن لە ماوەی پێنج ڕۆژدا ئەلف و بێ دروستبکەم؟ ئەتاتورك، کە ئەوسا پێیاندەگوت مستەفا کەمال پاشا، بە تووڕەییەوە گوتی: دەتوانی و پێت دەکرێ، بەڵام ئاگاداربە گەلێکی جاهیلمان هەیە، بۆیە، تا پێت دەکرێ پیتەکان کەم بن و تەواو! منیش بە ناچاری لە

چوارشەممەوە تا دووشەممە ئەو ئەلف و بێیەی ئێستام دروستکرد. بۆ ئەوەی پیتەکان کەم دەرچێت پیتی بزوێن و نەبزوێنم دانا. هەندێك پیتی وەك ( o-ö'yü-İ-ı, u-ü ئی، ئ، یو، ئو، ئۆ، ئۆ)م لە خۆمەوە بۆ زیاد کرد. ئینجا، چەند پیتێکی وەك (Q-W)[1] دەرهێنا. بەو شێوەیە کەمترین ئەلف و بێی لاتینیم لە جیهان دروستکرد. دوای تەواوکردنیشی، ئەتاتورك زۆری بە دڵ بوو".

بەسەرهاتێکی دیکەی نێوان فالیح ڕفقی و یەعقوب قەرەئۆسمان ئۆغلووم لایە، کە کاتی خۆی کاك یەعقووب لە ساڵۆنێکی میوانخانەی دیاربەکر پاڵاسی گەشتیاری بۆ ئێمەی گێڕابۆوە. ئەوکات، واتا ساڵی ١٩٥٤، من بەڕێوەبەری ئەوێ بووم. زۆر میوانی جیاواز و بەرپرسی باڵا سەردانیان دەکردین، لە ناویاندا ستیڤینسۆنی سەرۆکی ئەمریکا و مستەر دۆری باڵیۆزی ئینگیلتەرە و چەندان بەرپرسی دیکەی بیانی. لەناو سیاسەتمەدارە تورکەکانیش جەلال بەیار و عەدنان مەندەرەس و فوئاد کۆپرولوو و سەمەد ئاغا ئۆغلوو و یەعقوب قەدری قەرەئۆسمان ئۆغلوو. لەناو ئەو سیاسەتمەدارە تورکانەدا لە هەموویان زیاتر کاك یەعقوبم خۆش دەویست. نازانم بۆ، بەڵام ئەوسا ئەومان وەکو دۆستێکی کورد دەبینی، کابرا خۆشی کەسێکی خۆ دەرخەر نەبوو، لەبەر ئەوەی خولیای نووسین و شیعریشی هەبوو،

---

[1] تا ئێستاش هەر یەکێك لە پیتەکانی (Q-W-X) لە ئەلف و بێی تورکیدا نینە و لە تورکیاش بە قەدەغەکراوی ماونەتەوە. (وەرگێڕ).

بۆیە، کەسێك بوو دەرەوە و ناوەوەی وەك یەك. لەو باوەڕەدام گەر ئەو کابرایە لە تورکیا نەبوایە، زۆر پیاوێکی چاکتری لێ دەردەچوو.

ڕۆژێك لە سالۆنی میونخانەکە بەسەرهاتێکی ئاوای بۆ گێڕاینەوە:

"لە سالانی سیەکان، بە فەرمانی ئەتاتورك، من و فالیح ڕفقی و حەمدوللا سوبحی تانری ئۆڤەر، بەرپرسیاریەتی ئەوەمان پێبەخشرا تا زمانی تورکی سادە و ئاسان بکەینەوە. ئێمەش دەستمان بەکار کرد. ڕۆژێك فالیح ڕفقی فەرمانێکی ئەتاتورکی بۆ هێناین، کە بەو شێوەیە بوو: ئەتاتورك دەفەرموێ ئەو وشە تورکیانەی بە پیتی (D) کۆتاییان دێت، با وا بکرێت بە پیتی (T) کۆتاییان بێت. ئەو وشانەشی بە پیتی (B) کۆتاییان دێت، بکرێنە (P). من و حەمدوللا سوبحی ئیعتیرازمان لەو بڕیارە گرت و گوتمان چۆن شتی وا دەبێت، بەلام لەبەر ئەوەی فالیح وەرگری فەرمانەکە بوو، بۆیە گوتی، وەللا فەرمانەکە بەو شێوەیەیە، بۆیە گەر پێتان خۆشە، ئێوە خۆتان پێیبلێن. منیش گوتم باشە. ئیدی ئێوارە لەسەر مێزی نانخواردن بە ئەتاتورکم گوت: جەنابی پاشام، فالیح باسی شتێکی ئاوای کردووە، چۆن وا دەبێت؟ ئەتاتورکیش گوتی: یەعقوب بۆ نابێت؟ وەلامم داوە: پاشام، بۆ نموونە ناوی من لە تەورات و ئینجیل و قورئان (یەعقوب)ە. واتە ناوەکەم نێونەتەوەییە، ناوێکی ئاواش چۆن دەشێ بگۆڕدرێ بۆ (یەعقوپ)؟. ئەتاتورك لە وەلامدا گوتی: جا یەعقوب کێ پێی گوتی ناوێکی ئاوا نێونەتەوەیی هەلْبژێری!. دوای ئەو قسانە زانیم فەرمانەکەی ئەتاتورك بڕیارە. بۆیە، وازمان لە ئیعتیرازەکەمان هێنا. هۆکاری ئەو گۆڕانکارییەش بۆ ئەوەبوو

کە ئەتاتورك لە بنزاری خۆیان لە ناوچەی (سەلەنیك و تراکیا) ئەوان زۆربەی وشەکان، لە ڕووی دەربڕینی دەنگەوە، بە پیتی (P-T) کۆتایی پێ دەهێنن. بەو شێوەیە ئەو تورکییەی ئەوڕۆمان قسەی پێ دەکەین لەسەر شێوازی بنزاری تراکیایە".

## خالیدە ئەدیب و ئەحمەد عەدنان ئادڤار

ڕەنگە بلێن، مووسا تۆ لە کوێ و خالیدە ئەدیب و ئەحمەد عەدنان ئادڤار لەکوێ؟ بەڵام نابێ ئاوا بیر بکەینەوە. چونکە هەندێکجار پیاوێکی هەژار خەزێنەیەك دەبینێتەوە، یان لە یانەسیبێك پارەیەکی زۆر قازانج دەکا و لە پڕێك دەبێتە کوڕێك. منیش بە هەمان شێوە. لە ژیانی وەکو منداڵێکی ئەشکەوتی، زۆرانم ناسی و دەوڵەمەند بووم، چونکە دەوڵەمەند بوون تەنیا بە پارە نییە!. بۆیە، ئەوەی لە خوارەوە لەسەر ماڵباتی ئادڤارییەکان بۆتان باسدەکەم، بۆ من خەزێنەیەکی زۆر پڕ بەها بوو.

خالیدە ئەدیب، یەهوودییەکی هەڵگەڕاوەی ناوچەی سەلەنیکە و کچی کاك ئەدیبە. سەردەمانێك، کۆشکەکانی ناو دارستانەکانی ناوچەی ئوسکوداری ئیستانبووڵ، هی کاك ئەدیب بوون. دواتر هەرچۆنێك بووبێ، ئەو موڵکانە بوونەتە هی نووری دەمیرئاغی کورد. نووری دەمیرئاغ سەرۆکی پارتی گەل بوو. لەوێ ئەوەندە بەرخی سەردەبڕی و داوەت و داوەتکاریی پێ دەکرد، ناوی پارتەکەی ببووە، (پارتی بەرخەکان). ئێستا پێموانییە هیچ کەسێك لەناو کۆشکەکانی دابنیشێت، بەڵام هەندێك کات کە ڕێم بەوێ دەکەوێ بەردەوام لە دوورەوە چاوێك لە شوێنەکەی دەکەم.

کاك ئەدیب لە تەمەنی گەنجیدا کۆچی دوایی کردبوو،

دایکە چەرکەسەکەی خالیدە، مێردی بە عەلی شامیل پاشای کوڕی بەدرخان پاشای فەرماندەی گەرووی بۆغازی ئیستانبوول کردبووەوە. لای بەردخانییەکان لەماڵەوە بە کوردی قسە دەکرا. بەو شێوەیە خالیدە ئەدیب خان لەناو کوردان گەورە ببوو. بۆیە، دەیگوت ڕۆمانەکانی زەینۆ و کوڕەکانی زەینۆی لەژێر ئەو کاریگەرییە نووسیووە. نامەوێ ژیانی خالیدە ئەدیب و عەدنان ئەدڤار بنووسمەوە، بەڵام دەمەوێ ئەوەندەش بڵێم، ئەدڤارییەکان لە جەنگی ڕووبەڕووبوونەوەی میللی تورکیا هیچ کات ئەتاتورکیان، بۆ ساتێکیش بێ، بە تەنیا جێ نەهێشت، بەڵام دواتر ئەو ماڵباتە کەوتنە بەر ڕق و قینی ئەتاتورك، بە شێوەیەك بەر لەوەی لە تورکیا دەریان بکات، خەریك بووە سەریان بپەڕێنێت. بۆیە، چەندان ساڵ ڕاگوێزران بۆ ژیانێکی ناچاری لە هیندستان و میسر و ئەمریکا. دوای مردنی ئەتاتورکیش وەك ئەوەی ئەوانە تاونبار بن و قەباحەتێکی گەورەیان کردبێت، بڕیاری لێخۆشبوونیان بۆ دەرچوو، ئینجا توانییان بگەڕێنەوە تورکیا.

لە بەدرخانییەکانی وەك کاك عوبێدی دکتۆری ددان و دایکی دووەمی خالیدە خانم، واتا خانمی گەورە، بیستبووم، کە منیش ببمە زاوایان. دایکی عوبێدی، کە لەناو ماڵبات پێیاندەگوت خانمی گەورە، لە شەریفەکانی مەککە بوو، یانی مەتکی گەورەی مەلیك حوسێنی پادشای ئوردن بوو. بەدرخان پاشا کاتێك ڕاگوێزرابوو، خانمی گەورەی بۆ کوڕەکەی هێنابوو، بۆیە، بەو شێوەیە لە قاسم کوفرەڤی و ئەدڤارییەکان نزیك بوومەوە، دوای تێکەڵ بوونیشم لەگەڵیان ئەوانیش منیان خۆشویست. بۆیە، هەر بەو هەستانەوە، قاسم کوفرەڤی، کاتێك قوتابی کۆلێژی ئەدەبیات بوو، ببووە هاوکارێکی ئەدڤارییەکان. دواجار کوفرەڤی دکتۆراکەی لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی

سازکرد. لە ڕۆژی گفتوگۆی نامەکەی منیش داوەت کرابووم. لەوێ خاتوو خالیدە بە پێکەنینەوە سەیرێکی منی کرد و گوتی: بۆ ئەندامانی تاقیکردنەوە: "بەڕێزینە لە لقی تەریقەتی نەقشبەندی، کوفرەڤییەکان خاوەن دەسەڵاتن، لێرە بەرپرسیارییەتەکەمان لەلایەن کاك قاسمەوە سوودی لێ وەرگیراوە". بەو شێوەیە قاسم کوفرەڤی بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێنا.

ماوەیەك بوو، حکوومەت بڕیاری دابوو ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام بۆ تورکی وەربگێڕدرێت. سەرۆکی گرووپی وەرگێڕانەکە دکتۆر عەدنان ئەدڤاری بوو. حکوومەتی تورکیاش لەناو ئینیسکلۆپیدیاکە لەسەر پرسی کورد زۆر هەستیار بوو، بۆیە، داوای کردبوو یان ئەو بەشە پاز بدەن، یانیش گۆڕانکاریی تێدا بکرێ، بەڵام عەدنان ئەدڤار و خالیدە ئەدڤار دژی ئەو پێشنیازەی حکوومەت وەستابوونەوە و ئینیسکلۆپیدیای ئیسلامیان، بەبێ گۆڕانکاری، وەك خۆی وەرگێڕابوو. لەناو ئینیسکلۆپیدیاکە لە بەشی ٦٨ مین، باسی پرسی کورد بڵاو کرایەوە. کاك عەدنان زوو زوو بە خالیدە ئەدیبی دەگوت کچی کوردان. منیش ئەو ناوهێنانەم پێ خۆشبوو. لەکاتی داگیرکردنی ئیستانبوولیش لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، خالیدە ئەدیب لە مەیدانی سوڵتان ئەحمەد وتە بەناوبانگەکەی دەڵێ. ئەوسا هیچ ئافرەتێك نەبوو لەناو کۆمەڵگا لەبەردەم سەدان کەس بچێتە سەر سەکۆیەك و وتارێك بدات؛ لە هەمان کاتیش، فەرماندە ڕەوف ئۆڕبای، لە دەریای سپی تۆپێکی لە کەشتیی ئینگلیزی گرتبوو، لە ئەنجامدا کەشتییەکە لە ناوچەکە هەڵاتبوو. بۆیە، کاك عەدنان بە حەنەکەوە بە خالیدە خانی دەگوت: تۆ وتارێکی ئاگرینتدا و کاك ڕەوفیش تۆپێکی بە ئاگری هاوێشت، هەر بۆیە پەنجا ساڵە بۆ دواوە دەگەڕێینەوە.

ئەوان منداڵیان نەبوو، زۆر ژیانێکی ساکاریشیان بەسەردەبرد. ئەوسا سەردەمی جەنگی جیهانی بوو. هەموو شتێك بە كارتی خۆراكی دابەش دەكرا، ئەوان كاتیان بۆ وەرگرتنی ئەو خۆراكانەش نەبوو. شوێنی مانەوەیان لە من نزیك بوو، چونكە منیش لە ناوچەی لالەلی لە بەشەناوخۆیی فورات دەمامەوە. ئەو شوێنەی لێی دەمانەوە كۆشكێكی مێژوویی كۆن بوو، بۆیە، دەمتوانی زوو زوو بچمە لایان و كەموكوڕییەكانیانم بۆ جێبەجێ دەكردن. زۆرجار دار، ڕەژوو، شەكر، نان، چام بۆ دەبردن، یان بە هەندێك لە كارگوزارەكانی بەشی ناوخۆیی بۆم دەناردن. ماوەیەك تووشی ترسێكی زۆر ببوون و بەردەوام دەیانگوت دەكوژرێین. بۆیە، لەسەر داواكاری خالیدە خانم، من و چەند گەنجێكی كورد، شەوانە تا بەیانی لە چوار دەورەی ماڵەكەیان نۆبەتمان دەگرت. بیرم دێت هەریەك لە فایەق بوجاك و یاشار ئەلهاس و ئەحمەد گۆنجوو و قاسم كوفرەڤی و من بووین. دوای ماوەیەك كۆچی دوایی كرد، بۆیە، تەواوی زانكۆ مەراسیمێكی گەورەی تازیەیان بۆ دانا. خالیدە ئەدیب، ئەوكاتەی كاك عەدنان سەرۆكوەزیران بوو، وە تەواوی ئەو دیارییانەی لە ساڵانی بیستەكان لەلایەن گەورە بەرپرسانەوە بۆی هاتبوو وەك گۆچان و شاخی فیل و چەند كەلوپەلێكی دیكەی گرانبەها، هەمووی بە دیاری دایە من.

## خۆ هەڵكێشان

برادەرێكی كۆنم هەبوو، ناوی عەلی كەرەهان بوو. ئەو خەڵكی سیڤەرەك بوو، كوردێكی خاوێن و دڵسۆز بوو. گوندەكەیان ناوی (خانا ڕەش) بوو. (كەرە) واتا ڕەش و (هان) بە مانای خان دێت. بۆیە، كاتێك لە توركیا بڕیاری دانانی نازناو

دەرکرا، ماڵباتی کاك عەلی لەبەر ئەوە کاتی خۆی هەر پێیانگوترابوو ماڵباتی خانا ڕەش، بۆیە ئەوان بە پشتبەستن بەو بنەمایەی (کەرەهان) بە تورکی هەمان مانا کوردییەکە دەدات، ئەو نازناوەیان بۆ ماڵباتەکەیان هەڵبژارد، بەڵام کاك عەلی ڕەچەڵەکی خۆیانی تا فەرماندە کەرەهانی ئێرانی دەبردەوە. هەر بۆیەش زوو زوو بەسەر خۆیدا هەڵی دەگوت. نەبێتە درۆ، بەڵام خۆ هەڵکێشانەکەی زۆر بێ بنەمابوو. بۆ نموونە کاتێك بەیەکەوە لە زینـدان بـووین، زوو زوو چیرۆك و بەسەرهاتی خـۆی دەگێڕاوە و بەردەوامیش بەو ڕستەیە دەستی پێدەکرد و دەیگوت: "کاتێك من لە شەمزینان دادوەر بووم ...". با بشڵێین لەوێ دادوەر بووە، ئێ بەڵام بڵێی دادوەریی لە دادوەری شەمزینان بچووکتر هەبووبێ؟!.

هەندێکجار، بەشێك لە فەرماندە سەربازییەکان لە زیندانی حەربییە سەردانیان دەکردین. وتارێکی تەنز ئامێزی هەبوو لە هەموو شوێنێك دووبارەی دەکردەوە، ئەویش بە ئەزبەرکردن. لەبەر ئەوەی لە زیندانێکی سەربازی بووین، بۆیە، بنەمای سەرەکیی نوکتەکانی ئەویش بێگومان شتی سەربازین. بۆ نموونە زوو زوو دەیگوت: "ئێمەی کورد لە وڵاتانی بالکان و لیبیا و کەنداوی سوێس و بیابانەکانی سعودیە و قافقاسیا و بەرەنگاربوونەوەی میللی، جەنگاوین!". دوایە پرسیمانەوە، لە ماڵباتی عەلی جگە لە خۆی کەسێکی دیکە سەربازیشی نەکردووە. ئێمەش لەسەر ئەو قسانەی بەردەوام پێماندەگوت: "عەلی شەرمە تۆ بەردەوام مەدحی خۆت دەکەی". ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: "برا گیان گەر من بەشان و شەوکەتی خۆمدا

هەڵنەدەم، بۆ خەڵك برای بابمن تا مەدحی من بکەن؟". لەسەر ئەو وەڵامەی ئەو منیش ڕۆژێك بە وتەیەكی پێشینانی كوردی وەڵامم داوە، كە بەو شێوەیەبوو: "شەب و شەكر چوونە دیاربەكر. شەكر بێدەنگ لە شوێنی خۆی دانیشت. شەب هەستاوە و مەدحی خۆی كرد". مانای ئەو پەندە ئەوەیە كە شەكر لەبەر ئەوەی خۆی شیرینە، پێویستی بەوە نییە باسی خۆی بكا و بەشان و باڵی شیرینیەكەی هەڵبدات، بەڵام لەبەر ئەوەی شەب وانییە، ناچار دەبێ كارێكی وا بكا تا بڵێت من شیرینم.

پێموابێ عەلی كەرەهان تا ئێستاش لە ژیان ماوە، بۆیە، گەر هەڵەیەكم هەیە، دەتوانێ ڕەخنەم لێبگرێ. چونكە مەبەستم ئەوە نییە ڕەخنە لە كاك عەلیی برام بگرم، بەڵكو تەنیا بۆ خۆ هەڵكێشانێكی نا پێویست باسی ئەو چەند بەسەرهاتەم كرد.

### با بێینە سەر باسی خۆم

من نامەوێ لێرە بەرگری لە خۆم بكەم. چونكە ئەوەی نووسینەكانم دەخوێنێتەوە، یان ئەوانەی دەمناسن، دەزانن كەسێكی چۆنم. بەڵام منیش هەندێك جار، گەر كەمیش بێت، بەڵام ڕەخنەم لێدەگیرێت. بۆ نموونە لە مانگی یازدەی ساڵی ١٩٩١، گەنجێك لە ڕۆژنامەی (یەنی ئولكە) باسی لەوە كردبوو، خۆشی لەوە نایەت مووسا عەنتەر زوو زوو باسی ئەو ئەشكەنجانە دەكا كە لە زیندانەكان بینیویەتی. ئەو قوتابییە، ڕەنگە یان لە من نەگەیشتبێت، یان لەوەیە لەسەر حەق بێت، بەڵام هۆكاری ئەوەی تا نووسینی ئەو پەرتووكە گرنگیم بە

ڕەخنەی ئەو گەنجە داوە بۆ ئەو بنەمایە دەگەڕێتەوە:

لە بەرگــی یەکەمــی ئەو پەرتــووکە، ئەو کەســایەتییانەی باسمکردن، زۆربەیان کەسانی دیار و ناسراو بوون. ئێ ئەوسا کەسانی ناسراوی کوردستانیش، یان شێخ بوون، یان ئاغا و بەڕێــززادە. چــونکە کەســی ئاســایی بەدەگــمەن ناوبانگیــان پەیدادەکرد، بەڵام ئێستا سەردەم گۆڕاوە، چونکە عەبدوڵا ئاغاش ئێستا کەسێکی فەقیری گوندەکەی خۆیەتی. گەر قەدەغەش نەبوایە لێرە باسی ئاپۆشم دەکرد، بەڵام پەنا بەخوا دواتر لەسەر ئەویش دەنووسم و باسی دەکەم. بۆیە، ئەو ڕەخنەیەی بۆمن دێت بەو شێوەیەیە:

"بەڕێــز مووســا عەنــتەر یادەوەرییەکانــت بەردەوام لەگەڵ کەسانی ئەرستۆکرات بووە. یانی لەگەڵ کەسانی خانەدان. بۆیە، تۆش وەك شاعیرەکانی دەربار بەردەوام تەنیا باسی ئەوانت کردووە، چونکە پێناچێ هیچ یادەوەرییەکت لەگەڵ خەڵکی ئاسایی هەبووبێ".

منیش لە وەڵامدا دەڵێم، بە دڵنیایەوە، یادەوەریم لەگەڵ هەموو کەسێك هەیە، بەڵام لە بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکە مەبەستم نەبووە باسی پارێزگار و چەپەکان بکەم. لەگەڵ ئەوەی ئیسماعیل بێشکچیی مامۆستاشمان لەسەر ئەو پرسە ڕەخنەی لە من هەبوو. لێرەش دووبارەی دەکەمەوە، باس نەکردنی سەید ئەلچی ڕەحمەتی و زیا شەڕەفخان ئۆغلوو، لە بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکە، پەیوەندی بە پرسی ئایۆلۆژیی منەوە نییە، بەڵکو زیاتر مەبەستم ئەرکێکی ئەخلاقی بوو. لێرەوەش ڕایدەگەیەنم

لەو بەشانەی داهاتوو گەر بەسەرهاتەکان سادەش بن، بەڵام باسی بەشێك لە یادەوەرییەکانی خۆم لەگەڵ کەسانی سادە و ساکار و ئاسـایی گەلەکەم دەکەم. لەگەڵ ئەوەی یادەوەرییەکـانم لەگەڵ کەسـانی ناسـراو، سـەرنجی خـوێنەر زیـاتر بـۆ لای خـۆی ڕادەکێشێت، چونکە خەڵکێکـی زۆر ئەوان دەناسـن، لـێ ڕەنـگە بەسـەرهاتێکم لەگەڵ کەسـێکی خۆشەویسـتی گونـدەکەم، گەر باسەکە خۆش و سەمەرەش بێـت، بەڵام لەوەیە هەمـوو کەسـێك پێی سەرنج ڕاکێش نەبێت. بۆیە، مادەم داوای بەسەرهاتێکی ئـاوا دەکەن، لێرە باسی نموونەیەکتان بۆ دەکەم.

## شێخێ کوتێ

بەڕاستی شێخی کوتێ فەیلەسووفی ناو خەڵك بـوو. بەداخەوە ئەویش بە ئاگری کورد بوون سووتا و ناوی نەما. لەو بـاوەڕەدام ئەو جـوولە کۆمیـدییانەی لەودا هەبـوو، لە کەسـێکی دیـکەی گەلێکـی دیـکەی دونیـا هەبـوایە، لەسـەر ئاسـتی جیهـان دەبـووە کەسێکی ناوداری کۆمیدی. زۆرم خـۆش دەویسـت، کـاتێکیش لەلادێ بووم ساڵێك باخچەوانیی بۆ کـردم. هەم دۆسـت بـووین، هەمیش هەردووکمان ناومـان شـێخ مـووس بـوو. بەڵام بە منیـان دەگـوت شـێخا و بە ئەویشـیان دەگـوت شـێخێ. ئینجـا ناویـان کـردینە (شـەریك)، واتە هاوبەشـی کـار. کاتێـك دەگەڕامەوە لادێ، بـێ ئەو نـانم نەدەخـوارد. سـاڵەکیان، لەگەڵ خێـزانەکەم بەیەکەوە لە ئیستانبوولەوە چووینەوە گوند. لە ماڵی حەسەنی برام میـوان بـووین. ئەویـش لە بـاخچەکە خـوانێکی جـوانی بـۆ ڕازاندبووینەوە. چەندان جۆر گۆشت و پڵاو و بۆرەك و خاس و

ئاروو و جەرجیر و تووری ناو باخچەکەی خۆشمانی لێ کردبۆوە و دایناببوو. لەگەڵ چەندان سەوزەی جیاوازی تایبەت بە ناوچەکەی خۆمان. بۆیە، بە تۆبزی شێخێشمان هێنا سەر مێزی خۆمان. ئەو بەردەوام دەیگوت: "کاکە کەسێکی وەکو من چوزانێ خواردنی ئامادەکراو بخوا". لە گەڵ بیسمیلا، من و خێزانەکەم دەستمان بە خواردنی زەڵاتە کرد، بەڵام چاوێکمان هەر لەسەر شێخێ بوو. ئەویش سەیرێکی ئێمەی کرد و سەرێکی لە من نزیك کردەوە و گوتی: "مەعدەنی ژن و مێرد یەك ماددەیە". خێزانەکەم وەڵامی داوە: "بۆ شێخێ، من و عەنتەر بێ عەقڵین؟". ئەویش لە وەڵامی خێزانەکەم گوتی: "ما گەر بێعەقڵ نەبن، ئەو هەموو گۆشت و برنجە هەیە، چوونە ئەو گژوگیایە دەخۆن". خێزانەکەم گوتی: "شێخێ بەڵام لەناو ئەوانە ڤیتامین هەیە و دڵی مرۆڤ دەکاتەوە بۆ خواردن". شێخێ: "دە برۆن ئێوەش، لەناو ئەو سەوزانە هیچ گوێك نییە. جا ئێمە گەر ئەوانە بخۆین و دواتر دڵیشمان خواردن بخوازێت خۆ شتێك نییە بیخۆین. چونکە ئێمە نزا دەکەین برسی نەبین، نەك شتێك بخۆین تا دواتر دڵمان بۆ خواردنی دیکە بکاتەوە". تەبعەن قسەکانی شێخێ نە بۆمن و نە بۆ خێزانەکەشم لەبەر دڵان نەدەگیرا، چونکە ئەومان دەناسی، بۆیە خۆشماندەویست و لای ئێمە هونەرمەندێکی میللی بوو.

دوای ماوەیەك دیسان گەڕامەوە لادێ. ئەوسا هەواڵی چوونە سەرمانگ ببووە ڕۆژەڤێکی گرنگی ناوچەکە. شێخێ لێپرسیم: "مووسا بە ڕاستی پێمبڵێ ڕاستە ڕووس و ئەمریکییەکان چوونەتە سەر مانگ؟. قەینا گەر چووبنە سەر مانگیش، ئەی خوا لە کوێیە؟ چونکە گەر وابێت ڕۆژێك بیانەوێت خواش دەستگیر دەکەن و دەستی دەبەستنەوە و دەیهێننە سەر دونیا، بەڵام ترسی

من ئەوە نییە خوا دەستگیردەکەن، بەڵکو دەترسێم ئەو کافرانە، مانگیش تێك بدەن. چونکە ئەوان کارەبایان هەیە بۆ ڕووناك کردنەوە و پێویستیان بە ڕووناکی مانگ نییە، بۆیە، گەر مانگ ڕووناکی نەمێنێت دیسان لە ئێمەی هەژار و نەدار دەقەومێ، چونکە لە تاریکی دەمێنینەوە".

### ئاغای حەرەم و سومبول ئاغا

سەدەکانی ناوەڕاست، زەمەنێکی زۆر سەیر بووە، لەلایەك بیرۆکەی ئایینی پێغەمبەران تەواوی دونیای گرتووە و مرۆڤایەتی و برایەتی و عەدالەت بەرگێکی ڕۆحانیان بەبەر کراوە؛ لەلایەکی دیکەش، کەلتووری کۆیلایەتی و جارییەی سەردەمی فیرعەون و نەمروودەکان بەردەوام هەبووە. لە ئیسلامیش کاتێك ناوچەیەك یان شارێك بە زۆر دەستی بەسەردا بگیردرێت، وەك سەرجەم کەلوپەلە بەدەست هاتووەکانی جەنگ، مرۆڤەکانیشی وەك غەنیمەت هەژمار کراون و هەر یەکە و داوای بەشی خۆی لێ کردووە؛ جا خاوەن بەش دواتر گەر ویستبای غەنیمەکەی بەکار دەهێنا، یانیش لە بازار وەك ئاژەڵ دەیفرۆشتەوە. ئەو دیلانەی جەنگ، دوای جیا کردنەوەیان لە دایك و باوك و نیشتمانیان، بەشێکیان نەدەفرۆشران، یانیش بە زۆر لەگەڵ پیاوێکی تەمەنی باپیریان بەبێ ویست نەدەخەوێندران؛ بەڵکو کوڕەکان دەخەسێندران و زەوقی پیاوەتییان نەدەهێشتن و دواتر لەناو ئافرەتانی حەرەم کاریان پێدەکرا.

سەبارەت بەو بابەتە بەسەرهاتێکی لەو شێوەی خوارەوە هەیە:

لەسەردەمی هارونە ڕەشیدی خەلیفەی عەباسییەکان، شاعیرێکی ناوداری دەربار هەبووە ناوی زولال بووە. ئەو شاعیرە ئەوەندە سەرسام بووە بە هارونە ڕەشید، هەموو جوولانەوەیەکی

زاڵمانەشـی کـردۆتە قەسـیدە و کارەکـانی خەلـیفەی زۆر بەرز نرخانـدووە. تـا ئەو ئاسـتەی کاتێـك هـارِوون ڕەشـید بە دەسـتی خۆی کەسێك دەکوژێ، ئەویش دێ و بەو شێوەیە لە شیعرێکی باسی دەکا: "سەیرکەن خەلیفەمـان چەنـد جـوان بە جـووڵەیەکی شمشێرەکەی، سەری ئەو هەتیوەی پەڕاند".

شاعیرانی سەردەمی خەلیفە هارِوونە ڕەشـید، کە خۆشـییان لە زولال نەدەهـات، دەربـارەی نووسـینەکانی گوتبوویـان: "دەبـێ زولال چ جۆرە شـاعیرێك بـێ، چەپـڵە بـۆ هەمـوو زوڵمێـك لـێ دەدا، ئاخۆ دەبێ چی وای کردبێ بەو شێوەیە ببێتە زوورِنا ژەنـی هارِوونە ڕەشـید؟". بەرامـبەر بەو قسـانە زولال باسـی بەسـەرهاتی خـۆی دەکـا و بەو شـێوەیە وەڵامیـان دەداتەوە: "بـرادەرینە مـن نازانم کوڕی کێمە و خەڵکی چ ناوچەیەکم؛ بەڵام بیـرمە مـن و دوو برادەری دیکەم، کاتێ منداڵ بووین، لە دەستی بازرگانێکی کڕین و فرۆشتنی کـۆیلەدا بـووین. ئەوسـا یەکێـك دەیگـوت بـا ئەوانە بخەسێنین و بیـانبێرینە کۆنسـتانتینیە (ئیسـتانبووڵ)، تـا لەوێ بیانفرۆشـین؛ ئەوانـی دیـکەش دەیـانگوت باشـتر وایە ئەوانە بەر لەوەی بخەسـێنین بیـانبەینە بەغــدا و لەوێ بیانفرۆشــین. دوای بێنەوبەردەیەکی زۆر ئەو بازرگانانە لە نێوان خۆیان پێك نەهـاتن، بەڵام خاوەنەکەی من پێی گوتبوون: برادەرینە بـا ئەوانە لە نێـوان خۆمانـدا دابەش بکەیـن، ئەو دووە بـۆ ئێـوە و ئەوەش بـۆ مـن. دوای ئەو دابەشکارییە دوو برادەرەکەمیان لەبەرچاوی مـن بـردنە لای دکتۆر و گونەکانیان بە دەست و هەندێك کەلوپەلی ئەوسـا خەساندن، لە کاتی خەسـاندنیان هـاوار و نـاڵەی ئەو منـداڵانە تـا حەوت تەبەقەی ئاسـمان بەرز بـۆوە، لە تـاو ئـازاری جەسـتەیان کەفیان لە زار هاتە دەر و لە هۆش خۆیان چوون. پێموابێ دواتر ئەوانیان بردە بیـزانس و لە بـازاڕی کـڕین و فرۆشـتنی کـۆیلان،

فرۆشران. خاوەنەکەم منی بردە بەغدا، لەویٚ خانوویەکی هەبوو بە قەد کۆشکێك گەورە، جگە لە من منداڵی دیکە و کۆیلەی گەورەشی لێبوو، بەڵام خاوەنە جووەکەم زیاتر ئاگاداری من بوو. چەند مامۆستایەك وانەی زمانی عەرەبییان پێگوتم. لە ماوەی سیٚ چوار ساڵ تەواو گەورە بووم. ڕۆژێك خاوەنەکەم بە بوخچەیەکەوە هات و گوتی: هەستە کوڕم با بڕۆین!. چووینە حەمام و دەلاکەکانی ئەویٚ منیان جوان جوان شوشت. ئینجا بوخچەکەیان کردەوە و جلوبەرگی درێژی جوان جوانیان لەبەر کردم و بە گالیسکەیەك چووینە ماڵێکی زۆر گەورەی لە ماڵەکەی خۆمان جوانتر. لە ژوورەوە سیٚ کەس دانیشتبوون، یەکێکیان ئافرەت و دووانیشیان پیاو. خاوەنەکەم منی هێنا ناوەڕاستی هۆڵەکە و دەستی بە مەدح کردنم کرد: بەڕێزینە سەیری جوانیی ئەو منداڵە بکەن، خاوەن تەندروستییەکی باش و مێشکێکی زۆر زیرەکە، وەك چۆن خاوەن پەروەردەیەکی زۆر جوانیشە، جگە لەمانە، لە ماوەیەکی زۆر کورت، تەواوی قورئانی ئەزبەر کردووە. ئینجا هەندێك شوێنی جەستەمی ڕووت کردەوە و پیشانیدان. ئەو پیاوەی لەسەرەوە دانیشتبوو گوتی: زۆر باشە ڕازیمە، بۆیە بیبەنە لای دکتۆر و تۆش بڕۆ پارەکەت وەرگرە. کاتێك گوتیان بیبەنە لای دکتۆر، من ئەو دوو برادەرەم بیر کەوتەوە کە پێش چەند ساڵێك چییان بەسەرهاتبوو. لە پڕ بەبیٚ ویستی خۆم، ڕامکردە لای ئەو ئافرەتەی لەویٚ دانیشتبوو و خۆم خستە نێوان قاچەکانی و وەك منداڵێك کە دوای ماوەیەکی زۆر دایکی نەبینییٚ، خۆم لە باوەشی ئەو ئافرەتە نا. کاتێکیش پیاوانی بەر دەرگا هاتن تا من لە باوەشی دەربهێنن، ئافرەتەکە ئەوانی گەڕاندەوە شوێنی خۆیان و چەنەی گرتم و سەیری ناو چاوانی کردم و گوتی: ماشەڵا ئەو منداڵە چەند جوان و

میهرەبانە. بۆیە با ناوی بێتە (زولال). ئینجا دەستی گرتم و گوتی با بڕۆین، مەترسە من ناتبەمە لای دکتۆر، ئینجا بە خاوەنە جووەیەکەمی گوت: ئەو منداڵە بۆ منە و بڕۆ پارەکەت لە حیسابی من وەرگرە. من وەك چۆلەکە دەلەرزیم، ئەو خانمەش بەردەوام دڵنەوایی دەکردم و ورەی وەبەردەنام. تا ئەو شوێنەی بەیەکەوە چووینە شوێنی حەوانەوەی ئەو. ئافرەتەکە کوڕێکی هەبوو لە تەمەنی من، کە گەیشتینە ماڵەکەی بانگی کرد و بەیەکی ناساندین. دواتر فەرمانی بە کەنیزەکەکانی کرد تا ژوورێکی لە شێوەی کوڕەکەی خۆی بۆ منیش ئامادە بکەن. لەگەڵ ئەوان دەمخوارد و دەمخواردەوە، وەکو کوڕەکەشی جلوبەرگی لەبەر دەکردم، هەر لەگەڵ ئەویش بەیەکەوە لای مامۆستایەکان وانەمان دەخوێند. دوای مانگێك بڕیاری ئازادکردنیشی دام؛ بەڵام من گریام و گوتم: ئێستا من بچمە کوێ؟ کەسم نییە!. ئەویش ئاوا وەڵامی دامەوە: کوڕم مەترسە ناچییە هیچ کوێیەك، بەڵام تا ئێستا کۆیلە بووی، بۆیە، لەمەودوا مرۆڤێکی ئازادی. من لە ماڵەکەی ئەو گەورە بووم و بوومە زولالی شاعیر. ئەو ماڵەی لێی گەورە بووم کۆشکی خەلیفەی موسوڵمانان بوو. ئەو پیاوەی ڕۆژی یەکەم لە ساڵۆنەکە لەلای سەرەوە دانیشتبوو، موئمینی باوکی هاروونە ڕەشید بوو، ئەو ئافرەتەی لە ناوەڕاستیش دانیشتبوو، مەلیکە حەیزەرانی دایکی هاروونە ڕەشید بوو. پیاوەکەی دیکەش بەرمەکیی وەزیری دەوڵەت بوو. بۆیە، بەرامبەر ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵ من کرا، گەر من ستایشی هاروونە ڕەشید نەکەم، ئایا نابمە سپڵەترین کەسی دونیا؟".

هەمان ڕێکخستنی کڕین و فرۆشتنی کۆیلە و مرۆڤە دەستگیرکراوەکانی جەنگ، لە مەملەکەتی عوسمانییەکانیش تا

کۆتایی ئیمپراتۆریەتەکەیان بەردەوام بوو. خانی دایکی گەورە لە ئیستانبووڵ، بازاڕێکی گەورەی کڕین و فرۆشتنی کۆیلە بوو. من خۆم شوێنەکەم بینیووە. کاتی خۆیشی لەوێ، لەسەر سەکۆیەکی وەك سەکۆی شانۆگەری کۆیلەکانیان نمایش دەکرد، بەڵام ئەو کاتەی من بینیم کۆیلەی لێ نەدەفرۆشرا.

ساڵی ۱۹۲۳، کاتێك کۆشکی عەبدولمەجیدی دوایین سوڵتانی عوسمانی بێ خاوەن دەمێنێتەوە و پەرش و بڵاو دەبێ، دوای ئەوەی سوڵتان بەرەو ئەوروپا دەرکرا، کۆیلەکان بێ خاوەن مانەوە. ئەوسا لە کۆشك دوو جۆر کۆیلە و جارییەی ڕەش و سپی هەبوو. کۆیلە ڕەشەکان ئەوانە بوون کە لە ئەفریقاوە بەدەستهاتبوون، بەڵام سپی پێستەکان، ئەوانە بوون کە لە ئەوروپا و قەفقاسیا هێنرابوونە ئیستانبووڵ. لە سەردەمەکانی کۆتایی دەسەڵاتداریەتیی عوسمانی کۆیلە لە ئەوروپاوە نەدەهێندران. بەڵکو زیاتر لە قەفقاسیاوە کۆیلە دەهات، بۆیە، زۆربەیان چەرکەس و جۆرجی بوون، چونکە خەڵکی وڵاتانی قەفقاس زۆر جوانن. تا ئەو ئاستەی لەوێ شوێنیان بۆ پێگەیاندنی کۆیلە کردبۆوە. دەڵێن پیاوە دەوڵەمەندەکان بای پێویستی خۆیان زیاتر کەنیزەکی جوان جوانیان دەکڕی، هیچ یەکێکیشیان لە ۲۰ – ۳۰ دانە کەمتری نەدەکڕی، جگە لەو کەنیزەکانە ۲ – ۳ دانە کۆیلەی گەنجی قۆزیشیان دەکڕی، ئینجا ئەوانەیان بەیەکەوە جووت دەکرد و ئەو منداڵانەی لەوانە دەکەوتنەوە، وەکو بەرخ دەیانفرۆشتن.

ساڵی ۱۹٤۱ کە هاتمە ئیستانبووڵ، ۳۵ دانە لەو کەنیزەک و کۆیلە و خەدەم و حەشەمانە لە ژیان مابوون. سومبول ئاغای سەر ئاغای ئاغاکانی ناو حەرەمیش لە ژیاندا بوو. ئەو کەسێکی باڵا بەرزی شیك پۆش بوو، بەردەوامیش گۆچانێکی دەسك

زیوینی بەکاردەهێنا. سومبول ئاغا هیی سەردەمی سوڵتان حەمید بوو. خەڵك لە ئیستانبووڵ ڕێزیان دەگرت، کاتێك سواری کەشتییەکانی کادیکۆی دەبوو، وەکو ڕێزێك هەموو کەس لەبەری هەڵدەستاوە، گەر شوێنیش نەبا شوێنی خۆیان دەدایێ. ئەو کۆیلە و کەنیزەکانە، کاتێك کۆشکی دوایین سوڵتانی عوسمانی نامێنێت، دەکەونە کوچە و کۆڵانان. هەر یەکە و لەلایەك بە سەدەقە و زەکاتی دەوڵەمەندەکان خۆیان بە ژیانەوە هەڵواسیبوو.

دەربارەی ئەو ژیانە کوڵە مەرگیەیان، ڕۆژێك کاك فالیح ڕیفقی بەسەرهاتێکی ئاوای بۆ گێڕامەوە:

"ئەو قوربەسەرانە پەرێشان بیوون. چونکە کابرا لەناو کۆشك گەورە بووە، بۆیە، زۆربەیان کەسانی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بوون. منیش ئێوارەیەك دۆخی ژیانیانم بۆ ئەتاتورك باسکرد، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەوەی گوتی: "نا نا شتی وا چۆن دەبێ"، بەڵام بە ڕووداوەکە نیگەران بوو، بۆیە، فەرمانی دەرکرد تا داهاتی خانی گەورەی سیرکەجیی ئیستانبووڵ، بدرێتە ئەوان کە لە سوڵتانەکانەوە جێماوە، لە کادیکۆیش کۆشکێکی سوڵتانەکان هەیە، با هەموویان بە درێژایی تەمەنیان لەوێ بژین. وەك دیاریشە کەسیان منداڵیان نییە. بۆیە کە مردن شوێنەکانیان دووبارە ڕادەستی دەوڵەت دەکرێتەوە.

فەرمانەکەی ئەتاتورك، دوای دەرچوونی، جێبەجێ کرا. بۆیە، من بیرم دێ دوای ئەوە ژیانێکی ئیسراحەتیان بەسەربرد.

یەکدی ناسینی منیش لەگەڵ سومبول ئاغا بەوشێوەیە بوو:

ماڵەکەمان لە ناوچەی سوادیە بوو لە ئیستانبووڵ. خەسووی کاك بەکری بازرگانی دراوسێشم، چەرکەسێکی ناو کۆشکەکانی سوڵتانی عوسمانی بوو. لەبەر ئەوەی کاك بەکر

لەسەردەمی کۆشکەوە سومبول ئاغای دەناسی، بۆیە، زوو زوو داوەتی ماڵی خۆیانی دەکرد. زۆر کات بۆ ئەو داوەتە منیشی بانگهێشت دەکرد. سومبول عەرەبی دەزانی، کاتێك زانی منیش عەرەبیزانم، زوو لەیەك نزیك بووینەوە. لە ماوەیەکی کورت پەیوەندیی نێوانمان زۆر چووە پێش و بووینە دۆستێکی نزیك. ئەوسا قاوە و خورمای تایبەتم لە نوسەیبینەوە بۆ دەهات. منیش کاتێك دەچوومە ئەو داوەتییەی ماڵی کاك بەکر، خورما و قاوەکەم لەگەڵ خۆم دەبرد و پێشکەشی ئاغام دەکرد، ئەویش زۆر کەیف خۆش دەبوو. سومبول ئاغا نەیدەزانی خەڵکی کوێیە، بەڵام وەکو خەیاڵێك بەبیری دەهاتەوە کە بە کەشتی هێناویانەتە ئیستانبووڵ. ڕۆژێك ئەویش، وەك زولال، تۆپەراسیۆنی خەساندنەکەی بۆ باس کردین. کە بۆی دەگێڕاینەوە بە سەر و سیما و تۆنی دەنگ و چاوەکانی دیار بوو لە ڕووی دەروونییەوە تا ئەوساش لە ژێر کاریگەریی ئەو خەساندنە ڕزگاری نەبووە. پرسیاری لایەنی هەستی جنسیم لێ کرد، ئەویش بەو شێوەیە وەڵامی دامەوە: "کوڕی خۆم ئێمەیان لە تەمەنی سێ چوار ساڵی دەخەساند، بۆیە، منداڵ لەو تەمەنە چ هەستێکی جنسی هەبێت، ئێمەش هەر ئەوەندە. یانی وەك باسی دەکەن ئەو شەهوەتەی لە پیاواندا هەیە لە ئێمەدا نییە. سەیرکە لە قژ و برۆ و برژانگم بترازێ، هیچ موویێکی دیکەمان پێوە نییە؟ ئەوەی هەشە لە منداڵییەوە بۆمان ماوەتەوە". سومبول ئاغا هەموو کات یادەوەرییەکانی کۆشك و بەزم و بەسەرهاتی سوڵتان و شێخ زادەکان و مەسەلەی عەشق و خۆشەویستی ناو کۆشکی سوڵتانی عوسمانی بۆ باس دەکردم.

جگە لە سومبول ئاغا، ئافرەتێکی ڕەشپێست لای دراوسێیەکمان کاری بەخێوکردنی منداڵەکانی دەکردن، ناوی

ئەبلە زەرافەت بوو. ئەویش کاتی خۆی لە کۆشکی سوڵتانی عوسمانی ژیابوو. من زۆر ڕێز و حورمەتم دەگرت. هەندێك کات، گەر دەرفەتی هەبا ئاگای لە عەنتەری کوڕیشم دەبوو. ئەو بەردەوام دەیپرسی: "مووسا، کوڕی خۆم، دەبێ من خەڵکی کوێ بم؟ ئینجا باسی ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە ڕۆژێك لە لادێکەیان لەگەڵ هاوڕێیەکی لە خۆی بچووکتر، کاریلە و بەرخیان بردبووە ناو گژوگیا بۆ لەوەڕاندن. لە پڕ پیاوێکی بە قەڵافەت بە ئەسپێکەوە هات و ئێمەی لەناو گونیە کرد و فڕاندمانی. خەڵکی گوند بە دوامان کەوتن و دەستیان بە هاوار کرد تا کابرا بگرن، بەڵام لەبەر ئەوەی لادێکەمان ئەسپی لێنەبوو، بۆیە کەسیان نەمانگەیشتنێ. کابرا دواتر لە شارێکی کەنار دەریا ئێمەی فرۆشت. ئەوانیش ئێمەیان هێنایە ئیستانبووڵ". دوای هاتنی بۆ ئیستانبووڵ بە ماوەیەکی درێژ، زەرافەت ئەبلە لە ئیستانبووڵ لەگەڵ داودە فەندی هاوسەرگیریی کردبوو. داودە فەندی هەم کۆیلە نەبوو، هەمیش دەرچووی بەشی دارایی بوو. دوای هاوسەرگیریکردنیان خوا منداڵێکی پێ بەخشی بوون. کاتێك پرسیاری شوێن و چیرۆکی منداڵەکەیم لێ کرد، ئاوا وەڵامی دامەوە: "چاوم کۆرەبی کوڕم، کاتێك منداڵەکەم لە نەخۆشخانە بوو، ئەوەندە گوتم چ منداڵێکی جوانم بووە، تا لە ماوەی هەفتەیەك بە چاوم برد و منداڵەکە مرد".

جگە لە زەرافەت ئەبلە، ئەوکاتەی هاتبوومە ئیستانبووڵ، ئافرەتێکی سپی پێستی ناو کۆشك هەبوو، ئەو خانمێکی چەرکەس بوو. کاتێك بینیم تەمەنی نزیکەی ٧٠ ساڵێك دەبوو. بەڵام هێشتا لەسەر و سیمایدا دیار بوو چەند کەسێکی هونەر دۆست و خاوەن کەلتوور و فەرهەنگە. کاتی خۆی، ئەو خانمە

کەنیزەکی سولتان وەحدەدین بووە. یانی لەگەڵ پاشا بەیەکەوە دەخەوتن. ئەو خاتوونە ببووە حۆرییەکی ئیستانبووڵ، چونکە خانم لەو باوەڕە بوو، هەر شەوێك لە چ ماڵێکی ئیستانبووڵ بخەوێت، ئەو ماڵە بەرەکەتی دەکەوێ و ئیشیان ڕاست دەبێ و منداڵەکانیشیان لە تاقیکردنەوەکانی قوتابخانەیان سەرکەوتوو دەبن، گەر نەخۆشیان هەبێ شیفای بۆ دێ و کچ و کوڕە گەنجەکانیان هاوسەرگیرییەکی سەرکەوتوو و بەختەوەر پێکدێنن. ئەو خانمە هەر شەوە و لە ماڵێك بوو، جارێکیان لە شەقامی بەغداد لە بەری ئاسیای ئیستانبووڵ یەکدیمان بینی. ئەوسا شەقامی بەغداد وەك ئێستا قەرەباڵغ نەبوو، بەڵکو بە درێژایی شەقامەکە تەنیا کۆشك و خانی جوانی لێبوو. دوای ئەوە، شەوێك لە ماڵەکەی ئێمەش ماوە. ئێمە ئەوسا لە خانی مورات بەدرخان پاشا دەماینەوە لە ناوچەی فەنەر یۆل. کە هاتە لامان لەگەڵ خانمەکان ماوەیەکی زۆر خەریکی دەمەتەقێ بوو. چونکە ئەو لەگەڵ پیاوان دانەدەنیشت. بەرەبەیان کاتێك لە ماڵ دەردەچوو، کوڕی ماڵ بڕێك پارەی دوای شوشتن دەدایێ و دەستی ماچ دەکرد و ئینجا بەڕێی دەکرد. یەکێك لە خوەکانیشی ئەوە بوو، پارەی زۆری وەرنەدەگرت. منیش وەکو کوڕی هەر ماڵێکی ئەو لێی دەماوە، بەیانی زوو هەڵستام بۆ بەڕێکردنی، بەڵام لە کاتی ماڵئاوایی ئەو وتەیەی پێگوتم کە هەرگیز لەبیری ناکەم: "کوڕم بە خوا پارە زۆر شتێکی پیسە، بەڵام بەنەعلەت بی بێ ئەویش زۆر شت ناکرێ و پێویستیەکی حەتمییە".

هەموویان بکەونە بەر ڕەحمەتی خوا، بە بۆچوونی من،

شــەهیدی ڕاســـت و دروســـتی مرۆڤـــایەتیش ئەو کۆیلـــە و کەنیزەکـانەن، ئەگەرنـا ئەوانەی لە جەنـگ خەڵـك دەکـوژن و دواتر دەکوژرێنەوە شەهید نینە.

با ئەو بابەتەش لێرە کۆتایی پێبێت.

## چونگوش و گوللوو ئاغا

چونگوش ناوچەیەکی زۆر سەیرە، چونکە شوێنی تەقینـەوەی کانێکی گەورەی بورکـانە. نـاوچەکە پـڕە لە شـوێنەواری کـۆن. لەگەڵ هەمـوو ئەمـانە زۆر بەسـەرهاتی تـاڵ و ناخۆشیشـی هەیە. سـاڵی ١٩٥٤ بـۆ بانگەشـەی هەڵبـژاردن، لەگەڵ یوسـف عەزیـز ئۆغلوو و موستەفا ئەکینجی و چەنـد ئەنـدامێکی حیزبـی، منـیش وەك ڕۆژنامەڤانێـك لەگەڵ ئەوان چـووینە چوونگـووش. لەوێ چـووینە لای گوللـو ئاغـا، کە ئێسـتا نازناویـان بـووەتە (گـول دۆغان).

لەوێ کـاك موسـتەفای کـوڕی گوللـوو ئاغـا پێشـوازی لـێ کـردین. وەك دیـارە، کـاتی خـۆی لە بانگەشـەکانی هەڵبـژاردن خەڵك لە مەیدانێك کۆ نەدەکرانەوە بـۆ هەڵخەڵەتانـدنیان، بەڵکـو لە جیاتیی ئەوە بەپێی ناوچەکە ئەو کارە لە ڕێگای ئاغـا و شـێخ و گەورەی ئەو ناوچەیە جێبەجـێ دەکـرا. لە چونگـوش، بـۆ ئەو کارە بینینی کاك موستەفا بەس بـوو، چـونکە ئەوەی دەمـاوە ئەو خۆی چارەی دەکرد. کاك موسـتەفا کەسـێکی دونیـا دیـتە بـوو، لەسـەر داوای منـیش پیاسـەیەکی بە شـوێنە گەشـتیارییەکانی چونگوش پێ کـردین. لەوێ شـوێنەواری کڵێسـایەکی گەورەی ئەرمەنـی هەبـوو. بەپێـی قسـەی کـاك موسـتەفا بێـت، کـاری دروسـتکردنی چەرم و پیسـتە لە چونگـوش زۆر پێشـکەوتووە و بەشـێکی زۆریشـی هەنـاردەی هیندسـتان و ئەمریکـا دەکـرێ.

چونگــوش نــاوچەیەکی زۆر کــۆنە، بەڵام کــاتی خــۆی ئەرمەنییەکـان، هەم لە ڕووی ژمـارە، هەمـیش لە ڕووی هێـزەوە، دەسەڵاتداری ئەوێ بووینە. جگە لە مانە، لەوێ چەند گوندێکی ئەرمەنییەکانیش هەبووە کە ژمـارەی دانیشـتووانی هەر یەکێکیـان نزیکەی سێ چوار هەزار کەس بووە. ئەوسا لەنـاو چونگوشـیش نــزیکەی ٦ هەزار کەس ژیـــاوە، بەڵام تەواوی بازرگـــانی و کاروباری فەرهەنگی لە دەستی ئەرمەنییەکان بووە.

کاك موستەفا قەدپاڵی چیاکانی ئەوێـی پـێ نیشـاندایـن، کە لە سەردەمی ئەرمەنییەکان هەمووی باخی ترێ و باوی و هەنجیر و هەرمێ بووە، بەڵام ئێستا هیچی لێ نەماوە و خاکەکەی شـەقاری زۆر گەورەی تێ کەوتووە. لە بـێ خـزمەتیش تەواوی باغەکـان بوونەتە خـاك و خـۆڵ. دواتـر کـاك موسـتەفا ئـێمەی بـردە سـەر شـوێنی تەقیـنەوەی بورکانێـك کە دوو کیلـۆمەتر لە چونگـوش دوور بوو. ناوی شـوێنەکە (دوو دەنـگ) بـوو. نـاوەکەی لەوەوە هـاتبوو، کە سـەرت بە قـووڵایی شـوێنی تەقیـنەوەی بورکـانەکە دەکرد و هاوارت دەکرد، هەمان دەنگ لەناوەوە دەنگـی دەداوە و دەبووە دوو دەنگ و تێکەڵ بەیەك دەبوو. منیش تاقیمکردەوە، چیرۆکەکە ڕاست دەرچوو و دەنگی منیش بە هەمان شێوە بـووە دوو دەنگ. شوێنی تەقیـنەوەکە ئەوەنـدە قـووڵ بـوو، دەسـتم دا بەردێك و هاوێشـتمە نـاوی، کەچـی گـوێم لە دەنگـی بەردەکە نەبـۆوە. کـاك موسـتەفا کاتێـك زانیـی خۆشـیم بە گێـڕانەوەی بەسەرهاتەکانی ناوچەکەیان دێـت، بـۆ بەڕێکردنمـان، بەو تەمەنە گەورەی خۆیەوە بە جۆش و خرۆشەوە تـا دیـاربەکر لەگەڵمـان هات. لە ڕێگا ئەو بەسەرهاتەی خۆی بۆ باسکردین:

"کــاتی خــۆی لە چونگــوش دوو ئاغــا هەبــوون، ئاغــای موسوڵمانەکان گوولوو ئاغای باوکم بوو"، یەکسەر قسـەکەم پـێ

بڕی و گوتم: "بووره که قسەکەم پێ بڕی، بەڵام لەناو موسوڵمانان و تورکان ئاغا نییە، بۆیە باوکت دەبێ کورد بوو بێ؟". "عەنتەر تێکی مەدە"، کاك موستەفا بە پێکەنینەوە وایگوت. ئینجا بەو شێوەیە بەردەوامی بە چیرۆکەکەدا: "گەورەی ئەرمەنییەکانیش (کیرکۆر) ئەفەندی بوو. باوکم زۆر، بە باڵادەستی ئەرمەنییەکان بێتاقەت بوو، لەو سەر و بەندە، یەکەمین جەنگی جیهانی ڕووی دا. ئەوسا چونگوش قەزا بوو و دیاربەکریش ویلایەت. پارێزگاری ئەوسای دیاربەکر، دکتۆر ڕەشیدی ئیتیحاتچیی ناودار بوو. کابرا بڕیارێکی بۆ کۆچکردنی ئەرمەنییەکان دەرکرد، بۆیە، ئەرمەنییەکان لێرە و لەوێ زۆریان بەسەر دەهات و کەوتبوونە دەرد و میحنەتییەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە چونگوش بەهێز و دەسەڵاتدارتر بوون، بۆیە، کەس نەیدەتوانی دەستیان بۆ ببات. بەڵام لە کۆتاییدا باوکم و دکتۆر ڕەشیدی پارێزگاری دیاربەکر پیلانێك دادەڕێژن. ئینجا دێن و هەڵبژاردنێك بۆ ئیدارەی تایبەت دەکەن و بە زانین تەنیا ئەرمەنییەکانیان هەڵبژارد. ئینجا کریکۆره ئەفەندی و پێنج کەس لە گەورەی ئەرمەنییەکان بە پارێزگاریی بیست گەنجی هەڵبژێردراو بۆ پارێزگاری لێ کردنیان چوون تا مەزبەتەکانیان وەرگرن. ڕێکارە فەرمییە کارگێڕییەکان تەواو بوو، ئینجا موتەسەریف سوپاسی کردن، بەڵام تکای لێ کردن کە سەردانی دکتۆر ڕەشید بکەن، چونکە جەنابی پارێزگار زۆر خوازیاری ئەوەیە ئێوە ببینێت. پێشیگوتن بەو بۆنەیەوە هەم سەردانی دەکەن، هەمیش سوپاسگوزاریی خۆتانی پێ دەگەیەنن بۆ دەرچوونتان لە هەڵبژاردن. کریکۆرەفەندی داواکارییەکەی بە مەعقول زانی و خۆی و تەواوی ئەوانەی لەگەڵی بوون، بەڕێکەوتن بۆ دیاربەکر. تەبعەن ئەوسا ئۆتۆمبێل نەبووە و بە

سـواری ئەسـپ ئەو ڕێگایـانە بـڕدراون. کاتێـك بەڕێـدەکەون ژمارەیەك ژەندرمەشیان وەك پاسـەوان لەگەڵ دەنێردرێـت، بەڵام کاتێك دەگەنە ناوچەی سـەیران تەپە لە دیـاربەکر، ژەنـدرمەکان ڕوویـان بەرەو نـاوچەی سـیڤەرەك وەردەگێـڕن و بەپێـی ئەو پیلانەی پێشـتر ئامـادەکرابوو، سـەرجەم ئەرمەنییەکـان گولەبـاران دەکەن و دەیانکوژن. ئینجا چونگوش بـێ بەرپـرس و بـێ سـەر دەمێنێـتەوە! دوای ئەوە هەمـوو شـەوێك مـاڵە ئەرمەنییەکـانی چونگوش دەدرێنە بەر تەقە و ژمـارەیەکی ئێجگـار زۆریـان لـێ دەکـوژرێ. جـگە لەوەی ژمـارەیەکی ئێجگـار زۆریشـیان لـێ دەستگیر دەکرێ و دەیـانهێننە ئەو کڵێسـایەی بینیـت و لەوێ تـا شەو دەهێڵـدرێنەوە. کاتێـك شـەو دادێـت ئەوانـیش دەبەنە بیـری بورکـانی دوو دەنـگ و دانە دانە بە زینـدوویی فڕێیـان دەدەنە نـاوی. لە مـاوەی چـوار پێـنج ڕۆژ پشـتی هێـزە ئەرمەنییەکـانی چونگـوش دەشـکێنن، ئینجـا هەرچـی ئەرمەنـی چونگـوش هەیە دەگرن و دەیانخەنە ناو دوو دەنـگ، لە نزیـك ئەو چـاڵە، چەنـد ناوچەیەکی پەناو پێچ هەبوو دەچووەوە سەر کـانە بورکـانەکە لە ژوورەوە. چەنـد گەنجێکـی ئەرمەنـی دوای ئەوەی دەهێنـدرێنە ئەوێ، بە تاریکی شەو توانیبوویان لەو پەناوپێچە قوولانە خۆیـان حەشار بدەن، بەڵام باوکم لەوێ چەندان کەسی وەکو نـۆبەتچی دانابوو، شەوێك ئەو نۆبەتچییانە گوێیـان لە دەنگـی ئەو گەنجـانە دەبێ کە دەیانویست ڕاکەن و خۆیان ڕزگار بکەن، بەڵام دەم و دەست پاسەوانەکان لێیان دێنە دەست و دەیانتۆپێنن.

کریکۆر کچێکی جوانی هەبوو، باوکم ئەوی نەکوشت و بـۆ منـی هێنـا. ڕۆژێـك لەگەڵ ئەو کـچە بەبەردەم دوو دەنـگ تێـدەپەڕین، مـن لە پێشـەوە و ئەویـش لە دوای مـن بەسـواری ئەسپ دەڕۆیشتین. لە پڕ بینیم زۆر بە خێرایی لەسـەر ئەسپەکەی

هاتە خوارەوە و بەرەو دوو دەنگ ڕای کرد، بە زەحمەت پێیراگەیشتم، گرتم و پێم گوت: کچێ تۆ چی دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی، دەبێ چی بکەم، دەچمە لای دایک و باوکم. دوای ئەو ڕووداوانە زۆر نەژیا و ساڵێکی بەسەرچوو، تووشی نەخۆشی سیل بوو و کۆچی دوایی کرد.

عەنتەر ڕووداوێکی سەیری دیکەش هەیە گەر دەتەوێت ئەویشت بۆ باس دەکەم؟

منیش پێم گوت: "بۆنا، فەرموو گوێم ڕادێراوە".

"وەك دەزانن، ئەو کافرانە زۆر دەوڵەمەند بوون. باوکم بۆ کوشتنیان ئەوانی بەسەر پیاوەکانمان دابەش کردبوو، تا ماڵ و سامانەکەشیان بۆ ئەوان بێت. ڕۆژێك لە کاتی کوشتنی ئەو دەوڵەمەندانە، لەسەر ئەوەی من کوشتوومە پارەی کەمە و ئەوەی تۆ کوشتووتە پارەی زۆرە لە نێوان ئەو پیاوانە دەبێتە شەڕ و چەك لەیەك ڕادەکێشن. بە هەزار حاڵ باوکم پێشی بە شەڕەکە گرتبوو. ئەها وەك دەڵێن مەڕ لە دەردی ڕزگارکردنی گیانی خۆیەتی و قەسابیش خەمی گۆشتەکەیەتی. بۆیە، کەسیان خەمی کوشتنی ئەو پیاوانەیان نەبوو، بەڵکو خەمی ماڵ و موڵك و سامانەکەیان بوو".

### مەدام میتران

ئەها گوتم هەندێکجار پیاوێکی هەژار، یان خەزێنەیەك دەدۆزێتەوە، یانیش بە ڕێککەوت لە یانەسیبێك پارەیەکی زۆری بۆ دەردەچێ و لە پڕێک دەبێتە کوڕێك و دەوڵەمەند دەبێت. ڕێك وەك ئەو نموونەیە، یەکتر ناسینی من و مەدام میترانیش بەو شێوەیە بوو.

ساڵی ١٩٩١، بە هەزاران کورد، لە دەست ڕژێمی سەدامی

وەحشی بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆیان، لە کوردستانی عێراقەوە پەناهەندەی سنووری تورکیا بوون. وەك ئەوەی حکوومەتی تورك بۆ کورد زۆر باشتر بێ لە حکوومەتی سەددام حوسێن. بنۆڕنە مێژووی کورد چەند سەیرە، کورد بەردەوام لە کوردستانی نیشتمانی خۆی و لەسەر خاکی خۆی بووەتە پەناهەندە، یانیش بەردەوام قاچاغ بووە. ئەو ڕووداوانەی لەو بارەیەوە بەسەر کورددا هاتووە، تەنیا لەو بەسەرهاتەی تازە باسمکرد کورت نەبۆتەوە. چونکە گەر سەیری پەرتووکەکەی لۆرد کوردزۆنی سەرۆکوەزیرانی ئینگلەتەرەی دوای سالآنی ١٨٩٥ بکەین بەناوی (ئیران)، لەسەر هەمان بابەت ڕووداوێکی لەو شێوەیە دەگێڕێتەوە:

"هەردوو دەولەتی ئیران و عوسمانی بەردەوام لای ئێمە سکالایان لەیەکدی دەکرد. زۆربەی شکایەتەکانیشیان بەو شێوەیە بوو؛ عوسمانییەکان و ئێرانییەکان زوو زوو سنووری یەکدی دەبەزێنن و دەچنە ناو خاکی یەکدی. منیش، وەکو سەرۆکوەزیران، لە قونسلی تەبریز و دیاربەکری خۆمانم پرسی لەسەر ئەو بابەتە و وەلامی ئەوان بۆمن بەو شێوەیە بوو: بەڕێزم ئەو شوێنەی سکالای لێ دەکرێت کوردستانە، ئەوەی لەسەر ئەو خاکەش دەژی کوردە، ئەو کوردانەش لەسەر خاکی خۆیان دێن و دەچن. یانی هیچ پەیوەندییەکی بە عوسمانییەکان و ئێرانییەکانەوە نییە، ئەوان ئاگاشیان لە سنوورەکانیان نییە، چونکە گەر ئاگاداریش بن قبوولی ناکەن. واتە ئەو سنوور بەزاندنەی ئێرانییەکان و عوسمانییەکان باسیان دەکرد بەو شێوەیە بوو. واتە هاتوچۆ و گەڕان و سووڕانی کورد بوو لەسەر خاکی خۆیان، نەك بۆ ئامانجێکی دیکەی سیاسی".

کورد، ئەوەندەی پێیانکرابوو، خۆیان و مال و منداڵیان لە

چەپەڵۆکی سەدامی فیرعەونی کوڕی فیرعەون ڕزگارکردبوو، کەچی لە تورکیا، وەکو پەناهەندەیەکی سیاسی نا، بەڵکو وەکو دیلی جەنگ مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا. لە مێردین و دیاربەکر و موش، لەسەر زبڵدان بەناو کامپیان بۆ دروست کردبوون و لە ژیانێکی مەمرە و مەژی دا ڕۆژیان دەکردە شەو. لەگەڵ تێپەڕینی کات، دۆخ و هەواڵیان گەیشتە ناوەندەکانی میدیای جیهانی، دوای ئەو هەواڵانە، ڕاستەوخۆ، مەدام میترانی خێرخواز و خانەدان، لە ساڵی ١٩٨٨ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە دۆخی ژیانی کوردەکان لەناو ئەو کەمپانەی دروستکرابوون ببینێ، سەردانی تورکیای کرد.

پرۆگرامی پرۆتۆکۆڵی سەردانەکەی خاتوون، بە شێوەیەکی سەیر، بەم شێوەی خوارەوە بوو:

١- لەگەڵ هیچ لایەنێکی فەرمی لە تورکیا یەکدییان نەدەبینی.

٢- سەردانی کامپی پەنابەرەکانی دەکرد لە دیاربەکر و موش و مێردین و قەزای خۆسەر.

٣- لەگەڵ لەیلا زانا و دکتۆر ئەکرەمی سەرۆکی شارەوانیی موش و من کۆدەبۆوە.

٤- لە گەڕانەوەی، هەرچی بینیبووی و زانیاریی لەسەر کۆکردبۆوە، لە ڕێگای ڕاپۆرتێکەوە دەیگەیاندە دەزگا خێرخوازییەکانی جیهان و گرووپە دیموکراتەکان و ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی مافی مرۆڤ و سەرۆکی وڵاتانی پەیوەندیدار و پەرلەمنتارانیان.

ئەوکاتی، لە لادێکەی خۆمان بووم. شەو ئۆتۆمبێلێک لە دیاربەکرەوە هات و داوای کرد لەگەڵی بچم، پرسیاری هۆکارەکەیم لێ کرد؟ ئەویش پێیراگەیاندم بەیانی مەدام میتران

دێتە دیاربەکر و لەناو پرۆگرامی سەردانەکەیدا جەختی لەوە کردۆتەوە کە دەبێ تۆش ببینێت. خاتوو میتران ویستبووی لە گوندەکەی خۆمان سەردانم بکات، بۆیە لە ئەنقەرە گوتبووی: "مووسا عەنتەر بە تەمەنە و شەرمە من بانگهێشتی دیاربەکری بکەم". بەڵام پەرلەمانتارە کوردەکان ئەویان ڕازی کردبوو، کە لە دیاربەکر یەکدی ببینین. بەپێی ئەو قسانە بێت کە بۆیان باسکردم، ئاوایان بە مەدام میتران گوتبوو: "کاك مووسا گوێ بەو شتانە نادات، جا بۆ خانمێکی وەك ئێوەی بەڕێز کە بۆ پرس و حاڵی کورد تا ئێرە هاتوون، نەك بۆ دیاربەکر، مووسا عەنتەر بۆ دۆزەخیش دەچێت".

بەیانی زوو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری خەڵك، بۆ پێشوازیی مەدام میتران چووینە فڕۆکەخانەی دیاربەکر. دەسکە گوڵێکیان دامێ، تا ئەو کاتەی خانم لە فڕۆکە هاتە خوارەوە من پێشکەشی جەنابیان بکەم و بەخێر هاتنی بکەم. کەچی هێزەکانی ئاسایش نەیانهێشت بچینە ناو فڕۆکەخانە، جا لەوە خۆشتر هەر کە مەدام لە فڕۆکە هاتە خوارەوە، هێزەکانی ئاسایش ئەویان لە دەرگای تێرمیناڵەوە، وەك ئەوەی بیفڕێنن، خستە ناو ئۆتۆمبێلێك و بردیان، بەڵام ئێمەش دەستەوەستان نەبووین و بە سەدان ئۆتۆمبێلی دیکە بەدوایدا چووین. مەدام میتران لە هۆتێل پالاسی گەشتیاری لە دیاربەکر دابەزی. بەپێی پرۆگرامی سەردانەکەی ئەو ڕۆژە، مەدام میرتان بە وتەی خۆی سەردانی کامپی دیلەکانی جەنگی لە دیاربەکر و مێردین و موش دەکرد و ئێوارەی هەمان ڕۆژیش لەگەڵ ئێمە دادەنیشت. هەر بەو شێوەیەش پرۆگرامەکەی جێبەجێ کرا.

سەرەتا جەنابیان، لەگەڵ لەیلا زانا کۆبوونەوە، دواتر لەگەڵ دکتۆر ئەکرەم و دواتریش من. بەر لە دیدارەکە، گەنجێك هاتە

لام و گوتی: "خانم دەڵێ بە چ زمانێك قسە دەكات، تا بەپێی ئەوە وەرگێڕ ئامادە بكرێت؟ بۆ نموونە توركی، عەرەبی، فارسی، یان هەر یەكێك لە زمانە ئەوروپییەكان؟". منیش لە وەڵامدا گوتم: "برا دەشێ بە یەكێك لەو زمانانەش قسە بكەین، بەڵام گەر وەرگێڕی كوردیتان هەیە، دەمەوێ بە زمانی خۆم قسەی لەگەڵ بكەم". نێردەكەی خانم ڕۆیشت و دوای ماوەیەك هاتەوە و فەرمووی لێ كردم. چووینە ئەو ژوورەی مەدام میتران لێی دەماوە، كاتێك خاتوون منی بینی، وەكو ڕێزێك بۆ پێشوازی لێ كردنم تا بەر دەرگا هات. دەستەكانی گرتم و چەند هەنگاوێك بەرەو شوێنی دانیشتنەكە چووینە پێش. بەر لە دانیشتن گوتم: "مەدام لەناو كەلتووری ئێوەی ئەوروپی گەر پیاو چەند بە تەمەنیش بێ، دەستی ئەو ئافرەتە ماچ دەكات كە یەكمجارە یەكدی دەناسن، جا گەر ئافرەتەكە گەنجیش بێت، بەڵام ئێمەی كورد خۆشیمان لەو كەلتوورە نایەت، چونكە ئەوە یەكێكە لە نەریتەكانی چینی بورژوازی و جگە لەوەی ئەو عادەتە هەستێكی سێكسیشی تێدایە، وەلێ ئێمەی كورد، گەر دەستی ئافرەتێكمان ماچ كرد و لەسەرسەری خۆمان دانا، ئیدی ئەو ئافرەتە وەك دایكی خۆمان هەژمار دەكەین. بۆیە، گەر دەرفەت بدەن دەمەوێ دەستتان ماچ بكەم و لەسەری خۆمی دانێم، تا ئێوەش ببنە دایكی كوردان". ئینجا دەستەكانیم ماچ كرد و لەسەری خۆم دانا، ئەویش بەجارێک کەوتە ژێر كاریگەریی ئەو قسانەم و گوتی: "سەیركە مامە گیان، منیش پەیمانتان پێدەدەم ئیدی ببمە دایكی كوردان!". ئینجا باوەشی پێدا كردم و چووین دانیشتین.

یەكەم قسەی مەدام میتران بەو جۆرە بوو: "مامە گیان گفتوگۆ و دانیشتنی نێوانمان لە ڕووی كاتەوە دیاری كراو نییە،

بێ ئەوەی پەلە بکەی بە ئیسراحەت قسە بکەن. سەرەتا هەندێك پرسیارمان هەیە، ئینجا چیتان دەوێت بیڵێن. چونکە دەمەوێ بە دوور و درێژی لەگەڵ ئێوە قسە بکەم!". دوای ئەو قسانە، باڵیۆزی فەرەنسا هاتە ژوورەوە، بەڵام خاتوون پێی ڕاگەیاند تا بچێتە دەرەوە. هۆکاری ئەوەم لێپرسی بۆچی ناردتانە دەرەوە؟ خاتوون لە وەڵامدا گوتی: "ئەو پیاوێکی باش نییە و کاتی خۆشی پەیامنێری ڕۆژنامەی (لی مۆندا) بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست". پرسیم: "باشە گەر کەسێکی باش نییە، بۆچی کردووتانەتە باڵیۆز؟". مەدام میتران: "پیاوێکە پڕ بە پێستی تورکیا". دوای ماوەیەك، گفتوگۆ فەرمییەکانمان کۆتاییپێهات و لەسەر پرسی جیاواز جیاواز دەستمان بە قسان کرد. لەبەر ئەوەی زۆر لەیەکمان ڕا بینی، هەندێکجار لەناو قسەکان حەنەکیشمان دەکرد. بۆ نموونە لەکاتی ئاخافتەنەکانماندا من شتێکی ئاوام گوت:

"خاتوون زۆر سەیرە بەلامەوە، پیاوی ئەورووپی و ئەمریکی کوردیان خۆش ناوێ، بەڵام بە پێچەوانەوە ئافرەتەکانیان کوردیان لا ئەزیزە!".

به پێکەنینەوە گوتی: "یانی چۆن؟"

من: "لەو بارەیەوە دوو نموونەتان پێدەڵێم. ڕۆزڤێلتی سەرۆکی پێشووی ئەمریکا، هیچ بەلای پرس و دۆخی ئێمەی کوردەوە نەدەهات، بەڵام خوالێخۆشبوو ئەلینا خانمی خێزانی، تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی کرد، هاوکاری و خۆشەویستیی خۆی بۆ ئێمە نەپچڕاند".

دیسان بە پێکەنینەوە گوتی: "نا نا، ئیدی پیاوەکانیش پشتگیری پرسە ڕەواکەتان دەکەن". ئینجا بەردەوام بوو: "مامە تەمەنت چەندە؟".

من: "نازانم تەمەنی ڕاستەقینەم چەندە، چونکە لە سەردەمی عوسمانییەکان وەك ئێستا تۆماری ساڵی لە دایك بوون نەبوو، نەشدەچووینە سەربازی و باجیشمان نەدەدا، جا لای حکوومەت پەیماننامەی هاوسەرگیرشمان نەبوو، یانی دەتوانم بڵێم نیمچە سەربەخۆیەك دەژیاین؛ بەڵام دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا، بیرم دێت کاتێك چوومە قوتابخانە، داوای ناسنامەیان لێ کردم، بۆیە، منیان بردە دادگای نوسەیبین، لەوێ دکتۆرێك و دادوەرێك و داواکارێکی گشتی سەیری ددانیان کردم، لەگەڵ شوێنێکی بەعەیبی جەستەم، وەك ئەوەی بزانن کەی لە دایك بوومە، بە ساڵی کۆچی منیان بە لە دایك بووی ١٣٣٦ واتا ١٩٢٠ی زاینی لە قەڵەمدا، بەڵام دایکم دەیگوت: "کوڕم تۆ ساڵێك دوای کۆمەڵکوژی ئەرمەنی و کریستیانەکان لە دایك بووی!". کاتێك باسی کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکانم کرد، مەدام دڵی پڕ بوو، ئینجا گوتی: "من زۆر خۆشیم لە دیاربەکر هات". لە وەڵامدا: "مەدام ئێوە خانمی یەکەمی ئەوروپانە و خەڵکی پاریسن و لە کۆشکی ئێلیزی دەژین، سەیرە چۆن دیاربەکری هەژارتان پێ جوان و خۆش بووە؟".

وەڵامی دامەوە:

"با پێت بڵێم چۆن! دوێنێ شەو، کاتێك ئەو شارە هەمووی خەوتبوو، بەڵام ئێمە لەگەڵ هاوکارانم گوتمان با پیاسەیەکی ناو شار بکەین. باوەڕبکەن، کاتێك بەناو دیاربەکردا گەڕاین، هەستمدەکرد دار و بەردی ئەو شارە دەیەوێت قسەم لەگەڵ بکات، بۆیە گەر ئەو شارە بە شەڕەفە مێژووییە جوان نەبێت، ئەی چی جوانە؟ ڕاستە پاریسی ئێمە بە یەکێك لە کۆنترین شارەکانی ئەوروپا دادەنرێت، بەڵام گەر سەیری بکەین تەمەنی تەنیا ٩٠٠ ساڵە، بەڵام سەیری دیاربەکری دایکی مێژوو بکە،

ئەوەنـــدە کـــۆنە کە مرۆڤـــايەتی نـــاتوانێ مێژووییەکـــی ڕاســـتی دامەزراندنی ئەو شـــارەمان پێبلێـت. ڕەنـگە تەمەنـی پێنج یـان دە هەزار ســاڵ بێــت". منـیش ئەو وتـانەی مەدامـم وەکـو دەربڕینـی هەست و سۆزێك بۆ من و نەتەوەکەم قبوولکرد و پێی دڵخـۆش بووم. ئینجا بە پێکەنینەوە گوتی: "ئێوە تۆزێك پێش ئێستا باسـی شکۆ و گەورەیی و جوانی کۆشـکی ئێلێزیتـان کـرد، باشـە گەر من داوەتی ئەو کۆشکەتان بکەم، ئایا دێنە لامان؟".

لە وەڵامی میوانداریەکەی گوتم:

"سوپاسی ئەو میوانداریيە گەرمەتان دەکەم، جـا بـۆ کۆشـکی ئێلیـزی نـا، بەڵکـو بـا میوانـداریيەکە بـۆ بـاخێکی پـاریس بێـت، هەرچەنـدە حکـوومەتی تورکيـا پاسەپۆرتیشـم نـاداتێ". وەڵامـی دامەوە: "باشە گەر من شتێك بـکەم و پاسـەپۆرتتان بـۆ وەرگـرم، ئەوکات سەردانمان دەکەن؟".

من: "بە دڵنیایەوە".

دوای دیـدارەکە، خـانم زۆری هەوڵ دابـوو بـۆ وەرگرتنـی پاسـەپۆرتی مـن، بـۆ ئەو بـابەتە لەگەڵ لایەنـی پەیوەندیـداریش قسەی کردبوو، بۆیە، داوەتنامە و بلیتـی فڕۆکەشـی بـۆ ناردم تـا بەشداری کۆنفرانسی کورد بـکەم لە پـاریس، بەڵام حکـوومەتی تورکیا پاسەپۆرتی نەدامێ تا بتوانم ئەو گەشـتە بـکەم. هۆکـاری نەدانی پاسەپۆرتەکەشم لەلایەن پۆلیسەوە زۆر پێکەنین ئامێز بوو. ئەوان دەیانگوت گوایە لە دادگای نوسەیبین دۆسیەیەکم لەسـەر کراوەتەوە دەربارەی ئەوەی من کاری قاچاغ و کـلاوات دەکەم و خەڵـك هەڵـدەخەڵەتێنم، بـۆ وەرگرتنـی پاسەپۆرتەکەشـم ئەو دۆسـیەیە دەبـووە ڕێگـر. لەسـەر ئەو بەهـانەیە چـوومە دادگـای نوسەیبین، بەڵام پێیانگوتم هیچ داوایەکـی لەو شێوەیەت لەسـەر نیـــیە. گەڕامەوە لای پـــۆلیس و گوتیـــان لە نوســـەیبینەوە

نووسراوێکی فەرمیمان بۆ بهێنە لەسەر دۆسیەکەت، بەڵام دادوەرانی دادگای نوسەیبین گوتیان ناتوانین هیچ کتابێکت بۆ بکەین لەسەر دۆسیەیەك کە لەدادگا نییە لای ئێمە. بەو شێوەیە کاتی بەستنی کۆنفرانسەکە تێپەڕی و منیش تووڕە بووم و پێم گوتن بەر نەعلەتی خوا بکەن، ئیدی وازم لە مامەڵەی دەرهێنانی پاسەپۆرت هێنا.

## ئیسماعیل بێشکچی

لەگەڵ ئەوەی سی ساڵی ڕەبەق لەگەڵ ئیسماعیل بێشکچی بەیەکەوە بووینە؛ وەلێ دیسان بەلامەوە زۆر گرانە پێناسەیەك بۆ بێشکچی بنووسم. دەزانن بۆچی؟ چونکە زۆربەی خەڵك ئەوەندە خوێنەری مامۆستا ئیسماعیلن، ئەوەی بۆ من دەمێنێتەوە لایەنە قورسە نەزانراوەکەیە، ئێ چەندی دەیهێنم و دەیبەم ئەو لایەنە شاراوانە زۆر کەمە تا باسیان بکەم.

لە تورکیا، کەسانی ئەکادیمی و ئەهلی زانستی بە شەڕەف و نامووس زۆر کەمە، بۆیە، لەناو توێژی خوێندەوار و ئەکادیمییەکانیش کەم کەس لە بێشچکی تێدەگەن. بۆ نموونە زۆر کەسیش بە سەرسوڕمانەوە لێیان پرسیووم:

"ئیسماعیل بێشکچی کوردە؟"

چونکە ئەوانەی ئەو پرسیارە دەکەن، هەستدەکەن ئەوەی بە ئەخلاق و نامووسەوە کێشەکانی تورکیا بێنێتە سەر زمان دەبێ کورد بێت. لە کاتێکدا، لە داوای مافی ڕەوای گەلی کورد، زۆر دۆست و برادەری چەپی تورکیش هاوکاری و پشتیوانییان کردووین.

لە ڕاستیشدا بۆ ئەو پرسە پێویستە چەپی تورك بۆ سەر دوو بەرە دابەش بکەین:

یەکەم: چەپە ڕاستەقینەکان.

دووەم: چەپە ساختەکان.

زۆر بە داخەوە، ئێمە، بۆ ماوەی چەندان ساڵ ئەو دوو جۆر چەپەمان لەیەك جیا نەکردەوە. بۆ نموونە کەسانی وەك بولونت ئەجەڤید و ئیلهان سەلچووك و چەتین ئاڵتان و ئوغور مومجومان بە چەپ هەژمار دەکرد. وەك بینیشمان ئیلهان سەلچووك، دوای ئەوەی لە ڕۆژنامەی جومهوریەت جیا بۆوە، خەریك بوو ڕۆژی دواتر بچێتە ڕۆژنامەی هوریەت. ئاخر گەر پێشنوێژخوێنی مزگەوتێك لە جەماعەتەکەی تووڕە بێت و ڕۆژی دواتر بچێتە کڵێسا و ڕێورەسمی ئایینی مەسیحی جێبەجێ بکات، بەو کەسە دەڵێن موسوڵمان؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر. بۆیە، دەتوانین بڵێین ئەوانە کافری سۆسیالیزم بوون.

با بگەڕێینەوە سەر باسی بێشکچی.

ساڵی ١٩٦٩ ئەوکاتەی ماڵمان لە ناوچەی سوعادیەی ئیستانبووڵ بوو، گەنجێکی موو زەردی بەڕێزی موحتەرەم هاتە ماڵەکەمان. خۆی پێناساندم کە یاریدەدەری مامۆستای زانکۆیە لە بەشی زانستە سیاسییەکانی ئەنقەرە. وەکو شانسێکیش بۆ کوردان، ئەو گەنجە ماوەی سەربازیی لە ناوچە کوردییەکانی وان و باشکەلە و شەمزینان تەواو کردبوو. ئەو کەسێکی کۆمەڵناس بوو. هەر خۆی نامەی دکتۆراکەی لەسەر عەشیرەتی عەلی کان ئامادە دەکرد، کە لەو ناوچەیە دەژیان. بۆیەش سەردانی کردم تا لەسەر نامەی دکتۆراکەی بیروبۆچوونمان بگۆڕینەوە. منیش، بە هاتنەکەی زۆر خۆشحاڵ بووم. زۆریش خۆشیم لە گێڕانەوە و قسەکردنی هات. ئیدی، لەو ڕۆژەوە تا ئێستا، مامۆستا ئیسماعیل نە لە من و لە پرسە ڕەواکەی گەلەکەمان جیا نەبۆوە.

ساڵی ١٩٧٢، لەگەڵ بێشکچی لەسەر پرسی کورد پەرستی لە دیار بەکر لە زیندانی عورفیی کارگێڕی چەندان ساڵ بەیەکەوە لە زیندان بووین. چەندان کورد پەروەری دیکەش لەگەڵ ئێمە دەستگیرکرابوون. بەڵام ئەو دۆسیەیەی لەسەر ئەو پرسە بۆ مامۆستا ئیسماعیلی تورك ئامادەکرابوو، لەوەی هەموومان ئەستوورتر بوو.

رێك ئەوە لە دەموچاو و حیرسی داواکارە گشتییەکان، بەرامبەر بە بێشکچی، دەخوێندرایەوە "هەتیو، قەینا ئەوانە کوردن، بەڵام پرسی نەتەوەیی ئەوانە بە تۆ چی ؟". لێرە، دەمەوێ بەسەرهاتێکی نێوانمان لەو دۆسیەیەی لەسەری دادگاییکراین، بگێڕمەوە:

ناوی دۆسیەکەی ئیسماعیل بێشکچی (سلۆپی و جزیرێ) بوو. داواکاری گشتی داوانامەیەکی ئامادە کردبوو، بۆ ئەو ٢٥ کوردەی لەوێ بووین، شەرەفەدین ئەلچیش لەگەڵ ئێمە دەستگیرکرابوو. بەڵام ئەو تۆمەتانەی خرابوونە پاڵ بێشکچی لە تەواوی ئەو تۆمەتانەی درابووە پاڵ ئێمە زیاتر بوو، لە هەرە تۆمەتە دیارەکانیش (دابەشکردنی تورکیا و پاڵپشتی کۆمەنیستی و کورد پەرستی) بوو.

لە کاتی دادگاییکردنەکەدا، داوای وەرگرتنی مافی قسەکردنم کرد. دادوەر ڕێگای دامێ. من لە کاتی بەرێوەچوونی دادگاییکردنەکانمدا، خووێکم هەبوو کە زۆر هێرشم دەکردە سەر داواکارە گشتییەکان، ئەوانیش لەبەر ئەوەی لەسەر حەق نەبوون، بۆیە، نەیاندەتوانی وەڵامم بدەنەوە. لەبەرامبەریشدا، قسەی خۆشم بۆ دادوەرەکان دەکرد و دڵم ڕادەگرتن.

ئەو ڕۆژە بەمشێوەیە دەستم بە قسەکردن کرد:

"جەنابی دادوەران، ئەو داواکارە گشتییە زۆر ڕەزیلە، چونکە ئیسماعیل بێشکچی و زیا گۆك ئالپ بەیەکەوە بەراورد ناکات. بێشکچی لەو پرسە جیا دەکەمەوە و پەرژین بێت بۆ ئەو، بەڵام ئەو قسەیە وەکو نموونەیەك باس دەکەم. زیا گۆك ئالپ کورد بوو، بەڵام بناغەی نەتەوەیی تورکایەتی دانا. لە یەکەمەکانی ئیتیحاد و تەرەقیش بوو. چەندان پەرتووکی بەناوی (توران و کزڵ ئەلما) نووسی. جگە لەمانە مامۆستایەتیی ئەتاتورکیشی کردووە. جگە لەوەی بۆ مەسەلەی تورکایەتیش زۆر کاری دیکەشی کردووە. کەچی ئێمە هیچ بەسەرخۆمان نەهێنا و نەمانگوت بۆچی کوردێك ئەوەندە خۆی بۆ نەتەوەی تورك ماندوو دەکا. ئێستاش، مامۆستا ئیسماعیل بێشکچیی تورك، خۆی بۆ گەلی کورد ماندوو دەکات. بۆیە، داوا لە داواکاری گشتی دەکەم دڵیان نەرم بێت و داوای ئازادکردنی ئەو مامۆستا مەعسوومە بکات و بێشکچییش بەراورد بکا بە گۆك ئالپ بۆ گەلی کورد. گەرچی ئێمە، وەکو کورد، ئیسماعیل بێشکچی لەگەڵ زیا گۆك ئالپ ناگۆڕینەوە، بەڵام قەینا با ئەو چاکەیەش بەر ئێمە بکەوێت.

بەرامبەر بەو قسە نایاساییانەم، داواکارە گشتییەکە زۆر پەست بوو و داوای کردنەوەی دۆسیەیەکی دیکەشی لەسەر کردم، بەڵام دادوەرەکان ڕێگایان نەدایە.

## جگەرخوێن

زۆرم بیرەوەری لەگەڵ جگەرخوێن هەیە. لێرەشەوە دانی پێدادەنێم، گەر من شتێك بم، لە سایەی ئەوەوە بووە. با بۆشتان باسکەم چۆن: ناوی عەشیرەتەکەی ئێمە (تەمکا)یە. ئەو عەشیرەتە لە ٢٥ گوند پێکهاتووە. بەڵام لە دوای یەکەمین جەنگی

جیهانییەوە، هەموویان کەوتنە سووریا، تەنیا ئەو گوندە نەبێ کە باوکم لەوێ دەژیا، واتە لادێکەی ئێمە کەوتە دەست تورك.

لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری تورکیا، خوێنی کورد زۆر هەرزان بوو، کێی حەزی چووبا پیاوکوشتن، سڵی لە هیچ نەدەکردەوە، جا پۆلیس با یان ژەندرمە، هیچ جیاوازییەکی نەبوو، کێیان ویستبا دەیانکوشت. گەر بەدوای ڕزگارکردنی گیانی خۆت کەوتبای، پێیاندەگوتی ئەشقیا. بۆیە، زۆربەی عەشیرەتەکەمان لە دەست تورکەکان ڕایاندەکردە سووریا، کە لەژێر دەسەڵاتی فەڕەنسییەکان بوو. کارەکە زۆر قورس نەبوو، چونکە فەڕەنسییەکانیش هیچیان لەگەڵ ئەو کەس و خێزانانە نەدەکرد کە پەنایان بۆ ئەوێ دەبرد، بەڵکو ئەوانیشیان لەسەر عەشیرەت و خێزانەکانی سووریا هەژمار دەکرد.

لەبەر ئەوەی لە ڕووی جوگرافییەوە لادێکەمان کەوتبووە سەر سنووری نێوان تورکیا و سووریا، بۆیە، زۆر کات، ناسیاوەکانمان دەهاتنە لای ئێمە. سەردەمانێکی هاتنە پێش کە زۆربەی ڕووناکبیرانی کورد و شێخ و ئاغاکانی چوونە سووریا. جا کێ نە چووبوو؟ بۆ نموونە (جەلادەت عالی بەدرخان و کامەران بەدرخان و ئەکرەم جەمیل پاشا زادە و دکتۆر نافیز و نوورەددین زازا و بەیتار نووری و قەدری جان و عوسمان سەبری و حاجۆ ئاغا و حەسەنی کوڕی و شوکرووە ئەمین و مەلا ئەلیاس ئونیس و چەندان کەسانی دیکە و مامۆستای ئەزیزم جگەرخوێن.

ئەو کوردانە، لە سووریا وەکو گرووپێك، ناوەندێکی سیاسی و کەلتووریان دامەزراندبوو. ڕووناکبیرەکان لە شام و حەلەب ڕۆژنامەیەکیان دەردەکرد. کورد لە سووریا و تەواوی ولاتانی عەرەبی و ئیران، لەگەڵ ئەوەی پیتی عەرەبیان بەکار دەهێنا،

بەڵام پێشوازییەکی گەرمیان لە ئەلف و بێی لاتینی کوردی کرد. ئیدی، لە شام کورد لەساڵانی سییەکان ڕۆژنامەیەکیان بە ناوی (هاوار) دەردەکرد. ڕۆژنامەکە ئەوەندە بەهێز بوو، دوای ٥٠ – ٦٠ ساڵیش، کورد بیری لەوە دەکردەوە ڕۆژنامەیەکی بەو شێوەیە دووبارە بڵاو بکاتەوە. ئەوسا هەریەکە لە جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان و قەدری جەمیل پاشا و قەدری جانی شاعیر و عوسمان سەبری و مەلا شێخ مووسی مێردینیی هاوشاریم، واتا جگەرخوێن، لە ڕۆژنامەکەیان دەنووسی.

ساڵانی سییەکان، لەبەر ئەوەی سنووری نێوان تورکیا و سووریا مین ڕێژ نەکرابوو، بۆیە، لە پشووی قوتابخانە بە ئاسانی دەچوومە سووریا و دەهاتمەوە. دەتوانم بڵێم ئەوسا لە تەواوی عەشیرەتەکەمان و ناوچەکە، جگە لە من، کەسێکی دیکە نەبوو بتوانی پیتی لاتینی بخوێنێتەوە. هەر بۆیە، تەواوی ڕووناکبیرەکان منیان خۆش دەویست و بەدەممەوە دەهاتن. بەڵام لە هەموویان زیاتر جگەر خوێن و عوسمان سەبری و قەدری جان گرنگییان پێدەدام. جگەرخوێن شیعرە نەتەوەیی و پڕ حەماسەکانی دیوانی یەکەمی خۆی بە من لەبەر دەکرد، منیش کە دەهاتمەوە تورکیا لەسەر زاران شیعرەکەم بە هەموو لایەك بڵاو دەکردەوە و دواتریش شیعرەکەم بە هەرزەکار و گەنجەکان ئەزبەر دەکردەوە. جگەرخوێن کاتی خۆی پیاوێکی ئایینی بووە، نازناویشی (سەیدا مەلا شێخ مووس) بووە. لەبەر ئەوەی دەرچووی قوتابخانە بووە، بۆیە مەلای دوازدە عیلمیشیان پێ گوتووە. چەندان زانستی وەك (کەلام و حەدیس و فیقە و بیرکاری و گەردوون ناسی و سەرف و نەحوو) و چەندانی دیکەی خوێندبوو. ماوەیەك دوای مەلایەتی، جگەرخوێن هەستی نەتەوایەتی بەسەردا زاڵ دەبێت و واز لە کەوا و سەڵتە دەهێنێت

و دەبێتە شاعیرێکی نەتەوەیی گەلی کورد. بۆیە، بەشێکی زۆر لە ئاغاکان و دەسەڵاتدارە ئایینیەکان دژی وەستانەوە و بە چەکێکی بەهێز، هەوڵی ناشرینکردنیان دەدا و دەیانگوت: "جگەرخوێن لە دین وەرگەڕاوە و کافر بووە". گەر لە دەستیان هاتبا، وەکو دادگای کریستانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، دادگاییان دەکرد و دەیان سووتاند. لەبەر ئەوەی منیش زۆر پەیوەست بووم بە جگەرخوێنی مامۆستامەوە، بۆیە، منیشیان لە لیستی کافران هەژمارکرد. لەو باوەڕەدام تا ئێستاش کەسانێك هەبن بەو چاوە سەیری من بکەن.

ئەوان بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر جگەر خوێن، ئەویش بە شیعری زۆر جوان وەڵامی ئەو کەرانەی دەداوە. لە شیعرێکیدا دەڵێ: "زانا دەزانێ من کێمە، کەرەکانیش پێم دەڵێن کافر". جگەرخوێن لە شیعرێکی دیکەیدا بۆ کوردان دەڵێ: "دین مەبە، ئەو نە دینە" لێرە ئوستاز دینی بە مانا مەجازییەکەی بە دوو شێوە بەکار هێناوە، جارێك دین وەکو شێت، جارێکیش دین وەکو ئایین. یانی لەو شیعرەدا دەیەوێ بڵێ: "کوردینە شێت مەبن ئەوەی ئێوە ئایین نییە!". لە شیعرێکی دیکەیدا ئاوا باسی ئەو کەسانە دەکات کە ئەویان قبووڵ نەبووە:

"من ڕاهیشت گوڵەك گەش،
دا بەر پۆزێ کەرێ ڕەش،
کەرێ کشاند چەند کەسەر
گۆ ئاخ کەربەش ئاخ کەربەش
چ دزانە ژ گولێ
ژ کەرا ڕا تەنێ کەربەش".

لەگەڵ ئەوەی جگەرخوێن لە سووریا دەماوە و منیش لە

تورکیا، کەچی، لەو دواییانە من و ئەویش بووینە پیاوی قەدەغەکراو لای حکوومەت. نە ئەو دەیتوانی بێتە تورکیا، نە من دەمتوانی بچمە سووریا، بە شێوەیەك چل ساڵە و ئێستاشی لەگەڵدا بێ، پاسەپۆرتم نادەنێ. ڕۆژێك جگەرخوێن پیاوێکی ناردە لام و بە مێشکە زیرەکەکەی پلانێکی بۆ یەکتر بینینمان دانابوو. ئەوسا شەمەندەفەری نێوان حەیدەر پاشای ئیستانبوڵ و بەغدا، سووریا و تورکیا بە هاوبەشی بەکاریان دەهێنا. شەمەندەفەر دوای ناوچەی (چۆبان بەی) دەچووە ناو خاکی سووریا، لەوێشەوە تا شاری حەلەب دەڕۆیشت. لەوێ ئیدی سەرنشینەکانی شەمەندەفەرەکە دەهاتنە خوارەوە و شەمەندەفەرەکە ترانسیتێکی دەکرد و دەگەڕاوە. لە ئاڕاستەی گەڕانەوە لە مەیدانی (ئەکبەر) لە خاکی سووریا دەر دەچوو و دەهاتەوە ناو خاکی کوردستان لە تورکیا. جگەر خوێن گوتبووی: "ڕۆژی هەینی داهاتوو من دێمە قامیشلۆ و سواری شەمەندەفەر دەبم، تۆش لە نوسەیبینەوە سواری شەمەندەفەر بە". چونکە هەمان خاڵی وەستانی شەمەندەفەر بوو. وەك ئەوەی پلانی بۆ دانابوو، وامان کرد. لەوێ بەیەکەوە سواری شەمەندەفەرەکە بووین و تا چۆبان بەی بەیەکەوە بووین. دواتر ئەو چووە حەلەب و منیش گەڕامەوە نوسەیبین. خوایە گیان ئەو ڕۆژە چ ساتێکی خۆش و شیرین بوو، هەردووکمان باوەڕمان بە چاوەکانی خۆمان نەدەکرد کە یەکدی دەبینین، باوەڕمان بە گوێیەکانمان نەبوو کە گوێبیستی دەنگی یەکدینە. ٤٥ ساڵیش بەسەر ئەو ڕۆژە تێپەڕیوە، بەڵام هێشتا خۆشی و کەلەجانی ئەو ساتانە لە دڵ و گیانمدا ماوەتەوە. دەتوانم بە ئێوەی خوێنەری ئەزیزیش بڵێم ئەو ڕۆژە ڕێڕەوی ژیانم گۆڕانی بەسەرداهات. کارەکتەری سەیدا و ئیرادە و هەستی نەتەوایەتی هەر سەربەرز

و بە ناموس وەك خۆی بوو. گەر بشتوانم وەسیەتەکەی بهێنمە جێ، ئەوە بۆ من دەبێتە گەورەترین شانازی و دڵخۆشی.

زۆر بە دڵتەنگییەوە دەیڵێم، دوای ئەو دیدارە جارێکی دیکە بە یەکدی شاد نەبووینەوە. بەڵام تا ئەو ڕۆژەی لە غوربەتدا لە وڵاتی سوید گیانی سپارد، بەردەوام بە نامە گۆڕینەوە پەیوەندی نێوانمان بەردەوام بە گڕ و تین بوو. دوای کۆچکردنیشی، تەرمەکەی هێندرایەوە سووریا و لە قامیشلۆ لەناو باخچەی ماڵەکەی بە خاکیان سپارد. ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی تەرمەکەی بۆ هیچ کوردێکی دیکە بەو شێوەیە گەورە و قەرەباڵغە بەڕێوە نەچووبوو. خەڵکەکە بە ئۆتۆمبێل و پاس و تراکتۆر و لۆری لەسەر سنوور نۆرەیان گرتبوو تا بچنە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی و سەرەی وەستانی ئۆتۆمبێلەکان گەیشتبووە ٣٠ کیلۆمەتر. من نەمتوانی بچم، بەڵام هەردوو کوڕەکەم و شەش برازا و هەموو گەنجە کوردەکانی سوید و شاعیرە کوردەکان لە ماڵئاوایی کردنی تەرمەکەی جگەرخوێن ئامادەبوون. منیش لە باخچەکەی خۆم چەپکە گوڵێکی ڕەنگ زەرد و سوورم نارد تا لەسەر گۆڕەکەی بچینن. لەگەڵ ئەوەی حەسرەتی لەدەستدانی ئەو لای من تەواو نابێت، بەڵام چیبکەم منیش بەو گوڵانەی بۆ سەر گۆڕەکەیم نارد لەگەڵ جێبەجێکردنی ئەو وەسیەتەی پێی گوتم، دەمەوێ گەر تۆزێکیش بێت دڵی خۆم بدەمەوە.

گۆڕی پڕ نوور بێت.

وەکو لەسەرەتاش باسمکرد، من پەروەردەی نەتەوەییم لە جگەرخوێن و هەڤاڵانی وەرگرتووە. وەك ئەوەی ئاگری دەستپێکی ئۆڵمپیادێك بدەنە دەست من کە پێشبڕکێکە لەسەر خزمەتکردنی نەتەوەی کورد بێت، منیش دەمەوێ ئەو ئاگرە بدەمە دەست گەنجانی کورد.

ئیدی دەمەوێ بەوەندە جگەر خوێن بە ئارامی جێبهێڵم...

## ئەو پیلانە فەرمییە ئاست نزمەی بەرامبەریان کردم

ساڵی ١٩٦٩، دوای ئەوەی ماوەی ڕاگواستنم بۆ چەنەقەلە تەواو بوو، گەڕامەوە ناو ماڵ و منداڵەکانم. بێگومان چەند پۆلیس و میتی بێ ئیش و کار و جاهیل هەبوو، بۆ پەیداکردنی پارووی ژیانی ڕۆژانەیان بەدوای من کەوتبوون. دوای گەڕانەوەم، ساڵی ١٩٧٠، بزافی کرێکاری و خەڵك دروستبوو. ئیێ بۆ ئەوەی بەرپرسیارییەکەی بخەنە ئەستۆی من ئەوە بەهانەیەکی چاك بوو. لەکاتێکدا ئەو سەردەمە زوو زوو یلماز گونەیی و دەنیز گەزمیش و حوسێن جەواهیری سەردانیان دەکردم. عومەر ئایینای هاوشاریشم بۆ من وەکو کوڕم وابوو. لە هەمان کات سینان جەمگیلی دۆستیشم لە پارتی کرێکارانی تورکیا کاری دەکرد، عەدنان جەمگیلیش بەهەمان شێوە. جا ئەو دووە لەبەر دایکیان زۆر منیان خۆش دەویست و زوو زوو دەهاتنە لامان. ئیدی بەو تۆمەتانە لە ساڵی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤ بە چەند جار و ماوەی جیا جیا ٣٦ مانگ لە زیندان پاڵکەوتم.

گەر تەمەن ڕێگام بدا، دەمەوێ لە بەرگی سێیەمی ئەو پەرتووکە باسی ئەو زیندانیکردنانەشم بکەم لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا.

بەردەوام گوتوومە، دەوڵەتی کۆماریی تورکیا، لەگەڵ ئەوەی بەردەوام تاوانبارە، کەچی ئەو بەردەوام لە هاوولاتیی بێ تاوان خۆشدەبێ. منیش بەو ستایلە لە زیندانی کارگێڕیی عورفیی دیاربەکر دەرچووم. بەڵام تەنیا هێسك و پێست مابوومەوە. چونکە لەلایەک ڕۆژم پێنەدەکەوت و لەلایەکی دیکە ئەو ئەشکەنجانەی دەیاندام، قاچەکانم شین و مۆر و هێسکی

جەستەشم قاوەیی ببوون. ئەوەندە پەرێشـان ببـووم، گەر یەکێـك قۆڵی نەگرتبام نەمدەتوانی بە ڕێدا بڕۆم.

وتەیەکی پزیشکی هەیە دەڵێ: "سەرچاوەی بیرکردنەوەیەکـی تەندروست، جەستەیەکی تەندروستە". منیش کاتێـك بەو حـاڵ و ڕۆحە دەروونییەوە لە زیندان دەرچووم، بەو جەسـتە لەڕ و لاواز و داڕزاوەم، بیرم کردەوە "هەتیو مووسا چارەسەرکردنی کێشـەی کۆماری تورکیا بۆ تۆ ماوەتەوە؟ واز بێنە و چیان بەسەر دێت بـا بـێ، ملیـان بشـکێ". ئیـدی هەمـوو چـالاکییە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکانم واز لێهێنا و گەڕامەوە لادێکەی خۆمان بۆسـەر زەویی بـاب و بـاپیرانم و لەوێ نیشـتەجێ بـووم. ئـاو و هەواو و مرۆڤـی لادێکەمـان جـوان و ئـارام بەخـش بـوون. بـێ ئەوەی چارەسـەرێکی زۆر پزیشـکی وەرگـرم، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەسـتمدەکرد تەندروسـتیم باشـتر دەبـێ. لە کاتێکـدا دوای دەرچوونم لە زیندان چاوەڕوانی مردنیان دەکردم، بەڵام ئەوە ٢٥ ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژە ناخۆشانە تێپەڕ دەبێـت و تـا ئێسـتا سـاغ و سەلامەتم و دەڵێی کاکلە گوێزم.

من خۆم لە هەموو شتێك دوور دەخستەوە، وەلێ بۆچوونێکی فەسـادی فەرمـی وازی لە مـن نەدەهێنـا و بەردەوام بە دواوەم بـوون. سـاڵی ١٩٧٨ حەنەفـی ئۆغلـووی قائیمقـامی نوسـەیبین و فەرمانـدەی ناوەنـدی ژەنـدرمە و بەرپرسـی بـنکەی سـەربازیی لادێکەمـان، پیلانێکیـان دژی مـن ئامـادە کردبـوو. ئەو قائیمقـامە ئێستا پارێزگـارە. لە کاتێکـدا ڕەگەزپەرسـتێکی بەرچـاو تـاریکی سەیرە. بەڵام لە هەموو شوێنێك دەموچاوی ڕاستەقینەی خـۆی بە ماسکی ئیسلامی دەشارێتەوە. جا منیش لەناو ئەو پیاوە بە ڕێـز و موحتەرەمانە لە لادێکەی خۆم ژیانێکی شاعیرانەم بەسـەر دەبـرد. لە لادێـی زڤینگێمـان کشـتوکاڵ و ئاژەڵـداریم دەکـرد، لە

ئاکارسـووش بـاخی میـوه و گـوڵ و گـوڵزارم هەبـوو. جـا حەوزێکی جوان و خۆشیشم دروستکرد کە لە نـاوچەکەدا شتی وا هەر نەبوو. منیش وەکو خەڵکی ئاوایی هەمان ئەو بـنە دارانەم چاندن کە ئەوان دەیانچانـد و لە نـاوچەکە پێدەگەیشتن. لەگەڵ ئەوەش، لە ئیستانبووڵەوە چەندان جۆری جیـاوازی تـۆی میـوه و سەوزە و گوڵم لەگەڵ خـۆم بردبـوو، کە هیچیـان لە کوردسـتان نەبـوون، بەڵکـو تەنیـا لە ئیسـتانبوول و چەنـد نـاوچەیەکی دیـکە دەچێنـدران. لە بـاخچەی مـاڵەوە مریشـك و مێش هەنگـوین و کەروێشـکم بەخێـوکرد. وەکـو گـوتم بە هەمـوو شـێوەیەك دەمویست لە سیاسەت دوور بکەومەوە، بەڵام دیسان سەرکەوتوو نەبووم. چونکە بێ ئەوەی من بزانم، مامۆستایەکی ڕەگەزپەرستی تورکچیی نهێنی هەبوو لە لادێکەمان. ڕۆژێك چوومە دیـاربەکر، ئەو گرووپە سیخوڕەش وادەزانن من لە لادێکەی خۆمانم، بـۆیە فەرمانی هێرشکردن و وێرانکردنی ماڵەکەم بە فەرماندەی بنکەی سەربازیی گوندەکەم دەسـپێرن، ئەویـش شـەو دەچێـتە مـاڵی ئەو مامۆستایە و بۆ جێبەجێکردنی ئەو پیلانەی فەرمـانی پێکرابـوو تـا بۆمـب بخـاتە نـاو مـاڵەکەی مـن. ئەفسـەرەکە دەڵێـتە مامۆسـتاکە منداڵەکانی لای خۆی بباتە هۆدەکانی پشتەوەی خانووەکە. ئینجا مامۆسـتاکە و فەرمانـدەکە لە ژوورەوە بـۆمبە دەسـتییەکە لە پەنجەرەوە فڕێدەدەنە دەرەوە بۆ ماڵەکەی من، بەڵام بـۆمبەکە بەر چوارچێـوەی پەنـجەرەکە دەکەوێـت و ئـاگر دەگـرێ و دەگەڕێـتەوە ژوورەوە، فەرمانـدەکە زۆر بەپەلە ڕوومـانەکە هەڵـدەگرێتەوە و دەیەوێ دووبـارە بیهـاوێتە دەرەوە، بەڵام لەنـاو دەستی دەتەقێتەوە و قۆڵی دەپەڕێنێت.

کاتێك ڕووداوەکە بەو شێوەیە ڕوودەدات، ئەفسەرە پـلە یەکەکەی نوسـەیبین چاوەڕوانی هەواڵێکی خـۆش نەقـاش ئۆغلـووی

دەکات لە جێبەجێکردنی پیلانەکە، بەڵام لەناو ئەو چاوەڕوانیەدا چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداوەکەی پێڕادەگەینن، بۆیە، لەگەڵ هەواڵەکە شێت و هار دەبێت و دەکەوێتە ڕێ و بەرەو لادێکەمان دێت و یوسف ئای دۆغمشی برازام، کە سەرۆکی شارەوانی بوو، لەگەڵ مامۆستا یوسفی لادێکەمان و سەرجەم ئەو گەنجە نیشتمان پەروەرانەی کە مامۆستا سیخوڕەکە و قەرەقۆلی ئەوێ خۆشیان نەدەویستن، هەموویان دەستگیر دەکەن. ئەوانەی دەستبەسەرکرابوون دەبردرێنە سەدی نوسەیبین و دوای ئەوەی شل و کوتیان دەکەن لەگەڵ لێدان، ئینجا بەو سەرمای زستانە دەیانخەنە ناو ئاو و دەریان دەهێنن. ئینجا بە پلایس سمێڵ و خەنافسی مامۆستا شوکر دەردەهێنن. ڕۆژێك دوای ئەو ڕووداوانە سەعادەت عەنتەری برازام هاتە دیاربەکر و ڕووداوەکەی بۆ باسکردم و ئەوەشی پێڕاگەیاندم، کە فەرمانی دەستگیرکردنیشت لە غیابی خۆت بۆ دەرکراوە.

لەبەر ئەوەی باش شارەزای وەحشیەتی ژەندرمە ببووم، بۆیە، تەکسیەکم گرت و چوومە دادگای نوسەیبین. لەوێ دادوەرم بینی و پێم گوت: "جەنابت چۆن فەرمانی دەستگیرکردنی من دەردەکەی؟". دادوەرەکە شەرمەزار بوو، هەندێك منجە منجی کرد. ئینجا عەباکەی لەبەر کرد و دانیشتنێکی ساختەی ڕێکخست. کاتیبی دادگاکە کچێکی کوردی خەلکی دێرك بوو. ئەو پێی گوتم: "مامە ئەوانە دەڵێنە دادگا مووسا دەستگیر دەکەین و لێرە دەیخەینە زیندان، بەڵام لە ڕاستیدا دەتبەنە ناوەندی قەرەقۆلی سەربازی و لەوێ ئەشکەنجەت دەدەن و سووکایەتیت پێ دەکەن، بۆیە ئامان ئاگادار بە!". منیش ڕووداوەکەم بۆ دادوەر و داواکاری گشتی گێڕاوە. دادوەریش بڕیارەکەی گۆڕی، ئیدی دەبوو بچمە زیندان. عەریفەکە دوای

بڕیارەکە قۆڵی گرتم و منی پێش خۆی دا، بەڵام دادوەر گوتی: "هەتیو ڕاوەستە چی دەکەی؟". ئینجا دادوەر سەر کاتیبی دادوەری هێنا لای خۆی و بە عەریفەکەی گوت: "سەیرکە عەریف! مووسا لێرەوە ڕاستەوخۆ، بێ ئەوەی ببردرێتە هیچ شوێنێکی دیکە دەبردرێتە بەندیخانە و ڕادەستی ئەوانی دەکەیت. ئەرکی تۆش ئەوەیە بەبێ ئەوەی ئەو هەڵبێت ڕادەستی بەندیخانەی بکەیت". بەو شێوەیە عەریف و ئەفسەرە پلە یەکەکە لە حەژمەتی حیرسی خۆیان خەریک بوو بتەقن و هیچیان پێ نەکرا، بۆیە، ڕاستەوخۆ منیان بردە بەندیخانەی نوسەیبین. دەرگاوانەکانی زیندان، لەبەر ئەوەی زۆربەیان خەڵکی ناوچەکەی خۆمان بوون، ڕێز و حورمەتێکی زۆریان گرتم. وەلێ شوێنەکە تا بڵێی پیس و پۆخەڵ بوو. لەگەڵ ئەوەی شوێنەکە ٣٠ ساڵ بوو دروستکرابوو، بەڵام بۆ جارێکیش بێت نە نۆژەنکرابۆوە، نە فڵچەیەك سبوغی پێکەوتبوو. بەلوعەکان سیلاك ببوون و کاریان نەدەکرد، دیوارەکان پیس و پڵتۆخ بوون. ڕۆژێك داواکاری گشتی هاتە بەندیخانەکە، منیش پێم گوت: "جەنابی داواکاری گشتی، حکوومەت بێ دەرامەتە و پارە نادات بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەو بەندیخانەیە، بۆیە گەر ڕێگا بدەن من لەسەر ئەرکی خۆم دەمەوێ ئێرە نۆژەن بکەمەوە". داواکارە گشتییەکە گوتی: "جا لەبەر چی ئەو کارە دەکەی؟ یان ئەوەش پڕوپاگەندەیەکە بۆ خۆت؟" وەڵامم داوە: "شتی وا لە گۆڕێ نییە، جەنابی داواکاری گشتی، چونکە لەناو ئەو هەموو دەزگا فەرمییەی دەوڵەت تەنیا زیندان بەر ئێمە دەکەوێت، بۆیە، مادەم زیندان بووەتە ماڵ و موڵکی ئێمە، هەر هیچ نەبێ با خاوەنداریەتیی بکەین".

لە کۆتاییدا داواکارە گشتییەکە ڕێگای دا کارەکە بکەین.

ئینجا دەستمان بە کارەکانی کرد و لە ماوەیەکی زوو کۆتاییمان پێهێنا. دوای ئەوەی ٤٠ ڕۆژ لەوێ مامەوە، ئینجا منیان بردە بەندیخانەی دیاربەکر. تومەزە بەڕێوەبەری بەندیخانەکە تورانی بوو و منی بە دوژمنی خۆی دەزانی. بۆیە، پێداگریی لەسەر ئەوە کرد کە دەبێ قژی بتراشن، لەسەر ئەوە هاتمە دەنگ: "جەنابی بەڕێوەبەر، من گەنج نیمە تا حەزم بە قژی خۆم بێت، بەڵام لەو باوەڕەدام بەیانی دانیشتنی دادگامان هەیە و بڕیاری دادگاش بۆ من ئازاد کردنمە، بەڵێنیش بێت گەر بڕیاری ئازاد کردنم دەرنەچوو و لای تۆ مامەوە، نەك قژم، بەڵکو ئازادی گەر سەریشم ببڕی". سەرەڕای ئەو هەموو قسەکردنە، بەڕێوەبەر سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی بڕیارەکەی، منیش بۆ ئەوەی ڕووداوێکی ناخۆش ڕوونەدات، قژم تراشی.

ڕۆژی دواتر، من و چەند هەڤاڵێکی دیکەمیان بردینە دادگای ئاسایشی دەوڵەتی دیاربەکر. بڕیارنامە و بەڵگەکانی دژم زۆر سادە و گاڵتەئامێز بوون، وەبگرە دادوەرەکانیش سەریان سوورمابوو. بۆ نموونە شاهیدێك هەبوو بە ناوی حەمید ئەڵماس کە شاهێدیی دژی من دەدا. ئەو تازە لە سەربازی گەڕابۆوە، لەبەردەم دادوەر بە شێوەی وەستانی فەرمی سەربازی وەستا و گوتی: "کەرەمکەن گەورەم". دادوەر لێی پرسی: "کوڕم کێ سەردانی ماڵەکەی مووسا عەنتەری دەکرد؟" گەواهیدەرەکە لە وەڵامدا: "یونس ئەڵماس دەچوو، گەورەم". دادوەر: "باسی چیان دەکرد کوڕم؟ "شاهێد" باسی چیرۆك و بەسەرهاتەکانی دێرسیمیان دەکرد". دادوەرەکە سەیری کرد ئەو کوڕە لە ڕووی دەروونییەوە تەواو نییە، بۆیە، هیچی دیکەی لێ نەپرسی. ئینجا لێیخوڕیەوە: "هەتیوە حەمید تۆ زمانت لە باوکت دا، یونس ئەڵماس باوکی خۆتە". "چی بکەم، چونکە نازناوی ئەوانەی

دیکەم نەدەزانـی کە دەهـاتنە لای مووسـا عەنـتەر". حەمیـد ئـاوا وەڵامی دادوەری دایەوە.

ئیدی، دادگا بڕیاری ئازادکردنی دەرکردم. ئینجا داواکـاری گشتی هاتە زیندان و داوای لێبووردنی لێ کردم، بەڵام منیش بە ئاماژەکردن بە بەڕێوەبەری بەندیخانە، کە لەتەك من بوو، گـوتم: "جەنـــابی دادوەر ئێـــوە لە بـــری ئەوەی دەروونناســـێك، یـــان دکتۆرێك بکەنە بەڕێوەبەری بەندیخانە، هاتوون کەرێـك دەکەنە بەڕێوەبەر". داواکارە گشتییەکە پێکەنی و بەڕێوەبەرەکەش وەکـو سەفیلێك سەری شۆڕکردەوە و هیچی نەگـوت. لە دادگـاش ئەو داواکارە گشتییە سەربازییەی پلەی عەمیـدی هەبـوو، کاتێـك لە تەکمەوە تێپەڕی ڕامگرت و پێم گوت: "ئەرێ ئێوە چیتان لە من دەوێ؟ بەڵگەی ئاوا سووك و چرووك دژی مـن ئامـادە دەکەن". ئەویـش بە پێکەنیـنەوە: "دە واز بێـنن کـاك مووسـا، بە هەنجەتـی تـۆوە ئـێمەش نانێـك بـۆ مـاڵ و منـداڵەکانمان پەیـدا دەکەیـن". دۆسیەی دادگاییکردنەکەمان بەردەوام بوو، بەڵام بەبـێ ئەوەی لە زیندان بین. بەڵام دۆسیەکەم لە دادگـای ئاسایشـی دەوڵەتەوە بـۆ دادگـای دووی تـاوانە گرانەکـانی مێـردین گواسـتراوە. چـووینە دادگـا، لەوێ ئەو ئەفسـەرەش هـات کە دەسـتی پەڕیـوو، بینـیم گۆرەوییەکی ژنانەی درێژی لە دەسـتی هەڵکێشـاوە. دادوەر زوو زوو ناوی ئەفسەرەکەی دەهێنا. منیش گوتم: "جەنابی دادوەر، لە گوندەکەی ئێمە منداڵانیش بە تۆنترەقە ماسی دەگرن، لە خـوا بە زیاد بێ هیچ ڕۆژێکیش کارەساتێکیان لەدەست ڕوونەداوە. بۆیە، گەر یەکێـك نەزانـێ تـۆنترەقەیەك یـان ڕوومـانەیەك بتەقێنـێ و لەسـەر ئەوە قـۆڵێکی خـۆی بپەڕێنـێ چـۆن پێیـدەڵێن ئەفسـەر؟ چونکە بە بۆچوونی من باشترە پێی بڵێن جاهیلی کوڕی جاهیل".

دوای ئەوە کـچە حەفـت سـاڵانەکەی ئەفسـەرەکەیان هێنـا

بەردەم دادوەر تا شاهێدی لەسەر ئەو شتانە بدات کە بینیبووی. دادوەر چۆنیەتی ڕوودانی تەقینەوەکەی لە منداڵەکە پرسی. ئەویش بەو شێوەیە دەستی بە باسکردنی کرد: "بەڕێزم ئێمە چووینە ماڵی مامۆستاکەمان، باوکم ئێمەی بردە ژووری دواوە، من لە لێواری دەرگاوە سەیرم دەکرد. ئینجا باوکم شتێکی فڕێدا دەرەوە، بەڵام ئەو شتە بە پەنجەرەکە کەوت و گەڕاوە ژوورەوە، باوکم دیسان دەستی داوە ئەو شتە، ئینجا لە دەستی تەقیەوە و قۆڵێکی پەڕی". جا بەر لەو گێڕانەوەیەش دادوەری نوسەیبین کاتێك کەشفی شوێنی ڕووداوەکەیان کردبوو، بینیبووی کە وردە جامە شکاوەکان گشتیان لە دەرەوەن. بەو شێوەیە باوەڕی بەوە هاتبوو کە ڕوومانەکە لە دەرەوە نەهاوێشتراوەتە ژوورەوە. بۆیە من و بەشێك لە خزم و ناسیاوەکانم دوای ئەشکەنجە و زیانێکی ماددی و مەعنەوی، بڕیاری بێ تاوانیمان بۆ دەرچوو. لەگەڵ ئەوەی لەو جۆرە ڕووداوانە زیانێکی ئەوتۆی مەعنەویم نەدەکرد، چونکە سوپاس بۆ خوا لە ژیانمدا ڕووداوێکی وەهام نییە سەرم پێی شۆڕبێ، بە پێچەوانەوە شانازی بەو هەموو دەستگیرکردن و دۆسیانەم دەکەم.

## فەهمی قوڕاڵ

ساڵی ١٩٣٦، نرخی خوێنی کورد، لە نرخی کیلۆیەك پیاز هەرزانتر ببوو. دۆخی گەلی کورد وەك ئەو ڕانە مەڕە بوو کە گورگیان بەناو دەکەوێ. هێزەکانی ئاسایشی دەوڵەت، بۆ زەوق و شەوقی خۆیان پیاویان دەکوشت. لە نێوان ساڵانی ١٩٢٩ تا ١٩٣٥ لە قوتابخانەی سەرەتایی مێردین دەمخوێند. ئەوسا، لەبەردەم دەروازەی شار، تەختێك بە قەد گەورەیی دارەبازەیەك

دروستکرابوو. هەموو ڕۆژێك جەستەی کوردێکیان دەهێنا ئەوێ کە خەڵتانی خوێن کرابوو. مەبەستی سەرەکیش بریتی بوو لە چاوترساندنی هاونیشتمانیانی کورد زمان. ئەو جەستەیە بەو شێوەیە دوو سێ ڕۆژ دەماوە، تا بۆنی دەکرد و مێش و مەگەزی لێ کۆ دەبۆوە، ئینجا پارێزگار بڕیاری لابردنی ئەو جەستەی دەدا و لە شوێنی ئەو کەسێکی دیکە پارچە پارچە دەکرا و خەڵتانی خوێن دەکرا و لە شوێنەکەی دادەنرا. ئینجا دیسان ئەو تەرمانە هەڵدەگیرانەوە و دەیانبردنە شوێنێکی نادیار و لە شوێنی ئەوانیش بەردەوام جەستە و تەرمی نوێی دیکەی گەنجانی کورد نمایش دەکران. لە یەکێك لەو ڕۆژانە، گیان لەدەستدانی بەنگۆی خەلکی گوندی کوردیسم بینی، من ئەوم بە خاڵی خۆم هەژمار دەکرد، چونکە خەلکی لادێکەی دایکم بوو. ئەوەم هەرگیز بیرناچێتەوە کە چۆن وەکو گونیەیەك گەنم و جۆ لەسەر زگ خستبوویانە سەر پشتی هێسترێك. ئەو کوڕێکی قۆز و درێژ و چوار شانە بوو. لەبەر ئەوەی تازە کوژرابوو، بۆیە هێشتا ڕەنگی جەستەی تێك نەچوو بوو. بەسەر پشتی هێسترەکەوە خەنەی ناو لەپی دەست و قاچەکانی تەکە کیان بوو.

ئەویان هێنایە بەردەم دەروازەی شار. ژەندرمەکان وەك ئەوەی بارێك عەلەف فڕێبدەنە خوارەوە، ئەویان لەسەر پشتی هێسترەکە فڕێدا سەر تەختەکە. ئینجا خستیانە سەر پشت و لەوێ درێژیان کرد. لێی نزیك بوومەوە و سەیری چاوەکانیم کرد، ئەویش چاوەکانی زەقبوون. بۆیە، لەو تێڕامانە بۆخۆم ئەو مانایەم لێ دەرهێنا: "مووسا، کوڕی خۆم سەیرکە حاڵم چۆنە؟ جا چ پێویست ناکا شتێکت پێبڵێم و باسی دۆخی خۆمت بۆ بکەم".

لەو ساڵانە فەهمی فوراڵی بەڕێوەبەری پۆلیسی ئیستانبووڵیان بە پارێزگاری مێردین دامەزراند. کابرا هەم دادوەر بوو هەم

جەلاد، دەتوانم بڵێم هەمیش وەحشی. ئەو پارێزگارە تازەیە، کوردی مێردینی بە کۆمەڵ بەبەهانەی ئەوەی دەیانئێریتە دیاربەکر بۆ کارکردن بە ڕێ دەخست و لەلایەکی دیکەش فەرمانی بە ژەندرمە دەکرد لە ڕێگا لە شوێنێکی گونجاو بیانکوژن. هەر کۆمەڵێک لە ١٠ کەس پێک هاتبوون، ئینجا یەکێک لەو کۆمەڵانە باپیرەم و محەمەد ئاغا و هەندێک لە خزمەکانی ئێمەی تێدابوو. ئەو ژەندرمەیەی لە ڕێگا، دەیەوێت بیانباتە شوێنێك بۆ کوشتنیان، بە محەمەد ئاغا دەڵێ: "ئاغا ئێستا ئێمە ئێوە دەکوژین، بەڵام لەبەر ئەوەی چەند ڕۆژێکە دەستبەسەرن، ڕێگاتان دەدەم بچنە سەر ئەو ئاوەی نزیك ئێرە، تا گەر کەسێکتان بێ دەست و نوێژە یان غوسلی لە خۆی دەرنەکردووە، تا بچێ کارەکانی خۆی بە جێ بهێنێت. حوسێنی کوڕی محەمەد ئاغا و چەندانی دیکە، کاتێك غوسل لە خۆیان دەردەکەن تا دواتر دەستونوێژ هەڵبگرن، دەبینن چەند ئۆتۆمبێلێك دەگەنە سەریان. حوسێنی کوڕی ئاغا لەبەر ئەوەی تازە لە عەسکەری گەڕابۆوە، بۆیە دەزانێ ئەوەی لە پێشەوەی ئۆتۆمبێلی یەکەم دانیشتووە ئەفسەرێکی پلە بەرزە. بۆیە یەکسەر بە ڕووت و قووتی لە ناو ئاو دێتە دەر و پێش بە ئۆتۆمبێلەکان دەگرێ، ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە دەوەستن. سەرەتا وا دەزانن شێتە، بەڵام لەبەر ئەوەی حوسێن دەیزانی بە تورکی قسە بکات، بۆیە بە شەرمەوە دەستی لەسەر جێی عەیبی دادەنێ و ڕووداوەکە بۆ ئەفسەرەکە دەگێڕێتەوە. ئەفسەرەکە کەسێکی سالح بووە، بۆیە، عەریفەکەی ژەندرمە بانگ دەکات و ئەویش ڕووداوەکە پشت ڕاست دەکاتەوە، لێ عەریفەکە دەڵێ: "ئەوە فەرمانی پارێزگار و فەرماندەی ژەندرمەی مێردینە"، ئەفسەرەکە لێیدەخوڕێتەوە: "هەتیو شتی وا چۆن دەبێ". جەنابی ئەفسەر

ژەندرمە و دەستگیرکراوەکان دەهێنێتەوە مێردین. کاتێك دەچێتە لای فەهمی ڤوراڵ بۆ زانینی هۆکاری جێبەجێکردنی کارێکی وەها، پارێزگار دەڵێ فەرمانەکە لە ئەنقەرەوە بەو شێوەیە هاتووە. بەڵام ئەفسەرەکە واز ناهێنێ و تەلەگراف بۆ ئەنقەرە دەکا و بە تەلەفۆنیش ڕازییان دەکات کە ئەو گیراوانە ئازاد بکات. ئینجا دوای ئەو بەسەرهاتە ئەو تاوانانە کۆتاییان پێدێت. بەڵام بە داخەوە باپیرەم، واتا باوکی دایکم دوای ئەو ئەشکەنجە زۆرە لە تەمەنی ٨٥ ساڵ دابوویان، بەرگە ناگرێ و مانگێک دواتر کۆچی دوایی دەکات.

ئەو فەهمی ڤوراڵە زاڵمەی پارێزگاری مێردین، هەرچی گەنجی کوردی قۆز هەبوو لەناو شەقام بە پۆلیس دەستگیری دەکرد و ئەشکەنجەی دەدان، کاتێك ئەوان بەدەست ژانی جەستەیانەوە هاواریان دەکرد، ئەویش وەحشیانە قا قا پێدەکەنی. ئەو پارێزگارە زۆری لەسەرە، بۆ نموونە ئاغای کوردانی بانگهێشتی شوێنەکەی خۆی دەکرد و وەکو کەر سواری سەر پشتیان دەبوو، ئینجا پێدەکەنی و حەنەکی خۆی پێدەکردن.

کاتی خۆی عادەت بووە کە پارێزگارێکی نوێ دەهات، بەڕێوەبەری سەرجەم فەرمانگەکان بۆ بەخێرهێنانی دەچوونە لای، دوای هاتنی فەهمی ڤوراڵیش، بەڕێوەبەری فەرمانگەکان، بە فەرماندە سەربازییەکانیشەوە هەمان کاریان کرد، بەڵام، شەهاب یلدرمی بەڕێوەبەری فەرمانگەی کشتوکاڵ نەچوو. پارێزگار، هەموو ئێوارەیەك لەگەڵ دکتۆر عەزیز ئوراڵی سەرۆکی شارەوانی عارەق دەخۆنەوە. ڕۆژێك پارێزگار بە کاك عەزیز دەڵێ: "بەڕێوەبەری فەرمانگەی کشتوکاڵ نەهاتە بەخێرهاتنم، دەبێ هۆکارەکەی چی بێت؟". ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: "هەر کاتێك بینیم لێی دەپرسم هۆکارەکەی چییە".

سەرۆکی شارەوانی ڕۆژێك کاك شەهاب دەبینێ و لێی دەپرسێ: "کاك شەهاب جەنابی پارێزگار لە تۆ دەپرسێ، بۆچی نەچوویتە پیرۆزبایی و بەخێرهاتن کردنی؟". کاك شەهابیش دەڵێ: "کوڕە دەبڕۆ پارێزگار کوڕی چ قەحپەیەکەا" کاك شەهاب کوڕی یەکێك لەو خێزانانەیە کە بە بەڵای خوا دادەنرێن لە دیاربەکر. لە ئەوروپا بەشی کشتوکاڵی تەواو کردووە و پیاوێکی مەرد و چاونەترس و جوامێرە.

دکتۆر عەزیزی بێ عەقڵ ڕووداوەکە وەك خۆی بۆ پارێزگار دەگێڕێتەوە. چەند ڕۆژێك تێدەپەڕێ و ئێوارەیەك پارێزگار و عەزیزە فەندی لە بالکۆن هەمدیسان عارەق دەخۆنەوە. کاك شەهاب لەشەقامەکەی پێشیان تێپەڕ دەبێت، عەزیز بە پارێزگار دەڵێ: "ئەوە بەڕێوەبەری فەرمانگەی کشتوکاڵەکەتە". پارێزگاریش ڕاستەوخۆ پۆلیس دەنێرێت تا بانگهێشتی بکەن. کاك شەهاب دێتە لای پارێزگار و بە ڕقەوە پیرۆزبایییەکی ساردی لێدەکا. ئینجا پارێزگار لێی دەپرسێ: "کاك شەهاب بە بۆچوونی تۆ تەمەنی من چەندە؟" کاك شەهاب لەگەڵ ئەوەی دەزانێ تەمەنی گەورەیە، بەڵام بە قەست دەڵێ: "چل یان چل و دوو ساڵێ". پارێزگار دەڵێ: "نا نا زیاتر". کاك شەهاب: "٤٥ – ٤٧" پارێزگار: "نا نا هێشتا سەرکەوە". بەو شێوەیە تا تەمەنی ٥٦ ساڵی بەسەر دەکەون. ئینجا پارێزگار دەپرسێ: "باشە دایکی کەسێکی ٥٦ ساڵی دەبێ چەند بێ؟". کاك شەهاب وەڵام دەداتەوە: "جەنابی پارێزگار لەسەردەمی عوسمانییەکان تۆماری فەرمی ناسنامە نەبووە، کچ زوو مێردیان دەکرد، بۆ نموونە لە تەمەنی ١٣ – ١٤ ساڵی بە شوو دەدران.". پارێزگار دەڵێ: "نا نا بە شێوەیەکی ئاسایی لە تەمەنی ٢٠ ساڵی مێردیان دەکرد، بۆیە گەر بەو شێوەیە هەژماری بکەین ئێستا دایکم تەمەنی چەندە؟" کاك شەهاب وەڵامی دەداتەوە: "بەڕێزم ٧٦ ساڵە تەمەنی".

پارێزگـار دەڵـێ: "باشـە کەس هاوسـەرگیری لەگەڵ خـانمێکی تەمەن ٧٦ سـاڵان دەکـات؟". کـاك شـەهاب گـوتی مـن لە مەسـەلەکە گەیشتبووم و زانـیم کە کـاك عەزیـز چ هەڵەیەکـی کـردووە، بـۆیە بەو ڕستەیە دۆخەکەم هێـور کـردەوە: "جەنـابی پارێزگار گەر تەمەنی بچووك بکرێتەوە بۆ نا".

من وەکو مووسا عەنتەر، بەو تەمەنە بچووکەشمەوە ئاگاداری سـەرجەم ئەو کـردەوانەی بـووم کە دژی ڕۆڵەکـانی گەلـی کوردی دەکرد، بۆیە لە خوا پاڕامەوە کە توانـای تـۆڵەکردنەوەم بداتێ. چەندان ساڵ تێپەڕی و هـاتمە ئیسـتانبووڵ، بەشـەناوخۆیی قوتابیـانم هەبـوو، لەوێ زۆر کـوردی شـارە جیاوازەکـانی کوردسـتانی لێبـوو، لەوانە یاشـار کەمـال[1] و چەنـدان کەسـی دیکەی دیار، ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو، دەرفەتێکی مێژووییم هـاتە پێش و دیسان فەهمی ڤوڕاڵم دیتەوە.

لە ئیسـتانبووڵ کـۆنترین سـەندیکای کرێکـاران (کـۆمەڵەی حەمباڵان) بوو. ئێ لەسایەی دەوڵەتەکەماندا لەبەر ئەوەی هەمـوو حەمباڵەکـان کـورد بـوون، بـۆیە هەر کـورد دەسـەڵاتداری کۆمەڵەکە بوون. بەڵام میت هەڵسابوو ئەو فەهمی ڤوڕاڵە دەسـت

---

[1] ڕۆژێك لە ئیستانبوڵ، کاتێك مووسا عەنتەر لـە ناوچـەی فلۆریـا لەقـەراغ دەریا مەلەی دەکرد؛ گوێی لە دەنگی فیکەیەکی کـوردی دەبێـت، کـە لـە زاری گەنجێکەوە لێدەدرێت. مووسا عەنتەر لە ئاوەکە دێتە دەرێ و دەچێتە لای و هەنـدێك پرسـیاری لێـدەکات، وەلـێ گەنجەکـە زۆر بـە عەکسـی وەڵامی دەداتەوە، بەڵام ئاپێ مووسا بەر لە ڕۆیشتنی کارتی ناونیشانی خۆی دەداتێ. دوای چەنـد ڕۆژێـك گەنجەکـە لـە بەشـە نـاوخۆیی دەچێتـە لای. سەرەتا دەرگاوانەکە ناهێڵێ بچێتە ژوورەوە، بـەڵام ئـاپی مووسـا گـوێی لـە دەنگە دەنگەکە دەبێ و دەچێ گەنجەکە دەباتـە ژوورەکـەی و دەسـت بـە دەمەتەقێ دەکەن. لە کاتی ڕۆیشتنی مووسا عەنتەر دەیـەوێ هەنـدێك پـارە بۆ خەرجی بداتە گەنجەکە، بەڵام ئـەو ڕەتـی دەکاتـەوە و دەڵـێ "هاتوومـە ئێرە تا تۆ ببینم، نەك پارەکەت". ئەو گەنجە یاشار کەمال بوو.

بە خوێنەی پارێزگاری مێردینی کردبووە سەرۆکی کۆمەڵەکە. ڕۆژێك لە ڕۆژنامە نووسرابوو: "یەکشەممە کۆمەڵەی حەمباڵان کۆنگرەی خۆی دەبەستێت. کۆنگرەکەش لەلایەن سەرۆکی گشتی کۆمەڵەکە فەهمی ڤوراڵەوە بەڕێوە دەبردێت". من تا ئەوکاتە نەمدەزانی ئەو کابرایە کەوتۆتە کوێ و لە چ شوێنێکە، بەڵام کە هەواڵەکەم بینی، ئیدی شوێن و مەکانیم کەوتە دەست. من بۆ بەشە ناوخۆیەکەم ٤ دەرگاوان و کرێکارەکانم بەردەوام لەناوچەی پوتورگەی شاری ئادیەمانەوە دەهێنا. چونکە زۆر سادق و کرێکاری باش بوون. لەبەر ئەوەی سەر و کارم لەگەڵ حەمباڵان زۆربوو، بۆیە زۆر حەمباڵ دەهاتنە سەردانیکردنم. بەر لە دەستپێکی کۆنگرە، دیسان کۆمەڵێکیان هاتنە لام. منیش هەمووو ئەو خەسڵەتانەی لە فەهمی ڤوراڵی سەرۆکی کۆمەڵەکەیان هەبوو بۆم باسکردن، زۆر پێی بێتاقەت بوون، تۆزێك مابوو بچن و کابرا بخنکێنن، لەگەڵ ئەوەی هێورم کردنەوە، بەڵام پێم گوتن: "ئێستا دەستتانم گرت، بەڵام ڕۆژی کۆنگرە خۆتان دەزانن چی دەکەن". گەنجێکیان تێدابوو ڕووی لە من کرد و گوتی: "مادەم وایە تۆ سەیری کۆنگرەکە بکە کاکۆ". پلانێکی بەو شێوەیان دانا: لە ڕۆژی کۆنگرە ئەو حەمباڵانە لە شوێنی کۆنگرەکە دەبوونە دوو بەش، جا بە قەست شەڕێکیان دروستدەکرد، ئینجا فەهمی ڤوراڵ ناوبژیی دەکردن، جا لەوێ خوا گەورەیە چۆنی بەردەکەوت.

کۆنگرە دەست پێدەکات و وەك ئەوەی پلانی بۆ داندرابوو کارەکە دەچێتە پێشەوە. فەهمی دەچێتە نێوانیان، ئیدی ئامانجی هەردوو لایە دیارە و دەیدەنە بە ڕەحمەتی خۆیان. ئەوسا بیرم دێت ڕافیعە نەبوو، بۆیە حەمباڵی کوردی ئاوا هەبوو ئەوەندە بەهێز بوو ٥٠٠ کیلۆی لە باخیرە لەسەر پشتی خۆی دەگواستەوە سەر وشکانی. بۆیە، پانکردنەوەی فەهمی هەر هیچ نەبوو بۆ ئەو.

دوای ماوەیەکی زۆر فەهمی ڤوڕاڵ خراپ دەکەوێتە ژێر پێیان. سەرو گوێلاك و دەم و ددان و لووتی دەشکێ و دەگەیێندرێتە نەخۆشخانە. ئینجا دوای ماوەیەك دەتۆپێ و لە کۆڵ دەبێتەوە. بەو شێوەیە بۆ یەکەمجار تکایەکم لە خوا هاتە دی.

فەهمی ڤوڕاڵ تۆپی، بەڵام دوای مردنی، دەوڵەت ئاڵای تورکیای لەسەر جەنازەکەی دانا و بە شەهیدی لەقەڵەمدا، ئەوەش ئێمەی زۆر پەست و نیگەران کرد، بەڵام بە بۆچوونی ئێمەی کورد شوێنی ئەو تەنیا سەر زبڵدانە نەك شوێنێکی دیکە. جا چەندان ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوە تێپەڕی، کەچی سەیر ئەوەیە تا ئێستاش ئەو زیهنیەتە فەرمییەکە نەگۆڕاوە. بۆ نموونە ئەو جاشانەی پێیاندەڵێن گوند پارێز، کاتێك دەتۆپێندرێن، بە شەهید هەژمار دەکرێن، بەڵام بە پارتیزانەکانی پەکەکەی دڵ و جەرگی ۲۰ میلۆن کورد دەڵێن کوژراو. ڕەنگە تورك یان بەشێك لە نەتەوەکانی دیکەی هاوڵاتیمان لەو پرسە تێنەگەن، بەڵام هاووڵاتییانی کورد بە پێچەوانەی بەیانە فەرمییەکان، مردنی گوند پارێزەکان بە تۆپیوو، مردنی پارتیزانێکی پەکەکەش بە شەهید هەژمار دەکەن.

### کەمال بادڵی

کەمال بادڵیی ئەزیز دۆستێکی دێرینمە. ساڵی ۱۹٤۳، واتە دوو ساڵ دوای من، ئەویش هاتە ئیستانبووڵ. کە تازە هاتبوو ماوەیەك لە بەشەناوخۆیی فورات لای ئێمە ماوە. بە هەموو ئاکار و هەڵسوکەوتەکانی دیار بوو چەند کەسێکی بە سەرنج و زیرەك و لێهاتووە.

بەهۆی ئەو ئاکارە جوانانەی هەیبوو، لەگەڵ ڕێك پۆشی و قۆزییەکەی، ئیدی لەناو برادەران پێماندەگوت (لۆرد کەمال). بە جلوبەرگ و شەبقەکەی سەری، وەك ئەندامێکی خێزانی

خانەدانەکانی ئینگلیز دەهاتە بەرچاو. بۆیە، ئەو لە شوێنێکی وەك بەشەناوخۆیی ئاوا قەرەباڵغ نەیدەتوانی بمێنێتەوە. لەبەر ئەوەی دۆخی ماددیشی باش بوو، بۆیە، بە تەنیا چووە میوانخانەیەك. دۆستایەتیمان تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد زۆر بە گەرم و گوڕی و ڕاستگۆیی ماوە. کەسێکی بێدەنگ و هێمن بوو، تا شتێکت لێ نەپرسیبا قسەی نەدەکرد، ئەو بەردەوام بە منی دەگوت (کاکۆ)، منی وەك برا گەورەیەکی خۆی دادەنا. ئیدی بەو بێدەنگییەی خۆیەوە بەشی قانوونی لە زانکۆی ئیستانبووڵ تەواو کرد. دواتر گەڕاوە ڕوها، لەوێش بووە پارێزەرێکی خۆشەویست و دادپەروەر. لەگەڵ هەموو ئەو مەشغەڵەتیانەشی، بەڵام هەرگیز گرنگی و بایەخدانی خۆی بۆ زمان و وێژەی کوردی پشتگوێ نەدەخست. بۆیە، بەردەوام کاری لەسەر ڕێزمانی کوردی لەلایەك و لەلایەکی دیکەش کاری لەسەر فەرهەنگێکی کوردی دەکرد، لە پاڵ ئەمانەش، هیچ کات لە کۆکردنەوەی وتەی پێشینانی کورد دوا نەدەکەوت. جگە لەو هەموو بەهرانە، دەستی نووسینی شیعریشی هەبوو. کەمال دوای ئەوەی گەڕاوە ڕوهاش، زوو زوو لە ئیستانبووڵ دەهاتە لام و کار و بەرهەمە تازەکانی پیشاندەدام و ئێمەش وەکو دوو دۆست قسەمان لەسەر ناوەڕکی کارەکان دەکرد. جگە لە من، بادلی دۆستێکی نزیکی فایەق بوجاکیش بوو.

ساڵ هات و چوو، من زیندانی کرام و فایەقیش لەناو ئەو ٥٥ ئاغایە بوو کە لە شوێنی خۆیانەوە ڕاگوێزرابوون. لەو سەرو بەندە کەمال بووە پەرلەمانتار، بەڵام هیچ کات خۆشی بەو پیشەیەی نەهات. ئەو کاتەی پەرلەمانتار بوو، ڕۆژێك لە زیندان سەری لێدام و پێی گوتم: "کاکۆ، شەرم لە خۆم دەکەمەوە کە دەچمە ناو ئەو باڵەخانەیەی پێی دەڵێن پەرلەمان، چونکە لەوێوە

چەندان یاسای دژ بە کوردستانی لێ دەردەچێ، جگە لەوە هەر کاتێك بیرم دێتەوە بێز لە خۆم دەکەمەوە کە لەو شوێنەم، چونکە شەرم لە ڕۆحی ئەو شەهیدانە دەکەمەوە کە لە ڕێگای خەباتی کورد و کوردستان شەهید بوونە. بۆیە، باوەڕناکەم بتوانم چوار ساڵ بەرگەی ئەو ڕەزاڵەتە بگرم.". کەمال زوو زوو ئەو وتەیەی عەبدولڕەحیم زاپسووی خەزوورمی بەبیر دەهێنامەوە کە بۆ پەرلەمانتارە کوردەکانی ئەنقەرەی نووسی بوو. ئەوسا، بەپێی یاسای هەڵبژاردن لە هەر پارێزگایەك بە دەنگی ٤٠ هەزار کەس بەربژێر دەبووە پەرلەمانتار، خەزووریشم ئەوسا ئەو وتەیەی، کە بۆ بەشێك لە کوردە بێ شەرەفە پەرلەمانتارەکان گوتبووی، زۆر بەناوبانگ بوو. کەمالیش وەکو من ئەو قسەیەی دەزانی، چونکە کاك عەبدولڕەحمان لە شیعرێکیدا بە زمانی کوردی دەڵێ:

**ئەز وەکیلی چل هەزاران**
**ئەما گەلۆ ئەز مەبوس**
**ئەم ئەز یان لسەر بەختێ**
**کوندەکی ماکوس ئەم ئەز**

واتا (ئایا من نوێنەری داوا ڕەواکانی ئەو خەڵکەم؟ یان هۆکاری بەدبەختی و قەلەندەریان؟)

کەمال بادڵی زۆر جار ویستی دەست لە پەرلەمنتارییەکەی بکێشتەوە و واز بێنێت، چونکە هەستم دەکرد چەند نارەحەتە، بەڵام باش بوو خەریکی نووسینی پەرتووکێك بوو لەسەر ڕێزمانی کوردی، وا ڕێککەوت منیش ماوەیەك بوو خەریکی کارێکی لەو شێوەیە بووم، کە زانیی منیش کارێکی ئاوام لەبەر دەستە، بادڵی پەرتووکەکەی خۆی چاپ نەکرد، چونکە وای لێکدابۆوە گەر پەرتووکەکە چاپ بکات من زویردەبم، یانی

دەمەوێ بڵێم زۆر لەلای ئەو عەزیز بووم، بۆیە، پەرتووکەکەی چاپ نەکردبوو. لەبەر ئەوەی دەمزانی هەستی چۆنە و چۆن بیر دەکاتەوە، بۆیە لەگەڵ فایەق چووینە ئەنقەرە تا سەردانی ئەو بکەین و لەسەر ئەو پرسە قسەی لەگەڵ بکەم. لەوێ بەو شێوەیە باوەڕم پێهێنا تا پەرتووکەکەی چاپ بکات: "سەیرکە کەمال گیان، من ئەو ماوەیە ناتوانم پەرتووکی ڕێزمانی کوردییەکەم چاپ بکەم، تازە لە زیندان دەرچوومە، بۆیە، نامەوێ دیسان بچمەوە هەمان شوێن، جگە لەمانە باری تەندروستیشم باش نییە، بەڵام تۆ پەرلەمنتاری و پارێزبەندیت هەیە، بۆیە، وەرە با ئەوەی تۆ چاپ بکەین". کاك فایەقیش پشتگیریی منی کرد، ئینجا ئەو بە شەرمەوە داواکارییەکەمانی قبوولکرد.

ماوەیەك دوای ئەو دیدارە، لەگەڵ برادەران بڕیارماندا لە ئیستانبووڵ گۆڤارێك، بە هەردوو زمانی تورکی و کوردی بە ناوی (دەنگ) دەربکەین. دووبارە لەگەڵ فایەق چووینەوە ئەنقەرە بۆ لای کەمال. دەمویست لە هەر ژمارەیەك باس لە شاعیرێکی کلاسیکی کوردی و شاعیرێکی گەنجی سەردەمی خۆشمان بکەین. کەمال و فایەقیش هەردووکیان شاعیر بوون. گوتم کەمال گیان هیچم لێ مەشارەوە و دەزانم شیعر دەنووسی، بۆیە شیعرێکمان بدێ تا لە گۆڤارەکە بڵاوی بکەینەوە. کەمال سوور هەڵگەڕا لە شەرمان و گوتی: "کاکۆ نازانم چیت پێ بڵێم". بەڵام من پێم داگرت، تا شیعرێکی دامێ و لە گۆڤارەکە بڵاومان کردەوە.

## فایەق بوجاك

هۆ.. هۆۆۆ... فایەق بوجاك هۆۆۆ! من ناتوانم باوەڕ بەوە بێنم تۆ کۆچی دوایت کردووە و ئێستا مردووی برا، بۆیە، دەربارەی تۆ چیم بە دڵ دا بێ دەینووسم.

ساڵی ١٩٤١، دوای کۆتایی هاتنی قۆناغی ئامادەیی، هاتمە ئیستانبوول. دوای گەیشتنم، لەگەڵ گەنجێکی چوست و چالاك و پڕ وزە بەناوی فایەق بوجاك یەکدیمان ناسی. ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەو ناوە بووە بەشێکی دانەبڕاو لە ژیانم. هەندێك جار دڵخۆشی کردم و هەندێك جاریش ژەهری بەدەو وەدەکردم، بەڵام هیچ ژەهرێکیان وەك ئەوە نەبوو کە زوو منی جێ هێشت. لەگەڵ ئەوەی ئەو ژیانی لەمن شەرەفمەندانەتر بەڕێکرد، چونکە بە گوللەی دوژمنانی خائین شەهید بوو. کەچی من تا ئێستا دەژیم، بەڵام زۆر حەز دەکەم منیش وەك فایەق بە گوللەیەکی دوژمنان شەهید بم.

بە نووسینی بەشێك یادەوەرییەکان، یادەوەریی نێوان من و فایەق تەواونابێ، چونکە گەر ١٠ بەرگیش لە بیرەوەرییەکانم بنووسم، ئەو لەسەرووی هەموویانەوە دەبێت. لە بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکە، باسی ئەوەم بۆ کردبوون لە ڕووی سیمبۆڵییەوە لەگەڵ فایەق کۆمەڵەیەکی ڕزگارکردنی کوردستانمان دامەزراندبوو، بۆیە نازانم لێرە چۆن درێژە بە نووسینەوەی بەشێکی دیکە لەو بیرەوەرییانە بدەمەوە. کاك فایەق، ئەوکاتەی من لە زیندان بووم (پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا)ی دامەزراند و هاتە لام و پێی گوتم: "مووسا ئەی بەیەکەوە بەرلە ٢٠ ساڵ لەگەڵ تۆ پایەکانی ئەو پارتەمان دانەمەزراند، بۆ نایەی

کارمان لەگەڵ بکەی؟". وەلێ من داواکارییەکەیم ڕەتکردەوە، چونکە من لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە چاوێکی زۆرم لەسەر بوو، ئێ بەو حاڵەشمەوە لەوان نزیك بکەوتبامەوە زیانم بەوانیش دەگەیاند، ئەمە جگە لەوەی کارنامەی پارتەکەشم زۆر بە دڵ نەبوو. هەموو ئەو هۆکارانەم بۆ فایەق ڕوونکردەوە، کە بۆچی نامەوێ لە پارتەکە کار بکەم، ئەویش بە وەڵامەکانم ڕازی بوو. کاتێکی زۆر بەسەر ئەو دیدارەمان تێنەپەڕی، لەپڕ دوژمنانی گەلی کورد بە گوللەیەك فایەق بوجاکی دڵ و گیانم شەهید دەکەن. کە هەواڵەکەم گەیشتێ، وامزانی دونیام بەسەردا ڕووخاوە، عەقڵ و هۆش و خۆڕاگریم لەدەستدا. دوای ئەویش ئیدی بە تەواوەتی لەو پارتە دوور کەوتمەوە کە فایەقی برا دایمەزراندبوو، چونکە چاوم بەرایی نەدەهات کاری تێدا بکەم.

لە بەرگی یەکەمی ئەو پەرتووکە باسی ڕووداوە دڵتەزێنەکەی نێوان سەعید ئەلچی و سەعید قرمزی تۆپراکم بۆ کردبوون لە پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا. هەندێك لە خوێنەرانم ئاماژەیان بەوە داوە و داوای ئەوەیان کردووە ڕووداوەکە زیاتر ڕۆن بکەمەوە و باسی ورد و درشتی بکەم. ئەوان، لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو بابەتە هەستی من نازانن، بۆیە داوایەکی ئاوایان لێ کردووم، چونکە من پێم وایە باسکردنی ئەو پرسە وەك ئەو پەندەی پێشینانە کە دەڵێ: (تفی سەرهەوراز، بە ڕووی خاوەنی دەکەوێتەوە). بۆیە من چۆن زیاتر بە وردی باسی ڕووداوێکی ئاوا ناخۆش و نادیار بکەم؟ نازانم وەك عەرەب بڵێم عەلی یان معاوییە، کامیان لەسەر حەقن!. بۆیە، نامەوێ ببمە هۆکاری چاندنی ڕەگی فەساد و دوو بەرەکی لەناو گەلی کورد. ئیدی، بەبۆچوونی من با کورد ئەو ڕووداوە نەخوازراوە لەبیر بکەن و جارێکی دیکە نەیهێننەوە سەرزاران.

وەك چۆن لەسەر هەمان بابەت حەزرەتی محەمەد گوتوویەتی: "گەر لەناو سەحابەکانم فەساد بڵاوبۆوە، با ئۆمەتەکەم مشتومڕ لەسەر خاوەن ماف و مافخوراو نەکەن". منیش بە پشتبەستن و گوێڕایەڵیکردنی ئەو فەرموودەیەی حەزرەتی محەمەد دەڵێم: با کورد ڕووداوە ناخۆشەکەی نێوان دوو سەعیدەکە لەبیر بکەن، هەردووکیشیان وەکو خاوەن حەق و ناحەق لە قەڵەم بدەن.

ساڵی ١٩٦٠، کودەتایەکی سەربازی دژی پارتی دیموکرات لە تورکیا ڕووی دا. جەنەراڵێك بەناوی (کزڵ ئۆغڵوو) وەکو بەرپرسیاری سەربازی ناوچە کوردییەکانی تورکیا دامەزرێندرا. ئەو کابرایە، بە بەهانەی ئەوەی ئەندامی پارتی دیموکراتن، هەرچی لیستی ناوی کورد هەبوو لای پۆلیس و میت هەمووی لە کامپێکی سیواز کۆکردنەوە. چەندان مانگ ئەوانە کەوتنە ژێر ڕەحمەتی ئەشکەنجە و جوێن و سووکایەتی پێ کردن. لەناو ئەو ژمارەیە ٥٥ کەسیان لێ هەڵبژاردن و ئەوانی دیکەیان ئازاد کرد. لە مێژووی سیاسیی تورکیا ئەو ڕووداوە بە ڕووداوی ٥٥ ئاغاکە بەناوبانگە. پارێزەر فایەق بوجاکیش، کە چەندان ساڵ وەکو کۆمەنیست و سۆسیالیستێك پۆلیس بەدوایەوەبوو، ئەویش یەکێك بوو لەو ٥٥ ئاغایە. بڕیاری ڕاگوستنی بۆ دەرچوو، بەڵام هەر ڕۆژە و لە شار و شارۆچکەیەکی ڕۆژئاوای تورکیا گۆزە گۆزی پێدەکرا. تا دواجار بڕیاری تەواوکردنی ماوەی ڕاگواستنەکەی لە ئەنقەرە بۆ هاتەوە. دوای دەستگیرکردنی ئەو ٥٥ کەسە، ئیدی هەرچی سەروەت و سامانیان هەبوو لەلایەن حکوومەتی ئەنقەرەوە دەستی بەسەردا گیرا، هەرچی زەوی خۆشیان بوو لەلایەن وەزارەتی کشتوکاڵەوە، تەنیا بۆ دروستکردنی فەساد و کێشە، بەسەر خەڵکی ناوچەکە دابەشکرا. بۆیە، دوای دەرچوونی مافی لێخۆشبوونی گشتی، ئەو خەڵکەی

زەویــی ئەو ئاغایانەیــان بەســەردا دابەش کرابــوو، بە هەزار بێنەوبەردە ڕادەستی خاوەنەکانیان کردنەوە. فایەق خۆی خەڵکی سیڤەرەکە، بەڵام ئەمجارە لە ڕوها نیشتەجێ بوو، لە ماوەیەکی کەم بووە بەناوبانگترین پارێزەری کوردستان و پارێزەریی بۆ منیش دەکرد.

لەبیرمە. لە دیاربەکر لەسەر مەسەلەی کوردایەتی دۆسیەیەکی دادگاییکردنم هەبوو، تەنیا بۆ بەرگریکردن لەو دۆسیەیەم ۳۲ پارێزەر لە سەرحەد و عەنتاب و وان و بیدلیس و دیاربەکر و ڕوها و مێردینەوە هاتبوونە دیاربەکر. ئەو پارێزەرانە، بە کۆی دەنگ، فایەق بوجاکیان وەکو وتەبێژی خۆیان هەڵبژارد. ئەو دانیشتنەی دادگا دەبوو هەموو کەسێك ببینێت، چونکە هەموو لایەك واقیان وڕمابوو کە لەبەردەم دادوەر فایەق وەکو شێر بە ڕێگایەکی قانوونی چۆن بەرگریی لە من دەکرد؛ داواکاری گشتی و دادوەرەکان بێ ئەوەی یەك وشە بڵێن بڕیاری بێ تاوانی و ئازاد کردنیان دەرکردم. کە هاتینە دەرەوە، بەردەم باڵەخانەی دادگای دیاربەکر و باخچەکەی، بەهەزار هاونیشتمانیی لێبوو، هەموویان بە جارێك فایەقیان خستە سەر ملی خۆیان، بەڵام هەرگیز لەبیری ناکەم بەو حاڵەوە پەنجەی بۆ من ڕاکێشا و بە خەڵکەکەی گوت: "کوڕینە دەبێ ئێوە مووسا عەنتەر بخەنە سەر شانی خۆتان".

بیرەوەرییە سیاسیەکانی فایەق لای من کۆتاییان نایەت. ئەو کاتەی گۆڤاری (دەنگمان) بڵاو دەکردەوە، ڕۆژێك کە چووبووینە لای کەمال بادلی لە ئەنقەرە، بە هەردووکیانم گوت: "کوڕینە دەمەوێ لە ژمارەی یەکەم باسی کەمال بادلی بکەم وەك شاعیرێکی گەنج و لە ژمارەی دووەمیش فایەق بوجاك، جا مەشڵێن ئێمە شاعیر نینە، چونکە لە نزیکەوە دەتان ناسم و

دەزانم شیعر دەنووسن، بۆیە داواتان لێدەکەم یەکە و شیعری خۆتانم بدەنێ، بینیم لە شەرمان سوور هەڵگەران، بەڵام وازم لێنەهێنان و یەکە و شیعرم لێ وەرگرتن".

نازانم چۆن، سەبارەت بە فایەق بوجاك، دڵی خۆم بدەمەوە، چونکە ئەو کاتەی شەهیدیان کرد، لەبەر ئەوەی من لە زیندان بووم، نەمتوانی بچمە سەر تەرمەکەشی، بۆیە، ئێستا هەموو دڵنەوایی خۆم بە دوو کوڕەکەی و کچەکانی دەدەمەوە، کە ناویان (سەرهات، سەرتاج، زۆزان، نوور)ە. بیرمە، ڕۆژێك، لە فایەق بوجاکم پرسی: "ئەرێ تۆ چۆن ناوی ئەو منداڵانەت داناوە؟". ئەویش وەکو پێداهەڵدانێك "مووسا تۆ بەردەوام لە بەندیخانەی، دەزانم تۆش دەتەوێ لە کەشوهەوایەکی ئازادانەی دونیا بژی، بۆیە سەرهات واتا ترۆپکی بەرزی چیاکانی کوردستان، سەرتاجیش هێمای ڕزگارکردنی گەلی کوردی ژێردەستەیە. زۆزانیش واتە دەشتایی سەر چیاکانی کوردستان، نووریش واتا ڕووناکی و دەبێتە ڕێگا نیشاندەرمان. من بەو جۆرە بیرکردنەوەیە ناوم لە منداڵەکانم ناوە. بەڵام ئیلهامی هەموو ناوەکانیشم تۆی".

لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠-١٠-١٩٩١ی پەرلەمانی تورکیا، سەرهاتی کوڕی فایەق بوجاك بووە بەربژێر بۆ پەرلەمان، بۆ ئەوە چوومە سیڤەرەك، لەوێ ڕاستەوخۆ چوومە سەر گۆڕی فایەق و موستەفا ڕەمزی بوجاکی گەورەی هەموومان. باوەشم بە کێلی سەر گۆڕەکانیاندا کرد و ماچم کردن و بە فرمێسکی چاوەکانم گۆڕەکانیانم تەڕ کرد. دوای ئەوە، ئەوانەی کە بە کوشتنی فایەق بوجاکیش هێشتا دڵیان ئاوی نەخواردبۆوە، بە هەزار فێڵ و حیلە، نەیانهێشت کوڕەکەی ببێتە پەرلەمانتار.

هەرچی بڵێم دەربارەی فایەق بوجاکی خۆشەویست کەمە، بۆیە، بە ڕێز و خۆشەویستییەوە یادی ئەو بەسەرهاتەی نێوانمان دەکەمەوە. دەمەوێ لێرە ئەوەش بڵێم، من هەرگیز حەزم لە مردن نەبووە، بەڵام گەر بزانم دوای مردن لەو دونیا لەگەڵ فایەق بوجاك بەیەك شاد دەبینەوە، بێ دوو دڵی حەزدەکەم یەکسەر بمرم. لە سایەی تورکیا، بەو ڕێکخراوەی لەگەڵ فایەق بوجاك بۆ پارێزگاریکردن لە مافی گەلی کورد دروستمان کرد نەمانتوانی هیچ شتێك بەدەست بخەین، بەڵام، لەو باوەڕەدام لەو دونیا لە حزووری خوادا گەر ڕێکخراوێکی لەو شێوەیە دروستبکەین، خوا هاوکاری ئێمە و گەلی کوردیش دەبێ.

فایەق گیان، هەموو شتێکمان حەواڵەی خودا کرد؛ بۆیە بە هیوای دیدار...

## شۆڕشی شێخ سەعید

ئەو کاتەی شۆڕشی شێخ سەعید ڕووی دا، من تەمەنم حەفت یان هەشت ساڵ بوو، لەگەڵ ئەوە بەو تەمەنە بچووکەشمەوە لە ڕووی دەروونییەوە کەوتمە ژێر کاریگەرییەکانی شۆڕشەکە، بە شێوەیەك ئەو هەستەی ئەوسا بۆ ئەو شۆڕشەم هەبوو، تا ئێستاش لە دڵمدا وەك خۆی ماوە. لە ڕووی جوگرافییەوە دووریی نێوان گوندەکەی ئێمە و شوێنی سەرهەڵدانی شۆڕشەکە نزیکەی ٢٥٠ کیلۆمەترێکە. بەڵام دیسان ئەو ئافرەتانەی پیاوەکانیان لە دەستدابوو و منداڵەکانیان لێ زەوت کرابوو، بەرەو هەموو شوێنێکی ناوچەکە ڕایان دەکرد. زۆربەیان بریندار و بێ جلوبەرگ و نیوە ڕووت و برسی و تینوو، بە پێی پەتی هەڵدەهاتن. ژمارەی ئەو ئافرەت و خێزانانە

ئەوەندە زۆر بوو، نزیکەی ٥٠ – ٦٠ ئافرەت و چەندان منداڵ بەر لادێکەی ئێمەش کەوتن. نەبێتە پێداهەڵدان، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە دۆخمان باش بوو، لە هەمان کات دایکیشم ئافرەتێکی مەرد و بە ڕەحم بوو، بۆیە، ئەوەی لە دەستی هات بۆ هاوکاریی ئەو میوانانەمان کردی. ئێمەی منداڵیش لەگەڵ بەشێك لەو منداڵانەی دایکەکانیان توانیبوویان ڕزگاریان بکەن، ڕۆژانە لەناو گوند یاریمان دەکرد و بەیەکەوە ڕۆژمان دەکردە شەو. ئەوان دەیانگوت کوردین، بەڵام لە کاتی ئاخافتن لەیەك نەدەگەیشتین. ئەوسا بەو عەقڵە منداڵانەمانەوە دەمانگوت: "کاکە ئەوانە چ جۆرە کوردێکن؟ کە کوردی نازانن!". تومەزە شێوەزاری ئەو هەژارانە زازا بووە نەك کورمانجی. دایکم ئەو ماڵباتانەی لەچەند ئەشکەوتێکی لادێکەمان نیشتەجێ کردبوون، ئینجا سێ ژەمە بە مەنجەڵی گەورە خواردنی دروستدەکرد و ئەوانیش ڕۆژانە دەهاتن بەشە خواردنی خۆیان دەبرد. ئەو بەستەزمانانە نە قاپ و قاچاغێکیان هەبوو بۆ نان خواردن، نە دوو پارچە لباد و یاتاغ بۆ خەوتن. دایکم لە ماڵە خزم و دراوسێکانی لادێکەمان هەندێك پێویستیی بۆ کۆکردنەوە و لەوەی ماڵی خۆشمان هەندێکی لەسەر دانا و دایە ئەو خێزانانە. چونکە دایکم دەیوست هیچ نەبێ هەر خێزانە و یاتاغێکی بەربکەوێت بۆ خەوتن. چونکە بیرمە ڕۆژێك بۆ ئەوەی ئەو منداڵانە بانگ بکەم بۆ یاری کردن، چوومە ئەشکەوت، بەیانی زوو بوو، بینیم ٦ کەس لە ژێر یەك لێف خۆیان لەپاڵ یەك نابوو لەسەرمان، سێیان سەریان لەلایەك، سێیەکەی دیکەش سەریان لەلایەکەی دیکە بوو. ئێمە لە کوردی بەو جۆرە نووستنە دەڵێین (سەر و قوون) نووستن. من نەمدەویست ئەو کارەساتە ئاوا بە درێژی بنووسم، چونکە ئەوە

مشتێکە لە خەرمانی ئەو تراژیدیایە گەورەی بەسەر دێرسیم هات، بەڵام پێموابێ ئەوەی من بە منداڵی بینیم و تا ئێستا لە یادەوەریمدا ماوەتەوە، کەسێکی دیکە نەبووە ئەو ڕووداوە بنووسێتەوە، لەگەڵ ئەوەی ئەوسا زۆر لادێی دیکە وەکو لادێکەی ئێمە هەمان کارەساتیان بە چاوی خۆیان بینیووە.

ساڵی ١٩٥١، لەسەر مۆڵەتی قائیمقام، ڕێگایان دامێ بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ لە نوسەیبینەوە بچمە قامیشلۆ، ئەو ڕۆژانەم ئەوەندە جوان و ڕەنگاو ڕەنگ بوو، ئیدی تا ئێستا لە خەیاڵمدا شوێنی خۆیان پاراستووە. وەك چۆن لە ئەدەبیاتی ئەشقدا مانگی هەنگوینی هەرگیز لە یاد ناکرێت، منیش ئەو ڕۆژانە هەرگیز لە یاد ناکەم، جا نەك دەیان ساڵ، بەڵکو تا ئەو ڕۆژەی دەشمرم هەر لە بیر و هۆشم دەمێنێت. لەو سەردانەم چەندان مرۆڤی ئەزیز و خۆشەویستم بینی. ئەو چەند ڕۆژەی ئەو کەسایەتییە گەورانەم بینی، ئێستا، جگە لە عوسمان سەبری، کەسی دیکەیان لە ژیان نەماون، لەوانە (قەدری جان، ڕەشید کورد، عوسمان سەبری، دکتۆر نووری دێرسیمی، دکتۆر محەمەد نافی، حەسەن حاجۆ، حوسێن ئەشهەدی مامم و جگەرخوێن). من لێرە دەمەوێ ئەو چیرۆکەتان بۆ بگێڕمەوە کە ئەوسا جگەرخوێن بۆ منی باسکرد، لەگەڵ ئەوەی چیرۆکەکە نا تەبایی کورد دەردەخات، بەڵام با بینووسمەوە بەڵکو ببێتە وانەیەك بۆ گەنجەکانمان، ئومێدەواریشم ئەو ژەهری ناتەبایییەی لە نێوان کورد هەیە لەسەر خاکی کوردستان، ئیدی وردە وردە بەرەو لەناو چوون بچێت. ئەحمەدی خانیی باپیرە گەورەشمان، ٣٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا، هەمان نەخۆشی و دەرد و کەسەری لە نێوان کوردا بینیووە، بەڵام دیسان، ئەوەی نەکردۆتە کێماسییەکی نەتەوەیی گەلی کورد.

دەمەوێ باسی سەرهەڵدانی شێخ سەعید بکەم لە کوردستانی تورکیا، لەگەڵ ئەوە، دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە زۆربەی قارەمانە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، وەك بەشێك لە شاعیرەکانی خەسڵەتی ئایینیان هەبووە. بۆ نموونە شێخ عەلیی حەریری، مەلا ئەحمەدی جزیری، سەید ڕەزا، فەقێ تەیران، مەلایێ باتەیی، مەلا حوسەینی ئەتروشی، شێخ ئەحمەدی خانی، مەلا شێخ مووس (جگەرخوێن)، سەید عەبدولقادر، حاجی قادری کۆیی، شێخ ڕەزا تاڵەبانی، شێخ محەمەد بەرزنجی، مەلا مستەفا، شێخ عوبەیدوڵلا، شێخ شەهابەدین، سەید عەلی، شێخ ئەحمەد بارزانی. وەك ئاشکرایە، کاتی خۆی وەکو ئێستا، لە کوردستان قوتابخانە و زانکۆ نەبووە، بەڵکو زۆربەی زانا و دانا و خوێندەوارەکانی ئەوسا دەرچووی مزگەوت و حوجرەی فەقێیاتی بوونە. هەر بۆیەشە زۆربەیان ئەو خەسڵەتە ئایینیانەیان وەرگرتووە. داخەکەی گرانم ئەو خەسڵەتە ئایینیانە بۆ شاعیر و شۆڕشگێڕانی کورد، لە نیەت چاکی خۆیان، جاری وا هەبووە بە خراپە شکاوەتەوە و دوژمنان وەکو بەهانەیەك بەکاریان هێناوە، بۆیە، ناحەزانمان دژی شۆڕشگێڕانی کورد زۆرجار لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی دژ بە خۆیان گوتوویانە: "ئەوە بزاڤێکی کوردی نییە، بەڵکو جووڵانەوەیەکی کۆنەخوازی و ئایینییە". بۆ نموونە با بێینە سەر جووڵانەوەکەی شێخ سەعید، کە تورك بە جووڵانەوەیەکی دواکەوتوو و کوردیش بە شۆڕشێکی نەتەوەیی هەژماری دەکات.

من دۆستایەتیم، لەگەڵ عەلی ڕەزا ئەفەندیی کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ سەعید، زۆر خۆشبوو. ئەو منی وەکو ڕۆڵەیەکی خۆی دەبینی، منیش ئەوم لە شوێنی باوکم دانابوو.

ڕۆژێـك پێـی گـوتم: "کـوڕم مووسـا، عوسـمانییەکان لە کۆتـا سەردەمی دەسەڵاتداریەتی خۆیاندا، بە پشت بەستن بە تیـۆرێکی بێ مانای دروستکراو، تورکایەتییان چووە نـاو خـوێن و بـوونە نەژاد پەرست. ئەو بیرۆکەیە لەسـەردەمی سـوڵتان حەمیـد دەسـتی پێ کرد، کوردیش بەرامبەر ئەو کردەوانە کاردانەوەیان نوانـد و چـوونە نـاو پـارتی ئیتیحـاد و تەرەقـی و بـوونە بەشـێك لە دامەزرێنەرانیشی. بەڵام دواتر، کورد بینیی ئیتیحاد و تەرەقی زۆر لە سـوڵتان حەمیـد زیـاتر و تونـدتر دوژمنـایەتیی کـورد دەکەن. بۆیە کۆتایی ئیتیحـاد و تەرەقـی هەموومـان دەزانـین چۆن بـوو. جـگە لەمانـە، لە کۆتـایی تەمەنـی دەسـەڵاتدارییەکەیدا، عوسمانییەکان سێ پاشایان هەبوو بەناوەکانی تەڵعەت و ئەنوەر و جەمال پاشـا، بێگومـان ئەوانەش، وەکـو پاشـا زاڵمەکـانی ئێسـتا، دواتـر کـوژران. جـگە لەو پاشـایانە، لەو سـەردەمی کەسـێکی دیکەش پەیدا بوو بەناوی (کەمال پاشا). ئەو کەماڵە خۆی لەنـاو کوردان خۆشەویست کرد و کاری لەسەر برایەتیی نێوان کـورد و تورك کرد. جا گەلی کورد نەك تەنیا بەرامـبەر گەلـی تـورك، بەڵکو هیچ کاتێك خەنجەریان لە پشتی هیچ گەلێکی موسـوڵمان نەداوە. لەسـەر ئەو بـابەتە زۆر نمـوونە هەیە گەر باسـی بکەیـن. بەڵام کورد نەك نەیویستووە مستەفا کەمال بکوژێت، بەڵکـو زۆر کات لە کوشتنیش ڕزگاریـان کـردووە، چونکە ئەو بڕیـاری لە سێدارەدانی لەلایەن دەوڵەتی تـورك لە ئیسـتانبووڵ بـۆ دەرچـوو، بەڵام کورد پاراستیان، ئەوە چیرۆکێکی سـادەیە و هەمـوو کەس دەیزانێت، بۆیە، نامەوێ درێـژی بـکەمەوە، بەڵام کاتێـك مسـتەفا کەمال جێپێی خۆی قـایمکرد، سـەرجەم ئەو بەڵێنـانەی دایبـووی

بیری چۆوە و بەرامبەر بە کورد زۆر زاڵمانەتر لە پاشاکانی پێش خۆیشی جووڵاوە. لە کاتێکدا، کورد چاوەڕوانی دەکرد ئەو بەڵێنانە بێنێتە جێ کە لە دەوڵەتە تازەکەی تورکیا بە کوردی دابوو. جا خۆش ئەوەیە، کەمال پاشا لەگەڵ ئەوەی بەڵێنەکانی خۆی نەهێنا جێ، کەچی تۆمەتی دابەشکردنی وڵات و کورد پەرستیشی خستە پاڵ گەلی کورد، وەك ئەوەی تاوان بێت گەر کوردێك کورد پەروەری بکات. باشە گەر کوردێکی بە ناموس کورد پەروەر نەبێت، ئەی دەبێ چی بێت؟ یان دەیانەوێت کورد بێت و دوژمنی کوردان بێت؟ جا سەیرم بەوە دێت ئەوانەی لەسەر ئەو زیهنیەتە دەڕۆن پێیاندەڵێن ئەتاتورکچی. چونکە ئەوە کارێکی نا ئەخلاقی و بە تورك کردنە، جا لەو باوەڕەدام، گەر باش بیری لێبکرێتەوە، ئەوە سووکایەتی کردنە بە ئەتاتورکیش. نامەوێ درێژی بکەمەوە چونکە ئەتاتورك خۆشی گوتبووی (ئەوەی دەڵێ تورکم، چەند دڵخۆشە). یانی ئەوانەی تورك نینە هیچ دڵخۆش نابن لە تورکیا. جا یەکێك لەو کەسانەی دڵخۆش نین منم، بەڵام با بزانن من بە پێوەری ویژدانی خۆم و گەلە بەشەڕەفەکەم زۆر دڵخۆشم، بەڵام ئەوان، بە پێوەری کەمالیستی و بورژوازی، هەرچیان لە دەستهات کردیان بۆ ئەوەی دڵخۆش نەبم".

کاك عەلی ڕەزا ئەفەندی، ڕۆژێك، دەربارەی باوکی بۆی باسکردم: "باوکم چاوەڕوانی زۆر شتی باشی لە دەوڵەتی تورکیای تازە هەبوو، کەچی بەرامبەر ئەوە، زۆر زاڵمانە ڕووبەڕووی بوونەوە. ناڵێم تەنیا تورك، بەڵام کورد و تورکی دەسەڵاتدار لە ناوچەی ئەنادۆڵوو، لە زۆر ماوەی جیا جیا، تەنیا

بۆ ئەوەی خۆیان ببەنە پێش و بەرژەوەندیی خۆیان سەرکەوێ، شۆڕشەکەی باوکمیان وەکو جوولانەوەیەکی کۆنەخوازی دەردەخست. منیش ١٤ ساڵ لە باوکم بچووکتر بووم و لەناو سەرجەم ئەو ڕووداو و بەسەرهاتەنە بووم کە ئەوسا ڕوویان دەدا؛ بۆیە دەڵێم، کە شۆڕشی شێخ سەعید بە هەموو پێناسەیەك شۆڕشێکی تەواو نەتەوەیی و کوردانە بوو".

سەبارەت بە چۆنیەتی لە سێدارەدان و ناشتنی تەرمی شێخ سەعید، ئەو پرسەم لەگەڵ کاك عەلی ڕەزا کردەوە، بیرمە ساڵی ١٩٥٤ بوو، بە سەردانێك جەنابیان هاتبوونە لام، منیش پرسیاری شوێنی تەرمەکەیم لێ کرد، ئەویش بەو شێوەیە وەڵامی دامەوە: "باوکم لە دەروازەی دەری دیاربەکر لە سێدارە درا، گۆڕەکەشی لەناو چاڵێکی ئەو دارانەی ناوچەکەیە، ئینجا دوای بە پەتە وەکردنیشی بە کراسە سپییەکەی بەری، بێ ئەوەی هیچ ڕێورەسمێکی ئایینی لەسەر بکرێت، بە پەتێك دەیخەنە ناو ئەو چاڵە قووڵەی لەوێ بووە، ئینجا بە خۆڵ سەری دادەپۆشن و جێی دەهێڵن. ئەوسا بۆ دۆزینەوەی گۆڕەکەی زۆرمان پرسیارلەو کوردانە کرد کە ئەو سەردەمە ئاگاداری پرسەکە بوون، ئەوان ڕێك ئاوا وەڵامیان دامەوە: کاتی خۆی، لە دەروازەی چیای دیاربەکر تا کەناری ڕووباری دیجلە، قەبرستانێکی کۆن هەبوو، بەڵام دوای شۆڕشەکەی شێخ سەعید شوێنەکە بۆ مەبەستی دیکەی گەشتیاری و ئاهەنگ و سەیران، گۆڕانی بەسەردا هێنرا".
دواتر ئەو شوێنەی کە تەرمی شێخ سەعید و سەید عەبدولقادر و سەید محەمەدی کوڕی و دکتۆر فوئاد و چەندان کەڵە پیاوی دیکەی کوردی لێ ژێر خاك کرابوو، لەلایەن حکوومەتەوە کارگەی عارەقی دیاربەکریان لەسەر دروستکرد. بۆ زانیاریشتان،

ئەو کـارگەیە یەکەم کـارگەی حکـوومەت بـوو لە کوردسـتان دروسـتی کـرد. فەرمـانی دروستکردنیشـی لەلایەن کەمـال پاشـا دەرچوو بـوو، چـونکە دەڵـێن لەسـەر ئەو بـابەتە گوتبـووی: "ئەو گەوادانە پێم دەڵێن سەرخۆش، بۆیە، لەوێ کـارگەیەکی عـارەق دروست بکەن بۆ ئەوەی تا هەتایە هێسکیشیان سەرخۆش بێت لە ژێر خاك". ئینجا دواتر لە شـوێنەکەی سینەمایەکیش دروسـتکرا. بەم شـێوەیە ئێسـك و پڕوسـکی گەورە پیاوانمـان لە دیـاربەکر کەوتە ژێر قورسایی ئەو چیمەنتۆ و بلۆکـانەی باڵەخانەکـانی پـێ دروست دەکرا.

دێـتەوە بیـرم، ڕۆژێـك لەگەڵ جگەرخـوێنی شـاعیر لەسـەر هەمان بابەت قسەمان دەکرد، ئەویش لەوبارەیەوە ئەو چیـرۆکەی بـۆ گێـڕامەوە: "سـالی ١٩٢٥ جـوولانەوەی شـێخ سـەعید سـەریهەڵدابوو، چەنـدان پیاومـاقوڵی کـورد و ئاغـا لە دەسـت ڕژێمـی فاشیسـتی تـورك هەڵهـاتبوون و چووبـوونە سـووریا، کە ئەوسا لەلایەن فەڕەنساوە بەڕێـوە دەبـردرا. فەهمـی ئەفەنـدی، کە لەناو جوولانەوەکەی شێخ سـەعید ڕۆڵـی هەبـوو، نـامەیەکی بـۆ نـاردم. ئەوسـا مەکتـووبەکە بەنـاوی مـن هـاتبووە سـووریا، بەڵام چووبـووە لای مەلا عەلـی تۆپـووز تـا بیگەیەنێـتە دەسـتی مـن. نـامەکە کاتێـك بـۆ ئـێمە هـات کە سـەرۆکی سـێ عەشـیرەتی گەورەی کوردسـتان عەشـیرەتەکانیان جـێ هێشـتبوو و بەرەو سـووریا هەڵهـاتبوون، لەوانە، ئەحـمەد سـلێمانی سـەرۆکی عەشیرەتی ئۆمەریان لە مێردین، کە نزیکەی ٩٠ گوندیان هەبوو. ئەمینـێ ئەحـمەدی سـەرۆکی عەشـیرەتی ڕامـان و حـاجۆی سـەرۆکی عەشـیرەتی ڕایتـێ. شـێخ سـەعید، لە مەکتـووبەکە گوتبـووی: "ئاغـاینە ئێـوە لە ترسـی کـێ هەڵاتـوون؟ چـونکە لە تەواوی مێـردین و سـیرت تەنیـا ٢٠٠ ژەنـدرمە هەیە، بـۆیە گەر

ئێوە بگەڕێنەوە و سەرۆکایەتی عەشیرەتەکانی خۆتان بکەن، ئەوە سیرت و مێردین ڕزگاری دەبێ. ئێمەش خارپێت و دیاربەکر و نیوەی ڕوهامان ڕزگارکردووە، بۆیە، بیر لەوە بکەنەوە گەر ئێمە یەك بگرین، دڵنیابن تورك بەرامبەر بە ئێمە هیچی پێ ناکرێت".
جگەرخوێن بەو شێوەیە درێژەی بە باسەکەدا: "لەسەر ئەو نامەیەی شێخ سەعید، من و مەلا عەلی هەر سێ ئاغاکەمان لە گوندی (ڕەنگۆ) هێنایە جەم یەك، لەبەر ئەوەی نامەکە بە عەرەبی نووسرابوو، ئێمە بۆمان کردنە کوردی، سەرەتا بە کەلەجانەوە پێشوازییان لە داواکارییەکە کرد، بەڵام دواتر ئەو سێ ئاغایە بەگژ یەکدا چوون. عەشیرەتی ئۆمەریان باغێکی ئێجگار زۆریان هەبوو، بۆیە حاجۆ ئاغا گوتی: ئەحمەدی سلێمان کوڕی مێوژ فرۆش، دوای ئەو قسەیە ئەحمەد ئاغا هەڵچوو، ئینجا ڕووی لە ئەمینێ ئەحمەدی کرد و گوتی: کوڕی پەریخانی. بۆیە بینیمان ئەوانە لە بری ئەوەی ڕێك بکەون و وەڵامی نامەکەی شێخ سەعید بدەنەوە، کەچی وا لەیەك گیف بوونەتەوە و خەریکە یەکدی بکوژن. لە بری ئەوەی تووشی زیانێکی گەورە بین و عەیبە و شوورەییەکی گەورەمان بەسەر نەیەت، بۆیە، کۆبوونەوەکەمان هەڵوەشاندەوە و لەیەکمان دوور خستنەوە". بێگومان، جگەرخوێن، کە ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە، خەم و ماتەم بە ڕووخساریدا زۆر بە ئاشکرا دەبینرا.

## شەهاب باڵجی ئۆغڵوو

دەتوانم بڵێم، کاك شەهاب بووە هۆی ئەوەی، جاری دواتری بگەڕێمەوە دونیای ڕۆژنامەڤانی، چونکە ئیدی ئەوەندە قێزم لە ڕۆژنامەڤانی تورکیا ببۆوە، تا ئەو ئاستەی بێزم لە خۆشم دەکردەوە. بەو ڕقەوە ئیستانبوولم جێهشتبوو و گەڕابوومەوە ناو ئاو و هەوا سروشتییەکەی گوندەکەمان. من لە کەیف و سەفای خۆم بووم، بەڵام شەهاب یەخەی بەرنەدەدام، زوو زوو تەلەفۆنی بۆ دەکردم و هانیدەدام دەست بە نووسین بکەمەوە. منیش بەردەوام پێم دەگوت: "کاکە تۆ دەزانی نووسینەکانم ڕەقە، ئەو حکوومەتەی ئێستا و میدیاکەی گەر من بڵێم مەرحەبا، کەچی بەیەك دەنگ دەڵێن مووسا عەنتەر جنێوی داوە و دژم دەوەستنەوە".

ساڵی ١٩٥٨، وتارێکم بە ناونیشانی (بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان) نووسی. هەر ئەوەندە بەس بوو، گوتیان ئەوە پەیامێکی نهێنیی مووسا عەنتەرە بۆ گەلی کورد، چونکە ئاشکرایە دەیەوێ پێیانبڵێ ئیدی بەسە و هەستنە سەر پێ و ناوی خوای لێبهێنن. ئیدی لەسەر ئەو مانشێتە بە هەزار حاڵ خۆم لە دادگایکردن رزگارکرد. مانشێتێکی دیکەی وتارەکانم، ئیلهامەکەیم لە بانگدانی کەڵەشێرێکی بەیانیان وەرگرت، کە بە دەنگە خۆش و زوڵاڵەکەی لەبەردەم ماڵەکەمان بانگی دەدا. منیش ناونیشانەکەم بەو شێوەیە دانا (هەستە ئەی پیاو تاکەی دەخەوی، ببینە هەموو کەس چووەتە سەر کاری خۆی) چونکە، کە بەیانیان لەبەر دەرگای ماڵەکەم دەیخوێند، دەتگوت ئاوام پێدەڵێ. دیسان دادگا بانگی کردم و تۆمەتیان دامە پاڵ گوایە

مەبەستمە بڵێم: ئیدی تاکەی لەخەو هەڵناستن و ناچنە سەر کاری خۆتان. چونکە کاری مووسا دابەشکردن و کورد پەرستییە. دادگا بۆ لێکۆڵینەوە، دۆسیەکەمی بۆ نا پرۆفیسۆر سولحی دۆنماز نارد، ئەو ترە پرۆفیسۆرەش بەو شێوەیە وەڵامی دادگای دابۆوە: "لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان وڵاتی چین هەیە، مەبەستی ئەو لە کەڵەباب ماوتسی تۆنگە". ئینجا چیتان بۆ باس بکەم، چونکە چەنەم کەوت تا بۆم سەلماندن کەڵەباب هیچ پەیوەندیی بە ماوتسی تۆنگەوە نییە.

شەهاب و سەمیی باڵجی ئۆغلوو دەمێکە دەناسم و زۆریشم خۆش دەوێن. چونکە بەڕاستی لەناو میدیای تورکیادا دوو ئەستێرەی گەشاوەی بوارەکەن. یەکێکیان لە بواری ڕاگەیاندنی نووسراو و ئەوەی دیکەشیان لەسەر ئاستی جیهان لە بواری کاریکاتۆر ناوبانگێکی زۆری هەیە. جا کاك سەمیی دوو دیاری زۆر بە نرخیشی لە کارەکانی خۆی داومەتێ کە لە پێشانگاکانی ڕۆما خەڵاتی نێودەوڵەتییان وەرگرتووە. یەکێك لە دیارییەکان تابلۆیەکە، کە دوو لاقن لە تەك یەك، یەکیان پێڵاوێکی زۆر جوان و گرانبەهای لەبەرە، ئەوەی دیکەشیان بە پێخواسی دەرکەوتووە. جا لە ژێر پێی ئەوەی پێڵاوە جوان و گرانبەهاکەی لەبەرە نووسراوە ڕۆژئاوا و ئەوەی پێخواسیشە لە ژێری نووسراوە ڕۆژهەڵات. مەبەست لە ڕۆژئاوا شارە تورك نشینەکانی ڕۆژئاوای تورکیایە و ڕۆژهەڵاتیش مەبەست لێی ناوچە کوردییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیایە. دیاریی دووەمیشی نەخشەیەکی تورکیا بوو لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ.

ساڵانی شەستەکان، عەزیز نەسین، لە ناوچەی باڵمومجو لە ئیستانبووڵ دەستگیرکرابوو، لە زیندان ئەویشیان لەگەڵ ئەندامانی پارتی دیموکرات دانابوو. دوای چوونە ناو بەندیخانە

زینـدانییەکان دەیناسـنەوە و پێیـدەڵێن هەی کۆمۆنیسـتی بـێ ناموسـی خـائینی گەل و نیشـتمان، ئینجـا زۆر سـووکایەتیی پێدەکەن. تومەزە بە نزیکی عەدنان مەندەرەسیان داناوە. پارێزەر مستەفا دەلیڤەلی هاوڕێی ئامادەیی ئەدەنەشم لەوێ بووە، کاتێک زینـدانییەکان ئـاوا هێرشـدەکەنە سـەر عەزیـز نەسـین، مسـتەفای هاوڕێم ئەوی پاراستووە و نەیهێشتووە هیچی لـێ بـکەن. مسـتەفا خەڵکی ئەسکەندەروونە بوو، کاتێـک ئـێمە لە ئەدەنە دەمانخوێنـد ئەسـکەندەروونە لە ژێـر دەسـەڵاتی فەرەنسـییەکان بـوو، عەلـی باوکی مستەفا دەرچووی خوێندنگای فەرەنسییەکان بوو، بەڵام بە ڕەگەز تورك بوو. لەبەر ئەوەی ئەوسا ڕۆژ ڕۆژی ئەتاتورك بـوو، بـۆیە، دەوڵەت ئەو قوتـابییە تورکـانەی کەوتبـوونە دەرەوەی کۆمـاری تورکیـا لە ڕووی نەخشـەی تـازەی جـواگرافی وڵاتەکەوە، بانگهێشتی دەکردن بەبـێ بەرامـبەر لە قوتابخانەکـانی بخـوێنن و لە بەشەناوخۆییەکانیشـی بمێنـنەوە، بـۆ نمـوونە، ئەوکاتەی لە ئامادەیی ئەدەنە بووین، برادەرم هەبوو لە هەتـایی و قوبرس و ڕۆدۆس، لەگەڵ هەندێك قوتابیی ئەفغانی.

مـن و شـەهاب بـالجی ئۆغلـوو، چـووینە سـەردانی عەزیـز نەسین، ئەویش، بەو سەردانەمان، زۆر دڵخۆش بوو. وەکو گوتم مستەفای هاوڕێشم لەوێ بـوو، بۆیە زوو زوو بە عەزیـز نەسـینی گوتبوو: "مووسا هاوڕێیەکی دێرینمە". منیش گـوتم: "مـادەم وایە ئەویش بانگکەن بابێ". چەند خولەکێك دواتـر مسـتەفاش هـات، یەکدیمان ماچ کرد، لە حاڵ و ئەحواڵی یەکدیمان پرسی. ئینجـا لێیپرسیم: "مووسا بەو نزیکانە هەڵبژاردنی پەرلەمان هەیە، بە نیـازم خۆم بەربژێر بکەم، دەڵێی چی؟ پێت وایە دەربچم؟". بەر لەوەی وەڵامی بدەمەوە، عەزیز نەسین گوتی: "دەیبەیـتەوە و دەردەچـی، دڵنیـابە دەردەچـی، مـژدەت دەدەمـێ دەردەچـی، خـۆ ئەوانەی

دەردەچن لە تۆ بێناموستر نین، تا تۆ دەرنەچی". هەموومان پێکەنین. دیار بوو ئەوان لە بەندیخانە ببوونە دوو برادەری گیانی بە گیانی. بۆیە، بەزمی ئاوایان لەگەڵ یەك دەکرد.

شەهاب، دیسان زۆری لێ کردم وتارێکی بۆ بنووسم، ناچار کردم و ئەویش لە گۆڤاری (بەرەو ٢٠٠٠) بڵاوی کردەوە. بەڵام لەگەڵ بڵاوبوونەوەی گۆڤارەکە، حکوومەت بریاری کۆکردنەوەی تەواوی ئەو ژمارەیەی دەکرد، چونکە لەناوخۆ و وڵاتانی دەرەوەش کاردانەوەیەکی گەورەی دروستکرد. ئینجا لە دادگای ئاسایشی دەوڵەت، لە ئیستانبووڵ، دۆسیەیەکم لەسەر کرایەوە، لەلایەکی دیکەشەوە چەندان نامەی دەستخۆشی و تەلەفۆنی پیرۆزباییم، سەبارەت بەو وتارە، بۆ هات. بەهۆی وتارەکەوە ئەو گۆڤارە ئەوەندە بە خێرایی دەستی بە کۆکردنەوەی کرا؛ وایکرد نرخی هەر دانەیەکی زۆر گرانتر بێت لە ژمارەکانی پێشتری، وایلوایلهات، دانەیەك لەو گۆڤارە لە ساڵی ١٩٨٧ بە هەزار لیرە بوو، بەڵام، دوای کۆکردنەوەی، نرخی یەك دانەی ئەو ژمارەیە گەیشتە پەنجا هەزار لیرە. هاوشارییەکی زیتەڵەی دیاربەکریم تەنیا وتارەکەی منی کۆپی کردبوو و دانەی بە دە هەزار لیرە دەفرۆشت. لەو ژمارانەی کۆپییکردبوو دانەیەکیشی بۆ من نارد.

لەسەر ئەو وتارەم دواتر چوومە بەردەم دادگا، ئینجا بڕیاری بێتاوانیم دەرچوو، بەڵام دەرچوونی ئەو بڕیارە زۆری پێچوو. بۆیە، دەمەوێ ئەو وتارەی ساڵی ١٩٨٧ لە گۆڤاری (بەرەو ٢٠٠٠) بڵاوم کردەوە جارێکی دیکە لێرە بۆ ئێوەش دایبنێمەوە:

ناونیشانی وتارەکە: **(کورد، ڕۆژئاوا بێ ئەنادۆڵوو ناکات).**

لە دێرزەمانەوە لای ئێمە بووەتە نەریت، هەر کاتێك باسی کورد دەکرێت، ئیدی ڕاستەوخۆ دەچنە بنج و بنەوانی ئەو

گەلە. وەك ئەوەی کورد جن بێت یان پەری. یەکسەر دەپرسن، کورد هەیە یان نا؟ گەر هەیە لەکوێوە هاتوون؟ بۆچی بەو ناوچەیە دەگوترێ کوردستان؟. بەس نازانم بۆ لە عەرەب و بولگار و هیندییان ناپرسن؟ باشە بۆچی کەس بەلای هیندستان و ئەفغانستان و پاکستان و تاجاکستاندا ناچێ، بەڵام کە ناوی کوردستان دێت هەموویان چاویان ئەبڵەق دەبێ و کاردانەوەیان دەگۆڕێ؟!

باشە هەموو ئەمانە لەلایەك، بەڵام گەر بڵێین لە مێژوودا سۆمەرییەکان و ئارامییەکان و چەندان نەتەوەی دیکەش هەبوونە، بەڵام ئەورۆ ئەو گەلانە نەماون، یان با داینێین کوردیش لە مێژوو نەبووە، بەڵام ئەمرۆ وا لە گۆڕەپانەکەن و ئەوەی دەڵێ من کوردم ئەوە کوردە و ئەو خاکەی لەسەریشی دەژی کوردستانە.

سولتان سلێمانی قانوونی، کە باسی شوێنەکانی دەکرد، دەیگوت: "من سولتانی میسر و سووریا و عێراق و سعودیە و ئێران و کوردستانم". ڕێك وەك ئەوەی سولتان سلێمانی قانوونی گوتوویەتی، ئەو شوێنەی دەڵێ کوردستان، کوردستانە و ئەو خەڵکەی لەسەریشی دەژی کوردە. چونکە، گەر بەراوردی بکەین شتێکی زۆر سەیر دەبێت کە قانوونی سولتان سلێمانێکی ئاوا گەورە، کورد و کوردستان قبوولدەکات، بەڵام بەڕێز تورگوت ئۆزال و کەنعان ئێفرەن قەبوولی ناکەن!

بەر لە تورکایەتیی سولتان سەلجوق، کورد لە ناوچەکە هەبووە، ٤٠٠ ساڵ پێش زایین، گەزنەفۆنی مێژوو نووس کاتێك بە کوردستاندا تێپەڕ دەبێت، گەلێك دەبینێ بەناوی (کاردۆخی – کاردوك) کە ئێستا ئەوانە بابە گەورەی گەلی کوردن. ئینجا ئەو ناوە لە زمان و نەتەوەی جیاواز، بەپێی مێژوو، گۆڕانی

بەسەردا هاتووە، بۆ نموونە (کۆنی – کوردی – کورد – کورمانج). ئەم گۆڕانی ناوە بەپێی تێپەڕینی کات و جوگرافیا تەنیا بەسەر کورددا نەهاتووە، بەڵکو هەمان نموونە لە زمانی نەتەوەکانی دیکەش بەرچاو دەکەون. بۆ نموونە، ئێمە دەڵێین (ماجەر) کەچی هەندێك نەتەوەی دیکە پێیاندەڵێن (ئونگار). یان بۆ نموونە ئێمە دەڵێین (ئارنەڤوت) بەڵام هەندێکی دیکە دەڵێن (ئەلبان). بەڵام لە ڕاستیدا هیچ پێویست بەو وردەکارییە ناکات، چونکە لەو جیهانە بچووکە ئیدی نەژاد پەرستی زۆر عەیبە، وایلێهاتووە، لە هەندێك وڵات ئیدی نەژاد پەرستی قەدەغەکراوە. بۆیە، لەسەردەمێکی ئاوا، چ پێویست بە نەژاد پەرستی نێوان کورد و تورك دەکا؟

یانی، گەر تۆزێك بیری لێبکرێتەوە، هەموو کەسێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوە تێدەگا کورد لەناو کۆمەڵگای تورکی ناتوێتەوە، چونکە زۆر شار و شارۆچکە و گوند هەیە لە تورکیا، جگە لە فەرمانبەرانی حکوومی و تایبەت، هیچ ماڵێکی تورکی لێ نییە. بۆیە، پێویستە بیر لە ڕێگاچارەیەکی دیکە بکرێتەوە، چونکە حەفتا ساڵە بە بیری نەژاد پەرستیی دژی گەلی کورد ژیان، بەڵام نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك. چونکە مەحاڵە بتوانرێ گەلێکی گەورەی وەکو کورد بتوێندرێتەوە، یاخود زمان و کەلتوور و ناسنامەی بگۆڕدرێ. بەو پێیەی کورد یەکێکە لەو گەلانەی زۆر پەیوەستن بە دابونەریتی کۆنیانەوە، بۆیە گەر ئاوا نەبووبا، دەمێك بوو لەنێو نەتەوە لە نێوچووەکانی جیهان هەژمار دەکرا.

زۆر جار بووە، لە هەندێك شوێن، گرووپی بچووك بچووك، لە ناو گرووپی زۆر گەورەتر لە ڕووی ئابووری و کەلتوورییەوە توانەتەوە و بوونەتە گرووپ و ئیتنیکێکی تازە. بۆ نموونە وەکو

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە لەوێ چەندان گرووپ و نەتەوەی بچووك لەناو یەك تواونەتەوە و نەتەوەیەکیان پێك هێناوە. بەڵام لە تورکیا یەکێك دەخورێ و یەکێکیش سەیری دەکا، جا ئەمە هۆکارێکە بۆ هەڵگیرسانی قیامەت. بۆ نموونە، لە ئەمریکا ئایسنهۆفەر شانازی بە ئەڵمان بوونی خۆی دەکا، جۆن کەنەدی بەردەوام دەیگوت من خەڵکی ئێرلەندام، جگە لەمانە، دۆکماجیانی والیی ویلایەتی کالیفۆرنیا، شانازی بە ئەرمەنی بوونی خۆی دەکرد و ئەوەشی کردبووە کەرستەیەکی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن. بەڵام لە تورکیا ناتوانی نقەت لە زاری دەرچێ، چونکە هەر زارت بکەیتەوە بەر شەق دەدرێیت و ڕادەگوازرێیت و ئەشکەنجە دەدرێیت و لە سێدارە دەدرێیت. جا هەموو ئەو زەبر و زەنگانە نەیتوانیوە کرداری تواندنەوەی گەلە بچووکەکان بگەیەنێتە ئامانج، بەڵکو بە پێچەوانەوە، تەنیا ڕق و قین و دوژمنداریی دروستکردووە.

سەردەمانێك، سزای بە کوردی قسەکردن لە مێردین زۆر گران بوو، بەڵام دیسان بەو سزایەش هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێنا. نازانم بۆچی تەنیا بیر لە سزا و توندوتیژی دەکرێتەوە و بیر لە ڕاستگۆیی و بەیەکەوە ژیانی کورد و تورك ناکرێتەوە، لەسەر بنەمای ئاشتی و برایەتی و مافی مرۆڤ؟

سەیرکەن، زیا گۆك ئالپی داڕێژەری پایەکانی تورکایەتی، چەند جوان گوتوویەتی: "ئەو تورکەی کوردی خۆشنەوێت، تورك نییە، ئەو کوردەی تورکیشی خۆشناوێت، کورد نییە". مرۆڤی عاقڵ پێویستە گەر کارێکی تاقیکردەوە و لێی سەرکەوتوو نەبوو، ئیدی واز لەو کارە بهێنێت. جێبەجێکردنی قەدەغەیی و ڕاگواستن و ناو گۆڕین و جل گۆڕینی بە تۆبزی، تاقیکراوە و سەرکەوتوو نەبوو. چونکە، وەکو دەبینین گەیشتینە

ئەورۆژەی کە تێی کەوتووین، بەڵام، داخی گرانم دەبینم پیاوانی دەوڵەت و میدیاکانیشی، لەسەر ئەو ڕێچکە و کارە کۆنە هەر بەردەوامن. بۆ نموونە، جەنابی کۆزاکچی ئۆغلووی پاریزگار، ڕایگەیاندبوو ئەو ناوچەیە دەکەینە بەهەشتی گەشتیاری و بۆ ئەمەش کێشەی تیرۆر لە ڕەگەوە دەبڕین. بۆ ئەمەش، لەو بەرنامەیەی بۆ کاربەدەستانی ولاتی ناردبوو، بەو شێوەیە باسی پلانەکەی کردبوو: "ئەوەی من بیزانم، شتێك نییە لە تورکیا ناوی کورد بێ". جەنابی پاریزگارە سوپەرمانەکەشمان، ئاگای لەو ڕێسا بیرکارییە نییە، کە دەڵێ: "ئەگەر هاوکێشە بەهەڵە بنووسرێ، ئەنجەمەکەشی هەڵە دەبێت". چونکە ئەو بەرنامەی ئێوە داتانناوە هاوکێشەیەکی هەڵەیە، بۆیە، ئەنجامەکەشی هەڵە دەردەچێت. چونکە لە ئێستاوە ئەنجامە هەڵەکان خۆیان دەردەخەن و چیاکان پڕ سەرباز کراون.

قسەیەك هەیە دەربارەی لەناوبردنی تیرۆر، دەڵێت: "لەناوبردنی تیرۆر لەلایەن دەوڵەتەوە بە زەبری هێز، وەك ئەوەیە بتەوێت بە کوتك پێشکە بکوژی". جا گەر کورد لە دێر زەمانەوە لە ئاسیا هاتبێت یان لە ئەفریقا، ئەمڕۆ لەناو دەوڵەتی تورکیا بە زمان و شارە کوردییەکان خۆی کردۆتە واقیعی حاڵ. بۆ نموونە، ئەمڕۆ گەر لە شارەکانی ڕوها و مێردین و سیرت و هەکاری و دیاربەکر، کەسێك لە ترسانیش بڵێت تورکم یان عەرەب، ئێوە پێی باوەڕ مەکەن، چونکە خۆشی باوەڕ بە خۆی ناکات.

بەبۆچوونی من، لەو جیهانە پڕ پێشکەوتنەی ئەمڕۆ تیایداین، پێویستە خۆمان بگۆڕین. چونکە ئیدی کاتی ئەوەی نییە یاری لەگەڵ یەکدی بکەین، بەڵکو پێویستە لەگەڵ یەك ڕاستگۆ بین، چونکە هەندێك ولاتی نموونەیی هەن وەك: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەڵمانیا، یۆگوسلافیا، سویسرا، ئەوانە

ولاتی نموونەیین. چونکە، گەر سەیریان بکەین، ئەو ولاتانە نە پارچە پارچە بوون، نە لە ڕێڕەوی پێشکەوتنی جیهانیش دواکەوتوون. بە پێچەوانەوە، ولاتی زۆر پێشکەوتووشن. گەر تورکیاش ڕاستییەکان ببینێت و لە چوارچێوەیەکی دیموکراسی مافە ڕەواکانی گەلی کورد بدات و بە جوداخواز هەژماریان نەکات، ئەوا ئەوانیش دەبنە پایەی بەهێزتر بوون و پێشکەوتنی زیاتر لەو ولاتە. بۆیە، دەپرسم ئەرێ ئێمەی کورد لەگەڵ تورکیا بووینەتە یەك پارچە؟ یان نا؟

پێم وایە نا، چونکە تۆ ناوچەکانی ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا، وەك شارەکانی ڕۆژئاوای ئەو ولاتە کاری خزمەتگوزاری بۆ نەکەیت و لە ڕووی ئابوورییەوە خەلکەکەی بخەیتە ناو حالێکی پەرێشان، ئینجا ناولێنانی منداڵان بە دلی دایك و باوکیان قەدەغە بکەی و ناوە دێرینەکانی گوند و شار و شارۆچکەکانی بۆ ناوی سەیر سەیر بگۆڕی، کەچی، پێتوابێ کاری چاکت کردووە!. جا کە ناوی گوندێکی تازە دەگۆڕدرێ و لە ڕۆژنامە بلاو دەکرێتەوە، گوندەکانی دراوسێی نایناسنەوە و دەلێن کوا گوندی بەو ناوە لە ناوچەکە هەیە؟ ئێوە ڕێگا نادەن بە زمانی دایکمان قسە بکەین و چ ناوێکمان پیخۆشە لە منداڵەکانی بنێین، کەچی دێن و دەلێن ئێمە براین، کاکە ئەوە چ برایەتییەکە!. یان دەلێن ئێمە وەك نینۆك و گۆشتین و لەیەك جیا ناکرێینەوە، ئێ ڕاست دەکەن کورد و تورك وەك نینۆك و گۆشتن، بەلام تورك گۆشتەکەیە و کوردیش نینیۆك، بۆیە، هەر کاتێك نینۆك درێژ دەبێ، ئێوە دێن و کورتی دەکەنەوە. کەی یەکسانی و برایەتی ئاوایە، ئەی هاوار!!!.

من بەو تەمەنەمەوە، کاتێك قەلەم دەگرمە دەست، تەنیا لەبەر

ئەوەی وڵاتەکەمان پارێزراو بێت، بەردەوام بە دوو دڵییەوە شتێك دەنووسم، چونکە دەزانم گەر بیانەوێت سبەی لەسەر (جوداخوازی) یەخەم دەگرن. کەچی من، تا ئێستا کوردێکی عاقڵم نەبینیوە، داوای دابەشبوونی تورکیا بکات. چونکە تۆمەتی (وڵات دابەش کردن و کورد پەرستی) ئەنجامی ئەو سیاسەتەیە کە سیاسییەکانمان ساڵەهای ساڵە پیادەی دەکەن. دەبێ لەوە تێبگەن کە کورد نایەوێت لە تورك جیا بێتەوە، بەڵام ئەو لەناو چوارچێوەیەکی دیموکراسی داوای مافەکانی خۆی دەکات. کاتێکیش ئەو مافانەی بە یەکسانی وەرگرت، ئەویش دەیەوێت لەو وڵاتە بژیێت. چونکە کورد دەزانێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهان بێ کەس و بێ دۆستە. وەك چۆن کورد و تورکیش دەزانن گەر تەنیا بەیەکەوە لەگەڵ یەك باش بن ئینجا دەتوانن ڕزگار بن و پێشبکەون.

پێموایە، کورد ئەوەندە بێ عەقڵ نییە بیەوێ تورکیا دابەش بکرێ و ئیستانبووڵ و ئەنقەرە و ئیزمیر و بورسا و ئەنتاڵیا و ئەدەنە بەر تورك بکەوێت و مێردین و سیرت و بەدلیس و هەکاری و بینگۆل و ڕوها بەر کورد بکەوێت. چونکە ئەوکات دەریای سپی و ئیجە و دەریای ڕەشیش بەر تورك دەکەوێ، کەچی تەنیا دەریاچەی وان بۆ ئێمە دەمێنێتەوە. بەڵام گەر ئاوا بمێنینەوە لە ئێدرنەوە تا سلۆپی هەمووی هی ئێمەیە، بەڵام نابێ تورك خاوەن کار و کوردیش کرێکار بێ لەو وڵاتە. چونکە بەنگلادیش و پاکستان لەیەك جیا بوونەوە، کەچی هەردووکیان کۆتاییەکەیان زۆر خراپ بوو.

**یادەوەرییە تایبەتییەکانم**

راستە و بەو بەشە دەڵێم بیرەوەرییە تایبەتییەکانم، بەڵام دەبینم دیسان باسی عورف و عادات و فۆلکلۆری کوردی دەکەم.

## یاریی منداڵانی کورد

### ١- هۆلی

لە ناو کورددا دوو جۆر یاریی هۆلی هەیە. ئەگەر ئینگلیز، لە هیندستانیشەوە ئەو جۆرە یارییە منداڵانەیان بردبێتە ئەورووپا و بە هی خۆیانی بزانن، بەڵام ئەو یارییە هەر مولکی ئێمەیە. لە ئەشکەوتەکانی زڤینگێ، یانی ئەو گوندەی لێی لە دایك بووم و تێیدا گەورە بووم، یاریی هۆلیمان دەکرد. لای ئێمە ئەو یارییە دوو جۆری هەیە:

**یەکەم:**

دوو تاخم یاریکەر دروست دەکرێت. چاڵێك لە زەوییەکی بەرین هەڵدەکەندرێت، بە هەڵبژاردن کۆمەڵێك هێرشبەر هەڵدەبژێردرێت، تاخمی بەرامبەریش بەرگری دەکەن. هەر حەفت یاریزانەکەی هەردوو تاخمیش، یەکە و داریان لە دەست دەبێت. تۆپێکیش لە گەڵا و لق و پۆپی دار بە شێوەیەکی چاك دروستدەکرێت. ئینجا یاری دەست پێ دەکات:

ئامانجی یارییەکە ئەوەیە، بەو دارەی لەدەست یاریزانەکانە، تۆپەکە لە گۆڕەپانەکەوە بخرێتە ناو ئەو چاڵەی دروست کراوە، ئەوە کاری هێرشبەرەکانە. لە بەرامبەریشدا تیمەکەی دیکە بەرگری دەکا و دەیەوێ تۆپەکە نەکەوێتە ناو قوڕتەکە، بۆیە، گەر تاخمی هێرشبەر بتوانێ تۆپەکە بخاتە ناو چاڵەکە، واتە گۆڵێکی کردووە و خاڵێك وەردەگرێ، ئینجا دواتر شوێنەکانیان

دەگـۆڕنەوە. ئینجـا تـاخمەکەی دیـکە دەسـت بە هێرشـکردن دەکات، جا هەر لایەك سێ خاڵ بەدەست بهێنێت دەبێتە بـراوەی یارییەکە.

**دووەم:**

یارییەکە، لە شوێنێکی وەکـو یاریگـای تـۆپی پـێ، دەکـرێ. دوو گۆڵ دادەنرێت، وەکو یاریی تـۆپی پـێ، کـێ سـێ گـۆڵی لەوەی دیکە بکردبا ئەوا یارییەکەی دەبردەوە. گەر هـاتوو هـیچ یەکێـك لە تیمەکـانیش نەیتـوانی ئەو سـێ گـۆڵە بکـات و یارییەکەش کاتێکی زۆری پـێ بچووبـا، ئەوسـا چ لایەك گۆڵی زیاتر کردبا ئەو دەبووە براوە.

## ٢- کوچ کانك

کـوچ بە مانـای بەرد دێـت و کانیـك بە مانـای چـاو لێبـوون دێـت. بەرد لە مێـژووی میزۆپۆتامیـا و کوردسـتان، هەنـدێکجار وەکو چەکیش بەکار هاتووە. منیش بە منـداڵی زۆرم ئەو یـارییە دەکرد. ئێستاشی لەگەڵدابێ هێشـتا دەزانـم ئەو یـارییە بـکەم. ئەو یـارییە بە تـایبەتی لە ڕۆژانـی جەژن دەکـرا. دوو منـداڵ و دوو گەنجی خوێنگەرم بەرامبەر یەك ئەو یارییەیان دەکـرد. یـارییەکە بـۆ خۆشـی بـوو، بەڵام لەگەڵ دەسـتپێکردنی ئەو نـاوە دەبـووە مەیدانی جەنگ. بۆیە، زۆرجار یاریزانەکان برینـداریش دەبـوون. دەیگێڕنەوە هەنـدێکجار یـاریزان هەبـووە مـردووە. سـەیر ئەوەیە گەورەکانیشمان نەیاندەگوت ئەو یارییە مەکەن، هەرگیـز نەبـووە ڕێیان لێ گرتبین، چونکە یارییەکی مەترسیدار و خوێناوی بـوو. گەورەی هەر گونـدێکیش بەو یـارییەی منـداڵەکانیان خۆشـحاڵ دەبوون. بۆیە، سەرکەوتنی منداڵانی گونـدێك لەو یـارییە بەسـەر منداڵانی گوندێکی دیکە جێگای شانازیی گەورەکان بوو.

### ٣- پەری

مندالّ هەر مندالّە، ئەوەی پێشییەوە سەرقالّ دەبێ یاریکردنە. دەلێن ئیبن سینا، لە تەمەنی ٢٠ سالّی بووەتە مامۆستا. ئەو، رۆژێك لە بەغدا قوتابییەکانی دەباتە دەرەوە بۆ ئەوەی هەوایەکی پاك وەرگرن و لەبەر هەتاو وانەکانیان بخوێنن. سینا لەگەلّ ئەوەی تەمەنی بچووك بووە، بەلاّم قوتابیی زۆر بە تەمەنیشی هەبووە. ئیبن سینا، لە کاتی وانە گوتنەوە چەند بەردێك لە پێش خۆی دەبینێت و دەستدەکات بە یاری ساپ ساپانێ. ئەو کارەی مامۆستاکە دەبێتە هۆی ئەوەی قوتابییەکانی پێبکەنن. ئەویش لێیاندەپرسێ: "بە رێزینە بە چی پێ دەکەنن؟" قوتابییەکانیش وەلاّمیان داوەتەوە: "مامۆستا ئێوە وەکو مندالّ ساپ ساپانێ بەو بەردانە دەکەن". ئیبن سینا سەیرێکیان دەکا و دەلێ: "بەلێ یاری دەکەم، چونکە پێویستە حەق بە هەموو تەمەنێك بدرێت لە ژیان".

منیش دەمەوێ باسی بەکارهێنانی مافی ژیانی خۆم بکەم، بەلاّم بیردەکەمەوە، جگە لە تەمەن و حەقی مندالّیم من لە هیچ یەکێ: لە قۆناغەکانی تەمەنی خۆمدا مافی خۆم وەرنەگرتووە. چونکە هەر کاتێك داوای حەقێکی کەسیم کردبێ، خۆم لە زیندان بینیوەتەوە.

با ئێستا بگەرێینەوە سەر یاریی (پەری). هەر یەکێك لە مندالّەکان، پەڕەمووچێکی سووکی قاز یان مریشك یانیش مراویمان دەدۆزییەوە. چەندان مندالّ دێنە لای یەك و لە شوێنێکی داخراو یارییەکە دەکەن، ئەو شوێنەش زۆربەی کات لە ئاخوری ئاژەلاّن یانیش لە کادین دەکرا. ئینجا بە دەومانەوە فوومان لە پەڕە مووچەکە دەکرد و نەماندەهێشت بکەوێتە

زەوی. خالی سەرەکی ئەو یارییەش چۆنیەتی فوکردن و فڕاندنی ئەو پەڕەمووچە بوو. جا ئەوەی پەڕەمووچەکەی بکەوتبا سەر زەوی لە یارییەکە دەردەکرا و ئەوەی تا کۆتایی مابایەوە و نەیهێشتبا پەڕەمووچەکەی لە هەوا بێتە خوارەوە، دەبووە براوەی یارییەکە.

## دوایین یادەوەرییەکانم

### پارێزگار

من پێم وایە تۆ لە ترس و بێ توانایتدا یەکەم و پێشەنگی. لە کۆندا، سولتان و سەر وەزیرانەکانیان، کاتێک دەچوونە جەنگ، ئەوان لە پێشەوەی سوپاکەیان دەڕۆیشتن و بە شمشێری کورت دەجەنگان، ئەمەش هێمای ئازایەتی و بە غیرەتییان بوو، بەڵام جەنابتان حیز حیز خۆتان لە کون و قوژبنی پارێزراوی دیاربەکر شاردۆتەوە و چاوەڕوانی هاتنی مووچەی سەری مانگ دەکەن. سەرەڕای ئەمانە، هاتووی و قسەی لە خۆت گەورەتر دەکەی، بزانە ئەو وتانە حەددی تۆ نییە. شتی وا چۆن دەبێت پارێزگاری بچووك! بنواڕە، کە لە ٢٨ی مایسی ١٩٩٢، دیسان لە میدیاکانەوە قسەیەکی حەلەق و بەلەقت بڵاوبۆوە، کە دەڵێی: "من پەکەکە لە ڕەگەوە دەردێنم". جەنابت ئەو کارە دەکەی ها! تۆ گەر پیاوی وەرە ناو خەڵك و بڕۆ بازار خیار و تەماتە و باینجان بکڕە، نەك لە ژووری نووستنی خۆتەوە قسەی زل زل بکەی. لەگەڵ ئەوەی ئێستا قەدەغەیە، بەڵام زۆرم حەز دەکرد ئەوکاتەی ئاسایی بوو لەگەڵ تۆ زۆرەملانێیەکمان بکردبایە، چونکە سەرباری ئەوەی تەمەنم ٧٧ ساڵە و جەنابیشت، بەو پێیەی هێشتا خانەنشین نەبووی، دەبێ تەمەنت پەنجا ساڵێك بێت، بەڵام

دڵنیابە لەبەر ئەوەی من کوردێکی باوەڕدارم، بۆیە سەربازێکی بە پارە کارکردووی وەك تۆم پارچە پارچە دەکرد. پێموابێ ئەو قسانەم دژی مافەکانی مرۆڤ نییە، ڕەنگە دژی یاساکانی تورکیا بێت.

خەڵکینە سەیرکەن، کەسی خاوەن ماف چەندیش لاواز بێت، بەڵام دیسان سەردەکەوێت. شێخ سەعیدی کوردی (شێخ سەعیدی نەورەسی) لە دادگای گرانی تاوانەکانی ئیسپارتە، لە کاتی دادگایکردنەکەیدا دەڵێ: "داواکاری گشتی تۆ داوای لە سێدارە دانی من دەکەیت و کەللەی منت دەوێت، بەڵام باش بزانە، گەر بەقەد ژمارەی تاڵەکانی قژم کەللە و سەرم هەبێت و هەر ڕۆژەو دانەیەکیان بپەڕێنن، من لە ڕێگای ڕاست و دروست لانادەم". جا جەنابی پارێزگاری دیاربەکری خۆ هەڵکێش، من مووسا عەنتەری نەوەی شێخ سەعیدی کوردیم. من باپیرەی هەموو ئەو خەڵکە نەدار و بێ مووچە و کەسە پاکانەم لە هەکارییەوە تا ئەدرنە، نەك وەك تۆ بۆ بەشداریکردن لە پیادەکردنی تاوانێك لە ناوچە کوردییەکان، پارە وەربگرم. بۆیە، چاك بزانن تۆ و ئەوەی تۆشی ناردۆتە ئەو شارە، هەمووتان، وەکو مۆسۆلینی و هیتلەر، لەبەردەم جیهان ڕەزیل و ڕیسوا دەبن، بەڵام من، وەکو پیر سوڵتان عەبدالی هەژار، بە شەرەفمەندانە لەناو خەڵکی هەژاری کورد و تورك دەژیم. بۆیە، چی دەکەن بیکەن، بەڵام دەمویست منیش وەك سوقرات و سوڵتان عەبداڵ لە سێدارە بدەن.

### ئەنقەرە

لەوەتەی بیرم دێت، من کەیفم بە ئەنقەرە نەهاتووە، بۆیە، بەردەوامیش بێ بەختیم بۆ دێنێتە پێش. بەڵام زۆرجار بۆ کاروباری پێویست سەردانی ئەو شارەم کردووە. ئێوارەی ١١-١٢-١٩٩١، یەکێك بوو لەو جارانە. ئەوجاری، باڵیۆزخانەی فەڕەنسا لە ئەنقەرە، داوەتی ئێوارە خوانێکیان کردبووم. لەگەڵ من، لەیلا زانا و ئەحمەد تورك و خەتیب دیجلە و محەمەد قەهرەمان و چەندان ڕۆژنامەڤان و سیاسەتمەداری دیکەی کوردیش لەوێ بوون. من زۆر خۆشیم لەو جۆرە ئێوارە خوانانە نایەت، بە تایبەتی ئەو شێوازەی کە ڕۆژئاواییەکان، لەسەر مێزێکی بڵند هەرکەسە و قاپێك و بەرداخێکی لەدەستە و وەکو دەرۆزەکەر دەسووڕێنەوە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش، لەگەڵ بەشێك لە ئامادەبووان قسە و دەمەتەقێی خۆشمان کرد. ئەو ئێوارەیە، بەڕێز مورات قەرەیالچنی سەرۆکی شارەوانیی ئەوسای ئەنقەرەش داوەت کرابوو. جەنابیان زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێ کردم، چونکە ئەویش وەك ئەوەیە لە خۆمان بێت، تەنیا جیاوازییەکی لەگەڵ ئێمە ئەوەیە، جەنابیان دەریای بینیووە، واتە لە نەتەوەی لازە. باڵیۆزی فەڕەنسا، هەم وەکو کەسی یەکەمی وڵاتەکەی لە تورکیا، هەمیش وەکو خاوەن ماڵ ئامادەی ئێوارە خوانەکە بوو. زۆر دەمەتەقێی خۆشمان کرد و پێکەنین، لەناو ئەو قسانە بووین بە ئاماژەکردن بەو پشکە گۆشتە بچووکانەی هەر دانەیەکیان بە قەد دەنکە نۆکێك بوو، بە باڵیۆزم گوت: "مۆسیۆ ئەوە چ داوەت کردنێکە؟ چونکە گەر ئێوە بێن و ببنە میوانی ئێمە بەرختان بۆ دەکوژینەوە و گەر بەو پشکە

بچووکانەی ئێوە بەراوردی بکەین چەندان ملیۆن پشکی لێدەردەچێ". بالیۆز بە پێکەنینەوە: "وەڵا ڕاست دەکەن، چونکە ئێوە وەکو ئێمە بورژوازی نینە و خاوەن عەشیرەتن، بۆیە، مەرد و میوان دۆستن".

مۆسیۆی بالیۆزی فەرەنسا، ساڵانێکی درێژ پەیامنێری ڕۆژنامەی (لی مۆند)ی فەرەنسی بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆیە، خۆی بە کورد و تورك و عەرەب و ئیرانی دەزانێ. لەگەڵ ئەوەی کەیفیشم پێیان نایەت، بە نیازم لە یادەوەرییەکانی داهاتووم دیسان باسی بکەم. چونکە ئەوەندە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ماوەتەوە ئیدی ڕاستی و دروستیی خۆی لە دەستداوە و وەکو سیاسەتمەدارەکانی ئێمەی لێهاتووە. پێموابێ بەستەزمانەی لە جانتا دیپلۆماسیەکەیدا چەندان ماسکی جیاوازی پێبوو. سەرنجم دا جەنابیان بەپێی کەسەکان ماسکەکانی دەگۆڕی، هەندێکیان دەم بە خەندە و پێکەنیناوی بوون، هەندێکیشیان جددی و توند، هەندێکی دیکەش کورد گوتەنی، قەشمەری وەك خۆی نەبوو.

تا درەنگانێکی شەو خواردمان و خواردمانەوە و جەنابی بالیۆز هەر لەگەڵمان بوو. لەکاتی ماڵئاوایی کردندا، بینیم جەنابیان دیسان زوو زوو ماسکەکانی دەگۆڕی. لەگەڵ ئەوەی دەمزانی نابێ، بەڵام داوای کارێکم لێ کردن. کەچی بینیم کابرا وەکو دووکاندارێکی حەلەبی بە قسەی باق و بریق هەڵمدەخەڵەتێنێت و دەیەوێت بەڕێم بکات. ئیدی لەوێوە هەستم کرد ئەو زەلامە چەندە بووەتە تاکێکی ڕۆژهەڵاتی، بە تایبەتیش عەرەب، تەنیا عەگالێکی لێ کەمە.

ڕۆژی دواتــر، هەر لە ئەنــقەرە مــامەوە، چــونکە وەکــو دامەزرێنەری پارتی (هالکن ئەمەك پارتیسی HEP)[1]. بەشداری کۆنگرەکەیم دەکرد کە سێ ڕۆژ دواتر بەڕێوەدەچوو. بە نیاز بووم بۆ دوو سێ ڕۆژ بچمە ئیستانبوول، بەڵام ماوەکە کەم بوو، بۆیە، پەشیمان بوومەوە و سەردانەکەم هەڵوەشاندەوە، بە ناچاری لە ئەنــقەرە مــامەوە. لە هەڵبژاردنەکــان، ڕێکخســتنەکانی حــزب تۆزێك کەموکووڕیان تێکەوتبوو، بۆیەش ئامانجی کۆنگرەکە بریتــی بــوو لە ڕێکخســتنەوە و نــوێکردنەوەی ئۆرگانەکــانی. کــۆنگرەکە لە گەورەتـرین شـوێنی داخـراوی ئەنـقەرە بە نـاوی ساڵۆنی سەلیم سرِی تارجان بەڕێوە دەچوو. ڕۆژی کـۆنگرە، لە بەیانی زووەوە شوێنی کۆنگرەکە پڕ بوو لەلایەنگرە پڕ جۆش و خرۆشەکانی حیزب.

ئەوسـا، هەرچیمـان کردبـا، بە پـارتەکەی ئێمەیـان دەگـوت حیزبە کوردییەکە. ئێمەش ئەوەمان قبوولکردبوو. چونکە ئەوە بۆ ئـێمە کەموکـووڕی نەبـوو، بەڵکـو شـەڕەف و گەورەیـی بـوو. کەچـی سـەیری لیسـتی نـوێنەری شـارەکانم کـرد، کە ئامـادەی کـۆنگرەکە دەبـوون، بینـیم نـوێنەری شـارەکانی ئیسـتانبووڵ و ئەنقەرە و ئیزمیر و ئەدەنە و مێرسین و ئەنتالْیا و ئالانیا و ئایدن و هەتای و بورسا و کۆنیا و کرشەهیر زۆر زیاتر بوون لە نوێنەری شــارەکانی کوردســتان. ئیـدی وردە وردە، بەپێـی کارنــامەی کۆنگرەکە، قۆناغەکانی بەڕێوەچوونی کۆنگرە دەچووە پێش و

[1] پارتێکی سیاسی کوردی بوو، لە سالی ۱۹۹۰ دروستبوو، سالی ۱۹۹۲، دوای سوێند خواردنی لەیلا زانا بە زمانی کوردی لە پەرلەمانی تورکیا، بە بڕیـارێکی دادگـا بــە تۆمــەتی دابەشــکردن و دروســتکردنی بیرۆکــەی جوداخوازی لە تورکیا، داخرا. (وەرگێڕ).

چەند وتارێك پێشکەش کران. من نیازی قسەکردنم نەبوو، بەڵام گەنجەکان هاتن و لەو شوێنەی دانیشتبووم منیان لەسەر ملی خۆیان دانا و بردمیانە شوێنی قسەکردن. لەوێ هەندێك قسەمکرد، ئامادەبووانیش قسەکانمیان بەدڵ بوو و دەستیان بە چەپڵەلێدان کرد. لەو سەر و بەندە، دواتر زانیم کە پۆلیس قسەکانی منیان ڕیکۆرد کردبوو.

لەگەڵ هەمــوو ئەو ڕووداوانە، یەکێکی دیکە لە شتە سەیرەکانی ئەو کۆنگرەیە، ئامادەبوونی دایکی عەبدوڵلا ئۆجەلان بوو، ئینجا نازانم بە ڕێکەوت بوو یان بە لە پرۆتۆکۆل زانین، دایکی ئاپۆ لە تەك من دانیشت. لە سەر سەکۆوە گوێم لێبوو سوپاسگوزاریی منیان کرد وەکو باپیرێکیان و ئینجا دەستیان بە بەسەرهەڵداگوتن کرد، دواتر گوتیان سوپاس بۆ ئەسما ئۆجەلان، وەکو دایکی هەموومان لێرە ئامادەیە. هەر ئەوەندە گوترا و ئیدی بە هەزاران کەس هاتنە سەر بۆ دەست ماچکردن. لەو بەینە، بەسەرهاتی خۆش خۆشیش ڕووی دا، چونکە ناوی من و دایکی ئاپۆیان بەیەکەوە هێنا، بۆیە، هەندێك گوتیان با بانگی مەلا بکەین، بۆ لێك مارەکردنتان، هەندێك گوتیان ئەوە دایك و باوکی ئاپۆن، ئیدی حەنەکەکە چووە قاڵبێکی مەترسیدار، بۆیە گوتم کاکە واز بێنن، چونکە دەزانم ئاپۆ بە فەخرەوە من وەکو زڕ باوکی خۆی قبووڵدەکات، بەڵام موریدە دینەکانی ئەو حەنەکانە بە سووکایەتی وەردەگرن و دەمکوژن.

بەراستی ئەو کۆنگرەیە بووە لاپەڕەیەکی زۆر گەشاوە و ڕەنگاو ڕەنگ لە ژیانم. ئەو جۆش و خرۆش و ئازایەتی و مەردایەتییەی ئامادەبووان، کە تینووی ئازادی و سەربەخۆیی بوون، تا کۆتایی ژیانم لە بیرناکەم، ئەوڕۆژە ڕۆژێکی زۆر

شـــەڕەفمەندانە بـــوو. چـــونکە کـــۆنگرەکە بە یەکگرتـــوویی و بەیەکەوەبوون و بناغەکانی دیموکراسی کۆتاییهات.

قەت لەبیرم ناچێت، ساڵی ١٩٤٢، پرۆفیسۆری ئەڵمانیی بەشـی ئـابووریی زانکۆکەمـان، چەنـد سەرسـام بـوو بەو ڕێبـازی هەڵبژاردنەی بۆ دیاریکردنی سـەرۆکی بەشـە نـاوخۆیی دیجلەی قوتابیـان دامـان نـابوو. بەڵام بە داخەوە لە تورکیـا سـوودی لـێ نەبینرا. وەك چۆن نەبی شاعیر دەڵێ: "ڕووبارێکی زۆر بە خـوڕ و قووڵ و زۆرم، بەڵام چیکەم بەناو بیابان تێدەپەڕم". شـاعیر، لێـرە مەبەسـتی ئەوەیە کەسـێکی زۆر بە سـوودە، بەڵام دەوروبەرەکەم جاهیلە و سوود لە من نابینێت، جا سووچی مـن چییە؟. سـەیری مێـــژوو دەکەم و دەبیـــنم گەلـــی کـــوردیش وەك نەبـــی و ڕووبـارەکەن. چـونکە تەواوی جـوولانەوە کۆمەلایەتییەکـان بە سەرکردایەتیی کورد دەکرێن، بەڵام کەمتیارەکـان ئەشـکەوت و چاڵ و چۆڵ پیشانی ئەو جوولانەوەیە دەدەن.

کـاتی خـۆی، ئاگبـار ڕەشـی، سـەرۆکی دەوڵەتـی کـوردیی ئاگبار لە ڕوهـا، لە سـەردەمی حەزرەتـی عیسـا نەخۆشـدەکەوێ. بەڵام گوێی لێ دەبێ یەکێك لە فەلەستین پەیدا بووە، کە مردوو زینـدوو دەکـاتەوە و کـوێر چـاك دەکـاتەوە و بە دەسـتلێدانێك هەموو نەخۆشێك ساغ دەکاتەوە. ئاگبـار ڕەش لەگەڵ کۆمەڵێـك دیـاری بە نـرخ، گرووپێـك لە دار و دەسـتەکەی دەنێـرێتە لای حەزرەتـــی عیســـا و داوای چارەســـەرکردنی نەخۆشـــییەکەی لێدەکات. ئەو شاندە دەچنە ئۆرشەلیم، ئەو شارەی دواتر عەرەب کردیـانە قـودس، لەوێ عیسـا دەبیـنن. لە دانیشـتنەکە پێغەمـبەری خوا پێیاندەڵێ: "من ناتوانم لە نیشتمانی خۆم جیا ببمەوە، چـونکە ئەو ئەرکەی خـــوا پێـــی ســـپاردووم لێـــرەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی حوکمدارتان باوەڕی بە من هێناوە، ئەو دەستەسـڕەی مـن لەگەڵ

خۆتـان بـبەن و بە هەمـوو گیـانی دابهێـنن، پەنـا بە خـوا چـاك دەبێـتەوە". دوای هـاتنەوەی شـاندەکە، ئاگبـار دەستەسـڕەکە بە گیانی خۆی دادەهێنێت و چاك دەبێتەوە.

ئەو چیرۆکە ئەوەمـان بـۆ پشتڕاسـتدەکاتەوە کە کـورد دوای هاتنی عیسـا باوەڕیـان بە ئـایینەکەی هێنـاوە. ئەوە یەك، یەکێکـی دیـکەش پەیوەنـدی بە ئـایینی ئیسـلامەوە هەیە کە کـورد بەر لە تـونس و مەغریـب و جەزائیـر لەسـەردەمی عـومەری کــوڕی خەتاب، لە فتوحاتەکانی ئەو سەردەمە، کە خالیدی کوڕی وەلید دێـتە کوردسـتان و ئێـرە فەتـح دەکـا و بە زەبـر و زۆر کـورد دەکـاتە موسـوڵمان. ئینجـا دواتـر کاتێـك تـورك لـە ناوەڕاسـتی ئاسیاوە دێتە ناوچەکە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نیشـتەجێ دەبـن و بە هاوکاریی کورد موسوڵمان دەبـن. بـۆ نمـوونە گەورەتـرین کەسیان، کە ناوی سەلجوقە، لە تەمەنی ٤٣ساڵی سونەت کـراوە و ناوی خۆی کردۆتە محەمەد.

لەو نمونانەی سەرەوەڕا، بۆمـان دەردەکەوێـت لە جـووڵانەوە سیاسـی و کـۆمەڵایەتی و ئایینییەکـان، کـورد بەبەراورد لەگەڵ گەلانـی ئاسـیا و ئەفریقـا و بەشـێکیش لە گەلانـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاست، زۆر لە پێشتر و خێراتر بووە. بۆیە، پـێم وایە تـورك و عەرەب و عەجەم لە نـاوچەکە لە سـایەی کـورد دەبـنە گەلـی دیموکراسـی. چـونکە ئەو وڵاتە موسـوڵمانانە، تـا دان بە مـافی گەلی کورددا نەنێن، خۆشیان نـابنە وڵاتێکـی دیمـوکرات. یـانی دووبـارە ئـاڵای دیموکراسـی لەسـەر چیاکـانی کوردسـتان دەشەکێتەوە.

## مانگرتن لە خواردن

بەشێوەیەکی گشتی بووەتە نەریت، کاتێک کەسێک لەسەرەمەرگە وەسیەتەکانی خۆی دەنووسێتەوە، یانیش گەر ڕووداوێکی بەسەر هاتبێت ئاگاداری ماڵ و منداڵەکانی دەکاتەوە، هیچ نەبێت بۆ ئەوەی ئەوانیش ئاگاداری بابەتەکە بن.

لە بەرواری ١٣-٣-١٩٩٢، دەوڵەتی تورکیا زۆر کار و جووڵانەوەی دژی کوردستان جێبەجێکرد. لە ئەنجامیشدا، چەندان دایك و منداڵ و پیر و گەنج کوژران، بەو تەمەنەی خۆمەوە زەحمەتبوو بەرگەی ئەو ڕووداوانە بگرم. هەتا ڕێ لە کوشتنی خەڵکی بێتاوان و ئافرەت و منداڵ و کەسانی ئیختیار بگرین، لەو بەروارەی لەسەرەوە باسمکرد، لە ئیستانبوڵ بۆ ماوەی ٤٨ سەعات لەگەڵ کورد و تورکە هەڤاڵەکانمان لە بارەگای پارتی HEP لە بێشکتاش،مانمان لە خواردن گرت. لەگەڵ ئەو کارەمان، کاردانەوەیەکی چاکمان لەلایەن کورد و تورکە مرۆڤدۆستەکان بینی. لەو شوێنەی لێی مابووینەوە دوای ماوەیەکی کەم شوێن نەما خەڵك لێی دانیشێت، بە سەدان دەسکە گوڵی ڕێزلێنانمان بۆهات. لە دەرەوەش، کەناڵی BBC و کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤی ئەوروپا و پارتی سەوزی ئەڵمانی و ڕێکخراوە مرۆڤدۆستەکانی ئەوروپا، بەدەممانەوە هاتن. جگە لەمانە، شەش پارێزەر و دادوەرێك لە ئەڵمانیاوە هاتن و لەگەڵم دانیشتن، من ئەو قسانەم بە دادوەرەکە گوت: "جەنابی دادوەر، لای ئێوە قەدەغە نییە دادوەر تێکەڵی کاری سیاسی بێت؟". لە وەڵامی مندا گوتی: "نا، چونکە لای ئێمە قەدەغە نییە گەر دادگا بەدواداچوون بۆ کەیسێك بکات و پاڵەپەستۆ بخاتە سەر لایەنی

ناحەق، جا ئەوەی کە مافی زەوتکراوە کورد بێت یان هەر گەلێکی دیکە، چونکە ئێمە لەسەر ڕێگای مرۆڤایەتی دەڕۆین".

دوای تێپەڕینی ٤٨ دەمژمێر، هیچ میدیایەکی تورکی، نە لە دوور و نە لە نزیك، مێشێکی میوان نەبوو و خۆی لە قەرەی پرسەکە نەدا، لەوەشەوە بۆمان دەرکەوت ئەو میدیایە لە خەوێکی قووڵی کەمالیستەکانە، بۆیە، هیچ بەلایانەوە گرنگ نییە تورکیا بەرامبەر بە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ڕەزیل و شەرمەزار بکەن یان نا. چونکە ئەمڕۆ گەر سەیرکەین، میدیای تورکی لەدەست ئەو جووە سەرکەوتوانەن کە لە جوولەکەیتی هەڵگەڕاونەتەوە و بوونەتە موسوڵمان. بۆیە، بەرامبەر بەو بێدەنگییەی ئەوان بڕیارماندا بچینە بەردەم بارەگای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی تورکیا و لەوێ دەسکە گوڵێکی ڕەش دابنێین و بۆ ماوەیەك پرۆتێستۆیان بکەین تا ڕەزیل و شەرمەزار بن. ئەوەی بە بیرماندا هات کردمان، بەڵام هێزەکانی پۆلیسی پارێزەریان نەیانهێشت کارەکە وەك ئەوەی بیرمان لێ کردبۆوە بکەین، چونکە بە شەق و پێلەقە دەسکە گوڵەکانی دەستمانیان لێستاندین و دووریان خستینەوە، ئینجا بەشێکیشمانیان بردە بنکەی پۆلیسی ئێمینونو. با درۆی تێدا نەبێت،چونکە لەوێ هیچ توندوتیژییەکیان بەرامبەرمان نەنواند، وەلێ منیان ٢٤ سەعات لەسەر کورسییەك هێشتەوە و نەیان هێشت هەڵستم، ئەمە پاش ئەوەی کەسێکی ٧٧ساڵی وەکو من ٤٨ دەمژمێر بوو مانم لە خواردن گرتبوو، بۆیە، گەر ئەوەش جۆرێك نەبێ لە ئەشکەنجە، ئەی دەبێ چی بێت؟ جا لە شانسی خۆمان، باش بوو بەڕێوەبەری بنکەکە کورد بوو، بۆیە، شەرمی کرد ئەشکەنجەمان بدات.

ڕۆژی دواتر، بەیانییەکەی بە دەستبەستراوی ئێمەیان بردە دادگای ئاسایشی دەوڵەت. دوای بردنمان بۆ دادگا، داواکاری

گشتی، بە بەهانەی ئەوەی دۆسیەکەمان پەیوەندی بەوانەوە نییە، داواکەیان وەرنەگرتین، تاکە تاوانیشمان بریتی بوو لەوەی بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت خۆپیشاندانمان کردووە، کەچی هێزەکانی پۆلیس ئێمەیان لە شەقامەکانی ئیستانبووڵ دێنا و دەبرد. ئینجا ئێمەیان بردە شوێنێك لای مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد، توومەزە دواتر زانیمان شوێنەکە پزیشکی دادوەری بوو. ئامانجیشیان ئەوە بوو، ئەوە پشتڕاست بکەنەوە کە ئەشکەنجەیان نەداوین. دکتۆرێك هات و پێی گوتم جلەکانت داکەنە، منیش پێم گوت: "بۆچی جلەکانم داکەنم؟ دەتەوێ ڕاپۆرتێك بنووسن لەسەر ئەوەی پۆلیس ئەشکەنجەی من و هەڤاڵەکانمیان نەداوە؟ ئینجا سەیرم بەوە دێت ئایا هەر کەسێك ببردرێتە بنکەی پۆلیس دواتر دەیهێننە لای تۆ؟". دکتۆرەکەش بە قسەکانم قەڵسبوو، بەڵام هیچی نەگوت، لێ لە وەڵامی قسەکانی من گوتی: "نازانم کاکە گیان، پێم وابێ بۆ هەمووی وا نییە". منیش پێم گوت: "دکتۆر لە ڕووی فیزیکییەوە هیچ ئەشکەنجە نەدراوین و خۆم و هاوڕێکانم هیچمان پێ نەکەوتووە، چونکە دۆخی ئێمە بەرگەی ئەشکەنجە ناگرێ، بەڵام بۆ لەو ئەشکەنجانە ناپرسنەوە کە بەرامبەر گەنجەکان دەکرێ؟ من تەنیا شەوێك لەوێ مامەوە، بەڵام بریا جەنابت و وەزیری تەندروستی و وەزیری داد و سولێمان دەمیرەڵیش شەوێك لەوێ بان و گوێیان لە فیغان و هاواری ئەو گەنجانە با لە ژێر ئەشکەنجە چۆن هاوار دەکەن".

دوای پزیشکی دادوەری، دووبارە ئێمەیان بردەوە بنکەی پۆلیس. ئەوجارە بە نیاز بوون بمانبەنە دادگای سوڵتان ئەحمەد بۆ لای داواکاری گشتی، ئینجا لەوێ بڕیاری ئازادکردنمان دەرکرا. بەڵام لەولا و لەولا دەبیستمەوە تا ئێستاش ئەو دۆسیەیە دانەخراوە، چونکە دوای ئازاد کردنیشمان بە تۆمەتی ئەوەی

بەبێ مۆڵەت خۆپیشاندانمان کردووە، دووبارە دۆسیەکەیان بۆ دادگا بەرز کردۆتەوە.

جا ئەوەش یادەوەرییەکی دیکەی تاڵ و ناخۆشم، وەکو یادەوەرییەکانی دیکە.

# بەشی دووەم:
# بەڵگەکان

**نامە**

ئەو نووسینانەی لە خوارەوە دەیخوێننەوە، بەلای منەوە زۆر پڕ بایەخن، چونکە گەر ئاوا نەبووبا، من نەمدەویست باسی خۆم و ماڵباتەکەم بکەم. لەبەر ئەوەی من کاتێك یادەوەرییەکانم دەنووسمەوە، دەمەوێت ئەو نووسینە بۆ گەلی کوردی زوڵملێکراو ببێتە بەڵگەنامەیەک و بۆ گەلی تورك و گەلانی جیهانیش سوودێکی هەبێت. چونکە گەر باسی ئەوە بکەم، خێزانەکەم خۆش دەویست و ئەویش منی خۆش دەویست و دڵخۆش و بەختەوەر بووین بەیەکەوە، ئەوە هیچ سوودێکی بۆ خوێنەر نییە. بەڵام ئەو نووسینانەی لە خوارەوە دەیخوێننەوە لەو چەشنە یادەوەری و نووسینانە نین. چونکە ڕێبەرێکە بۆ هەر گەنجێك کە دەچێتە ناو ژیانی هاوسەرگیری و بە دوو کەس ماڵۆچکەیەك پێکدەهێنن.

ساڵی ١٩٤٣ من بەڕێوەبەر و خاوەنی بەشەناوخۆیی فوراتی قوتابیان بووم، بەو کارە پارەیەکی چاکم قازانج دەکرد، بۆیە، ئەوانەی پێشتر سڵاویان لێنەدەکردم، بینیم دوای ئەوەی دەستم بەو کارە کرد، بە کۆمەڵ لە دەورم کۆبوونەوە، بەڵام باش دەمزانی هەموویان کەسانی هەلپەرست و ماستاوچینە، بە شێوەیەك گەر پیاوێك بکوژم، هەموویان بە یەك دەنگ پێم دەڵێن: "دەستخۆش مووسا گیان زۆر جوانت کوشت". زگورتی

و گەنج بووم، بۆیە ئەو کەسانە بەردەوام منیان بۆ لای کچ و ئافرەتان پاڵ دەدا، لە کاتێکدا ماڵم نەبوو، چونکە لە ژوورێکی بەشە ناوخۆیی دەمامەوە. بیرمە نیوەی شەو لە دەرگایان دەدا و کچ و ئافرەتیان بۆ دەهێنام، جا وەك ئەوەی ئەو ئافرەتانە پێشتر زۆر خۆشیان لە من هاتبێ دەیانگوت: "سەیرکە مووسا ئەو ئافرەتە زۆر تۆی خۆش دەوێ". ئینجا ئەو کچە بەستەزمانەیان جێدەهێشت و دەڕۆیشتن. منیش زۆر جار دوای ئەوان ئەو کچانەم دەردەکرد، زۆر جاریش زگم پێدەسووتان و بۆ ئەوەی بە سووکایەتیی تێنەگات لای خۆم دەمهێشتنەوە. دوای تێپەڕینی کات، لە کۆتاییدا، بە هۆش خۆم هاتمەوە و خۆم بە خۆمم گوت: "مووسا تۆ منداڵێکی کوردی لادێی نەدیتکەی، بۆیە، گەر بەو شێوەیە بەردەوام بی، تۆش وەکو ئەو سەرسەرییانەت لێدێ و ڕیسوای دونیا و قیامەت دەبی. بۆیە، باشترین کار ئەوەیە کچێك لە ماڵباتێکی خانەدان بدۆزییەوە و هاوسەرگیری بکەی". ئەوسا لەگەڵ هەموو ئەو کارە نا بەجێیانە، چالاکی نەتەوەییشم دەکرد. چونکە تا ئەوسا ئەو ماڵبات و کەسایەتییانەی خەباتیان بۆ جووڵانەوەی گەلی کورد دەکرد، لە ئیستانبووڵ، ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێپەڕی نەدەکرد. لەبەر ئەوەی بەشێکی زۆریان لە سێدارەدرابوون، یانیش بۆ شوێن و وڵاتی دیکە ڕاگوێزرابوون، یانیش بەپێی کات بە شێوەیەکی ئاسایی کۆچی دواییان کردبوو. یەکێك لەوانەی لە ئیستانبووڵ مابوونەوە، شاعیری ناوداری کورد، عەبدولڕەحیم ڕەحمی زاپسوو بوو.

بەشەناوخۆیەکەم لە ناوچەی لالەلی بوو لە بەشی ئەورووپای ئیستانبووڵ، نزیك ناوچەی ئاك سەڕای. ماڵباتی زاپسووش لەوێ بوو. بەر لەوەی هاوسەرگیری بکەم، زوو زوو دەچوومە لای و

سوودم لە یادەوەرییەکانی وەردەگرت. لە نێوان ساڵانی ١٩١٩ تا ١٩٢٠ تەواوی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەی لە ئیستانبووڵ دەردەچوو شیعرە جوانەکانی عەبدولڕەحمان زاپسوویان بڵاو دەکردەوە. ئەوسا بەشێك لەو بڵاوکراوانە ناوەکانیان بەو شێوەیە بوو (کوردستان، هەتاوی کورد، ڕۆژی کورد، ژین). ڕۆژێك لە کاتی دەرچوونم لە ماڵی کاك عەبدولڕەحیم، لەبەردەرگا بینیم کچێکی جوان بە جلی زانکۆ هاتە ژوورەوە، پێموابێ کچی کاك عەبدولڕەحیم بوو. یەکسەر ڕامگرت و لێم پرسی: "جەنابت کێی؟". بەڵام ئەو سوور بۆوە و توورە بوو، بە ڕەقی وەڵامی دامەوە: "ئێرە ماڵی باوکمە". ئیدی لەو ساتەوە وەك ئەو تاوانبارەم لێهات کە پیاوێك دەکوژێ و کاتێکیش دەیەوێ وەڵامی دادوەر بداتەوە دەڵێ: "گەورەم نازانم چیم کردووە". منیش وەك ئەو تاوانبارە نەمزانی چۆن عاشقی ئەو کچە بووم. ئەو کچە (هالا عەنتەر) بوو، کە دواتر بووە دایکی منداڵەکانم. ئەو لە ئیستانبووڵ قوتابی ئامادەیی (ساینت جۆرجی) نەمسایی بوو. ١٠ ساڵ لە من بچووکتر بوو، بەڵام من چووە دڵم و چاوەڕێم کرد و زەماوەندم لەگەڵ کرد.

لە ئیستانبووڵ شێخێکی بەناوبانگی بیدلیسی هەبوو ناوی شێخ مستەفا بوو. دەچوومە لای ئەو و دەستەکانیم ماچدەکرد و لە شوێنی باوکی خۆمم دادەنا، ئەو کەسێکی دڵ نەرم و باش بوو، بۆیە، دوای ئەو بەسەرهاتە پێم گوت: "یا شێخ تووشی دەردێك بوومە و دەمەوێ لێی دەرچم، بۆ دەرچوون لەو دەردەش کچی ماڵباتێکی بە ناموسم بینیوە و دڵم چۆتە سەری. بۆیە، گەر باوکایەتیم بۆ بکەن و ئەو کارەم بۆ بگەیەننە ئەنجامێك، هەم خێرتان دەگاتێ، هەمیش گەنجێکی نیشتمان پەروەر ڕزگار

دەکەن". لەبەر ئەوەی شێخ مستەفا و کاك عەبدولڕەحمان هاوڕێ بوون، بۆیە پێی گوتم: "باشە کوڕم، ئەوەی لە دەستم بێت دەیکەم، تۆش تۆزێك ئارام بگرە". ماوەیەك دواتر داواکەی بە کاك عەبدولڕەحمان گوتبوو. لەبەر ئەوەی کاك عەبدولڕەحمانیش منی بە دڵ خۆش دەویست، بەڵام بۆ ئەوەی بە بەڵێ وەڵامی شێخ مستەفا بداتەوە پێویستی بە کات بوو.

تومەزە من نەمزانی بوو، بەڵام کاك عەبدولڕەحمان لە نێوان ساڵانی ١٩٢٦ تا ١٩٣٠ لە شارۆچکەی میدیاتی سەر بە مێردین بەڕێوەبەری فەرمانگەی دارایی بووە. بۆیە، پەیوەندی و دۆستایەتیی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە و کەسە دیارەکانی ئەوێ هەبوو. لەگەڵ ئەوە بەشێکی زۆری ئاغاکانی ناوچەکەشی دەناسی، لەبەر ئەوەی لەکاتی میوانداریکردنی منیشدا ناوی گوند و ماڵباتەکەمانی زانیبوو، بۆیە لە گەڵ عەزیز ئاغای برا گەورەی گەورەترین عەشیرەتی میدیات قسەی کردبوو و پرسیاری منی کردبوو. دەربارەی من لێی پرسیبوون: "گەنجێکی بەو ناوە هەیە لە ئیستانبوڵ و داوای کچەکەی منی کردووە، ئەرێ کەسێکی چۆنە تا بیکەمە زاوای خۆم؟". درێژی نەکەمەوە ئەوانیش لەسەر ماڵبات و عەشیرەت و خودی خۆشم ڕاپۆرتێکی چاکیان دابووە کاك عەبدولڕەحیم. هەموو ئەو پرسیار و وەڵامانە نزیکەی سێ مانگی خایاند. لەو ماوەیە من وەکو شێتێك لە چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی وەڵام بووم. بۆ ئەمەش زوو زوو دەچوومە لای شێخ مستەفا تا وەڵامێکی دڵخۆشکەر وەرگرم، بەڵام دەیگوت: "هێشتا هیچ هەواڵێك نییە". ڕۆژێك چووم، بینیم دەموچاوە نوورانیە لێو بەخەندەکەی لە جاران زیاتر گەشاوە و پڕ خەندەترە، ئینجا بانگی کردمە لای خۆی و ماچی کردم و

گوتی: "تەواو کوڕی خۆم کارەکە پێکهات، بۆیە پیرۆزبایت لێ دەکەم، چونکە وەڵامێکی ئەرێنیم لە کاک عەبدولڕەحمان وەرگرتووە".

ئێوارەیەك جیا لە ڕۆژانی دیکە بە کۆمەڵێك قوتوو شیرینی چوومە ماڵی کاك عەبدولڕەحیم، نازانم من وام هەستکرد یان هەر وابوو، بەڵام پێموابێ ئەو ئێوارەیە کاك عەبدولڕەحیم بە چاوێکی دیکە لە منی دەڕوانی، چونکە وەك ئەندامێکی خێزانەکەی مامەڵەی لەگەڵ کردم. پێموابێ لەو کاتانە مرۆڤ زۆر هەستیار دەبێ و هەوڵدەدات مانایەك بۆ هەڵسوکەوتەکان بدۆزێتەوە، چونکە بیرمدێت ئەو ئێوارە پێی گوتم: "مووسا، کوڕم بڕۆ پێیان بڵێ چایەکمان بۆ دروست بکەن!". دوای ئەو قسەیە وامزانی هەموو دونیا بووەتە هی من. بە فڕین چوومە لایان و پێم گوتن. ئەو ئێوارەیە کاتێك ڕۆیشتم، کاك عەبدولڕەحیم زەرفێکی نامەی دا دەستم و پێی گوتم: "کوڕم نامەی ناو ئەو زەرفە بخوێنەوە و وەڵامەکەتم بۆ بنووسە". ئەوەی لەناو زەرفەکە نووسرابوو، تۆزێکی دیکە وەڵامەکەی لە ژێر ناونیشانی (باوکی بەڕێزم) دەخوێننەوە، کە لە بەرواری ٢٩-١-١٩٤٣ بۆ کاك عەبدولڕەحیم زاپسوی خەزوورم نووسیومە. دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد پەرتەڤ زاپسوی کوڕی ئەو نامەیەی منیشی لەناو نامە هەڵگیراوەکانی باوکی دەبینێت و بۆمنی نارد.

لە هیچ شوێنێکی یادەوەرییەکانمدا باسی ژیانی تایبەتی خۆمم نەکردووە، لەبەر ئەوە داوای لێبووردن لە خوێنەرانم دەکەم و با لە کەم و کوڕییەکانم ببوورن.

١٩٤٣-١-٢٩

**باوکی بەڕێزم...**

لە کاتی نووسینی وەڵامی نامەکەتان، بە پشت بەستن بە ئەخلاقی داناییتان، دەمەوێ بە ئازادی بەرسڤتان بدەمەوە. دوای ئەوەی مەکتووبەکەی جەنابتانم خوێندەوە، هەستمکرد مفتەییێکە بۆ کردنەوەی دەرگای بەختەوەریی ڕێڕەوی ژیانم، بە سوود وەرگرتن لە بیروبۆچوونی کەسانی دیکە لەو کاروانەدا، چونکە دەبێ ئێمەی مرۆڤ بتوانین لە ڕێگا پێچا و پێچەکاندا بە سەلامەتی دەرباز بین و هەمان کات بتوانین گرێکوێرەی کێشەکانی سەر ڕێگا بەبێ پچڕان بکەینەوە.

هێماکانی ناو ڕێبەرەکەم ئەوەندە بەهێزە کە ڕێگر دەبێت لە هاتوچۆی هەر توخمێکی بیانی لە خوێنم. لەبەر ئەمانە دەتوانم بە بڕوا بەخۆبوونەوە بڵێم، هەر هەنگاوێکی دەیهاوێژم لەسەر بنەمای ڕێبەرەکەم دەبێت، وەك چۆن پێشکەشکردنی هەر داوایەکم دڵۆپێك دەبێت لە دەریای بەختەوەری.

### ١- ئامانج لە دروستکردنی خێزان چییە ؟

وەڵامی ئەو پرسیارە پیرۆزە، ئاستەمە بە دوو ڕستەی ماددی، یان بە دیاری کردنی ئامانجێك بدرێتەوە. بۆیە لە خوارەوە جگە لەوەی دەمەوێ وەڵامی ئەو پرسە لە سەرچاوەیەکی ڕۆحی بدەمەوە، بەڵام بەر لەوە دەمەوێ بێژم: ئەو حەیوانە کۆمەڵایەتییەی پێیدەڵێن مرۆڤ، بەردەوام لە خولیا و خەیاڵی ئەوە دایە ئەسەرێك بۆخۆی دروست بکات. جا بۆ هەندێکیان ئەو حەزە ماددیە، بۆ هەندێکیش مەعنەوی، یانیش کۆمەڵایەتی. بەڵام لەهەر سێ دۆخدا دروستکردنی کەشوهەوای ئەو دەستکەوتە بە ڕێگای خێزانێکی سەرکەوتوودا تێپەڕ دەبێت.

ئێوە ئاگاداری پشووی هۆتێلەکان و دەمەتەقێی سینەماکانن. لە قوتابخانەی زگورتیاتیشدا، چەندان کەسایەتی دەناسن، بۆ نموونە ئەو ڕستە ناودارەی دەڵێ: (سەزار[1] مێردی هەموو ئافرەتانی ڕۆما و ژنی هەموو پیاوانی ئەو شارەیە) تا ئێستاش لەکەیەکە بە نێوچاوانی مێژووی پڕ لە شکۆی ڕۆماوە. لە کاتێکدا ڕێڕەوی مرۆڤایەتی بە دروستکردنی خێزان گەشەی کردووە. هەموو ئەو نموونانە لەو جیهانە پڕ عیبرەتەمان بۆ ئەوەیە، گەر بە ڕێگایەکی دیکەدا گوزەر بکەین، دەبێ لە نەخۆشییەك زیاتر هیچی دیکە نەبێ. بۆیە بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی ویستوومە ڕوونکردنەوەی بۆ بدەم دەربارەی بیروهزری من، لە خوارەوە بەسەر چەند ناونیشانێك دابەشم کردووە:

### یەکەم دروستکردنی خێزان لە ڕووی ئایینییەوە:

١- بە شێوەیەکی سروشتی، دروستکردنی خێزان بریتییە لە مومارەسەکردنی مافێکی زایەندی، لە ژێر فەرمانی خوا و فەرموودەی پێغەمبەر. بەڵام ئەمەش تەنیا لەگەڵ خێزانێکی نەجیبزادە ئەگەری دروستکردنی هەیە.

٢- خێر گەیاندن بە دایك و باوك و خێزان دروستکردن لەسەر ڕێگای ئەوان و خستنەوەی نەوە و وەچەی تازە و پێگەیاندنیان. لە هەمان کات تێرکردنی گەدەی هەژاران و

[1] گایوس جولیوس سەزار یەکێک لە جێنراڵ و سیاسەتمەداری ڕۆمانی لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٠٠ی پێش لەدایکبوونی مەسیح لە دایک بووە و لە ١٥ ی ئازاری ٤٤ی پێش لەدایکبوونی مەسیح لە لایەن کۆمەڵێک سێناتۆری ڕۆمانییەوە کوژرا. ئەو ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە گۆڕینی کۆماری ڕۆم بۆ ئیمپراتۆری ڕۆم. (وەرگێڕ).

چاکردن و زاڵبوون بەسەر نەفس و دەروون بەو ڕێگایە سەرکەوتوو و هەستەوەرانە. هەمـوو ئەمانەش دووبارە تەنیا لە چوارچێوەی خێزانێکی خوادییەوە دێتە جێ. گەر ئەیوب هاوسەرگیری پێك نەهێنابا، سەلاحەدین نەدەهاتە دونیا، ئێمەش ئەوکات تەنیا لەشەوە زەنگێکی تاریك دەبوو سەیری مانگ بکەین، ئەویش زۆر بە تەڵخ و لێڵی.

٣- بەردەوامیدان بە مرۆڤایەتی تەنیا لە ڕێگای دروستکردنی خێزانەوە دەبێت؛ لە کاتێکدا مرۆڤایەتی بە بەهاترین خوڵقێندراوی خودایە. بۆیە، بۆ بەردەوامیدان بەو ئەسەرەی خوا خوڵقاندوویەتی، گەلەکەم زۆر بە شێوەیەکی پیرۆز ئەوەی فێری مرۆڤایەتی کردووە.

## دووەم: دروستکردنی خێزان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە

١- کاتێك لە کۆڵانە پڕ پێچ و پەناکانی ژیان تێپەڕ دەبین، زۆر بەربەست دێنە بەر دەممان. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەشیان، هەندێکجار تاك لایەنە، هەندێك جاریش بە کۆمەڵ، زۆربەی کاتیش هاوشانی خێزان بەسەر ئەو بەربەستانە زاڵ دەبین.

یانی، بە ڕستەیەکی کلاسیکی، دەربارەی ئەو پرسە دەتوانم بڵێم، بۆ دڵخۆشکردنی کەسێکی زگورتی، باشترین ئەتمۆسفێر خێزانێکی بەختەوەری پڕ و تەبایە. وەك چۆن هیچ چارەسەرێك وەك شیفای خێزان خێرا و بە سوود نییە بۆ ئەو ڕۆژانەی لەژێر بنمیچی ماڵ وەك نەخۆشێك دەناڵێنین. ئینجا، دەتوانم بڵێم هیچ ڕەنگ و شوێنێك و هەوایەکی خۆشی گوڵستان و دارستانەکان وەك کەشوهەوای ناو خێزان خۆش و پاك نییە، بۆ نەخۆشیش چارەسەری دکتۆرێکی نێوچاوان گرژ، بە قەد بەدەمەوە هاتنی خێزان نابێتە بنەمای شیفا و چاکبوونەوە.

٢- نهێنیی چیرۆكی بەختەوەری، بەیەكەوە ژیان و لەجەم یەك بوونە، بۆیە، لەسەر هەرتاكێك پێویستە بەشداری ئەو چالاكییە بكات لە كۆمەڵەكەی، وەك چۆن هەر كۆبوونەوەیەك پێویستی بە جۆرە جلوبەرگێكە، بۆیە كۆمەڵیش پێویستی بە بەشداریی جۆری جیاوازی تاكەكانە. چونكە كەسێكی بێكاری سەرسەریی بێ شوێن، ئاشكرایە چەند كەد و كەسەر دەبەخشێتە كۆمەڵگا، جا گەر چەند خاوەنی پلە و پایەش بێت. شووكرو بابان و تاهیر تان پرۆفیسۆرن، یانی ئەمانەكەسانی پێگەیشتوون، بەڵام كە دەڵێن (زگورتین) ڕاستەوخۆ ئەو ناونیشانەیان وەكو چینێك بەفری ساردی سپی، كامڵ بوونیان دادەپۆشێ و ناگەنە ئەو پوختەبوونەی مرۆڤێكی دیكەی لەو تەمەنە دەیگاتێ. ئەم زگورتی بوونەشیان نەك تەنیا بۆخۆیان، بەڵكو ڕەنگە زیان بە مرۆڤایەتیش بگەیەنێت.

**سێیەم: ئامانجی پێكهێنانی خێزان لە ڕووی نەتەوەییەوە**

١- گەلێكی خۆ ڕاگر، لە كۆمەڵێك خێزانی خۆڕاگر پێك دێت. بۆ نموونە، پێكهاتە و شێوازی ژیانی خێزانی فەڕەنسی و ئەڵمانیتان لا ئاشكرایە، وەكو نموونەیەك لە تێكچوونی پێكهاتە و شیرازەی خێزان لە ئەوروپا و وڵاتانی ڕۆژئاوا.

٢- نەبوونی خێزان زۆر جار بووەتە هۆی ئەوەی چارەنووسی گەلێك گۆڕانی بەسەردا بێت، بۆیە، ئەمرۆ بەو هۆكارەوە بەشێك لە مێژووی ئەو گەلانەش بە شێوەیەكی نادیار و تەڵخ ماونەتەوە. بەرامبەر بە شەرمەزاریی كلیۆپاترا و سەزار و كاترینا، ئەوانەی لە پاڵ هاوسەرەكانیان جەنگاون، بە درێژایی مێژوو ناویان هەر بە گەشاوەیی ماوەتەوە و ناوی گەل و وڵات و خەباتیان ئاشكرا و دیارە.

## دڵخۆشی چییە و بە چی وەدەست دێت و چۆن دروستدەبێ؟

بەختەوەری، بەرهەمێکی هەرە بەرزی هۆش و بیرمەندیی مرۆڤە. یانی بە شێوەیەك دەتوانین بڵێین بەرهەمێکی ئاوایە کە لە هەر ئان و ساتێکدا ڕەنگە لە دەستی بدەین، وەك چۆن دەشتوانێ خۆی لەگەڵ هەموو کەشێك بگونجێنێ. یانی، بوونی خۆشبەختی پێویستی بە سوپاسگوزاریی خودایە، تا بتوانین کەڵك لەو نیعمەتە وەربگرین. بۆیە، مرۆڤی خاوەن کەسایەتیی سەرکەوتوو، پارێزگاری لەو نیعمەتە دەکا و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش هەوڵی زیادکردن و گەشەسەندنی دەدات. هەندێك کەس هەن هیچ خۆیان بە ماڵباتەکانیانەوە نابەستنەوە و ڕێگایان بە ماڵ ناکەوێتەوە و منداڵی خۆیان خۆشناوێت، تەنیا بۆ دەرخستنی ناو خەڵك نەبێت. لە کاتێکدا ناتوانن هەموو ڕۆژێك بەختەوەرییە شاراوەکانی ناو خێزانەکەی خۆیان بدۆزنەوە، کەچی سەرقاڵی ئەوە دەبن ئەو بەختەوەرییانەی خەڵك بشێوێنن کە لەناو خاو و خێزانی خۆیان کەسانی دیکە لە دەوری کۆبوونەتەوە. بۆیە، بەو شێوەیەی خوارەوە، دەمەوێ عەرزی جەنابتانی بکەم کە دڵخۆشی چییە و چۆن و بە چ ڕێگایەك بەدەستدێت:

با وایدانێین باخێکی گەورەی جیهانی، بێ کەموکووڕی تژی گوڵ و گوڵزارە، بە چەندان جۆر و ڕەنگی جیاوازی گوڵ و داری قەد و باڵا بەرز ڕازاوەتەوە. ڕێبوارێك بەناویدا تێپەڕ دەبێت، بەڵام ئەو بەردەوام بەرز دەڕوانێت، بۆیە پێ لە گوڵە باخ و ڕەیحانەکان دەنێ و پانیان دەکاتەوە، جا دەیەوێ دەستی بگاتە

ئەو گوڵە بێ بۆنانەی ئەو دارە پیرانە دەری دەکەن، بەو شێوەیە نە دەستی بەوان دەگا، نە لەبەر بەرز ڕوانینەکەی ئاگای لەو بۆنە خۆشانەی ڕەیحان و گوڵە باخەکان دەبێت، کە پانی کردوونەتەوە، جا دەست بەتاڵ لە باخەکە دەچێتە دەرەوە. بەڵام لە هەمان باخ و پارك، ڕێبوارێکی دیکە کاتێك دێتە ناویەوە، گوێ لە دەنگی بولبول و جریوەی چۆلەکەکانی دەگرێ و بە ئاوی شوێنەکە دەموچاوی دەشوا و خۆی دەچەمێنێتەوە و گوڵە باخە ڕەنگا و ڕەنگەکان بۆن دەکا و دەسکێکیش ڕێحانی بۆنخۆش لێیکاتەوە و بیکاتە دیاری بۆ دۆست و ئەزیزانی.

هەردوو ڕێبوارەکە بە هەمان باخ و ڕێگا تێپەڕین، یەکێکیان بەرز ڕوانی و گوڵەکانی بەر پێی خۆی پلیشاندەوە، ئەوەی دیکەش خۆی بۆ گوڵەکانی بەردەمی چەماندەوە و تێر و پڕ بۆنی کردن و چەند دانەیەکیشی لێ کردنەوە بۆ دیاری، چونکە یەکێکیان بەدبەخت و ئەوەی دیکەیان بەختەوەر بوو.

## جیاوازی نێوان عەقڵ و هەست چییە؟

لە ڕاستیدا، وەڵامدانەوەی پرسیارێکی فەلسەفیی لەو چەشنە، ئەمڕۆ یەکێکە لە پرسە هەرە گرنگەکانی ناوەندەکانی زانست و زانیاری لە جیهان. دڵنیام لەوەی لە ماوەیەکی ئاوا کورتدا ناتوانم وەڵامێکی پوخت و جوانی جەنابتان بدەمەوە کە شیاوی قورسی و پڕ مانایی پرسیارەکەتان بێت.

عەقڵ شتێکە مرۆڤ لە ئاژەڵ و گیان لەبەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە، بۆیە، ئەوەیان تایبەتە بە مرۆڤ. هەرچی تایبەتە بە هەست، بە بۆچوونی من بریتییە لەو بازنەیەی کە جیهان بە مرۆڤەوە گرێ دەدات. بۆ نموونە ئەو شتە سپیەی بە دەستیەوە دەگرین، بەهۆی هەستکردنمان بە ساردییەکەی و ڕەنگە

سپیەکەی لە سایەی کارکردنی عەقڵ دوای هەستپێکردن بە ماددەکە بۆمان دەردەکەوێت کە بەفرە. بۆیە بەهۆی ئەو تۆڕانەی لەناو جەستەی مرۆڤدایە عەقڵ و هەستەکان وەکو دوو هاوپەیمانی یەکدین لە ژیان. یانی ئەوەی خاوەن عەقڵێکی ئاڵۆزە، بە دڵنیاییەوە کەسێکی زۆر کەم هەستە. ئەوانەی منداڵەکانیان دەخنکێنن، یاخود ئاگر لەماڵ و منداڵەکەی بەردەدات، یاخود ئەوانەی دایك و باوکیان دەدەنە بەر چەقۆ و هیچ حەیا و حورمەتێکیان نەماوە، نەخۆشن و پێیاندەڵێن (شێت).

دەمەوێ وەڵامی ئەو پرسیارەتان بۆ ئێستا بەوەندە کۆتایی پێ بهێنم، وەلێ دەمەوێ عەرزی جەنابتان بکەم لە داهاتوو بۆ گفتوگۆکردن لەسەر تەواوی پرسیارەکانی دیکە لەگەڵ ئێوە ئامادەم دەمەتەقێیەکی فەلسەفی بکەم.

*لەگەڵ ڕێز و حورمەتم*

*مووسا عەنتەر*

**نامەی سەروەر تانیللی**
**- ستراسبۆرگ ٢٨.٠٧.١٩٩١**

بەڕێز عەنتەر...
ئەوەنـدەی بیـرم مابێـت، لە مـانگی مایسـی ئەمسـاڵ لەلایەن ئینیسـتیتوتی کـوردی پـاریس پاکەتێـك بـۆ ناونیشـانی مـاڵەکەم نێـردرا. کە کـردمەوە بینـیم پەرتـووکی (یادەوەرییەکـانم)ی بەڕێزتی تێدا بوو. نازانم ئێوە ناردبووتان یـان برادەرێکـی دیـکە، بەڵام ئەوەی لای من گرنگە خوودی پەرتـووکەکەیە. مـاوەیەك لەمەوبەر گوێم لەوە ببوو ئەو پەرتووکە بـڵاو کـراوەتەوە، بۆیـە، داوام لە دۆسـتانی تورکیـام کردبـوو بـۆم بنێـرن، تـا ئەویـش لە لیستی ئەو پەرتووکانە دانێم کە بە نیـازم بە مێشـکێکی ئـارام لەو گەشتەی لەبەر دەممە بیخوێنمەوە. کەچی ئەو سوپرایزە منی زۆر دڵخۆشکرد. دوای کردنەوەی پاکەتەکە و بینینی پەرتووکەکە پڕ دڵخۆش بووم، جا هەر کێیەك بۆ منی ناردبێ، لە دڵەوە سوپاسـی دەکەم.
لەبەر ئەوەی زۆر گرنگـــی و قـــیمەتم بە پەرتـــووکەکەی جەنابتان دا، بۆیە، دوای کۆتاییهاتنی مانگەکانی ساڵی خوێنـدن، لە ماوەیەکی زۆر کورتی دوای ئەزموونەکان لە کاتێکی شـیاودا دەسـتم بە خوێنـدنەوەی کـرد، ئەو نامەیەشـم دەربـارەی پەرتووکەکە بۆ جەنابتان، ڕاستەوخۆ دوای خوێنـدنەوەی تەواوی لاپەڕەکانی ئەو بەرهەمەتانە.
لای مـن، یـادەوەری یەکـێکە لەو جـۆرە پەرتووکـانەی زۆر

گرنگیی پێدەدەم. جگە لە چۆنیەتی ناوەڕۆکی پەرتووکەکە، لە هەمان کات کۆمەڵێک ڕاستیی نەگوتراو هەن کە لە هیچ شوێنێکی دیکە دەستمان ناکەوێت و گوێمان لێنابێ، بەڵام لەناو دوو توێی ئەو پەرتووکە چەندان بەسەرهاتی ئاوا دەخوێنینەوە. ئەمەش وانەیەکە و زۆر شتمان فێر دەکات. جا ئەوە بۆ پەرتووکەکەی ئێوە زۆر زۆر ڕاستە، چونکە زۆر شتی نەبیستراوی تێدایە. بۆیە، دەمەوێ لێرەوە دان بەوەدا بنێم دوای خوێندنەوەی زۆر شت فێر بووم، وەك تەخمینی دەکەن منیش لەناو ئێش و ئازاری ئێوە خوێندمەوە، بەڵام چ ئێش و ئازارێك!!!

دوای خوێندنەوەی هەر بەشێکی یادەوەرییەکانتان، بۆ بەردەوامبوون لە خوێندنەوەی، لەبەر دەیان ڕووداوی تراژیدی، ناچار چەند ڕۆژێك دوای هەندێك بەشی دەستم لە خوێندنەوەی هەڵدەگرت، یانی دەمەوێت بڵێم گەر ئەوانەی جەنابتان باستان کردووە ٩٩٪ دوور بێت لە ڕاستی و تەنیا ١٪ ڕاستی بێت، ئەو دەرد و کەسەرەی بەسەر ئێوە هاتووە، هەم وەکو ڕووناکبیرێك، هەمیش وەکو تاکێکی گەلی کورد، بەسە بۆ ئەوەی تورك شەرمەزار بکەین. جا گەر نووسینەکەتان سەرلەبەری ڕاست بێ، ئەوە کارەساتێکە بۆخۆی، کە من هیچ گومانم لە ڕاستیان نییە.

دەستەکانتان خۆشبێ بۆ نووسینی ئەو پەرتووکە. چونکە کاتێك سەرقاڵی خوێندنەوەی بووم، دڵ و گیانم ئاگریان تێبەر بوو، بەڵام پێم لە جەرگی خۆم نا و بەردەوام بووم لەسەری، چونکە ئەوەندە ڕووداوی پڕ ئازاری تێدایە، مرۆڤ بەدەست خۆی نییە هەناوی ژان دەکات. بۆیە، دوای خوێندنەوەی هەر بەشێك، تەنیا هیوا و ئاواتم ئەوەبوو گەلی کورد بگاتە ڕۆژێك سەربەرزانە بێ چەوساندنەوە ژیان بەسەر ببات.

لە نزیکترین دەرفەتێدا دەمەوێ وتارێکی ناساندن لەسەر پەرتووکەکەتان بنووسم، بۆ ئەوەی زیاتر بە خەڵك ئاشنای بکەین. ڕۆژی هەینیی هەفتەی ڕابردووش، لە ڕادیۆی کۆڵن لە ئەڵمانیا پرسیاریان لێ کردم بۆ ئەوەی خوێنەر لە پشووی هاویندا چ پەرتووکێك بخوێنێتەوە، تا بۆیان پێشنیار بکەم، منیش لە ماوەی سێ خولەکدا هەندێك قسەم کرد کە لە خوارەوە بۆ جەنابتانیشی دەنێرم. ئەو قسانەم بۆ ئەوە نییە بەشان و باڵی پەرتووکەکەتان هەڵبدەم، بەڵکو من لەو لێدوانەم تەواو باسی ناوەڕۆك و گرنگیی دێر بە دێری پەرتووکەکەم کرد. چونکە بەوە زۆر دڵخۆشم، بۆیە لە هەموو شوێنێك دەڵێم: کورد لە هەموو شتێك هاوبەشمانن، تا دەگاتە شیعری ناو گۆرانییەکانیشمان، گەلێکن ژن و ژنخوازیمان لە نێوان دروستبووە، ئەمەش ئێمەی کردۆتە برای یەکدی. لەگەڵ ئەوەش گەلی کورد لە چەندان ڕووەوەخاوەن مێژوویەکی دەوڵەمەندە. من واش هەست دەکەم گەلەکەتان پەیوەندییان لەگەڵ ڕووناکبیرەکانی خۆیان، زۆر لە پەیوەندی گەلانی دیکە گەرم و گوڕترە لە گەڵ ڕووناکبیرەکانیان. بۆیە، لە ئێوە نزیك بوونەوەم دەبێتە هۆکارێکی دڵخۆشی، کە بەلای منەوە زۆر هەستێکی جیاوازە.

جەنابی عەنتەر، ئەوەی ئەمڕۆ بە بیرم دا هات هەر ئەوەندە بوو. ناشمەوێ بە یەکەم نامەم بۆ جەنابتان زۆر ماندووتان بکەم. بەڵام دەمەوێ بڵێم کە یادەوەرییەکانتان لەو پەرتووکە، تەنیا گوزارشت لە بەسەرهاتەکانتان ناکات. چونکە گەر نووسینەکانی دیکەتان لە ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە) بشخوێنمەوە، بەڵام هێشتا دەمەوێت لەگەڵ ئێوە ڕوو بە ڕوو دابنیشم و دەمەتەقێ بکەین و پرسیارگەلێکت لێ بکەم. چونکە ئەوە تام و لەزەتێکی تایبەتی

هەیە. لێرە ئێوەم وەکو میوانێکی عەزیز و خۆشەویست هەژمار کردووە و دەمەوێ زۆر جوان خزمەتتان بکەم. بۆیە، تا ڕۆژی دیدار بە ڕێز و خۆشەویستی بە جێتان دێڵم. گەر لە ئێستاوەش هەر کارێکتان بە من هەبوو، بەسەر سەر و سەرچاو لە خزمەتدام.

بە ئومێدی دووبارە نامە گۆڕینەوەمان، لێرەوەش هاوپێچی نامەکەم دەقی لێدوانەکەم بۆ ڕادیۆی کۆڵن بۆ ئێوە دەنێرم.

بە هیوای دیدار بەڕێزم.

## لێدوان بۆ ڕادیۆی کۆڵن - ١٩.٧.١٩٩١

لەو ساڵانەی دوایی گرنگییەکی زۆر بە پەرتووکە کوردییە بڵاوکراوەکان دەدەم، بۆ نموونە ئەو پەرتووکانەی دەربارەی (مێژووی کورد و ئەدەبیاتی کورد و هونەری کوردی) بڵاو دەکرێنەوە، بە کورتی دەربارەی کولتووری کورد چیم دەستکەوێت دەیخوێنمەوە. لە ماوەی ڕابردووش زۆر پەرتووکی چاك لەو بارەیەوە بە تورکی بڵاوکراوەتەوە، بە بۆچوونی منیش کارێکی زۆر چاکیان کردووە. چونکە تورك و کورد تا گۆرانییەکانیشمان هاوبەشن، ئێمە ژن و ژنخوازیمان لە نێوان کراوە، بۆیە کەلتووری ئەو گەلە برایەمان، تەنیا پەیوەست نییە بە خۆیانەوە، بەڵکو پەیوەستە بە گەلی تورکیشەوە.

لە ماوەی ڕابردوو پەرتووکێکم خوێندەوە، کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام. ئەو پەرتووکە یادەوەرییەکانی مووسا عەنتەری ڕووناکبیری گەورەی کوردە کە تا ئێستا لە ژیان ماوە. پەرتووکەکە ساڵی ڕابردوو لە ئیستانبوول چاپ و بڵاوکراوەتەوە لەژێر ناونیشانی (بیرەوەرییەکانم).

مووسا عەنتەر، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە تا ساڵی ١٩٩٠، ئەوەی بینیویەتی و گوێی لێبووە و بەسەری هاتووە، لەگەڵ کۆمەڵێك ڕووداو و چیرۆك کە بەسەر کەسانی دیکە هاتوون لەو پەرتووکەدا نووسیویەتییەوە. جگە لەوەش، لە پاڵ ئەو کۆمەڵە بەسەرهات و ڕووداوانە کۆمەڵێك زانیاریی مێژوویی و کەلتووریی گەلی کوردیشی بۆ باس کردووین. لە هەمان کات کۆمەڵێك بابەتی مێژووی تورکیای نوێشی بە پێنووسەکەی ڕووناککردۆتەوە. لە کاتێك پێویست بە وەبیرهێنانەوە ناکات، تورکیای نوێ وەکو گەل و وەکو ڕووناکبیرەکانی، پڕیەتی لە کارەساتی ناخۆش و جەرگبڕ. ئەو کارەساتانەشم کاتێك لە پەرتووکەکەی مووسا عەنتەر دەخوێندەوە، وەك ئەوەبوو مشتێك خوێ بخەنە سەر برینێکی جەستەم. پێتان سەیر نەبێت گەر بڵێم ئەو بەسەرهاتە تراژیدیانە منی لە گەلی کورد و ڕووناکبیرەکانی هەنگاوێکی دیکە نزیکتر کردەوە. بۆیە، ئەمە پاڵی پێوەنام زیاتر هیواخواز بم بۆ وەدیهێنانی جیهانێکی ئاسوودە و کامەران بۆ گەلی کورد.

بە کورتی، پەرتووکی (بیرەوەرییەکانم)ی مووسا عەنتەر پێویستە هەموو کەسێك بیخوێنێتەوە، بۆیە، تکا لە خوێنەران دەکەم لە دەست خۆیانی نەدەن. بەڵام دەمەوێ ئەوەش بڵێم، گوێم لێ بووە لە تورکیا ئەو پەرتووکە بە بڕیارێك کۆکراوەتەوە و لەلایەن دەوڵەتەوە لە دادگا داوای لەسەر تۆمارکراوە. گەر ئەوە ڕاست بێت زۆر کارێکی بە ئازارە! بۆیە، گەر خوێنەر ئەو پەرتووکەشی نەدۆزییەوە، با پەرتووکی هەمان نووسەر بە ناونیشانی (برینی ڕەش) بخوێنێتەوە، کە مووسا عەنتەر لە کاتی دەستگیرکردنی لە زیندان نووسیویەتی، چونکە پەرتووکەکە باس لە تاوانێک دەکات کە دژی گەلی کورد

كـــراوە. برینـــی ڕەش لە شـــێوەی چیـــرۆك یـــان شـــانۆنامەیەك نووســـــراوە، دوای بڵاوكردنەوەشـــی بـــۆ زمـــانی بەلجیكـــی و دانیمـارکی و سـوێدی و هۆڵەنـدی تەرجـومە کـراوە، ئینجـا لە سەكۆی بەشێك لە شـانۆكانی ئەو وڵاتـانە كـراوەتە شـانۆ و زۆر دەستخۆشـی و خەڵاتـی وەرگرتـووە. دوای چەنـدان سـاڵ ئەو پەرتووكە بە توركی چاپ كراوە، بۆیە پێویستە بخوێنـدرێتەوە و لە شێوەی شانۆش پێشكەش بكرێتەوە. مووسـا عەنـتەر، كە ئێسـتا تەمەنـی ٧٥ سـاڵە بـۆ ئەوەی پەرتـووكی جـوانتر و باشـترمان بـۆ بنووسێت داواكارین كە تەمەنی درێژتر و تەندروستتر بێت.

***پرۆفیسۆر سەروەر تانیللی***

"گەر زمانەکەم مەترسی بێت بۆ سەر پایەکانی دەوڵەتەکەت؛ کەواتە وڵاتەکەت لەسەر خاکەکەی من بنیادناوە."

**مووسا عەنتەر**

# بیرەوەرییەکانم

ئەم پەرتووکەی بەردەستتان، کۆمەڵێک بیرەوەریی مووسا عەنتەرە، لەگەڵ چەندان کەسایەتیی دیاری وەک شێخ سەعیدی کوردی، ئیسماعیل بێشکچی، عەبدولڕەحمان قاسملوو، کامەران بەدرخان، جگەرخوێن، یاشار کەمال، عەزیز نەسین، دایکی عەبدوڵڵا ئۆجەلان، مەدام میتران، یلماز گۆنای و نووری سەعید پاشا و... هەڵبەت بەپێی جۆری ژیان و چالاکیی سەردەمەکەی خۆشی، مژارە جیاوازەکانی هەر سەبارەت بە کوردستان و تورکیا بووە.

لە پاڵ ئەمانەدا، نووسەر باسی چەندان رووداو و بەسەرهاتی پشت پەردەی، شۆڕشەکانی دێرسیم و باشووری کوردستان و کۆماری مەهاباد و شێخ سەعیدی پیران و مەلا مستەفا بارزانی و سەید ڕەزا و هەڵسوکەوتە بەرایییەکانی دامەزراندنی کۆماری تورکیا و ئەتاتورک دەکات، بەرامبەر بە کورد لە باکووری کوردستان.

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAM publication